بسم الله الرحمن الرحيم

# پێشەکی وەرگێڕ

إنَّ الحَمْدَ للهِ نحمدهُ ونستعينهُ ونستغفرهُ ونعوذُ باللهِ منْ شرورِ أنفسنا ومنْ سيئاتِ أعمالنا، مَنْ يهدهِ اللهُ فلا مضلَّ لهُ ومَنْ يُضلِلْ فلا هاديَ لهُ، وأشهدُ أنْ لا إلهَ إلا اللهُ وحدهُ لا شريكَ لهُ، وأشهدُ أنَّ محمداً عبدهُ ورسولهُ.

﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنْتُمْ مُسْلِمُونَ ﴾ ﴿ آل عمران: ١٠٢﴾.

﴿ يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيراً وَنِسَاءً وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي تَسَاءَلُونَ بِهِ وَالْأَرْحَامَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيباً ﴾ ﴿النساء: ١﴾.

﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَقُولُوا قَوْلاً سَدِيداً، يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَنْ يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزاً عَظِيماً ﴾﴿ الأحزاب: ٧٠ _ ٧١ ﴾.

أمَّا بَعْدُ فإنَّ أصدَقَ الحديثِ كتابُ اللهِ، وخيْرُ الهَدِي هَدْيُ محمدٍ _ صلى الله عليه وسلم _ وشرُّ الأُمُورِ مُحْدَثاتِهَا، وكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَة، وكُلَّ بِدْعَةٍ ضلالة، وكُلَّ ضلالةٍ في النارِ.

پاشان، من یەکێکم لەو کەسانەی کە هەمیشە پێم وابووە، خزمەتێ کە تەمەن درێژ بێ و، زۆرترین کەس سوودی لێ وەربگرێت، بواری نوسین و خزمەتە بە ئاینی پیرۆزی ئیسلام، پاککردنەوەی بیروباوەڕو پەرستنەکانی خەڵك یەکێکە لەو ئەرکە گەورانەی کە پێویستە هەموو کەسێکی بەتوانا هەوڵی بۆ بات.

ئەگەر سەرنجێکی کتێبخانەی کوردی بدەین، بۆمان دەردەکەوێ کە کتێبخانەی کوردی لە بواری ئاشکراکردی فێلەکانی ئیبلیسدا هەژارەو، کتێبی سەربەخۆی لەم بارەوە بە زمانی کوردی تێدا نیە، کەسێکی واش بەدیناکرێت پێنوسەکەی خۆی بۆ ئەم بوارە تەرخان کردبێ،

نه بەنوسین و نه بە وەرگێڕان، بەڵكو زۆربەی زۆری ئەوانەی دەنوسرێن لـە بوارەكـانی دیكـەی شەریعەتدان بەگشتی و، لە بواری چەسپاندنی بیروباوەڕی ئەهلی سوننەت و جەماعەتدایە بـە تایبەتی، سوپاس بۆ خوا.

بـۆ پاراسـتنی ئـاینی پـیرۆزی ئیـسلام زانایـان چـەندین كتـێبی بـەنرخیان دانـاوە بـۆ وشـیاركردنەوەی خـەڵك لـە فێـڵ و دەسیـسەكانی ئیبلـیس ، كـە هۆكـارێكی چـالاكە بـۆ سەرلێشێواندنی تێكڕای جەماوەری خەڵك و، تێكدانی پەرستنەكانیان و، جێبـەجێ كردنیـان بەشێوازێكی نەگونجاو كە شەرع فەرمانی پێ نەكردووە.

كتێبی (تَلبيسْ إبليسْ)ی پێشەوای بەناوبانگ (ابنُ الجَوزي) _ بەڕەحمـەتی خـوا بێـت _ بەلای هیچ كەسێكی موسڵمانەوە شاراوە نیەو، گەورەترین ناوبانگی لە سەر تا سەری جیهانی ئیسلامیدا بەدەست هێناوە، یەكێكە لەو كتێبانەی كە لە بوارەكـەی خۆیـدا تاكـەو، هـەموو موسـڵمانێك نـابێ خـۆی لـە خوێندنـەوەی بێبـەش بكـات، بـۆ ئـەوەی بـە تـەواوی سەرلێشێواندنەكانی ئیبلیسی بـۆ ڕوون بێتـەوە، بـەڵام ماوەیـەكی زۆر درێـژ گـەلی كـوردی موسڵمان تەنها نـاوی ئـەم كتێبـەیان دەبیـست و، شـارەزای نـاوەڕۆكی نـەبوون، بەتایبـەت نەوەكانی ئەمڕۆ كە زمانی عەرەبیان بەلاوە بۆتە بێگانە، زۆر بەداخەوە، بۆیـە بـە پێویـستی سەر شانی خۆمم زانـی ئـەوانیش لـەم كتێبـە بەنرخـە بێبـەش نـەبن و، ئـیتر دەسـتم دایـە وەرگێڕانـی، بۆیـە داواكـارم ئەگـەر هـەر هەڵەیـەكم هـەبێ، لـە ڕێگـای دەزگـای چـاپو بڵاوكردنەوەی نارینەوە ئاگادارم بكەنەوە.

بۆیە ئەگەر كارەكەم باش بێ ئەوا گومانی تێدا نیە كـە خـوای تعـالی یارمـەتی داوم و، ئەگەر بە پێچەوانەشەوە بێت، ئەوا كەم و كورتیەكە لە خۆمدایە.

والله الموفق

نوری هەمەوەند

پێنجوێن / ٢٠١٢

# پێشەكی

أنِ الْحَمْدُ لِلَّهِ، نَحْمَدُهُ، وَنَسْتَعِينُهُ، وَنَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا ومِـن سيِّئاتِ أعمالِنا، مَنْ يَهْدِهِ اللَّهُ، فَلا مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلْ، فَلا هَادِيَ لَهُ.

وَأَشْهَدُ أَنَّ لا إِلَهَ إِلا اللَّهُ وحدَهُ لا شريكَ له.

وأشهدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ.

أما بعدُ:

خوای تعالى له قورئانه پیرۆزەكەیدا له ئیبلیسەوه باسمان بۆ دەكات و دەفەرمێت:

﴿قَالَ أَنظِرْنِي إِلَى يَوْمِ يُبْعَثُونَ. قَالَ إِنَّكَ مِنَ الْمُنظَرِينَ. قَـالَ فَبِمَـا أَغْـوَيْتَنِي لأَقْعُـدَنَّ لَهُـمْ صِرَاطَكَ الْمُسْتَقِيمَ . ثُمَّ لآتِيَنَّهُم مِّن بَيْنِ أَيْدِيهِمْ وَمِنْ خَلْفِهِمْ وَعَنْ أَيْمَـانِهِمْ وَعَـن شَـمَائِلِهِمْ وَلاَ تَجِدُ أَكْثَـرَهُمْ شَـاكِرِينَ﴾ ﴿الأعـراف: ١٤ _ ١٧ ﴾ واتـه ﴿قَـالَ أَنظِرْنِـي﴾ وتـی مۆڵـەتم بـده (مەمرێنه) ﴿ إِلَى يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴾ تا ئەو ڕۆژەی زیندوو دەكرێنەوه ﴿ قَالَ إِنَّكَ مِنَ الْمُنظَـرِينَ ﴾ (خواش) فەرمووی: بێگومان تۆ له مۆڵەتدراوانی ﴿ قَالَ فَبِمَا أَغْـوَيْتَنِي لأَقْعُـدَنَّ لَهُـمْ ﴾ وتـی ئەی پەروەردگار بەهۆی ئـەوەوه كـه گـومڕات كـردم بێگومـان بۆیـان (ئـادەم و نـەوەكانی) دادەنیشم ﴿ صِرَاطَكَ الْمُسْتَقِيمَ ﴾ له ڕێگه ڕاستەكەی تۆدا ﴿ ثُمَّ لآتِيَنَّهُم مِّن بَيْنِ أَيْدِيهِمْ وَمِـنْ خَلْفِهِمْ ﴾ ئینجا سوێندبێ بێگومان بۆیان دەچم له پێشیانەوەو له دوایانـەوه ﴿ وَعَـنْ أَيْمَـانِهِمْ وَعَن شَمَائِلِهِمْ ﴾ وه له لای ڕاستیان و له لای چەپیانەوه ﴿ وَلاَ تَجِدُ أَكْثَرَهُمْ شَاكِرِينَ ﴾ ئەوسـا نابینی زۆربەیان سوپاسگوزاربن[1].

ئەم ئایەته پیرۆزه نیشانەی جەنگێكی بەهێزمان بۆ ڕوون دەكاتـەوه لـه نێـوان شـەیتان و سەربازانی له لایەك و، له نێوان وەلی و پیاوچاكانی خوادا له لایەكی ترەوه.

كەسـی بـاوەڕدار لـەو جەنگـه بێبەزەیـه پـارێزراو نـابێ، مەگـەر داوای یارمـەتی لـه پەروەردگاری بكات و، خۆی به زانستی بەسوودو كردەوەی چاك پڕچەك بكات، بۆ ئەوەی هیچ

---

١ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

كون و كەلەبەرێك بەجێنەهێڵێت كە شەیتان و سەربازانی پیایدا بچن و، بەهۆیەوە بـۆی بێنـە ژوورێ.

پزیسكی یەكەمی ئەم جەنگە بە گرمەیە لەو كاتەوە دەستی پێكرد كە خوای تعالی ئادەم پێغەمبەری _ علیه السلام _ دروست كرد:

﴿ فَوَسْوَسَ إِلَيْـهِ الـشَّيْطَانُ قَـالَ يَـا آدَمُ هَـلْ أَدُلُّـكَ عَلَـى شَـجَرَةِ الْخُلْـدِ وَمُلْـكٍ لا يَبْلَـى ﴾ [طه: ١٢٠].

واتە ﴿ فَوَسْوَسَ إِلَيْهِ الشَّيْطَانُ ﴾ ئینجا شەیتان نیازی خراپـی خـستە دڵیـەوە ﴿ قَـالَ ﴾ وتی ﴿ يَا آدَمُ ﴾ ئەی ئادەم ﴿ هَلْ أَدُلُّكَ ﴾ ئایـا نیـشانت بـدەم ﴿ عَلَـى شَـجَرَةِ الْخُلْـدِ ﴾ درەختی نەمری (هەركـەس لێـی بخـوات هـەرگیز نـامرێ) ﴿ وَمُلْـكٍ لا يَبْلَـى ﴾ و موڵـك و دەسەڵاتێ هەر دوای نەیەت[٢].

ئیتر لەو ڕۆژەوە جەنگەكەی نێـوان شـەیتان و موریـدەكانی و وەلی و خواپەرسـتانی خـوا بەردەوامەو پێشبڕكێی یەكتر دەكەن، جار بـەجار سـەركەوتن بـۆ لایـەنی شـەڕەو، بـەزۆریش سەركەوتن و زاڵبوون بۆ لایەنی خەیرە.

بەڕاستی زانایان ئومەت و پێشەوایانی هەڵبژێردراوی دڵـسۆزیی زۆر چـاك لـەم ململانـێ فەوتێنەرە ئاگادار بونەوە، بۆیـە ژمارەیـەكی زۆر كتێبیـان نوسـی بـۆ وریاكردنـەوەی بەنـدە ڕاستگۆكان و، موسڵمانە خواپەرستەكان و، لە شەڕی ئیبلـیس ئاگاداریـان دەكردنـەوەو، لـە سەرلێشێواندن و فیتنەكانی ئیبلیس قەدەغەیان دەكردن.

ئەوەبوو پێشەوا (ابنُ أَبي الـدُّنيا) كە لە ساڵی (٢٨١ كۆچی) مردووە هەستا بە نووسـینی كتێبی ((مكايد الشيطان))[٣].

---

٢ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

٣ _ ((سير أعلام النبلاء))(١٣ / ٤٠٣)، وورَدَ في ((كشف الظنون))(٢ / ١٧٠٤): ((مصايد الشيطان)). لعله هو.

شێخ (أبوحامدِ الغَزاليُّ)یش كه له ساڵی (٥٠٥ كۆچی) مردووه هەستاوبوو به نووسینی كتێبی ((تلبيس إبليس))[٤].

هەروەها پێشەوای ئازاو جوامێرمان (ابنُ الجوزيِّ) كتێبی (تلبيس إبليس)ی نووسی[٥].

پاشان پێشەوا (ابنُ القَيِّمِ الجوزيَّةِ) كه له ساڵی (٧٥١ كۆچی) مردووه كتێبی ((إغاثة اللهفان مِن مصايد الشيطان))ی[٦] نووسی.

ئاوەها: پێشەوایان _ بەرەحمەتی خوابن _ له ڕێگەی دانانی زنجیرەیەك كتێبی زانستیی بەسوودەوە ویستیان فێڵەكانی شەیتان ئاشكراكەن و، سەرلێشێواندنەكانی ڕوونكەنەوەو، فریودان و هەڵخەڵەتاندنەكانی بخەنەڕوو.

له بەر ئەوەی شتەكه بەم جۆرەیە، بە پێویستی سەرشانی خۆمم زانی منیش جۆرە بەشداربونێكم هەبێ، بۆ ئەوەی ئەم كاروانە درەوشاوە چاكە بەردەوام بێ، بەڵام...

---

٤ _ ((طبقات الشافعية الكبرى)) (٦ / ٢٢٧).

(فائدة):

اختلفت مقالاتُ أهل العلمِ في ضبط (الغَزالي)، أهُو بتشديد حرف الزاي أم بتخفيفهِ ؟

وقد نقلَ الزَّبيديُّ في ((تاج العروس)) (غ ز ل) هذا الأختلاف دون ترجيح !

ثمَّ إني رأيتُ _ بدلالة أحد الإخوة _ ما قاله العلَّامة الفيُّومي في ((المِصباح المُنير)) (ص ٤٤٧) أنَّه يُنْسَب إلى (((غزَاله)، قرية من (طُوس)))، ناقلاً ذلك مشافهةً عن أحد أحفاد الغزالي، ثم ذكر عن هذا الحفيدِ قوله:

((أخطأ الناسُ في تثقيلِ اسمِ جدِّنا، وإنَّما هو مُخَفَّف)).

والحمدُ لله الذي بنعمتهِ تتِمُّ الصالحاتُ.

٥ _ وسيأتي الكلام عليه مفرداً.

٦ _ ولي مُختصرٌ له على نَسَق هذا الكتاب الذي بين يديك _ أخي القارىء _ عنوانه ((مَوارد الأمان المُنتقى من إغاثة اللهفان))، وهو تحت الطبع في دار ابن الجوزي _ الدَّمام.

له كتێبی ((سيَرِ أَعـلام النُّـبلاء))دا[٧] كـه مێژوونوســی ئیـسلام پێـشەوا (شمـسِ الـدينِ الذهبـيِّ) نوسیویەتی، گوتەیەكی زۆر شیرینم خوێندەوە، كە پێشەوامان لـە میانـەی نووسـی ژیانامەی پێشەوای قورئان خوێن (ابنِ مُجاهدٍ)دا دەیگێڕێتەوەو فەرموویەتی:

(((ابنُ أبي هاشمٍ) دەڵێت: پیاوێك بە (ابنِ مُجاهدٍ)ی گوت: ئەوە بۆ تۆش بۆ نەفسی خۆت پێتێك دانانێیت ؟ ئەویش فـەرمووی: نەفـسی ئێمـە زۆر پێویـستی بەوەیـە كـار بكـات بـۆ پاراستنی ئەوەی پێشەواكانمان لە سەری دەچوون بەبەراوردی ئەوەی خۆی هەستێت بەدانان)).

ئیتر گوفتارەكەی چوو بـە دڵمـەوەو، بـەدوای كتێبێكـدا گـەڕام بـۆ ئـەوەی لـە میانـەی خزمەتكردنیدا بتوانم چەكێكی تر بە دەستی بەندە یەكتاپەرستەكانی خواوە بەم، بۆ ئەوەی دژ بەم شەیتانە نەفرەتكراوە بجەنگن تـا كـپ دەبێتـەوە ! ئـەوەبوو كتـێبی ((تلبـيس إبلـيس))ی پێشەوا (ابن الجوزيِّ)م هەڵبژارد، لە بەر چەند هۆكارێك:

یەكەم: چاكی چارەسەركردنی بۆ ئەو بابەتە گرنگانەی كە لە كتێبەكەیـدا باسـی كـردووەو هەموو ئومەت سوودی لێ وەردەگرن.

دووەم: ئەو واقیعەی كە پێشەوا (ابن الجـوزيِّ) باسـی دەكـات زۆر لـەم واقیعـەی خۆمـان دەچێت كە ئێستا تیایدا دەژین.

سێ یەم: ئەو ناوبانگە گەورەیەی كە كتێبەكە بەدەستی هێناوە لە نێـوان سـەرجەم چـین و توێژەكانی خەڵكدا: تایبەت و گشتی.

چوارەم: نەبونی هیچ نوسخەیەكی تەحقیق كراو بە تـەحقیقێكی زانـستی كـە موسـڵمانی ئاسایی و خوێندكارانی زانست متمانەی پێ بكەن.

وە چەندین هۆكاری دیكەش كە شاراوە نابێ لە كاتی چاك تێوردبونەوەدا.

ئەوەبوو _ برای خوێنەرم _ هەستام بـە تـەحقیق كردنـی ئـەم كتێبـە، بـەم جـۆرەی كـە دەیبینی، داواكارم خوای تعـالی بیكـات بـە سـوودو كـەڵكێكی زۆر بـۆ ئـەو كەسـانەی كـە دەیخوێننەوەو، تەماشای نـاوەڕۆكی دەكـەن ، لـە هـەمان كاتیـشدا خـوای تعـالی پاداشـتی

٧ _ (١٥ / ٢٧٣).

پێشەوامان (ابن الجوزيِّ) باتەوە کە هەستاوە بە نووسینی و، پاداشتی تەحقیقکاریش باتــەوە، إنَّهُ سميعٌ مجيبٌ.

وآخِرُ دعوانا أَنِ الحمدُ للهِ ربِّ العالمينَ.

أبوالحارث الحلبــي الأثريُّ
الخميس ٢٧ / ٧ / ١٩٨٩ م
٢٤ / ذي الحجة / ١٤٠٩ هـ

# ئەم کتێبە

_ پێشەوا (ابن الجوزيِّ) ناوی ناوە ((تلبيس إبليس))، وەکو ئـەوەی لـە کتـێبی ((کـشف الظنون))دا (١ / ٤٧١) هاتووە، بەڵام شێخ (محمد منير الدِّمشقي) لە کتێبی (أنموذج الأعمال الخيرية)دا (ص ٧٩)[٨] فەرموویەتی:

((کتێبی ((تلبيس إبليس)) کە لـە چـاپخانەی (الـسعادة) لـە وەڵـاتی میـسر لـە ساڵی (١٣٤٠ كۆچی)دا چاپکراوە، بەڕاستی ناوی بۆ ((نقـد العلمِ والعُلَمـاء، أو تلبـيس إبلـيس)) گۆڕدراوە، بۆیە ئێمە لە ساڵی (١٣٤٧ كۆچـی)دا کـە دووبـارە هەسـتاینەوە بـە چـاپکردنی کتێبەکە، وازمان لەو ناوەی سەرەوە هێناو، ناوە ڕاستەکەی خۆیمان بەکارهێنا کە دانەرەکـەی ناوی نابوو، کە بریتیە لە ((تلبيس إبليس)) بەتەنها)).

هەندێ جاریش کە کتێبەکەیان چاپ کردووە ناوی ((النَّاموس في تلبيس إبلـيس))یـان بـۆ دانـاوە، وەکـو ئـەوەی مامۆسـتا (عبـدالجبار عبـدالرحمن) لـە کتـێبی ((ذخـائر الـتراث الإسلامي))دا (١ / ٧٨) باسی دەکات.

_ ((پێشەوا (ابن الجوزيِّ) تیایدا ئەو مەسـەلە گرنگانـە بـاس دەکـات کـە جێگـەی ڕای جیـاوازن لـە نێـوان زانایـانی مەزهـەب و ڕێبـاوەڕو ئاینەکانـدا، وە ڕێـڕەوی فیقهزانـان و فەرموودەناسان و زمانەوانان و خوێنەران و کەسانی دیکەش دەخاتە ڕوو، ئەو گومانانـە ڕوون دەکاتەوە کە ئیبلـیس وەکـو هۆکارێـك بـەکاری هێنـاوە بـۆ سەرلێـشێواندنیان، دانـە پەلاماری ئەو گومانانەی داوەو بە توێژینەوەو لێکۆڵینەوەو ڕەخنـەگرتن وەڵـامی داونەتـەوە، بەڕەخنەگرتن لە ڕێباوەڕ ڕێباوەڕو، ڕێـڕەو ڕێـڕەو شـی یـان دەکاتـەوەو، ڕاسـت و دروسـتی مەسەلەکان لە خراپ و بۆگەنەکان جیادەکاتەوەو، گومانەکان ڕەتدەکاتەوە، بۆ هەموو ئەوانـە

---

٨ _ ئەوەی لە کاتی باسکردنی هەندێ کتێبدا فەرمووە کە بەهۆی نەفامی و نـەزانینی کتێبفرۆشـەکانەوە گۆڕدراوەو شێواوەو تێکدراوە.

پــشت بــه بەڵگــەكانی قورئــان و ســوننەتی (صــحیح) و ڕێتێــچوترین بەڵگــەكانی ئــەقڵی دەبەستێت، لە گەڵ باسكردنی نموونەگەلێك كە هەست و ویژدان شایەتی بۆ دەدەن))[٩].

_ پێشەوا (ابن الجوزيّ) _ بەرەحمەتی خوا بێت _ كتێبەكەی بــە ســیازدە بــەش دانــاوە، درێژترین ئەو بەشانە بەشی پێنجەمە بە ناوی ((باسی سەرلێشێواندنەكانی ئیبلیس لە بــواری بیروباوەڕو ئاینەكاندا))، هــەروەها بەشــی دەیەمیــشە بــەناوی ((باســی سەرلێــشێواندنەكانی ئیبلیس بەرامبەر بە صوفیەكان))، بەشێوەیەكی سەرسوڕمێن درێــژەی بــەم بەشــە داوە، كــە زیاتر لە دوو سەد لاپەڕەیە، كە نزیكەی نیــوەی كتێبەكــە دەبێــت و، بەڕاســتی گــرنگترین و چاكترینی هەموو بەشەكانە.

وە من _ علي الحلبي _: پاش لێكۆڵینەوەی كتێبەكەو ژیانەمەی پێشەوا (ابــن الجــوزيّ) دانەری كتێبەكە، درێژەپێدانی بەشی دەیەم دەگەڕێنمــەوە بــۆ سروشــتی ئــەو چــاخ و كــات و زەمەنەی كە (ابن الجوزيّ) تیایدا ژیاوە، چونكە كات و زەمەنێك بوو كە صوفیەكان چین چــین هیلانەیان بۆ خۆیان دروست كردبوو، چەندین زەڕنەقوتەو بەچكەیان هەڵهێنابوو، كە ســەر بــە هیچ لایەك نەبوون !

بۆ ڕوویەڕووبونەوەی ئەو شاڵاوەی كە لە سەر قسەو گوتەی پڕوپوچ و بێ تــام و بــێ مانــاو خەون وستابوو، پێشەوا (ابن الجوزيّ) بەدرێــژی باســی صــوفی و خۆبەصــوفیكارانی كــردووە، چونكە بیروڕای كەسانێكی وەكو ئەوان، بە لای كەسانی نەفام و خەڵكی ئاسایەوە، لە هەمــوو شارو لە هەموو كات و زەمەنێكدا، داواكاریەكی زۆری لە سەرە، مەگەر ئەو كەســەی خــوای تعالی بەزەیی پێدا بێتەوە.

_ بەڕاستی كەسانێك لە پێشەوایانی پێشین _ بەرەحمەتی خوابن _ گرنگیــان بــەم كتێبــە داوە، پێشەوا (السیوطيُّ) لە كتێبی (نظم العِقْیان)دا (ص ٤٩) فەرموویــەتی: پێــشەوا (ابــن

---

٩ _ لە كتێبی ((أنموذج الأعمال الخیریة))ەوە (ص ٢٨٨) وەرگیراوە.

حَجَر العسقلاني) کە لە ساڵی (٨٥٢ کۆچی) مـردووە، کتـێبی ((تلبـیس إبلـیس))ی کـورت کردۆتەوە، بەڵام بەدەستمان نەگەشتووە[١٠].

_ پوختەی تێکڕای گوفتارەکان سەبارەت بەم کتێبە ئەوەیە کە ((شایستەیە بە ئـاوی زێـڕ بنوسرێت و، پێشکەش بە هەموو ئەو کەسانە بکرێت کە حـەز بـە چـاککردنن و، خوازیـاری ئەوەن کە بە زانستی هەقیقی و، ڕێگەی ڕاسـت و، بیروبـاوەڕی ڕاسـت و دروسـت بگـەن کـە تێکەڵ بە هیچ گومانێك نەبێ))[١١].

چونکە ((دەقاودەق سازیاری باروحاڵی کۆمەڵایەتی خۆمان و، ئـەو بیروباوەڕانەمانـە کـە تێکەڵ بە چەندەها خەیاڵات و ئەندێشەی پڕوپوچە، بۆیە هانی زانایان و کەسانی هەقیقەتخواز دەدین کەوا هەوڵی پەیداکردنی ئەم کتێبە بەن و بیخوێننەوە، چـونکە لـەم بـوارەدا چـاکترین کتێبی دانراوە)).

_ مەنهەجی من _ علي الحلبـي _: بۆ تەحقیق کردنی ئەم کتێبە لە سەر ئەم بنەمایانـە وەستاوە:

یەکەم: لابردنی (إسناد) لە سەراپای کتێبەکە.

دووەم: لابردنی ئەو فەرموودانەی کە (صحیح) نین.

سێ یەم: لابردنی ئەو فەرموودەو هەواڵانەی کە لە یەك جێگەدا دووبارە بۆتەوە.

چوارەم: (تخریج)کردنی فەرموودە (صحیح)ەکانی[١٢] نێو کتێبەکە بە شێوەیەکی زانـستیو وەستاو لە سەر مەنهەجی زانایانی لەوەوپێش و، ڕێگەکانی پێشین، بـەکورتی و بـەبێ درێـژە پێدان.

---

١٠ _ ((ابن حجر ودراسة مصنَّفاته))(ص ٦٦٦) لشاكر عبدالمنعم.

١١ _ ((أنموذج الأعمال الخيرية)) (ص٢٨٨).

١٢ _ أمّا الآثار، فلم ألتزم بذلك، ((لأنها ليست كالأحاديث المرفوعة التي يجب الأحتجاج بهـا، وأتِّخاذهـا ديناً، وإنَّما ذُكِرت للأستئناس بها والأستشهاد فقط))، كمـا قـال شـيخنا الألبـاني في مقدمتـه النافعـة لـ ((مختصر العلوّ)) (ص ٢١).

پێنجەم: لابردنی چیرۆك و بەسەرهاتەکان کە سوودێکی ئەوتۆیان تێدا نییەو، بەشەکانیش شتانێکی دیکەی چاکیان تێدایە کە جێگەی ئەوانە دەگرێتەوە.

شەشەم: هەستاوم بە پەراوێز نووسین بۆ هەندێ بابەت کە بە بۆچونی خۆم پێویست بەوە دەکات کە بەواقیعەوە پەیوەست بکرێت، یاخود ئاگادارکردنەوە لە نادیارەکان و، بەو هاوشێوانە کە بە بۆچونی خۆم سوودو کەڵکێکی زۆر دەبەخشێت _ إن شاء الله _.

لابردن و کورتکردنەوە لە گوفتارەکانی دانەر ناچاری کردم هەندێ شت زیاد بکەم، یاخود هەندێ لە ڕستەکان بۆ شێوەیەکی تر بگۆڕم، بۆ تەواوکردنی سوودو کەڵك و، بۆ ئەوەی بە یەکەوە پەیوەندبن.

حەوتەم: هەڵەو ناتەواویەکانی کتێبەکەم چاك کردۆتەوەو، (ضمة) و (فتحة) و، (كسرة) و (سكون)م بۆ هەموو وشەکانی کتێبەکە داناوە، کە بە بۆچونی خۆم تەواوە، بۆ ئەوەی بە ئاسانی سوودو کەڵکی لێ وەرگیرێت و، بۆ هەموو چینی خوێنەران بە سوود بێت.

وە چەندین شتی تر کە بەلای هەموو بینەرانی کتێبەکەوە شاراوە نابێ.

بۆیە ئەگەر لە کارکەمدا پێکابێتم، ئەوا لە بەخششەکانی خوای تعالاوەیەو، ئەگەر هەڵەشم کردبێ، ئەوا کەمتەرخەمی خۆمەو، لێبوردنی خوای تعالی دەمگرێتەوە.

لە خوای تعالی داواکارم ببورێت و ، ئاکامی چاکم پێ ببەخشێت، ڕەحم بە خۆم و دایك و باب و، سەرجەم شێخەکانم بکات، إِنَّه سَمِيعٌ مُجِيبٌ.

## وەستانێك لە گەڵ كتێبی ((تفليس إبليس))دا

كە پێشەوا (ابنُ الجوزيِّ) _ بە ڕەحمەتی خوا بێت _ كتێبی ((تلبيس إبليس))ی نووسی، بوبە دڕكێك لە قوڕگی ئەو كەسانەدا كە سەرپێچی هەق دەكەن، بەتايبەت شوێنكەوتوانی مەزهەب و ڕێباوەڕو ڕێگەو دەمارگیریەكان، بە تايبەتریش ئەوانەی بۆ ئەهلی تەصوف دەگەڕێنەوە، بۆیە دانەیەكیان بەناوی (ابنُ غانمٍ المقدسيُّ الشافعيُّ)[13] كە لە ساڵی (٦٧٨ كۆچی) مردووە، خۆی چالاك كردەوە بۆ وەڵامدانەوەی پێشەوا (ابنُ الجوزيِّ) !

وە لە بەر ئەوەی پێشەوا (ابنُ الجوزيِّ) ناوی كتێبەكەی ناوە ((تلبيس إبليس)) واتە ((سەرلێشێواندنەكانی ئیبلیس))و ئەوەمان بۆ ڕوون دەكاتەوە كە ئیبلیس هێرش و پەلاماری هەیە، بەتايبەت بۆ سەر صوفیەكان، (ابنُ غانمٍ) وەڵامی دایەوەو كتێبەكەی خۆی ناونا بە ((تفليس إبليس))[14] واتە ئیفلاسكردنی ئیبلیس، واتە ئیبلیس هیچ هێرش و پەلامارێكی نییە!!

لە میانەی قەسەكانی (ابنُ غانمٍ)ەوە كە لە كتێبە ((تفليس))ەكەيدا نوسيويەتی، هەروەها لە ناونیشانی كتێبەكانیەوە _ كە تەنها ((تفليس))مان پێ گەشتووە _، زۆر بە ئاشكرا بۆمان دەردەكەوێت كە صوفیەو تیایدا نقووم بووە.

بۆ نموونە كتێبی ((الفتوحات الغيبِيَّة في الأسرار))و، كتێبی ((حلّ الرموز ومفاتيح الكنوز)) هەیە !! وە هیتریش، لە تەماشاكردنی هەموو ئەو شتانەوە بۆمان ڕوون دەبێتەوە كە صوفیەو بیروباوەڕێكی ئەشعەری[15] هەیە.

---

١٣ _ مترجم في ((البداية والنهاية)) (١٣ / ٢٨٩).

١٤ _ وقد طُبع قديماً، كما أشار الزركلي في ((الأعلام)) (٣ / ٣٥٥)، وحققه أخيراً وتعقّبه _ إجمالاً _ أخونا الفاضل سليم الهلالي _ وفقه الله_.

١٥ _ كما تراه عندما ذكر مسألة ((الكسب)) المعروفة عند الأشاعرة، وقد تعقّبه فيها أخونا الفاضل سليم الهلالي _ وفقه الباري _، وكذا مسألة ((الشريعة والحقيقة))، وغير ذلك.

بۆیە لە کتێبە ((تفلیس))ەکەیدا (ل ٢٨) دەڵێت:

((کاتێ کتێبی ((تلبیس إبلیس))م خوێندەوە، تەماشام کرد خراپترین هاودەمە، ڕێبەرێکە بۆ کەمکردنەوەی ڕێزی وەلیەکانی خوا (!) تانە لە بەرزی پلەوپایەیان دەدا، پاکیزەیی ڕێزو ئابڕویان لەکەدار دەکات، وا بەخەیاڵدا دێنێت کە شەیتانیان بەسەردا زاڵ بوەو، فریویان دەداو گومڕایان دەکات)) !

دەڵێم _ علي الحلبي _: بەڵام هیچ شتێك لەوانەی ڕوون نەکردۆتەوە، ڕێگایەکی نادیاری بۆ کەسانی پشکنەرو لێکۆڵەر باس کردووە، بەڵام گوفتارەکانی (ابنِ الجوزيِّ) جەختی لە سەر ئاشکراکردنی هەموو ئەو شتانە کردۆتەوە کە ئیبلیس بەکاریهێناوە بۆ سەرلێشێواندنی صوفیەکان، لە تێکڕای بوارەکانی عەقیدەو بیروباوەڕدا، وە بەڵگەگەلێکی بۆ هێناوەتەوە لە ڕووناکی ڕۆژ ڕوونترە، بەڵام (ابنُ غانم) _ کە کتێبەکەشی خوێندۆتەوە[١٦] _ تەنها نکوڵیی لەو شتانە کردووە، بەڵام... بەبێ هیچ بەڵگەیەکی ڕوون کە کەسانی ژیر پێی قایل بن !!

ئا بەو شێوە[١٧]...

هەموو ئەو کەسانەی بەرپەرچی بانگەوازخوازنی هەق دەدەنەوە، هیچ شتێکیان بەدەستەوە نییە بەدەر لە چەند وشەیەك کە بەکاریدەهێنن بۆ سەرلێشێواندن و ئاژاوە نانەوە !! بەشێوازێکی سۆزداری و، بەڕستەگەلێکی حەماسی دایدەڕێژن و، لە قاڵبێکی دەدەن کە دڵان ڕاکێش کات[١٨].

فالحمدُ للهِ وحدَهُ، سبحَانَهُ علَّام الغُيوب.

---

١٦ _ وفي ((هدية العارفين)) (١ / ٥٧١) أنَّ مِن مؤلَّفاته ((الحديث النفيس في تفليس (!) إبليس))، ولعلَّه نفسه.

١٧ _ لە گەڵ هەموو ئەوانەشدا، کتێبەکەی سوودو کەڵکی خۆی هەیە، چونکە بە شێوازێکی وتوێژی و مشتومڕیی لە گەڵ شەیتاندا کتێبەکەی نوسیوەتەوە، تیایدا فێڵ و تەڵەکەکانی شەیتان هەڵدەوەشێنێتەوەو وەڵامیان دەداتەوە.

١٨ _ كما فعل _ أخيراً _ الشيخ محمد الغزالي في كتابه ((السُّنَّة النبوية بين أهل الفقه وأهل الحديث))، وقد ردَّ عليه بعض الأفاضلِ ردوداً في الأشرطة، أو الصحف، أو في رسائل مفردة.

ولنا ردٌّ عليه بعنوان ((نظرات ونَقَدات...)) بالأشتراك مع الأخ سليم الهلالي.

# ژیاننامەی نووسەر _ بەڕەحمەتی خوا بێت _

_ ناوی (جمالُ الدین)، (أبو الفرج)، (عبدُالرحمنِ)ی کوڕی (عليٍّ) کوڕی (محمد)ی کوڕی (عليّ)، (القرشِيُّ)، (البَغْدادِيُّ) ناسراو بە (ابنِ الجوزيِّ)ە.

_ لە (دَربِ حبیب) لە بەغداد، لە ساڵی (٥١٠ کۆچی) لە دایك بووە.

_ لە گەڵ زانستدا پەروەردە کراوە، سێ یەم ساڵی بوو لە فێربوونی زانستدا کە بابی مرد، ئیتر لە باوەشی پورێکیدا _ خوشکی بابی _ پەروەردە بوو، بایەخ پێدان و چاودێریکردنێکی زیادی پێدا تا بە سەر تێکڕای هاوەڵانیدا سەرکەوتوتر بوو، هەر پوڕەکەشی بوو کە بردی بۆ مزگەوتەکەی پێشەوا (أبي الفضْلِ محمدِ)ی کوڕی (ناصرٍ) کە لە ساڵی (٥٥٠ کۆچی) مردووە، ئەویش بە شێوازێکی چاك پەروەردەی کردو، فەرموودەی فێرکرد[١٩].

بە خۆشگوزەرانی پەروەردە بوو، وەکو ئەوەی خۆی باسی دەکات.

_ پاشان لە پێناوی فێربوونی زانستدا ماندووبونێکی زۆری چەشتووە[٢٠]، وەکو ئەوەی باسی خۆی دەکات و دەڵێت:

((لە زەمەنی لاوێتیمدا چەند پارچە نانێکی وشکم دەبردو، دەچوومە دەرەوە بۆ فێربوونی فەرموودە، لە سەر ڕووباری (عیسی) دادەنیشتم و، نەمدەتوانی نانەکە بخۆم تەنها لە سەر ئاوەکە نەبێ، چ پارویەکم بخواردبا، قومێك ئاویشم بەسەریدا دەکرد، هیمەتیشم حەزی بە هیچ شتێکی تر نەبوو جگە لە چێژی فێربوونی زانست))[٢١].

_ شیخەکانی زۆرن، تا ئەو ئاستەی کاتێ کتێبی ((شێخەکانی خۆی))[٢٢] نووسی، نزیکەی نەود شێخی تێدا نووسیوە.

پێشەوا (ابنُ الجوزيِّ) دەفەرمێت:

---

١٩ _ ((صيد الخاطر)) (ص٤٤٦)، ثم ابتدأ بالتقلّل وهجر المُشْتَهى " كما قال في الموضع نفسه.

٢٠ _ باسی خۆی دەکات کەوا هێشتا خوێندکار بووە بیست هەزار موجەللەدی خوێندۆتەوە !

٢١ _ ((صيد الخاطر)) (ص٢٣٥).

٢٢ _ طبعت في دار الغرب الإسلامي، بتحقيق: محمد محفوظ.

((لە تەمەنی منداڵیمدا شێخمان (ابنُ ناصرٍ) دەیبردمە خزمەتی شێخانی تر، (العَوالِيَ) فێردەكردم، هەموو ئەو شتانەی فێری دەبووم بە دەست و خەتی خۆی بۆی دەنوسیم، لە هەموو ئەو شێخانە ئیجازەی بۆ وەردەگرتم، كاتێكیش مانای زانست فێربوون تێگەشتم، ئیتر لە شێخەكان دەچوومە خزمەتی زاناترینیان، لە (أرباب النقل)یش تێگەشتوترینیانم پەسەند دەكرد))[٢٣].

_ لە بەر ئەوەی پێشەوا (ابنِ الجوزيِّ) لە فێربوونی زانستدا بە ڕوویەكی ڕاست و دروست دەچوو و، گەورە زانایانی كات و زەمەنی خۆی هەڵدەبژارد بۆ ئەوەی لە سەر دەستیان فێر بێ، بۆیە خوێندكارانیش لە هەموو لایەكەوە ڕوویان تێدەكرد، بۆ ئەوەی لە زانستەكەی وەرگرن و فێربن.

لە خوێندكارانی: (الحافظ عبدالغنيِّ المَقْدِسيُّ)، كە لە ساڵی (٦٠٠ كۆچی) مردووە.

هەروەها كچەزاكەی (سِبْطُهُ): (یوسُفُ)ی كوڕی (قَزْ أُوْغَلي)ی[٢٤] كوڕی (عبدالله) كە لە ساڵی (٦٥٤ كۆچی) مردووە.

لە لایەن زانایانەوە پیاهەڵدان و ستایش كراوە، مێژوونوسان زۆر بە چاكی باسیان كردووە:

(ابنُ خَلِّكانَ) فەرموویەتی:

((زانای سەردەمی خۆی بوو، پێشەوای كات و زەمەنی خۆی بووە لە فەرموودەناسی و، وەعزداندا)).

(الذهبيُّ) فەرموویەتی:

((لە تەفسیرو وەعزو مێژوودا درەوشاوە بوو، زانینێكی تەواوی هەبوو لە سەر (متن)ی فەرموودەكان)).

---

٢٣ _ ((ذيل طبقات الحنابلة)) (١ / ٤٠١) لابن رجب.

٢٤ _ وقد تصحَّف في كثير من المصادر إلى ((فرغلي)) !! وهو تصحيف طريف !

پێشەوا (ابنِ الجوزيِّ) لە وەعزدانـدا زۆر بـەناوبانگ بـوو، پێـشەوا (ابـنُ كـثيرٍ)[٢٥] فەرموويەتی:

(((ابنِ الجوزيِّ) لە هونەری وەعزداندا تاك بوو کە کەسی تری پێش نەکەوتبوو، کەسی تـر لێی نەدەبردەوە، لە چۆنیەتیدا، لە شێوازیدا، لە زمان پاراویدا، لە ڕەوانبێژیدا، لە شـیرینیدا، لە خۆشی هۆنینەوەیدا، لـە گوزارشـتکاری و تێپەڕانـدنی وەعزیـدا، نقومبـوونی لـە مانـای خۆشدا، شتە نامۆکانی بە نموونەگەلێکی هەستپێکراو بۆ خەڵك نزیك دەکردەوە، ئـەوەش بـە ڕستەگەلێکی کـورتی ئـەوتۆ کـە کەسـی بەرامبـەر بـەخێرا لێـی تـێ بگـات، بـە جۆرێـك ماناگەلێکی زۆری لە وشەیەکی کەمدا کۆدەکردەوە)).

_ لە جێگیرکردنی ناو و سیفاتەکانی خوای تعالادا شلۆاو بوو، وەکو ئەوەی (ابنُ رجبٍ) لە ((الذيلِ على طبقاتِ الحنابلةِ))دا (١ / ١٤١٤) دەڵێت:

((لەو بواردا زانایان بە توندی نکۆڵیان لیّ کردووە، لە مەسـەلەی (التأويـل)یـشدا شـلۆاو بـوو، هەرچـەند بـەفراوانی فـەرموودەکانی ئـەم بەشـەی دەزانـی، بۆیـە لـە شـیکردنەوەو چارەسەرکردنی گومانی قسەناساندا کارامەو لێهاتوو نەبوو)).

بۆیە پێشەوا (الذهبـيُّ) لە کتێبی ((سير أعلام النبلاء))دا (٢١ / ٣٦٨) فەرموويەتی:

((خۆزگە لە بواری (التأويل)دا نەدوایەو، بەپێچەوانەی پێشەواکەی ڕەفتاری نەکردایە)).

خوای تعالی لێی ببورێت و، بیبەخشێت.

_ نزیکەی پێنج سەد کتێبی نووسیوە، مامۆستا (عبدالحميد العُلوجي) بەدوایدا گـەڕاوەو ژماردویەتی و لە کتێبێکدا کە لە بەغدا لە ساڵی (١٩٦٥ زاینی) چاپکراوە بڵاوی کردۆتەوە.

لەو کتێبانە زیاتر لە پەنجا کتێبی چاپکراوە[٢٦]، وەکو:

١_ ((نواسخُ القرآنِ)).

٢_ ((زاد المسيرِ في علمِ التفسيرِ)).

---

٢٥ _ ((البداية والنهاية)) (١٣ / ٢٨).

٢٦ _ انظرها في ((ذخائر التراث)) (١ / ٧٦ _ ٨٢).

٣ _ ((ذمّ الهوى)).

٤ _ تلقيح فهوم أهل الأثر)).

٥ _ ((صفةُ الصفوةِ)).

٦ _ ((صيد الخاطِر)).

٧ _ ((القُصَّاصُ والمذكّرونَ)).

٨ _ ((المِصْباحُ المضيءُ)).

٩ _ ((المُنْتَظَم في تاريخ الملوكِ والأمَم)).

١٠ _ ((الموضوعات)).

١١ _ ((العلل المتناهية في الأحاديث الواهية)).

١٢ _((نُزهة الأعين النواظر في علم الوجوه والنظائر)).

وه چەندەها كتێبى دیكەش.

_ له بەغدا شەوى هەينى (١٢ ڕەمەزانى / ٥٩٧ كۆچى) لە نێـوان مـەغريب و عيـشادا كۆچى دواى كردو، نزيك بە گۆڕى پێشەوا (أحمَد)ى كوڕى (حنبلٍ) نێژرا.

پێش مردنەكەى ئەم شيعرەى دەخوێندەوە:

يـــا كَثيرَ العَــفْوِ عَــمَّنْ ... كَثُرَ الذَّنْبُ لَــــــدَيْهِ

جـــاءَكَ المُذْنِبُ يَــرْجــو ... الصَّفْحَ عـــنْ جُرْمِ يَدَيْهِ

أنا ضَيْفٌ وجـــــــزاءُ ... الضَّيْفِ إحســـانٌ إِليهِ

خواى تعالى بەڕەحمەتێكى فراوان ڕەحمى پێ بكات و، لێى ببورێت و، بيبەخشێت.

سەرچاوەكانى ژياننامەكەى:

١ _ ((البداية والنهاية)) (١٣ / ٢٨)، ابن كثير.

٢_ ((وَفَيات الأعيان)) (٢ / ٣٢١)، ابن خَلّكان.

٣ _ ((ذيل طبقات الحنابلة)) (١ / ٣٩٩)، ابن رجب.

٤ _ ((تذكرة الحفّاظ)) (رقم ١٠٩٧)، للذهبـي.

٥ _ ((سير أعلام النبلاء)) (٢١ / ٣٦٥)، لهُ.

٦ _ ((العِبَر)) (٤ / ٢٩٧)، لهُ.

٧ _((دول الإسلام)) (٢ / ٧٩)، لهُ.

٨ _ ((المختَصَر المُحتاجُ إليهِ مِن تاريخ ابن الدُّبَيْثي)) (٢ / ٢٠٥)، للذهبي.

٩ _ ((الكامل)) (١٢ / ١٧١)، لابن الأثير.

١٠ _ ((مفتاح السعادة)) (١ / ١٠٧)، لطاش كُبرى زادة.

١١ _ ((التكملة لوفيات النَّقَلَة)) (٢ / ٢٩١)، للمُنذري.

١٢ _ ((غاية النهاية)) (١ / ٣٧٥)، لابن الجزري.

١٣ _ ((مرآة الزمان)) (٨ / ٤٨١)، لسِبْطِهِ.

١٤ _ ((مِرآة الجَنان)) (٣ / ٤٨٩)، لليافِعي.

١٥ _ ((المشيخة)) (١٤٠) للنَّعال البغدادي.

١٦ _ ((المختصر في أخبار البشر)) (٢ /١١٨)، لابن الوردي.

وغيرها كثير.

# الْمُنْتَقى النَّفيسْ

مِنْ

# تَلبِيسْ إِبْلِيسْ

للإمام إبن الجوزيِّ

المتوفي سنة (٥٩٧هـ) رحمه الله

بقلم الشيخ علي حسن عبدالحميد الاثري

وەرگێڕانی

نوری هەمەوەند

# بسم الله الرحمن الرحيم

سوپاس بۆ ئەو خوایەی کـە کێـشی دادپـەروەری بەدەسـت ژیـرو هۆشمەنـدان سـپارد. پێغەمبەرانی وەکو مژدەدەرو ترسێنەر بە پاداشت و سزا نـارد. کتێبیـشی بـۆ دابەزانـدن بـۆ ڕوونکردنەوەی ڕاست و هەڵەو دەستورەکانی شەرعیشی تەواوکرد بە بێ هیچ کەموکوڕیـەك. سپاست و ستایشی دەکەم سپاست و ستایشی کەسێك بزانێت کە خوای پەروەردگار باعیـسی هۆکارەکانە. شایەتی دەدەم بە تاکێتی پەروەردگار شایەتی کەسێکی دڵسۆز لە نێتیدا بە بـێ هیچ گومانێك. شایەتیش دەدەم کە محمد بەندەو پێغەمبـەری خوایـە ناردویـەتی بـۆ ئـەوەی کوفرو بێباوەڕی لە ڕووی باوەڕو ئیماندا لاداو بهێنێتە خوارێ. بـە نـورو ڕوونـاکی هیدایـەت تـاریکی لادات و پـەردەی ڕێگـەی ڕاسـتی حـەقی ئیـسلام هەڵداتـەوە. هەڵیشـسا بـە ڕوونکردنەوەی ئەو شەرعەی بۆیان دابەزیبوو، ئـەو کێـشانەی لـە قورئانـدا باسـکرابوو بـۆی ڕوونکردنەوەو، لە سـەر ڕێگەیـەکی ڕاسـتی ڕەوان بـە جێـی هێـشتن (وتَـرَکَهُم علـی المَحَجَّـةِ البیضـاء)[٢٧] کە نە گونج و قوڵای و نە تراوێلکەی تێدا بوو. بۆیـە دروودی بێپایـانی خـوای پەروەردگاری لە سەر بێت و لـە سـەر خـاوخێزان و هـەموو هاوەڵـانیی، هـەروەها لـە سـەر (تابعین)ێك کە بە چاکە شوێنی کەوتن تا کاتی کۆبوونەوەو حسابکردنی سەراسەری لـە ڕۆژی قیامەتدا. دروودی لێبێت درووديکی بێپایان.

پاشان، گەورەترین نیعمەتەکانی خوای پەروەردگار بۆ مرۆڤـ ئـەقڵ و ژیـری یـە، چـونکە ئەندامێکی چالاکە بۆ ناسینی خواوەند _ سبحانه و تعـالی _، ئـەو شـتەیە کـە بەهۆیـەوە بڕوایەکی تەواومان بە ڕاستگۆیی پێغەمبەران لا دروست دەبێ، بەڵام کە ئەقڵ توانادار نـەبوو هەستێت بەهەموو ئەوانـەی لـە بەنـدە داواکـراوە، بۆیـە پێغەمبـەران نێـردران و کتێبـەکان دابەزێندران.

لێرەدا دەتوانین نموونەی شەرع بچوێنین بە خۆرو، ئەقڵ و ژیریش بـچوێنین بـە چـاو، بۆیـە ئەگەر ساخ و تەواو بوو خۆرەکە دەبینێت.

---

٢٧ _ حديث: ((تركتكم على مثل البيضاء نقّيـة، ليلـها كنهارهـا، لا يزيـغ عنهـا إلا هالـك)) صـحيح، خرَّجته في ((الأربعين في الدعوة والدعاة)) (رقم ٦)، طبع دار ابن القيم، الدمام.

وە كاتێك بەلای ئەقڵ و ژیریەوە فەرمایشتی پێغەمبەرانی سەلمێنراو بە بەڵگە ئاسابەدەرەكانی بەدەر لە سروشت جێگیربوو، خۆی پێ سپاردن و، پشتیشی پێ بەستن سەبارەت بەوانەی لێی پەنهان دەبێت.

كاتێكیش خوای پەروەردگار نیعمەتی ئەقڵ و ژیری بە جیهانی مرۆڤ بەخشی، بە پێغەمبەرایەتی بابیان (آدَمْ) _ علیه السلام _ دەستپێكی كردن، كە سرووشی خوای _ عزَّوجلَّ _ی پێڕادەگەیاندن و، ئەوانیش لە سەر ڕێگەی ڕاست بوون، تاوەكو (قابیل)[٢٨] بە هەواو ئارزووەكانی تاك بویەوەو، براكەی خۆی كوشت، ئیتر هەواو ئارەزووەكان بە نێو خەڵكدا پەلیان هاوێشت و، لە بیابانی گومڕایدا دەربەدەرو تەفروتونای كردن، تا بە ئاستی پەرستنی بتەكان گەشتن، لە بیروباوەڕو كردەوەكانیشدا جیاوازیان تێكەوت بە جۆرێك تیایدا بوون بە پێچەوانەكاری پێغەمبەران و ئەقل و ژیری، چونكە شوێنی هەواو ئارەزووەكانی خۆیان كەوتن، هەواداری داب و نەریتەكانی خۆیان بوون، پەیڕەوی سەرگەورەكانیان دەكرد، بۆیە ئیبلیس گومانی خۆی لەواندا بەدیهێناو، جگە لە بڕواداران هەموویان شوێنی كەوتن [٢٩].

---

٢٨- ئەم ناوە لە ئیسرائیلیات و، لە هەندێ فەرموودەی لاوازەوە وەرگیراوە، ناوی هەردوو كوڕەكانی باوكە ئادەم لە قورئان و فەرمووده (صحیح)ەكاندا جێگیر نەبووە.

٢٩- ئاماژەیەكە بۆ ئایەتی (٢٠) سورەتی سبأ.

## * دانایی لە ناردنی پێغەمبەراندا[٣٠]:

بزانە پێغەمبەران پەیامێکیان هێناوە کە دەبێت بە مایەی پڕکردنەوەی گشت داواکاری و پێداویستیەك، ڕووبەڕووی نەخۆشیەکان بوونەوە بە چارەسەری سازگارو، ڕێکەوتن لە سەر مەنهەجێك جیاوازی تێنەکەوێت. لێرەدا شەیتان هات و پەیامەکەی تێکەڵ بە گومان کردو، چارەسەرەکەی تێکەڵ بە ژەهر کردو، ڕێگەی ڕاستی کرد بە ڕووتەنی و پڕ بە نەفامی ، بەردەوامیش یاری بە ئەقڵ و ژیریەکان کرد تاوەکو خەڵکی نەفامی جیاکردەوە بە سەر چەندین ڕێباوەڕی ناماقوڵ و، بیدعەی ناشیرینداو، هەستان بە بتپەرستن لە ماڵی خواداو، (السائبة) و (البحيرة) و (الوصيلة) و (الحام)یشیان[٣١] حەرام دەکردو, زیندەبەچاڵی کچانیشیان بە چاك دادەناو، بێبەشیشیان دەکردن لە میرات و، چەندین کردەوەی گومڕاکاری تریش کە ئیبلیس بۆی ڕازاندبوونەوەو، فریوی دابوون.

بۆیە خوای _ سبحانه و تعالى _ محمدی _ صلى الله عليه وسلم _ بۆ ناردن، کە کردەوە خراپەکانی لابردو، بەرژەوەندیە چاکەکانی داناو، هاوەڵانیش لە گەڵیداو لە پاش مردنیشی بەو نورو ڕوناکیە دەجوڵانەوە کە بۆی هاتبوو، بۆیە لە دوژمن و فرتوفێل و درۆودەلەسەو خۆهەڵکێشانەکانی سەرفەرازبوون.

بەڵام کاتێك ڕۆژی زیندەگیان ئاوابوو، ئیتر لێڵی و تاریکی داهات و، هەواو ئارەزووەکانیش ڕووی تێکردنەوەو دەستیان دایە دانانی چەندین داهێنراو. ڕێگایەکیان تەسك کردەوە کە هێشتا فراوان بوو، بۆیە زۆربەی خەڵك جیاوازیان خستە دینەکەیانەوەو بوون بە چەندەها تایفەوە, ئالێرەدا ئیبلیس هەستا بە سەرلێتێکدان و، ڕازاندنەوەو، درۆو دەلەسەی

---

٣٠ _ ئەم ناونیشانە لاوەکیانە لە کتێبی بنەڕتی (تلبيس إبليس)دا نەهاتووە، بەڵکو لە ڕاستیدا ئێمە دامانناوە بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەو نزیکردنەوە.

٣١ _ السائبة والبحيرة: بریتی بوو لە چەند جۆرە قوربانیەك کە پێشکەش بە خواوەندە تاغوت و کافرە پووچەکان دەکرا !! بۆیە نە لە ئاژەڵەکەو نە لە گۆشتەکەشی سوود نەدەبینرا، بەهۆی چەند بیروباوەڕێکی شیرکی ناپەسەندو خراپەوە !

گەرم و گوڕو، جیاوازی دروستکردن و، ئاشنایەتی دروستکردن، لە ڕاستیدا ئیبلیس بە تواناداەبێت کردەوەکانی خۆی بە پەنهانی لە شەوی نەفامیدا بە ئەنجام بگەیەنێت، بەڵام ئەگەر سپێدەی زانست بە دەرکەوت زۆر بە ئاسانی فێڵەکانی ئاشکرا دەبێت.

بۆیە بەلامەوە باش بوو هەستم بە وشیارکردنەوەی خەڵك لە پیلان و فێڵ و دەسیسەکانی، داو و نێچیرەکانیی بەدەرخەم. چونکە ناساندنی شەڕ چوارچێوەیەکە بۆ وریاکردنەوەی جەماوەری خەڵك لەو مەترسیەو نەکەوتنە نێوی. لە (الصحيحين)دا[٣٢] هاتووە: لە (حُذيْفة)ەوە _ خوای لیّ ڕازی بێت _ فەرموویەتی: ((كان الناس يسألون رسول الله _ صلى الله عليه وسلم _ عن الخير، وكنت أسأله عن الشر, مخافة أن يدركني...)) واتە ((خەڵك سەبارەت بە خەیر لە پێغەمبەری خوایان _ صلى الله عليه وسلم _ دەپرسی، بەڵام من سەبارەت بە شەڕ لێم دەپرسی، چونکە دەترسام پێم بگات ...)).

---

٣٢ _ رواه البخاري (١١/٣١)، ومسلم (١٨٤٧).

## ✸ ڕاستێتی ئاینی ئیسلام:

ئەم کتێبە دانراوە بۆ وشیارکردنەوە لە فیتنەو ئاشووبەکانی ئیبلیس، ترسێنەر لە دەردەسەری و نەهامەتیەکانی، ئاشکراکار بۆ نادیارو شاراوەکانی، دەرخەری فێڵ و گزی و تەڵەکەکانی.

خوای تعالاش بە بەخشندەی خۆی یارمەتیدەری هەر ڕاستگۆیەکە لە مەبەستەکانیدا.

ئەم کتێبەم کردووە بە سیازدە بەشەوە کە بە هەر هەموویەوە چوارچێوەی سەرلێشێواندنەکانی ئیبلیس بە دەردەکەوێت، بۆیە هەر کەسێکی زرنگ و زیرەك کاتێ تێگەشت لەو شتانەی کە باسی دەکەم، ئیتر سەرلێشێواندنەکانی ئیبلیسیی بە تەواوی بۆ ڕوون دەبێتەوە، ئەوجا ئەگەر بڕیاری دا کاری پێ بکات ئیبلیسەکەی بەتەواوی لێی بێزاردەبێت، داواکارم خوای پەروەردگار بە پێی ویستی خۆم ڕێنومایم بکات و، ڕاستێتیم پیشان بدات بۆ پێکانی ئەوەی مەبەستمە.

# بەشی یەکەم

## فەرماندان بە هەمیشە لە گەڵ بوون و پەیوەستبوون بە سوننەت و کۆمەڵی موسڵمانانەوە:

عن ابن عُمر أنَّ عمر بن الخطاب _ رضي الله عنهما _ خَطَبَ بالجابيةِ [٣٣]، فقال: قام فينا رسولُ الله _ صلى الله عليه وسلم _، فقال:

((مَن أرادَ منكُم بحبوحةَ الجنةِ " فَلْيَلْزَمِ الجماعةَ، فإنَّ الشيطانَ مع الواحدِ، وهو من الاثنين أبعدُ))[٣٤]. واتە لە (ابن عمر)ەوە فەرموویەتی: (عمر)ی کوڕی (خطاب) _ خوای لێ ڕازی بێت _ لە (الجابیة) وتارێکی خوێندەوەو فەرمووی: پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ لە نێوماندا هەستاو، فەرمووی:

((هەر کەسێکی ئێوە ئەگەر ناوەڕاستی بەهەشتی ویست، با هەمیشە لە گەڵ کۆمەڵی موسڵماناندا بێت، چونکە شەیتان لە گەڵ تاکدایەو، لە دووانیشەوە زۆر بە دوورە)).

وعن ابنِ مسعودٍ قال: خطَّ رسولُ الله _ صلى الله عليه وسلم _ خطاً بيده، ثم قال: ((هذا سبيلُ اللهِ مستقيماً)).

---

٣٣ _ ناوی شوێنێکە.

٣٤ _ أخرجه أحمد (١/٢٦)، وابن حبان (٢٢٨٢)، والطيالسي (ص٧)، وأبويَعْلى (١٤١) " من طريق عبدالملك بن عُمير عن جابر بن سمرة عن عمر مطولاً.

قلت: وفيه عنعنة عبدالملك بن عُمير، وقد توهَّم المعلق على ((مسند أبي يعلى)) أنه صرَّح بالتحديث عنده، وليس به!

وأخرجه أحمد (١/ ١٨)، والترمذي (٢١٦٦)، والحاكم (١/ ١١٢)، وابن أبي عاصم (٨٨) " من طرق عن محمد بن سوقة عن عبدالله بن دينار عن ابن عمر عن عمر به.

وسنده صحيح.

وللحديث طرقٌ أخرى لا مجال لسردها.

قال: ثم خَطَّ عن يمينهِ و شمالهِ، ثم قال:

((هذه السُّبُلُ ليس منها سبيلٌ إلا عليه شيطانٌ يدعوا إليه))

ثم قرأ: ﴿وأنَّ هذا صِراطِيْ مُسْتَقيماً فاتَّبِعوهُ ولا تَتَّبِعوا السُّبُل﴾ ﴿ الأنعام: ١٥٣﴾[٣٥].

واتە لە (ابن مسعود)ەوە فەرموويەتى: پێغەمبەرى خوا _ صلى الله عليه وسلم _ بە دەستى هێڵێكى كێشاو، پاشان فەرمووى:

((ئەمە ڕێگەى ڕاستى خوايە)).

(ابن مسعود) فەرمووى: پاشان بەلاى ڕاست و بەلاى چەپى هێڵە ڕاستەكەدا چەند هێڵێكى ترى كێشاو، فەرمووى:

((هيچ ڕێچكەيەكى ئەم ڕێچكانە نييە مەگەر شەيتانێكى بە سەرەوەيەو بانگەشەى بۆ دەكات)).

پاشان ئەم ئايەتەى خوێندەوە: ﴿وَأنَّ هذا صِراطِيْ مُسْتَقيماً﴾ واتە (فەرمانى داوە كە) بێ گومان ئەمە ڕێگاى ڕاستى منە كە ڕاست و دروستە ﴿فَاتَبِعُوهُ﴾ كەواتە شوێنى بكەون ﴿وَلا تَتَّبِعوا السُّبُل﴾ و شوێنى ڕێچكەكانى تر مەكەون[٣٦].

وعن ابن عَمرو قال: قال رسولُ الله _ صلى الله عليه وسلم _:

((ليأتينَّ على أُمَّتي كما أتى على بني إسرائيلَ، حَذْوَ النعلِ بالنعلِ، حتى إنْ كانَ منهُم مَن أتَى أُمَّه علانيةً " لكان في أُمَّتي مَن يصنَعُ ذلك، وإنَّ بني إسرائيلَ تفرَّقتْ على ثنتَيْنِ وسبعينَ مِلَّةً، وتفرَّقتْ أُمَّتي على ثلاثٍ وسبعينَ مِلَّةً " كُلُهُمْ في النَّارِ " إلا ملةً واحدةً)). _ .

قالوا: مَن هي يا رسولَ اللهِ ؟

قال: ((ما أنّا عليهِ وأصْحابي))[٣٧]

---

٣٥ _ الحديث حسن، خرجته في تعليقي على ((اتباع السنن واجتناب البدع)) (رقم ٧) للضياء المقدسي.

٣٦ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەى تەفسيرى قورئان.

٣٧ _ حديث حسن، وله طرق و شواهد، وقد تكلمت عليها في جزء مفرد عنوانه: ((كشف الغُمَّة عن حديث افتراق الأمة)).يسر الله إتمامه.

واتە لـە (ابـن عَمـرو)ەوە فەرموویـەتی: پێغەمبـەری خـوا _ صـلی الله علیـە وسـلم _ فەرمووی:

((دڵنیابن بە سەر ئومەتەکەی منیشدا دێت وەکو چۆن بە سـەر (بـني إسـرائیل)دا هـات، هەمبەری نەعل بە نەعل، تا ئەو ئاستەی ئەگـەر کەسـێکیان هـەبێت بـە ئاشـکرا لـە گـەڵ دایکیدا جووت بوبێ، ئەوا لە ئومەتەکەی منیشدا کەسانێك دەبن ئەو کارە دەکـەن، وە (بنـو إسرائیل) بە سەر حەفتاو دوو دەستەبەرەدا جیابوونەوەو، ئومەتەکەشم بە سـەر حـەفتاو سـێ دەستەبەرەدا جیادەبێتەوە، هەموویان لە ئاگردان جگە لە یەك دەستەبەرەی)).

فەرموویان: ئەوە کێ یە ئەی پێغەمبەری خوا ؟

ئەویش فەرمووی: ((ئەوەی من و هاوەڵانی منی لە سەرە)).

وروى أبوداود في ((سُننه))[٣٨] من حديث مُعاوية بن أبي سُفيان " أنَّـه قـام، فقـال: ألا إنَّ رسولَ الله _ صلى الله عليه وسلم _ قامَ فينا، فقالَ:

((ألا إنَّ مَن قبلَكُم مِن أهـلِ الكتـابِ افْتَرَقـوا علـى ثنْتَـيْنِ وسـبعينَ مِلّـةً، وإنَّ هـذه المِلَّـةَ ستفترقُ على ثلاثٍ وسبعينَ: ثنتانِ وسـبعونَ في النـارِ، وواحـدةٌ في الجنـةِ، وهـي الجماعـةُ، وإنَّـه سيخرُجُ مِن أُمَّتي أقوامٌ تَجَارَى بهِم تلكَ الأهواء كَما يَتَجَارَى الكَلَبُ بصاحِبِه)).

واتە پێشەوا (أبوداود) لە ((سُنن))ەکەیدا دەگێڕێتەوە کە (مُعاوية)ی کوڕی (أبي سُفيان)، هەستاو، فەرمووی: ئاگادارბن کە پێغەمبەری خوا_ صلی الله علیـە وسـلم _ لـە نێوانـدا هەستاو، فەرمووی:

((ئاگاداربن ئەوانەی پێشتان لە ئەهلی کیتـاب بـە سـەر حـەفتاو دوو ڕێبـازی ئاینیـداو جیابوونەوە، ئەم ئومەتەش بە سەر حەفتاو سێ دا جیادەبێتەوە: حەفتاو دوویان لـە ئـاگردان، یەکێکیشیان لە بەهەشتدایە، کە کۆمەڵی موسڵمانانە، لـە ئومەتەکەشـدا قـەومانێك پەیـدا

---

٣٨ _ انظر التعليق السابق.

دەبن هەواو ئارەزوو بە نێو جەستەیانەوە دەچێ وەکو چۆن نەخۆشی هاریی سەگ بە نێو جەستەی کەسی تووشبۆوە دەچێ.

وعن عبدالله قال: الأقتصادُ في السُّنَّةِ خيرٌ من الاجتهادِ في البدعةِ (٣٩).

واتە لە (عبدالله)ەوە فەرموویەتی: خۆبەستنەوەو تەنها کردارکردن بە سوننەت زۆر چاکترە لە کۆشش و تەقەلاکردن لە داهێنراودا.

وعن أُبَيٍّ بن كَعْب قال: عليكُم بالسبيلِ والسنةِ، فإنَّه ليس مِن عبدٍ على سبيلٍ و سُنَّةٍ ذَكَرَ الرحمنَ، ففاضتْ عيناهُ من خشيةِ الله، فتمسَّه النارُ، وإنَّ اقتصاداً في سبيلٍ و سنةٍ خيرٌ من اجتهادٍ في خلافٍ (٤٠).

واتە لە (أُبَيٍّ) کوڕی (كَعْب)ەوە فەرموویەتی: لە سەر ڕێگای ڕاست و سوننەتی پێغەمبەری خوا بن _ صلى الله عليه وسلم _، چونکە هەر بەندەیەك لە سەر ڕێگای ڕاست و سوننەتی پێغەمبەری خوا بێت _ صلى الله عليه وسلم _ و یادی (الرَّحمن) بکاتەوەو، لە ترسی خوای گەورەدا چاوەکانی فرمێسك بڕێژن، ئەوا ئاگری بەر ناکەوێت، وە خۆبەستنەوەو تەنها کردارکردن بە ڕێگای ڕاست و سوننەت زۆر خێردارترە لە کۆشش و تەقەلاکردن لە ڕێگاگەلێکی دیکەی پێچەوانەی ڕێگای ڕاست و سوننەت.

وعن عاصمٍ عن أبي العاليةِ قال: عليكُم بالأمرِ الأوَّلِ الذي كانوا عليهِ قبل أنْ يفتَرِقوا.

قال عاصِمٌ: فحدَّثتُ بهِ الحسنَ، فقال: قد نصحكَ واللهِ وصدَقَك (٤١).

واتە لە (عاصم)ەوە لە (أبي العالية)ەوە فەرموویەتی: لە سەر کارو ڕێگای ڕاستی یەکەم بن، کە پێشینان لە سەری بوون، پێش جیابوونەوەیان.

---

٣٩ _ أخرجه الدارمي (١/٧٢)، وغيره. وسنده صحيح.
وانظر تخريجه مطولاً في كتاب ((الجُنَّة في تخريج كتاب السنَّة)) (رقم ٨٨٨) لابن نصر.

٤٠ _ الأثر " أخرجه أحمد في ((الزهد)) (ص١٩٦) مطولاً بسند حسن.

٤١ _ أخرجه أبونعيم (٢/ ٢١٨) بسند جيّد.

(عاصِمٌ) فەرمووی: ئەوەم بۆ (الحسنَ) گێڕایەوەو، ئەویش فەرمووی: سوێند بە خوا ئامۆژگاری کردوویت و ڕاستیشی لە گەڵدا کردوی.

وعن سُفيانَ قال: يا يوسُفُ ! إذا بلَغَكَ عن رجلٍ بالمشرِق أنه صاحبُ سُنَّةٍ " فابْعَثْ إليهِ بالسلامِ ، وإذا بلَغَكَ عن آخَرَ بالمغربِ أنَّه صاحبُ سنَّةٍ " فابْعَثْ إليهِ بالسلامِ ، فقد قلَّ أهلُ السنةِ والجماعةِ(٤٢).

واتە لە (سُفيانَ)ەوە فەرمووی: ئەی یوسف ! ئەگەر هەواڵی پیاوێکت لە ڕۆژهەڵات پێگەشت کە شوێنکەوتووی سوننەتە، ئەوا سڵاوی بۆ بنێرە، وە ئەگەر هەواڵی پیاوێکیشت لە ڕۆژئاوا پێگەشت کە شوێنکەوتووی سوننەتە، ئەوا سڵاوی بۆ بنێرە، چونکە خەڵکانی شوێنکەوتووی سوننەت و کۆمەڵی موسڵمانان کەم بوونەتەوە.

وعن أيوبَ قال: إنَّ من سعادةِ الحَدَثِ والأعجميِّ أن يُوفِّقَهما اللهُ تعالى لعالِمٍ من أهل السنةِ(٤٣) واتە لە (أيوب)ەوە فەرموویەتی: ئەوپەڕی کامرانییە بۆ لاو و کەسانی ئەعجەمی کە خوای تعالی ڕێنموویان بکات بۆ زانایەك لە شوێنکەوتوانی سوننەت.

وعن سُفيانَ الثوريِّ قال: استوصوا بأهلِ السُّنَّةِ خيراً " فإنَّهم غُرباءُ(٤٤).

واتە یەکتر ڕاسپێرن بە ئاگالێبوون و چاودێریکردنی چاك بە خەڵکانی شوێنکەوتووی سوننەت، چونکە بێگانەن.

وعن يونُسَ بنِ عبدالأعلى قال: سمعتُ الشافعيَّ يقولُ: إذا رأيتُ رجلاً من أصحابِ الحديث" فكأنِّي رأيتُ رجلاً من أصحابِ النبيِّ _ صلى الله عليه وسلم _ (٤٥).

واتە لە (یونُس)ی کوڕی (عَبْدِالأعلى)ەوە فەرموویەتی: گوێبیستی ئیمامی (الشافعي) بووم دەیفەرموو: ئەگەر پیاوێك لە پیاوانی فەرموودەناس ببینم وەکو ئەوەیە پیاوێك لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوام _ صلى الله عليه وسلم _ بینیبێت.

---

٤٢ _ أخرجه اللالكائي (رقم ٥٠)

٤٣ _ أخرجه اللالكائي (رقم ١٠١).

٤٤ _ أخرجه أبونعيم في ((الحلية)) (٩/١٠٩)، والبيهقي في ((مناقب الشافعي)) (٤٣٧/١).

٤٥ _ أخرجه أبو نعيم (٩/ ١٠٩) بسند صحيح.

وعن الجُنَيْد قال: الطرقُ كلُّها مسدودةٌ على الخَلْقِ " إلا مَنِ اقْتَفى أثَرَ الرسولِ _ صلى الله عليه وسلم _، واتَّبَعَ سنَّتَه، ولَزِمَ طريقتَه، فإنَّ طُرُق الخيراتِ كُلَّها مفتوحةٌ عليهِ " كما قال الله عزَّوجل: ﴿ لَقَدْ كانَ لكُمْ في رَسولِ اللهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ ﴾﴿ الممتحنة: ٦ ﴾[٤٦].

واته له (الجُنَيْد)ەوه دەڵێت: هەموو ڕێگاكـان بەرامبـەر بـە خـەڵك داخـراون، جگـە لـەو كەسانەی شوێنكەوتووی پێغەمبەری خوان _ صلى الله عليه وسلم _و، شوێنی سوننەتەكانی دەكەون و، هەمیشە لە سەر ڕێگا ڕاستەكەی دەبن، چونكە هـەموو ڕێگـە خێردارەكـانی بـە سەردا كراوەتەوە، وەكو ئەوەی خوای تعـالی فەرموویـەتی: ﴿ لَقَـدْ كـانَ لَكُـمْ في رَسُـولِ اللهِ﴾ سوێند بەخوا بە ڕاستی لە پێغەمبەری خوادا _ صلى الله عليه وسلم _ بۆ ئێوە هەیە ﴿أُسوَةٌ حَسَنَةٌ﴾ سەرمەشقی و پێشەوایەتی چاك(٤٧).

---

٤٦ _ الخَبَرُ، أخرجه أبونعيم (١٠ / ٢٥٧)، والخطيب في ((الفقيه والمتفقه)) (١ / ١٥٠) بسند صحيح.

٤٧ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

# بەشی دووەم

## لە زەمکردنی بیدعەو بیدعەچیاندا

عن عائشة _ رضي الله تعالى عنها _ قالت: قال رسول الله _ صلى الله عليه وسلم _:
((مَنْ أحدَثَ في أمْرِنا ماليس فيهِ " فهُو رَدٌّ))(٤٨).

واته له دايكه (عائشة)ەوه _ خواى لىّ ڕازى بێت _ فەرموويەتى: پێغەمبەرى خوا _ صلى الله عليه وسلم _ فەرمووى: ((هەركەس لەم كارەماندا شتێك دابهێنێت و تيايدا نەبێت، نەويستراوەو بەرپەرچدراوەتەوە).

عن أنس بن مالك عن النبيّ _ صلى الله عليه وسلم _ أنّه قال:
((مَن رَغِبَ عن سُنَّتي " فليس مِنِّي))(٤٩)

واته له (أنس)ى كوڕى (مالك)ەوه لە پێغەمبەرى خواوە _ صلى الله عليه وسلم _ فەرموويەتى:

((هەركەس دەستبەردارى سوننەتەكانم بێت، لە من نييە)).

وعن عبدالرحمن بن عَمْرو السُّلَمِيّ وحُجر بن حُجْر قالا: أتينا العِرْباضَ بنَ ساريةَ _ وهو ممن نزلَ فيه: ﴿ولا عَلى الذينَ إذا ما أَتَوْكَ لِتَحْمِلَهُمْ قُلْتَ لا أَجِدُ ما أَحْمِلُكُم عليهِ﴾﴿التوبة ٩٢﴾ _، فَسَلَّمنا، وقُلنا: أتيناكَ زائرِينَ وعائِدينَ و مقتبسينَ، فقال عرباضٌ:

صلَّى بنا رسولُ اللهِ _ صلى الله عليه وسلم _ الصُّبحَ ذاتَ يومٍ، ثم أقبلَ علينا بوجهِه، فوعَظَنا موعظةً بليغةً " ذَرَفَتْ منها العيونُ، ووَجِلَتْ منها القلوبُ، فقالَ قائلٌ: يا رسولَ اللهِ ! كأنَّ هذه موعظةُ مودِّعٍ، فماذا تَعْهَدُ إلينا ؟ فقال:

---

٤٨ _ انظر تخريجه في (أتباع السنن واجتناب البدع) (رقم ٤).

٤٩ _ رواه البخاري (١١/٤)، ومسلم (١٤٠١).

((أُصيكُمْ بتقوى اللهِ، والسمعِ والطاعةِ، وإنْ عبداً حبشياً، فإنَّه مَنْ يَعِشْ بعدي " فسيرى اختلافاً كثيراً، فعليكُم بسنَّتي وسنَّةِ الخلفاءِ الراشدينَ المهديِّينَ مِن بعدي، تمسَّكوا بها، وعضُّوا عليها بالنَّواجِذ، وإيَّاكُم ومحدثات الأمورِ، فإنَّ كُلَّ محدثةٍ بدعةٌ، وكلَّ بدعةٍ ضلالةٌ))[٥٠]

واته له (عبدالرحمن)ى كورِى (عَمْرو السُّلَمي) و (حُجر)ى كورِى (حُجر)ەوە فەرموويان: چوينە خزمەتى (العِرباض)ى كورِى (سارية) _ كە يەكێك بوو لەوانەى بە هۆيەوە خواى تعالى ئەم ئايەتەى دابەزاند: ﴿ولا عَلى الذينَ﴾ وە تاوان لە سەر ئەو كەسانەش نييە ﴿إذا مَا أَتَوْكَ لِتَحْمِلَهُمْ﴾ كە هاتنە لات (ئەى محمد _ صلى الله عليه وسلم _) بۆ ئەوەى (ولاْخيان) بۆ دابين كەيت و سواريان كەيت ﴿قُلْتَ لا أَجِدُ مَا أَحْمِلُكُمْ عَليهِ﴾ گوتت ولاْخم دەست ناكەوێ سوارتان بكەم (بۆ جيهاد)(٥١)، سلاْومان كردو، گوتمان: بۆ سەردانى و ديدەنىو لێوەرگرتن هاتوينەتە خزمەتت، (عرباض)يش فەرمووى:

رِۆژێك پێغەمبەرى خوا _ صلى الله عليه وسلم _ نوێژى بەيانى بۆ كردين و، پاشان رِووى موبارەكى تێكردين و، بە ئامۆژگاريەك ئامۆژگارى كردين، چاوەكان فرمێسكيان دەرِشت و، دلْەكانيش دەترسان، بۆيە پياوێك فەرمووى: ئەى پێغەمبەرى خوا ! ئەمە لە ئامۆژگارى كەسێك دەچێت كە بيەوێت بەجێمان بێلْێت، بە چ ئامۆژگاريمان دەكەى؟ ئەوەبوو فەرمووى:

((وەسيەتتان دەكەم بە ترسان لە سزاى خواو، بەگوێكردن و ملكەچى، با كويلەيەكى حەبەشيش بێت، چونكە هەركەس دواى من بژێت، جياوازيەكى زۆر بەديدەكات، بۆيە پابەندى سونەتەكانى من و سونەتى جێنشينە رِاستگۆ رِێنموكارەكانم بن لە پاش مردنم، بە توندى دەستى پێوەگرن و، بە دانە برِەرەكانيش قەپى پێداكەن، وە هەرگيز توخنى تازە داهێنانەكان مەبنەوە، چونكە هەر تازە داهێنێك بيدعەيەو، هەموو بيدعەيەكيش گومرِايە)).

---

٥٠ _ حديث صحيح، خرّجته في ((اتباع السنن واجتناب البدع)) (رقم٢).

٥١ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەى تەفسيرى قورئان.

وعن ابن مسعود قال: قال رسولُ الله _ صلى الله عليه وسلم _:

((أنا فَرَطُكُم على الحوضِ، ولَيُخْتَلَجَنَّ رجالٌ دوني، فأقولُ: يا رَبِّ ! أصحابي. فيُقالُ: إنَّك لا تدري ما أَحْدَثوا بعدَك)).

أخرجاه في ((الصحيحين))[٥٢].

**واته له (ابن مسعود)ەوە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ فەرمووی:**

**((من بۆ سەر حەوزەكە پێشكەوتوتان دەبم، پیاوانێكیش ڕادەكێشرێن و، لە من دووردەخرێنەوە، بۆیە دەڵێم: ئەی پەروەردگارم ! هاوەڵانم. دەگوترێت: تۆ نازانی پاشی تۆ چیان داهێناوە)).**

وعن سفيان الثوريِّ قال: البدعة أَحبُّ إلى إبليسَ من المعصيةِ، المعصية يُتاب منها، والبدعة لا يُتاب منها[٥٣].

**واته له (سفيان الثوريّ)ەوە فەرموویەتی: بەلای ئیبلیسەوە بیدعە لە سەرپێچی خۆشەویسترە، چونكە سەرپێچی تەوبەی لێدەكرێت، بەڵام بیدعە تەوبەی لێ ناكرێت.**

وعن الفُضَيل قال: إذا رأيت مبتدعاً في طريقٍ " فخُذْ في طريقٍ آخرَ، ولا يُرفعُ لصاحِبِ بدعةٍ إلى الله عزَّوجلَّ عملٌ، ومَن أعانَ صاحبَ بدعةٍ " فقد أعانَ على هدمِ الإسلامِ(٥٤).

**واته له (الفُضَيل)ەوە فەرموویەتی: ئەگەر كەسێكی بیدعەچیت لە ڕێگایەكدا بەدیكرد، ئەوا بە ڕێگایەكی تردا بچۆ، وە خاوەن بیدعە هیچ كردەوەیكی بۆ لای خوای _ عزَّوجلَّ _ بەرز نابێتەوە، هەركەسیش یارمەتی خاوەن بیدعەیەك بدات، بەڕاستی یارمەتی ڕۆخاندنی ئیسلامی داوە.**

---

٥٢ _ رواه البخاري (١١/٨٠٤)، ومسلم (٢٥٩٧).

٥٣ _ رواه ابن الجَعْد في ((مسنده)) (رقم ١٨٨٥). وانظر كتابي ((الكشف الصريح عن أغلاط الصابوني في صلاة التراويح)) (رقم ٦١)، طبع دار الهجرة _ الدَّمَّام.

٥٤ _ أخرجه أبو نعيم (٨/١٠٣ _ ١٠٤).

وسمعتُ رجلاً يقولُ للفضَيْلِ: مَنْ زوَّجَ كريمَتَهُ من فاسقٍ " فقد قَطَعَ رحِمَها. فقالَ لهُ الفُضَيْلُ:ـ

من زوَّجَ كريمَتَهُ من مبتدعٍ " فقد قطعَ رحِمَها، ومَن جَلَس مع صاحبِ بدعةٍ " لم يُعْطَ الحكمَةَ، وإذا عَلِمَ الله عزَّوجلَّ من رجلٍ أنَّه مُبْغِضٌ لصاحبِ بدعةٍ " رجوتُ أن يغفرَ له سيئاته(٥٥).

قال المصنِّف:-

وقد روي بعضُ هذا الكلامِ مرفوعاً.

**واته گوێبیستی پیاوێك بووم به (الفُضَیل)ی دەفەرموو: هەركەسێك كچەكەی لە پیاوخراپێك (فاسق) مارەبكات، ئەوا ڕایەڵی خزمایەتی بچڕاندووە. (الفُضَیْل)یش پێی فەرموو:**

**هەركەس كچەكەی لە كەسێكی بیدعەچی مارەبكات، ئەوا ڕایەڵی خزمایەتی بچڕاندووەو، هەركەسیش لە گەڵ خاوەن بیدعەیەكدا دابنشێت، دانایی پێنەدراوە، ئەگەر خوای ـ عزَّوجلَّ ـ بزانێت پیاوێك ڕقی لە خاوەن بیدعەیەك دەبێتەوە، ئەوا بە هیوام لە تاوان و خراپەكاریەكانی ببورێت.**

فعن عائشة ـ رضي الله عنها ـ قالت: قال رسولُ الله ـ صلى الله عليه وسلم:

((مَن وَقَّرَ صاحبَ بدعةٍ " فقد أَعانَ على هَدْمِ الإسلامِ)) (٥٦).

**واته لە دایكە (عائشة)ەوە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا ـ صلى الله عليه وسلم ـ فەرمووی:**

**((هەركەس ڕێز لە خاوەن بیدعەیەك بگرێت، بەڕاستی یارمەتی ڕۆخاندنی ئیسلامی داوە)).**

---

**٥٥ ـ انظر ما قبله.**

**٥٦ ـ حديث حسن إن شاء الله.**

**وقد أفردت الكلام في تخريجه، وجمع طُرُقِه، والكلام عليها في جزء مفرد عنوانه ((اللمعة بحُسْنِ حديث: (مَنْ وقَّرَ صاحب بدعة)))، يسر الله إتمامه.**

## ✸ زەمكردنی بیدعەو بیدعەچیان:

ئەگەر كەسێك بڵێت: هەستای بە ستایشكردنی سوننەت و، زەمكردنی بیدعە، باشە سوننەت چی یەو، بیدعە چی یە، چونكە ئێمە تەماشا دەكەین هەر كەسێكی بیدعەچی _ بە بانگەشەی ئێمە (فِي زَعْمِنا) _ بانگەشە دەكات لە شوێنكەوتووانی سوننەتە(٥٧)؟

وەڵامەكەشی ئەوەیە: كە سوننەت لە زماندا: ڕێگایە.

گومانی تێدا نییە كە ئەهلی نەقڵ و ئەسەری شوێنكەوتووی ئاسەواری پێغەمبەری خوا _ صلی الله علیه وسلم _و، شوێنكەوتووی ئاسەواری هاوەڵانی بەڕێز، خەڵكانی بەڕاستی شوێنكەوتووی سوننەتن، چونكە لە سەر ئەو ڕێگەیەن كە هێچ شتێكی تێدا دانەهێنرا، لە ڕاستیدا سەرتاپای ڕووداو و بیدعەكان پاش پێغەمبەری خوا _ صلی الله علیه وسلم _ و هاوەڵانی بەرپابوو.

بیدعەش: بریتیە لە كردارێك كە پێشتر نەبووەو، داهێنراوە.

بەشی زۆری بیدعەكانیش بە سەرپێچی و جیاوازیەك دژ بە سوننەت دەوەستنەوەو، بە زیادەیەك یا كەم و كورتیەك شەریعەتی پێ جێبەجێ دەكرێت، بەڵام ئەگەر شتێك داهێنراو، دژبە شەریعەت نەبوو، وە شتێكی زیادیشی پێ نەخرایە سەر شەریعەت، جەماوەری زانایانی پێشین بە (كراهة)تیان دادەناو، خەڵكیشیان لە هەر داهێنراوێك دووردەخستەوە، وەكو پارێزگاریەك بۆ بنەڕەت، كە شوێنكەوتنە.

---

٥٧ _ ئەمەش _ سوێند بەخوا _ لە ئەوپەڕی سەرسوڕماندایە، بەڵام ئەگەر لێكۆڵینەوت تێدا كردو، بەووردی لە گەڵیدا دووای، قسە بێسەروبەرەكانیی و، سەرنەكەوتنی لە نیازەكانیدا بە تەواوی بۆت ئاشكرا دەبێت و، ئەگەر بە پێی تێگەیشتنی پێشین بۆ قورئان و سوننەت قسەكانیت پێوا، كرداری نابەجێ و ڕازاندنەوە پووچەكانیت لە سەر لادەچێت.

وقال: زيدُ بنُ ثابتٍ لأبي بكرو عُمر _ رضي الله عنهما _ حين قالا له: اجمع القرآن _: كيف تفعلانِ شيئاً لم يفعَلْهُ رسولُ الله _ صلى الله عليه وسلم؟(٥٨).

**واته: (زيد)ى كورِى (ثابت) به ئيمامى (أبو بكر) و (عُمر)ى فەرموو _ كاتێ به (زيد)يان فەرموو: قورئان كۆكەرەوە _: چۆن كارێك دەكەن پێغەمبەرى خوا _ صلى الله عليه وسلم _ نەيكردبێت ؟**

وعن أبي البَخْتَريِّ قال: أخبرَ رجلٌ عبدَاللهِ بن مسعود أن قوماً يجلسونَ في المسجدِ بعدَ المغربِ، فيهم رجلٌ يقولُ: كبِّروا الله كذا وكذا، وسبِّحوا الله كذا وكذا، واحمدوا الله كذا وكذا.

قال عبدُاللهِ: فإذا رأيتَهُم فعلوا ذلك " فأْتِني، فأَخْبِرني بمجلسِهم. فأتاهُم، فجلسَ، فلمَّا سمِعَ ما يقولونَ " قامَ، فأتى ابنَ مسعودٍ، فجاءَ، وكانَ رجُلاً حَديداً، فقال:

أنا عبدُاللهِ بنُ مسعودٍ، واللهِ الذي لا إلهَ غيرُه، لقد جئْتُم ببدعةٍ ظُلماً، ولقد فَضَلْتُم أصحابَ محمدٍ علماً.

فقالَ عَمْرو بن عُتْبة: أستغفر الله.

فقال: عليكُمْ بالطريقِ، فالْزموهُ، ولَئِنْ أخذتُم يميناً وشمالاً " لَتَضِلُّنَّ ضَلالاً بعيداً (٥٩).

**واته له (أبي البَخْتَريِّ)وه فەرموويەتى: پياوێك هەواڵى دايه (عبدالله)ى كورِى (مسعود) كەوا قەومێك پاش شێوان له مزگەوت دادەنيشن و، پياوێكيان تێدايه دەڵێت: (الله أكبر) بڵێن ئەوەندەو ئەوەندە، (سبحان الله) بڵێن ئەوەندەو ئەوەندە، (الحمد لله) بڵێن ئەوەندەو ئەوەندە.**

**(عبدالله) فەرمووى: هەركات بەديتكردن ئەوەيان ئەنجام دەدا، وەرە بۆ لام و، هەواڵى دانيشتنەكايانم پێراگەيەنە. پياوەكەش چووە لاى ئەو كۆمەڵەو، دانيشت، كە بيستنى چ**

---

٥٨ _ رواه البخاري (٩/٩) عن زيد مطولاً.

٥٩ _ وهو مروي بأسانيد ثابتة، وهو مخرج بالتفصيل في كتابي ((إحكام المباني في نقض وصول التهاني)) (ص٥٥ _ ٥٨).

وانظر ((اتباع السنن)) (رقم ١٠) ففيه زيادة بيان.

دەڵێن، هەستاو، چووە خزمەتی (ابـن مـسعود)، ئـەویش چـووە لایـان، (ابـن مـسعود)یـش پیاوێکی بەجەرگ و توندو بوو، ئەوەبوو فەرمووی:

من (عبداللە)ی کوڕی (مسعود)م، سوێند بەو خوایەی کە جگە لەو هیچ خوایەکی تر نییە بەهەق ، بە ستەم ئەم بیدعەیەتان هێناوەو، خۆشتان لە هاوەڵانی محمد بە زاناتر دادەنێن.

بۆیە (عَمْرو)ی کوڕی (عُتبة) فەرمووی: داواکارم خوای گەورە ببەخشێت.

(ابن مسعود)یش فەرمووی: بە ڕێگـا ڕاسـتەکەدا بـچن و، دەسـتی پێـوە بگـرن، ئەگـەر بەڕاست و چەپدا ڕۆشتن، دڵنیابن گومڕا دەبن بە گومڕایەکی دوور.

## ✸ ڕاست ڕۆشتن بە ڕێگای شوێنکەواتوانی سوننەتدا :

بۆمان ڕوونکردنەوە کە پێشینی چاك خۆیان لە هەموو بیدعەیەك دەپاراست، بـا شـتێکی ئاسایی بوایەو هیچیشی تێدا نەبووایە، بۆ ئەوەی شتێکی نوێ دانەهێنن کە پێشتر نەبوبێت.

کەچی چەندین شتی داهێنراوی نـوێ کـاری پێکـرا، کـە لـە گـەڵ شـەریعەتدا دژبەیـەك نەبوونو، زیادەیەکیشی پێ نەدەخرایە سەر شەریعەت، بۆیە کارپێکردنی ئەوانەیان بە ئاسایی دادەنا، بۆ نموونە باسکراوە کە خەڵك لە ڕەمەزاندا تاك تاك نوێژیان دەکرد، پیاو هەبوو نوێژی دەکردو، کۆمەڵێکیش بە نوێژەکەی ئەو نوێژیان دەکـرد، ئـەوەبوو ئیمـامی (عُمـر) لـە سـەر پێشەوایەتی (أُبَي) کوڕی (كَعْب) _ خوای لێ ڕازی بێـت _ کۆیکردنـەوە، کـاتێکیش چـووە دەرەوەو، تەماشای کردن، فەرمووی: ئەمە بیدعـەیەکی چـاك بـوو(٦٠)، چـونکە نوێـژی بـە کۆمەڵ ڕەوایە(٦١).

بۆیە لە ڕوانگەی ئـەوەوە کـە بۆمـان باسـکردن ڕوون دەبێتـەوە کـە ئـەهلی سـوننەت پەیڕەوکارن و، ئەهلی بیدعـەش ئاشکراکاری شتێکن پێشتر نـەبووەو، هـیچ بەڵگەیەکیـشیان بەدەستەوە نییە، بۆیە خۆیان لە پاڵ بیدعەکانیاندا شاردۆتەوە، ئەهلی سـوننەتیش ڕێبـاوەڕی ئەو تاقمەیان نەشاردۆتەوەو، دەرکاندویانەو، باسیان کردووە، بۆیە ئەهلی سـوننەت وتـەکانیان ئاشکرایەو، و ڕێباوەڕیان بەناوبانگەو، ئاکام و دەرئەنجامی چاکیش هەر بۆ ئەمان دەبێت.

عن المُغيرة بن شُعبة _ رضي الله عنه _ قال: قال رسولُ الله _ صلى الله عليه وسلم _:
((لا يزالُ ناسٌ مِن أُمَّتي ظاهرينَ حتى يأتِيَهُم أمرُ اللهِ وهُم ظاهِرونَ)).
رَوَياه في ((الصحيحين))(٦٢).

---

٦٠ _ رواه البخاري (٤/٢١٨).

٦١ _ ولزيادة التفصيل في هذه المسألة تُراجع رسالة ((المصابيح في صلاة التراويح)) للسيوطي _ بتحقيقي، وكتابي ((الكشف الصريح عن أغلاط الصابوني في صلاة التراويح)).

٦٢ _ رواه البخاري (١٣/٢٤٩)، ومسلم (١٩٢١).

وقد قالَ محمدُ بن إسماعيلَ البُخاريُّ: قال عليٌّ بنُ المُديني: هم أصحاب الحديث(٦٣).

واته له (المُغيرة)ی كوڕی (شُعبة)ەوە _ خوای لیّ ڕازی بێت_ فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا _ صلی الله علیە وسلم _ فەرمووی: ((بەردەوام كەسانێك لە ئومەتەكەم كاربە شەرعەكەی خوا دەكەن، تا ئەو كاتەی خوای تعالی دەیانمرێنێت هەر كاربە شەرعەكەی دەكەن)).

(محمد)ی كوڕی (إسماعیل البخاري) فەرموویەتی: (علي) كوڕی (المَدینی) فەرمووی: ئەو كەسانە فەرموودەناسانن.

٦٣ _ ولأخينا الفاضل سليم الهلالي رسالة ((الآلیء المنشورة بأوصاف الطائفة المنصورة))، وهي تحت الطبع.

## ✸ دابەشبوونی ئەهلی بیدعە:

عن أبي هريرةَ _رضي الله عنه_ قالَ: قالَ رسولُ اللهِ _ صلى الله عليه وسلم_:

((تفرَّقتِ اليهودُ على إحدى وسبعين فرقةً، أو اثنتينِ وسبعينَ، والنَّصارى مثلُ ذلك، وتفترقُ أُمَّتي على ثلاثٍ وسبعينَ فرقةً))(٦٤).

قال الترمذي: هذا حديثٌ صحيحٌ.

**واتە لە (أبي هريرة)ەوە _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی: پێغەمبەری خـوا _صـلى الله عليه وسلم_ فەرمووی:**

**((جولەکە بە سەر حەفتاو یەك کۆمەڵدا دابەشـبوون، یـا حـەفتاو دوو، گاورەکـانیش بـە هاوشێوەی ئەوەو، ئومەتەکەشم بە سەر حەفتاو سێ کۆمـەڵدا دابەش دەبێت)).**

**ئەم فەرموودەیەمان لە بەشی پێشوودا باس کردو، تیایدا هاتووە:**

((كلُّهم في النارِ، إلا ملَّةً واحدةً)).

**واتە ((هەموویان لە ئاگردان، جگە لە یەك کۆمەڵ)).**

قالوا: مَن هي يا رسولَ الله؟

**واتە گوتیان: ئەوە کامیانە ئەی پێغەمبەری خوا؟**

قال: ((ما أنا عليهِ وأصْحابي)).

**فەرمووی: ((ئەوەی من و هاوەڵانی منی لە سەرە)).**

**ئەگەر گوترا: ئایا ئەم کۆمەڵانە ناسراون؟**

**وەڵامەکـەی ئەوەیـە کـە ئێمـە جیابوونـەوەو، بنـەڕەتی کۆمەڵـەکان دەناسـین، هـەر تایەفەیەکیش لەم کۆمەڵانە دابەشبوون و بوون ژمارەیەك کۆمـەڵی تـرەوە، ئەگەرچـی نـاو و ڕێباوەڕی ئەم کۆمەڵانەمان بە تەواوی بۆ ڕوون نەبۆتەوە، لە بنەڕەتی ئەو کۆمەڵانـەی بۆمـان ئاشکرابووە:** (الحَروريَّة)**و،** (القَدَريَّة)**و،** (الجَهْمِيَّة)**و،** (المُرْجِئة)**و،** (الرّافضة)**و،** (الجَبْريَّة)**ن.**

---

٦٤ _ تقدم الكلام عليه.

هەندێ لە زانایان فەرموویانە: بنەڕەتی کۆمەڵە گومڕاکان ئەم شەش کۆمەڵەن و، هەر یەکێك لەو شەش کۆمەڵەش دابەشبوون و، بوون بە دوازدە کۆمەڵی ترەوە، بەو جۆرە بوون بە حەفتاوددوو کۆمەڵ (٦٥).

## ئەوەبوو (الحَروريَة)کان بوون بە دوازدە کۆمەڵەوە:

یەکەمیان (الأزرقية)ن، گوتیان: هیچ کەسێك ناناسین باوەڕدار بێت، وە خەڵکی قیبلەشیان بە کافر دانا، جگە لەو کەسانەی گوێڕایەڵی گوفتارەکانیان دەبن.

(الإباضِيَّةُ)، گوتیان: هەرکەس کوێڕایەڵی گوفتارەکانمان بێت، باوەڕدارەو، هەر کەسیش ڕووی وەرگێڕا دووڕووە(٦٦).

(الثَّعلبيَّةُ)، گوتیان: خوای تعالی نە قەزای کردوەو، نەتەقەدیر.

(الحازِميَّةُ)، گوتیان: نازانین ئیمان چی یە ؟ ، وە هەموو خەڵك بەهانەدارن (الخلق كلهم معذورون).

(الخَلَفيَّةُ)، وایان ڕادەگەیاند کە هەرکەس واز لە (جهاد) بێنێ پیاو بێت یا ژن، کافرە.

(الُمكَرمية)، گوتیان: بۆ هیچ کەسێك نییە دەستی بەر کەسێکی تر بکەوێت، چونکە نازانێت کامە پاك و کامە پیسە، پێویستە لە گەڵێشیدا نەخوات، تا تەوبە دەکات و، خۆی دەشوات.

(الكَنْزيَّةُ)، گوتیان: پێویستە هیچ کەس ماڵ و سەروەت و سامانی بە کەسێکی تر نەدات، چونکە پێدەچێت شایستەی نەبێت، بەڵکو لە زەویدا پەسەندی دەکات، تا ئەو کاتەی کەسانی شوێنکەوتووی هەق بەدەردەکەون.

---

٦٥ _ لە گێڕانەوەی ناوەکانیاندا وێکنەچوون و جیاوازی هەیە، بۆ زیاتر شارەزابوون بگەڕێرەوە بۆ: ((مقالات الأسلاميين)) للأشعري، و ((البرهان في معرفة عقائد أهل الأديان)) للسكسكي الحنبلي، وغيرهما.

٦٦ _ لەم سەردەمەشدا دەستیان دایە بڵاوکردنەوەی بیروڕاکانیان و، هەستان بە چاپکردنی کتێبەکانیانو، بەستنی چەندەها کونفرانس بۆ جێگیرکردنی کۆڵەکەکانی ڕێباوەڕیان.
با خەڵکی شوێنکەوتووی سوننەت وریایان بن.

(الـشِّمراخيةُ)، گوتيان: دەست بەركەوتنی ژنانی بێگانە هيـچی تێـدا نييـە (٦٧) چـونكە ڕێحانەن (رياحين).

(الأَخْنَسِيَّةُ)، گوتيان: لە پاش مردن هيچ شتێك بە مردوو ناگات، نەخەيرو نە شەڕ.

(المُحَكِّمية)، گوتيان: هەركەس دادپرسی لای بەديهێنراوێكی خوای گـەورە بكـات، كـافر دەبێت (من حاكم إلى مخلوق، فهو كافر).

(المعتزلةُ من الحروريَّةِ)، گوتيان: بە گومانين لە كاری (علي) و (معاويـة)، بۆيە لە هەردوو كۆمەڵەكە دوردەكەوينەوە.

(المَيْمونيَّـةُ)، گوتيـان: هـيچ پێـشەوايەك نييـە مەگـەر بـە ڕەزابـوونی لايـەنگر و خۆشەويستانمان(لا إمامَ إلا بِرِضا أهلِ محبَّتِنا).

## (القَدَرِيَّة)ش دابەشبوون و بوون بە دوازدە كۆمەڵەوە:

(الأَحْمَرِيَّـةُ): بانگەشەی ئەوەيان دەكـرد كـە مـەرجی دادپـەروەری بـۆ خـوا ئەوەيـە كـە خاوەندێتی كاروباری بەندەكان بداتە دەستی خۆيان و، ڕێگـری بكـات لـە نێـوان بەنـدەكان و سەرپێچيەكانياندا (زعمت أنَّ شرطَ العدلِ من اللهِ أن يَمَلِّكَ عبادَهُ أمورَهُم، ويحولَ بيـنهم وبـين معاصيهم).

(الثَّنوية): وايان ڕادەگەياند كە خەير لە خواوەيەو، شەڕيش لە ئيبليسەوە.

(المعتزلة): بانگەشەی ئەوەيان دەكرد كە قورئان مخلوقەو، لە بينينيش نكۆڵيان دەكرد (هم الذين قالوا بخلق القرآن، وجحدوا الرؤية).

(الكَيْـسانِيَّة): ئەوانەن كە گوتويانە: نازانين ئەم كردەوانە لە خواوەيـە يـا لـە بەندەوەيـە؟ ناشزانين پاش مردن خەڵكی پاداشت دەدرێنەوە يا سزا دەدرێن (لا ندري هذه الأفعـال مـن الله أم من العبد؟ ولا نعلم أيُثابُ الناس بعد الموت أو يعاقبون)؟

(الشَّيطانيَّة)، گوتيان: خوای گەورە شەيتانی نەخولقاندووە.

---

٦٧ _ لەم سەردەمەشدا ئەندامانی ((حزب التحريـر)) هاوشـێوايەتيان دەكـەن و، ڕێگـەيان بـەوە داوەو، لەوەش گەورەتر. لە ناميلكەيەكيشمدا بە ناوی ((المقالة الغرَّاء في حكم مصافحة النِّساء)) درێژەپێدانێكی وردی تێدايە.

(الشَّريكيَّة)، گوتيان: هەر هەموو خراپەكان بە قەدەرو چارەنووسە جگە لە، كوفر.

(الوَهميَّةُ)، گوتيـان: كـردەوەی بـەدیهێنراوانی خـوای تعـالی و گوفتاریـان زاتـی نییـە، هەروەها چاكەو خراپەش زاتی نییە (ليس لأفعال الخلقِ وكلامِهِـم ذاتٌ، ولا للحـسنَةِ والـسيئةِ ذاتٌ)

(الرَّاوَنْديَّةُ)، گوتيان: هەر كيتابێك لە لايەن خواوە دابەزێنرابێت، كردەوەپێكردنی هەقـە، (ناسخ) بێت یا (منسوخ).

(المُتَرِيَّةُ)، وایان ڕادەگەیانـد كـە هەركـەس سەرپێـچی بكـات و، پاشـان تەوبـە بكـات، تەوبەكەی قبولْ نابێت.

(الناكِثيَّة)، وایان ڕادەگەیاند كە ئەو كەسانەی پەیمان پێدانەكـەی پێغەمبـەری خوایـان _ صلى الله عليه وسلم _ شكاند، هیچ تاوانێكیان لە سـەر نییـە (زعمـوا أنَّ مـن نكـثَ بيعـةَ رسول الله _ صلى الله عليه وسلم _ فلا إثْمَ عليه).

(القاسِطِيَّة)، ویستنی دونیایان لە وازهێنان و نەویستنی بە چاكتر دانا.

(النَّظَّامِيَّـةُ)، شوێنی (إبـراهيم النَّظّـام) كـەوتن لـەو گوفتارەیـدا كـە دەڵێـت: هەركـەس بانگەشەی ئەوە بكات خوا شتێكە ، كافرە (مَن زعمَ أنَّ الله شيءٌ، فهو كافر).

## (الجهْمِيَّة)ش جیابوونەوەو بوون بە دوازدە كۆمەڵەوە:

(المُعَطِّلَةُ)، وایان ڕادەگەیاند كـە ئـەوەی خـەیاڵی (وَهَـم) مرۆڤـی بـۆ بـچێت، (مخلـوق)ە، هەركەسیش بانگەشەی ئەوە بكات كە خوا دەبینرێت ، كافرە.

(المَريسِيَّةُ)، گوتویانە: زۆربەی سیفاتی خوای تعالی (مخلوق)ە.

(المُلْتَزِمَةُ)(٦٨)، گوتویانە خوای _ سبحانه وتعالی _ لە هەموو شوێنێكدایە(٦٩).

---

٦٨ _ وفي نسخة أخرى من هذا الكتاب: ((الملتزقة)).

٦٩ _ ئەمە بیروباوەڕی زۆربەی خەڵكی ئاسای یە _ ئـەمڕۆ _ هـەروەها كەسـانێكی تایبـەتیش _ زۆر بەداخەوە _ بەڵام بیروباوەڕێكی بۆگەنە بە گەورەترین بۆگـەنی، ڕاسـتیش ئەوەیـە كـە خـوای تعـالی لـە سـەرووی ئاسمانەكانەوەیەو بەسەر بەدیهێنراوانی خۆیدا بەرزە.

وفي رسالة ((نصيحة الإخوان...)) لأبن شيخ الحَزَّامين تفصيل جيِّد فيها فلتراجع _ بتحقيقي.

(الوارِديَّةُ)، گوتویانه: هەركەس پـەروەردگاری بناسـێت ناچـێته ئـاگرەوە، هەركەسـیش بچێته ئاگرەوە، هەرگیز دەرچوونی نابێت.

(الزَّنادقةُ)، گوتویانه: بۆ هیچ كەس نییه پەروەردگارێك بۆ خۆی جـێگیر بكـات، چـونكه جێگیركردن بەدینایەت تەنها پاش ئەوەی كه هەستەكان پەی پێ دەبن و، ئەوەش هەست پەی پێ بەرێت خوا نی یەو، ئەوەش پەی پێ نەبرێت جێگیرناكرێت (لـیس لأحـد أن یثبـت لنفـسه ربا، لأن الإثبات لا یكون إلا بعد إدراك الحواس، ومایدركه الحواس فلیس بإله، ومـا لا یـدرك لا یثبت).

(الحَرْقِیَّةُ)، بانگەشەی ئەوەیان دەكرد كه كافر یەك جار ئاگر دەیسوتێنێت، پاشان به هـەتا هەتای به سوتێنراوی دەمێنێتەوەو، هەست به گەرمی ئاگرەكه ناكات.

(المَخلوقِیَّةُ)، وایان ڕادەگەیاند كه قورئان (مخلوق)ە.

(الفانیةُ)، وایان ڕادەگەیاند كـه بەهـشت و دۆزەخ نـامێنن(٧٠)، كەسـی واشـیان هـەبوو دەیگوت: هێشتا نەخولقێنراون.

(المُغیرِیَّـةُ)، دانیـان بـه پێغەمبەرانـدا نـەناوەو، گوتویانـه: لـه ڕاسـتیدا ئەوانـه تـەنها فەرمانڕەوان (حكام).

(الواقِفِیَّةُ)، گوتویانه: نەدەڵێین قورئان (مخلوق)ەو، نەشدەڵێین (مخلوق) نییه.

---

٧. _ لـه مەسـەلەی نـەمانی ئـاگردا گومـان و نـاڕوونی هەیـه، بـه ئاسـتێك وایكـردووه كەسـانێكی بانگەشەكاری زانستو خـەڵكانی شـوێنكەوتووی هـەواو ئـارەزوو بەرامبـەر بـه پێـشەوا (ابـن تیمیـه)و خوێندكارەكەی (ابن قیم) قسه بكەن و، تۆمەتی كوفرو سەلێتێكدانیان بدەنـه پـاڵ، بـەبێ خۆپاراسـتن لـه تاوانو بەبێ ترس.

(القبْريَّةُ)، نكۆڵی له سزای گۆڕو(٧١) تكاكاری دەكەن.

(اللَّفظيَّةُ)، گوتویانه: ئاخاوتنمان به قورئان خولقێنراوه (لفظُنا بالقرآنِ مخلوقٌ)(٧٢).

## (المرجئةُ)ش دابەشبوون و بوون به دوازده كۆمەڵەوه:

(التَّاركيَّةُ)، گوتویانه: خوای تعالی هیچ فەرزێكی تری له سەر بەدیهێنراوانی خـۆی نییـه جگه له بڕوابوون پێی، بۆیه هەركەس باوەڕی بەخوا بێت و بیناسێت، بـا چ ئـارەزوو دەكـات بیكات.

(السَّائبيَّةُ)، گوتویانه: خوای تعالی بەدیهێنراوانی خۆی سەربەست كردووه، بۆ ئەوەی بـه پێی ویستی خۆیان كردەوه بكەن.

(الرَّاجِيَةُ)، گوتویانه: كەسی گوێڕایەڵ به گوێڕایەڵ ناونابەین و، كەسی سەرپێچیكاریش به سەرپێچیكار ناونابەین، چونكه نازانین لای خوا ئەو كەسه چ هەیه.

(الشَّاكيَةُ)، گوتویانه: كردەوەكان بەشێك نییه ئیمان (الطاعات ليستْ من الإيمانِ).

(البَيْهَسِيَّةُ)، گوتویانه: ئیمان زانینەو، هەركەسیش نەزانیت هـەق و پووچـی و، حـەڵاڵ و حەرام لێك جیاكاتەوه، كافره.

(المَنْقوصِيَّةُ)، گوتویاته: ئیمان نه زیاد دەكات و نەكەم.

---

٧١ _ وەكو (أبي ريّة)و كەسانێكیش كه به نەزانین و نەفامی دەمكۆی له گەڵدا دەكەن !!
دڵنیابن كەسم بینیوه دەیەها لاپەڕەی ڕەش كردۆتەوەو له نامیلكەیەكدا چاپی كردووەو تیایـدا نكـۆڵی لـه سزای گۆڕ دەكات، بەڵام ئەیهو ئەیهو، هەموو قسەكانی خەیاڵێكی بۆگەنن و، تەنها گومانێكی بێبـازاڕن، بۆیه ئەگەر خوای گەوره تەمەن درێژمان بكات بەرپەرچی كتێبەكەی دەدەمەو هەڵیدەوەشێنم _ إن شاء الله _ به وەڵامێكی زانستی كه له سەر بەڵگەو سەلماندن وەستابێت نەك له سەر خەیاڵ و نكۆڵیكردن !!
بەڵام پاش نووسینەكەی سەرەوه به نزیكەی ساڵێك، هەمان نووسەرم بەدیكرد _ خوا ڕێگەی ڕاستی پیشان دات _ نامیلكەیەكی نووسیبوو سەبارەت به جێگیربوونی سزای گۆڕ !!

٧٢ _ ئەمه دەستەواژەیەكه له لایەن پێشینی چاكەوه _ رضوان الله عليهم _ نـەگوتراوه، ئەگەرچـی بـه ڕواڵەت دژكاریی تێدا بەدیناكرێت.

(المُسْتَثْنيةُ)، نكۆڵیی جگەکردنیان (الأستثناء) لە ئیماندا دەکرد.

(المُشَبِّهَةُ)، دەڵێن: خوا چاوێکی هەیە وەکو چاوی من و، دەستێکیشی هەیە و کو دەستی من.

(الحَشَويَّةُ)، یەك حوکمیان بۆ هەموو فەرموودەکان داناوە، بۆیە بەلایانەوە وازلێهێنەری سوننەتەکان وەکو وازلێهێنەری فەرزەکانە (جعلوا حكم الأحاديث كلها واحداً، فعندهم أنَّ تارك النفلِ كتارك الفرضِ).

(الظَّاهريَّةُ)، ئەمانە نکۆڵی لە (قیاس) دەکەن (٧٣).

(البِدْعِيَّةُ)، یەکەم کەسانێك بوون کە داهێنراویان لەم ئومەتەدا بەدیهێنا.

## (الرَّافضةُ)ش دابەشبوون و بوون بە دوازدە کۆمەڵەوە:

(العَلَويَّةُ)، گوتویانە: پەیامەکە بۆ (علی) بوو، بەڵام (جبریلَ) بەهەڵەدا چوو.

(الأمْريَّةُ)، گوتویانە: (علی) هاوبەشی (محمد)ە _ صلی الله علیه وسلم _ لە پەیامەکەیدا.

(الشِّيعةُ)، گوتویانە: (علی) _ خوای لێ ڕازی بێت _ ڕاسپێراو جێنشینی پێغەمبەری خوایە _ صلی الله علیه وسلم _ لە پاشیداو، ئومەتیش کە گفتیان دایە یەکێکی تر کوفریان کرد.

(الإسحاقيَّةُ)، گوتویانە: پێغەمبەرایەتی هەمیشە یەك لە دوای یەکە تا ڕۆژی قیامەت و، هەرکەسێکیش زانستی (أهل البيت) بزانێت، پێغەمبەرە.

(النَّاووسيَّةُ)، گوتویانە: (علي) چاکترینی ئەم ئومەتەیەو، هەرکەس یەکێکی تر لەو بە چاکتر دابنێت، کوفری کردووە.

---

٧٣ _ دانانیان لە کۆمەڵی (المرجئة)دا، بەهۆی ئەو خەسڵەتەوە، پێویستی بە تێڕوانینی زۆرتر هەیە، ڕاستیش _ إن شاء الله _ پێچەوانەی ئەوەیەو، لە شوێنکەوتووانی سوننەتن، بەڵام لە هەندێ (جزئيات)دا بەهەڵەدا چوون. وانظر ترجمة مؤسس المذهب: أبوداود الظاهري من ((سير أعلام النبلاء)) (٩٧/١٣). وكذا ترجمة حامل لوائه ورافع رايته: ابن حزم الأندلسي. من ((السير)) (١٨٤/١٨) أيضاً.

(الإماميَّةُ)، گوتویانە: ئەم دونیایە بەبێ پێشەوایەك لە نەوەی (حسین) نابێت و، (جبرائیل) پێشەواکە دەناسێت، بۆیە ئەگەر پێشەواکە مرد، یەکێکی تر وەکو خۆی لە جێگەی دادەنێت.

(الیزیدِیَّةُ)، گوتویانە: کوڕانی (حسین) هەرهەموویان پێشەوان لە نوێژەکاندا، بۆیە هەرکات یەکێکیان بەدیکرا، نوێژی پشتی هیچ کەسێکی تر شیاو نابێت، چاك و خراپیان.

(العبَّاسیَّةُ)، بانگەشەی ئەوەیان دەکرد کە (عباس) لە هەموو کەس شایستەترە بە جێنشینی.

(المُتناسِخَةُ)، گوتویانە: گیانەکان دەگوێزرێتەوە لە لەشی کەسێکەوە بۆ لەشی یەکێکی تر، بۆیە ئەگەر چاکەکاربوو، گیانی دەردەچێت و، دەچێتە لەشی یەکێکەوە بە ژیانی ئەو لەشە بەختیار دەبێت و، ئەگەر خراپەکاریش بوو، گیانی دەردەچێت و دەچێتە لەشی بەدیهێنراوێکی خواوە بە ژیانی ئەو لەشە بەدبەخت دەبێت.

(الرَّجْعِیَّةُ)، وایان ڕادەگەیاند کە (علی)و هاوەڵانی بۆ دونیا دەگەڕێنەوەو، تۆڵە لە دوژمنەکانیان دەکەنەوە.

(اللاعنیَّةُ)، ئەوانەن کە نەفرین لە (عثمان) و، (طلحة)و، (الزُّبیر)و، (معاویة)و، (أباموسی)و، (عائشة)و، کەسانی تریش دەکەن _ خوایان لێ ڕازی بێت _.

(المُتربِّصهُ)، خۆیان بە جل و بەرگ و سەروسیمای خواپەرستانەوە دەچواند، لە هەموو سەردەمێکدا پیاوێکیان دادەمەزراند کە کاروباریان بۆ ئەو دەگەڕاندەوە، وایان ڕادەگەیاند کە (مهدي) ئەم ئومەتەیەو، ئەگەر بمردایە، پیاوێکی تریان دادەمەزراند.

## (الجَبْریَةْ)ش دابەشبوون و بوون بە دوازدە کۆمەڵەوە:

(المُضْطَرِبَةُ)، گوتویانە: ئادەمی هیچ کردەوەیەکی نییە، بەڵکو خوای _ عَزَّوجَلَّ _ هەر هەمووی دەکات (لا فعل للآدمي، بل الله _ عَزَّوجَلَّ _ یفعلُ الکُلِّ).

(الأفعالیـةُ)، گوتویانە: کردەوەمان هەیە، بەڵام دەستەڵاتمان بەسەریدا ناشکێت، لە ڕاستیدا ئێمە وەکو ئاژەڵێن، بە حەبل لێمان دەخوڕن.

(المَفروغيَّةُ)، گوتيان: هەر هەموو شتەكان بەديهێنران و، ئيستاش هيچ بەديناهێنرێت.

(النَّجَّاريَّةُ)، وايان ڕادەگەياند كە خوای گەورە سزای بەندەكانی دەدات لە سەر كردەوەكانی خۆی، نەك لە سەر كردەوەكانی خۆيان (زعمت أنَّ الله يعذب الناس على فعلهِ، لا على فعلهم).

(المَنَانيَّةُ)، گوتيان: پەيوەنديت بەوەوە هەبێ كە بە دڵتداو دێ و، ئەوە ئەنجام بدە كە چاوەڕوانی خەيری لێدەكەيت.

(الكَسْبيَّةُ)، گوتيان: بەندە نە پاداشت بەدەست دەهێنێت و نەسزا .

(السَّابقيَّةُ)، گوتيان: ئەو كەسەی ئارەزووی لێ يە با كردەوەی چاك بكات، ئەو كەسەش ئارەزووی لێ نيە با كارنەكات، چونكە كەسی بەختيار تاوانەكانی زيانی پێ ناگەيەنێت و، بەدبەختيش چاكەكانی سوودی پێ ناگەيەنێت.

(المُحبيَّةُ)، گوتيان: هەركەس كاسی خۆشەويستی خوای _ عَزَّوجلَّ _ بنۆشێت، هەمو پايەكانی ترو ئەنجامدانيان لە سەری دەكەوێت.

(الخوفيَّةُ)، گوتيان: هەركەس خوای تعالای خۆشويست، ئەوا ترسی لێ نابێت، چونكە خوشەويست لە خۆشەويستەكەی ناترسێت.

(الحَسِّيَّةُ)، گوتيان: دونيا لە نێوان بەندەكاندا يەكسانە، هيچ بە سەردابوونێكيان (تفاضل) لە نێواندا نييە سەبارەت بەوەی كە باوكە ئادەم بە ميرات بۆی بەجێهێشتوون (الدنيا بين العباد سواء، لا تفاضل بينهم فيما وَرَّثَهُم أبوهُم آدمُ).

(المَعيَّةُ)، گوتيان: كردەوە لە ئێمەوەيەو تواناشمان هەيە (مَنَّا الفعلُ ولنا الأستطاعةُ)(٧٤).

٧٤ _ يُنظر تفصيل القولِ حول هذه الفرق في كتاب ((الملل والنِّحل)) للشهرستاني، و ((الفِصَل)) لأبن حزم، و ((الأعتصام)) للشاطبي، وغيرهما.

# بەشی سێیەم

# سەبارەت بە وریاکردنەوە لە ئاژاوەکانی ئیبلیس و پیلانەکانی

بزانە ئادەمی کە دروستکرا، حەزو ئارەزووکانیشی تێدا پێکهێنرا، بە هۆیەوە چ لە سوودمەندیدایە بۆی ئامادە دەکرێت، تووڕەبوونیشی تێدا پێکهێنرا، بە هۆیەوە چ لە زیانمەندیدایە لێی دووردەخرێتەوە، ئەقڵ و ژیریشی پێدرا وەکو ئەدەبدەرێك ، بۆ ئەوەی فەرمانی دادپەروەری پێبکات لە هەردوو لایەنەکەی سەرەوە کە بۆی ئامادە دەکرێت و، لێی دووردەخرێتەوە. شەیتانیش دروستکرا وەکو هاندەرێك، بۆ ئەوەی هانیان بات کە زێدەڕۆیی بکەن، لە هەردوو لایەنەکەی سەرووەدا کە بۆی ئامادەدەکرێت و لێی دووردەخرێتەوە، بۆیە پێویستە کەسی ئاقڵ و ژیر وریایی خۆی بکات لەو دوژمنەی کە دوژمنایەتی خۆی ئاشکرا کردووە لە زەمەنی باوکە ئادەمەوە _ علیه الصلاة والسلام _، کە هەموو تەمەنی خۆی بەکارهێناوە بۆ خراپکردنی بارودۆخی نەوەی ئادەم.

**خوای تعالی فەرمانی داوە بە وریابوونەوە لەو دوژمنە:**

خوای تعالی فەرموویەتی: ﴿ولا تَتَّبِعوا خُطُواتِ الشَّيْطانِ إنَّهُ لكُم عَدُوٌّ مبينٌ. إنَّما يـأمُرُكُمْ بِالسُّوءِ والفَحْشاءِ وأنْ تقولوا على اللهِ ما لا تَعْلَمونَ﴾﴿ البقرة: ١٦٨ ﴾.

واتە ﴿ولا تَتَّبِعوا خُطُواتِ الشَّيْطانِ﴾ وەدوای هەنگاوەکانی شەیتان مەکەون ﴿إنَّـهُ لَكُم عَدُوٌّ مـبينٌ﴾ بەڕاستی شەیتان دوژمنێکی ئاشکراتانە ﴿إنَّمـا يَـأمُرُكُم﴾ بەڕاستی (شەیتان) فەرمانتان پێدەکات ﴿بِالسوءِ﴾ بەتاوان ﴿والفَحْشآءِ﴾ وخراپە ﴿وأنْ تقولوا﴾ لە گەڵ هەڵبەستنی شتی وا ﴿على اللهِ﴾ بەدەم خواوە ﴿ما لا تعلمونَ﴾ کە نازانن (٧٥)

---

٧٥ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

وقال تعالى: ﴿الشَّيْطانُ يَعِدُكُمُ الفقْرَ وَيأمُرُكُمْ بالفَحْشاءِ﴾﴿ البقرة: ٢٦٨ ﴾.

واته ﴿الشَيْطانَ يَعِدُكُمُ الفقْرَ﴾ شەيتان دەتان ترسێنێ به هەژارى ﴿وَيأمُرُكُم بالفَحْشاء﴾ وەفەرمانتان پێدەدات به خراپه (٧٦).

وقال تعالى: ﴿ويُرِيدُ الشَّيْطانُ أنْ يُضِلَّهُم ضَلالاً بَعيداً﴾﴿ النساء: ٦٠ ﴾.

واته ﴿ويُرِيدُ الشَّيْطانُ﴾ وەشەيتان دەيەوێت ﴿أنْ يُضِلَّهُم﴾ كه گومڕايان بكات ﴿ضَلالا بَعيداً﴾ به گومڕايەكى دوور له ڕاستى (٧٧).

قال تعالى: ﴿إنَّما يُريدُ الشَّيطانُ أنْ يوقعَ بيْنَكُمُ العداوةَ والبَغْضاءَ في الخَمْرِ والمَيْسرِ وَيَصُدَّكُمْ عنْ ذِكْرِ اللهِ وعَنِ الصَّلاةِ فهَلْ أنْتُم مُنْتَهونَ﴾﴿المائدة: ٩١ ﴾.

واته ﴿إنَّما يُريدُ الشَّيطانُ﴾ بێ گومان شەيتان هەر ئەوەی دەوێ ﴿أنْ يوقعَ بَيْنَكُمُ العداوةَ والبَغْضاءَ﴾ كه دوژمنايەتى وكينەو ڕق بخاته نێوتانەوە ﴿في الخَمْرِ والمَيْسرِ﴾ به هۆى ئارق و قومارەوە ﴿وَيَصُدَّكُمْ عَنْ ذِكْرِ اللهِ وعَنِ الصَّلاةِ﴾ وە بەرگريتان بكات له يادو باسى خواو له نوێژكردن ﴿فَهَل أنْتُمْ مُنْتَهونَ﴾ دەى ئا ئێوه واز دەهێنن (لەو خراپانە)(٧٨).

وقال تعالى: ﴿إنَّهُ عَدُوٌّ مُضِلٌّ مُبِينٌ﴾ ﴿القصص: ١٥﴾. واته بەڕاستى ئەو (شەيتان) دوژمنێكى گومڕاكەرى ڕوون و ئاشكرايه(٧٩).

وقال: ﴿إنَّ الشَّيطانَ لكُمْ عَدُوٌّ فاتَّخِذوهُ عدُوّاً إنَّما يَدْعو حِزْبَهُ لِيكونوا مِن أصْحابِ السَّعيرِ﴾ ( الفاطر: ٦). واته ﴿إنَّ الشَّيطانَ لكُمْ عَدُوٌّ﴾ بەڕاستى شەيتان دوژمنى ئێوەيە ﴿فاتَّخِذوهُ عدُوّاً﴾ دەى كەواته ئێوەش بە دوژمنى خۆتانى دابنێن ﴿إنَّما يَدْعوا حِزْبَهُ﴾ بێگومان ئەو (شەيتان) تاقم و كۆمەڵەكەى بانگ دەكات ﴿لِيَكُونُوا مِنْ أصْحَابِ السَّعِيرِ﴾ بۆ ئەوەى ببنە هاوەڵانى ئاگرى هەڵگيرساوى (دۆزەخ) (٨٠).

---

٧٦ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەى تەفسیرى قورئان.

٧٧ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەى تەفسیرى قورئان.

٧٨ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەى تەفسیرى قورئان.

٧٩ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەى تەفسیرى قورئان.

٨٠ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەى تەفسیرى قورئان.

وقال تعالى: ﴿ولا يَغُرَّنَكُمْ باللهِ الغَرورُ﴾ ﴿لقمان: ٣٣﴾.واتە با شەيتانى فريودەر بە (بيانووى بەزەيى و لىٚ بووردنى) خوا نەتان خەڵەتێنێ (٨١).

وقال تعالى: ﴿ألَمْ أعْهَدْ إليكُمْ يا بَنِي آدَمَ أن لا تَعْبُدوا الشَّيْطانَ إنَّهُ لكُمْ عَدُوٌّ مُبينٌ﴾ ﴿يس: ٦٠﴾.

واتە ﴿ألَمْ أعْهَدْ إليكُمْ يا بني آدَمَ﴾ ئەى نەوەكانى ئادەم ئايا وەسێتم بۆ نەكردن ﴿أنْ لا تَعبُدوا الشَّيْطانَ﴾ كە شەيتان نەپەرستن ﴿إنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُبينٌ﴾ چونكە بەڕاستى شەيتان دوژمنى ئاشكراى ئێوەيە (٨٢).

لە قورئاندا گەلىٚ نموونەى تريش بەم شێوە هەن.

---

٨١ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەى تەفسيرى قورئان.

٨٢ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەى تەفسيرى قورئان.

## ✷ وریاکردنەوە لە ئاژاوەو پیلانەکانی ئیبلیس:

پێویستە بزانیت ئیبلیس کە بە سەرلێشێواندنی خەڵکەوە سەرقاڵ بوو، خۆی یەکەم کـەس بوو کارەکانی لێشێواو، لە دەقی ئاشکرای فەرمانکار بە سجوود ڕووی وەرگێڕاو، دەستی کرد بە پتر هەبوونی چاکە (یُفاضِلُ) لە نێوان بناغەو بنەماکاندا، ئەوەبوو گـوتی: ﴿خَلَقْـتنِي مِـنْ نارٍ وخَلَقْتَهُ مِنْ طِينٍ﴾ ﴿ص: ٧٦﴾. واتە چونکە منت لە ئاگر دروست کردووە بـەڵام ئـەو لـە قوڕ(٨٣).

پاشان لە خوای داناو تەگبیرکار دەستی بە ڕەخنەگرتن کردو، گوتی: ﴿أرَأيْتَـكَ هـذا الـذي كَرَّمتَ عَلَيَّ﴾ ﴿الإسـراء: ٦٢ ﴾. واتە: هەواڵم بدەرێ بۆ ڕێزی ئەمەت بەسەر مندا داوە؟(٨٤) ئەو ڕەخنەگرتنە فریویدا تـا بـە خـوای پـەروەردگار بڵێـت ئـەوەی کردووتـە هـیچ دانایـەك نانوێنێێت، پاش ئەوەش بەفیزو خۆ گەورەنواندنەوە گوتی: ﴿ أنا خَيْرٌ مِنْهُ ﴾ ﴿ص: ٧٦﴾.

واتە: (شەیتان) گوتی من لەو (ئادەم) چاکترم (٨٥). ئەوەبوو سجوودی نـەبرد، بۆیـە ئـەو نەفسەی خۆی کە بە نیازبوو گـەورەیی پێبەخـشێت بـە نـەفرین و سـزای خـوای پـەروەردگار سووكو ڕیسوای کرد.

بۆیە هەرکات شەیتان مرۆڤی فریوداو بۆی ڕازاندەوە کارێکی خراپە ئەنجام بات ، پێویستە بەو پەڕی وریابوونەوە ئاگاداری خۆی بێت، ئەو کاتەی کە شەیتان فەرمانی ئەنجامدانی کـارە خراپە بەمرۆڤ دەدات با بڵێت: لەڕاستیدا کـە فـەرمانی کـارە خراپەکـەم پێـدەدەیت، تـەنها بـەنیازی ئامۆژگـاریم بکـەی کـە چـۆن بەهـەواو ئـارەزوواتم بگـەم ، باشـە چـۆن ڕاسـتێتی ئامۆژگاریکردنی کەسێکی وەکو تۆم بۆ ڕوون بێتـەوە، ئەگـەر تـۆ توانـای ئامۆژگـاریکردنی نەفسی خۆتت نەبێ ؟ پاشان چۆن بڕوام بە ئامۆژگاری کەسێکی دوژمن هـەبێت ؟ بۆیـە لـێم دووربەرەوە، چونکە قسەکانت لە مندا هیچ ڕێڕەوێکی نییە.

---

٨٣ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

٨٤ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

٨٥ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

لێرەدا هیچ شتێك بەدەستی شەیتانەوە نامێنێت، بۆیە لە نەفسەکان داوای یارمەتی دەکات بۆ ئەوەی بەچاکی فریویان بات کە شوێنی هەواو ئارەزواتیان بکەون، ئیتر با مرۆڤەکان ئەقڵ وژیری خۆیان ئامادەی خانەی بیرکردنەوە بکەن دەربارەی ئەنجام وعاقیبەتی تاوان، کە پێدەچێت یارمەتیەکی سەرکەوتن سەربازەکانی ئیرادەو خواست بنێرێت و، سوپای هەواو ئارەزوو بشکێنێت.

عن عِياض بنِ حِمَارٍ قالَ: قالَ رسولُ الله _ صلى الله عليه وسلم _:

((يا أيُّها الناسُ ! إنَّ الله تعالى أمَرَني أن أُعَلِّمكُم ما جَهِلْتُم مِّمَّا علَّمني في يومي هذا: إنَّ كُلَّ مالٍ نَحَلْتُه عَبْدي فهو لهُ حلالٌ، وإنِّي خلقتُ عبادي حُنفاءَ كُلَّهُم، فأتَتْهُم الشياطينُ، فاجْتالَتْهُم عن دينِهم، وأمَرْتُهُم أن لا يُشْرِكوا بي ما لَم أُنَزِّلْ بهِ سُلطاناً، وإنَّ الله تعالى نظَرَ إلى أهلِ الأرضِ، فمَقَتَهُم " عَرَبهم وعجَمَهُم، إلا بَقايا مِن أهلِ الكتابِ...))(٨٦).

واتە لە (عِیاض)ی کوڕی (حِمَار)ەوە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ فەرمووی: ((ئەی خەڵکینە ! خوای تعالی فەرمانی پێکردووم ئەوەی کە نایزانن فێرتان بکەم دەربارەی ئەو شتانەی لەم ڕۆژەدا فێری کردووم: هەرماڵ و سامانێك بە بەندەی خۆمم بەخشیبێت حەڵاڵی بێت، من هەموو بەندەکانی خۆمم بە باوەڕڕاستی و شوێنکەوتووی و موسڵمان دروستکردووە، کەچی شەیتانەکانیان بۆ هاتن و، لە ئاینەکەی خۆیانیان لادان، فەرمانیشم پێکردن هیچ هاوەڵێکم بۆ پەیدا نەکەن بێ ئەوەی هیچ بەڵگەیەکم لە سەر دانەبەزاندبێت، خوای تعالی تەماشای دانیشتوانی سەر زەمینی کردو، هەموویانی لا بێزرا چ عەرەب و چ عەجەم، جگە لە کەمێکی خاوەن کیتاب...)).

وعن جابر بن عبدِاللهِ _ رضي الله عنهما _ قالَ: قالَ رسولُ اللهِ _ صلى الله عليه وسلم_:

((إنَّ إبليسَ يضعُ عرشَهُ على الماءِ، ثم يبعثُ سراياهُ، فأدناهُم منه منزلةً أعظمُهم فتنةً، يجيءُ أحدُهم، فيقولُ: فعلتُ كذا وكذا. فيقولُ: ما صنعتَ شيئاً. قالَ: ثم يجيءُ أحدُهم، فيقولُ:

---

٨٦ _ رواه مسلم (٢٨٦٥) عنه.

ما تركتُه حتى فرَّقتُ بينَـه وبـينَ امرأتِـه. قـالَ: فيدْنيـهِ منـهُ. أو قـالَ: فيلتزمُـهُ، ويقـولُ: نعـمْ أنتَ))(٨٧).

واته له (جابر)ی کوڕی (عبدالله)ەوه _خوا له خۆی و بابیشی ڕازی بێت _ فەرموویـەتی: پێغەمبەری خوا _ صلی الله علیه وسلم _ فەرمووی: ((ئیبلیس عەرشی خۆی له سـەر ئـاو دادەنێت، پاشان مـەفرەزەکانی بـە هـەموو لایەکـدا دەنێرێـت، پلەوپایـەدارترینیان بـەلای شەیتانەوە گەورەترینیانە له ئاژاوەگێڕیدا، یـەکێکیان کـە دێتـەوە بـۆ لای دەڵێـت: ئاوەهـاو ئاوەهام کرد. ئەویش دەڵێت: هیچت نەکردووە. دەڵێت: پاشان یەکێکی تریان دێت و، دەڵێت: پیاوەکەم بە جێنەهێڵا تا جیابوونەوەم خستە نێوان خۆی و خێزانەکەیـەوە. دەڵێـت: بۆیـە لـە خۆی نزیکی دەکاتەوە. یا دەڵێت: دەستی له مل دەکات و دەڵێت: تۆ چەند چاکی)).

وعن جابر _ رضي الله عنه _ أنَّ النبـيّ _ صلى الله عليه وسلم _ قال:

((إنَّ إبليسَ قد يئسَ أن يعبُدَه المُصَلُّونَ، ولكن في التحريش بينَهُم))(٨٨).

واته له (جابر)ەوه _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی: پێغەمبەری خـوا _ صـلی الله علیه وسلم _ فەرموویەتی: ((ئیلیس نائومێـد بـووه نوێژخوێنـەکان گوێڕایـەڵی بـن، بـەڵام ئاژاوەیان له نێواندا دەگێڕێت)).

وه ئاژاوەو پیلانـەکانی شـەیتان زۆرن، لـەم بـارەوه لـە دووتـوێی ئـەم کتێبـەدا چـەندین نموونەمان هێناوەتەوە کە گونجاوی هەر جێگەیەکی کتێبەکەن _ إن شاء الله تعالى _.

وه لەبەر زۆری ئاژاوەکانی شەیتان و، هەستانی بە گرتنی دەستەو داوێنـی دڵـەکان، بۆیـە بێوەیی قورس و گرانە، چونکە ئیبلیس کە کاری هاندانی سروشتی مرۆڤـە بـۆ شـوێنکەوتنی ئارەزووەکان، لە ڕاستیدا وەکو ڕێڕەوی کەشتیەکی لیژبۆوەی لێدێت، کە بە خێرای بـەرەوخوار دەبێتەوە.

---

٨٧ _ رواه مسلم (٢٨١٣) عنه.

٨٨ _ رواه مسلم (١٨١٢) عنه.

# ✸ پيْرِاگەياندنى خەڵك بەوەى هەموو مرۆڤێك شەيتانێكى لە گەڵدايە:

عن عائشة زوج النبـيّ _ صلى الله عليه وسلم _ أن رسولَ اللهِ _ صلى الله عليه وسلم _ خرجَ مِن عندِها ليلاً " قالت: فغِرْتُ عليهِ، فجاءَ، فرأى ما أصنعُ، فقالَ:

((ما لَكِ يا عائِشةُ ؟ أغِرْتِ ؟)).

فقلتُ: وما لي لا يغارُ مِثْلي على مِثلك ؟

فقالَ: ((أوَ قدْ جاءَك شيطانُكِ ؟)).

قالت: يا رسولَ اللهِ ! أوَ معيَ شيطانٌ ؟!

قالَ: ((نعم)).

قلتُ: ومع كُلِّ إنسانٍ ؟

قالَ: ((نعم)).

قلتُ: ومعكَ يا رسولَ اللهِ ؟!

قالَ: ((نعم، ولكنَّ ربِّي عزَّوجلَّ أعانَني عليهِ، حتى أسلَمَ))(٨٩).

**واته لە خاتوو (عائشة)ى خێزانى پێغەمبەرەوە _ صلى الله عليه وسلم _ فەرموويەتى: پێغەمبەرى خوا _ صلى الله عليه وسلم _ شەوێك لاى من بوو، پاشان چووە دەرەوە، خاتوو (عائشة) فەرمووى: ڕەشكم پێبرد (فغرت)و، پێغەمبەرى خوا _ صلى الله عليه وسلم _ كە هاتەوە، منى بينى چ دەكەم، فەرمووى:**

**(((عائشة) چيتە ؟ ڕەشكێتيت پێبردم ؟)).**

**گوتم: كەسێكى وەكو من چۆن ڕەشكێتى بە كەسێكى وەكو تۆ نابات ؟**

**فەرمووى: ((ئايا شەيتانەكەت هاتووە بۆ لات ؟)).**

**گوتم: ئەى پێغەمبەرى خوا ! ئايا شەيتانم لە گەڵدايە ؟!**

---

٨٩ _ رواه مسلم (٢٨١٥).

فەرمووی: ((بەڵێ)).

گوتم: هەموو مرۆڤێك شەیتانی لە گەڵدایە ؟

فەرمووی: ((بەڵێ)).

گوتم: تۆش شەیتانت لە گەڵدایە ئەی پێغەمبەری خوا ؟!

فەرمووی: ((بەڵێ، بەڵام خوا یارمەتی داوم و شەیتانەكەم موسڵمان بووە)).

پێشەوا (الخطابي) فەرموویەتی: هەموو ئەو پیاوانەی فەرموودەكە دەگێڕنەوە دەڵێن: ((فأسْلَمَ)) واتە شەیتانەكەم موسڵمان بوو، بە شێوازی كاری ڕابردووی زمانی عەرەبی، جگە لە (سُفیان)ی كوڕی (عُیَینة) كە دەڵێت: ((فأسْلَمُ)) واتە سەرفەراز دەبم، مەبەستی: لە شەڕی شەیتانەكەیە، دەشیفەرموو: شەیتان موسڵمان نابێت.

شێخ فەرموویەتی: گوفتارەكانی (ابن عُیَینة) چاكە، چونكە ئاسەواری تێكۆشانی مرۆڤ بەدەردەخات بۆ دژایەتی و سەرپێچیكردنی شەیتان، بەڵام فەرموودەكەی (ابن مسعود) دەڵێی گوفتارەكانی (ابن عُیَینة) بەرپەرچدەداتەوە، بڕوانە فەرموودەكەی (ابن مسعود):

عن ابن مسعودٍ يرفعُهُ:

((ما مِنكُم مِن أحدٍ إلا وقد وُكِّلَ بِهِ قرينهُ من الجِنِّ وقرينُه من الملائكةِ)).

قالوا: وإيَّاكَ يا رسولَ اللهِ ؟!

قال: ((وإيَّايَ، ولكنَّ اللهَ عزَّوجلَّ أعانَني عليهِ، فلا يأمُرُني إلا بحقّ)).

وفي رواية: ((فلا يأمُرُني إلا بخيرٍ)).

واتە لە (ابن مسعود)ەوە ـ خوای لێ ڕازی بێت ـ فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا ـ صلى الله عليه وسلم ـ فەرمووی: ((هەر یەكێك لە ئێوە یاوەرێك لە جن و یاوەرێكی فریشتەشی پێسپێردراوە)).

گوتیان: تۆش ئەی پێغەمبەری خوا ؟!

فەرمووی: ((منیش، بەڵام خوای _ عزَّوجلَّ _ یارمەتی دام و سەری خستم سەریداو، جگە لە هەق فەرمانی شتی ترم پێناکات)).

لە (ریوایة)تێکی تریشدا: ((جگە لە خەیر فەرمانی شتی ترم پێناکات)).

شێخ فەرموویەتی: ئیمامی (مسلم) تاك بۆتەوە لە (تخریج)کردنی فەرموودەکەداو (٩٠)، ڕواڵەتی فەرموودەکە موسڵمانبوونی شەیتانەکان بەدەردەخات و، شیاوی ڕێتێچونی گوفتارەکەی دیکەش دەکات.

---

٩٠ _ برقم: (٢٨١٥).

## ✸ شەیتان بە ڕێڕەوی خوێنی نەوەی ئادەمدا دەڕوات:

عن صفيَّةَ بنتِ حُيَيٍّ زوجِ النبيِّ " قالت: كانَ رسولُ اللهِ _ صلى الله عليه وسلم _ معتكفاً، فأتيتُه أزورُه ليلاً، فحدَّثْتُه، ثم قمتُ لأنقلِبَ، فقامَ معي لِيَقْلِبَني _ وكانَ مسكنُها في دارِ أسامةَ بنِ زيدٍ _، فمرَّ رجلانِ من الأنصارِ، فلمَّا رأيا رسولَ اللهِ _ صلى الله عليه وسلم _ أسْرَعا، فقالَ النبيّ _ صلى الله عليه وسلم _:

((على رِسْلِكُما، إنها صفيةُ بنتُ حُيَيٍّ)).

فقالا: سُبحانَ اللهِ يا رسولَ اللهِ !

قالَ: ((إنَّ الشيطانَ يجري مِن ابنِ آدَمَ مَجْرى الدَّمِ، وإنِّي خَشيتُ أنْ يَقْذِفَ في قُلوبِكُما شرّاً))(٩١).

واتە لە (صفيَّة)ی كچی (حُيَي) خێزانی پێغەمبەری خواوە _ صلى الله عليه وسلم _ فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ (إعتكاف)ی كردبوو، منیش شەو چوومە دیدەنی و، لە گەڵیدا دووام و، پاشان هەستام بگەڕێمەوە، ئەویش لە گەڵمدا هەستا بمباتەوە _ شوێنی نیشتەجێبوونی (صفيَّة)لە ماڵی (أُسامة)ی كوڕی (زید) بوو _، دوو پیاو لە پشتیوانان بە لاماندا تێپەڕبوون، كە پێغەمبەری خوایان _ صلى الله عليه وسلم _ بەدیكرد ڕۆشتنەكەیان خێرا كردەوە، ئەوەبوو پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ پێی فەرموون:

((لە سەرخۆبنەوە، ئەمە (صفية)ی كچی (حُيَي)یە)).

ئەوانیش گوتیان: (سُبحان الله) ئەی پێغەمبەری خوا !

بۆیە پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ فەرمووی: ((شەیتان بە ڕێـڕەوی خوێنی بەنی ئادەمدا دەڕوات و، منیش ترسام گومانێكی شەڕ بە دڵتانەوە بچێت)).

---

٩١ _ رواه البخاري (٤/٢٤٠)، ومسلم (٢١٥٧).

پێشەوا (الخطـابي) فەرموویەتی: ئەو زانستەی لەم فەرموودەیەوە دەستگیر دەبێت ئەوەیـە کەوا بە پەسەند دانراوە (إستحباب) مرۆڤ لە هەر کارێکی نەویستراو وریای خۆی بێـت، کـە دەبێتە مایەی تانەلێدان و بەدگومانی، کە دەچێتە دڵەوەو بە خیاڵدا تێدەپـەڕێت، بـا کـەم و کوڕی و چاکێتی خۆشی بەرامبەر بە خەڵك بسەلمێنێت، بۆ ئەوەی لە هەر شتێکی گومانـاوی خۆی ڕزگار بکات.

هەروەها لەم بارەیەوە لە پێشەوا (الـشافعي) دەگێڕنەوە فەرموویەتی: پێغەمبەری خـوا ـ صلى الله عليه وسلم ـ ترسا شتێکی گوماناوی بکەوێتە دڵی ئەو دوو پیاوەو، کـوفر بکـەن، لە ڕاستید پێغەمبەری خوا ـ صلى الله عليه وسلم ـ ئـەوەی فـەرموو وەکـو بـەزەی پیـدا هاتنەوەیەك بە هەردووکیاندا نەك بۆ خودی خۆی.

## ✸ باسی پەناگرتن و قەڵابەندی لە شەیتانی نەفرەت لێکراو:

خوای تعالی فەرمانیداوە بە پەناگرتن و قەڵابەندی لە شەیتانی نەفرەت لێکراو لە کاتی خوێندنی قورئاندا.

فقال تعالى: ﴿ فإذا قَرَأتَ القُرآنَ فاسْتَعِذْ باللهِ مِن الشَّيطانِ الرَّجيمِ ﴾﴿ النحل: ٩٨ ﴾.

واتە ﴿ فإذا قَرَأتَ القُرءَانَ ﴾ ئەی (محمد _ صلى الله عليه وسلم _) کاتێ ویستت قورئان بخوێنی ﴿ فأَسْتَعِذْ بِاللهِ مِنَ الشَيطانِ الرَّجيمِ ﴾ پەنا بگرە بە خوا لە شەیتانی دەرکراو لە بەزەی خوا([٩٢]).

هەروەها بۆ کاتی بەرەبەیانیش، خوای تعالی فەرموویەتی:

﴿ قُلْ أعوذُ بِرَبِّ الفَلَقِ ﴾﴿ الفلق: ١ ﴾... إلى آخر السورةِ.

واتە: (ئەی محمد _ صلى الله عليه وسلم) بڵێ: پەنا دەگرم بە دروستکاری بوونەوەر (بەرەبەیان)([٩٣]).

بۆیە ئەگەر خوای پەروەردگار فەرمانی خۆپاراستنی بە مرۆڤ دابێت لەم دوو کارەدا، ئەی بۆ شتیتر ئەبێ چۆن بێ.

عن أبي التَّيَّاحِ قال: قلتُ لعبدِالرحمنِ بن خَنْبَش: أدركتَ النبيّ _ صلى الله عليه وسلم_؟ قالَ: نعم.

قلتُ: كيفَ صنعَ رسولُ اللهِ _ صلى الله عليه وسلم _ ليلَةَ كادَتْهُ الشياطينُ ؟ فقال:

إنَّ الشياطينَ تحدَّرتْ تلكَ الليلةَ على رسولِ اللهِ _ صلى الله عليه وسلم _ من الأوديةِ والشِّعابِ، وفيهِم شيطانٌ بيدِهِ شعلةُ نارٍ، يُريدُ أنْ يَحْرِقَ بها وَجْهَ رسولِ الله _ صلى الله عليه وسلم _، فهبَطَ جبريلُ _ عليه السلام _، فقالَ:

((يا محمد ! قُلْ.

قالَ: ما أقولُ؟

---

٩٢ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

٩٣ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

قالَ: قلْ: أعوذُ بكلماتِ اللهِ التَّامَّاتِ مِن شَرِّ ما خَلَقَ وذَرَأَ وبَرَأَ، ومِن شرِّ ما ينزلُ مِن السماءِ، ومِن شرِّ ما يَعْرُجُ فيها، ومِن شرِّ فتَنِ الليلِ والنهارِ، ومن شَرِّ كلِّ طارِقٍ " إلا طارقاً يطرُقُ بخيرٍ يا رحمنُ))(٩٤).

قال: فطُفِئت نارُهم، وهزَمَهُم الله تعالى.

**واته: له (أبي التَّيَّاح)ەوە فەرموويەتی: بە (عبدالرحمن)ی کوڕی (خَنْبَش)م گوت: بە ژیانی پێغەمبەری خوا _ صلی الله علیه وسلم _ گەشتی ؟**

**فەرمووی: بەڵێ.**

**گوتم: پێغەمبەری خوا _ صلی الله علیه وسلم _ کرداری چۆن بوو ئەو شەوەی شەیتانەکان داویان بۆ نایەوە ؟ (عبدالرحمن) فەرمووی:**

**ئەو شەوە شەیتانەکان لە دۆڵ و مابەینی نێوان شاخەکانەوە دابەزینە سەر پێغەمبەری خوادا _ صلی الله علیه وسلم _، شەیتانێکیان تێدا بوو گڕێکی بەرزی ئاگری بەدەستەوە بوو، دەیەویست ڕووی موبارەکی پێغەمبەری خوای _ صلی الله علیه وسلم _ پێ بسوتێنێت، ئەوەبوو (جبریل) _ علیه السلام _ هاتە خوارەوەو، فەرمووی:**

**((ئەی محمد! بڵێ.**

**فەرمووی: چ بڵێم ؟**

**فەرمووی: بڵێ: پەنا دەگرم بە وشە تەواوەکانی خوای پەروەردگار لە شەڕی ئەوەی بەدیهێناوەو دروستیکردووەو هێناویەتیە بوون و، لە شەڕی ئەوەی لە ئاسمانەوە دادەبەزێ و لە شەڕی ئەوەی بۆی سەردەکەوێ و، لە شەڕی ئاژاوەکانی شەو و ڕۆژ و، لە شەڕی هەر شتێك بە شەو دێت، جگە لە بەشەو هاتوویەك کە بەخەیر دێت ئەی ڕەحمان)).**

**فەرمووی: بۆیە ئاگرەکەیان کوژایەوەو، خوای تعالی بەزاندنی.**

---

٩٤ _ رواه أحمد (٣/٤١٩) بسندٍ صحيح.

وعزاه السيوطي في ((جمع الجوامع)) (٢/ رقم ٥١٠٨ _ ترتيبه) لابن أبي شيبة، والبزّار، والحسن بن سفيان، وأبي زرعة، وابن مندة، وأبي نُعيم في ((الدلائل)). وأورده (٣٩٨٠) من مرسل مكحول عند أبي شيبة. وترى تخريجه مفصَّلاً في كتابي: ((كفاية المطمئن...)) الآتي ذكره.

وعن عائشة _ رضي الله عنها _ أن النبـيّ _ صلى الله عليه وسلم _ قال:

((إنَّ الشيطانَ يأتي أحدَكُم، فيقولُ: مَن خلقَكَ ؟ فيقولُ: الله تبارك وتعالى. فيقولُ: فمَنْ خَلَقَ الله ؟ فإذا وجَدَ أحَدُكم ذلك " فَلْيَقُلْ: آمنتُ باللهِ ورسولِه، فإنَّ ذلك يذهب عنه)).

واته: له خاتوو (عائشة)هوه _ خواى ليّ رازى بيّت _ فهرموويهتى: پيّغهمبهرى خوا _ صلى الله عليه وسلم _ فهرموويهتى:

((شهيتان ديّته لاى يهكيّكتان و، دهلّيّت: كيّ بهديهيّناوى ؟ ئهويش دهلّيّت: خواى _ تبارك و تعالى _.

ئينجا دهلّيّت: باشه كيّ خواى بهديهيّناوه ؟ بوّيه ههركات يهكيّكتان ههستى بهوه كرد، با بلّيّت: بروام به خواو پيّغهمبهرهكهى هيّناوه، ئيتر ئهوهى ليّ دوور دهكهويّتهوه)).

وعن ابن عباس _ رضي الله عنهما _ قال: كان رسولُ اللهِ _ صلى الله عليه وسلم _ يُعَوِّذُ الحسنَ والحسينَ، فيقولُ:

((أعيذُكُما بكلماتِ اللهِ التَّامَّة، من كُلِّ شيطانٍ وهامَّةٍ، ومن كُلِّ عينٍ لامَّةٍ)).

ثم يقولُ:

((هكذا كانَ أبي إبراهيمُ _ صلى الله عليه وآله وسلَّم _ يُعَوِّذُ إسماعيلَ وإسحاقَ)).

أخرجاه في ((الصحيحين)) (٩٥).

واته: له (ابن عباس)هوه _ خوا له خوّى وبابشى رازى بيّت _ فهرموويهتى: پيّغهمبهرى خوا _ صلى الله عليه وسلم _ دوعاى به سهر (حسن) و (حسين)دا _ خوايان ليّ رازى بيّت _ دهخويّندو، دهيفهرموو:

((پهناتان دهدهم به وشه پيروّزو تهواوهكانى پهروهردگار له ههموو شهيتان و جانهوهريّكى ژههردارى زيانبهخش و، له ههر چاويّكى پيس و ئيّرهيى خواز)).

---

٩٥ _ رواه البخاري (٦/ ٢٩٣) وحده، وليس هو في ((صحيح مسلم)) كما قال المصنف. وانظر ((تحفة الأشراف)) (٤/ ١٤٥٠)، و((جامع الأصول)) (٤/ ٣٧٠).

پاشان دەیفەرموو:

((باوکە (إبراهیم)م _ صلی الله علیه وآله وسلم _ ئاوەها دوعای پەناگرتنی بۆ (إسماعیل) و (إسحاق) دەخوێند)).

(أبو بکر الأنباري) دەڵێت: وشەی (الهامَّةُ) تاکی وشەی (الهوامّ)ە واتە: هەر گیانەوەرێکی ژەهرداری زیانبەخش، دەشگوترێت: بریتیە لە هەر گیانەوەرێك ویستی خراپەی هەبێت. وشەی (اللامَّةُ)ش هەر وشەی (المُلِمَّة)یە واتە: واتە پیسی ئێرەیی خواز، بەڵام پێغەمبەری خوا _ صلی الله علیه وسلم _ وشەی (اللامَّة)ی بەکارهێنا بۆ ئەوەی لە سەر کێشی وشەی (الهامَّة) بێت و، لە سەر زمان سووکتر بێت.

(مُطَرِّفٌ) دەڵێت: تەماشام کرد، بینیم ئەوەی ئادەم لە نێوان پێش دەستی خوای _عزَّوجلَّ_ و لە نێوان ئیبلیسدا فڕێدراوە، ئەگەر خوای تعالی ویستی هەبێ لە هەڵەو تاوان دوری خاتەوە، ئەوا دووری دەخاتەوەو، ئەگەر وازیشی لێهێنا، ئیلیس دەیبات.

لە هەندێ پێشینی چاك دەگێڕنەوە کە بە (خوێندکارەکەی) فەرمووبوو: چ لە شەیتان دەکەی ئەگەر کردەوە خراپەکانی بۆ ڕازاندیتەوە ؟ گوتی: بەرامبەری تێدەکۆشم و دووری دەخەمەوە. گوتی: ئەگەر گەڕایەوە ؟ گوتی: دیسان بەرامبەری تێدەکۆشم و دووری دەخەمەوە. گوتی: ئەگەر گەڕایەوە ؟ گوتی: هەر بەرامبەری تێدەکۆشم و دووری دەخەمەوە. گوتی: ئەمە درێژە دەکێشێ، پێم بڵێ ئەگەر بەلای ڕانێك مەڕدا تێپەڕیووی و، سەگەکەی پێت وەڕی، یا پەڕینەوەی لێ قەدەغەکردی، چ دەکەی ؟ گوتی: گیرۆدەی دەبم و، بەپێی توانام بەرهەڵستی دەکەم. گوتی: ئەمە درێژەت پێدەکێشێ، بەڵام داوای یارمەتی لە خاون مەڕەکان بکە، لێت دووردەخاتەوە !

بشزانە نموونەی ئیبلیس لە گەڵ کەسانی لە خواترس و کەسانی سەرلێشێواودا بە هاوشێوەی پیاوێکی دانیشتووە خۆراکی لە پێش دەستدا بێت، سەگێکی بەلادا تێپەڕ بێت و، پێی بڵێت: دووربەرەوە. سەگەکەش بڕوات و، بەلای یەکێکی دیکەدا تێپەڕ بێت و خۆراك و گۆشتی لە پێش دەستدا بێت، هەرچەند دووری خاتەوە، جێگەکەی بە جێنەهێڵێت، بۆیە

یەکەم وەکو کەسێکی لە خواترسە شەیتانی بەلادا تێپەڕ بێت، کە تەنها یادو زیکری خوای بەسە بۆ دوورخستنەوەی، بەڵام دووەم وەکو کەسێکی سەرلێشێواوە کە شەیتان بە جێی ناهێڵێت، چونکە سەری لێشێواوە. پەنادەگرین بە خوا لە شەیتان.

# بەشی چوارەم

## سەبارت بە ماناكانی ( التَّلبيس ) و ( الغُرور )

(التَّلبيس) واتە: بەدەرخستنی نارەوا لە شێوەی هەقدا، بەڵام (الغُرور) جۆرە نەفامیەكە مرۆڤ والێدەكات بیروباوەڕی بۆگەن بە تەواو و، خراپ بە چاك دابنێت، هۆكارەكەشی دەگەڕێتەوە بۆ بوونی گومانێك كە ئەوە دروست دەكات.

لە ڕاستیدا ئیبلیس سەر لە موسڵمانان دەشێوێنێت بە ئەندازەی توانای خۆی و، ئەو توانایەشی زیادو كەم دەكات، بە گوێرەی هوشیاری و بێئاگایی و نەفامی و زانینی خەڵك.

هەروەها بزانە كە دڵ لە قەڵایەك دەچێت، لە سەر ئەو قەڵایە دیوارێك هەیەو، ئەو دیوارەش چەند دەرگایەكی هەیەو، چەند شكاویەكی تێدایە، دانیشتوانەكەی ئەقڵ و ژیریە، فریشتەكان هاتووچۆی ئەو قەڵایە دەكەن، بە تەنیشتی قەڵاكەوە چەند ماڵێك هەیەو هەواو ئارەزووی تێدایەو، شەیتانەكانیش بە بێ هیچ بەربەستێك زوو زوو بۆ ئەو ماڵانە دەچن، جەنگ هەیە لە نێوان دانیشتوانی قەڵاكەو دانیشتوانی ئەو ماڵانەدا، شەیتانەكانیش بە بەردەوامی بە چواردەوری قەڵاكەدا دەسوڕێنەوە بە نیازی بێئاگای پاسەوانەكەن بۆ ئەوەی لە هەندێ جێگە شكاوەكانەوە بپەڕنەوە، بۆیە پێویستە پاسەوان هەموو دەرگاكانی قەڵاكە بناسێت كە ئەركی پاراستنیانی پێ سپێردراوە، لە گەڵ جێگە شكاوەكانیشدا، چاوتروكانێكیش لە پاسەوانی سارد نەبێتەوەو كەمتەرخەمی نەكات، چونكە دوژمن سارد نابێتەوە.

پیاوێك لە پێشەوا (الحسَنِ البصريِّ) پرسی: ئایا ئیبلیس دەنوێت ؟ ئەویش فەرمووی: ئەگەر بنووستایە دەحەساینەوە.

ئەو قەڵایە بە یادوزیكری خوای تعالی ڕووناك كراوەتەوە، بە ئیمان دەدرەوشێتەوە، ئاوێنەیەكی ڕۆشنی تێدایە وێنەی هەموو شتێكی تێدا دەبینرێت كە بەلایدا تێپەڕ دەبێت، سەرەتا شەیتان لەو ماڵانەدا دووكەڵ زۆر دەكات، دیواری قەڵاكە ڕەش دەبێتەوەو،

ئاوێنەکەش ژەنگ هەڵدێنێ، بەڵام شێوەی تەواوی بێ کەم و کوڕی بیرخستنەگرِ بۆ گەشتن بە ڕاستیەکان دووکەڵەکە دەگەڕێنێتەوە، بە جوانکردن و ناسك کردنی یادوزیکری خوای تعالاش ئاوێنەکە ڕۆشن دەبێتەوە، دوژمنیش چەندین هێرشی هەیە، ناوبەناو هێرش دەبات و، دەچێتە نێو قەڵاکەوەو، پاسەوانەکە پەلاماری دەدات و دەردەچێت، لەوانەشە بچێتە ژوورەوەو، خراپە بەرپاکات، لەوانەشە بەهۆی بێئاگای پاسەوانەکەوە لەوێ بمێنێتەوە، لەوانەشە بای دوورخەرەوەی دووکەڵەکە بوەستێت و، دیسان دیواری قەڵاکە ڕەش بێتەوەو، ئاوێنەکەش ژەنگ هەڵبێنێت، بۆیە شەیتانی بە لادا تێپەڕ دەبێت و ئاگای لێنابێت، لەوانەشە پاسەوانەکە بە هۆی بێئاگابوونی خۆیەوە بریندار بێت، دەستبەسەر بکرێت و، بەکاربهێنرێت بۆ ئەوەی فرت و فێڵی نوێ هەڵهێنجێنێت، بۆ ڕەزامەندی هەواو ئارەزوو و یارمەتیدانی و، لەوانەشە لە هاوکاریکردنی شەڕدا ببێت بە فەقیە و زانا.

هەندێ لە پێشین چاك گوتوویانە: شەیتانم بینی، پێی گوتم: پێشتر چاوم بە خەڵك دەکەوت و فێرم دەکردن، بەڵام ئێستا چاوم پێیان دەکەوێت و لێیانەوە فێردەبم.

لەوانەیە شەیتان بووکی هەواوئارەزووی بە دەستەوە بێت و، هەستابێت بە ڕازاندنەوەی، هێرش بەرێتە سەر کەسی زیرەکی بە سەلیقەی هۆشیار، کەسی زیرەکیش خۆی بە تەماشاکردنی ئەو بوکەوە خەریك بکات ، ئیتر دەستبەسەری دەبێت و، پابەندی فەرمانەکانی دەبێت و، بە قسەی دەکات.

بەهێزترین کۆت و پێوەندێکیش دیل و دەستبەسەرانی پێ ببەسترێتەوە نەفامیە، ناوەندیشیان لە هێزدا هەواو ئارەزووە، لاوازترینیشیان بێئاگاییە، بەڵام تاوەکو باوەڕدار قەڵغانی باوەڕی پۆشیبێت، تیری دوژمن نایکوژێت.

(الحَسَن)ی کوڕی (صالح) _ بەرەحمەتی خوا بێت _ دەڵێت: شەیتان نەودو نۆ دەروازەی خەیر بۆ بەندە دەکاتەوە، بە نیازی ئەوەی دەروازەیەکی شەڕی بۆ بکاتەوە.

له (الأعمش)ەوه فەرموویەتی: پیاوێك كە لە گەڵ (جن)دا دەدوا، بـۆی باسـکردین، کـەوا جنە شەیتانەکان گوتبویان: هیچ کەسێك بەلامانەوە ئەوەندەی شوێنکەوتووانی سوننەت دژوار نییە، بەڵام شوێنکەوتوانی هەواوئارەزوو، ئێمە بە یاردیکردن یاریان پێدەکەین (٩٦).

٩٦ _ چەند مانگێکە دەستم کردووە بە نووسینی نامیلکەیەك بە ناوی (كفاية المطمئن بأحكام الجن) باسی چەند مەسەلەیەکی گرنگم تێدا کردووە هەموو ئەوانەی دەربارەی (جن) دەنووسن لە نووسـەرانی هاوچـەرخ نێی بێئاگابوونە، داواکارم خوای تعالى بە خەیر نووسی ئەم نامیلکەیەم بە ئاسانی بۆ تەواوکات.

# بەشى پێنجەم

# باسى سەرلێشێواندنەكانى ئیبلیس لە بوارى بیروباوەڕو ئاینەكاندا :

## ✱ باسى هەستانى ئیبلیس بە سەرلێشێواندنى سۆفستایەكان :

شێخ دەفەرمێت: ئەمانە قەومێكن ڕەگ و ڕیشەیان دەگەڕێتەوە بۆ پیاوێك، بەناوى: سۆفستا، وایان ڕادەگەیاند كە شتەكان هەقیقەتیان نییەو، ئەوەى بەدوورى دادەنێین و ڕێى تێ ناچێت دەگونجێت ئەو بێت كە دەیبینین، دەشگونجێت بە پێچەوانەى ئەوەوە بێت كە دەیبینین (زعموا أن الأشياء لا حقيقة لها، وأنَّ ما نَسْتَبْعِدُهُ يجوزُ أن يكونَ ما نشاهِدُهُ، ويجوزُ أنْ يكونَ على غيرِ ما نُشاهِدُه).

زانایان وەڵامیان دانەوەو فەرموویان: ئەم گوفتارانەى ئێوە هەقیقەتیان هەیە یا نییە ؟

ئەگەر گوتتان: هەقیقەتى نییەو، دەشێ پووچ بێت، ئیتر چۆن دەگونجێت بانگەواز بۆ شتێك بكەن كە هەقیقەتى نەبێت ؟ وەكو ئەوەى بەم گفتارەتان دانى پێدا دەنێن كە قبوڵ كردنى بیروباوەڕەكەتان حەڵاڵ نیە.

ئەگەر بڵێن: هەقیقەتى هەیە، ئەوا وازتان لە ڕێباوەڕەكەى (مَذهب) خۆتان هێناوە.

(أبومحمد الحسن)ى كوڕى (موسى النُّوبَخْتِيّ) لە كتێبى (الأراء والديانات)دا ڕێباوەڕى ئەم كۆمەڵەیە باس دەكات و دەڵێت:

زۆرێك لە قسەناسانم (المتكلمين) بینیوە سەبارەت بە كاروبارى سۆفستایەكان بەهەڵەدا چوونە بە هەڵەیەكى ئاشكرا، چونكە گفتوگۆیان لە گەڵدا كردوون و، مشتومڕیان لە گەڵدا كردوون، بە نیازى ئەوەى بەم گفتوگۆ و مشتومڕە وەڵامیان بەنەوەو، بەرپەرچیان بەنەوە، لە كاتێكدا ئەوان نەراستى و هەقیقەتێكیان جێگیر كردووەو، نەدانیان بە تەماشاكردنێكدا

ناوە(وهم لم يُثْبِتوا حقيقةً، ولا أقرُّوا بمشاهدةٍ)، باشە چۆن لە گەڵ یەكێكدا دەدوێی كە دەڵێت: نــــــازانم لە گەڵمدا دەدوێ یا نەء ؟ (فكيف تُكَلِّمُ مَن يقـولُ: لا أدْري أيُكَلِّمُـني أم لا ؟) وە چۆن مشتومڕ لە گەڵ یەكێكدا دەكەی واڕادەگەیەنێت كە نازانێت خودی خۆی لە بووندایە یـا لە نەبووندایە ؟! (وكيف تُناظِرُ مَن يزعُمُ أنَّه لا يدري أموجودٌ هو أم معدومٌ ؟) چۆن گفتوگـۆ لە گەڵ كەسێكدا دەكەی كە واڕادەگەیەنێت گفتوگۆ بە پلەوپایەی بێدەنگیە لە ئاشكراكردن و دەربڕیندا، ڕاست و تـەواو بەپلەوپایـەی بۆگـەنی و خراپیـە؟ (وكيـفَ تخاطِـبُ مَـن يـدَّعي أنَّ المخاطبةَ بمنزلةِ السُّكوتِ في الإبانةِ، وأنَّ الصحيحَ بمنزلةِ الفاسد).

دەڵێت: لە ڕاستیدا گفتوگۆ لە گەڵ یەكێكدا دەكرێت دان بە زرورەتێكدا بنێت، یا دان بە كارێكدا بنێت، ئینجا ئەو دان پێدانەی دەكرێت بە هۆكاری ڕاسـتكردنەوەی ئـەو شـتەی كـە نكۆڵیی لێدەكات. بەڵام ئەوەی دان بە شتێكدا نانێت، واز لە گفتوگۆكردنی دەهێنرێت.

شێخ دەڵێت: (أبوالوفا)ی كوڕی (عقیل) بەرپەرچی ئەو گوفتارانەی داوەتەوەو، دەڵێت:

قەومانێك دەڵێن: چۆن گفتوگۆ لە گەڵ ئەمانەدا بكەین، لـە كاتێكـدا مەبەسـتی كەسـی گفتوگۆكار ئەوەیە ماقوڵ لە هەستپێكراو نزیك بكاتەوەو، بەڵكـە دامـەزرێنێت، بـۆ ئـەوەی ڕێنمای و چاوساغی بكات بۆ گەشتن بە نادیار ؟ ئەمانەش بڕوایان بە هەستپێكراوەكان نییە، ئیتر بە چ گفتوگۆیان بكرێت ؟

دەڵێت: ئەمە قسەی كەسێكی بیرتەسـكە، پێویـستە نائومێـد نـەبین لـە چارەسـەركردنی ئەمانەدا، چونكە ئەو شتەی تووشیان بووە لە ئەندێشەی خراپ زیاتر نییە، پێویستە بیرتەسك نەبین بەرامبەر بە چارەسەرەسەركردنی ئەمانە، چونكە قـەومێكن چـەند كۆسـپێكی ناسـازی سروشت و خووی خۆیان بەدەریهێناون، بۆیە نموونەی ئێمەو ئەوان وەكـو پیاوێكـە منـداڵێكی چاو خێلی هەبێت، بـەردەوام مانگ بە دوو مانگ ببینێ، تا ئەو ئاستەی هـیچ گومـانێكی نەبێت كە دوو مانگ لە ئاسماندا هەیە، باییـشی پـێ دەڵێـت: مـانگ یەكـەو، لـە ڕاسـتیدا ناتەواوی لە چاوی تۆدایـە، چـاوە خێلەكـەت ببەسـتەو، تەماشـاكە، كـە ئـەوەی ئەنجامـدا،

منداڵەکە گوتی: یەك مانگ دەبینم، چونکە چاوێکم بەستووە، بۆیـە مانگێکیـان ون بـوو !!
ئەم گوفتارەدا منداڵەکە گومانێکی دووەمی خستەڕوو، بۆیە بابی پێی دەڵێـت، ئەگـەر بـەو
شـــێوە بێت کە تۆ دەیڵێیت، دەبێ چاوە ساغەکەت ببەستی، منداڵەکەش ئەوەی بە ئـەنجام
گەیاند، دوو مانگی بینی، ئەوەبوو ڕاستی گوفتارەکانی بابی بۆ دەرکەوت.

## ✱ باسی هەستانی ئیبلیس بە سەرلێشێواندنی دەستەکانی فەیلەسوفان:

(النُّوبَختی) دەڵێت: دەستەیەکی خۆبەنەفام کردوان واڕادەگەیەنن کە شتەکان لە خودی خۆیاندا یەك حەقیقەتیان نییە، بەڵکو حەقیقەتی شت بەلای هەر قەومێکەوە بە گوێرەی بڕوای خۆیەتی بەرامبەر بە شتەکە، بۆیە هەنگوێن بەلای تووشبووانی نەخۆشی (المِرَّة الصفراء)ەوە تاڵە، کەچی بەلای کەسانی ترەوە شیرینە.

دەڵێن: هەروەها جیهان کۆنە بەلای ئەو کەسانەوە کە بڕوایان بە کۆنیەتی جیهانەو ، تازەبەدیهێنراویشە بەلای ئەو کەسانەوە کە بڕوایان بە تازەبەدیهێنانی هەیە (قالوا: وکذلك العالَمُ هو قديمٌ عند من اعتقدَ قِدَمَهُ، مُحْدَثٌ عند من اعتقد حدوثَهُ)، ڕەنگیش تەنە بەلای ئەو کەسانەوە کە بڕوایان بە تەنێتی ڕەنگەو، عەرەزیشە بەلای ئەو کەسانەوە کە بڕوایان بە عەرەزێتی ڕەنگە (واللونُ جسمٌ عند من اعتقدَهُ جسماً، وعَرَضٌ عندَ مَن اعتقدَهُ عَرَضاً).

دەڵێن: ئەگەر وامان بەبیردا هات کە هەردوو بڕواکە بوونی نەبوو، ئەوا شتەکە دەکەوێتە سەر بوونی ئەو کەسانەی بڕوایان پێیەتی !! (قالوا: فلو تَوَهَّمنا عَدَمَ المعتقدين، وَقَفَ الأمرُ على وجودِ مَن يعتقدُ !!).

ئەمانە لە ڕەگەزی سۆفستایەکانن، پێیان دەگوترێت: ئایا گوفتارەکەتان ڕاستە ؟ ئەوانیش دەڵێن: بەلای ئێمەوە ڕاستەو، بەلای نەیارانیشمانەوە پووچە. دەڵێین: ئەو بانگەشەیەی کە بۆ ڕاستێتی گوفتارەکانتان دەیکەن نەوەستراوە، کە دانیشی پێدادەنێن ڕێباوەڕتان بەلای نەیارانتانەوە پووچ بێت بەڵگەیەك دەبێت بەسەرتانەوە (وإقرارُكُم بأنَّ مذهبكم عند خصمِكم باطلٌ شاهدٌ عليكم)، وە هەرکەس شایەتی بۆ پووچی گوفتارەکانیان بات، لە هەر ڕوویەکەوە بێت، ئەوا لە جیاتی نەیارەکەی هەستاوە بە ڕوونکردنەوەی بۆگەنی و خراپی ڕێباوەرەکەی (ومَن شَهِدَ على قولِهم بالبُطْلانِ من وجْهٍ، فقد كفى خصمَهُ بتبيينِ فسادِ مذهبِهِ).

لەو شتانەش کە پێیان دەگوترێت: ئایا بۆ تەماشاکردن حەقیقەتێك جێگیردەکەن ؟ ئەگەر گوتیان: نەخێر، ئەوا دەدرێنە پاڵ یەکەمینان (أَتُثْبِتونَ للمشاهدةِ حقيقةً ؟ فإنْ قالوا: لا،

لَحِقوا بالأوَّلِينَ). ئەگەر گوتیشیان: حەقیقەتی بە پێی باوەڕە ؟ ئەوا هـیچ حەقیقـەتێکیان بـۆ جێگیر نەکردووە لە خودی خۆیداو، گفتوگۆکردن لە گەڵیاندا وەکو گفتوگۆکردنی یەکەمینانی لێدێت (وإنْ قالوا: حقيقتُها على حسبِ الأعتقادِ، فقدْ نَفَوا عنهـا الحقيقـةَ في نفـسِها، وصارَ الكلامُ معهم كالكلامِ مع الأوَّلِينَ).

(النُوبَختي) دەڵێت: کەسانێك لەوانە دەڵێن: جیهان لە توانەوەو لەبەر ڕۆشتنندایە (إنَّ العالَمَ في ذَوْبٍ وسَيَلانٍ).

دەڵێن: مرۆڤ لە توانایدا نییە دووجار بیر لە شتێك بکاتەوە، چونکە شتەکان بەردەوام لـە گۆڕیندایە.

بۆیە پێیان دەگوترێت: باشە ئەمە چۆن زانرا لە کاتێکـدا ئێـوە نکـۆڵی لـە جێگیربـوونی شتانێك دەکەن کە دەبێتە هۆی زانین، وە پێدەچێت کەسـێکتان کـە ئێـستا هەڵدەسـتێت بـە وەڵامدانەوە ئەو کەسە نەبێت کە بەو گوفتارانە دووا ؟

## ✸ باسی هەستانی ئیبلیس بە سەرلێشێواندنی (الدَّهريَّة)ەكان:

نووسەر واتە _ ابن الجوزي _ دەفەرمێت:

ئیبلیس كەسانێكی زۆری بەهەڵەدا بردووە كە گوایە هیچ خواوەندێك نییەو، هیچ دروستكارێك نییەو، ئەم شتانە هەر خۆیان هەبوون بەبێ دروستكار، ئەم تاقمە كە بەهەست دروستكاریان نەناسی و، ئەقڵ و ژیریشیان بۆ ناسێنی بەكارنەهێنا، بۆیە نكۆڵیان لێكرد.

ئایا كەسی خاوەن ئەقڵ و ژیری گومانی لە بوونی دروستكاردا دەبێت ؟! تۆ تەماشاكە ئەگەر مرۆڤێك بە زەویەكی فراواندا تێپەڕیوو و هیچ بینایەكی تێدا نەبوو، پاشان كە هاتەوە، دیوارێكی دروستكراوی تێدا بەدیكرد، دەزانێت بەدڵنیایی وەستایەك دروستی كردووە، ئەم زەویە تەخت كراوەو، ئەم سەربانە بەرزكراوەو، ئەم بینا سەرسوڕهێنەرانەو، ئەم ڕێسا جوانانەی كە ڕێگەی خۆیان دەگرن بە حیكمەت و دانایی، ئایا بەڵگەی بوونی دروستكارێك نین ؟!

چەند جوانە ئەو گوفتارەی كە هەندێ عەرەب گوتویانە: پشقل بەڵگەی بوونی وشترە، هەیكەلێكی بەرزوبڵند بەم ناسك و جوانیە، سەنتەرێكی خواروو بەم چڕوپڕیە، ئایا بەڵگەی بوونی زاتێكی زانیارو ئاگادار نییە بە بوونی گشت ڕووداوێك.

پاشان ئەگەر مرۆڤ سەرنجی خۆی بات، بەسە وەكو بەڵگەیەك و، بەسیشە بۆ چارەسەری گومانێك، چونكە ئەم جەستەیە چەندەها حیكمەت لە خۆدەگرێت، كە باسكردنی لە دوتۆی كتێبێكی وەكو ئەمەدا جێگەی نابێتەوە، هەركەسیش سەرنجی تیژێتی ددان بدات بۆ بڕین، ددانە خڕێكان كە لەت دەكات و دەهاڕێت، زمان كە پارووەكان هەڵدەگێڕێتەوەو، سەروژێریان پێدەكات، زاڵكردنی جگەریش بەسەر خۆراكدا بۆ پێگەیاندنی و، پاشان ناردنی بۆ ئەندامەكان بە ئەندازەی پێویستیی بە خۆراك، ئەو پەنجانەی كە چەندین گرێیان تێدا ئامادەكراوە بۆ ئاسانی نووشتانەوەو كرانەوەو، ئاسانی كارپێكردنیان، ناوبۆشیش نەكراوە بە هۆی زۆرێتی كارەكانیانەوە، چونكە ئەگەر نابۆش بكرایە شتی بەهێزی بەردەكەوت و دەشكا، هەندێكیشیان لە هەندێكی تریان درێژتر دروستكراوە، بۆ ئەوەی یەكسان بنەوە لە نووشتاندا،

هەروەها نەفس لە جەستەدا شاردراوەتەوە کە ڕیك و پێکی پێ دەبەخشێت و، ئەگەر تێکچوو ئەقڵ وژیری خراپ دەبێت، کە ڕێنوێنی کەسەکە دەکات بۆ بەدەستهێنانی بەرژەوەندیەکان، هەموو ئەم شتانە بە دەنگێکی بەرز هاوار دەکەن: ﴿ أفي الله شكٌ ﴾ ﴿ إبراهيم: ١٠ ﴾ واتە ئایا گومان لە خودا هەیە (٩٧).

لەڕاستیدا تەنها کەسی نکۆڵیکارە کە سەرلێشێواوە، چونکە دەیەوێت بە هەست پەروەردگار بناسێت، کەسانێکی دیکەش هەستاون بە نکۆڵیکردن، چونکە کاتێك بوونی پەروەردگاریان بە گشتی جێگیرکرد، لە بوونی پەروەردگار بە وردی و درێژی تێنەگەشتن، بۆیە نکۆڵیان لە بنەڕەتی بوون کرد، بەڵام ئەمانە ئەگەر بیرو هزریان کارپێکردایە، دەیانزانی چەندەها شتمان هەیە تێگەشتنی مەحاڵەو تەنها بە گشتی لێی تێدەگەین، وەکو نەفس و، ژیری، کە هیچ کەسێك بەدینەکراوە ئەمانە جێگیر نەکات و خۆی لابات.

مەبەستیش تەنها جێگیرکردنی بەدیهێنانە (خلق) بەگشتی، ئیتر بۆچی بگوترێت: ئەوە چۆنە ؟ یا: ئەوە چی یە ؟ چونکە نەچۆنیەتی و نە ماهیەت لە ئارادا نییە !!

لەو بەڵگە یەکلاکەرەوانەش کە دەیسەلمێنێت جیهان تازەبەدیهاتووە (حادث)، ئەوەیە کە بەردەوام بەدیهێنانی (حوادث) تێدا ڕوودەدات، هەر شتێکیش بەردەوام بەدیهێنانی تێدا ڕوویدات ئەوا خۆشی تازەبەدیهاتووە، بۆ بەدیهێنانی تازەبەدیهاتووەکانیش دەبێ هۆیەك هەبێ، کە خوای پەروەردگارە.

بێباوەڕانیش ڕەخنەیەکیان هەیەو بەو ڕەخنەیە لە ڕوومانەدا هەڵدەگەڕێنەوەو دەمدرێژی دەکەنە سەر ئەو گوفتارەمان کە دەڵێین: پێویستە هەر دروستکراوێك دروستکارێکی هەبێت. دەڵێن: لەمەدا خۆتان پەیوەند کردووە بە بەڵگەو شاهیدەوە، بۆیە ئێمەش هەمان بەڵگەو شاهید بەکاردێنین و، دەڵێین: وەکو چۆن پێویستە هەر دروستکراوێك دروستکارێکی هەبێت، ئەو شێوەیەی کە دروستکار بەدیدەهێنێت پێویستی بە ماددەیەکە شێوەکەی لێبەدیهێنێت، وەکو دار بۆ شێوەی دەرگاو، ئاسن بۆ شێوەی تەور.

---

٩٧ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

گوتویانە: ئەو بەڵگەیەی کە دروستکاری پێ جێگیر دەکەن هەربوونیەتی جیهان (قِدَم العالم) دەسەلمێنێت.

بۆ وەڵامەکەشی دەڵێین: هیچ پێویستیەکمان بە مادده نییە، بەڵکو دەڵێین: دروستکار هەموو شتەکانی داهێناوە (أخترع) بە داهێنان، چونکە ئێمە دەزانین شێوەو دیمەنە نوێکاریەکان لە تەندا، وەکو شێوەی دۆڵاب، هیچ مادەیەکی نییە، بەڵام خوای پەروەردگار بەدیهێناون، ئێمە لێرەدا شێوەو دیمەنێکمان پیشاندان، کە لە هیچەوە داهێنراوە، بەڵام هەرگیز ئێوە ناتوانن دروستکراوێکی بێ دروستکارمان پێشان بدەن !

## ✸ باسى هەستانى ئيبليس به سەرليْشيْواندنى ( الطبائعِيِّين )[٩٨]:

نووسەر دەفەرميْت:

كاتيْك ئيبليس كەمى قايلبوونى خەلْكى بە قسەكانى خۆى بەديكرد سەبارەت بە نكۆڵيكرن لە دروستكار، چونكە ئەقلْ وژيرى شايەتن كە شتى دروستكراو دەبىْ دروستكاريْكى چاكى هەبيْت، ئەمجارە گوتى: هيچ شتيْك ناخولْقيْنريْت مەگەر بە كۆبوونەوەى هەر چوار (الطبائع)ەكە، بۆيە ئەمە بەلْگەيەكى ئاشكرايە كە ئەم چوارە بكەرن (الفاعلة) !

بۆ وەلاْمى ئەمە، دەلْيْين: كۆبوونەوەى چوار (الطبائع)ەكان بەلْگەيە لە سەر بوونيان، نەك بكەريْتيان، پاشان جيْگيربووە ئەم چوارە كارناكەن تەنها بە كۆبوونەوەو تيْكەلْبوونيان نەبيْت و، ئەمەش پيْچەوانەى سروشتيانە، بۆيە ئەمە دەريدەخات ئەو چوارە بەزيو و ناچاركراون لە لايەن خواى تعالاوە.

ئەم كۆمەلْە قايلبوونە كە ئەو چوارە نە زيندوون و، نە زانان و ، نە بەتواناشن، زانراويشە كە كردەوەى ريْكوپيْكى رەشتەدار بەدينايەت تەنها لە لايەن زانايەكى داناوە نەبيْت، ئيتر چۆن شتگەليْك كە نە زانان و نەبەتواناشن كردار بكەن !

---

٩٨ _ كۆمەليْكن لەو بروايەدان بنەرەتى بەديهيْنراوان بە گشتى و شتەكانيش بە گشتى: خاك و، ئاوو، ئاگرو، هەوايە.

## ✸ باسی هەستانی ئیبلیس بە سەرلێشێواندنی نکۆڵیکارانی زیندووبوونەوە:

نووسەر دەفەرمێت:

ئیبلیس سەری لە خەڵکێکی زۆر شێواندووە، بۆیە نکـۆڵی لـە زیندووبوونـەوە دەکـەن و، گەڕانەوەی دوای مردنیان بە شتێکی قورس و گران و زڵ لە قەڵـەم داوە، دوو گومانیـشی بـۆ دروستکردوون:

یەکەم: پیشانی دان کە مادده لاوازە.

دووەم: تێکەڵبوونی بەشە بڵاو و جودا جوداکان لە ناخی زەویدا.

گوتیان: ئاژەڵ ئاژەڵێکی تر دەخوات، باشە چۆن گەڕانەوەی بۆ بڕەخسێندرێ.

قورئانی پیرۆزیش باسی گومانەکانی کردوون:

بۆ یەکەم پەروەردگار دەفەرمێت: ﴿ أَيَعِـدُكُم أَنَّكُـم إِذا مِـتُّمْ وكُنْـتُم تُراباً وعِظامـاً أَنَّكُـمْ مُخْرَجونَ. هَيْهَاتَ هَيْهَاتَ لِما تُعَدُونَ ﴾﴿ المؤمنون: ٣٥ ﴾. واتە: ﴿ أَيَعِدُكُم أَنَّكُم إِذا مِتُّم ﴾ ئایا ئەو (هود _ علیه السلام _ بەڵێن بە ئێوە دەدات کە بەڕاسـتی کـاتێ مـردن ﴿ وكُنْـتُم تُراباً وعِظامَاً ﴾ وەبوون بە خاك و ئێسك (ی ڕزیوو) ﴿ أَنَّكُم مُخْرَجونَ ﴾ بێگومان ئێوە (لـە گۆڕ) دەردەهێنرێن (زیندوو دەکرێنەوە). ﴿ هَيْهَاتَ هَيْهَـاتَ ﴾ زۆر دوورە، ئەسـتەمە ﴿ لِمـا تُعَـدُون ﴾ ئەو بەڵێنەی بە ئێوە دراوە (گوایـــــــە زینـدوو دەکرێنـەوە)([99]) سـەبارەت بـە دوومـــیش دەفـــەرمێت: ﴿ وَقـالوا أئـذًا ضَـلَلْنا في الأَرْضِ أْءِنـا لَفـي خَلْـقٍ جَدِيـدٍ ﴾ ﴿السجدة:١٠﴾ واتە: ﴿ وَقالوا أءِذا ضَلَلْنا في الأرض ﴾ (بـێ بڕواکـان) دەڵـێن: ئایـا کـاتێ (مردین و لەشمان ڕزا) لە نێو زەویدا گوم بووین ﴿ أءِنـا لَفـي خَلْـقٍ جَدِيـدٍ ﴾ ئایـا (زینـدوو دەکرێینەوەو)دروست کردنێکی تازەمان دەبێ([100]).

---

٩٩ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

١٠٠ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

ئەمە بیروباوەڕی زۆربەی نەفامەکان بوو، یەکێکیان دەڵێت:

يُخَبِّرُنا الرَّسولُ بأن سَنَحْيَي
وكيفَ حَياةُ أصداءٍ وهَامِ

واتە: پێغەمبەر پێمان ڕادەگەیەنێت دووبارە زیندوو دەبینەوە
ئەی پاش مردن چۆن زیندوو دەبینەوە
ئەمە خەیاڵە

یەکێکی دیکەش _ کە (أبو العلاء المَعَرِّي)ە _ دەڵێت:

حَيَاةٌ ثُمَّ مَوْتٌ ثُمَّ بَعْثٌ
حَديثُ خُرافَةٍ ([101]) يا أمَّ عَمْرِو

واتە: ژیان پاشان مردن پاشان زیندووبوونەوە
باسەکەی (خُرافَةٍ)یە ئەی (أمَّ عَمْرو)

بۆ وەڵامی گومانی یەکەمیشیان دەڵێین: لاوازی ماددە لە دوومدا، کە خاکە، لادەچێت چونکە خاڵی دەستپێك بە (نطفة) واتە: تۆوە، پاشان (مضغة) واتە: خوێنی مەیوو، پاشان (علقة) واتە: پارچە گۆشتێکی جواوە.

پاشان بنەڕەتی ئادەمیەکان _ کە باوکە ئادەمە _ لە خاکە، بە پێی ئەوەی کە خوای _ سبحانه وتعالى _ هەموو شتێکی پەسەندی لە ماددەیەکی لاواز دروست کردووە، بڕوانە ئەم ئادەمیەی لە تۆو دەرهێناوە، تاووسی لە هێلکەی بۆگەنی پیس و، دارگەزی سەوزی لە دەنکە تووی کەڕواوی دەرهێناوە، بۆیە مرۆڤ دەبێ بڕوانێتە هێزی خوای بکەرو تواناکەی، نەك لاوازی ماددەکان.

وە بە تێڕوانینی هێزو توانای خوای بەدیهێنەر وەڵامی گومانی دوومیش ئاشکرا دەبێت.

پاشان خوای تعالى چەندین نموونەی پیشان داوین سەبارەت بە کۆبوونەوەی ماددە شیی بووەکان، وەکو ئەوەی کە وردەو خاکەی زێڕی بڵاوبۆووە لە خاکی زۆردا، ئەگەر کەمێك

---

١٠١ _ پاشان لە لاپەڕەکانی دیکەدا باسی ئەمە دەکرێت.

ماددەی (زئبق)ی بە سەردا بکەیت، زێڕەکە کۆدەبێتەوە هەرچەند لە پێشدا بڵاوبوبۆوە، ئەی باشە کاریگەری تواناو هێزی خوا دەبێ چۆن بێ کە هەموو شتێك لە نەبوونەوە بەدیدەهێنێت!

لە سەرسوڕمێنترین بەڵگەکانی زیندووبوونەوەش ئەو بەڵگانە بوون کە خوای تعالی لە سەر دەستی پێغەمبەرانی خۆی بەدەریخستن و زۆر لە زیندووبوونەوەش گەورەتر بوون ، وەکو گۆڕینی داردەست بۆ مارێکی زیندووی ئاژەڵی و، دەرهێنانی مێ وشترەکە لە بەردەکەوەو، ڕوونکردنەوەی زیندووبوونەوە لە سەر دەستی پێغەمبەر عیسی _ صلوات الله وسلامه علیه_ کە هەڵدەستا بە زیندووکردنەوەی مردووان و، چاك کردنەوەی کوێری زکماك و بەڵەکی بە ئیزنی خوای تعالی.

# * بیروباوەڕی بتپەرستی:

ئیبلیس هەستا بە سەرلێشێواندنی کۆمەڵانێك کە بە چاوی خۆیان هێزو توانای خوای _سبحانه وتعالی _ یان بەدیدەکرد، پاشان هەردوو گومانەکەی پێشووشی بۆ دروست کردن، بۆیە سەبارەت بە زیندووبوونەوە دودڵیان دەنواند.

بۆیە کەسی وایان هەبوو دەیگوت: ﴿ ولَئِنْ رُدِدْتُ إلى رَبِّي لأجِدَنَّ خَيْراً مِنْها مُنْقَلَباً﴾ ﴿الكهف: ٣٦ ﴾.

واتە: ﴿ ولَئِنْ رُّدِدْتُ إلى رَبِّي ﴾ سوێند بە خوا ئەگەر (پاش مردن) بگێڕنەوە بۆ لای پەروەردگارم ﴿ لأجِدَنَّ خَيْراً مِنْها مُنْقَلَباً ﴾ بێ گومان باشتر لەم باخەم دەست دەکەوێ(١٠٢).

(العاصُ)ی کوڕی (وائل)یش دەیگوت: ﴿ لأُوتَيَنَّ مالاً ووَلَداً ﴾﴿ مريم: ٧٧ ﴾(١٠٣) واتە: (لە ڕۆژی دوایشدا) ماڵ و کوڕم پێ دەدرێ (١٠٤) !

لە ڕاستیدا بەو شێوانە دەدوان، چونکە گومانیان هەبوو، بۆیە ئیبلیس لەوەدا سەری لێشێواندن و دەیانگوت: ئەگەر زیندووبوونەوە هەبێت، ئێمە لە خەیردا دەبین، چونکە ئەو زاتەی لە دوونیادا ماڵ و سامانی پێبەخشین، لە ڕۆژی دوایدایشدا ئەو ماڵ و سامانەمان لێ قەدەغە ناکات.

---

١٠٢ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

١٠٣ _ وقصة العاص بن وائل أخرجها البخاري (٨ / ٣٢٧)، ومسلم (٢٧٩٥) " عن خبّاب ابن الأرت.

وانظر ((تفسير ابن كثير)) (٣ / ٢١٨)، و ((والصحيح المُسْنَد من أسباب النزول)) (ص٨٨).

١٠٤ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

**نووسەر دەفەرمێت:**

**ئەمەش هەڵەیەکەو تێیکەوتوون، چونکە بۆ نەگونجێت ئـەم مـاڵ و سـامانەی کـە خـوای تعالی پێبەخشیون مۆڵەتێك بێت لە لایەن پـەروەردگارەوە بـۆ تاقیکردنـەوە یـاخود سـزایەك بێت؟ زۆر جاریش مرۆڤ هەڵدەسـتێت بە پاراستنی کوڕەکەی، کەچی بەندەکـەی لـە هـەواو ئارەزووەکاندا بەرەڵا دەکات.**

## * باسی هەستانی ئیبلیس بە سەرلێشێواندنی کۆمەڵی بڕواکاران بە گیانگۆڕکێ (التناسخ)[١٠٥]:

نووسەر دەفەرمێت:

ئیبلیس سەری لە کۆمەڵانێك شێواندو و، ئەوەبوو باسی گیانگۆڕکێ یان دەکرد، بەوەی گوایە ڕوحی کەسانی چاك ئەگەر دەرچوو، دەچێتە نێو چەستەگەلێکی چاکەوەو، بەوەش دەحەوێتەوە، بەڵام ڕوحی کەسانی خراپ ئەگەر دەرچوو، دەچێتە نێو جەستەگەلێکی خراپەوەو، بە هۆیەوە بەدبەختی و کەساسی دەچێژێت.

ئەم ڕێباوەڕە لە زەمەنی فیرعەونی (موسی)ەوە دەرکەوت.

لە (أبي الحسن علي) کوڕی (نظيف)ەوە، دەڵێت: لە بەغدا شێخێکی (الإماميَّةِ) لە گەڵماندا ئامادە دەبوو، کە بە (أبو بكرِ الفَلَّاس) دەناسرا، (أبي الحسن علي) بۆی باسکردین کەوا ئەو شێخە دیدەنی کەسانێکی دەکرد بە شیعەگەرێتی بەناوبانگ بوون، پاشان بانگەشەی گیانگۆڕکێی دەکرد، (أبوالحسن علي) دەڵێت: ڕۆژێك پشیلەیەکی ڕەشم لە پێش دەستیدا بینی، دەستی پێدا دەهێناو، نێوچاوانی دەخوراند، بینیم چاوانی پشیلەکە فرمێسکیان دەڕشت، وەکو شتێکی ئاسایی کە لە پشیلە بەدیدەکرێت، هەروەها شێخەکەشم بینی بە گریانێکی کوڵ دەگریا، منیش پێم گوت: بۆ دەگری ؟ ئەویش گوتی: وەی بۆ تۆ ! ئەی نابینی ئەم پشیلە دەگری کە دەستی پێدا دەهێنم ! بێگومان ئەمە دایکمەو، لە ڕاستیشدا دەگرێ چونکە بە ئاهوو حەسرەتەوە تەماشام دەکات.

(أبوالحسن علي) دەڵێت: هەروەها بینیم لە گەڵ پشیلەکەدا دەدوا، بە هاوشێوەی ئەو گوفتارانەی کە لە گەڵ کەسانێکی ئامادەبووی دەوروبەریدا پێی دەدوا، وەکو ئەوەی پشیلەکە

---

١٠٥ _ تناسخ: لەم ڕۆژگارەشدا کەسانێکی زۆرمان لە نێواندایە لە چوارچێوەی ئەم بیروباوەڕەدا ئیبلیس سەری لێشێواندوون، واش ڕادەگەیەنن کە موسڵمانن !! جاربەجاریش بە ((التَقَمُّص)) واتە خۆگۆڕین !! ناوی دەبن _ لا حول ولا قوة إلا بالله _.

لێی تێبگات، پشیلەکەش کەم کەم دەستیکرد بە هـاوار، پـێم گـوت: باشـە پـشیلەکە لێـت تێدەگات چ پیێ دەڵێی ؟ گوتی: بەڵێ. ئینجا پێم گوت: ئەی تۆش لە هاوارەکەی تێدەگـەیت؟ گوتی: نەخێر. بۆیە پێم گوت: کەوابوو تۆ روحی پشیلەکەت تێچووەو، ئەو مرۆڤە!!

# ✸ باسی هەستانی ئیبلیس بە سەرلێشێواندنی ئەم ئومەتە لە بیروباوەڕو پەرستنەکاندا:

نووسەر دەفەرمێت:

ئیبلیس بەدوو ڕێگە توانیویەتی بچێتە نێو بیروباوەڕی ئەم ئومەتەوە:

یەکەم: چاولێکاری (التقلید) باب و باپیران.

دووەم: خۆخستنە نێو شتانێکەوە قوڵای نەزاندرێت، بۆیە ئەو کەسە بێتوانا دەبێت بگاتە بنج و بنەوانی ئەو شتە، ئەمەش هۆکارێکی سەرەکی بوو بۆ ئەوەی لاینگرانی ئەم بەشە تووشی چەند جۆرێکی جیاوازی سەرلێشێواندن بن.

لە ڕێگەی یەکەمدا، ئیبلیس بۆ کەسانی چاولێکاری ڕازاندەوە، کە گوایە پێدەچێت بەڵگەکان گومانیان لێکرێت و، ڕاستیش نادیار بێت و، چاولێکردن تەواوترە، ئەوەبوو خەڵکێکی بێشومار لەم ڕێگەیەدا گومڕابوون و، هەر ئەمەشە کە دەبێتە هۆکاری ئەوەی هەموو خەڵك تیابچن، جوولەکەو گاوەرەکان هەستان بە چاولێکردنی باوان و پێشین و زانایانی خۆیان بۆیە گومڕابوون، هەروەها خەڵکانی سەردەمی نەفامیش.

بزانە ئەو هۆیەی لە پێناویدا چاولێکردنیان بە چاك دانا، هەر ئەو هۆیەیە کە لە پێناویدا زەمی چاولێکردن دەکریت، چونکە ئەگەر بەڵگەکان گومانیان لێکرێت و، ڕاستیش نادیار بێت، پێویستە واز لە چاولێکردن بهێنرێت، نەوەکا ببێتە هۆکاری گومڕابوون.

خوای _ سبحانه وتعالى _ لە چەندین ئایەتدا زەمی ئەوانەی کردووە کە پشتگیری چاولێکردنی باوان و پێشینی خۆیان دەکەن، خوای _ عزَّوجل _ دەفەرمێت:

﴿بَلْ قالوا إنَّا وَجَدْنا آباءنا عَلَى أُمَّةٍ وإنَّا عَلَى آثارِهِمْ مُقْتَدون. قُلْ أوَلَوا جِئْتُكُمْ بأهْدَى مِمَّا وَجَدْتُمْ عَلَيْهِ آباءَكُمْ﴾ ﴿الزخرف: ٢٣﴾. واتە: ﴿إنَّا وَجَدْنا آباءَنا عَلى أُمَّةٍ﴾ بەڕاستی ئێمە باوباپیرانی خۆمان لە سەر ئاینێك دیووە ﴿وإنَا عَلَى آثارِهِمْ مُقتَدونَ﴾ وە بەڕاستی ئێمە لە سەر ئاینی ئەوان دەڕۆین ﴿قُلْ أوَلَوا جِئْتُكُمْ بأهْدى﴾ وتی ئەگەرچی من (ئاینی)

ڕاستریــشم بــۆ هێنــابن ﴿مِمَّا وَجَدْتُمْ عَلَيهِ آبَاءَكُمْ﴾ لــەوەی کــە باوباپیرانتــان دیــووه لــه سەری(١٠٦).

واتە: ئایا هەر شوێنیان دەکەون ؟

هەروەها خوای _ عزَّوَجَلَّ _ دەفەرمێت: ﴿ إِنَّهُم أَلْفَوْا آباءَهُم ضالِّينَ. فَهُمْ على آثارِهِمْ يُهْرَعُونَ﴾ ﴿الصافات: ٦٩﴾. واتە: ﴿ إِنَّهُم أَلْفَوْا آباءَهُم ضالِّينَ ﴾ بەڕاستی ئەوان باوبــاپیرانی خۆیانیان بە گومڕای بینی ﴿فَهُمْ عَلَى آثارِهِمْ يُهْرَعُونَ ﴾ ئینجا ئــەوان هانــدەدران بــۆ شــوێن کەوتنیان لە گومڕایدا(١٠٧).

نووسەر دەفەرمێت:

بزانە کەسی چاولێکار متمانەیەکی تــەواوی نییــە بەوانــەی تیایــدا چــاولێکاری دەکــات، چاولێکاری پووچکردنەوەی سوودو کەڵکی ئەقڵ و ژیریە، چونکە ئەقڵ و ژیری بــۆ تێــڕوانین و بیرکردنەوەو چارەسازی بەدیهێنراوە، وە زۆر ناشیرینە بۆ کەسێك مۆمێکی پێدرابێت بەر پێــی خۆی پێ ڕووناك بکاتەوە کەچی بیکوژێنێتەوەو بە تاریکی ڕێ بکات !

بزانە کە هەموو شوێنکەوتوانی ڕێباوەڕەکان هەمیشە شەخصیان لە دڵدا گــەورە دەبێــت، بۆیە شوینی گوفتاری شەخصەکان دەکەون بەبێ بیرکردنەوە لەوەی کــە گوتوویــەتی، ئەمــەش خوودی گومڕایە، چونکە پێویستە تێڕوانین ئاڕاستەی گوفتار بکرێت نەك گوفتاربێژ، ئەوەبوو ئیمامی (علي) _ خوای لێ ڕازی بێت _ بــە (حــارث)ی کــوڕی (حَــوْط)ی فــەرموو: کاتێــك (حارث) لێی دەپرسی: بەڕای تۆ ئێمە دڵنیابین کە (طلحة) و (الزبير) لە سەر ناڕەوایی بوون ؟

ئەویش پێی فەرموو: ئەی (حارث) تۆ سەریان لێشێواندووی ! هــەق بــەپیاوان ناناســرێت، بەڵکو هەق بناسە، شوێنکەوتوانی دەناسیت.

پێشەوا (أحمد)ی کوڕی (حنبــل)یش دەیفەرموو: لە نیشانەکانی کەم زانستیی مرۆڤ ئەوەیە لە چوارچێوەی بیروباوەڕیدا چاولێکاری پیاوێك بکاتەوە.

---

١٠٦ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

١٠٧ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

ئەگەر كەسێكيش بلێت: كەسانی ئاسايی بەڵگە نازانن، ئەی چۆن چاولێكاری نەكەن ؟

بۆ وەڵامەكەی دەڵێین: بەڵگەكانی بیربـاوەر زۆر ئاشـكران وەكـو ئـەوەی لـە باسـی (الدَّهرية)كاندا بەيادمـان هێنانەوە، شتی وەكو ئەوەش بەلای ئاقڵ و ژيـرەوە شـاراوە نابێـت، بەڵام لە (الفروع)دا واتە: لقەكان، بەهۆی ئەوەوە كـە ڕووداوەكـانی (حوادثهـا) زۆربـوون و، زانينی بەلای كەسانی ئاساييەوە قورس بوو، وە زۆر نزيكيشە مرۆڤ تيايدا هەڵە بكـات، بۆيـە واچاكترە كەسانی ئاسايی تيايدا چاولێكاری بكەن بە تايبەت ئەو كەسـە ئاسـايانەی توانـای تاقيكردنەوەو تێڕوانينيان تێدايە، چونكە (إجتهاد)ی كەسانی ئاسـايی لـە هەڵبـژاردنی ئـەو كەسانەدايە كە چاولێكاريان دەكاتەوە (١٠٨).

نووسەر دەفەرمێت:

بەڵام ڕێگەی دووەم: ئيبليس لە سەرلێشێواندنی كەسـانی گەمـژەدا بـەتوانابوو، ئـەوەبوو هەڵيخەڵەتاندن و تووشی چاولێكاری كردن و، لێيخوڕين لێخوڕينی ئاژەڵ، پاشان كەسـانێكی بەديكرد جۆرە زيرەكی و تێگەشـتنێكيان هـەبوو، ئـەوەبوو بـە پێـی توانـای خـۆی هەسـتا بەفريودانيان، دای بە گوێی هەندێكياندا كە وەستان لە سەر چاولێكاری ناشيرينەو، فـەرمانی تێڕوانينی پێكردن، پاشان هەر يەكێك لەوانەی بە جۆرێكی جياواز فريودا:

كەسانێكی واتێگەياند كە وەستان لە گەڵ ڕواڵەتەكانی شەرعدا (ظواهر الشرع) بێتوانايە، ئـەوەبوو لێيخـوڕين بـەرەو ڕێبـاوەڕی فەيلەسـوفەكان، وازيـشی لێنـەهێنان تـا لـە ئيـسلام كردنيەدەرەوە.

بـۆ كەسـانێكی ديكـەش ئـەوەی ڕازانـدەوە كـە بـڕوا نـەكات تـەنها بەوانـە نـەبێ كـە بەهەستەكانی خۆی بۆی ئاشكرا دەبێت.

بۆيە بەم كەسانە دەگوترێت: ئايا بە هەستەكان ڕاستێتی گوفتارەكانی خۆتان زانی؟ ئەگەر گوتيان: بەڵێ، ئەوا خۆيان بە گەورە زانيووە، چونكە هەستەكانمان دەركی ئەو قسانەی نەكرد

---

١٠٨ _ بە مەرجێك متمانەی بە زانست و دين و لە خواترسانی ئـەو كەسـە هـەبێت، هـەر يـەكێك لـەو دووانەش جێگەی ئەويتر ناگرێتەوە بەڵكو دەەبێت ئەو دووانەی تێدا بێت.

که گوتبویان، چونکه ئەوەی بە هەستەکان دەرك دەکرێت جیاوازی تێـدا ڕوو نـادات. ئەگـەر گوتیشیان: بەبێ هەستەکان: ئەوا هەڵگەڕاونەتەوە لە گوفتارەکانی خۆیان.

ئیبلیس کەسانێکی تریشی لەوانە ترساندوو بەدووریخستنەوە لە چـاولێکاری و، ڕۆچـوونی بۆ ڕازاندەوە لە قسەناسیدا (علم الکلام)[١٠٩] بۆ ئەوەی _ بە بانگەشەی خۆی _ لە نەزانینی خەڵکانی ئاسایی بچنە دەرەوە!

---

١٠٩ _ (علم الکلام): واتە بەرگریکردن لە ئاین بە بەڵگە نەقڵیـەکان بـەبێ ئـەوەی بەڵگـەکانی قورئـان وسوننەت بەکاربهێنرێت _، لە گەڵ تێڕوانینی کاروباری فەیلەسوفەکان، وەرگێڕ.

## ✱ ئاکامی قسەناسان (المتکلمین) گومان و شلژانە:

بارودۆخی قسەزانان جۆراوجۆری زۆری بە خۆوە دیوەو، مشتومڕیش گەیاندنیە ئەو ئاستەی کە زۆریەیان گومان پەیدا بکەن، کۆمەڵێکی دیکەشی گەیاندە ئاستی خوانەناسی و ئیلحاد، زانایانی پێشینی ئەم ئومەتەش کە بێدەنگی خۆیان نواندووەو مشتومڕیان لە بوارەکانی بیروباوڕدا نەکردووە بە بەڵگە ئەقڵیەکان لە ڕووی بێ توانایەوە نەبووە، بەڵکو بۆیان دەرکەوتووە کە تینویەتیەك ناشکێنێت و، کەسی تەندروستیش دەکاتەوە بە نەخۆش، بۆیە دەستیان لێهەڵگرت و، قەدەغەی دەستێوەردانی کەسانی دیکەشیان دەکرد لەو بوارە، تا ئەو ئاستەی پێشەوا (الشافعي) _ بە ڕەحمەتی خوا بێت _ دەیفەرموو:

ئەگەر بەندەی خوا دووچاری ئەنجامدانی تێکڕای ئەوانە ببێت کە خوای تعالی قەدەغەی کردووە جگە لە شیرك و هاوەڵ پەیداکردن لەوەی چاکتر دەبێت کە تێڕوانێتە قسەناسی.

دەیفەرموو: ئەگەر گوێبیستی پیاو بووی دەیگوت (الأسم هو المسمی)، یا (أو غیر المسمی)، شایەتی بدە کە لە خەڵکانی شوێنکەوتووی قسەناسیەو، هیچ ئاینێکی نییە.

هەروەها دەیفەرموو: حوکمی من بەرامبەر بە قسەناسان ئەوەیە کە بە سەعفی دارخورما لێیان بدرێت و، بە نێو هۆزو تیرەکاندا بگەڕێندرێن و، بگوترێت: ئەمەیە پاداشتی ئەوانەی کە وازیان لە قورئان و سوننەت هێناوەو، دەستیان داوەتە قسەناسی.

پێشەوا (أحمد)ی کوڕی (حنبل) دەیفەرموو: هەرگیز قسەناسان سەرکەوتوو نابن، قسەناسان ئایندارێکی زیندیق و بەڕواڵەتن(١١٠).

گوتم _ ابن الجوزي _ چۆن زەمی قسەناسی نەکرێت لە کاتێکدا کۆمەڵی (المعتزلة)ی گەیاندە ئەو ئاستەی بڵێن: خوای _ عَزَّوَجَلَّ _ گشتێتی (جُمَل) شتەکان دەزانێت و، وردەکاری و ڕوونکردنەوەکانی (تفاصیل) نازانێت.

---

١١٠ _ پێشەوا (السیوطي) _ بەرەحمەتی خوا بێت _ کتێبێکی گەورەی داناوە بە ناوی ((صون المنطق والکلام عن فنّ المنطق والکلام)) واتە ((پاراستنی قسەو ئاخاوتن لە هونەری قسەزانی و ژیرێتی)) بە دوای هەموو ئەم (أثر)انەدا گەڕاوەو هەڵیسەنگادوون و (تخریج)ی کردوون، با تەماشا بکرێت.

(جهم)ى كورِى (صفوان)يش دەيگوت (علم)و، (القدرة)و، (حياة)ى خـــوا بـەديهێنراوە (محدث).

(أبومحمد النُّوبَخْتِي) لە (جـهم) دەگێڕێتەوە كە گوتوويـەتى: خـواى _ عَزَّوجَلَّ _ شـتێك نييە (إنَّ اللهَ عزَّوجلَّ ليس بشيءٍ).

هــەروەها (أبوعليّ الجُبَّائيُّ) و (أبوهاشم) و ئەوانەى شوێنيان كـەوتن لـە (بـصري)ەكـان دەيانگوت : نەبوو (المعـدوم) شـت و، زات و، نـەفس و، جەوهـەرو(١١١)، سـپى و، زەرد و، سورە، خواى _ سبحانه وتعالى _ ناتوانێت زات بكات بـە زات و، عـەرەز(١١٢) بكـات بـە عەرەز و، جەوهەر بكات جەوهەر، بەڵكو لە ڕاستيدا بـە توانايـە زات لـە نـەبۆوە بـۆ بـوون دەرهێنێت.

(القاضي أبويَعْلى) لە كتێبى (المقتبس)دا دەڵێت: (العَلاف المعتزلـي) پێى گـوتم: دڵنيـابن خۆشگوزەرانى خەڵكى بەهەشت و سزاى خەڵكى دۆزەخ شتێكن لەم بارەوە خوا وەسف ناكرێـت بەتوانين بۆ پاڵپێوەنانى و زياتركردنى، بۆيـە دروسـت نييـە نەويـستى بكـەيت و، نەلێيـشى بترسيت، چونكە ئەو كاتە خواى تعالى تواناى خەيرو شەڕو، سوودو زيانى نابێت.

هەروەها دەڵێت: خەڵكانى بەهەشت بـەبێ جووڵـەيى وبـەبێ بێـدەنگى دەمێننـەوە، هـيچ وشەيەكيان لێوە بەدەرنايەت و، نەخۆيان و نەخواكـەيان توانـاى بـە جێهێنـانى هـيچ شـتێك

---

١١١ _ الجوهر: هەموو شتێك سەربەخۆ بێت بە (الجوهر) ناودەبرێت بۆ نموونە جەستەى مرۆڤـ (الجـوهر)ە، خۆر (الجوهر)ە، مانگ (الجوهر)ە، بۆ زياتر تێگەشتن بگەڕێرەوە بۆ: محمد بن صالح العثيمين، شـرح العقيـده السفارينية ج٢٠ ص١٩٢، وەرگێڕ.

١١٢ _ العَـرَض: سيفاتەكانى درێژى و كورتى و ڕەنـگ و هێـزو لاوازى و بـەو هاوشـێوانە بـە (العَرَض) ناودەبرێت. بۆ نموونە دەگوترێت فلان كەس (الجوهر)ە، بەڵام درێژە ياخود كورتـە ئـەوە (العَـرَض)ە، دەرگـا (الجوهر)ە، بەڵام سورە ياخود سپى يە ئەمە (العَـرَض)ە، بۆ زياتر تێگەشتن بگەڕێرەوە بۆ: محمـد بـن صـالح العثيمين، شرح العقيده السفارينيه ج٢، ص١٠٢، وەرگێڕ.

لەوانەیان نابێت، چونکە ڕووداوەکان (الحوادث) بە گشتی پێویستە کوتایەکیان هەبێت تیایـدا تەواو بن و، پاش ئەوەش هیچ شتێك نابێت !

بەرزی و بڵندی بۆ خوای تعالی.

گوتم _ ابن الجوزي _: (أبوالقاسم عبدالله)ی کوڕی (أحمد)ی کـوڕی (محمـد البَلْخـيُّ) لـە کتێبی (المقالات)دا بەیادمان دەهێنێتەوەو دەڵێت (أبا الهُذَيْل) کـە نـاوی تـەواوی: (محمـد)ی کوڕی (الهُذَيْل العَلاف)ە تاك بۆتەوە لەو گوتنەیدا کە دەڵێت:

خەڵکی بەهەشت جوڵەیان تەواو دەبێت، بۆیە باریان دەگۆڕێـت بـۆ بـارێکی بـێ بـزاوت و سرەوتنی بەردەوام.

دەشیگوت: زانینی خوا بریتیە لە خوا (علم الله هو الله)، وە توانای خواش بریتیە لە خـوا (قدرة الله هو الله).

(أبوهاشم) دەیگوت: ئەگەر کەسێك لە هەموو شتێك تەوبە بکات، بەڵام قومێك ئـارەقی خواردەوە، ئەوا بەهەتا هەتایی بە سزای خەڵکی کوفر سزا دەدرێت.

(النَّظَّام) دەیگوت: خوای _ عَزَّوَجَلَّ _ توانای هیچ شتێك لە شەڕی نییە، بـەڵام ئیبلـیس توانای خەیرو شەڕی هەیە.

(هشام الفُوَطيُّ) دەیگوت: وەسفی خوای تعالی ناکرێت بەوەی لە (أزل)ەوە(١١٣) زانایە.

هەندێ لە (المعتزلة) دەیانگوت: درۆکردن شیاوە بۆ خوای تعالی، بەڵام لێی نەوەشاوەتەوە.

(المُجْبِرة)ش دەیانگوت: ئادەمی هیچ توانستێکی نییە، بەڵکو وەکو بێ گیان ئیختیـارو و کرداریان لێ سەندراوەتەوە.

المرجِئـةُ)ش دەیـانگوت: هەرکـەس دان بـە هـەردوو شـایەتوومانەکەدا بنێـت و، هـەموو سەرپێچیەکانیش ئەنجام بـدات، هـەرگیز ناچـێتە دۆزەخـەوە ئـەم کۆمـەڵـە دژبـە فـەرموودە

---

١١٣ _ أزل: ئەو زەمەنە کۆن و دێرینەیە کە سەرەتای نی یە، بڕوانە: رسائل الشيخ محمد بن إبراهيم الحمد في العقيدة، ج١٤، ص٢٦، وەرگێڕ.

(صحیح)ەکانیش وەستانەوە سەبارەت بەوەی کە سەرپێچیکارانی یەکتاپەرستان دەچنە ناگرەوەو لێشی دەردەکرێن (١١٤).

(ابن عقیل) دەڵێت: چەند لەوە دەچێت دانەری ڕێبازی (الإرجاء) زیندیق و موسڵمانێکی بەڕواڵەت بێ، چونکە چاکێتی جیهان لە جێگیرکردنی هەڕەشەو(الوعید)، بڕواهێنان بە پاداشتە، کۆمەڵی (المرجئة)ش کاتێك نەیانتوانی نکۆڵیی لە دروستکار بکەن " چونکە دوورکەوتنەوەی جەماوەرو، پێچەوانێتی ئەقڵی تێدایە، هەستان بە لابردنی سوودی جێگیرکردن (الإثبات)، کە بریتیە لە ترس و چاودێریکردن (الخشیة والمراقبة)، هەروەها سیاسەتی شەرعیشیان ڕۆخاند، بۆیە ئەمانە شەرترین تایەفەن بەسەر ئیسلامەوە.

گوتم _ ابن الجوزي _: (أبو عبدالله)ی کوڕی (کرَّام)یش هاتوو، لە ڕێباوەڕەکاندا خراپترینیانی هەڵبژاردو، لە فەرموودەکانیشدا لاوازترینیان و، مەیلی لێکچواندنیشی (التشبیه) دەکرد، هەروەها (حلول الحوادث)ی بە شیاو دانا لە زاتی خوای پەروەردارداو(١١٥) دەیگوت: خوای تعالی توانای گەڕانەوەی جەستەو (الجواهر)ەکانی نییە، بەڵکو دەتوانێت بەدیانبهێنێت.

---

١١٤ _ ئەمەش ئاماژەیەکە بۆ فەرموودەکانی تکاکاری، کە فەرموودەگەلێکی (متواتر)ن بە کوێرایی چاوی بیدعەچیەکان لە (الروافض) و (الإباضیة) و، کەسانی تریش کە وە دوویان کەوتن و بەرێگەی ئەواندا دەچن !

بڕوانە کتێبی (الشفاعة)ی شێخ (مُقبل)ی کوڕی (هادي الوادعي)، چونکە بەڕاستی کتێبی داناوەو وشیاری داوە.

١١٥ _ بێژەی: ((حلول الحوادث)) نوێ یە، لە قورئان و سوننەتدا نەهاتووە.

بۆیە ئەگەر کەسێك مەبەستی ئەوە بێت کە خوای تعالی شتێك لە بەدیهێنراوانی خۆی تیایدا جێگیر دەبێ، ئەوا گوفتارێکی نەویستراوو پووچە، بەڵکو کوفرە.

بەڵام ئەگەر کەسێك مەبەستی جێگیرکردنی سیفاتە کرداریەکانی خوای پەروەردگار بوو، ئەوا مەبەستێکی چاکەو، لە بێژەو شێوازی دەربڕیندا هەڵەی کردووە.

مەسەلەکەش درێژەپێدانێکی فراوانتری هەیە، خستوومەتە نێو کتێبەکەمەوە: ((منهاج التأسیس في الرد علی أهل البدع والتلبیس))، بەشی یەکەم، با تەماشا بکرێت.

(السَّالِمِيّة)كانيش(١١٦)دەیانگوت: خوای _ عَزَّوجلَّ _ له ڕۆژی قیامەتـدا بەدەردەكـەوێت بۆ هەموو شتێك لـە ماناكەیـدا، بۆیـە ئـادەمی بـە هاوشـێوەی ئادەمیـەك بەدیدەكـەن و، جنۆكەش بە هاوشێوەی جنۆكە بەدیدەكەن!

دەشیانگوت: خوای تعالی نهێنیەكی هەیـە، ئەگـەر پووچـیكاتەوە، چارەسـازیش پـووچ دەبێتەوە.

گوتم _ ابن الجوزي _ پەنادەگرم بە خـوا لـەو تێـڕوانین و زانـستانەی كـە ئـەم ڕێبـاوەڕە دزێوانەی هێنایە كایەوە.

قسەناسانیش (أرباب الكلام) بانگەشەیان دەكرد كە گوایە باوەڕ تـەواو نابێـت تـەنها بـە زانینی ئەوانە نەبێت كە ڕێكیان خستووە، ئەمانەش بە هەڵەدا چـوون، چـونكە پێغەمبـەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ فەرمانی بە باوەڕهێنان كردووە، بەڵام فەرمانی بە مشتومڕی قسەناسان نەكردووە، ئەو هاوەڵە بەڕێزانەش كە پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليـه وسـلم _ شایەتی چاكترینی خەڵكانی (١١٧)بۆ داون ڕۆشتن و مردن و لە سەر هەمان ڕێبازی پێغەمبـەر خوا بوون _ صلى الله عليه وسلم _.

زەمی قسەناسی و قسەناسانیشمان بۆ كراوە وەكو ئەوەی لە پێشەوە ئاماژەمان پێدا.

---

١١٦ _ السالمية: شوێنكەوتەی (أبي عبـدالله محمد)ی كوڕی (أحمد)ی كـوڕی (سـالم)ن كـە لەسـاڵی (٢٩٧ كۆچی) مردووە، هەروەها كوڕەكەشی (الحسن أحمد)ی كوڕی (محمد)ی كـوڕی (سـالم) كـە لـە سـاڵی (٣٥٠ كۆچی) مردووە، (أحمد)ی كوڕی (محمد)ی كوڕی (سالم) لەسەر دەستی (سهل)ی كـوڕی (عبـدالله التـستري) فێربوبو، (السالمية)كان نێوان گوفتاری ئەهلی سوونەو گوفتاری (المعتزلـة) كۆدەكەنەوەو مەیلی (التـشبيه)و ئارەزووی صوفیەتێكی ئیتحادیشیان دەكرد، بڕوانـە: موقـع مجلـة جامعـة أم القـرى علـى الإنترنيـت، ج١، ص١٢٥. وەرگێڕ.

١١٧ _ ئەوەش فەرمایشتی پێغەمبەری خوایە _ صـلى الله عليەوسـلم ((خـير النـاس قرنـي، ثـم الـذين يلونهم، ثم الذين يلونهم...)) واتە: ((چاكترین خەڵكانێك لە سەردەمی مندایە، پاشان ئەوانەی بە دوایاندا دین و، پاشان ئەوانەی بە دوایاندا دێن...)). وهو مخرج في تعليقنـا علـى: ((التحـف في مـذاهب الـسلف)) (ص٤٤) للشوكاني، طبع مكتبة ابن الجوزي.

هەروەها باس وخواسی وازهێنانی قسەناسانیشمان بۆ باسکراوە لەو ڕێبازەی کە پێوەی ماندوودەبوون، چونکە دزێوی و ناشرینی بەڵاو کارەساتەکانیان بە چاوی خۆیان بینی:

(أحمد)ی کوڕی (سِنان) دەڵێت: (الولید)ی کوڕی (أبانَ الكرابیسي) خاڵم بوو، کاتێ هاتە سەرەمەرگ، بە کوڕەکانی گوت: ئایا کەسێك دەناسن لە قسەناسیدا لە من شارەزاتر بێ ؟ گوتیان: نەخێر. گوتی:

ئایا تاوانبارم دەکەن ؟ گوتیان: نەخێر. گوتی: بەڵام من ئامۆژگاریتان دەکەم، قبوولتانە ؟ گوتیان: بەڵێ. گوتی: لەسەر ئەو ڕێبازەبن کە خەڵکانی شوێنکەوتووی سوننەتی لە سەرە، چونکە بینیم حەقیان پێ یە.

(أبوالمعالي الجُوَیْني) دەیگوت: گەشتێکم بە نێو خەڵکانی ئیسلام و، زانستەکانیاندا کردو، بە دەریای گەورشدا سەفەرم کرد، خۆشم نقوومی ئەوانە کرد کە قەدەغەیان دەکرد، هەموو ئەوانەم لە پێناوی بەدەستهێنانی هەق و، هەڵهاتن لە چاولێکاری ئەنجام دەدا، ئیستاش، لە هەموو شتێك پاشگەزبوومەتەوە بۆ وشەی هەق، ئامۆژگاریتان دەکەم بەوەی ئێوە تەنها شوێنکەوتووی ئاینی کەسە پیرو بەتەمەنەکان بن، بۆیە ئەگەر خوای هەق بە چاکەو بەزەیی خۆی فریام نەکەوێت و لە سەر ئاینی کەسە بەتەمەنەکان نەمرم و، لە سەرەمەرگیشدا بە وشەی (الإخلاص) ئاکامم کۆتا پێ نەهێنێت، ئەوا (وَیْل) بۆ (ابن الجُویْني).

بە هاوەڵانی خۆشی دەگوت: ئەی هاوەڵانمان ! کاری قسەناسی مەکەن، چونکە ئەگەر بمزانیبا قسەناسی دەمگەیەنێتە ئەو باروحاڵە خراپەی کە پێی گەشتووم، هەرگیز خۆم بەو کارەوە خەریك نەدەکرد.

(أبوالوفاء)ی کوڕی (عَقِیل) بە هەندێ لە هاوەڵانی خۆی دەگوت: من دووپاتی دەکەمەوە کە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا _ صلی الله علیه وسلم _ مردن و کەسیان (الجوهر)و (العَرَض) یان نەدەزانی، بۆیە ئەگەر ڕازیت وەکو ئەوان بیت، ئەوا وەکو ئەوان بەو، ئەگەر بینیشت ڕێگەی قسەناسان لە ڕێگەی (أبي بکر) و (عمر) شایستەترە، ئەوا تیابچیت بۆ ئەوەی بینیوتە.

گوتوویەتی: دەستێوەردانی قسەناسیی شوێنکەوتووانی گەیاندە گومان پەیداکردن و، زۆر لەوانەشی بە ئیلحادو بێ خوایەتی گەیاند، بۆیە بۆنی بێ خوایەتی لە قسە لە دەم دەرچووەکانی (فلتات کلام) قسەناساندا بەدیدەکرێت، بنەڕەتی ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ قایلنەبوونیان بەوەی شەرع پێی قایل بووەو، بە دوای ڕاستیەکاندا دەگەڕان، هێزی ئەقڵیش توانای دەرکی ئەو حیکمەتانەی نییە کە خوای تعالی تاك بۆتەوە تیایداو تەنها خۆی دەیزانێت، وە خوای تعالی زانستی خۆی بۆ بەندەکانی ئاشکرا نەکردووە سەبارەت بە هەقیقەتی ئەو شتانەی کە دەیزانێت.

دەڵێت: بە درێژای تەمەنم لە یەکەمدا ڕۆچووم، پاشان دوابەدوا بۆ ڕێباوەڕی قورئان و سوننەت گەڕامەوە.

لە ڕاستیدا دەیانگوت: ڕێباوەڕی کەسە پیرو بەتەمەنەکان تەواوترە، چونکە کاتێ گەشتنە نەوپەڕی وردبوونەوە لە تێڕوانیندا، هیچ (التعلیلات والتأویلات)ێکیان بەدینەکرد ئەقڵ دووربخاتەوە، بۆیە لە گەڵ ڕێ و ڕەسمەکانی شەرعدا وەستان و، لە گوفتار لایاندا بۆ بەهانەو ڕوونکردنەوە، ئەو کات ئەقڵیش ملکەچ بوو کە حیکمەتێکی خوای بەسەرەوەیە، بۆیە تسلیم بوو.

## ✸ هەستانی ئیبلیس بە سەرلێشێواندنی ئومەتەكەمان لە بواری بیروباوەڕەكاندا:

كۆمەڵانێك لـە گـەڵ ڕووالّەتەكانـدا (الظـاهر) وەسـتان، بۆیـە بـە گـوێرەی داخـوازی و ویستەمەنیەكانی هەست شتەكەیان لێكدایەوەو، گوتیان: خوای تعالی جەستەیەكە! بـەرزیو بڵندی بۆ خوای تعالی.

ئەمە ڕێباوەڕی (هشام)ی كوڕی (الحَكَم)و، (علـي)ی كـوڕی (منـصور)و، (محمـد)ی كـوڕی (الخليل)و، (یونس)ی كوڕی (عبدالرحمن) بوو.

پاشان جیاوازیان تێكـەوت و، هەنـدێكیان دەیـانگوت: جەسـتەیەكە وەكـو جەسـتەكان ! هەندێكی تریشیان دەیانگوت: وەكو جەستەكان نییە (لا كالأجسام) !!

دوای ئەوەش جیاوازیان تێكەوت و، هەندێكیان دەیانگوت: نورو ڕووناكیە. هەندێكیشیان دەیانگوت: لەسەر شێوەی پارچەیەكی سپی یە (السبيكة البيضاء).

(هشام)ی كوڕی (الحكم) ئاوهای دەگوت.

دەشیگوت: خواوەند حەوت بستە بە بستی خۆی (١١٨).

بەرزی و بڵندی بۆ خوای تعالی.

نووسەر دەفەرمێت:

ئەمەش وای بۆ پێویست دەكات كە چۆنیەتیەكیشی (كيفية) هەبێ، ئەمەش یەكتاپەرستی هەڵدەوەشێنێتەوە، جێكیریش بووە كە ماهیەت دروست نابێت مەگەر بـۆ ئـەو شـتانەی كـە

---

١١٨ _ ئەمەش كوفرێكی تەواوە پەنا بەخوا، چەند جوانە گوفتارەكەی (نُعیم)ی كوڕی (حماد): ((مَن شبَّه الله بخلقه " كفـر...)) واتـە: هەركـەس خـوای تعـالی بـچوێنێت بـە بـەدیهێنراوانی خـۆی " كافرة...)).

وانظر لزاماً تعليق الذهبي _ رحمه الله _ في ((سير أعلام النبلاء)) (١٣ / ٢٩٩ _ ٣٠٠)) على هذه الكلمة الذهبية.

خاوەن ڕەگەزن و هاوتاشیان هەیە، بۆیە پێویستە خوای تعالی لەوانــە تــاك بكرێتــەوەو، ئــەو بۆچونانەشی لێ بەدوور بگیرێت، چونکە خوای تعالی خاون ڕەگەز نییە و، هاوشێوەشی نییە.

بەبۆچونت ئەمانە چۆن (قـدیم)ی بۆ خوا جێگیر دەكەن، ئەی بۆ بەلاشیانەوە شـیاو نـەبێت خوای تعالی وەکو نادەمیەکان نەخۆش کەوێت، یا بفەوتێت.

پاشان پێت دەگوترێت: هەرکەس بانگەشـەی (التجـسیم) واتـە قـەوارەوەرگرتن بـۆ خـوای تعالی بکات، بەهـەر بەلگەیـەك بێـت ؛ ئـەوا هەسـتاوە بـە جێگیرکردنـی تازەبـەدیهێنانی جەستەکان (حَدَث الأجـسام)، ئـەوەش پێـشانت دەدات کـە ئـەو خواوەنـدەی بـاوەڕت وابـوو جەستەیەکی تازەبەدیهاتووە (قدیم) نییە .

هەروەها لە گوفتارەکانی کۆمەڵی (المجسِّمةِ): شیاوە خـوای تعـالی دەسـتی پیاهێنرێـت و دەستی لێدرێت.

بۆیە پێیان دەگوترێت: کەوابوو بە گوێرەی گوفتارەکانی ئێوە شیاوە دەستی پیاهێنرێت و، دەستی لێدرێت و، دەستیشی لە مل بکرێت !

هەندێکیشیان دەیانگوت: جستەیەکە، بەتاڵی و چۆڵایەکەو (فضاءٌ) هەموو تەنەکانی تری تێدایە.

(بیانُ)ی کوڕی (سَمْعانَ) وای ڕادەگەیاند کە خواوەندەکـەی هەرهـەمووی نـوورو ڕوونـاکی یەو، لە شێوەی پیاوێکدایە، هەموو ئەندامەکانیشی دەفەوتێت جگە لە ڕووی ! بۆیە (خالد)ی کوڕی (عبدِالله) کوشتی.

(المغیرة)ی کوڕی (سعد العِجْلِيُّ) وای ڕادەگەیانـد کـە خواوەندەکـەی پیاویکـە لـە نـوورو ڕووناکی، تاجێکی بەسەرەوەیە لە نوورو ڕووناکی، ئەندامی هەیەو دڵێکیـشی هەیـە دانـایی لێوە هەڵدەقولێت، ئەندامەکانیشی لە سەر شێوەی پیتی هیجائین.

(زُرَارةُ)ی کوڕی (أعْـيَنَ) دەیگوت: خوای تعالی لە (أزل)دا بەتوانا و زیندو و زانا نـەبوو ، تا بۆ خۆی ئەو سیفەتانەی بەدیهێنا (لم یکنِ الباري قادراً حیاً عالماً في الأزل حتی خلَقَ لنفـسهِ هذه الصفات).

بەرزی و بڵندی بۆ خوای تعالی.

لە سەرسوڕمێنترین باروحاڵەکانی کۆمەڵی (الظاهريَّة)یەش گوفتاری (السالِمِيَّة)کـان بـوو کە دەیانگوت: مردوو لە گۆڕدا دەخوات و دەخواتەوەو زەواجیش دەکات، چونکە گوێبیـستی کامەرانیی (نعیم) بوون و، لە جۆرەکانی کامەرانیش لەمە بەدەریان نەدەزانی (١١٩)، کەچـی ئەگەر قایل بووایەن بەوەی لە فەرموودەکاندا هاتووە، کـەوا ڕوحـی بـڕواداران دەکرێتـە نێـو چیکڵدانەی باڵندەگەلێکەوەو لە دارەکانی بەهەشت دەخۆن (١٢٠)، بـەدڵنیایی قایـل دەبـوون، بەڵام ئەوەیان گەڕاندەوە بۆ جەستە بۆیە دەیانگوت دەخوات و دەخواتەوە.

(ابن عقیل) دەفەرمێت: ئەم ڕێباوەڕە نەخۆشیەکی هەیە بە هاوشێوەی ئـەو هەسـتکردنەی کە خەڵکانی سەردەمی نەفامی دەیانهێنایە خەیاڵی خۆیانداو، ئەوەی کـە دەربـارەی تـەرم و جەستەی مرۆڤ پاش مردن دەیانگوت، بۆیە دواندنی ئەمانە پێویستە لە ڕوانگەی نوازشت و ئاگالێبوون و دڵنەشکاندنی ئەم کۆمەڵەوە بێت بەوەی هەستی پێدەکـەن، نـەك لـە ڕوانگـەی مشتومڕەوە، چونکە بەرهەڵستیکردن خراپیان دەکات. لە ڕاسـتیدا ئیبلـیس هەسـتا بەسـەر لێشێواندنی ئەمانە چونکە بەدوای لێکدانەوەیەکی تەواوی دەقـاودەقی بەڵگـەکانی شـەرع و ئەقڵدا نەگەڕان و وازیان لێهێنا، چونکە کاتێك کامەرانیی و سزا بۆ مردوو لای خواوە هـات، ئاشکرا بوو کە ئەو دووانە دەخرایە سـەر جەسـتەکان و گۆڕەکـان لـە ڕووی پێناسـەکردنەوە، ئەوەبوو دەگوترا: خاوەنی ئەم گۆڕەو ئەم ڕوحەی لەم جەسـتەدایە کامەرانـە بـە خۆشـیەکانی بەهەشت و سزادراوە بە سزای ئاگر.

---

١١٩ _ بەداخەوە هەر ئەم گوفتارە گوفتاری هەندێ کەسانی سەربە چـوار مەزهـەب و ڕێباوەڕەکـەن کـە چاولێکاری دەکەن.

١٢٠ _ أخرجه أحمد (٣ / ٤٥٥)، والنسائي (١ / ٢٩٢)، وابن ماجة (٤٢٧١)، والترمـذي (١ / ٣٠٩) " عن كعب. وسنده صحيح.

## * ڕێگەی ڕزگاربوون لە ئەوە:

نووسەر دەفەرمێت:

ئەگەر کەسێك بڵێت: ڕێگەی چاولێکارانت لە بیروباوەڕو (الأصول)و، ڕێگەی قسەناسانیشت خەوشدار کرد، باشە ڕێگەی دروستی ڕزگاربوون لە سەرلێشێواندنەکانی ئیبلیس چییە؟

وەڵام: ئەوەی کە پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ و، هاوەڵانی و، شوێنکەوتووانیان بە چاکە _ کە پێشینی چاك بوون _، لە سەری دەچوون بریتی بوو لە جێگیرکردنی خوای تعالى و، جێگیرکردنی سیفاتەکانی بە پێی ئەوەی لە قورئان و لە سوننەتدا هاتووە، بەبێ تەفسیرو(١٢١)، بەبێ گەڕان بەدووی ئەوانەی کە لە توانای ئەقڵی مرۆڤدا نییە لێی تێبگات، قورئانیش گوفتاری خوای پەروەردگارەو (مخلوق) نییەو، لە ناوەڕۆکی ئایەتەکانیش ناچینە دەرەوەو، بەبیروڕای خۆشمان قسەی تێدا ناکەین، پێشەوا (أحمد)ی کوڕی (حنبل) قەدەغەی دەکرد پیاو بڵێت: (لفظي بالقرآن مخلوق أو غيرُ مخلوق) واتە گوتنم بە قورئان (مخلوق)ە یا (مخلوق) نییە، نەوەکو لە شوێنکەوتنی پێشین(١٢٢) بچێتە دەرەوە بۆ داهێنانێکی نوێ (حَدَث).

لە (جعفر)ی کوڕی (بَرْقان)ەوە دەڵێت: (عمر)ی کوڕی (عبدالعزيز) بە پیاوێکی فەرموو _ کە پیاوەکە دەربارەی هەواو ئارەزووکان لێی پرسیبوو _ لە سەر ئاینی منداڵەکان بە کە لە حوجرە دەخوێنن و، لە سەر ئاینی دەشتەکیەکان بە، جگە لە ڕێبازی ئەو دووانەش هەموو شتێکی دیکە لە بیری خۆت بەرەوە.

---

١٢١ _ واتە بەبێ تەفسیری چۆنیەتی و ئەو حەقیقەتەی بە خوای پەروەردگارەوە پەیوەندە.

١٢٢ _ ئەمەیە کە پێنووسەکانی خۆمانمان بۆ دەرهێناوەو، نەفسی خۆمان بۆ تەرخان کردووە، بۆیە پەروەردگارا یارمەتیدەرمان بەو بە پێی ویستی خۆمان داواکەمان بە جێ بێنە.

وقال عمرُ بنُ عبدِالعزيزِ: إذا رأيْتَ قوماً يتنـاجَوْنَ في ديـنهم بـشيءٍ دون العامَّـةِ " فـاعْلَم أَنَّهـم علـى تأسـيسِ ضـلالةٍ (١٢٣) واتـه: (عمـر)ی کـوڕی (عبـدالعزیز) دەيفـەرموو: ئەگـەر کۆمەڵێکت بەدیکرد دەربارەی شتێك لـە ئاینەکـەیان بـەنهێنی و دوور لـە خـەڵکی گـشتی ئاسایی دەدوان، بزانە ئەو کەسانە خولیای ئەوەن کە گومڕاییەك دامەزرێنن.

(عمـر)ی کـوڕی (عبـدالعزیز) بـۆ هەنـدێ لـە کاربەدەسـتانی خـۆی دەنووسـێ و دەڵـێ: ئامۆژگاریـت دەکـەم بـە زۆر ترسـان لـە سـزای خـوای _ عَزَّوجـلَّ _، شـوێنی سـوننەتی پێغەمبەرەکەی بکەوە _ صلی الله علیه وسلم _، واز بهێنـە لـەو شـتانەی کـە کەسـانێك تازەدایانهێناوە (أحدث) چونکە پێغەمبەری خوا _ صلی الله علیه وسلم _ ڕێگەی ڕاستی بۆ بەجێ هێشتوون، بشزانە ئەو کەسەی سوننەتەکانی داناوە هەر خۆشـی بـە دژەکـانی ئاگـادار بووە، لە هەڵەو، لە ڕاستیی لادان و، ڕۆچـوون و، قووڵبوونـەوە، ئـەوەبوو پێـشینی ڕابـردوو زانابوون بۆیە سنووریی شەرعیان نەبەزاندو، تێڕوانینێکـی بـەهێزی پەیڕەوکاریـشیان هـەبوو بۆیە پێویستیان بە هیچیتر نەما.

لە (ریوایة)تێکی دیکەشدا لە (عمر)ەوە دەفەرمێت: پێـشین لـە ئاشـکراکردنی شـتەکاندا بەهێزبوون، هیچ کەسیش هەڵنەستا بە تازەگەری (أحـدث) تـەنها ئـەو کەسـانە نـەبێت کـە شوێنی ڕێچکەیەکی تر کەوتن و، خۆیان لە پێشین بە چاکتر دادەنـا، بۆیـە کەسـانێك لەمانـە بێتوانابوون بگەنە ئاستیان، بۆیە لە لایەن پێشینەوە شاردرانەوەو، کەسانێکیش ئارەزووی لـە ئەوان بەرزتری هەبوو، بەڵام پێشینی چاکەوە بە سەریدا سەرکەوتن!

---

١٢٣ _ رواه أحمد في ((الزهـد)) (ص ٤٠٨). ئاینەکەشمان _ سپاس و ستایش بۆ خوا _ ئاشکراو ڕوونـە، هیچ شتێکی شاراوەو، پەنهان و، خەفەکردن و، نهێنی تێدا نیە.

## * باسى هەستانى ئیبلیس بە سەرلێشێواندنى (الخوارج)ەکان:

نووسەر دەفەرمێت:

یەکەم کەسی (الخوارج)ەکان وخراپترینیان باری (ذوالخُوَیْصرة) بوو:

عَنْ أبِي سَعيدٍ الخُدريِّ _ رضي الله عنه _ قالَ: بَعَثَ عَلِيٌّ _ رضي الله عنه _ من اليَمَنِ إلى رَسُولِ اللهِ _ صلى الله عليه وسلم _ بذُهَيْبَةٍ في أديمٍ مَقْروظ، لم تُخَلَّصَ من ترابِها، فَقَسَمَها رَسُولُ اللهِ _ صلى الله عليه وسلم _ بَيْنَ أربَعَةٍ: بينَ زَيْدِ الخيلِ، والأقرع بن حابِسٍ، وعُيَيْنَةَ بنِ حِصْنٍ، وعلقمةَ بنِ علاثةَ أو عامر بن الطُّفيلِ _ شكَّ عُمارةُ _ فوجدَ مِن ذلك بعضُ أصحابِه، والأنصارُ وغيرهم، فقالَ رسولُ اللهِ:

((ألا تأمَنوني وأنا أمينُ مَن في السماء، يأتيني خَبَرُ السماءِ صباحاً ومساءً؟!))(١٢٤).

ثُمَّ أتاهُ رَجلٌ غائِرُ العينَيْنِ، مُشْرِفُ الوجنتينِ، نائِيءُ الجبهةِ، كَثُّ اللحيةِ، مشمِّرُ الإزارِ، محلوقُ الرأسِ، فقالَ: اتقِ الله يا رسولَ اللهِ! : فرفعَ رأسهُ إليهِ، فقالَ:

((وَيْحَك! أليسَ أحقَّ الناسِ أنْ يَتَّقيَ اللهَ أنا ؟!)).

ثُمَّ أدبَرَ، فقالَ خالدٌ: يا رسولَ اللهِ! ألا أضرِبُ عُنُقَهُ ؟

فقالَ رَسُولُ اللهِ: ((فلعلَّهُ يكونُ يُصلِّي)).

فقالَ: إنَّه رُبَّ مُصَلٍّ يقولُ بلسانِه ما ليسَ في قلبِه.

فقالَ رسولُ اللهِ _ صلى الله عليه وسلم _: ((إنِّي لم أُؤمَرْ أن أُنَقِّبَ عن قلوبِ الناسِ، ولا أشُقَّ بطونَهم)).

ثم نظرَ إليهِ النبيّ _ صلى الله عليه وسلم _ وهو مُقْفٍ، فقال:

إنَّ مِن ضِئضِيءِ هذا قَومٌ يَقرؤنَ القُرآنَ، لا يُجاوِزُ حَنَاجِرَهُمْ. يَمْرُقُونَ مِنَ الدينِ كما يَمرُقُ السَّهمُ من الرَّمِيَّةِ)).

واتە: لە (أبي سعيد الخُدري) _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی: ئیمامی (علي) _ خوای لێ ڕازی بێت_ لە (اليمن)ەوە هەندێ زێڕی لە نێو پێستەیەکی دەباخکراودا بۆ

---

١٢٤ _ رواه البخاري (٨ / ٦٧)، ومسلم (٢ / ٧٤٢).

پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ نارد، كە لە خـاك و خۆڵەكـەی پـاك نـەكرابۆوە، پێغەمبەری خواش _ صلى الله عليه وسلم _ دابەشی نێوان چوار نەفەری كرد: (زَيْدِ الخيلِ)، (الأقـرع)ی كـوڕی (حـابس)، (عُيَيْنـة)ی كـوڕی (حِصْن)، (علقمـةَ)ی كـوڕی (عُلاثـة) يـا (عامر)ی كوڕی (الطُّفيل) _ (عُمارة) گومـانی هـەبوو _ ئـەوەبوو هەنـدێ لـە هاوەڵـان و، پشتیوانان و، كەسانی تریش خەمباربوون، بۆیە پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليـه وسـلم _ فەرمووی:

((ئایا متمانەم پێناكەن لە كاتێكدا من باوەڕپێكراوی ئەو زاتەم كە لە ئاسماندایە، بەیان و ئێوارە هەواڵی ئاسمانم بۆ دێت ؟!)).

پاشان پیاوێكی چاو بە قوڵا چووی، دەموچـاو قۆپـاوی، ناوچـاو قـۆقزی، ڕیـش پـڕ، كـە (إزار)ەكەی لە قاپەڕقەی بەرزتر كردبـۆوە، سەرتاشـراو هـات و گـوتی: لـە خوابترسـە ئـەی پێغەمبەری خوا ! ئەویش سەری بەرزكردەوەو، فەرمووی:

((وەی بۆ تۆ ! ئایا شایستەترین كەس من نیم كە لە سزای خوا بترسێت ؟!)).

پاشان پیاوەكە پشتی هەڵكردوو چوو، خالد فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا ! ئایا لە ملی نەدەم ؟

پێغەمبەری خوا فەرمووی: ((لەوانەیە نوێژ بكات)).

خالد فەرمووی: پێدەچێ كەسانێكی نوێژخوێن هەبن بە زمانیان شـتانێك بڵـێن كـە بـەدڵ بڕوایان پێ نەبێت.

پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ فـەرمووی: ((مـن فـەرمانم پێنـەكراوە دڵـی خەڵك بكەمەوەو بیپشكنم و، سكیان هەڵدڕم)).

پاشان پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ تەماشـایەكی پیاوەكـەی كـرد، كـاتێ پشتی هەڵكردو چوو، فەرمووی:

((لە نەوەی ئەمە كاسانێك دەردەچن قورئان دەخوێنن، لە قوڕگیـان ناترازێـت، لـە ئـاین دەردەچن بە هاوشێوەی خێرایی ئەو تیرەی كە لە كەوانەوە دەردەچێت)).

نووسەر دەفەرمێت:

ئەو پیاوە ناوی (ذو الخُوَيْصرة التميميٌّ) بوو، كە بە یەكەم (خارجي) دادنرێت لە ئیسلامدا جیابوبێتەوە، بەڵاكەشی بریتی بوو لە ڕازیبوونیی بە بیروڕای خۆی، بەڵام ئەگەر بوەستایە، دەمیزانی هیچ بیروڕایەك بەسەر بیروڕای پێغەمبەری خواوە _ صلى الله عليه وسلم _ نییە، شوێنكەوتوانی ئەم پیاوەش بوون كە دژی ئیمامی (علي) _ خوای لێ ڕازی بێت _ دەجەنگان.

چیرۆك گەلێكیان هەیە درێژە دەكێشێ، هەروەها چەندین ڕێباوەڕی سەرسوڕمێنیشیان هەیە، بە بیروبۆچونم درێژەدان و باسكردنیان پێویست نییە، چونكە مەبەستم لێرەدا تەنها تەماشاكردنی فێڵەكانی ئیبلیس بوو، كە چۆن هەڵدەستێت بە سەرلێشێواندنی ئەو گێلانە، نموانەی كە كار بە واقیعاتی خۆیان دەكەن، بۆیە وای بۆ دەچوون ئیمامی (علي) _ كرّم الله وجهه _ هەڵە بێت و، ئەو كۆچكردوو پشتیوانانەش لە گەڵیدا بوون هەڵەبوون و، خۆیان ڕاستن، ئەم كۆمەڵە خوێنی منداڵانیان حەڵاڵ دەكرد، بەڵام خواردنی بەروبوومیان بەبێ پێدانی نرخەكەی حەرام دەكرد، خۆیان لە پەرستنەكاندا ماندوو دەكرد، شەونخونیان دەكرد، بەرامبەر بە موسڵمانان شمشێریان بەرز دەكردەوە.

هیچ سەرسوڕمانێكیشم بۆ دروست نابێت كە ئەمانە بە زانست و بیروباوەڕی خۆیان ڕازی بن و، خۆشیان لە ئیمامی (علي) _ خوای لێ ڕازی بێت _ بەزاناتر دابنێن، چونكە هەر (ذو الخُوَيْصرة) پێشەوایان نەبوو كە بە پێغەمبەری خوای _ صلى الله عليه وسلم _ گوت: بەدادبە چونكە بەداد نەبووی !

هەرگیز ئیبلیس ڕێگەی ئەم بەڵا ڕیسواكارانەی نەدەزانی.

پەنادەگرین بە خوا لەوەی كە دەست لە یارمەتی و سەرخستنمان هەڵگرێت.

وعن أبي سعيدٍ قال: سمعتُ رسولَ اللهِ _ صلى الله عليه وسلم _ يقولُ:

((يخرُجُ قومٌ فيكُم، تحقِرونَ صلاتَكُم مع صلاتِهم، وصيامَكُم مع صيامِهِم، وأعمالَكُم مع أعمالِهم، يقرؤونَ القرآنَ لا يُجاوِزُ حناجِرَهُم، يمرُقونَ من الدينِ مروقَ السهمِ مِن الرَّميَّةِ)).

أخرجاه في ((الصحيحين)) (١٢٥).

---

١٢٤ _ رواه البخاري (٩ / ٨٦)، ومسلم (١٠٦٤).

واته: له (أبي سعيد)ەوه فەرموويەتی: گوێبیستی پێغەمبەری خوا بووم _ صلى الله عليه وسلم _ دەیفەرموو:

((كۆمەڵێكتان لێ دەردەچێت، نوێژەكانتان بەكەم دادەنێن بە بەراوردی نوێژەكانیان و، ڕۆژووەكانیشتان بە بەراوردی ڕۆژووەكانیان و، كردەوەكانیشتان بە بەراوردی كردەوەكانیان، قورئان دەخوێنن لە قوڕگیان ناترازێت، لە ئیسلام دەردەچن بە هاوشێوەی خێرای ئەو تیرەی كە لە كەوانەوە دەردەچێت)).

وعن عبدالله بن أبي أوفى قال: سمعتُ رسولَ اللهِ _ صلى الله عليه وسلم _ يقولُ:

((الخوارجُ كلاب أهلِ النارِ)) (١٢٦).

واته له (عبدالله)ی كوڕی (أبي أوفى)ەوه فەرموويەتی: گوێبیستی پێغەمبەری خوا بووم _ صلى الله عليه وسلم _ دەیفەرموو:

(((الخوارج) سەگانی خەڵكی ئاگرن)).

---

١٢٦ _ أخرجه أحمد (٤ / ٣٥٥)، وعبدالله ابنُه في ((السنة)) (١٥١٣)، وابن ماجة (رقم ١٧٣)، وابن صاعد في ((مسند ابن أبي أوفى)) (ص ٣٩) " من طريق إسحاق الأزرق عن الأعمش عن ابن أبي أوفى.

وفيه انقطاع.

الأعمش " لم يسمع من ابن أبي أوفى.

وله طريق أخرى:

أخرجها أحمد (٤ / ٣٨٢ – ٣٨٣)، والطيالسي (رقم ٨٢٢)، والحاكم (٣ / ٥٧١) " من طريق الحشرج بن نباته عن سعيد بن جُمهان عن أبي أوفى.

وسنده حسن إن شاء الله.

## * بیروڕای (الخوارج)ەكان:

(الخـوارج) وای بۆ دەچن كە پێشەوایەتی تایبەت نییـە بـە كەسـێكەوە مەگـەر زانـست و زوهدی تێدا كۆبێتەوە، بۆیە هەركات كەسـێك ئـەو دووانـەی تێـدا كۆبوویـەوە، دەبێـت بـە پێشەوا، ئەگەر لە هەرچی و پەرچیەكانی خەڵكیش بێت ! لە ڕوانگەی بـیروڕای ئەمانیـشەوە (المعتزلـة)كـان (١٢٧) (التحـسین والتقبـیح)(١٢٨) واتـە: بەچـاك دانـان و بـەخراپ دانانیـان گەڕاندەوە بۆ ئەقڵ، واشیان دادەنا كە دادپەروەری بە گوێكردنی ئەقڵە لەو دووانەدا.

---

١٢٧ _ المعتزلـة: واتە (خۆجیاكرەوەكان) ناوی كۆمەڵێكە لە ئیـسلامدا دەركـەوتن لـە سـەدەی دووەمـی كۆچی لە نێوان ساڵانی (١٠٥ _ ١١٠ك) بەسەركردایەتی پیاوێك بەناوی (واصل)ی كوڕی (عطاء الغـزال) كاتێ خۆی لە ئەڵقەكەی (حسن البصري) جیاكردەوە، ئەمەش بـەهۆی ئـەوەوەبوو كـە پیاوێـك سـەبارەت بەتاوانكاران لە (حسن البـصري) پرسی، ئەویش دەستپێشكەری كردو وەڵامی دایەوە پێش ئـەوەی (حـسن البصري) وەڵام بداتەوە، ئالێرەوە شتەكە گەورە بۆوە تا بوبە هـۆی ئـەوەی كـە (واصـل)ی كـوڕی (عطـاء الغزال)و هاوەڵانی خۆیان لە ئەڵقەكەی (حسن البصري) جیابكەنەوە، ئـەوەبوو لـە لایـەن نەیارەكانیانـەوە ناونران (المعتزله) وەكو زەمكردنێك. بڕوانە: الـدكتور غالـب بـن علـي عـواجي، فـرق معاصـرة، ج٢، ص ١٩٩٠ وەرگێڕ.

١٢٨ _ التحسین والتقبیح: واتە ئەقڵی خۆیان بەكاردێنن بۆ بەچاك دانان و بەخراپ دانانی ئەو كردەوانـەی كە بە تەقدیری خـوای تعـالی ڕوودەدات، چـونكە بـەلای ئەوانـەوە ئـەقڵ بنەڕەتـە، بۆیـە دەڵـێن ئـەقڵ بەكاردەهێنرێت لە كردەوەكانی خوادا (العقل يُعْمَلُ في أفعـال الله) وە ئـەوەی ئـەقڵ بەچـاكی دابنێـت لـە كردەوەكانی خوا دەبێ بەچاك (فما حَسَّنَهُ العقل في أفعال الله صار حسناً) وە ئەوەش ئەقڵ بەخراپی دابنێت لە كردەوەكانی خوای _ عزَّ وجـلَّ _ واجبە لە خوا دوور بخرێتەوە (ومـا قبَّحَـهُ العقـل في أفعـال الله - عـز وجل - وجب نفيه عن الله - عز وجـل -)، بـۆ زیـاتر تێگەشـتن بڕوانـە: صـالح آل الـشيخ، شـرح العقیـدة الطحاوية، ص٢٤٢. وەرگێڕ.

پاشان لە زەمەنی هاوەڵـە بـەڕێزەكانی پێغەمبـەری خـوادا _ صـلى الله عليـه وسـلم _ كۆمەڵی (القدرية)(١٢٩) پەیدابوون و، هەریـەك لـە (مَعْبَـد الجُهَنِـيُّ) و (غَـيْلانُ الدمـشقيُّ) و (الجَعْدُ)ی كوڕی (دِرْهَم) ئاڵا هەڵگری ئەم كۆمەڵە بوون و باسی (القدر)یان دەكـرد، لـە سـەر ڕێبازی (مَعْبَد) (واصِلُ)ی كوڕی (عطاء)یش هەمان ڕێگەی گرتەبەرو، پاشان (عمرو)ی كوڕی (عُبَيْد)یش چوونە پاڵیان.

لـەو زەمەنـەدا ڕێبـازی (المُرْجئـة)ش هاتـە كایـەوەو دەیـانگوت: لـە گـەڵ بڕوابوونـدا سەرپێچیكردن هیچ زیانێكی نی یە، هەروەكو چۆن لە گـەڵ كـوفردا ملكەچـی و خواپەرسـتن هیچ سوودێكی نابێت.

پاشان كەسانێك لە (المعتزلـة) وەكـو _ (أبـي الهُـذَيْلِ العـلاف) و (النَّظـام) و (مَعْمَـر) و (الجاحظ) هەستان بە خوێندنەوەی كتێبە فەلسەفیەكانی زەمەنی (المأمون)و، چەند شـتێكیان لێ دەرهێناو لە گەڵ بارودۆخەكانی شـەرعدا تێكـەڵیان كـردن، وەكـو وشـەكانی (الجـوهر)، (عَرَض)، (زمان)، (مكان)، (الكون) !

یەكەم شتێك ئەمانە بانگەشەیان بۆ دەكرد (خلق القرآن) بوو.

پاش ئەم مەسەلەیە كۆمەڵێك مەسـەلەی تایبـەت بـە سـیفاتیش هاتـە كایـەوە، وەكـو: (علم)، (القدرة)، (حياة)، (السمع)، (البصر).

---

١٢٩ _ شیاو نی یە بۆ موسڵمان ڕۆبچێت لە وردەكاریەكانی قـەدەرداو دەروازەی گومـان و دودڵیـی بـۆ خودی خۆی بكاتەوە، بەڵكو بەسیەتی بڕوا بەقـەدەر بكـات وەكـو ئـەوەی خـوای _ سـبحانە وتعـالى _و پێغەمبەرەكەی _ صلى الله عليه وسلم _ هەواڵیان پێ داوین بەوەی كە هەموو شـتێك بەقـەزاو قـەدەرو چارەنووسی خوایە، وە پرسیار نەوروژێنێت: بۆ ئاوەها و بۆ ئاوەها، چونكە بەئەنجام ناگات، چونكە شـتەكە وەكو ئەوەی هاوەڵی ڕێزدار (عبدالله)ی كوڕی (عباس) _ خوا لە خۆی وبابیشی ڕازی بێت _ فەرموویەتی: قەدەر نهێنی خوایە، نهێنیەكە بەدەر لە خوای _ سبحانە وتعالى _ هیچ كەسـی تـر نایزانێـت. كـەوابوو پێویستە: بڕوای پێ بكەین و، لە وردەكاریەكانیدا ڕۆنەچین، بەڵكو تەنها بڕوای پێ دەكەین وەكو ئەوەی لـە قورئان وسوننەتدا هاتووە، بڕوانە: صـالح بـن فـوزان الفـوزان، إعانـة المستفيد شـرح كتـاب التوحيـد، ج٣، ص٤٤٥، وەرگێڕ.

ئەوەبوو کۆمەڵێك دەیانگوت: چەند مانایەکی زیادن بە سەر زاتەوە (الصفات زائدة على الذات).

(المعتزلة)کانیش نکۆڵیان لێدەکردو، دەیانگوت: هەرخۆی زانایەو (عالم لذاته)، هەرخۆشی بەتوانایە (قادر لذاته).

(أبوالحسن الأشعريُّ) (١٣٠)لە سەر ڕێباوەڕی (الجُبَّائيّ) بوو، پاشان گەڕایەوە بۆ ڕیزی جێگیرکارانی سیفات، دوای ئەوەش هەندێ لە جێگیرکارانی سیفات باوەڕیان بە چواندن (التشبيه)و، جێگیرکردنی (الأنتقال في النزول) (١٣١)هێنا. والله الهادي لما يشاء.

---

١٣٠ _ پاشان گەڕایەوە بۆ ڕێباوەڕی پێشینی چاك، وەکو ئەوەی لە کتێبەکەماندا ((عقيدتنا قبل الخلاف وبعده في ضوء الكتاب والسنة)) ئاماژەمان پێداوە، با بخوێندرێتەوە.

١٣١ _ بێژەی (الأنتقال) بێژەیەکی داهێنراوە نە لە قورئان و نە لە سوننەتیشدا نەهاتووە، بۆیە بنچینە(الأصل) بێدەنگ بوونە بەرامبەر بەو شتانەی کە لە شەرعدا نەهاتوون.

## * باسی هەستانی ئیبلیس بە سەرلێشێواندنی کۆمەڵی (الرافضة)[١٣٢]:

نووسەر دەفەرمێت:

ئیبلیس هەستا بەسەرلێشێواندنی (الخوارج)و وازی لێنەهێنان تا دژبە ئیمامی (علي) _ خوای لێ ڕازی بێت _ جەنگان، هەروەها هانی کەسانێکی دیکەشیدا لە خۆشەویستی ئیمامی (علي)دا _ خوای لێ ڕازی بێت _ زێدەڕۆی بکەن، بۆیە ئەم کۆمەڵە ئەو خۆشەویستیەیان لە سنووری شیاوی خۆی بردە دەرەوەو، هەندێکیان دەیانگوت: خواوەندە. هەندێکی تریشیان دەیانگوت: لە پێغەمبەران چاکترە. هەروەها ئیبلیس هانی کەسانێکی تریشیدا جوێن بە ئیمامی (أبي بكر) و (عمر) بدەن، تا ئەو ئاستەی هەندێکیان تەکفیری ئەو دوو پێشەوا بەرزەیان دەکرد... سەرەڕای چەندین ڕیباوەڕی ناماقوڵی تر کە بە پێویستم نەزانی کاتی خۆمان بەفیڕۆ بدەین بە باسکردنیانەوە، بەڵکو ئاماژە بۆ هەندێکیان دەکەین.

(الخطیبُ) دەڵێت: کتێبێکی (أبي محمد الحسن)ی کوڕی (يحيى النُّوبَختِي)م پێگەشت بە ناوی ((الردٌّ على الغُلاة)) واتە بەرپەرچدانەوەی زێدەڕۆیکاران، ئەم (النُّوبَختِي)یە لە قسەزانانی شیعەی ئیمامی بوو، تیایدا چەندین چەشنی گوتەکانی زیدەڕۆیکاران باس دەکات، تا ئەو ئاستەی دەڵێت:

لەو کەسانەی ئەقڵ لە دەستدان ڕایکێشا بۆ زیدەڕۆیکردن لە سەردەمی خۆماندا (إسحاقُ)ی کوڕی (محمد)ی ناسراو بە (الأحمر)ە، وای ڕادەگەیاند (علي) خوای _عزَّوجلَّ_ە، لە هەموو کاتێکیشدا بەدەردەکەوێت، بۆیە کات هەیە (الحسنُ)ەو، هەروەها (الحُسينُ)یشە، هەر خۆشی (محمد)ی ناردووە !

---

١٣٢ _ لە زەمەنی خۆشماندا شوێنکەوتووانی خومەینی _ مردووە _ سەر بەو کۆمەڵەن خوای تعالی بمانپارێزێت لە درۆو گومرایی.

گوتم _ ابن الجوزي _ كۆمەڵێك لە (الرافضة) لەو بڕوایەدان ئیمامی (أبوبكر) و (عمر) كافربوونە(١٣٣).

هەندێكیشیان دەیانگوت: پاش مردنی پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ هەڵگەڕاونەتەوە.

هەندێكیشیان داوای بەریبوون لە غەیری (علي) دەكەن.

بۆمان باسكراوە كە شیعەكان ویستیان (زیدَ)ی كوڕی (علي) خۆی بەریكات لە هەموو ئەو كەسانەی كە بە پێشەوایەتی ئیمامی (علي) ڕازی نەبوون، بەڵام بەوە قایل نەبوو، بۆیە ئەوانیش (زَید)یان نەویست و ڕەفزیان كرد، بە هۆی ئەوەوە ناونران (الرافضة).

لەوانیش كەسانێك هەن دەڵێن: پێشەوایەتی بۆ (موسی)ی كوڕی (جعفر)ە، پاشان بۆ (علي) كوڕیەتی، پاشان بۆ (محمد)ی كوڕی (علي)یە، پاشان بۆ (علي)ی كوڕی (محمد)ە، پاشان بۆ (الحسن)ی كوڕی (محمد العسكري)یە، پاشان بۆ كوڕەكەیەتی، كە پێشەوای دوازدەیەمەو، پێشەوای چاوەڕوانكراوە، كە بانگەشەی نەمردنی دەكەن و، لە كۆتای زەماندا دەگەڕێتەوەو، سەر زەمین پڕ لە دادپەروەری دەكات(١٣٤)!

---

١٣٣ _ (روافض)ی ئەم سەردەمە نزایەكی تایبەتیان داناوە بە ناوی ((نزای هەردوو بتەكەی قورەیش)) سەبارەت بە تەكفیركردنی هەردوو شێخی پایەبەرز _ ڕەزای خوایان لێبێت _ و بەریبوون لە هەردووكیان. ﴿ قَاتَلَهُمُ اللَّهُ أَنَّى يُؤْفَكُونَ ﴾﴿ التوبه: ٣٠ ﴾ واتە: ﴿ قَاتَلَهُمُ اللَّهُ ﴾ خوا لەناویان بەریّ ﴿ أَنَّى يُؤْفَكُونَ ﴾ چۆن درۆ دەكەن و لەهەق و ڕاستی لادەدەن، مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

١٣٤ _ بە (المهدي) ناوی دەبەن، بەڵام ئەو (المهدي)ە نی یە كە لە فەرموودە (صحيح)ەكانی پێغەمبەری خوادا _ صلى الله عليه وسلم _ باسكراوە! نەخێر، بەڵكو لە ڕاستیدا ئەو (المهدي)یە درۆ هەڵبەستراوەیە كە ئەقڵ و هەواو ئارەزووەكانی خۆیان بەدیهێناوە.

ئەوانەشە خوای _ سبحانەوتعالى _ ڕێگەی هەندێ خوێندكاری زانستی شەرعی سانا بكات بۆ دانانی كتێبێك لەبارەی ئەم مەسەلە گرنگەوە بۆ جیاكرنەوەو جیاوازی لە نێوان (المهدي)سوونەو، (المهدي)شیعەو، هەروەها بۆ بەرپەرچدانەوەی هەڵبەست و گومڕایی و نەفامی و درۆ ئاشكراكەیان.

(أبومنصور العِجْليُّ)یش بانگەشەی چاوەڕووانی (إنتظار) (محمد)ی کوڕی (علي الباقر)ی دەکرد، بانگەشەی جێنشینی ئەو پیاوەی دەکردو، دەشیگوت بەرزکراوەتەوە بۆ ئاسمان و، پەروەردگاریش بەدەستەکانی خۆی دەستی بەسەریدا هێناوە.

واشی ڕادەگەیاند پارچەیەکە(الكِسْفُ)(١٣٥) لە ئاسمان بەربۆتەوە.

تایەفەیەکی دیکەی (الرافضة)کان بە (الجناحيَّةُ) ناسراون و، لە هاوەڵانی (عبدالله)ی کوڕی (مُعاويةَ)ی کوڕی (عبدالله)ی کوڕی (جَعْفر ذي الجنـاحَيْنَ)ن دەڵێن: ڕوحی خواوەند لە ڕەچەڵەکی پێغەمبەران و ئەولیادا سوڕایەوە تا بە (عبدالله) کۆتایی هات، کە نەمردووەو، چاوەڕوانکراوە !

تایەفەیەکی تریشیان بە (الغُرابيَّة) ناسراون، هاوبەشایەتی (علي) _ خوای لێ ڕازی بێت _ لە پێغەمبەرایەتیدا جێگیردەکەن.

تایەفەیەکی تریشیان بە (المُفَوِّضيةُ) ناسراون، دەڵێن: خوای _ عزَّوجَلَ _ (محمد)ی دروستکردو، پاشان دەستەڵاتی دروستکردنی جیهانی پێ سپارد.

تایەفەیەکی تریشیان بە (الذّماميةُ) ناسراون، زەمی (جبريل) دەکەن و، دەڵێن: فەرمانی دابەزینی بۆ سەر (علي) پێکرابوو، بەڵام دابەزیە سەر (محمد).

(ابن عَقيل) دەڵێت: وادیارە ئەو کەسەی ڕێباوەڕی (الرافضة)ی داناوە ویستویەتی تانە لە بنەمای ئاین و پێغەمبەرایەتی بدات، چونکە ئەوەی پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم_ هێناویەتی شتێکی نادیارە لە ئێمەوە، بەڵام تەنها بە گێڕانەوەی پێشینی ئێمەو، چاکێتی تێوردبوونەوەیان لە وردەکاریەکانیی باوەڕمان پێهێناوە.

---

١٣٥ _ کە لە ئایەتی: (٤٤)ی سورەتی (الطور)دا باسکراوەو خوای تعالى دەفەرمێت: ((وإن يَـرَوْا كِسْفاً مِنَ السَّماءِ ساقِطاً)) واتە: ئەگەر پارچەیەك لە ئاسمان ببینن بکەوێتە خوارەوە، بڕوانە: مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

نووسەر دەفەرمێت:

زێدەڕۆیی (الرافضة) لە خۆشویستنی ئیمامی (علي)دا _ خوای لێ ڕازی بێت _ گەیاندنیە ئەو ئاستەی هەستن بە دانانی چەندین فەرموودە لە فەزڵ و چاکێتیدا، زۆربەی ئەو فەرموودانە عەیبداری دەکەن و زیانی پێدەگەیەنن، کۆمەڵێك لەو فەرموودانەم لە کتێبی (الموضوعات) (١٣٦)باسکردووە:

لەو فەرموودە دانراوانە: أن الشمس غابت، ففاتت علياً صلاة العصرِ، فرُدَّت له الشمسُ(١٣٧).

واتە: خۆرئاوا بوو، ئیمامی (علي)یش _ خوای لێ ڕازی بێت _ نوێژی عەسری لەدەست چوو، بەڵام جارێکی تر ڕۆژی بۆ گەڕێندرایەوە.

ئەم فەرموودە لە ڕووی گێڕانەوەوە دانراوە (الموضوع)، کەسی متمانەکار (ثقة) نەیگێڕاوەتەوە، لە ڕووی ماناشەوە، کاتی عەسر تێپەڕیوو، بۆیە گەڕانەوەی پێویستی بە خۆردەرچونێکی نوێ یەو، ئەوەش مەحاڵەو هەرگیز کات ناگەڕێنرێتەوە.

هەروەها ئەم فەرموودەشیان داناوە: أنَّ فاطمة اغتسلتْ، ثم ماتت، وأوصتْ أن تكتفي بذلك الغُسْلِ (١٣٨).

واتە: (فاطمة) خۆی شت، پاشان مرد، وە وەسێتی کرد جاری تر نەشۆردرێت.

---

١٣٦ _ بڕوانە بەشی (١ / ٣٣٨ _ ٤٠١)ی ئەو کتێبە.

١٣٧ _ أورده المصنف في ((الموضوعات)) (١ / ٣٥٦)، وقال:

((موضوع بلا شك، وقال الجَوْزَقاني: هذا حديث منكر مضطرب)).

وقد تكلم على هذا الحديث بما لا مزيد عليه شيخنا العلامة ناصرالدين الألباني في كتابه المستطاب ((سلسلة الأحاديث الضعيفة)) (٢ / ٣٩٥ _ ٤٠١)، فانظره، وقارن بـ((المقاصد الحسنة)) (رقم ٥١٩) للسخاوي.

١٣٨ _ _ رواه المصنف في ((الموضوعات)) (٣ / ٢٧٧)، وردَّه إسناداً ومتناً.

ئـەم فـەرموودە لـە ڕووی گێڕانـەوەوە درۆیـە، لـە ڕووی ماناشـەوە كـەم تێگەشـتنیان بەدەردەخات، چونكە مرۆڤـ دەمرێت پاشان دەشۆردرێت، بۆیە چۆن ڕەوا دەبێت پـێش مـردن شتنی بۆ ئەنجام بدرێت ؟!

پاشان چەندین باوەڕی پڕوپوچیان هەیە بـە هـیچ بەڵگەیـەك پاڵپـشتی ناكـەن، هـەروەها چەندین ڕێباوەڕی داهێنراویشیان لە فیقهدا هەیـەو، چـەندەها بـاوەڕی پڕوپوچیـشیان هەیـە پێچەوانەكاری (الإجماع)ە.

چەند مەسەلەیەكم لێ دەرهێناوە كە بە دەسـتوخەتی (ابـن عقیـل) نووسـراوەو، ئـەویش دەڵێت: لە كتێبەكەی (المرتضی) وەرمگرتووە بەناوی: ((في ما انفردت به الإمامیة))، لەوانە:

شیاو نییە سجود لە سەر شتێكی تری جگـە لـە زەوی و، گـژوگیای زەوی ببرێـت، بـەڵام خوری و تووك و پێستیش، نابێت.

خۆ پاكردنەوە بە بەرد لە دوای میزكـردن شـیاو نییـە (لا یجزيء)، بـەڵكو تایبەتـە بـە پێسیكردنەوە.

سڕینی سەر شیاو نابێت تەنها بە پاشماوەی ئەو ئاوە نەبێت كە بە دەستەوەیە، بۆیە ئەگەر دووبارە ئاوێكی تری هەڵگرت، ئەوا جێگەی یەكەم ناگرێتەوە، هـەتا ئەگـەر دەستیـشی لـە ئاوەكە سڕی و وشكی كـردەوە پـێش ئـەوەی سـەری بـسڕێت، پێویـستە دەسـتنوێژێكی تـر بگرێتەوە.

تاكیش بوونەتەوە بە حەرامكردنی خواستنی ئەو ژنە مێردارەی پیاوێك زینـای لـە گەڵـدا دەكات بە هەتا هەتای، بۆیە ئەگەر مێردەكەشی تەڵاقی بـدات، بـۆ پیـاوی زیناكـار حـەڵاڵ نابێت مارەی بكات بە هەتا هەتای.

مارەكردنی ژنانی خاوەن كیتابیشیان حەرام كرد.

گوتوشيانه (الطلاق المعلق)ى(١٣٩) بەستراو بەمەرجێکەوە ناکەوێت، ئەگەر مەرجەکەش بهێنرێتە دی.

تەڵاقیش یش ناکەوێت تەنها بە ئامادەبوونی دوو شایەتی بەداد نەبێت (١٤٠).

هەرکەس خەوت و نوێژی عیشای نەکردو تا دوای نیوەی شەو خەبەری نەبۆوە، ئەوا ئەگەر خەبەری بۆوە پێویستە نوێژەکە قەزا بکاتەوەو، بەیانیەکەشی بەرۆژوو بێت بۆ کەفارەتی ئەو کەمتەرخەمی یە.

ئەگەر ئافرەت پرچەکەی خۆی هەڵپاچیٚ، ئەوا کەفارەتێکی لە سەرە وەکو کوشتنی بە هەڵە.

هەرکەس پۆشاکەکەی خۆی دادڕێت بەهۆی مردنی کوڕێکی یا خێزانەکەیەوە، ئەوا کەفارەتێکی سوێندخواردنی لە سەرە.

هەرکەس ئافرەتێك مارەبکات و، ئافرەتەکە مێردی هەبێت و، پیاوەکە پێی نەزانیبیٚ، پێویستە پیاوەکە پێنج دیرهەم وەکو خەیروچاکەداری ببەخشێتەوە.

کەسی مەی خۆر ئەگەر دووجار سزای شەرعی درا، بۆ جاری سیٚ یەم دەکوژرێت (١٤١).

---

١٣٩ _ الطلاق المعلق: واتە تەڵاقی هەڵبەستراو: ئەوەیە کەوا مێرد کەوتنی تەڵاقەکەی ببەستێت بەمەرجێکەوە، وەکو ئەوەی بە خێزانەکەی بڵێت: ئەگەر بچیت بۆ ماڵی فڵان کەس ئەوا تەڵاق دراویت، وەرگێڕ.

١٤٠ _ هەندیٚ لە پێشین ئەوەیان گوتووە، بەڵام مەسەلەکە جیاوازی کۆنی تێدایە، بڕوانە ((الأستئناس في تصحيح أنكحة الناس)) (ص ٥١) للقاسمي _ بتحقيقي، و ((نظام الطلاق في الإسلام)) (١١٨ _ ١٢١)) للعلامة أحمد شاكر.

١٤١ _ ئەهلی سوننەت وردەکاریی و درێژەدانێکی تریان لەو بارەوە هەیە بگەڕێرەوە بۆ ((كلمة الفصل في قتل مدمني الخمر)) للعلامة أحمد شاكر.

لە گەڵ چەندەها مەسەلەی تر باسکردنیان درێژە دەکێشێ، تیا یدا سەرپێچی لە (الإجماع) دەکەن، ئیبلیس فریوی داون و ڕێگەی دانانی بۆ ڕازاندونەتەوە بە شێوەیەك پشت بە هیچ فەرموودەو، (قیاس)ێك نابەستن، بەڵکو پشت بە (الواقعات)(١٤٢) دەبەستن.

دڵنیابن گوتەو کردارە خراپەکانی (الرافضة) زۆر لەوە زیاترە لێرەدا بژمێردرێت.

خەیری نوێژیشیان لە دەست چوو، چونکە لە دەستنوێژدا پێیەکانیان ناشۆن، هەروەها خەیری نوێژی بەکۆمەڵیشیان لە دەست چوو، چونکە بە دوای پێشەوایەکی پارێزراو لە هەڵەکردن (معصوم)دا دەگەڕێن.

هەروەها تووشی جوێندان بەهاوەڵە بەڕێزەکانیش بوون.

وفي ((الصحيحين)) عن رسول الله _ صلى الله عليه وسلم _ أَنَّه قال:

((لا تَسبُّوا أصْحابي، فإنَّ أحَدكُم لو أَنْفَقَ مثل أُحُدٍ ذهباً " ما أدْرَكَ مُدَّ أحدِهم ولا نَصِيفَهُ)) (١٤٣).

واتە: پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ فەرمووی:

((جوێن بە هاوەڵەکانم مەدەن، چونکە ئەگەر کەسێکتان بە ئەندازەی کێوی ئوحد زێڕ ببەخشێت، ئەوەندەی گوێلێك یا نیو گوێلێکی ئەوان خەیری دەستگیر نابێت)).

لە (سُوید)ی کوڕی (غَفَلَة)ەوە دەڵێت: بەلای چەند نەفرێکی شیعەدا تێپەڕیووم، باسی (أبابکر) و (عمر)یان دەکرد _ خوایان لێ ڕازی بێت _و گاڵتەیان پێدەکردن، منیش چوومە خزمەتی (علي)ی کوڕی (أبي طالب)و، پێم گوت: ئەی ئەمیری موسڵمانان ! بەلای چەند نەفەرێك لە هاوەڵانی تۆدا تێپەڕیووم باسی (أبابکر) و (عمر)یان دەکرد _ خوایان لێ ڕازی

---

١٤٢ _ الواقعات: بریتیە لە مەسەلەگەلێك کەسانی (مجتهد) کەلە پاشاندا هاتوون دەریانهێناوەو بە فتوای خۆیان فەتوایان تێدا داوە کاتێ لێیان پرسیون و هیچ (ریوایە)تیەکیان نەدۆزیوەتەوە وەکو بەڵگە بەکاری بێنن و پشتی پێبەستن، بڕوانە ((حاشية رد المختار)) (ص ٧٤) _ الجزء الأول _ وەرگێڕ.

١٤٣ _ رواه البخاري (٧ / ٢٧)، ومسلم (٢٥٤١).

بێت _ بە قسانێك شایستەی ئەوان نەبوو، ئەگەر بیانزانیبا تۆ شتێکی چاك لە دڵی خۆتدا بەرامبەر بەو دووانە هەڵدەگریت، نەدەوێران ئەوانە بڵێن.

(علي) فەرمووی: پەنا بەخوا دەگرم، پەنادەگرم بەخوا ئەگەر شتێکی دیکە لە دڵی خۆمدا هەڵگرم بەدەر لەوەی کە پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ وەسێتی پێکردوم(١٤٤)، نەفرەتی خوا لەو کەسە بێت کە جگە لە چاکەی جوان لە دڵی خۆیدا بەرامبەر بەو دووانە هەڵگرێت، دوو براکەی پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _و، دوو هاوەڵەکەی و، دوو وەزیرەکەی، ڕەحمەتی خوایان لێبێت.

پاشان هەستاو چاوەکانی فرمێسکی دەڕشت و دەگریاو دەستی منی گرتبوو، تا چووە مزگەوتەوە، چووە سەر مینبەرو، بەڕێکوپێکی لە سەری دانیشت و ڕیشی خۆی گرتبوو، تێی دەڕوانی، کە سپی بوبو، تا خەڵکەکەمان بۆ کۆبویەوە، پاشان هەستاو، شایتومانی هێناو وتارێکی کورتی پڕ مانای خوێندەوە، پاشان فەرمووی:

کەسانێك باسی هەردوو سەرکردەکەی قورەیش و هەردوو بابی موسڵمانان دەکەن، بە قسانێك من لەو خراپەیە بەدوورم و، لەوەشی دەیڵێن بەریم و، لە سەر ئەوەش کە دەیڵێن سزادراوم، بەو زاتەی کە تۆوی لەتکردووەو، ڕوحی دروستکردووە، هیچ کەسێك خۆشی ناوێن مەگەر بڕوادارێکی لە خواترس، کەسیش ڕقی لێیان نابێتەوە مەگەر کەسێکی گوناهکاری یاخی سەرکێش، ئەو دووانە لە سەر ڕاستگۆیی و وەفاداری هاوەڵێتیی پێغەمبەری خوایان دەکرد، فەرمانیان دەداو قەدەغەیان دەکردو ڕقیان دەبۆوەو سزایان دەدا بەڵام هەرگیز لە ڕای پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ نەدەچوونە دەرەوەو، پێغەمبەری خواش _ صلى الله عليه وسلم _ بەڕای ئەوانی دەکردو، هیچ کەسێکیشیی بە ئەندازەی ئەوان

---

١٤٤ _ وەسێتی بە پەسەندێتی (أبابکر) و (عمر) کردبوو بە سەر (علي)دا " وەکو ئەوەی بە (صحیح)ی نیەمی (علي) خۆی دەیگێڕێتەوە.

وقد عقد الإمام أحمد بن حنبل في ((فضائل الصحابة)) (١ / ٧٦ _ ٨٤) فَصْلا في سَرْدِ الروايات الواردة عن علي في ذلك، فليراجع.

خۆشنەدەویست، پێغەمبەری خوا _ صلی الله علیه وسلم _ گیانی سپاردو و لەو دووانە ڕازی بوو، ئەو دوانەش گیانیان سپاردو موسڵمانانیان لێ ڕازی بوو.

پێغەمبەری خوا _ صلی الله علیه وسلم _ فەرمانیدا (أبوبکر) نوێژ بە موسڵمانان بکات، ئەویش نۆ ڕۆژ لە ژیانی پێغەمبەری خوادا _ صلی الله علیه وسلم _ نوێژی پێکردن، کاتێك پەروەردگار گیانی پێغەمبەرەکەی خۆی کێشاو، لای خۆی بۆ هەڵبژارد، موسڵمانان بەرپرسێتی ئەوەیان دایە دەست و، کاری زەکات کۆکردنەوەشیان پێ سپارد، پاشان بە گوێڕایەڵی و نەك بە زۆرلێکراوی گفتیان دایە، من یەکەم کەسی (بني عبدالمطلب)بووم ئەو ڕێگەیەم بۆ کردەوەو گفتم دایە، بەڵام خودی خۆی ئەوەی نەدەویست و، خوازیاربوو کەسێکمان لە جیاتیی، بەو فەرمانڕەوایە هەستین، سوێند بەخوا چاکترین کەسی بەجێهێڵابوو، کە بە سۆزترین و، میهرەبانترین کەس بوو، دوورترین کەسیش بوو لە خراپەو تاوانەوە، بەتەمەنترین و پێشینترین کەسیش بوو لە ئیسلامدا، تا گیان سپاردنی کاری بە ڕێبازی پێغەمبەری خوا _ صلی الله علیه وسلم _ دەکرد، ڕەحمەتی خوای لێبێت.

لە پاشیدا فەرمانڕەوایی سپێردرایە ئیمامی (عمر) _ خوای لێ ڕازی بێت _، من یەکێك بووم لەو کەسانەی کە ڕازی بوون، بە گوێرەی مەنهەجی پێغەمبەری خوا _ صلی الله علیه وسلم _و (أبوبکر)ی هاوەڵی هەقی جێبەجێ دەکرد، پێ بە پێ شوێنی هەردووکیان دەکەوت، وەکو چۆن بەچکە وشتر شوێنی دایکی دەکەوێت، سوێند بەخوا زۆر بەبەزەی و میهرەبان بوو بەرامبەر بە بێ هێزو زەبوونان، پشتگیریکارو سەرخەری ستەملێکراوان بوو دژی بە ستەمکاران، لە جێبەجێکردنی شەرعی خوادا سەرزەنشتی سەرزەنشتکاران کاری تێنەدەکرد، خوای تعالی هەقی خستبووە سەر زمانی(١٤٥) ، ڕاستگۆیی کردبووە کاروپیشەی، تا ئەو ئاستەی واماندەزانی فریشتەیەك لە سەر زمانی دەدوێ، بە موسڵمانبوونیی (عمر) خوای

---

١٤٥ _ كما صح عن النبي _ صلى الله عليه وسلم _ مرفوعاً:

رواه أحمد (٢ / ٩٥)، والترمذي (٥ / ٦٦٧)، وابن حبان (٥٣٦) " عن ابن عمر، بسند حسن.

وله طرق أخرى كثيرة.

تعالى شكۆو سەربەرزی بە موسڵمانان بەخشی، كوچكردنی كرد بە پاڵپشتی و پشتیوانی بۆ ئیسلام ، ترسی بۆ خستبووە دڵی دووڕوانەوە، بەڵام خۆشەویستی بۆ خستبووە دڵی موسڵمانانەوە، كەچی زۆر توندوتیژبوو بەرامبەر بە دوژمنان.

ئەو سیفەتانەی لە ئەواندایە لە چ كەسێكتاندایە، ڕەحمەتی خوایان لێبێت و، بە ئێمەش شوێنكەوتنی ڕێبازی ئەو دووانەمان پێبەخشێت، هەركەس منی خۆش دەوێت، با ئەو دووانەشی خۆش بوێت، هەركەسیش خۆشی ناوێن، ئەوا ڕقی لە منەو، منیش لە ئەو كەسە بەریم.

ئەگەر پێشتر لەبارەیانەوە شتێكم بۆ باسكردنایە ، ئەوا بۆ ئەو قسانەتان بەتوندترین سزا سزام دەدان.

ئاگاداربن پاش ئەمڕۆ هەركەسیان بۆ هێنام و ئەو قسانەی گوتبێت، دڵنیابن ئەوەی لە سەر جێبەجێ دەكرێت، كە لە سەر بوختانكار جێبەجێ دەكرێت.

ئاگاداربن چاكترین كەسی ئەم ئومەتە پاش پێغەمبەرەكەی (أبوبكر) و (عمر)ە _ خوایان لێ ڕازی بێت _، پاشان خوای تعالى هەر خۆی ئاگادارە چاك لە كوێدایە ؟

ئەمە دەڵێم و داوای لێخۆشبوون بۆ خۆم و بۆ ئێوەش لە خوای پەروەردگار دەكەم.

لە (علي)ەوە _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی: لە كۆتای زەماندا كۆمەڵێك دەردەچن نازناوێكی ناشرین و خراپیان هەیە بە ناوی (الرافضة)، حاڵ وباری كەسێتی شیعەكانمان هەڵدەگرن، بەڵام لە شیعەی ئێمە نین، نیشانەیان ئەوەیە جوێن بە (أبوبكر) و (عمر) دەدەن _ خوایان لێ ڕازی بێت _، لە هەر شوێنێك پێیان گەشتن بیانكوژن، چونكە ئەوانە كەسانێكی موشریك و هاوەڵ پەیداكارن.

## ✸ باسی هەستانی ئیبلیس بە سەرلێشێواندنی کۆمەڵی (الباطنیة):

نووسەر دەفەرمێت:

(الباطنیة) کۆمەڵێك بوون خۆیان بە ئیسلام دەشاردەوە، هەواداری (الرفض) بوون، بەڵام بیروباوەڕو کردەوەکانیان بە یەکجاری لە ئیسلامەوە دووربوو، چونکە ئەنجامی قسەکانیان لەکارخستنی خوای دروستکارو، پووچکردنەوەی پێغەمبەرایەتی و پەرستنەکان و، نکۆڵیی لە زیندووبوونەوە بەدەردەخات.

بەڵام لە سەرەتادا ئەوە ئاشکراناکەن، بەڵکو وارادەگەیەنن کە خوا هەقەو، (محمد)یش پێغەمبەری خوایەو، ئاینەکەش ڕاستە، لە کۆتاشدا دەڵێن: بەڵام ئەوە نهێنییەکی نادیاری هەیە.

ئیبلیس یاری پێکردن و، زیادەڕەوی کردو، چەندین ڕێباوەڕی جیاوازی بۆ ڕازاندنەوە، بۆیە هەشت ناویان هەیە:

### ناوی یەکەم: (الباطنیة):

ئەو ناوەیان لێنراوە چونکە وارادەگەیەنن کە ڕووی ئاشکرای (الظواهر) قورئان و فەرموودەکان دیوی نهێنیان (البواطن) هەیەو، پەیوەندی نێوان هەردووکیان وەکو پەیوەندی نێوان کاکڵ و توێکڵە، ئەم کۆمەڵە وارادەگەیەنن کە بەلای نەفامانەوە شێوەی ڕووە ئاشکراکان شێوەیەکی ڕوون و جوانە، بەڵام بەلای ئاقڵ و هۆشمەندانەوە تەنها هێماو نیشانەگەلێکن بۆ گەشتن بە ڕاستیگەلێکی شاراوە، بۆیە هەرکەس ئەقڵی لەکارکەوێت و نەتوانێت نووقمی دیوە شاراووەکان و نهێنیەکان و قوڵای و پەنهانەکان بێت و، تەنها بە ڕووە ئاشکراکان ڕازی بێت، ئەوا خۆی خستۆتە ژێر کۆتەوە کە بریتیە لە سەپاندنەکانی شەرع (تکلیفات الشرع)، بەڵام ئەو کەسەی کە سەردەکەوێت بۆ زانینی دیووە شاراوەکان، سەپاندنەکانی شەرعی لە سەر دەکەوێت و، لە بارقورسیەکانی دەحەسێتەوە.

ئەمانە دەڵێن: خوای تعالی مەبەستی ئەو کەسانەیە کە دیـوە شـاراوەکان دەزانـن کـاتێ دەفەرمێت: ﴿ وَيَضَعُ عَنْهُمْ إِصْرَهُمْ والأَغْلالَ التي كانَتْ عليهِمْ ﴾﴿ الأعراف: ١٥٧ ﴾. واتـە: ﴿ ويَضَعَ عَنْهُمْ إِصْرَهُمْ ﴾ وەبارە قورس و گرانەکانیان لەسەر لادەبات و ﴿ والأغـلالَ ﴾ ئـەو کۆت و زنجیرانەش ﴿ التي كانَتْ عليهم ﴾ کەبەسەریانەوە بوون (١٤٦).

ئەمانە دەیانەوێت ڕووە ئاشکراکان لە عەقیدەو بیروباوەڕ دامـاڵن و نـەهێڵن، بـۆ ئـەوەی بتوانن بە بەکارهێنانی بانگەشە پڕوپوچەکانیان شەرع پووچ بکەنەوە.

## ناوی دووەم: (الإسماعيلية):

دراونەتە پاڵ سەرگەورەیەکیان کە نـاوی: (محمـد)ی کـوڕی (إسماعیـل)ی کـوڕی (جعفـر)ە، وایان ڕادەگەیاند کە نۆبەتی پێشەوایەتی بۆ ئەو تەواو بووە، چـونکە حەوتەمـە، بیانووشـیان ئەوەبوو کە ئاسمانەکان حەوتەن، زەمینەکانیش حەوتن و، ڕۆژەکانی هەفتـەش حـەوتن، بۆیـە ئەوە بەڵگەیەکی گونجاوە کە نۆبەتی پێشەوایەتی بە حەوت تەواو دەبێت.

پێشەوا (أبو جعفر الطـبري) لە (تـاريخ)ەکەیـدا دەفـەرمێت: (علـي)ی کـوڕی (محمـد) لـە باییەوە دەگێڕێتەوەو دەڵێت: پیاوێك لە تایەفەی (الراوندية)یەکان (١٤٧) بە (الأبلـق) ناودەبرا، چونکە نەخۆشی بەڵەکی هەبوو ، بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە ڕوحی (عیسی)ی کوڕی (مریم) دراوە بە(علي)ی کوڕی (أبي طالب) _ خوای لێ ڕازی بێـت _، پاشـان بـە پێـشەواکان درا، یەك لە دوای یەك، تا بە (إبراهیم)ی کوڕی (محمد) گەشت.

حەرامەکانیان حەڵاڵ دەکردو، کەسانێکیان هەبوو کۆمەڵە کەسێکی بانگهێشتی ماڵەکەی خۆی دەکردو، خواردن و خواردنەوەی دەدانێ و، سواری خێزانەکەی خۆشی دەکردن ! تا باس و

---

١٤٦ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

١٤٧ _ دەگەڕێنەوە بۆ (ابن الراوندي) (البـاطني)ی بێباوەڕ، بۆ شارەزابوونی زیاتر لـە سـەر ئـەو پیـاوەو هاوشێوەکانی لەم سەردەمەدا وەکو (سلمان رشدی)ی بێباوەڕ بڕوانـە کتێبەکـەم ((دلائـل التحقيـق لإبطـال قصة الغرانيق)) (ص١٥)، نشر دار الهجرة _ الدَّمَّام.

خواسیان به (أسد)ی کوڕی (عبدالله) گەشت، ئەوەبوو کوشتنی و لە خاچیدان، بەڵام تاوەکو ئەمڕۆش هەمان ڕەفتاریان تێدا ماوەتەوە.

به شوێنه بەرزەکانیشدا سەردەکەوتن و، خۆیان فڕێ دەدایە خوارەوە وەکو ئەوەی بفڕن، بەڵام پێش گەشتنیان بە زەوی دەمردن.

کۆمەڵەکەشیان بە چەکەوە ڕووبەڕووی خەڵك دەبوونەوەو، هاوارایان دەکرد: (یا أباجعفر ! أنتَ أنتَ) (١٤٨)!

## ناوی سێ یەم: (السَّبْعِيَّة):

ئەو نازناوەیان لێنراوە لەبەر دوو هۆکار:

یەکەمیان: نۆبەتی پێشەوایەتی حەوت حەوتە وەکو ئەوەی پێشتر ئاماژەمان پێدا، گەشتنیش بە حەوتەم نۆبەتی کۆتایەو، بریتیە لە قیامەت، بەدوایەکداهتنی ئەم نۆبەتانەش کۆتایی نییە.

---

١٤٨ _ ئەمەش بیروباوەڕی یەکبوونە (وحدة الوجود) _ پەنا بەخوا _. الشيخ علي الحلبي.
منیش دەڵێم _ وەرگێڕ _: وحده الوجود: واتە بڕوابوون بەوەی کە هەموو شتێك لەم گەردونەدا بریتیە لەخوا _ سبحانه وتعالى _ واتە: بوون (وجود) بریتیە لەزاتی خوای تعالی، بۆیە خۆر و، مانگ و، تێکڕای تەنە بێ گیانەکان بریتین لە خواو هەروەها تێکڕای گیانلەبەرانیش. صوفیەکان ئەم مانایە بەچەند جۆرە وشەیەك دەردەبڕن و وارادەگەیەنن کە گوایە (وحده الوجود) یەکتاپەرستی هەقە، ئەم بیروباوەڕە لە هەموو بیروباوەڕەکان خراپترەو، لەهەمووشی پوچترە، چونکە پێچەوانەی فیترەت و ئەقڵ و شەرعە، بەسە بۆ پوچێتی ئەم بیروباوەڕە کەوا ئیبلیس لەگەڵ گەورەترین کوفرو لوتبەرزی خۆیدا پێچەوانەی ئەوان بیروباوەڕ دەکات، هەروەها موشریکەکانی مەککەش، هەر هەموویان بیروباوەڕیان وایە کە خوای تعالی خوڵقێنەریانەو، خوڵقێنەری ئاسمانەکان و زەمینیشە، ئەمەش بەڵگەیە کە ئەمانە جیاوازیان لە نێوان خوڵقێنەرو خوڵقێنراودا دەکرد، (محی الدین)ی کوڕی (العربی) لە گەورەترین ئەو زیندیقانەن کە باوەڕیان بە (وحده الوجود) هەبوو ، کە زۆرێك لە صوفیەکان بە کۆتا وەلیەکان و پێشەوای زانایانی دادەنێن. بڕوانە: عمر بن التهامي بن عبدالرحمن، شعر البرعي في ميزان الكتاب والسنة، ص٨٠، قدم له فضيلة الشيخ عبدالعزيز بن محمد بن عبدالله السدحان، الحاضر بجامعة الإمام محمد بن سعود الإسلامية. وەرگێڕ.

دووەم: چونکە دەڵێن: بەڕێوەبردن و چارەسازی جیهانی خـوارەوە سـپێردراوە بـە حـەوت هەسارەکە: زوحەل، پاشان موشـتەری، پاشـان مـریخ، پاشـان زوهـرە، پاشـان خـۆر، پاشـان عەتارد، پاشان مانگ.

## ناوی چوارەم: (البابكيَّة):

**نووسەر دەفەرمێت:**

ناوی تایەفەیەکیانە، شوێنی پیاوێك کـەوتن بـەناوی: (بابَـك الخُرَّمـي)، سـەربە کۆمـەڵی (الباطنية) بوو، نەژادی زۆڵ بوو، لە هەندێ چیای سەربە دەڤەری (أذْرَبيجـان) ساڵی دووسەدو یەك بەدەرکەوت، خەڵکێکی زۆر شوێنی کەوتن و، مەترسـیی و ئاڵۆزیـەکی زۆریـان نایـەوە، حەرامەکانی حەڵاڵ کردو، ئەگەر بیزانیبا کەسێك کچێك، یا خوشکێکی جوانی هەیـە، داوای دەکرد، ئەگەر ئەو کەسە بۆی ڕەوانە کردبا ئەوە ڕزگاری دەبوو و، ئەگەر بۆشی نەناردبا ئـەوا دەیکوشت و دەیبرد، بیست ساڵ لە سـەر ئـەم ڕەفتـارە مایـەوەو، هەشـتا هـەزاری کوشـت. گوتراویشە: پەنجاو پێنج هەزارو پێنج سەد مرۆڤ.

سوڵتان دژبە بە (بابك) جەنگی بەرپاکرد، سەرەتا (بابـك) سوپایەکی زۆری تێکشکان، تـا (المعتصم) ناچاربوو (إفشين)ی (١٤٩)کاربەدەستی خۆی بۆ بنێرێـت، پـاش جـەنگیکی بـەتین، بەتوانابوو (بابك)و براکەی بەدەستبەسەری ساڵی دووسەدو بیـست و سـێ لـە پـێش دەسـتی (المعتصم)دا ئامادە بکات، کاتێ چوونە ژوورەوە براکەی پێی گوت: ئەی (بابـك) ! کردەوانێك کە تۆ ئەنجامت داوە هیچ کەس ئەنجامی نەداوە، بۆیە دەبێ ئیـستا بـە ئارامگرتنێـك ئـارام بگریت هیچ کەس پێشی تۆ ئەو ئارمەی نەگرتبێت. ئەویش گوتی: ئارامگرتنەکەم دەبینیت.

ئەوەبوو (المعتصم) فەرمانیدا هەردوو دەستی و هەردوو پێـی ببڕدرێـت، کـە بـڕدران، بـە خوێنەکە دەموچاوی خۆی سڕی، (المعتـصم)یش پێی گوت: تۆ لە ئازایەتیدا ئاوهـاو ئاوهـای، بۆ بە خوێن دەموچاوی خۆت سڕی ! ئایا بێ توانابووی بەرامبـەر بـە مـردن ئـارام بگریـت ؟

---

١٤٩ _ نازناوی یەکێك لە کاربەدەستانی خۆی بوو، بڕوانە ((تاريخ الطبري)) (٨ / ٥٤٦ فما بعد).

گوتی: نەخێر، بەڵام کە هەردوو دەست و هەردوو پێم بڕدران، خوێنم پژاو بەربوو، ترسـام پـێم بڵێن: ڕەنگی زەردهەڵگەڕاوە چونکە بێ توانابوو بەرامبەر بە مردن ئارام بگرێت. گـوتی: بـۆ ئەوەی ئەو گومانەم پێ نەبرێت، بە خوێن دەموچاوی خۆم داپۆشی، بۆ ئەوەی هیچ گومانێکم پێ نەبرێت !

پاشان لە ملی دراو، ئاگریشی تێبەردراو، هەمان شتیش بە براکـەی کـرا، هـیچ کامیـان هاواریان لێ هەڵنەساو، هیچ کامیشیان نەیناڵاندو، هـیچ کامیـشیان بـێ ئـارامی نەنوانـد، نەفرەتی خوایان لێبێت.

لە (البابكية) کۆمەڵێك ماوەن، دەگوترێت: لە سـاڵدا شـەوێکیان هەیـە، تیایـدا ژنـان و پیاوانیان کۆدەبنەوەو، چراکان دەکوژێننەوەو، پاشان هەڵدەستان و، هەر پیاوێکیان باز دەداتە سەر ژنێك و، واش ڕادەگەیەنن کە هەرکەس ژنێك لە ئامێز بگرێت، بەڕاو حەڵاڵی دەکـات، چونکە ڕاو ڕێپێدراوە !!

## ناوی پێنجەم: (المُحَمِّرَةُ):

نووسەر دەفەرمێت:

ئەو ناوەیان لێنراوە چونکە لە زەمەنی (بابَك)دا پۆشاکەکانیان بـە سـور ڕەنـگ دەکـردو، پاشان دەیانپۆشی.

## ناوی شەشەم: (القرامطة):

نووسەر دەفەرمێت:

سەبارەت بە هۆکاری ناونانیان بەو ناوە مێژوونووسان دوو هۆکار دەخەنە ڕوو:

یەکەم: پیاوێك لە دەڤەری (خُزِسْـتان)ەوە بـۆ دەوروبـەری (کوفـة) کۆچـی کـرد، زوهـدی بەدەردەخست و، بۆ شوێنکەوتنی پێشەوایەك لە بنەماڵەی پێغەمبـەری خـوا _ صـلی اللـە علیە وسلم _ بانگەوازی دەکرد، بۆیە میوانی پیاوێك بـە نـاوی (کَرْمیتـةُ) _ ئـەو نازنـاوەی لێنرابوو بەهۆی سوری چاوەکانیەوە کە بە زمانی (النَّبطيَّة): واتـە چـاوتیژ _، ئـەمیری ئـەو دەڤەرە دەسبەسەری کردو، خستیە بەندیخانەوە، پاشان ئەمیر نووست و کلیلی ماڵەکەی خستە

ژێر سەری خۆی، بەڵام کەنیزەکێك بەزەی بە پیاوە بەندکراوەکـەدا هاتـەوە، بۆیـە کلیلەکـەی بردو، دەرگاکەی بۆ کردەوەو، دەریهێنـاو، کلیلەکەشـی گەڕانـدوە شـوێنەکەی خـۆی، کـاتێ پیاوەکە داواکراو، نەدۆزرایەوە، خەڵکەکە زیاتر شەیدای بوون، ئەوەبوو پیاوەکە دەرچووبوو بۆ (الشام)و، لەوێش ناونرابوو (كَرْمِيتَةَ)، بەناوی ئەو کەسەوە کـە لای مـابۆوە، پاشـان وشـەکە سووك کرایەوەو، گوترا: (قُرْمُط)، پاشان کەسوکارو منداڵاکانی یەك لە دوای یەك بە میراتـی لە جێگەی بابیان دادەنیشتن و هەمان ڕێبازی ئەویان پەیڕەو دەکرد.

دووەم: ئەم نازناوە بۆ ئەم تایەفە دانراوە بە هـۆی پیاوەکـەوە بـەناوی: (حمـدان قُـرْمُط)، سەرەتا ئەم پیاوە تەنها بانگخوازێکیان بوو، کۆمەڵـە خـەڵکێکیش بـە دەنگیـەوە چـوون و، نازناوی (قرامطة) و (قُرْمُطِيَّة)یان بۆ دانرا.

ئەم پیاوە لە خەڵکی (کوفة) بوو، هەواداری زوهد بوو، بەڕێکەوت پیاوێکی بانگخوازی لە (الباطنية)ەکان چاوپێکەوت لە ڕێگەیەکدا بۆ دێیـەك دەچـوو، هاوکـات (حمـدان)یـش چـەند مانگایەکی لێدەخوڕی ! ئەوەبوو (حمـدان) بە پیاوەکەی گوت _ کە نەیدەناسـی _: بـۆ کـوێ دەچیت ؟ پیاوەکەش ناوی دێیەکەی (حمـدان)ی هێنا، بۆیە بـە پیاوەکـەی گـوت: بـۆ ئـەوەی ماندوو نەبیت سواری مانگایەکیان بە. پیاوەکـەش گـوتی: مـن بەمـە فـەرمانم پێنـەکراوە. (حمدان)یش گوتی: وەکو ئەوەی بە فەرمان نەبێت هیچ کارێك نەکەیت ؟ ئەویش گوتی: بەڵێ. (حمدان)یش گوتی: بە فەرمانی کێ کار دەکەیت ؟ ئەویش گوتی: بـە فـەرمانی خاوەنەکـەم و خاوەنی تۆو خاوەنی دونیاو دواڕۆژ. (حمدان)یش گـوتی: کەواتـە ئـەوە خـوای پـەروەردگاریی جیهانیانە. ئەویش گوتی: ڕاست دەفەرمیت. (حمـدان) لێی پرسی: خواستت چی یە لەم دێیەی کە بۆی دەچی ؟ ئەویش گوتی: فەرمانم پێکراوە بانگی خەڵکەکەی بکـەم لـە نەفامیـەوە بـۆ زانین، لە گومڕایەوە بۆ ڕێگەی ڕاست، لە بەدبەختیەوە بۆ کامەرانیی، لە تەنگوچـەڵەمەکانی ڕیسوایی و هەژاری ڕزگاریان بکەم و، بیانکەم بە خاوەنی شتانێك کـە چـیتر پێویـستیان بـە تەقەلاو ماندویەتی نەبێت. بۆیە (حمدان) پێی گوت: ڕزگارم بکـە خـوا ڕزگـارت بکـات، بـە زانست دەوڵەمەندم بکە تا دەمژێنیتەوە، ئای چـەند پێویـستم بەوەیـە ! پیاوەکـەش گـوتی:

فەرمانم پێنەكراوە ئەم نهێنییە هەڵگیراوە بۆ هەموو كەسێك ئاشكرا بكەم، تا پاش ئەوەی متمانەیەكی تەواوم پێ دەبێت و، تا ئەو كاتەی ڕاشی دەسپێرم بە هەندێ شت. (حمدان)یش پێی گوت: ڕاسپێریەكانت بڵێ، پابەندی دەبم. پیاوەكەش پێی گوت: لە نەفسی خۆتدا پەیمانی خوا بە خۆم و پێشەوا بدەیت كە نهێنی و ڕازی پێشەوا كە فێرت دەكەم بڵاو نەكەیتەوە، هەروەها هەمان نهێنی و ڕازی خۆشم.

(حمدان)یش پابەندی پەیمانەكەی بوو، ئەوەبوو بانگخوازەكە بە پەرۆشییەوە هونەرەكانی نەفامی خۆی فێری (حمدان) دەكرد، تا بە تەواوی فریویداو، بە گوێكردنی (حمدان)ی بۆ خۆی مسۆگركرد، پاشان كرا بە نوێنەری بانگكردن و، بویە بنەمایەك لە بنەماكانی ئەم بیدعەیە، بۆیە شوێنكەوتوانیشی بە (القرامطة) و (القرمطيَّة) ناودەبران.

پاشان بە بەردەوامی كوڕەكانی (حمدان) جێگەكەی بابیان بە میراتی بۆ یەكتر بە جێدەهێشت و هەمان ڕێبازیان پەیڕەو دەكرد، بەڵام بەهێزترینیان پیاوێك بوو بەناوی (أبوسعيد)، ساڵی دووسەدو هەشتاوسێ بەدەركەوت، دەستەڵاتی بەهێز بوو، خەڵكێكی بێشومار شوێنی كەوتن، ژمارەیەكی زۆری لە موسڵمانان كوشت، مزگەوتەكانی دەڕۆخاند، قورئانەكانی دەسووتاند، پەلاماری حاجیەكانیشی دەداو دەیكوشتن، بۆ كەسوكارو هاوەڵانی خۆشی چەندین دابونەێتی نابەجێی داڕشت، چەندین هەواڵی پڕوپوچ و فێڵ و تەڵەكەی پێدەدان، هەركات بجنگایە دەیگوت: لەم ساتەدا پەیمانی سەركەوتنم پێدراوە، كاتێ مرد، گومەزێكیان [١٥٠] لە سەر گۆڕەكەی دروست كردو، باڵندەیەكی لە گەچ دروستكراویشیان بە سەریەوە دانابوو، دەیانگوت: ئەگەر ئەم باڵندەیە بفڕێت، (أبوسعيد) لە گۆڕەكەیەوە دەردەچێت، هەروەها ئەسپێك و جلوبەرگێكی دیاری و، چەكێكیشیان بەلایەوە دانابوو.

---

١٥٠ _ لەم سەردەمەشدا كەسانێكی زۆر لە بیدعەكاران و نەفامان هاوشێوایەتیان دەكەن و، لە سەر گۆڕەكان گومەزو مزگەوت دروست دەكەن، وادەزانن خەیریان ئەنجام داوە !!

ئیبلیس بۆی ڕازاندبوونەوە کە هەرکەس بمرێت و بە لای گۆڕەکەیەوە ئەسپێك دانرابێت، بە سواری کۆدەکرێتــەوەو، هەرکەسـیش ئەسـپێك بـەلای گۆڕەکەیـەوە دانـەنرابێت، بـە پیـادە کۆدەکرێتەوە.

هاوەڵانی (أبوسعید) هـەرکات یادیـان بکردایـەوە (صـلوات)یـان لـە سـەر دەدا، کەچـی (صلوات)یان لە سەر پێغەمبـەری خـوا _ صـلی الله علیـە وسـلم _ نـەدەداو، گوێبیـستی هەرکەسیش بوایەن (صلوات) لە سەر پێغەمبـەری خـوا _ صـلی الله علیـە وسـلم _ دەدا، پێیان دەگوت: ڕۆژی (أبوسعید) دەخۆیت و، (صلوات) لە سەر (أباالقاسم) دەدەیت ؟!

پاش خۆی (طاهر)ی کوڕی بەجێهێشت، هەمان کردەوەکانی بابی ئـەنجام دەدا، پـەلاماری کەعبەی پیرۆزی داو، هەموو کەلوپەلەکانیی بردو، (حجر الأسـود)یشی هەڵکەندو، هەڵیگرت بــۆ وەڵاتەکــەی خــۆی و، خەڵکیــشی چەواشــەکردبوو وای تێگەیانــدبوون کــە ئــەو خــوای _عزَّوجلَّ_ە.

## ناوی حەوتەم: (الخُرَّمِيّة ):

(خُرَّم): وشەیەکی عەجمیە هەواڵی شتێکی خۆشی بەلەزەتی پاك و چاك دەدات کە مرۆڤـی پیّ خۆشحاڵ دەبێت.

مەبەستی ئەم ناوەش زاڵ کردن و بەتواناکردنی خەڵکـە بـۆ شـوێنکەوتنی خۆشـیەکان و، داواکردنــی هــەواو ئارەزووەکــان هەرچــۆنێك بێــت و، پێــچانەوەی ڕاخــەری ســەپاندنەکانەو (التکالیف)، لادانی قورسیەکانی شەرعی سەر شـانی بەنـدەکانی خوایـە، پێـشتر ئـەم نـاوە نازناوی (المزدكيَّةِ)کان بوو، کە کۆمەڵە خەڵکێکی (المجوس)ی هەواداری بـەرەڵایی (الإباحیـة) بوون و لـە زەمــەنی (قُبـاذ)دا زانیاریـەکانیان بەدەرکـەوت، هەسـتان بـە حـەڵاڵکردنی ئـەو ئافرەتانــەی کــە بــەهۆی خزمایەتیــەوە نــابێ بخــوازرێن (النـساء المحرّمـات)، وە هــەموو حەرامکراوەکانیشیان حەڵاڵ کرد، ئەم تایەفە بەوە ناونران چونکە لە کۆتای ئەم ڕێباوەڕدا گەڵ (المزدکیة)کاندا لێك دەچوون، ئەگەرچی لە پێشەکیەکاندا لەوان جیاوازتر بوون.

**ناوی هەشتەم: (التَّعليميَّة):**

ئـەو نازناوەیـان بـۆ دانـان، چـونكه بنـەمای ڕێباوەڕەكـەیان پووچـكردنەوەی بـیروڕاو، پەكخستنی مافی بەكارهێنانی ئەقڵ وژیریەو، بانگكردنی خەڵكە بۆ فێربوون لە پێـشەوایەكی پارێزراو لە هەڵەو تاوان، وە پەی بەزانستەكانیش نابرێت مەگەر بەفێربوون.

## ✱ هۆکاری گومڕابوونی (الباطنية)کان:

بزانە ئەم کۆمەڵە ویستیان بەدزیەوە لە ئاین بچنە دەرەوە، بۆیە بە کۆمەڵێك لە (المجوس) و، (المزدكيَّة)و، (الثنَويَّة)و، فەیلەسوفە بێباوەڕکانیان ڕاوێژیان کرد، بۆ دۆزینەوەی ڕێگەچارەیەك بۆ چۆنیەتی سووکردنەوەی ئەو دەستبەسەراگرتنەی کە لە لایەن شوێنکەوتوانی شەرعەوە گیرۆدەی بوون، تا ئەو ئاستەی کە لاڵیان کردبوون و توانای دەربڕینی بیروباوەڕکانی خۆیان نەبوو، سەبارەت بە نکۆڵیکردن لە خوای دروستکارو، بەدرۆخستنەوەی پێغەمبەران و، باوەڕنەبوون بە زیندووبوونەوەو، بانگەشەکردنیان بەوەی پێغەمبەران هەواڵەکان بەدرۆ دەگێڕنەوەو هەق و نارەوایان بۆ تێکەڵ دەکەن و سەریان لێدەشێوێنن، تەماشاشیان کرد کاروباری (محمد) _ صلى الله عليه وسلم _ بە هەموو وەڵاتاندا بڵاوبویەوەو، چیتر توانای بەرهەڵستیان نەماوە، بۆیە گوتیان: تەنها ڕێگەیەکمان لە پێشەوە مابێت ئەوەیە کە بچینەسەر بیروباوەڕی تایەفەیەك لە کۆمەڵی موسڵمانان، کە خاوەن زیرەکترین ئەقڵ و، نایابترین بیروارِاو، قبوڵترینیان بە فێڵ و تەڵەکەو، خۆشباوەڕترینیان بە درۆودەلەسەبن، کە بریتیە لە (الروافض)کان و، خۆمان بپارێزین بەوەی کە گوایە بەشێکین لە ئەوان، برایەتیان لە گەڵدا ببەستین بە دەرخستنی خەفتباری بۆ ئەو ستەم و ڕیسوایەی لە بنەماڵەی پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ کرا، بۆ ئەوەی بەتوانابین جوێن بەو پێشینانە بدەین کە شەریعەتیان بۆ گواستونەتەوە، بۆیە ئەگەر ئەوانیان بەلاوە سووك بوو، چیتر ئاوڕ لەو شتانەش نادەنەوە کە ئەوان بۆیانیان گواستۆتەوە، ئەو کاتە بەتوانادەبین وردە وردە لە ئاینەکەیان دووریان بخەینەوەو لە خشتەیان بەرین. ئەگەر کەسانێکیشیان مایەوە دەست بە ڕووە ئاشکراکانی قورئان و فەرموودەوە بگرێت، هەڵیاندەخەڵەتێنین بەوەی کە ڕووەئاشکراکان نهێنی و دیوی شاراوەیان هەیەو، کەسی خەڵەتێنراو بە ڕووەئاشکراکان گێلەو، لە ڕاستیدا تەنها بڕوابوون بە دیوەشاراوەکان زیرەکیە، پاشان بیروباوەڕەکانمان لە نێوانیاندا بڵاو دەکەینەوەو، واڕادەگەیەنین ئەمە مەبەستە بەو ڕووەئاشکرایانەی کە ئێوە بڕواتان پێیەتی،

ئەوجا ئەگـەر بـەم کەسـانەوە زۆربـووین، زۆر بـە ئاسـانی توانـای لـە خـۆ نزیککردنـەوەی کۆمەڵەکانی تریشمان دەبێت.

پاشان گوتیان: تەنها ڕێگەشمان بریتیـە لـە هەڵبـژاردنی پیاوێـك لـەو کەسـانەی توانـای یارمەتیدانی ئێمەی دەبێت لە ڕێباوەڕەکـەداو، بانگەشـەی ئـەوە بکـات کـە لـە بنەماڵـەی پێغەمبەری خوایە _ صلى الله عيه وسلم _، وە پێویستە هـەموو خـەڵك شـوێنی کـەون و، پێویستە هەموویان گوێڕایەڵی بن، چونکە جێنشینی پێغەمبەری خوایـە _ صـلى الله عليـه وسـلم _، وە لـە لایـەن خـوای _ عزَّوجـلَّ _ەوە لـە هەڵـەو تـاوان پـارێزراوە، پاشـان بانگەوازیەکەمان نزیك بەم جێنشینەی کە بە پـارێزراو ناوزەنـدمان کـردووە بەدەرناکـەوێت، چونکە نزیکبونەوە پەردە شاروەکان لادەبات، بۆیە ئەگەر ماوەکـە دووربـوو و، دووری نێـوان درێژبۆووە، ئیتر کەسی بەگوێکار چ کاتێك بتوانێـت لـە بـارودۆخی پێـشەوا بکۆڵێتـەوە، یـا ڕاستی کارەکـــەی بزانێت ؟

مەبەستیشیان بە هەموو ئەمانە دەستەڵات بوو، دەستبەسەراگرتنی ماڵ و سامانی خەڵك بوو، تولەیان لێکەنەوە، چونکە پێشتر ئەوان بە خوێنرێژی مامەڵەیان لە گەڵدا کردن و، ماڵو سامانیان بە تاڵانی بردن، ئەمە ئەوپەڕی مەبەست و، سەرەتای کاریان بوو.

## ✸ فێڵەکانی (الباطنية):

نووسەر دەفەرمێت:

ئەم کۆمەڵە چەندەها فێڵ بەکاردێنن بۆ ملکەچ پێکردنی خەڵك، چونکە ئەوان زۆر بە باشی توانای جیاکردنەوەی ئەو کەسانەیان تێدایە کە شیاوە بۆ وردە وردە خەڵەتاندن بە بەراوردی ئەو کەسانەی بەلایانەوە شیاوی ئەوە نییە، بۆیە ئەگەر حەزیان بە خەڵەتاندنی کەسێك هەبێت، تەماشای خوو و ڕەوشتی دەکەن:

ئەگەر ئەوە کەسە هەواداری زوهد بوو، بۆ ئەمانەت و، ڕاستگۆیی و، وازهێنان لە هەواو ئارەزوو بانگی دەکەن.

بەڵام ئەگەر ئەو کەسە هەواداری بەرەڵایی بوو، ئەوەی لە دڵدا جێگیر دەکەن کە پەرستنەکان تێکچونەو, خواپەرستی و خۆپارێزی گێلیەو، زرنگی و دانایی لە شوێنکەوتنی هەواو ئارەزووکانی ئەم دونیا لەناوچووەدایە.

بۆ هەر خاوەن ڕێباوەڕێکیش ئەوەی بۆ جێگیر دەکەن کە شیاوی ڕێباوەڕەکەیەتی، پاشان لە بیروباوەڕەکانیدا گومانی بۆ دروست دەکەن و، ئەویش بە گوێیان دەکات و ئامادەیی خۆیان بۆ دەردەبڕێت، ئەو کاسانەش، یا پیاوێکی گەمژەیە، یا پیاوێکە لە نەوەی (أكاسرة) و منداڵانی (المجوس)، لەو کەسانەی دەوڵەتی باوباپیریان هیچ پەیوەندیەکی بە دەوڵەتی ئیسلامەوە نەماوە، یا پیاوێکە هەواداری دەسبەسەراگرتنەو، زەمەن یارمەتی نادات، ئەوانیش پەیمانی بەدەستهێنانی هیواو ئاواتەکانی پێدەدەن، یا کەسێکی لووتبەرزەو حەزی بەوەیە لە پلەو پایەی خەڵکی ئاسایی بەرزتربێتەوەو، بەگوتەی خۆی خواستی زانینی ڕاستیەکانی هەیە، یا کەسێکی (رافضي)ەو بە جوێندانی هاوەڵان _ خوایان لێ ڕازی بێت _ دینداری دەکات، یا کەسانێکی بێباوەڕە لە فەیلەسوف و (الثنوية)و سەرسامبووان لە ئایندا، یا کەسانێکە حەزپێکردنی هەواو ئارەزوو بەسەریاندا زاڵ بووەو، سەپاندنەکانی (تكليف) شەرعیان بەلاوە قورسە.

چەندەها کەسانی زندیقی ئاینداری بە ڕواڵەتیش هەن ڕق و کینەیەکی زۆریـان لـە دڵدایـە بەرامبەر بە ئیسلام، بۆیــە دەرکـەوتن و زیـدەڕۆیان کـردو، (إجتهـاد)یـان نوانـدو چـەندەها بیروباوەڕی تایبەت بە خۆیان ڕازاندەوەو ئەو کەسانەیان پێ لـە خـشتەدەبرد کـە هاوەڵێتیـان دەکردن و، قوڵی مەبەستیشیان لە بواری بیروباوەڕدا تەنها بەدزیەوە دەرچوون بـوو لـە گرێـی ئیسلام و، کارکردن بوو بۆ بەدەستهێنانی هەواو ئارەزووکان و حەڵاڵکردنی قەدەغەکراوەکان.

کەسانێکیش لەوانە بەردەوام بوون لە سەر خراپەکانیان، تا دونیاو دوارۆژیشیان لە دەسـت چوو، وەکو (ابن الراوندي):

(علي)ی کوڕی (المُحَسَّن التنوخِيّ) دەڵێت: بەردەوام (ابن الراوندي) لە (الرافضة)و کۆمەڵی بیباوەڕان جیانەدبۆووە، ئەگەر سەرزەنیشتیش بکرایە، دەیگوت: لە ڕاستیدا تـەنها خواسـتی زانینی ڕێباوەڕەکانیانم هەیە، پاشان دژایەتی خۆی دەربڕی و، خەریکی مشتومر بوو !!

نووسەر دەفەرمێت:

هەرکەس بیر لە باروحاڵی (ابن الراوندي) بکاتەوە، دەبینێت یەکێکە لە گەورەترین یـاخی بووان لە ئاین و خواپەرستی، کتێبێکی دانـابوو بـە نـاوی ((الـدامغ)) واتـە پووچـکار، وای ڕادەگەیاند کە گوایە شەریعەتی پێ پووچ دەکاتەوە، بەڵام پاك و بێگەردی بۆ ئەو زاتـەی کـە کتێب و بیروباوەڕەکانی پووچ کردەوە، لـە سـەرتاو تـافی لاوێتیـدا بـوو کتێبەکـەی دەبـردو، بەرامبەر بە قورئان نارەزای دەردەبڕی، بانگەشەی جیاوازیی و، بێ ڕەوانبێـژیی لـە قورئانـدا دەکرد، ئەگەرچی باش دەیزانی کە گەورە زمان پاراوانی عەرەب لە بیستنیدا سەرسام بـوون، ئیتر باروحاڵی فسەزمان لە کاتی بیستنی قورئاندا دەبێ چۆن بێت ؟!

هیچ زەمەنێکیش لە کەسانی پاشینی ئەمانە بێ بەش نەبووە، بـەڵام سوپاسـت بـۆ خـوا پشکۆی فراوانبوونی ئەمانە دامرکایەوە، جگە لە کەسانێکیان وەکو (باطني)یـەکی پـەنهان، یا خۆ بە فەیلەسوف زانێکـی بێـدەنگ کـە خراپترینـی خـەڵك و، ڕەنـج بـەباترین کـەس و، خراپترین گوزەرانی هەیە.

# بەشی شەشەم

## باسی هەستانی ئیبلیس بە سەلێشێواندنی زانایان لە جۆرەکانی زاستندا

نووسەر دەفەرمێت:

بزانە ئیبلیس بە چەند ڕێگەیەك سەر لە خەڵك دەشێوێنیٚ:

لەوانە ڕووە ئاشکراکان، لێرەدا مرۆڤ پەسەندێتی هەواو ئارەزووەکانی خۆی بەسەریدا زاڵ دەبیٚ، بۆیە لە زانستێکدا زێدەڕۆیی دەکات بە شێوەیەك کە دواتر کەساسی و ڕیسوایی پیٚ دەبەخشێت.

هەشە نادیارەو، بەلای زۆربەی زانایانەوە شاراوە دەبێت !

ئێمە ئاماژە بە چەند جۆرێك لە سەرلێشێواندنەکانی دەکەین کە بە کۆی ئەمانەی باسیان دەکەین باس نەکراوەکانیش دەزانرێن، چونکە ژماردن و باسکردنی هەموویان درێژە دەکێشیٚ.

## ✱ باسى هەستانى ئیبلیس بە سەرلێشێواندنى خوێنەرانى قورئان:

لەوانە کەسانێك خۆى بە خوێندنە (شاذ)ەکانى قورئانەوە خەریك دەکات و، بەشێکى زۆرى تەمەنى خۆى تەرخان دەکات بۆ کۆکردنەوەو، ڕێکخستن و، پێ خوێندنەوەیان بە خەڵك، بە جۆرێك پەرستنەکانى دیکەى لە (فرض) و (واجب) بیردەچێتەوەو بە باشى ئەنجامیان نادات، زۆرجار پێشەواى مزگەوتێك دەبینیت خۆى خەریك کردووەو قورئان فێرى خەڵك دەکات کەچى نازانێت چ شتێك نوێژ بەتاڵ دەکاتەوە، پێدەچێ زۆرجار حەزبە پێشەنگایەتى هانى بدات، بۆ دانیشتن لە پێش دەستى زانایاندا، بۆ ئەوەى زانستیان لێوە فێر بێت و، چیتر بەچاوى نەفامیەوە تەماشاى نەکرێت.

بەڵام ئەگەر بیرى خۆیان کارپێکردایە، دەیانزانى مەبەستى سەرەکى لەبەرکردنى قورئان و، چاك دەرخستنى وشەکانى و، ئینجا کارپێکردنى و، پاشانیش ڕووتێکردنى ئەو شتانەیە کە نەفس چاك دەکاتەوەو، ڕەوشتى پاك دەکاتەوەو، دواتریش کارکردنە بە گرنگ لە زانستە شەرعیەکان.

بەڕاستى بەفیڕۆدانى کات لە شتێکدا لەو گرنگتر هەبێ تێشکانێکى گەندو خراپە.

(الحسن البصري) فەرموویەتى: قورئان دابەزێندراوە بۆ کارپێکردن، کەچى خەڵك تەنها خوێندنەوەى قورئانیان کردووە بە کردەوە.

واتە تەنها دەیخوێننەوەو، کارپێکردنیان وازلێهێناوە.

وەکو ئەوەى کەسێك لە میحرابەکەیدا خۆى بە خوێندنى پلە (الشاذ)ى قورئانەوە خەرێك دەکات و، خوێندنە پلە (المتواتر)ەکان وازلێدەهێنێت.

ڕاستیش بەلاى زانایانەوە ئەوەیە کە نوێژکردن بە خوێندنى پلە (الشاذ)ى قورئانەوە دروست نیە، چونکە مەبەستى ئەم جۆرە کەسانە تەنها بەدەرخستنى خوێندنێکى نەبیستراوى غەریبە، بۆ بەدەستهێنانى ستایشى خەڵك و، بۆ ئەوەى خەڵك زیاتر ڕووى تێبکەن، ئیتر وادەزانێت کار بە قورئان دەکات.

کەسی واش هەیە خوێندنەوەکان کۆدەکاتەوە، بۆیە دەڵێت: (مَلِكِ)، (مالـكِ)، (مَلّـاكِ)... ئەمەش شیاو نییە، چونکە قورئان لە ڕێکخستنەکانی دەباتە دەرەوە.

کەسـی واش هەیـە (الـسجدات) و (التهلـیلات) و (التکـبیرات) کۆدەکاتـەوەو، ئـەوەش (مکروە)ە.

ئەمانە گەشتونەتە ئـەو ئاسـتەی کـە ئـاگرێکی زۆر بـۆ خەتمـە دادەگیرسـێنن، ئەمـەش کۆکردنەوەیە لە نێوان بـە فیڕۆدانـی سـامان و، خۆچـواندن بـە (المجوس)، هۆکارێکیـشە بـۆ کۆبوونەوەی ژنـان و پیـاوان بەشـەو و دروسـتبوونی خراپـی و بەدڕەوشـتی. ئیبلـیس وایـان بەخەیاڵدا دێنێت ئەمە خۆشەویستی و بەشکۆکردنی ئیسلامی تێدایە.

ئەمەش سەرلێشێواندنێکی گەورەیە، چونکە شکۆمەندی شەرع لـە بـەکارهێنانی ڕێگـە ڕەواکانیدایە.

کەسـانێکیش هـەن نـەرمونیانی دەنـوێنن و خۆیـان واپیـشان دەدەن کـە قورئانیـان لـە سەردەسـتی کەسـانێك خوێنـدووە کـە لـە سەردەستیـشیدا نەیخوێنـدووە، پێدەچـێت تـەنها ئیجازەیەکی لەو کەسەوە وەرگرتبێت، بۆیە کاتێ کە قسە دەکـات دەڵێـت: پێـی ڕاگەیانـدین (أخبرنا)، ئەمەش ساختەکاریە (تدلیس)، ئەو کەسە وادەزانێت شتەکە لەوەوە نزیکە، چونکە خوێندنەوەکان دەگێڕێتەوەو، بەکارێکی خەیری دادەنێت، بەڵام بیری دەچـێت ئـەوە درۆیـەو ؛ تاوانی درۆزنانی لە ئەستۆیە.

خوێنەری چاك خوێندنی قورئان لـە دوو یـا سـێ کەسـەوە وەردەگرێـت و، لـە گـەڵ ئـەو کەسەشدا قسە دەکات کە دیدەنی دەکات، پاشان داوای لێـدەکات بەدەسـتخەتی خـۆی بـۆی بنوسێت لەسەردەستی فڵان کەس خوێندویەتی بە خوێندنی فڵان کەس.

کۆمەڵێك لە لێکۆڵەرەوان دەڵێن: پێویستە دوو یا سێ کـەس کۆبنـەوەو، لـە سەردەسـتی کەسێك بخوێنن.

کەسانێك پێشبڕکێ بە زۆر خوێندنی قورئانەوە دەکەن، هەندێ لـە شێخەکانیـشیانم بینـی خـەڵك کۆدەکاتـەوەو، کەسـێکی خوێنـەری قورئـان دادەنێـت و، لـە ڕۆژێکـی درێـژدا سـێ

خەتمەی([١٥١]) قورئان دەكات، ئەگەر كەمتر بخوێنێت، عەیبدار دەكرێت و، ئەگەر بەتەواویش بیخوێنێت، ستایش دەكرێت، خەڵكی ئاسایی بۆ ئەو مەبەستە كۆدەبنەوەو، بە كارێكی چاكی دادەنێن، ئیبلیس وایان پێشان دەدات كە زۆر خوێندنی قورئان پاداشتی تێدایەو، ئەمەش دەچێتە چوارچێوەی سەرلێشێواندنەكانی ئیبلیسەوە، چونكە خوێندنی قورئان پێویستە بۆ خوای تعالى بێت، نەك بۆ بەدەستهێنانی چاكێتی، پێویستیشە لە سەرخۆ بخوێندرێت.

خوای تعالى دەفەرمێت: ﴿ لِتَقْرَأَهُ على النَّاس على مُكْثٍ ﴾ ﴿ الإسراء: ١٠٦ ﴾ واتە: ﴿لِتَقْرَأَهُ على النَّاس ﴾ بۆ ئەوەی بیخوێنیتەوە بەسەر خەڵكیدا ﴿ على مُكْثٍ ﴾ بەلەسەرخۆیی و هێواشی(١٥٢).

هەروەها فەرموویەتی: ﴿ وَرَتِّلِ القرآنَ تَرْتيلا ﴾﴿ المزمل: ٤ ﴾ واتە: دەوری قورئان بكەرەوە بەلەسەر خۆی (بەرێك و پێكی) (١٥٣).

كەسانێكیش لە خوێنەران خوێندنی قورئانیان بە ئاوازەوە داهێناوە، كە زۆر لە ئاوازی دیكەوە نزیكە،، بۆیە پێشەوا (أحمد)ی كوڕی (حنبل)و كەسانی تریش بە (مكروه)یان داناوە.

بەڵام پێشەوا (الشافعي) فەرموویەتی: گوێگرتن لە گۆرانی وشترەوان و، سرودی دەشتەكیەكان، هیچی تێدا نییەو، هەروەها خوێندنی قورئان بە ئاوازەوەو، جوانكردن و چاكرنی دەنگ لە كاتی قورئان خوێندندا هیچی تێدا نییە.

گوتم _ ابن الجوزي _ لەڕاستیدا پێشەوا (الشافعي) ئاماژە بۆ ئەوە دەكات كە لە زەمەنی خۆیدا هەبووەو، بە ئاوازێكی كەمەوەو قورئانیان دەخوێند، بەڵام ئەمڕۆ، ئەوەیان بردۆتەوە

---

١٥١ _ ئەم كارە پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەری خوایە كە فەرموویەتی: ((لا يفقه القرآن مَن قرأه في أقل من ثلاث)) واتە ((هەركەس قورئان بە كەمتر لە سێ ڕۆژ بخوێنێت لێی تێناگات)). رواه البخاري (٤٧٢/٩)، ومسلم (١١٥٩) " عن ابن عمرو.

١٥٢ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

١٥٣ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

چوارچێوەی یاسای گۆرانیەوە، بۆیە چەند زیاتر نزیك بێتەوە لە چواندن بە گۆرانیەوە، (کراهە)تی زیاتر دەبێت، بۆیە ئەگەر قورئان لە سنووری دانانیی دەرهێنرا، حەرام دەبێت.

کەسانێك لە خوێنەران نەرمونیانی دەنوێنن بەرامبەر بە شتێکی کەمی تاوان، وەکو غەیبت و بەدگۆیی هاوتاوهاوشانی خۆیان، پێدەچێ لەو تاوانە گەورەتریش ئەنجام بدەن و، بروایان وابێت کە بە لەبەرکردنی قورئان سزای ئەوەیان لەسەر لادەبات و، ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەری خواش _ صلى الله عليه وسلم _ بە بەڵگە دەکەن کە دەفەرمێت:

((لو جُعِلَ القرآنُ في إهابٍ ما احترَقَ))(١٥٤) واتە ((ئەگەر قورئان بچێتە نێو دڵی مرۆڤەوە بەلەبرکردن و خوێندنەوە ئەوا ئاگر نایسوتێنێت)).

ئەوەش کاری ئیبلیسە کە سەری لێشێواندوون، چونکە سزای ئەو کەسەی دەزانێت زیاترە لە سزای ئەو کەسەی نازانێت، چونکە زاستی زیاتر بەڵگە بەهێز دەکات، وەلەبەر ئەوەی خوێنەر رێزی دانەناوە بۆ ئەوەی لە تاوانێکی تر بپارێزێت:

خوای تعالى دەفەرمێت: ﴿ أَفَمَنْ يَعْلَمُ أَنَّما أُنْزِلَ إليكَ مِن ربِّكَ الحَقُّ كَمَنْ هو أعْمَى﴾ ﴿الرعد: ١٩﴾ واتە ﴿أفَمَنْ يَعْلَمْ﴾ جا ئایا کەسێك کە بزانێ ﴿أنَّما أُنْزِلَ إليكَ﴾ بەڕاستی ئەوەی نێرراوەتە خوار بۆ تۆ ﴿ من رَبِّكَ الحَقُّ ﴾ لە لایەن پەروەردگارتەوە حەق و ڕاستە ﴿كَمَنْ هو أعْمَى ﴾ وەك ئەو کەسەیە کە کوێربێت(١٥٥).

سەبارەت بە خێزانەکانی پێغەمبەری خواش _ صلى الله عليه وسلم _ فەرموویەتی: ﴿مَنْ يَأتِ مِنْكُنَّ بفاحِشَةٍ مُبَيِّنَةٍ يُضاعَفْ لها العَذابُ ضِعفَيْن ﴾﴿ الأحزاب: ٣٠ ﴾ واتە ﴿مَنْ يأتِ مِنْكُنَّ بفاحِشَةٍ مُبَيِّنَةٍ ﴾ هەرکام لە ئێوە گوناهێکی گەورە بکات ﴿ يُضاعَفْ لها العذابُ ضِعفَيْنِ﴾ سزای بۆ دوو بەرابەر دەکرێتەوە بە دوو قاتی (خەڵکی تر)(١٥٦).

---

١٥٤ _ رواه الطبراني في ((الكبير)) (١٧ / ١٦٩)، وابن عدي في ((الكامل)) (٦ / ٢٠٤١) " عن عصمة بن مالك. وفيه ضعف. وله شاهد: رواه الدارمي في ((مسنده)) (٢ / ٤٣٠) عن عقبة بن عامر. وسنده حسن. فالحديث صحيح لغيره.

١٥٥ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

١٥٦ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

## * باسی هەستانی ئیبلیس بە سەرلێشێواندنی فەرموودەناسان:

لەم بوارەدا کەسانێك هەموو تەمەنی خۆیان تەرخان کرد بۆ بیستنی فەرموودەو گەڕان‌و کۆچکردن بەدوایداو، کۆکردنەوەی ڕێگەیەکی زۆرو (١٥٧)، دواکردنی (سند)ێکی بەرزو، (متن)ی نامۆ، ئەمانە دوو بەشن:

بەشێکیان مەبەستی سەرەکیان پاراستنی شەرع بوو بە ناسینی (صحیح) و (ضعیف)ی فەرموودەکان، ئەمانە سپاست کراوەن سەبارەت بە مەبەستە چاکەکەیان، بەڵام ئیبلیس کاری سەرلێشێواندنی خۆی دەکات و هەڵدەستێت بە خەریك کردنیان بەم کارەوە بۆ ئەوەی بە باشی فێری ئەو شتانە نەبن کە (فرض عین)ەو دەبێ هەموو کەس بیزانێت، لە گەڵ کۆششکردن بۆ بەجێهێنانی پێویست و، شارەزابوون لە فەرموودەدا.

ئەگەر کەسێك بڵێت: کەسانێکی زۆری پێشین وەکو (یَحْیی)ی کوڕی (مَعین) و (ابن المَديني) و (البُخاري) و (مسلم) بەم کارە هەستاوەن !

بۆ وەڵامەکەی دەڵێین: ئەوان بەتوانابوون لە کۆکردنەوەی نێوان فێربوون و ناسینی گرنگ لە کاروباری ئاین و، داواکردن و کۆکرنەوەی فەرموودەدا، ئەوەش کە یارمەتی دەدان کورتی (اسناد)و، کەمی فەرموودە بوو، بۆیە زەمەنی ئەوان فراوان بوو بۆ بە جێهێنانی هەردوو کارەکە.

بەڵام لەم زەمەنەدا _ زەمەنی (ابن الجوزی) _، (سند)و ڕێگەی فەرموودەکان درێژ بۆتەوەو، ڕێکخستن و دانانی کتێبیش تیایدا فراوان بووە، بۆیە کەم کەس توانای کۆکردنەوەی هەردوو کارە ئاماژە پێکراوەکەی سەروەیان دەبێت، بۆیە فەرموودەناس (١٥٨) دەبینیت پەنجا ساڵ دەنوسێت و دەبیستێت و، کتێب کۆدەکاتەوەو، نازانێت چ تێدایە، ئەگەر لە نوێژەکەیدا

١٥٧ _ للأستكثار لا لزيادة الفائدة، وهذه مهمةٌ !

١٥٨ _ بێگومان شتێکی وەکو ئەمە _ ئەگەر ڕوویدات _ تەنها خۆی دەگرێتەوە، چونکە فەرموناسی ڕاست، ئەو کەسەیە کە فەرموودەناسی و لێکۆڵینەوەی سوننەت دەیگەیەنێتە ئاستی شارەزابوون لە فیقەو، داواکردنی حوکمە شەرعیەکان لە سەرچاوە ڕەسەنەکانەوە بە شێوەیەکی دروست و ڕاست.

ڕووداوێکی بێته پێش، ناچاری هەندێ لە خوێندکارە شەرعیەکانی خۆی دەبێت کـە بـەردەوام دیدەنی دەکەن بۆ بیستنی فەرموودە.

بەهۆی ئەمانەوە بوو ڕەخنەگران توانای تانەلێدانی فەرموودناسـانیان بـۆ دروسـت بـوو ، دەیانگوت: هاوەڵی سەفەرن، نازانن چیان پێیە (١٥٩).

ئەگەر کەسێکیشیان سەرکەوتوو بێت و، تەماشای فەرموودەکانیی کرد، زۆر نزیکە کاریە فەرموودەیەکی لابراو (منسوخ) بکات، لەوانەیە تێگەشتنیشی بۆ فەرموودەکە بە هاوشێوەی تێگەشتنی کەسێکی ئاسایی نەفام بێت و، کاری پێبکـات و، ئـەوەش مەبەسـتی ڕاسـت لـە فەرموودەکە نەبێ.

(الخطـابي) دەفەرمێت: فەرموودەکەی پێغەمبەری خوا _ صلی الله علیـه وسـلم _: ((أنَّ النبـيّ _ صلى الله عليه وسـلم _ نَهـى عـن الحِلَـقِ قبـلَ الـصلاةِ يـومَ الجُمُعَـةِ))(١٦٠) واتـە ((پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ قەدەغەی ئەڵقە بەستنی دەکرد بـۆ خوێنـدن و فێربوونی زانستی شەرعی پێش نوێژی هەینی))، شێخێکمان واتێگەشتبوو فەرموودەکـە بـەم جۆریە: ((أنَّ النبـيّ _ صلى الله عليه وسلم _ نَهى عن الحَلْـقِ قبلَ الـصلاةِ يـوم الجُمُعَـةِ)) واتە ((پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ قەدەغەی سەرتاشینی کردووە پێش نوێژی هەینی)) !

---

١٥٩ _ وفي مثل ذلك يقول شاعرهم (!):

زوامِلُ للأسْفارِ لا عِلمَ عندَهُم       بجَيِّدِهـــا إلا كَعِلْمِ الأباعِرِ

واتە: هاوەڵی سەفەرن و تێگەشتنیان بە چاکەکانی نی یە تەنها ئەوەندەی تێگەشتنی وشتر نەبێ

١٦٠ _ رواه أبـوداود (١٠٧٩)، والترمـذي (٣٢٢)، والنـسائي (٢ / ٤٧ و ٤٨) " مـن طريـق عَمـرو بـن شعيب عن أبيه عن جده.

وهذا سند حسن.

ولأخينا الفاضل محمد موسى نَصْر رسالة في مسألة التحلُّق قبل الجمعة للدرس ونحوه، وهي تحت الطبع.

(الخطابي) فەرمووی: ئەو شێخە پێی گـوتم کـە چـلّ سـاڵە پـێش نوێـژی هـەینی سـەری نەتاشیووە. منیش پێم گوت: لە ڕاستیدا وشەکە (الحِلَق)ە، کۆی (حَلَـقة) واتە ئەڵقـە بەسـتن نەك (الحَلْـق) واتـە سەرتاشـین، لەڕاسـتیدا پێغەمبـەری خـوا _ صـلی الله علیـە وسـلم _ قەدەغەی کۆبوونەوەو ئەڵقەبەستنی کردووە بۆ خوێندن و فێربوونی زانستە شـەرعیەکان پـێش نوێژی هەینی و، فەرمانی کردووە مرۆڤ خـۆی بـە نوێژەکـەوە خـەریك بکـات و، گـوێ لـە وتارەکە بگرێت. ئەویش پێی گوتم: خەم و خەفتت ڕواندمـەوە. شـێخەکە پیـاوێکی چـاکیش بوو.

لە زەمەنی خۆشماندا _ زەمەنی (ابن الجـوزي) _ کەسانێکمان بینی کتێـب کۆدەکاتـەوە، گوێگرتنێکی زۆر دەکات بۆ فێربوونی فەرمودە، بـەڵام تێگەشـتنێکی تــــــەواوی نییـە سەبارەت بەوەی دەستی کەوتووە!!

هەشیانە قورئانی لەبەر نییەو، پایەکانی نوێژ نازانێت، ئەو کەسانە _ بە گوتەی خۆیان _ لە جیاتی فێربوون و کارپێکردنی (فرض عـین)ەکان(١٦١) خۆیـان بـە فێربـوون و کـارپێکردنی (فرض کفایة) یەکانەوە(١٦٢) خەریك دەکەن، بۆیە هەرکات کاری نا گرنگ لـە کـاری گـرنگ پەسەندتر کرا ئەوا بە دڵنیایی لە سەرلێشێواندنەکانی ئیبلیسەوەیە.

بەشی دووەم: کۆمەڵێکن گوێگرتنیان بۆ فێربوونی فەرموودە زۆر بوو، بەڵام مەبەسـتیان دروست نەبوو، نەشیان دوویـست (صـحیح)ی فـەرموودەکان لـە (ضـعیف)ی جیاکەنـەوە بـە

---

١٦١ _ فرض عین: ئەو پەرستنەیە کە پێویستە هەموو کەسێك بۆ خۆی بیکات، پاداشت وسزاشی هەر بۆ خۆیەتی و، ئەگەر کەسێکی تر ئەو پەرستنە بکات تاوانی نەکردنی لەسەر ئەم لاناچێت وەکو: نوێژو ڕۆژوو وهتد... وەرگێڕ.

١٦٢ _ فرض کفایة: ئەوەیە کەوا لە هەر وەڵاتێکدا کۆمەڵێك کەس بیکەن و کارەکەیان پێ ئەنجام بدرێت، ئەوە لەسەر خەڵکی تری ئەو وەڵاتە دەکەوێت، بەڵام ئەگەر کەس نەیکات، یاخود کەسانێك بیکەن، بـەڵام کارەکەیان بەتەواوەتی پێ ئەنجام نەدرێت، ئـەوە خـەڵکی ئـەو وەڵاتـە هـەموویان تاوانبـار دەبـن بـەهۆی کەمتەرخەمیەوە وەکو ناشتنی مردوو، بانگ دان و هتد... وەرگێڕ.

کۆکردنـەوەی ڕێگـەکانی گێڕانـەوەی فـەرمووده(١٦٣)، بـەڵکو مەبەسـتیان بەدەسـتهێنانی (عوالي) و (الغرائب)ی فەرموودەکان بوو، بۆیە بە وەڵاتاندا دەگەڕان، بۆ ئەوەی کەسـانێکیان بڵێت: چاوەم بە فڵان کەس کەوت، چەندەها (إسناد)م لایە بەلای کەسی ترەوە نییە، چـەندەها فەرموودەم لایە بەلای کەسی ترەوە نییە.

لە بەغدا کەسانێکی فێرخوازی فەرموودە لـە شـوێنەکانی تـرەوە سـەردانی کـردین، کـە دەهات شێخی دەبردو، لە (الرَّقَّـة) _ ئەو باخـەی سـەر ڕووبـاری دجلەیـە _ دایدەنیـشاندو، شێخیش فەرموودەی فێر دەکرد، بۆیە فێرخوازەکە لە کۆکراوەکانیدا دەیگوت: فڵان و فڵان لە (الرَّقَّة) بۆیان باسکردم. خەڵکی واتێدەگەیاند ئەو شارەی وەڵاتی (الشام)ە (١٦٤)، بـۆ ئـەوەی خەڵك واتێبگەن لە سەفەرەکانیدا زۆر ماندوو بووە لە پێناو فێربوونی فەرموودەدا.

هەروەها شێخی لە نێوان ڕووبـاری عیـسی و ڕووبـاری فوراتـدا دادەنیـشاندو، پاشـانیش دەیگوت فڵان کەس لە (وراء النهـر)ەوە واتە لـە پـشت ڕووبـارەوە بـۆی باسـکردم. خـەڵکی واتێدەگەیاند لـە (خُراسـان) پەڕیوەتـەوەو لـە وەڵـاتی پـشت ڕووبـارەوەوە فێـری فـەرموودە بووە(١٦٥).

دەشیگوت: لە سەفەری دووەمدا، یا سێیەمدا فڵان کەس بۆی باسکردم، بۆ ئەوەی ئاسـتی ماندووبوونەکەی لە پێناو فێربوونی فەرموودەدا بە خەڵك ڕاگەیـەنێت، بۆیـە هـیچ پـیرۆزی و فڕداریەکی دەستگیر نابێت و، هەر لە زەمەنی داواکردن و فێربوونیشدا مرد!

---

١٦٣ _ ئەمە هەمان شتە کە پیش چەند پەراوێزێك ئامـاژەم پێـدا، بۆیـە پێویـستە ئـەو کەسـانەی لـەم سەردەمەدا لە بواری فەرموودەناسیدا کار دەکەن تێگەشـتن و، تێـڕوانین و، کـارپێکردنی فـەرموودەکانیان تێدا کۆبێتەوە.

١٦٤ _ انظر ((معجم البلدان)) (٣ / ٥٩ _ ٦٠) لياقوت الحموي.

١٦٥ _ ئەمە کارێکی زەمکراوەو، فەرموودەناسان پێی دەڵـێن: ((تـدليس البلـدان)) واتـە سـاختەکاری وەڵاتان. انظر: ((الباعث الحثيث)) (ص ٥٦)، وتعليق أحمد شاكر عليه.

نووسەر دەفەرمێت:

هەموو ئەمانە لە دڵسۆزیەوە بەدوورن، لە ڕاستیدا مەبەستیان تەنها سەروەری و خۆهەڵکێشان بوو، بۆیە بەدوای (شاذ) و (غریب)ی فەرموودەدا دەگەڕێن، لەوانەش بوو کەسێکیان بەشێکی دەستکەوتایە کە گوێگرتنێکی برا موسڵمانەکەی تێدا بوایە، ئیتر دەیشاریتەوە، بۆ ئەوەی ئەو گێڕانەوەیە تەنها بۆ خۆی بێت و، لەوانەش بوو بمرێت و ئەو بەشە نەگێڕێتەوە، بۆیە لە دەستی هەردووکیان دەچوو.

لەوانەش بوو کەسێکیان سەفەری کردایەو چوبایەتە دیدەنی شێخێك پیتی یەکەمی ناوەکەی (قاف) یا (کاف) بووایە، بۆ ئەوەی تەنها لە لیستی شێخەکانیدا بینووسێت !

# ✸ زەم و غەییەت کردن:

لە سەرلێشێواندنەکانی ئیبلیس هەستانی ئەهلی فەرموودەیە بە زەمکردنی یەکتر تەنها بۆ تۆڵەکردنەوە (١٦٦)، ئەوەش دەبەنە بواری (جرح و تعدیل)ەوە(١٦٧) کە پێشینی ئەم ئومەتە بەکاریان دەهێنا بۆ پاراستنی شەرع، خواش بە مەبەستەکان زاناترە.

بەڵگەیەکی بەهێزی مەبەست خراپی ئەمانە بریتیە لە بێدەنگ بوونیان بەرامبەر بەو شێخانەی فەرمودەیان لێ وەرگرتوون، بەڵام پێشین بەو شێوە نەبوون، ئەوەبوو (علي)ی کوڕی (المَديني) لە باییەوە _ کە (ضعیف) بوو _ فەرموودەی دەگێڕایەوە، پاشان دەیفەرموو: (وفي حديث الشيخ مافيه)(١٦٨) واتە فەرموودەکانی شێخ ئەوەی تێدایە کە تیایدایە.

(یوسف)ی کوڕی (الحسین) فەرمووی: سەبارەت بە غەیبەتکردن لە (المحاسبي)م پرسی ؟ ئەویش فەرمووی: خۆتی لێ بپارێزە، چونکە خراپترین دەستکەوتە، ڕات چی یە بەرامبەر بە شتێك کارە چاکەکانت لێ بستێنێتەوەو، نەیاران و ئەو کەسانەش کە لە دوونیادا ڕقت لێ بوون پێی ڕازی بکات ؟ باشە لەڕۆژی قیامەتدا چۆن نەیارانت ڕازی دەکەیت، بەدڵنیایی لە کارە چاکەکانت دەبا، یا لە کارە خراپەکانی دەبەی ؟! چونکە لەوێ دینارو دیرهەم نییە، بۆیە خۆتی لێ بپارێزەو ؟ سەرچاوەکەی بزانە، چونکە سەرچاوەی غەیبەتی خەڵکی هەرچی و پەرچی بۆ سارێژکردنەوەی ڕق و کینەیە، یا هەڵەشەیە، یا بەخیلیە، یا بەدگومانیە، ئەمانەش ئاشکران و شاراوە نین.

بەڵام هەستان بە غەیبەتکردنی زانایان، سەرچاوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ خەڵەتاندنی نەفس کە هاندەرە بۆ دەربڕینی ئامۆژگاری و، لێکدانەوەی (تأویل) ئەو هەواڵانەی کە ڕاست نین،

---

١٦٦ _ بەدڵنیایی لە کەسانی تردا بەڵاترو تاڵترە.

١٦٧ _ علم الجرح والتعديل: زانستێکە گرنگی داوە بەو پیاوانەی فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا _ صلی الله علیه وسلم _ دەگێڕنەوە، بەتێڕوانینی مەرجەکانی قبوڵبونیان و، هۆکاری ڕەتکردنەوەیان، بۆیە ئەو (اسناد)انەی مەرجەکانی دروستی تێدایە حوکم بەقبوڵبونی دەدرێت و، ئەوەشی کە هۆیەك یا زیاتر لە هۆیەکانی ڕەتکردنەوەی تێدایە ڕەتدەکرێتەوە. زانستێکی گەورەیە بەرەکەی بریتیە لە ناسینی فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا _ صلی الله علیه وسلم _ بە (صحیح)ی و (ضعیف)ی، قبولکردن و ڕەتکردنەوە، والله أعلم، بڕوانە: الدکتور عبدالله الفقیه، موقع الشبكة الإسلامية على الإنترنيت.

١٦٨ _ انظر ((تهذيب التهذيب)) (٥ / ١٧٤ _ ١٧٦) لابن حجر.

ئەگەر ڕاستیش بن، نابن بە پاڵنەری غەیبەتکردن، بۆ نموونە ئەم گوتەیە: ((أَتَرِعونَ عن ذكره؟ اذكروه بما فيه " ليَحْذَرَهُ الناسُ))(١٦٩) واتە: ((ئایا دەستبەرداری باسکردنی دەبن ؟ بەوەی تیایدایە باسی بکەن ؛ بۆ ئەوەی خەڵکی خۆیانی لێ بپارێزن)). نابێتە پاڵنەری غەیبەتکردن.

بەڵام ئەگەر هەواڵەکە ڕاست و پارێزراو بوو، ئەوا هیچ ناو زڕاندنێکی برا موسڵمانەکەتی تێدا نابێت و، لەو بارەشەوە هیچ پرسیارێکت لێ ناکرێت. بەڵام ئەگەر کەسێك بە شوێن ڕاستیدا دەگەڕاو(١٧٠) پێی گوتیت: دەمەوێ کچەکەم لە فلان کەس مارەبکەم، ئایا هیچ بیدعەیەکت لێ بینیوە، یا جێی متمانە نەبێ لە سەر پارێزراوی موسڵمانان، ئەو کاتە تۆش

---

١٦٩ _ هو كما قال المصنف _ رحمه الله _.

وقد أخرجه في ((العلل المتناهية)) (رقم ١٣٠٠)، ونقل كلام أئمة الجرح والتعديل في الطعن برواته، وبخاصة الجارود النيسابوري، فهو وضّاع. وأخرجه من الطريق نفسه ابن حبان في ((المجروحين)) (١ / ٢١٥)، والبيهقي في ((السنن)) (١٠ / ٢١٥)، والخطيب في ((التاريخ)) (١ / ٣٨٢ و ٣ / ١٨٨)، وغيرهم.

١٧٠ _ ئەوە بۆ نموونەیە، بەڵام شتی بەو جۆرە زانایان بە شیاویان داناوە لە چەند جێگەیەکدا، کە هەندێ لە شاعیران بەشێوەی شیعر ڕێکیان خستووە بەم جۆرە:

القَدْحُ لَيسَ بِغَيْبَـةٍ في سِتَّةٍ مُتَظَلِّمٍ ومُعَرِّفٍ ومُحَـذِّرِ
ومُجاهِرٍ فِسْقاً ومُسْتَفْتٍ ومَـنْ طَلَبَ الإعـانَةَ في إزالةِ مُنْكَرِ

ولتراجع رسالة ((رفع الريبة عما يجوز ومالايجوز من الغيبة)) للإمام الشوكاني _ رحمه الله _.

واتە: زەمکردن نابێت بە غەیبەت لە شەش باردا:

مُتَظَلِّمٍ: واتە ستەم لێکراوێك دەڵێت فلان کەس ستەمی لێکردووم.

مُعَرِّفٍ: واتە کەسێکی ئاشکراکار ڕاوێژی پێدەکرێت بۆ زانینی عەیبی جەستەیی کەسانێك ئەویش دەڵێت فلان چاوکزویرپووشاویە یا فلان کەس شەلە و هتد...

مُحَذِّر: واتە کەسێکی وریایکار بە هاوەڵەکەی خۆی دەڵێت فلان کەس ئاوەهاو ئاوەهای لێدەوەشێتەوە هاوەڵیی مەکە.

مُجاهِرٍ فِسقاً: واتە ئەگەر کەسێك شێوەیەك لە شێوەکانی خراپەی (فسق) تێدا بوو، ئاسایە تۆ باسی ئەو شێوە خراپەی بکەیت بە مەرجێك مەبەستت تەنها قەدەغەکردنی بێت ئەگەر قسەکانی تۆی پێگەشت.

مُسْتَفْتٍ: واتە کەسێك داوای فەتوایەکی شەرعی دەکات و دەڵێت فلان کەس ئەو کارەی کردووە ئایا شیاوە ئەوە بکات یا نەء.

ومن طلب الإعانَةَ في إزالةِ مُنْكَـر: واتە کەسێك دەڵێت فلان ئەو کارە خراپە دەکات داوای یارمەتیت لێدەکەم بۆ لادانی ئەو خراپەیە. بڕوانە: أنواع البروق فی أنواع الفروق. وەرگێڕ.

به شێوازێكی جوانی دوورخستنه‌وه پیاوه‌كه‌ی لێ دووره‌خه‌یته‌وه. یا پیاوێكی تر دێت و، پێت ده‌ڵێ: ده‌مه‌وێ ماڵ و سامانه‌كه‌م ئه‌سپارده‌ی ده‌ستی فڵان كه‌س بكه‌م. ئه‌و پیاوه‌ش شیاوێتی ئه‌مانه‌ت لاداناني تێدا نییه، دیسان تۆش به جوانترین شێواز پیاوه‌كه‌ی لێ دووره‌خه‌یته‌وه. یا پیاوێكی تر دێت و پێت ده‌ڵێ: ده‌مه‌وێ له پشتی فڵان كه‌سه‌وه نوێژ بكه‌م، یا بیكه‌م به پێشه‌وام له زانستێكدا. تۆش به جوانترین شێواز له‌و پیاوه‌ی دووره‌خه‌یته‌وه‌و، به غه‌یبه‌تكردنیشی رِق و كینه‌ت به‌رامبه‌ری سارێژ ناكه‌یته‌وه.

به‌ڵام سه‌رچاوه‌ی غه‌یبه‌ت له لایه‌ن خوێنه‌ران و خواپه‌رستانه‌وه ئه‌وه‌یه كه له رِێگه‌ی پێ سه‌رسام بوونه‌وه ناته‌واوی برا موسڵمانه‌كه‌ی ئاشكرا ده‌كات و، پاشان خۆی واپیشان ده‌دات كه له كاتی ئاماده نه‌بوونیدا نزاو دوعای بۆ ده‌كات. بۆیه سه‌ره‌تا به‌ده‌ستهێنانی گۆشتی برا موسڵمانه‌كه‌ی مسۆگر ده‌كات و، پاشان خۆی ده‌رِازێنێته‌وه به‌وه‌ی كه گوایه نزاو دوعای بۆ ده‌كات.

به‌ڵام سه‌رچاوه‌ی هه‌ستان به غه‌یبه‌تكردنی ده‌سته‌ڵاتداران و مامۆستایان، له رِێگه‌ی به‌ده‌رخستنی به‌زه‌یی و سۆزه‌وه‌یه، تا ده‌ڵێت: فڵان كه‌س به‌دبه‌خته، تووشی ئاوه‌هاو ئاوه‌ها بووه‌و، به ئاوه‌هاو ئاوه‌ها تاقی ده‌كرێته‌وه، په‌نا ده‌گرین به خوا له رِیسوایی، ئه‌مجا خۆی واپیشان ده‌دات كه به‌زه‌یی و سۆز ده‌رده‌برِێت به‌رامبه‌ر به براكه‌ی و، هه‌روه‌ها خۆی واپیشان ده‌دات كه نزاودوعای بۆ ده‌كات له نێو براكانیداو، ده‌ڵێت: ئه‌وه‌م بۆ ده‌ربرِین تا ئێوه‌ش نزاو دوعای زۆری بۆ بكه‌ن.

په‌ناده‌گرین به خوا له غه‌یبه‌تكردن به هێما بۆ كردن یا به ئاشكراكردن، خۆتان له غه‌یبه‌ت بپارێزن چونكه قورئان (كراهة)تی(١٧١) ئاشكرا كردووه‌و خوای تعالى ده‌فه‌رمێت:

﴿ أَيُحِبُّ أَحَدُكُم أَنْ يَأكُلَ لَحْمَ أخيهِ مَيْتاً فكَرِهْتُموهُ ﴾﴿ الحجرات: ١٢ ﴾. واته ﴿ أيُحِبُّ أحَدُكُمْ ﴾ ئایا كام له ئێوه پێی خۆشه ﴿ أن يأكُلَ لَحْمَ أخيـهِ ﴾ كه گۆشتی برا (ئاینیه‌كه‌ی)

---

١٧١ _ الكراهة التحريمِيّةُ المُغَلّظة.

بخوات؟ ﴿ مَيْتاً ﴾ به مـردووی ﴿ فَكَرِهْتُمـوه ﴾ بێگومـان قێزتـان لـێ ی دێتـەوەو پێتـان ناخۆشه(١٧٢).

لەم بارەشەوە چەندین فەرموودەی (صحیح) لە پێغەمبەری خواوە _ صلی الله علیه وسلم _ باس کراوە.

هـەروەها ئیبلـیس سـەر لـە زانایـانی فـەرموودەناس دەشـێوێنێت بـەوەی فـەرموودەی (الموضوع) دەگێڕنەوە بەبێ ئەوەی (الموضوع)بوونی فەرموودەکە ڕوون بکەنـەوە (١٧٣)، ئەمـە دەستدرێژیەکەو دەیکەنە سەر شەرع، مەبەستیشیان ئەوەیە کـە دەیانـەوێت تـەنها بـرەو بـە فەرموودەکانیان بەن، لە گەڵ زۆرکردنی (ریواية)ەکانیان، بەڵام پێغەمبەری خوا _ صلی اللـه علیه وسلم _ فەرموویەتی:

((مَن روى عنِّي حديثاً يُرى أنَّه كَذِبٌ " فهـو أحـدُ الكـاذِبَيْن ))(١٧٤) واتـە: ((هەرکـەس فەرموودەیەك لە منەوە بگێڕێتەوەو بزانرێت درۆیە، ئەوا کەسێکە لە درۆزنان)).

لە چوارچێوەی ئەم زانستەشدا هەڵدەستن بـە (تـدلیس)کـردن(١٧٥) لـە گێڕانـەوەدا، بۆیـە کەسانێك دەڵـێن: (فـلان عـن فـلان)، یـا (قـال فـلان عـن فـلان). تـۆ واتێدەگەیـەنێت کـە

١٧٢ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

١٧٣ _ وللمصنف _ رحمه الله _ كتاب ((الموضوعات))، وهو فريدٌ في بابه " إلا أنه حكم على أحاديث صحيحه أو ضعيفة الضعف اليسير بالوضع، لذلك حكم الأئمة أنه متساهل في الحكم بالوضع. وانظر ((القول المسدّد في الذب عن المسند)) للحافظ ابن حجر _ رحمه الله _.

١٧٤ _ رواه مسلم (١ / ٩) في المقدِّمة، وأحمد (٥ / ١٤) " عن سَمُرة.

١٧٥ _ التدليس: واتە ساختەکاری و شاردنەوەی عەیبێك لە (سند)ی فەرموودەداو، هەستان بەچاككردنی ڕواڵەتی (إخفاء عيب في الإسناد، وتحسين لظاهره) بڕوانە: الدكتور محمود الطحان، تيسير مصطلح الحديث، ص٧٨. وەرگێڕ.

فەرموودەی (منقطع)ی(١٧٦) لێوە گوێبیست بووە، کەچی نەشیبیستووە، ئەمەش ناشیرینە، چونکە فەرموودەی (منقطع) دەخاتە پلەی فەرموودەی (المتصل)ەوە (١٧٧).

هەشیانە فەرموودە لە کەسانی لاوازو درۆزنەوە دەگێڕێتەوە، بەڵام ناوەکەی لادەبات و نکۆڵیی لێدەکات، لەوانەشە بە ناوێکی ترەوە ناوی بەرێت، لەوانەشە نازناوێکی بۆ دانێت، لەوانەشە بێداتەپاڵ باپیرەی، بۆ ئەوەی نەناسرێت، ئەمەش دەستدرێژیکردنە بۆ سەر شەرع، چونکە حوکم بەشتێ جێگیر دەکات کە پێی جێگیر ناکرێت (١٧٨)

بەڵام ئەگەر (المرويُّ عنه) باوەڕپێکراو بوو، (الراوي)(١٧٩) هەستاو دایەپاڵ باپیرەی، یا تەنها نازناوی باس کرد، بۆ ئەوەی نەزانرێت (ریواية)تی لێوە دووبارە دەکاتەوە، یاخود (المرويُّ عنه) لە گەڵ (الراوي)دا لە یەك پلەدا بوون ، (الراوي)یش شەرمی کرد ناوی بەرێت، ئەوا (مکروه)ەو نزیکە لە دروستیەوە بە دوور بێت، بە مەرجێك (المرويُّ عنه) باوەڕپێکراو بێت.

والله الموفق.

---

١٧٦ _ مەبەست بە فەرموودەی (منقطع) ئەوەیە کە (سند)ی فەرموودەکە بەیەك گەشتن و پەیوەندی تێدا بەدینەهاتبێت، بەهەر ڕوویەك بێت ئەو بچڕانە (مالم يتصل إسناده، على أي وجه كان إنقطاعه)، بڕوانە: الدکتور محمود الطحان، تیسیر مصطلح الحدیث، ص٧٦. وەرگێڕ.

١٧٧ _ فەردوودەی (المتصل) " ئەو فەرموودەیەیە کە (سند)ەکەی بەیەك گەشتن و پەیوەندی تێدا بەدیهاتبێت بەیەکسانی ئەگەر (مرفوع) بێت یاخود (موقوف) بێت، بڕوانە: الدکتور محمود الطحان، تیسیر مصطلح الحدیث، ص١٣٥. وەرگێڕ.

١٧٨ _ تا ئەمە (تدلیس)ەو، زۆریش زەم دەکرێت، بۆیە پێشەوایان فەرموویانە: (تدلیس) برای درۆیە. فەرمووشیانە: ئەگەر پیاو زیناو داوێن پیسی بکات بەلامانەوە لە ساختەکاری باشترە.

ولنظر ((مقدمة ابن الصلاح)) (ص ٦٦)، و((الشَّذا الفَيَّاح من علوم ابن الصلاح)) (ق ٧٥) للبرهان الأبناسي _ بتحقيقي.

١٧٩ _ الراوي: ئەو کەسەیە کە فەرموودەکە دەگێڕێتەوە.

المرويُّ عنه: شێخی ئەو کەسەیە کە فەرموودەکە دەگێڕێتەوە، بۆیە (الراوي) فەرموودەکان لە شێخەکەی خۆیەوە دەگێڕێتەوەو شێخیش لە شێخەکەی خۆیەوەو بەو شێوەیە. وەرگێڕ.

# * باسی هەستانی ئیبلیس بە سەرلێشێواندنی فیقهزانان:

نووسەر دەفەرمێت:

فیقهزانان لە زەمانی دێریندا بریتی بوون لە کەسانی شوێنکەوتووی قورئان و فەرمووده، بەڵام بەردەوام ئەو خەسڵەتەیان تێدا کەم بوویەوە، تا ئەو ئاستەی پاشینەکان دەیانگوت: تەنها ئایەتەکانی (الأحكام) لە قورئاندا بزانین بەسمانە، لە گەڵ پشت بەستن بە کتێبە بەناوبانگەکانی فەرمووده، وەکو (سنن أبي داود)و هاوشێوەکانی.

پاشان ئەمەشیان بە چاوێکی نزمتر تەماشاکردو، کەسانێکیان تێدا پەیدا بوو ئایەتێکی دەکرد بە بەڵگە ماناکەی نەدەزانی، یا پشتی بە فەرموودەیەك دەبەست، نەیدەزانی (صحیح)ە یا نەء(١٨٠)؟!

لەوانەشە پشت بە (القیاس)ێك ببەستێت فەرموودەیەکی (صحیح) بەرهەڵستی بکات و پێی نەزانێت، لەبەر کەمی ئاوڕدانەوەی بۆ فێربوونی زانستی فەرمووده، لە ڕاستیدا فیقە بریتیە لە دەرهێنانێك لە قورئان و فەرمووده, ئیتر چۆن لە شتێکەوە دەریدەهێنێت کە نایزانێت ؟

زۆر ناشیرینە حوکمێکی شرعی بە فەرموودەیەکەوە ببەستێت نەزانێت ئایا (صحیح)ە یا نەء ؟

زانینی ئەوە زۆر قورس بوو، پێویستی دەکرد مرۆڤ سەفەرێکی دووردرێژو، ماندویەتیەکی زۆر بکێشێت، تا ئەوە بزانێت، ئەوەبوو کتێبەکان دانران و، سونەتەکان جێگیربوون و، (صحیح) و (ضعیف)ی فەرموودەکان ناسران، بەڵام تەمبەڵی بە یەکجار زاڵ بۆە بە سەر خەڵکانی پاشیندا و وای لێکردوون کە توانای خوێندنی زانستی فەرموودەیان نەماوە، تا ئەو ئاستەی کەسانێکی بەرزم لە فیقهزانان دیوە لە کتێبە دانراوەکانیدا سەبارەت

---

١٨٠ _ ئەمە نەخۆشی ئەم سەردەمەیە کە کەسانێکی فەتوادەرو، بانگەشەکارانی شێخێتی پێی هەڵدەستن! بۆیە سکاڵامان بۆ لای خوای پەروەردگار بەرز دەکەینەوە.

به هەندێ وشەی نێو (الصحاح) دەڵێت: شیاو نییه پێغەمبەری خوا _ صلی الله علیـه وسـلم _ ئەمەی فەرمووبێت. بینیویشمه بەڵگه بۆ مەسەلەیەك دەهێنێتـەوەو، دەڵێـت: بەڵگـەمان ئەوەیه كه هەندێ كەس دەیگێڕنەوه كه پێغەمبەری خوا _ صلی الله علیـه وسـلم_ ئاوهـای فەرمووه. سەبارەت به فەرموودەیەكی (صحیح)یش تەنها له بەر ئەوەی نەیارەكەی كردویەتی بەبەڵگه دەڵێت: ئەم فەرموودەیه ناناسرێت.

هەموو ئەمانەش دەست درێژیه بۆ سەر ئیسلام (١٨١)!

هەروەها ئیبلیس هەستاوه به سەرلێشێواندنی فیقهزانان بەوەی بەشێكی زۆری بیروهۆشـی خۆیان ئاڕاستەی بەدەستهێنانی مـشتومڕزانی (علـمِ الجـدَل) كـردووه، بەبانگەشـەی خۆیـان دەیانەوێت هەستن به ڕاستكردنەوەو پیاچوونەوەی بەڵگەكانی سەر حوكمـەكان و، هـەڵهێنجان بۆ وردەكاریەكانی شەرع و زەدەی (عِلل) ڕێباوەڕەكـان، بـەڵام ئەگـەر بانگەشـەكەیان ڕاسـت بووایه، به تێكڕای مەسەلەكانەوه خۆیان خەریك دەكرد، كەچـی خۆیـان تـەنها بـه مەسـەله گەورەكانەوه خەریك دەكەن، بۆ ئەوەی بواری گفتوگۆی تێدا فراوان بێـت و، لـه پـێش چـاوی خەڵكیدا كەسی مشتومڕكار له مشـــتومڕی ڕاوبۆچوندا پێشكەوێت، بۆیه تەنها پەژارەیـەكی ئەمانه بریتیه له ڕێكخستنی مشتومڕو گەڕان بەدوای مەسەله جیاوازو دژبەیەكەكانـدا، بـۆ خۆهەڵكێشان و شانازیكردن، كەچی لەوانەیه حوكمی بـچوكترین مەسـەله نـەزانێت كـه بـه نەزانینی بەڵایەك گشتاندن دەكات !

---

١٨١ _ وەكو ئەوەی دانەر _ بەڕەحمەتی خوا بێت _ دەنوسێت و ڕۆڵەكانی ئەم سەردەمەی له پێشدایه له كەسانی حەزلێكاری كتێب دانان، كه بـەبێ زانـست دەنوسـن و، بـەبێ مـەنهج كتێـب دادەنـێن، ئەگـەر پێشمویستایه نموونه بۆ ئەمه باس بكەم، بەدڵنیاییی حبری قەڵەم تەواو دەبوو پێش ئەوەی شتێكی كەم تەواو بكەم لەوەی كه دەیزانم، فلا حول ولا قوة إلا بالله.

## ✸ ئیبلیس سەریان لێدەشێوێنێت و گوتەی فەیلەسوفان تێکەڵ بە مشتومڕەکانیان دەکەن و، پشت بەو حاڵ و بارانە دەبەستن:

لەم بارەوە (القیاس)یان زۆر بەلاوە پەسەندترە لە فەرموودەیەك کرابێت بە بەڵگە لە مەسەلەیەکدا، بۆ ئەوەی بواری تێڕوانین و مشتومڕیان فراوانتر بێت، ئەگەر کەسێکیان فەرموودەیەك بکات بە بەڵگە، عەیبدار دەکرێت، کەچی ڕەوشت وایە بۆ بەڵگە هێنانەوە فەرموودە پێش بخرێت (١٨٢).

لەو بوارەدا تێڕوانین و مشتومڕیان کردووە بە بەشی زۆری کارەکانیان و، هەڵنەستاون بەتێکەڵ کردنی لەگەڵ ئەوانەدا کە دڵ نەرم دەکاتەوە، وەکو خوێندنی قورئان و، بیستنی فەرموودەو، ژیانەمەی پێغەمبەر _ صلی الله علیه وسلم _ و هاوەڵانی.

زانراوە کە دڵکزی (خشوع) بە زۆر دووبارەکردنەوەی لابردنی پێسی و، ئاوی گۆڕاو بەدینایەت، بەڵکو ئەو دڵە پێویستی بە یادکردنەوەو مۆچیاری دەبێت، بۆ ئەوەی هەستێت بە داواکردن و خۆئامادەکردن بۆ ڕۆژی دوایی.

مەسەڵەکانی جێی جیاوازیش ئەگەچی لە زانستی شەرعن، بەڵام هەموو داواکاریەکان جێبەجێ ناکەن، بۆیە هەرکەس ئاگاداری نهێنیەکانی ڕێبازی پێشین و، باری ئەو کەسەش نەبێت کە کردویەتی بە ڕێباوەڕی خۆی، هەرگیز توانای گرتنەبەری ڕێگەکەیانی نابێت.

پێویستە بزانرێت کە خوو دزە، ئەگەر لە گەڵ خەڵکی ئەم زەمەنەدا بەجێهێڵرا خووەکانیان دەدزێت و، وەکو ئەوانی لێدێت، وە ئەگەر تەماشای ڕێبازو ژیانامەی پێشین بکات، پێشبڕکێیان دەکات و، پەیڕەوی خوو و ڕەوشتی ئەوان دەکات.

---

١٨٢ _ بەڵکو بەدڵنیای (واجب)یشە، چەند جوانە گوفتاری ئەو شاعیرەی فەرموویەتی:

العِلْمُ قال اللهُ قالَ رَسولُهُ قالَ الصَّحابةُ لَيسَ بالتَّمْويهِ

ما العِلْمُ نَصْبَكَ للخِلافِ سَفاهَةً بينَ الرَّسولِ وبينَ رأيِ فَقِيهِ

واتە: زانستی ڕاست خوا فەرمووی پێغەمبەر فەرمووی، هاوەڵان فەرموویان نەك ڕاستی نەڵێیت

زانست ئەوە نی یە بەبێ هۆش جیاوازی دامەزرێنیت، لە نێوان پێغەمبەرو ڕای فەقیهێکدا

ئەوەبوو کەسانێکی پێشین دەیانفەرموو: فەرموودەیەك کە دڵمی پێ نەرم بێت لـە صـەد کێشە لە کێشەکانی (شُرَیح)(١٨٣) بەلامەوە خۆشەویسترە.

لەم بارەوە ئەمانە تەنها مشتومڕیان دەکـردو، پـشتیان لـە پاراسـتنی ڕێبـاوەڕو زانـستە شەرعیەکانی دیکە هەڵکردبو، بۆیە کەسی فـەقیهت دەبینـی سـەبارەت بـە ئایـەتێك لێیـان دەپرسی، نەیدەزانی.

ئەمە سستییە، ئەی باشە شکۆمەندی و خۆبەدورگرتن لە کەمتەرخەمی لە کوێیە؟!

لـەم بـارەوە مـشتومڕ دانـراوە بـۆ ئـەوەی ڕاسـتیەکان دەربکـەوێت، مەبەسـتی پێـشین ئامۆژگاریکردنی یەکتر بوو بۆ بەدەرخستنی هەق، ئەوەبوو لـە بەڵگەیەکـەوە دەچـوونە سـەر بەڵگەیەکی تر، ئەگەر شتێکیش لە کەسێکیان پەنهان و نادیار بووایـە، ئـەوی تـر ئاگـاداری دەکردەوە، چونکە مەبەست دەرخستنی هەق بوو، بەڵام پاشان گەشتنە ئـەو ئاسـتەی ئەگـەر کەسێکی فیقهزانیان بە پێی بۆچونی خۆی (القیاس)ی(١٨٤) لـە سـەر (أصـل)ێـك بکردایـە، کەسێکی دیکەش پێی بگوتبا: بەڵگەت چی یە کە حوکم لە (أصل)ەکەدا لەبەر ئـەم هۆکـارە دیاریکراوە ؟ دەیگوت: وام بۆ دەرکەوتووە، ئەگەر شتێکی دیکەتان بۆ دەرکەوت لەوە شیاوتر بوو، باسی بکەن، چونکە بەرهەڵستکار ناچاری باسکردنی ئەوەم ناکات.

ڕاستیش دەڵێت کە گوایە ناچاری ناکات، بەڵام لەبەر ئەوەی مـشتومڕی داهێنـاوە ناچـار دەبێ، هەروەها لە دەروازەی ئامۆژگاری و، ئاشکراکردنی هەقیشەوە ناچار دەبێت.

---

١٨٣ _ (شُرَیح): پیاوێکە لە گەورە بەناوبانگەکانی دادوەران، سـاڵی (٧٨)ی کۆچـی مـردووە، بـۆ زیـاتر شارەزابوون بڕوانە ((أخبار القضاة)) (٢ / ١٨٩ _ ٤٠٢).

١٨٤ _ القیاس: واتە پێوەندکردنی لقێك بە بنەڕەتەوە لەبەر هۆکارێکی هاوبەشی نێوانی هـەردوکیان بـۆ نمونە فەرماندان لە سەر حەرامکردنی خواردنەوەیەکی مەستکەر ئەمەش لە سەر مەی و بـادە دەپێوڕێـت بەهۆی هاوبەشی بوونیانەوە لە مەست و سەرخۆشکردندا، بۆ زیـاتر شـارەزابوون بگـەڕێرەوە بـۆ الـدکتور عبدالکریم زیدان، ((الوجیز في أصول الفقه))، وەرگێڕ.

لەم بارەوە کەسێکیان بۆی دەردەکەوێت کە ڕاستی لە گەڵ نەیارەکەیدایە، بەڵام ناگەڕێتەوەو پەشیمان نابێتەوەو، زۆر نارەحەت دەبێ کە چۆن ئەو هەقە لەلایەن نەیارەکەیەوە ئاشکرا بوو، لەوانەشە تێکۆشێت بۆ پەرپەرچدانەوەی، هەرچەند دەزانێت هەق بەوە، ئەمەش زۆر ناشیرینە، چونکە مشتومڕو گفتوگۆ بۆ ڕوونکردنەوەی هەق دانراوە.

پێشەوا (الشافعي) _ بەرەحمەتی خوا بێت _ فەرموویەتی: ئەگەر مشتومڕو گفتوگۆم لە گەڵ کەسێکدا بکردایەو، نکۆڵیی لە بەڵگەکان بکردایە، لە بەرچاوم دەکەوت و، ئەگەر قبوڵیشی بکردایە، ڕێزم لێدەگرت، ئەگەر مشتومڕو گفتوگۆم لە گەڵ کەسێکدا بکردایە، گوێم بەوە نەدەدا بەڵگە بەکێیە، ئەگەر بەڵگەی ڕاست بەو بوایە، وەرم دەگرت.

وە لەبەر ئەوەی مەبەستیان بە مشتومڕ بەدەستهێنانی سەرگەوریە بۆیە ئەو مشتومڕە زیاتر سەرگەورەی شاراوەی نێو دڵیان دەوروژێنێت و، ئەگەر کەسێکیان لاوازیەك لە قسەکانی خۆیدا بەدیبکات کە ببێ بە هۆکاری بەزاندنی لەلایەن نەیارەکەیەوە، خۆگەورەی دەنوێنێت و، ئەگەر نەیارەکەشی بەدیکرد بە وشەیەك دەستدرێژی دەکاتە سەر، هەڵەشەیی خۆیەزلزانین دەیگرێت و، بە جوێندان وەڵامی دەداتەوەو، مشتومڕەکەش دەبێ بە ڕیسواکردن.

هەروەها مۆڵەتیان بە درۆکردن دادا بەو بەهانەیەوە کە گوایە باس و خواسی مشتومڕەکان دەگێڕنەوە، بۆیە کەسیان هەبوو دەیگوت: لە گەڵ فڵان کەسدا دووام، نەیتوانی هیچ شتێك بڵێت، بە شێوەیەکیش دەدوا کە ببێ بە هۆکاری سارێژبوونی دڵی بەرامبەر بە مەبەستی نەیارەکەی بەو بەهانەیە.

لەم بارەشەوە ئیبلیس سەری لێشێواندوون و وای تێگەیاندوون کە (فقە) بەتەنیا زانستی شەرعەو، هیچیتر، ئەگەر باسی فەرموودەناسێکیان بۆ بکرێ دەڵێن: ئەوە هیچ تێناگات، بیریان دەچوو کە فەرموودە بنەڕەتە.

ئەگەر قەسەیەکیان بۆ بکرێت دڵی پێ نەرم بێت، دەڵێن ئەمە گوفتاری پیاوانی واعیزو ئامۆژگاریکارە.

هەروەها دەچنە پێشەوە بۆ فەتوادان، کەچی هێشتا نەگەشتونەتە ئەو پلەیە، پێدەچیّ لە روانگەی بارو رووداوەکانی خۆیانەوە کە پێچەوانەی دەقەکانە فەتواش بدەن، ئەگەر لەسەر کێشەکان بووەستنایە، شیاوتر دەبوو:

(عبدالرحمن)ی کوڕی (أبي ليلى) فەرموویەتی: بە سەدوبیست کەس لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ گەشتم، سەبارەت بە مەسەلەیەك لە کەسێکیان پرسیار دەکرا، ئەو پرسیارەکەی وەڵام نەدەدایەوەو بۆ ئەوی دەیگەڕاندەوەو، ئەو بۆ ئەو، تا بۆ یەکەم دەگەڕایەوە.

بە بێژەیەکی تریش هاتووە دەفەرمێت: لەم مزگەوتەدا سەدوبیست پیاوم لە پشتیوانان چاوپێکەوت، لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ هەر کەسێکیان فەرموودەیەکی باس بکردایە، حەزی دەکرد براکەی لە جیاتی خۆی باسی بکردایەو، ئەگەر سەبارەت بە فەتوایەکیش لێیان بپرسیایە، حەزی دەکرد براکەی لە جیاتی خۆی وەڵامی بداتەوە.

لە (إبراهيم النَّخَعِيّ)وە بۆمان باسکراوە کەوا پیاوێك سەبارەت بە مەسەلەیەك لێی پرسی؟ ئەویش فەرمووی: هیچ کەسێکت نەدۆزیەوە لێی بپرسی جگە لە من ؟

(مالك)ی کوڕی (أنس) _ خوای لیّ ڕازی بێت _ فەرموویەتی: فەتوام نەدا تا لە بیست شێخم پرسی: ئایا پێتان باشە فەتوا بدەم ؟ فەرموویان: بەڵیّ.

بە (مالك) گوترا: ئەگەر قەدەغەیان بکردیتایە ؟

فەرمووی: ئەگەر قەدەغەیان بکردمایە، توخنی نەدەبوومەوە.

نووسەر دەفەرمێت:

لە ڕاستیدا ئەمە خوو و ڕوشتی پێشینی چاك بوو، چونکە لە خوای _ عزَّوجلَّ _ دەترسان، بۆیە هەرکەس تەماشای ژیانامەو ڕێبازیان بکات، چاویان لێدەکات و پەروەردە دەبێت.

## * خۆ نزيك كردنەوە لە ئەميرو سوڵتانەكان:

لە سەرلێشێواندنەكانی ئیبلیس بەرامبەر بەفیقهزانان: تێكەڵ بە ئەميرو سوڵتانەكان دەبن، مەراییان بۆ دەكەن و، واز لە نكۆڵیی و قەدەغەكردنیان دێنن هەرچەند توانای ئەوەشیان تێدایە، لەوانەشە ڕێدانی شیاوێتی بە ئەنجام گەیاندنی هەندێ كاریان بۆ بكەن كە لە بنچینەدا ڕێیان پێنەدرابێت بیكەن، بۆ ئەوەی لە دونیادا شتێكیان دەستكەوێت، بەوەش لە سێ ڕۆوە خراپە دروست دەبێت:

**یەكەم: ئەمیرەكە**، دەڵێت: ئەگەر من ڕاست نەبوومایە، فیقهزانەكە نكۆڵیی لێدەكردم، ئەی چۆن نەم پێكابێت لە كاتێكدا ئەو لە ماڵی من دەخوات ؟!

**دووەم: كەسی ئاسایی**، دەڵێت: ئەم ئەمیرەو، ماڵەكەی و، كردەوەكانی چاكن و هیچیان تێدا نییە، چونكە فڵانی فیقهزان بە جێی ناهێڵێت و بەردەوام لە گەڵیدایە.

**سێ یەم: فیقهزان**، بەوە ئاینەكەی خۆی تێك دەدەات !

ئیبلیس سەری لێشێواندون و هانی چوونیان دەدات بۆ دیدەنی سوڵتان، بۆیە دەڵێن: لە ڕاستیدا دەچینە دیدەنی سوڵتان بۆ ئەوەی تكاكاری بۆ موسڵمانێك بكەین (١٨٥).

ئەم سەرلێشێواندنەی ئیبلیس بەوە ڕوون دەبێتەوە كە ئەگەر كەسێكی تر بچێتە دیدەنی سوڵتان بۆ تكاكاری، فیقهزانەكە ئەوەی پێ باش نابێت و، پێدەچێ زەمی ئەو كەسە بكات، چونكە تاك بۆتەوە بە سوڵتان وتەنها خۆی دیدەنی دەكات.

---

١٨٥ _ لەبەر ئەوە لە ڕێبازو ژیانامەی پێشیندا نەهاتووە خۆیان لە دەرگای سوڵتان نزیك بكەنەوە، ئەوەبوو كەسانێكیان دەیفەرموو: ئەگەر زانات بینی خۆی لە دەرگای سوڵتان نزیك دەكاتەوە، بزانە دزە. پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ فەرموویەتی: ((إياكم وأبواب السلطان، فإنه قد أصبح صعباً هَبوطاً)). واتە: ((هەرگیز نزیكی دەرگای سوڵتان مەبنەوە، چونكە نزیكبوونەوەی قورس بووەو كردەوەش پووچ دەكاتەوەو پلەو پایەش دادەبەزینێ لای خوای پەروەردگار)).
وهو حديث حسن، انظر تخريجه في ((أربعين في الدعوة والدعاة)) (رقم ٣١) بقلمي. وانظر ((نصيحة الملك الأشرف)) للضياء المَقْدِسي _ بتحقيقي، ففيها تفصيل آخر.

ئیبلیس هەستاوە بەسەرلێشێواندنی فیقهزانەکە بە ئاستێك ئەمیرەکە ماڵ و سامانەکەیان دەبات و، ئەو دەڵێت: مافی خۆتی تێدایە.

وە زانراوە کە ئەگەر ئەو ماڵ و سامانە لە حەرامەوە بێت، هیچ شتێکی حەڵاڵ نابێت و، ئەگەر لە گومانیشەوە بێت، وازلێهێنانی شیاوترەو، ئەگەر لە (مُباح)یشەوە بێت، شیاوە لێی بەرێت بەو ئەندازەی کە شەرع دیاری کردووە، نەك زۆری لێ بەرێت و هەستێت بە خەرج کردنی بۆ جێگیرکردنی هەڵەشەیی و ناژیری.

پێدەچی دواتر خەڵکی ڕەمەکیش شوێنی کرداری ئەمیرەکە بکەون و، ئەوەی حەڵاڵ نییە بە حەڵاڵی دانێن.

ئیبلیس سەری لە کۆمەڵێکی تری زانایانیش شێواندووە، دیدەنی سوڵتان ناکەن، بە پەرۆشەوە ڕوویان لە پەرستنی خوای تعالى و ئاین کردووە، بۆیە لێرەدا ئیبلیس غەیبەتکردنی ئەو زانایانەی بۆ ڕازاندونەتەوە کە دیدەنی سوڵتان دەکەن، لە ئەنجامیشدا دوو بەڵایان بۆ کۆدەکاتەوە: غەیبەتکردنی خەڵك و، ستایشکردنی نەفسی خۆی.

بەگشتی، دیدەنی سوڵتان و کاربەدەستان مەترسیەکی گەورەیە، چونکە پێدەچی سەرتا نیەت چاك بێت، بەڵام پاشان دەگۆڕێت بەهۆی ئەو ڕێزگرتن و خەڵاتانەی پێی دەبەخشن، یاخود تەماع بەو کاربەدەستانە دەکات و، خۆی پێ ناگیرێت و مەراییان بۆ دەکات و، واز لە نکۆڵیکردن و قەدەغەکردنیان دەهێنێت.

(سفيانُ الثوريُّ) _ خوای لێ ڕازی بێت _ دەیفەرموو: ترسم نییە سوکایەتیم پێبکەن، لە ڕاستیدا ترسم لە ڕێزگرتنیان هەیەو، دڵم نەرمونیان بۆ بنوێنێت.

زانایانی پێشین خۆیان بەدوور دەگرت لە ئەمیرەکان، لەبەر ئەو ستەم و بێ دادیەی لێیانەوە بە دەردەکەوت، بەڵام ئەمیرکان بانگیان دەکردن چونکە بۆ کاروباری وەرگرتنی فەتواو هەروەها بۆ ئەوەی بەرپرسیارێتیەکیان پێ بسپێرن پیویستیان پێیان بوو، لێرەدا کۆمەڵانێك پەیدابوون ویست و داخوازی دونیانیان تێدا بەهێز بوو، بۆیە ئەو زانستانە فێربوون

کە بۆ ئەمیرەکان دەشیاو چاك بوو، پاشان ئەو زانستەیان بۆ بردن بۆ ئەوەی بەشی خۆیـان لـە دونیادا دەست بکەوێت.

ئەوەش کە دەبێ بە ڕێنیشاندەرت بۆ ئەوەی بزانیت مەبەستیان بەو زانستانە ڕایی کردنـی کاروباری ئەمیرەکان بوو ئەوەیە کە ئەمیرەکانی پێش هەواداری مشتومڕ بوون لـە ئوصـول و بیروباوەڕدا، ئەوەبوو خەڵك قسەناسیان (علم الكلام) داهێنـا، پاشـان هەنـدێ لـە ئـەمیرکان هەواداری مشتومڕو گفتوگۆبوون لە فیقهدا، ئەوەبوو خـەڵکیش هـەواداری مـشتومڕ بـوون، پاشـان هەنـدێ لـە ئـەمیرەکان هـــەواداری مۆچـیاری و ئامۆژگـاری ئـاینی بـوون، ئـەوبوو خەڵکێکی زۆر لە خوێندەواران هـەواداری بـوون، وە لەبـەر ئـەوەی کـە جـەماوەری خـەڵکی ئاسایی هەواداری چیرۆکن، بۆیە چیرۆك خوانان زۆربوون و، فیقهزانان کەم بوونەوە.

لە سەرلێشێواندنەکانی ئیبلیس بەرامبەر بە فیقهزانان ئەوەیە کە کەسی وایان تێدایە لـەو ماڵ وداراییە دەخوات، کە کراوە بە (وقف) بۆ ئـەو قوتابخانەیـەی کـە بـۆ فێربـوونی زانـستی شەرعی دروستکراوە، بەڵام ساڵانێك دەمێنێتەوەو خۆی بە زانستەوە خەریك ناکـات و، ڕازی دەبێت بەوەی کە فێری بووە، یا بەیەکجاری واز لە فێربوونی زانـست دەهێنێـت، بۆیـە هـیچ بەشێکی لەو ماڵ وداراییە تەرخانکراوە (وقف) نامێنێت ، چونکە ئەو ماڵ وداراییەی کە کراوە بە (وقف) بۆ ئەو کەسانەیە کە خواستی فێربوونیان هەیە، مەگەر ئەو کەسە مامۆسـتا بێـت یا یارمەتیدەری مامۆستا بێت، ئەو کاتە کارەکەی بەردەوامەو دەتوانێت لـەو مـاڵ و داراییـە تەرخانکراوە بخوات.

لەم بارەشەوە لە هەندێ کەسانی تازە شارەزابووی بنەماو ڕێساکانی شەرع دەگێڕنـەوە کـە دڵخۆشن بە هەندێ لە قەدەغەکراوەکان، وەکو پۆشینی ئاورێشم و، خۆ ڕازاندنەوە بـە زێـڕ و، چەندین سەرپێچی تریش.

هۆکاری دڵخۆشبونی ئەمانەش جیاوازە:

لەوانە کەسانێکیان تێدایە بیروباوەڕیان بۆطقنة بە ئەصلی دین، خواستی فێربـوونی شـەرع دەکەن بۆ ئەوەی خۆیان بشارنەوە، یا لە ماڵ و داراییە (وقـف)ەکان ببەن، یا بۆ سـەرگەورەیی، یا بۆ مشتومڕکردن.

کەسانێکیشیان تێدایە بیروباوەڕێکی ڕاستی هەیە، بەڵام خۆشیی هەواو ئارەزوو بە سەریدا زاڵ دەبێت و، هیچ شتێکیش نییە لەوانـە دوریخاتـەوە، چـونکە خـودی مـشتومڕو گفتوگـۆ پاڵنەری مرۆڤـە بـۆ خۆبەگـەورەدانان و لـە خۆبـایبوون، لـە ڕاسـتیدا مرۆڤــ بـە مەشـق و ڕاهێنانو، خوێندنەوەی ژیانامەی پێشین چاك دەبێت، بەڵام زۆرینەی خەڵك لەمەوە بەدورن و، ئەو شتانەش کە هەیە یارمەتیان دەدات بۆ لووتبەرزی، بۆیە ئـەو کاتـە هـەواوئارەزوو بـەبێ هیچ توێشوویەکی چاك بەرەڵایەوە دێت و دەچێت.

کەسانێکیان تێدایە ئیبلیس سەری لێشێواندووەو وای تێگەیاندووە کە زاناو موفتیەو، وای بەخەیاڵدا دێنێت کە زانست بەرگریی لە خاوەنەکەی دەکات.

بەڵام هەیهو زۆر دوورە، چونکە بەوە شایستەیە کە زانست بەرهەڵـستی بکـات و، سـزای دوو ئەوەندە بکات.

(الحسن البصري) دەفەرمێت: لە ڕاستیدا فیقهزان ئەو کەسەیە کە لە خوا بترسێت.

(ابن عقیل) دەڵێـت: فیقهزانێکـی (خراسـان)یـم بینـی ئاورێـشم و ئەمووسـتیلەی زێـڕی پۆشیبوو، پێم گوت: ئەمە چی یە ؟ گوتی: بخشـشی سـوڵتان و، خـەفتباری دوژمنانـە. پـێم گوت: بەڵکو ئەوە شادبوونی دوژمنانە بە بەدی و نائومێدی تۆ ئەگەر موسـڵمانیت، چـونکە ئیبلیس دوژمنتە، ئەگەر دەسـتی لێگیرکـردی، ئـەوەت لەبـەر دەکـات کـە دەبێـت بـەهۆی تووڕەبوونی شەرع، بە خوودی خۆت هەستایت و بە بەدی و نائومێدی خۆت دڵخۆشـت کـرد، ئینجا ئایا بەخششەکانی سوڵتان ڕەوایەتی بە قەدەغەکراوەکانی خوای پەروەردگار دەدەن ؟!

ئەی بەدەبەخت ! سوڵتان جلوبەرگی پێ بەخشیت، بەڵام بوو بـەهۆی لـەقبوونی ئیمانـت، دەبوایە سوڵتان بەرگی لە ڕێی ڕاست لادانت (فسق) لەبەر داکەنێت و، بەرگی لەخوا ترسـانت لەبەرکات.

خوای تعالی سووك و ڕیسواتان بکات، وەکـو چـۆن کاروباریتـان ئـــــابەم جـۆرە سـووك کردووە، خۆزگە بتگوتبا: ئەمە هەڵەشەیەکانی خووە. ئیستا مەینەتیەکەت بە تەواوی جێگیر بوو، چونکە لە سنوور دەرچونت بەڵگەی بۆگەنی ناختە.

له سه‌رلێشێواندنه‌كانی دیكه‌ی شه‌یتان بۆ سه‌ر خه‌ڵكی: به‌سووك ته‌ماشاكردنی واعیزانیان بـۆ ده‌ڕازێنێتـه‌وه، بـه جۆرێـك قه‌ده‌غـه‌یان ده‌كـات لایـان ئامـاده بـن و گوێبیـستی ئامۆژگاریه‌كانیان بن، ئیتر خه‌ڵكه‌كه‌ش به چاوێكی سـووكه‌وه ته‌ماشـای واعیـزان ده‌كـه‌ن و ده‌ڵێن: ئه‌مانه كێن ؟ ئه‌مانه چیرۆك خوانن !

مه‌به‌ستی شه‌یتان ئه‌وه‌یه خه‌ڵكه‌كه دورخاته‌وه له‌و شـوێنانه‌ی كـه دڵنـه‌رمی و دڵكزیـان (الخشوع) بۆ به‌دی بێنێ.

چیرۆك خوانان له باره‌ی ناوه‌كه‌یانه‌وه زه‌م ناكرێن، چونكه خوای تعالی ده‌فه‌رمێت: ﴿ نَحْنُ نَقُصُ عليكَ أحْسَنَ القَصَصِ﴾ ﴿ یوسـف: ٣ ﴾. واتـه ﴿ نَحْـنُ نَقُـصُ علیـكَ ﴾ ئێمه ده‌گێڕینه‌وه بۆ تۆ ﴿ أحْسَنَ القَصَصِ ﴾ جوانترین چیرۆك و به‌سه‌رهات (١٨٦).

هه‌روه‌ها خوای تعالی ده‌فه‌رمێت: ﴿ فاقْصُصِ القَصَصَ ﴾﴿ الأعـراف: ١٧٦ ﴾ واته: ده‌ی ئه‌و داستان و چیرۆكانه باس بكه (١٨٧).

به‌ڵكو چیرۆك خوانان زه‌م كراون، چونكه به‌زۆری فراوانی ده‌ده‌ن به باسكردنی چیرۆك بـه‌بێ باسكردنی زانستی به سوود، پاشانیش زۆربه‌یان هه‌ڵده‌ستن به تێكه‌ڵ و پێكه‌ڵ كردنـی ئـه‌وه‌ی كه ده‌یگێڕنه‌وه، پێده‌چی پشت به شتانێكیش ببه‌ستێت كه زۆربه‌یان مه‌حاڵن.

به‌ڵام ئه‌گه‌ر چیرۆكه‌كان ڕاست بوون و، بوون به هۆی مۆچـیاری و ئامۆژگـاری پێـشكه‌ش كردنێك، ئه‌وه هیچی تێدا نییه‌و ستایشكراوه.

پێشه‌وا (أحمد)ی كوڕی (حنبل) ده‌یفه‌رموو: خه‌ڵكی چه‌ند پێویستیان به چیرۆك خـوانێكی ڕاستگۆیه.

---

١٨٦ _ مه‌لا محمد مه‌لا صالح، پوخته‌ی ته‌فسیری قورئان.

١٨٧ _ مه‌لا محمد مه‌لا صالح، پوخته‌ی ته‌فسیری قورئان.

## ✱ باسى سەرلێشێواندنەكانى بەرامبەر بە واعیزان و چیرۆك خوانان:

نووسەر دەفەرمێت:

واعیزان لە زەمەنی دێریندا زاناو فیقهزان بوون، بۆیە (عبـدُالله)ی كوڕی (عُمـر) _ خـوای لیّ ڕازی بێت _ ئامادەی كۆڕی (عُبیدِ)ی كوڕی (عُمیر) دەبوو.

هەروەها (عُمَر)ی كوڕی (عبدالعزیز) ئامادەی كۆڕی چیرۆك خوان دەبوو.

پاشان ئەم پیشەیە بیّ بایەخ بوو، چونكە نەفامانی خەڵك دەستیان تێخست، بۆیە ژیران و وشیاران لێیان دووركەوتنەوەو، تەنها ڕەمەكی خەڵك و ژنان دڵبەندی بـوون، چـیرۆك خوانـان خۆیان بەكارپێكردنی زانستەوە خەریك نەدەكردو، بەپەرۆشەوە ڕوویان كردە چـیرۆك و ئـەوەی دەبووە هۆی سەرسامبوونی خەڵك، وە بیدعەكان لەم بوارەدا جۆربەجۆر بوون.

بەڵای چیرۆك خوانانم لە كتێبی (القُصاصِ والمُذكِّرين)دا(١٨٨) باس كردووە، بەڵام لێرەشدا كۆمەڵێكی باس دەكەین:

لەم بارەوە كۆمەڵێك لە چیرۆك خوانان و واعیزان هەستاون بە دانانی فەرموودە لـە بـواری (الترغیب والترهیـب)دا واتە هاندان و ترساندندا، ئیبلیس سەری لێـشێواندون و دەڵـێن ئێمـە مەبەستمان هاندانی خەڵكە بۆ خەیرو، دوورخستنەوەیانە لە شەڕ.

بەڵام ئەمە دەستدرێژییەكەو دەیكەنە سەر شەرع، چونكە بەم كارەیان ئەوە دەسـەلمێنن كـە شەرع كەموكورتی تێدایەو، پێویستی بە تەواوكردن هەیە، فەرموودەكەی پێغەمبەری خوایان _ صلى الله علیه وسلم _ بیرچۆتەوە:

((مَـن كَذَبَ عليَّ مُتَعَمِّـداً " فليتبـوَّأ مقعَـدَه مِـن النـارِ))(١٨٩) واتـە: ((هەركـەس بـە ئەنقەست درۆیەك بەدەم منەوە هەڵبەستێت، با جێگەیەك لە ئاگردا بۆ خۆی دیاری بكات)).

---

١٨٨ _ وهو مطبوع بتحقيق صديقنا الفاضل الدكتور محمد لطفي الصباغ _ حفظه الله _.

١٨٩ _ وهو حديث متواتر. وللإمام الطبراني _ رحمه الله _ ((جُزْءٌ)) في جَمْعِ طرُقِه، فرغـتُ مِـن تحقيقـه وتخريجه قريباً، وهو تحت الطبع.

لەم بارەوە سەرنجیاندا چ شتێك نەفس بێزار دەكات و، چ شتێكیش شادومانی دەكات، هەستان قسەیان تێدا هەمەجۆر كرد، بۆیە تەماشا دەكەیت بە دەنگەوە شیعری خۆشەویستی (غَـزَل) سازگار دەخوێننەوە! ئیبلیس سەری لێشێواندوون و دەڵێن ئێمە مەبەستمان ئاماژەدانە بە خۆشەویستی خوای _ عزَّوجلَّ _.

زانراویشە تێكڕای ئەوانەی ئامادەی كۆڕەكانیان دەبن ڕەمەكی خەڵكن لەو كەسانەی ناخیان لە خۆشەویستی هەواو ئارەزوو پڕە، بۆیە چیرۆك خوان گومڕا دەبێ و گومڕاش دەكات.

لەم بارەوە كەسانێك لە چیرۆك خوانان و واعیزان خۆشەویستی و دڵكزیەكی (الخشوع) ئەوتۆ بەدەردەخەن زیاد لەوەی كە لە دڵدایە، زۆر كۆكردنەوەش پێویستی بە زیادەیەكی كاروكردەوەیە كاری پێبكرێت، ئەوجا ئەگەر گریان و دڵكزیشی خرایە سەر دڵ فراوان و بەخشندە دەبێت.

گومانی تێدا نییە ئەگەر كەسێكیان بە درۆوە ئەوانەی ئەنجامدابێت، ئەوە بەدڵنیای خەسارۆمەندی ڕۆژی دوایە، ئەگەر كەسێكیشیان ڕاستگۆ بوو، ڕزگاری نابێت و ڕاستگۆیەكەی تێكەڵ بە ڕووپامایی (ریاء) دەبێت.

كەسانێك لە چیرۆك خوانان لە گەڵ خوێندنی بە ئاوازەوە چەند جوڵانەوەیەك بە لەشیشی دەكات، بەڵام ئەو ئاوازانەی كە ئەمڕۆ دایانهێناوە لە گۆرانی دەچێت، بۆیە لە حەرامێتیەوە نزیكترە بە بەراوردی (كراهە)ت ، خوێنەر بە ئاوازەوە دەخوێنێت، چیرۆك خوانیش شیعری خۆشەویستی دەخوێنێتەوە لە گەڵ چەپڵەلێدان و، هاوكات بە جوڵانەوەی پێیەكانی، ئەمە لە سەرخۆشبوون دەچێت، دەرەنجامیش دەبێ بە هۆی وورووژاندنی خووەكان و، هەژاندنی نەفسەكان و، هاواركردنی پیاوان و ژنان و، دڕاندنی پۆشاك، بەهۆی ئەو هەواوئارەزووە شاراوەی لە نەفسەكاندا كۆبۆتەوە، كۆتاش دەچنە دەرەوەو، دەڵێن: مەجلیسەكە خۆش بوو، ئاماژە بە خۆشی شتانێك دەكەن كە شیاو نییە.

کەسانێکیشیان هەمان شتی باسکراومان ئەنجام دەدەن، بەڵام شـیعری شـیوەن و زاری بـۆ مردوان دەخوێننەوەو، وەسفی ئەو کارەساتانە دەکەن کـە بەسـەریاندا دێـن، غـەریبی بـەیاد دەهێننەوەو, ئەو کەسانەش کە بە غەریبی مردوون، بۆیە ژنان دەگرین و، شوێنەکە دەبێ بـە پرسە.

لە ڕاستیدا پێویستە ئارامگرتن بەیاد بهێنرێتەوە بۆ لـە دەسـتدانی خۆشەویـستان، نـەك ئەوەی دەبێتە هۆی ئارام نەگرتن.

کەسانێك لە چیرۆك خوانان و واعیزان باس لە وردەکاریەکانی زوهدو، خۆشەویستی خـوای تعالی دەکات، بەڵام ئیبلیس سەری لێدەشێوێنێت و دەڵێت: تۆش لە کۆی وەسـفکراوانی بـەو سیفەتانە، چونکە توانای وەسفکردنت نەبوو، تا زهدت کردو، ڕێگە ڕاستەکەت گرتەبەر.

ئاشکراکردنی ئەو سەرلێشێواندەنەش بەوەیە کە وەسفکردنی زوهد و خۆشەویـستی خـوای تعالی زانین و زانستە، بەڵام گرتنەبەری ڕێگاکە شتێکی ترەو ئایـا لـە ئەنجامدانیـدا ڕێگـای پێشینی چاکی ئەم ئومەتە دەگرێتەبەر یا ڕێگای تر.

کەسانێك لە چیرۆك خوانان و واعیزان سەبارەت بە بەڵاو نەهامەتیەکان دەدوێن، لە بـواری شەرعیشدا قسەکانیان لە مەبەستی ڕاست دووردەکەوێتەوە، لە میانەیاندا دەقەکانی شـیعری خۆشەویستی وەکو بەڵگە دەهێننـەوە، چـونکە مەبەسـتیان تـەنها هـاوارکردن و زۆرکردنـی ژمارەی خەڵکە لە کۆڕەکانیاندا، ئەگەر بە هۆی قسەگەلێکی بۆگەنیشەوە بێت.

چەندەهاشیان دەستەواژەگەلێك دەڕازێننەوە کە هیچ مانایەکی نییە، وە ئـەمڕۆ زۆرتـرین گوفتارەکانیان سەبارەت بە موساو کێوەکەو، زولەیخاو یوسفە، زۆر بەکەمی باسـی فـەرزەکان دەکەن و، قەدەغە لە تاوانێك ناکەن.

باشە کەی کەسی زیناکارو، سوو خـۆر دەسـتهەڵگرن و پەشـیمان بنـەوە، کـەی ژن مـافی پیاوەکەی بزانێت و، نوێژەکەی بەجێبێنێت و بپیارێزێت ؟

ئەیهو زۆر دوورە.

ئەمانە شەرعیان خستۆتە پشت گویّ، بۆیە هیچیان پیّ نەماو شمەکەکەیان زوو تەواو بوو، چونکە هەق قورسەو، پووچیش سووکە.

کەسانێك لە چیرۆك خوانان و واعیزان هانی خەڵك دەدەن بۆ زوهدو، شەو نوێژی و، مەبەستی ڕاستەقینەو بیروباوەڕی ڕاست بۆ خەڵکی ڕەمەکی ڕوون ناکەنەوە، بۆیە پێدەچیّ پیاوێکی ئەم کۆمەڵە تەوبە بکات و، گۆشەگیری جێگەیەك بێت، یا دەچێتە دەرەوە بۆ چیایەك و، خاوخێزانەکەی دەمێننەوەو هیچ شتێکیان لە ماڵەوە نابیّ(١٩٠).

کەسانێکیش لە چیرۆك خوان و واعیزان سەبارەت بە هیواو ئومێدو ئارەزوو دەدوێن، بەڵام تێکەڵ بەوانەی ناکەن کە ترس و وریایی دروست بکات، بۆیە خەڵك زاتی تاوان و سەرپێچی کردنی زیاتر دەبێت، دواتریش ئەم کەسانە باسەکانیان بەهۆکارەکانی دڵ تێچوونی دونیا بەهێز دەکەن، وەکو هۆکاری گواستنەوەی جوان و، پۆشاکی بەنرخ، بۆیە دڵەکان بە گوفتارو بە کرداری خۆی خراپ دەکات.

---

١٩٠ _ چەند دوێنیّ لە ئەمڕۆ دەچێت ؟! هەندیّ لە کۆمەڵە ئیسلامیە بانگخوازیەکانی ئەمڕۆ سەروەت و سامان و پاڵپشتی تێکۆشانیان لە سەر ئەم کارەیە، بە چوونە دەرەوەو بەجێهێشتنی خاوخێزان و شتگەلێکی تری بەو هاوشێوانە ! تێڕوانە !!

## ✸ ڕەخنەگرتن لە ڕێبازگەلی واعیزان و چیرۆك خوانان:

پێدەچی واعیز ڕاستگۆ بیت، مەبەستی ئامۆژگاری بێت، بەڵام لە گەڵ زەمەندا کەسانێکیان سەرگەورەی تێکەڵ بە دڵیان بووە، بۆیە حەزدەکات بە گەورە دابنرێت، نیشانەی ئەوەیە کە ئەگەر واعیزێکی دیکە دەرکەوت بۆ ئەوەی لە جیاتی کاربکات، یا یارمەتی بدات بۆ ئامۆژگاریکردنی خەڵك، ئەوەی پێ ناخۆش دەبێت، کەچی ئەگەر مەبەستی ڕاست بووایە، قایل دەبوو بۆ چاکردنی خوو و ڕەوشتی خەڵك یارمەتیدەری بێت.

کەسانێك لە چیرۆك خوانان ژنان و پیاوان لە کۆڕەکەیدا کۆدەکاتەوە، بۆیە تەماشا دەکەیت ژنان هاوارێکی زۆر دەکەن بە هۆی سۆزەوە بە بانگەشەی خۆیان، کەچی قەدەغەی ئەوەیان لێ ناکات، تەنها لە بەر کۆکردنەوەی دڵان و ڕاکێشانیان بۆ لای خۆی.

لە زەمەنی خۆشماندا _ زەمەنی (ابن الجوزي) _ کەسانێك لە چیرۆك خوانان پەیدا بوون لە چوارچێوەی سەرلێشێواندنەوە بە دوورن، چونکە شتێکی ئاشکرایە چیرۆکیان کردووە بە هۆکاری بژێوی و بە هۆیەوە بەخشش و خەڵات لە ئەمیرو ستەمکاران و باج کۆکەرەوەان وەردەگرن و، کردویانە بە هۆکاری پەیداکردنی بژێوی بە گەڕان لە وەڵاتاندا، کەسانێکیشیان ئامادەی سەرقەبران دەبێت و، باس لە بەڵاو کارەسات و، جیابوونەوە لە خۆشەویستان دەکات و، ژنان دەگرێنێت و، باسی ئارامگرتن ناکات.

پێدەچێ ئیبلیس سەر لە واعیزی تۆکمەی باش تێگەشتووی حاڵی بوو (الواعظ المُحَقِّق) بشێوێنێ و، پێی بڵێت: کەسێکی وەکو تۆ مۆچیاری و ئامۆژگاری ناکات، بەڵکو کەسێکی هۆشیاری ئاسایی مۆچیاری و ئامۆژگاری دەکات، بەوەش هانی پچڕان و بێدەنگبوونی دەدات!

ئەوەش یەکێکە لە پیلانگێڕیەکانی ئیبلیس، چونکە ڕێگریی لە کاری خەیر دەکات و، بەو واعیزە تۆکمەیە دەڵێت: تۆ چێژ لە باسەکانت وەردەگریت و، هەست بە ئارامی و حەوانەوە دەکەیت، پێدەچێ بەوە ڕووپامایی (ریاء) تێکەڵ بە گوفتارەکانت بوبێت و، هەڵبژاردنی ڕێگەی تەنیایی چاکترو بێوەی ترە، کەچی مەبەستی تەنها داخستنی دەروازەی خەیرە.

## * باسی سەرلێشێواندنەكانیی بەرامبەر بە زمانەوانان و ئەدەب دۆستان:

نووسەر دەفەرمێت:

ئیبلیس سەری لەم جەماوەرە شێواندووەو، سەرقاڵی كردوون بە زانستەكانی (النحو)و زمانەوەو (١٩١)، دووری خستونەتەوە لە فێربوونی شتە گرنگە پێویستیەكان كە (فرض عین)ەو دەبێ هەموو كەسێك بیزانێت و كاری پێ بكات، وەكو زانینی ئەو شتانەی كە بە ناچاری لەبواری پەرستنەكاندا دەبێ بیزانن، لە گەڵ كردەوەگەلێكی شایستەی فێربوونی پەیوەست بە ئەدەبی نەفس و، چاكەكاریی دڵان، هەروەها زانستە چاكەكانی تایبەت بە زانستەكانی تەفسیرو فەرموودەو فیقە، هەموو زەمەنی خۆیان بە زانستێكەوە بەسەربرد كە بۆ خودی خۆی خواست ناكرێت، بەڵكو بۆ فێربوونی زانستەكانی تر سوودی لێوەردەگیرێت، چونكە مرۆڤ كە وشەیەك فێر دەبێ، پێویستە سەركەوێت بۆ كارپێكردنی وشەكە، چونكە لە بواری دیكەدا خواستراوە، بۆیە مرۆڤی وایان دەبینیت هێندەی نەماوە لە ئادابەكانی شەریعەت هیچ نەزانێت جگە لە شتێكی كەمی نەبێت، سەرەڕای نەزانینی فیقە، وە ئاوڕ لە پاككردنەوەی نەفسی و، چاكردنی دڵی ناداتەوە.

لە گەڵ ئەمەشدا، خۆبەزلزانینێكی گەوریان تێدایە، ئیبلیس وای بە خەیاڵدا هێناون كە ئێوە لە زانایانی ئیسلامن، چونكە (النحو)و زمان لە زانستەكانی ئیسلامن و، هۆكاری سەرەكی تێگەشتنی قورئانی پیرۆزن!

سوێند بە خوا نكۆڵی لەمە ناكرێت، بەڵام ئەوەی پێویستە لە (النحو) بزانرێت بۆ چاككردنی زمانەو، ئەوەش كە مرۆڤ پێویستی پێیەتی لە زمان بۆ تەفسیركردنی قورئان و فەرموودەیە، كە كارێكی ناچاریی و پێویستە، جگە لەوە زیادەیەكەو پێویست نییە، بۆیە

---

١٩١ _ واتە: سەرقاڵی كردوون بە زۆر قوڵبوونەوە لە زانینی لقەكانی و وردەكاریەكانیداو، وای لێكردوون هەوڵی تەنها فێربوونی شتە پێویستیەكان نەدەن كە زمانی پێ ڕاست دەبێتەوە.

بەسەربردنی کات لە فێربوونی ئەم زیادەیەدا _ کە پێویست نییە _ لە گەڵ پشت گوێ خستنی پێویست: هەڵەیە، پەسەندترکردن و بە چاکتردانانیشی بەسەر شتگەلێکی دیکەی بەسوودترو پلە بەرزتری وەکو فیقەو فەرموودە: فێڵ وفەرەج و بێدادپەروەریە.

ئەگەر تەمەن ئەمەندە فراوان بوایە بۆ زانینی هەرهەمووی، کارێکی چاك بوو، بەڵام تەمەن کورتە، بۆیە پێویستە گرنگترو چاکتر پێش بخرێت و پەسەندتر بکرێت.

لەبەر ئەوەی کاریان بە گشتی بریتی یە لە شیعری (الجاهلي)و، خووش هیچ بەبەرستێکی بەدینەکرد بیگەڕێنێتەوە بۆ خوێندنەوەی فەرموودەکان و، فێربوونی ژیانامەی پێشینی چاك، ئەوەبوو ئەو خووانەی خۆیان بۆ نێو قوڵای تیاچوون و هەواو ئارەزووەوە ڕاڕەوی کردن، بۆیە تەماشا دەکەیت دەستوورەکانی تەمبەڵی و بێکاری ڕادەپەڕێت و گاڵتەو سوکایەتی دەکات و، کەم کەسیان دەبینیت بە لە خواترسانەوە خەریك بێت، یا بژێویەك پەیدا بکات، چونکە بە (النحو) خۆی لە کاربەدەستان نزیك دەکاتەوەو، بەوەش زمانەوانان لە ماڵە حرامەکانی ئەوان دەخۆن، وەکو (أبو علي الفارسي) کە لە سەردەمی (عَضُدِ الدولة)و کەسانی تریش پێی هەڵدەستان.

زۆر جار واتێدەگەن کە هەندێ شت شیاوە، کەچی شیاویش نییە، بە هۆی کەم تێگەشتنیانەوە، وەکو بە سەرهاتەکەی (أبي إسحاق إبراهيم)ی کوڕی (السَّرِيِّ)، دەڵێت:

(القاسم)ی کوڕی (عبدالله)م فێری زانست و ڕەوشتی جوان دەکردو، پێم دەگوت: ئەگەر بەو پلەیەی بابت گەشتی و، وەزارەتت پێ سپێردرا، چ چاکەیەکم لە گەڵدا دەکەی ؟ ئەویش دەیگوت: ئەوەی خۆت حەزت پێیەتی. منیش پێم دەگوت: حەزم بەوەیە بیست هەزار دینارم بدەیتێ. ئەوە ئەوپەڕی هیواو ئاواتم بوو.

پاشان تەنها چەند ساڵێك تێپەڕبوو، ئەوەبوو وەزارەت بە (القاسم) سپێردراو، منیش هێشتا لە گەڵیدا بووم و لێی جیا نەبوومەوە، بویوم بە هاوەڵی، نەفسم هانی دام بۆ بەیادهێنانەوەی ئەو پەیمانەی پێی دابووم، بەڵام بە گەورەم داناو لێی ترسام، لە ڕۆژی سێیەمی وەزارەتەکەیدا، پێی گوتم ئەی (أبا إسحاق) ! ناتبینم پەیمانەکەم بەیادهێنیتەوە !

منیش گوتم: پشتم بە چاودێری وەزیـر بەسـت خـوا بیپـارێزێ، چـونکە پێویـستی بـە هـیچ بەیادهێنانەوەیەك نابێت سەبارەت بەو پەیمانەی داویەتی بەرامبەر بە خزمەتکارێکی مافدار. پێی گوتم: کێشەکە (المعتـضد)ە، ئەگەر ئەو نەبوایە بەلامەوە قورس نەبوو هـەموو پارەکـەت بە جارێك بدەمێ، بەڵام ترسم لەوەیە قسەیەك لە نێوان من و ئەودا روویدات، بۆیە دڵفراوانی بنوێنە و بەش بەش وەریبگرە. گوتم: بەو جۆرە کردار بکە. پێی گوتم: بـۆ خـەڵك دابنیـشەو، ئەو (رقاع)انەیانم (١٩٢) بۆ بهێنە کە پێداویستیە گەورەکانی ئەوانی تێدایە، پەلەشی لە سـەر بکە، سڵیش لە داواکردنم نەکەیتەوە سەبارەت بەو شتانەی بۆیان هێنای، قسەم لە گەڵدا بکەو بۆت جێبەجێ دەکەم، راست بێت یا مەحاڵ بێت، تاوەکو ئەو پارەی پـەیمانم پێـداوی دەسـتت دەکەوێت، منیش ئەوەم بەجێدەگەیاندو، هەموو رۆژێـك (رقـاع)ێکـم نیـشان دەداو، ئـەویش ئیمزای دەکردو، لەوانەش بوو پێی بگوتمایە: چـەندت بـۆ دەسـتەبەرکراوە لـە سـەر ئەمـە ؟ منیش دەمگوت: ئەوەندەو ئەوەنـدە، ئـەویش دەیگـوت: فێـڵێ و فـەرەجت لێکـراوە، ئەمـە یەکسانە بە ئەوەنـدەو ئەوەنـدە، بۆیـە داوای زیـاد بکـە، منـیش دوویـارە دەگەڕامـەوە لای خەڵکەکەو، بەردەوام مامەڵەم لە گەڵدا دەکردن و، بۆیـان زیـاد دەکـردم، تـا دەگەشـتە ئـەو رادەیەی بۆی دیاری کردبووم.

(أبي إسحاق) دەڵێت: ئەوەبوو شتێکی زۆرم نیـشاندا، تـاوەکو بیـست هـەزار دینارەکـەو زیاتریشم دەستکەوت لە ماوەیەکی کەمدا، دوای چەند مانگێك پێی گوتم: ئەی (أبا إسـحاق) ! ئەو پاریەی پەیمانم پێ دابووی دەستت کەوتەوە ؟ منیش گوتم: نەخێر. ئەوەبوو بێدەنگ بوو، پاشان هەموو مانگێك یا نزیك بە مانگێك لێی دەپرسیم: ئەو پارەیـەی پـەیمانم پـێ دابـووی دەستت کەوت ؟ منیش دەمگوت: نەخێر، لە ترسی بڕانی ئەو بژێویەدا، تا دوو ئەوەندەی ئەو پارەیەی پەیمانی پێ دابووم دەستم کەوت، رۆژێکی دیکەش لێی پرسیمەوە ؟ بەڵام شەرمم لـە

---

١٩٢ _ رقاع: پارچە پێستێکە یا هەر شتێکی ترە بۆ لە سەر نووسین بەکاردێت و داواکاری ئەو خەڵکـەی تێدا دەنوسرا بۆ ئەوەی بەرزکرێتەوە بۆ وەزیرو ئەویش لە جیاتی هەستانی لە بەرزکردنەوەیدا بڕێـك پـارەی وەکو بەرتیل لەو خەڵکە وەردەگرت. (وەرگێڕ).

درۆکردنی بەردەوام دەکرد ! بۆیە گوتم: بـە خۆشـی و بەخـشندەی وەزیـرەوە دەسـتم کـەوت، ئەویش پێی گوتم: سوێند بە خوا خەم و خەفەتت ڕواندمەوە، چونکە بەردەوام دڵم لە پـەژارەدا بوو تا ئەو پارەتە دەستکەوت.

دەڵێـت: پاشـان شووشـە مرەکەبەکـەی هـەڵگرت و، کتێبێکـی بـۆ ئیمـزا کـردم بـۆ گەنجینەوانەکەی کە سێ هەزار دینارم بە یەکجار بداتێ، ئـەوەبوو منـیش وەرمگرتـوو، ئـیتر هیچ شتێکم نیشان نەدایەوە، نەشمدەزانی وەزیر چۆن ڕەفتارم لە گەڵدا دەکات، بـۆ سـبەینێ، دیدەنیم کردەوەو، دانیشتم، ئاماژەی بۆ کردم: ئەوەی پێتە بیهێنە، بۆ ئەوەی ئەو (رقاع)انـەم پێیە لێم وەربگرێت. ئەوەبوو گوتم: (رقـاع)م لە هیچ کەس وەرنەگرتووە، چونکە ئەو پارەیـەی پەیمانت پێ دابووم دەستم کەوت، نەشمزانی وەزیر چیتر چۆن ڕەفتارم لە گەڵدا دەکات ؟ ئەویش گوتی: ئەی (سبحان الله) ! واتێدەگەی شتێکت لێدەبرم کە بووە بە نەریتێك بۆ تۆ، خـەڵکیش پێیان زانی، بەو هۆیەشەوە پلەوپایەیەو شکۆمەندیەکت لای ئەوان پەیداکردو، خەڵکیش بەیان و ئێوارە سەردانی ماڵـەکت دەکـەن و، نەشـزانرێت هۆکـاری بڕینەکـەی چ بـوو، ئـەو کاتـە وادەزانرێت ئەوە بە هۆی لاوازی شکۆمەندیتەوە بووە لای من، یا گـۆڕان بـە سـەر پلەکەتـدا هاتووە ! (رقاع)ەکانتم نیشان بدەو، بەبێ ژماردن بەرە.

ئەوەبوو منیش دەستم ماچ کردو، سبەینێ زوو (رقاع)ەکانم بۆ بردەوە، ئیتر هەموو ڕۆژێك نیشانم دەدا تاوەکو مردو بەو جۆرە ماڵ و سەروەتم زۆر بوو.

نووسەر دەفەرمێت:

تەماشاکەن کەم تێگەشتن لە فیقهدا چ دەکات ؟! چونکە ئەم پیاوە پایە بـەرزە زانایـە لـە زانستەکانی (النحو)و زماندا، ئەگەر بیزانیبا ئەوەی پێی هەستاوە لە ڕووی شـەرعەوە شـیاو نییە، باسی نەدەکردو ئاشکرای نەدەکرد !

چونکە گەیاندنی پێداویستیەکانی خەڵك بە کاربەدەستان (واجب)ە، بەڵام شیاو نییە هـیچ بەرتیلیەکی لـە سـەر وەربگرێـت، هـەروەها نابێـت هـیچ شـتێك وەربگرێـت لـە سـەر ئـەو کاروبارانەی دەوڵەت کە خراوەتە ئەستۆی وەزیر، بەمە زۆر بە ئاشکرا پلەبەرزی فیقـە بەسـەر جگە لە فیقهدا دەردەکەوێت.

## ✸ باسی سەرلێشێواندنەکانیی بەرامبەر بە شاعیران:

نووسەر دەفەرمێت:

ئیبلیس سەری لێشێواندون و، وای بە خەیاڵدا هێناون کە ئەوان لە چینی ئەدیبانن و، تایبەت کراون بە زرنگی و زیرەکیەکەوە کە پێی جیابوونەتەوە لە کەسانی تر، ئا لێرەدا لە توانادایە بگوترێت هەرکەس تایبەتی کردون بەو زرنگی و زیرەکیەوە، پێدەچێ لە گوناەو تاوانەکانیشتان بورابێ ! بۆیە تەماشا دەکەیت وێڵ و سەرلێشێواون لە هەموو شێوێکداو شیعر دەڵێن، وەکو درۆ، سووکردن، هەجوو، ئابڕوبردن و ئەتك کردن، دان نان بە هەر خراپەو بەدڕەوشتیەکدا، کەمترین بارودۆخیشیان شاعیر هەڵدەستێت بە پیاهەڵدانی مرۆڤ و پاشان ئەو مرۆڤە لە ترسی ئەوەی هەجووی نەکات، پارەی پێدەدا بۆ خۆپاراستن لە شەڕی، یا لە نێو کۆمەڵێکدا پیاهەڵدەداو ستایشی دەکات و، مرۆڤیش شەرمی ئامادەبوان دەیگرێت و پێی دەدا.

هەموو ئەمانە لە ڕەگەزی دەست بە سەراگرتنی ماڵی خەڵکە.

تەماشای کۆمەڵێکی شاعیران و ئەدیبان دەکەیت خۆیان بەدوورناگرن لە پۆشینی ئاورێشم و، لە پیاهەڵداندا درۆ دەکەن و لە سنوور دەچنە دەرەوە، کۆبونەوەشیان لە سەر کاری نارەواو خراپەکردن و، خواردنەوەی مەی و، جگە لەوانەشە، دوای ئەوە کەسانێکیان دەڵێن: من و کۆمەڵێك لە ئەدیبان کۆبوینەوەو، ئاوەهاو ئاوەهامان کرد !

ئەیهو زۆر دوورە، دڵنیابن هیچ ئەدەبێك ڕەوا نابێ مەگەر بۆ خوای پەروەردگار بێ، ئەوەش بە بەکارهێنانی خۆپاراستن و لێترسانی ئەو زاتە دەبێت، کەسی زرنگ لە کاروباری دونیادا شکۆمەندیەکی ئەوتۆی نابێت، هیچ دەستەواژەیەکیش بەلای خوای پەروەردگارەوە چاك نابێ ئەگەر خۆپاراستن و لە خواترسانی لە گەڵدا نەبێ.

جـەماوەری ئـەدیبان و شـاعیران ئەگـەر رۆزی و بەدەسـتهاتیان کـەم بویـەوە، بێـزاری دەنوێننو، کوفر دەکەن و، دەسـت دەکـەن بـە سەرزەنـشتکردنی چـارەنووس، وەکـو ئـەوەی هەندێکیان گوتویانە:

لَئِنْ سَمَتْ هِمَّتِي فِي الفَضْلِ عالِيَّةً
فإِنَّ حَظِّي بِبَطْنِ الأرْضِ مُلْتَصَقٌ
كَمْ يَفْعَلُ الدَّهْرُ بِي مـــالا أُسَرُّ بِهِ
وكَـــمْ يُسِيءُ زَمـــانٌ جائِرٌ حَنِقٌ

واتە: ئەگەرچی هیمەتم لە فەزڵ و چاکەدا بەرزبوبێتەوە
بـــەڵام بەختم بـەسکی زەمینەوە نووساوە
ڕۆژگـار چەندم پێ دەکـــات کــــە پێی دڵخۆش نابم
وە زەمـەنێکی ستەمکاری ڕقاوی چەند خراپەم لەگەڵ دەکات.

بەڵام ئەمانە بیریان چووە سەرپێچیەکانیان رۆزی و دەستکەوتیان کەم دەکاتـەوە، نەفـسی خۆیان وابینیوە شایستەن بە هەموو خێرو خۆشیەك، شایستەن بە بێـوەی لـە هـەر بەڵایـەك، کەچی سەرەنجی پێویستێتی ملکەچبوونی خۆیان نەداوە بەرامبـەر بـە فەرمانـەکانی شـەرع، چونکە زرنگی و زیرەکیان لە بێئاگای و کەم ئەزموونیدا ونبووە.

# ✱ باسی سەرلێشێواندنەکانی ئیبلیس بەرامبەر بە زانایانی تۆکمەی کامڵ:

نووسەر دەفەرمێت:

هیمەتی کۆمەڵانێك بەرز بۆوەو، فێری زانستەکانی شەرع بوون، لە قورئان و، فەرموودەو، فیقهو، ئەدەب، بەڵام ئیبلیس بە سەرلێشێواندنێکی شاراوەوە بۆیان چوو، خودی خۆیـانی بـە چاوێکی گەورەوە پێشاندان، لەبەر هەموو ئەو زانستەی کە فێری بوون و سوودیان بـە خـەڵك گەیاند، لێرەدا کەسانێکیان والێدەکات بیزار بـێ بـە هـۆی دوورودرێـژی ماندووبونیـەوە بـۆ فێربوونی زانست و، خۆشیەکانی بۆ دەڕازێنێتەوەو، پێی دەڵێت: ئـەم ماندووبوونـەت تـاوەکو کەی ؟ ئەندامەکانی لەشت لە نارەحەتیەکانی سـەپاندن (التکـالیف) بحەوێنـەوەو، ڕێگـە بـە نەفست بدە لە بواری خواست و ئارەزووەکانیدا ڕابوێرێت، ئەگـەر تووشـی تـاوانێکیش بـووی زانستەکەت تاوانەکەت لە سەر لادەبات ! وە فەزڵ چاکەی زانایانی بەیاد دەهێنێتەوە.

ئەگەر ئەم بەندە بە جێماو، ئەم سەرلێشێواندنەی قبوڵ کرد، ئەوا تیادەچێت و دەفەوتێت.

بەڵام ئەگەر سەرکەوت، پێویستە بڵێت: ئەی ئیبلیس بە سێ ڕوو وەڵامت دەدرێتەوە:

یەکەمیان: لە ڕاستیدا زانایان بە زاستەوە فـەزڵ و چـاکەیان بـۆ دەسـتەبەرکرا، بـــەڵام ئەگەر کاریان پێ نەکرد، ئەوا هیچ مانایەکی نابێ، ئەگەر منیش کارم پێ نەکرد، وەکو ئـەو کەسەم لێدێت کە نەزانێت مەبەستی سەرەکی فێربوونی ئەو زانستە چی یە، نموونەشـم وەکـو نموونەی پیاوێکی لێدێت کە خۆراك کۆبکاتەوەو، دەرخواردی کەسانی برسـی بـدات و، خـۆی هیچی لێ نەخوات، بۆیە ئەم کەسە هیچ سوودێکی تێربوون بە برسێتیەکەی خۆی نابەخشێت.

دووەم: بەرپەرچی بداتەوە بەو فەرموودانەی سەبارەت بە زەمکردنی کارنەکردن بە زانست هاتووە، وەکو ئـەوەی کـە پێغەمبـەری خـوا _ صـلی الله علیـە وسـلم _ بـاس و خواسـی پیاوێکمان بۆ دەگێڕێتەوەو دەفەرمێت: ((رجل يُلقى في النار، فتندَلِقُ أقتابُه، فيقولُ: كنتُ آمُرُ

بالمعروفِ ولا آتيه، وأنهى عنِ المنكَرِ وآتيه)(١٩٣). واته: ((پياوێك فرێ دەدرێتــە ئــاگرەوەو، ڕيخۆڵەكانى بە خێرايى دەچێتە دەرەوەو، دەڵێت: فەرمانم بــە چــاكە دەكــردو خــۆم كــارم پــێ نەدەكردو، قەدەغەشم لە خراپە دەكردو خۆم پێ هەڵدەستام)).

وقولِ أبي الدرداء _ رضي الله عنه _: ((ويلٌ لَمنْ لا يعلم " مرةً، وويلٌ لَمن عَلِمَ ولم يَعْمَلْ" سبعَ مرَّاتٍ)) (١٩٤) واته: ((وەيل بۆ ئەو كەسەی نازانێت، يــەك جــار، بــەڵام وەيــل بــۆ ئــەو كەسەی دەزانێت و كاری پێناكات، حەوت جار)).

سێيەم: با باسی سزای ئەو زانايانە بكات كە تياچوون بە هۆی وازهێنانيانەوە بە كــاركردن بەو زانستەی پێيان بوو، وەكــو ئيبلــيس و كەســانی تــری جگــە لــە ئــەويش، بەسيــشە بــۆ زەمكردنی زانای كارنەكردوو بە زانستەكەی، ئەوەی كە خوای تعالى فەرموويەتی:

﴿ كَمَثَلِ الحِمارِ يَحْمِلُ أسفاراً ﴾ ﴿ الجمعة: ٥ ﴾. واته: ﴿ كَمَثَلِ الحَمارِ ﴾ وەك گــوێ درێژێكە ﴿ يَحْمِلُ أسْفاراً ﴾ كە كتێبێكی زۆری هەڵگرتبێ (سوودی لێ نابينێ) (١٩٥).

---

١٩٣ _ رواه البخاري (٣٢٦٧)، ومسلم (٢٩٨٩)، عن أسامة بن زيد.

١٩٤ _ _ وسنده صحيح.

انظر تخريجه في تعليقي على ((ذمُ مَن لا يعمل بعلمه)) (ص ٤٥ _ ٤٦) لأبن عساكر، طبع دار عمّار.

١٩٥ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسيری قورئان.

## ✹ ڕەخنەگرتن لە ڕێبازگەلی زانایان تۆکمەو کامڵ:

ئیبلیس لە لایەکی ترەوە سەری لە کۆمەڵانێکی تری زانایانی تۆکمـەی بـە ئـەزموون لـە زانست و کرداردا شێواندووە، خۆبەزلزانینی بۆ ڕازاندونەتەوە لەبەر ئەو زانستەی پێیانـە، لـە گەڵ ئێرەیی بردن (الحسد) بە کەسانی تری هاوتای خۆی و، ڕووپامایی کردن بۆ بەدەستهێنانی سەرگەورەیی، جار بە جار وایان پیشان دەدا ئەوە هەقێکی پێویستی ئەوانەو، جار بە جـاریش خۆشەویستی ئەوەیان لە دڵدا زیاد دەکات، بۆیە وازی لێناهێنن، ئەگەرچی چاك دەزانن ئـەوە هەڵەیە.

چارەسـەری ئەمـە بـۆ کەسـی سـەرکەوتوو بریتیـە لـە تێڕوانینـی بـەردەوام بـۆ تـاوانی خۆبەزلزانینو ئێرەیی بردن و ڕووپامایی و، بەیادهێنانەوەی نەفـسە کـە زانـست شـەری ئـەو دەسـتکەوتانەی سـەروە لانابـات، بـەڵکو سـزاکەی دووئەوەنـدە دەکـات، چـونکە بەڵگـەی سزادانەکە دووئەوەندە بۆتەوە، هەرکەس تەماشای ژیانامەی پێشینی چـاك لـە زانایـانی بـە کردار بکات، لە ئاستی ئەواندا خودی خۆی بە کەم و نزم دێتە پێش چاوو، ئیتر خـوی بـە زل نازانێت، وە هەرکەس خوای پەروەردگار بناسێت، ئیتر ڕووپامایی نانوێنێـت و، هەرکەسـیش تەماشا بکات کە چارەنووسی بە پێی ویست و خواستی خـوای تعـالی تێدەپـەڕێت، ئێرەیـی نابات.

پێدەچێ ئیبلیس بە گومانێکی جـوان پۆشـەوە بۆیـان بـچێت و، بڵێـت: داواکردنتـان بـۆ پلەبەرزی مانای خۆبەزلزانین نابەخشێ، چونکە ئێـوە نوێنـەری شـەرعن و، داواکاریـەکانتان بریتی یە لە بەهێزکردنی ئاین و، بەدرۆخستنەوەی ئەهلی بیدعە، کە جڵەوی زمانیشتان شـل کردووە بەرامبەر بە ئێرەیی بەران ئەوە تووڕەبوونە بۆ شەرع، چونکە ئێرەیی بەران زەمی ئـەو کەسانە دەکەن کە بەوە هەستاون، ئەوەش کە بـە ڕووپامـایی دایـدەنێن، ڕووپامـایی نییـە، چونکە ئەو کەسەی لە ئێوە دڵکزی (تخاشع) دەنوێنێت و، خۆی دەگرێنێـت، خـەڵکی شـوێنی دەکەون و پەیڕەوی دەکەن، وەکو چۆن پـەیڕەوی پزیـشك دەکـەن ئەگـەر بـە کرداریـی خـۆی پاراست، زۆر زیاتر لەوەی کە ئەگەر تەنها وەسف بکات.

بەدەرخستنی ئەم سەرلێشێواندنەش بەوەیە کە ئەگەر کەسێکی تر هەستێت و خۆیـەزلزانین بەسەر هاوەڵێکی خۆیاندا بنوێنێت و ، لە مەجلیسەکەدا بە سەریدا سەرکەوت، یا کەسـێکی نێرەیی بەرامبەر بە هاوەڵەکەیان شـتێك بڵێـت، ئـەم زانایـە بـۆ ئـەوە تـووڕە نابێـت وەکـو تووڕەبوونی بۆ خودی خۆی، ئەگەرچـی هاوەڵەکـەی لـە نوێنـەرانی شـەرعیش بێـت، لێـرەدا دەزانرێت لە ڕاستیدا بۆ نەفسی تووڕەنەبوو، بەڵکو بۆ زانستەکە بوو.

بەڵام ڕووپامایی، بۆ هیچ کەسێك نابێتە بەهانە، شیاویش نییـە بکرێـت بـە هۆکـارێکی بانگـەوازیکردنی خـەڵکی، بۆیـە (أیـوب الـسَّخْتِیانيُّ) ئەگـەر فەرموودەیـەکی باسـکردایە، دڵنەرمی دەیگرت و، چاوەکانی فرمێسکی دەرشت و ئاو بە لوتیدا دەهاتە خوارێ، بـەڵام لـە ترسی ڕووپامایدا دەیفەرموو: ئای کە هەڵامەتەکەم توندە !

پاشان: کـردەوە بـە نیـەت و نیـازەو، ڕەخنـەگریش زرنـگ و کارامەیـە، چـەندین کـەس پێدەنگەو غەیبەتی موسڵمانان ناکات، بەڵام ئەگەر لە ئامادەبوونیدا غەیبەتیان کرا، دڵخۆش دەبێت، بەوەش لە سێ ڕۆوە تاوانبار دەبێت:

یەکەم: دڵخۆشی، چونکە ئەو دڵخۆشیە بە هۆی ئەو سەرپێچیەوە بوو کە لە لایەن کەسـی غەیبەتکارەوە ئەنجام درا.

دووەم: شادوومانبوونی بە قسەپێگوتن و تانەلێدانی موسڵمانان.

سێ یەم: نکۆڵی ناکات.

ئیبلیس سەری لە زانایانی کامڵی تۆکمە شـێواندووە، شـەوخونی دەکـەن و، بـە ڕۆژیـش بەردەوام تێدەکۆشن بۆ دانان و ڕێکخستن و کۆکردنەوەی زانستەکان، ئیبلیس وای بە خەیاڵـدا هێناون کە مەبەست بڵاوکردنەوەی ئاینە، بەڵام مەبەسـتی نـاوەکی شـاراوەیان بڵاوبوونـەوەی ناوداری و، بەرزی ناوبانگی و، سەرگەورەیە، بۆ ئـەوەی لـە هـەموو لایەکـەوە خوێنـدکارانی زانست بۆ لای نووسەر سەفەر بکەن.

ئەم سەرلێشێواندنەش بەوە ئاشكرا دەبێت كە ئەگەر خەڵكی سوود لە دانراوەكانی وەرگرن بەبێ ئەوەی ئامشۆی خۆی بكەن، یا بە سەر كەسێكی دیكەی هاوتای خۆی لە زانستدا خوێندرابەوە، بەوە دڵشاد دەبێت، ئەگەر مەبەستی بڵاوبوونەوەی زانست بێت.

كەسانێك لە پێشین(١٩٦) فەرموویانە: هەر زانستێك كە فێری بوومە حەزم كردووە خەڵك سوودی لێوەرگرن بە بێ ئەوەی بدرێتە پاڵ من.

هەشیانە بە زۆریتی شوێنكەوتوان دڵخۆش دەبێت و، ئیبلیسیش سەری لێدەشێوێنێت و وای بەخەیاڵدا دێنێت كە ئەو دڵخۆشبوونە بۆ زۆریی خوێندكارانی زانستە، بەڵام لە ڕاستیدا مەبەستی تەنها زۆركردنی هاوەڵان و، بڵاوكردنەوەی ناوبانگ و شورەتە.

لەو بوارەدا لە خۆباییبوونێكی زۆر بە وشەو زانستەكانی خۆیانەوە پەیدا دەكەن، ئەم سەرلێشێواندنە بەوە ئاشكرا دەبێت كە ئەگەر هەندێك لەو كەسانەی ئامشۆی دەكەن وازیان هێناو چوونە خزمەتی كەسانی تری لە خۆی زاناتر، ئەوەی لا قورس دەبێت و پێی بێزار دەبێت.

ئەمە خوورەوشتی كەسی دڵسۆز نییە لە بواری فێركردندا، چونكە نموونەی كەسی دڵسۆز وەكو نموونەی ئەو پزیشكانەیە كە بۆ خوای تعالی تیماری نەخۆشەكان دەكەن، بۆیە ئەگەر هەندێ لەو نەخۆشانە لە سەر دەستی پزیشكێكی هاوەڵی خۆیان چاك بوویەوە، ئەوانی تر دڵخۆش دەبن.

---

١٩٦ _ ئەو كەسە پێشەوا (الشافعي)ە _ بەرەحمەتی خوا بێت _. انظر ((التعريف بآداب التأليف)) (ص١٧) للسيوطي _ بتعليقي، ومقدمتي الحافلة على كتابه ((الفارق بين المصنف والسارق))، وكلاهما تحت الطبع.

## ✱ باسی هەندێ لە سەرلێشێواندنە شاراوەکان:

نووسەر دەفەرمێت:

پێدەچێ زانایانی تۆکمەی کامڵ لە سەرلێشێواندنە ئاشکراکانی ئیبلیس رزگاریـان بێـت، بەڵام ئیبلیس بە سەرلێشێواندنێکی تری شاراوەوە بۆیان دەچـێت و، پێیـان دەڵێـت: هـەرگیز وەکو تۆم چاو پێ نەکەتووە، ئای کە زانای بـە رێگـەکانی چـوونە ژوورەوەو هاتنـە دەرەوەم! بۆیە ئەگەر بەوە دڵخۆش بوو، بە لەخۆباییبوون تیا دەچێت و، ئەگەر خـۆی لـە ملکەچـبوونی قوتار کرد، ئەوا سەرفەراز دەبێت.

(السَّرِيُّ السَّقَطِيُّ) دەڵێت: ئەگەر پیاوێك بچێتە نێو باخێکەوە هەموو جۆرەکانی درخـەتی تیابێت کە خوای تعالی بە دیهێناوەو، هەموو جۆرەکانی باڵندەشـیان بـە سـەرەوە بێـت کـە خوای تعالی بە دیهێناون و، هەر باڵندەیەکیش بە زمانی خۆی دواو، بڵـێن: سـڵاوت لـێ بـێ ئەی وەلی خوا! وە نەفسی بەوە دڵخۆش بوو و نەترسا، ئەوا دیلی دەستیان دەبێـت. چـونکە وەلی خوا دەبێ بەردەوام بترسێ بۆ ئەوەی تووشی سەرلێشێواندن نەبێ.

والله الهادي لا إله إلا هُو.

# بەشی حەوتەم

## سەبارەت بە سەرلێشێواندنەکانی ئیبلیس بەرامبەر بە کاربەدەست و فەرمانڕەواکان

نووسەر دەفەرمێت:

ئیبلیس لە چەندەها ڕووەوە سەری لێشێواندون، گرنگترینیان باس دەکەین:

ڕووی یەکەم: ئیبلیس وای بەخەیاڵدا هێناون کە خوای _ عزَّوجلَّ _ خۆشی دەوێن، چونکە ئەگەر ئاوەها نەبوایە، سوڵتانی خۆی پێ نەدەسپاردن و، لە نێو بەندەکانیدا نەیدەکردن بە نوێنەری خۆی !

ئەم سەرلێشێواندنەش بەوە ڕوون دەبێتەوە کە ئەگەر بەڕاستی نوێنەری خوای پەروەردگارن، با حوکم بە شەریعەتەکەی بکەن و، شوێنی ڕەزامەندیەکانی بکەون، ئەوجا خۆشی دەوێن چونکە گوێڕایەڵی دەبن.

دڵنیابن خوای تعالی موڵك و دەسەڵات دەسپێرێتە دەستی کەسانێك کە ڕقی لێیانە، دونیاشی ڕاخستووە بۆ کەسانێك کە تەماشایان ناکات، کۆمەڵێکیش لەو کەسانەی بە سەر خواپەرستان و دینداران و پیاوچاکاندا زاڵ کردوە، دەیانکوژن و، ملکەچیان دەکەن، بۆیە ئەو موڵك و دەسەڵاتەی کە پێی دان بۆتە بەڵگەیەك بە سەریانەوە نەك بەڵگەیەك بێت بەدەستیانەوە، بەو کارەشیان دەچنە چوارچێوەی گوفتاری خوای پەروەردگارەوە کە دەفەرمێت: ﴿ إِنَّما نُمْلِي لَهُمْ لِيَزْدَادُوا إِثْماً ﴾﴿ آل عمران: ١٧٨ ﴾ واتە: ﴿ إِنَّما نُمْلِي لَهُمْ﴾ بەڕاستی ئێمە مۆڵەتی ئەوان ئەدەین ﴿ لِيَزْدَادُوا إِثْما ﴾ بۆ ئەوەی گوناه زیاتر بکەن(١٩٧).

---

١٩٧ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

دووەم: پێیان دەڵێت: دەستەڵات هیچ شکۆداریەکی نەماوە، بۆیە ئەوانیش لووت بەرزی لە ئاستی داواکردن وفێربوونی زانست و، کۆبوونەوە لە گەڵ زانایانـدا دەنـوێنن و، کـار بـە ڕای تایبەتی خۆیان دەکەن و، بەوەش زیان بە ئاین دەگەیەنن.

ئاشکرایە کە خووی مرۆڤ خەسڵەتی ئەو کەسانە دەدزێت کە تێکەڵیان دەبێت، بۆیە ئەگەر تێکەڵ بە کەسانی پەسەندکارانی دونیای نـەفام بـە شـەرع بـوو، خەسـڵەتەکانیان دەدزێـت سەرباری لەو جۆرە خەسڵەتانەی کە خۆی هەڵیگرتووە، هیچ شتێکیش بەدیناکات بـۆ ئـەوەی خۆی پێ چاك بکاتەوە ، یاخود ئەو خەسڵەتە خراپانە لـە خـۆی دوورخاتـەوە، بۆیـە ئـەوەش دەبێت بە هۆکارێکی گرنگی تیاچوون.

سێ یەم: بە دوژمنان دەیانترسێنێت و، فـەرمانی دەرگـاوانیی تونـدیان پـێ دەکـات، بـۆ ئەوەی خەڵکانی خاوەن پێداویستیەکان بە ئاسانی چاویان پێ نەکەوێت.

وقد رَوَى أبو مريَمَ الأسديُّ عن النبـيِّ _ صلى الله عليه وسلم _ قال:

((مَن وَلّاه الله شيئاً مِن أمرِ المسلمينَ، فاحْتَجَبَ دونَ حاجتِهِم وخَلَّتِهم وفقـرِهِم " احتَجَبَ الله عزَّوجلَّ دون حاجتِهِ وخلَّتِه وفقرِهِ)) (١٩٨). واتە: (أبو مريم الأسدي) لە پێغەمبەری خواوە _ صلى الله عليه وسلم ـــ بۆمان دەگێڕێتەوەو دەفەرمێت: ((ئەگەر خوای تعالى شـتێك لـە کاروباری موسڵمانانی بە هەرکەسێك سپاردو، نەهێڵێت خاوەن پێداویستیەکان و سکاڵاکاران و

١٩٨ _ رواه أبوداود (٢٩٤٨)، والحاكم (٤ / ٩٤)، الـدولابي في ((الكنـى)) (١ / ٥٣ و ٥٤)، والطبرانـي في ((الكبير)) (٢٢ / ٣٣١)، وفي ((مسند الشاميين)) (١٤٠٤) " من طريق يزيد بن أبي مريم عن القاسم بن مخيمرة عن أبي مريم.

وسنده حسن إن شاء الله.

يزيد " لا بأس به.

وقال الحاكم:

((إسناده شامي صحيح)).

ووافقه الذهبي !

وتابعهما شيخنا ـ حفظه الله _ في ((الصحيحة)) (٢ / ٢٠٦).

داواکاران بگەنە لای و بۆیان جێبەجێ نەکات، خـوای پـەروەرگاریش پێداویـستی و سـکاڵاو داواکانی ئەو جێبەجێ ناکات)).

چوارەم: فەرمانڕەکان کەسانێك کارپێدەکەن کە چاك نین لەوانەی هـیچ زانـست و لـە خـوا ترسانێکیان تێدا نیە، بۆیە ئەم کەسانە ستەمێکی زۆر لە موسڵمانان دەکـەن و دەرەنجـامیش تزا لێکردن و دوعالێکردنی خەڵك بۆ فەرمانڕەواکانیان دەستەبەر دەکەن، بە کرداری فروشتنە پووچەکانیشیان حەرامیان دەرخوارد دەدەن، سزا بە سەر کەسانێکدا دەسەپێنن کـە پێویـستە سزا نەدرێن، دواتریش وادەزانن لە خوای _ عزَّوجلَّ _ قوتاریان دەبێت چونکە ئەو تاوانانە بە گەردەنی فەرمانڕەکانیانەوە دەکەن.

ئەیهو زۆر دوورە، چونکە کاربەدەستی سەر زەکات ئەگەر کەسێکی پیاو خراپـی کـرد بـە بریکاری دابەشکردنی زەکاتەکە، بەڵام ناپاکیان نواند، پێی دەبژێردرێت (ضَمِنَ).

پێنجەم: کارکردن بە ڕای تایبەتی خۆیانیان بۆ دەرازێنێتەوە، بۆیە دەستی کەسانێك دەبڕن شیاو بە بڕین نییەو، کەسانێکیش دەکوژن کە کوشتنی حەڵاڵ نییە، وایان پیـشان دەدات کـە ئەوە سیاسەتە([199])، ئەم کارەیان ئەوە دەگەیەنێت کە شەریعەت تەواو نییەو، پێویـستی بـە تەواوکردنەو، ئێمە بە ڕای خۆمـان تەواوی دەکەین.

ئەمە لە خراپترین (التـدليس)ەکانە، چونکە شـەریعەت سیاسـەتێکی خواییـەو، مەحاڵـە سیاسەتی خوایی کەم وکورتیەکی تێدا بێت پێویستی بە سیاسەتی خەڵك بێت، خوای تعـالی دەفەرمێت:

﴿ مَا فَرَّطْنا في الكتابِ مِن شَيْءٍ ﴾﴿ الأنعام: ٣٨ ﴾ واتـە: هـیچ شـتێکمان فـەرامۆش نەکردووە لەم کتێبەدا (لوح المحفوظ یا قورئان دا)([200]).

---

١٩٩ _ سیاسەت: واتە بەڕێوەبردنی خەڵك و فەرمان پێکردن و قەدەغەکردنیان، وەرگێڕ.

٢٠٠ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

هەروەها دەفەرمێت: ﴿ لا مُعَقِّبَ لِحُكْمِهِ ﴾[ الرعد ٤١ ] واتە: کەس ناتوانێ بڕیاری ئەو (خوا) بگۆڕێ (یا هەڵیوەشێنێتەوە)(٢٠١).

بۆیە بانگەشەکاری سیاسەت بانگەشەکاری ناتەواویە لە شەریعەتدا، ئەمەش نزیک بە کوفرە.

لە (عَضُدِ الدولة)ەوە باسمان بۆکراوە کە هەواداری کچێك بوو، بیروهۆشی سەرقاڵ کردبوو، ئەوەبوو فەرمانیدا لە ئاودا بخنکێنرێت، بۆ ئەوەی بیروهۆشی خەریك نەبێت و ببێت بە هۆکاری باش بەڕێوەنەبردنی موڵکەکەی !

ئەمەش ئەوپەڕی شێتی یە، چونکە کوشتنی موسڵمان بەبێ تاوان حەڵاڵ نابێت، بڕوابوونیش بە شیاوێتی ئەو ڕەفتارە کوفرە، وە ئەگەر بڕوای بە شیاوێتی نەبوو، بەڵام وەکو بەرژەوەندیەك بەدیکرد، ئەوە هیچ بەرژەوەندیەك لەو شتانەدا نییە کە پێچەوانەکاری شەرع بن.

شەشەم: فراوانکردنی سەروەت و سامانیان بۆ دەڕازێنێتەوەو، واگومان دەبن کەوتۆتە ژێر حوکمی خۆیانەوەو بەدەستی خۆیانە، ئەم سەرلێشێواندنە بەوە ئاشکرا دەبێ کەوا هەرکەسێك ماڵ و سامانی تایبەتی خۆیان بە فیڕۆ بات لە ڕووی شەرعەوە قەدەغە دەکرێ و ڕێگری لێ دەکرێت، ئیتر دەبێ کەسی بەکرێگرتە لە پاراستنی ماڵ و سامانی خەڵکدا چۆن ڕەفتار بکات ؟ لە ڕاستیدا بە ئەندازەی کارەکەی مافی لەو سامانەدا دەبێت، بۆیە هیچ بەهانەیەك بۆ فراوانکردنی سامانەکەی نییە.

(ابنُ عقیل) دەفەرمێت: دەگێڕنەوە کە (حماد الراویة) بۆ (الولید)ی کوڕی (یزید) چەند دێڕە شیعرێکی خوێندەوەو ئەویش پەنجا هەزارو دوو کەنیزەکی پێ بەخشی !

دەڵێت: ئەمە لە ڕووی پیاهەڵدان و ستایشەوە بۆیان باسکراوە ! کەچی ئەمە ئەوپەڕی زەمکردنە بۆیان، چونکە بە فیڕۆدانە لە خەزێنەی (بیت المال) موسڵمانان.

---

٢٠١ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

لەوانەیە ئیبلیس بۆ هەندێ لە فەرمانڕەوایان قەدەغەکردنی سەروەت و سامان بۆ کەسانی مافدار برازێنێتەوە، ئەمەش هەر هاوشێوەی بەفیڕۆدانە.

حەوتەم: دڵخۆشبوونیان بۆ دەڕازێنێتەوە سەبارەت بە فراوانبوون لە سەرپێچیەکاندا، سەریان لێدەشێوێنێت و وایان بە خەیاڵدا دێنێت کە هەستنتان بە پاراستنی ڕێگاویان و دەروازەو ئاسایشی وەڵات سزاتان لێ قەدەغە دەکات.

بۆ وەڵامی ئەمە دەڵێین: لە ڕاستیدا کراون بە کاربەدەست بۆ پاراستنی وەڵات و، دڵنیایی ڕیگاویان و، ئەمەش پێویستیەکی سەرشانی ئەوانە، دڵخۆشبوونیشیان بە فراونبوون لە سەرپێچیدا قەدەغەکراوەو، ئەمە سزای ئەو سەرپێچیانە لانابات.

هەشتەم: سەر لە زۆریەیان دەشێوێنێت وایان بە خەیاڵدا دێنێت کە هەستاون بە جێبەجێکردنی پێوستیەکانی سەرشانیان، بە بەڵگەی ئەوەی کە ڕواڵەتی باروودۆخ ڕاست و گونجاوەو کێشەی تێدا نییە.

بەڵام ئەگەر تێڕوانینێکی ورد بەکاربێنێت، جیاوازیەکی زۆر بەدیدەکات.

نۆیەم: دەستکەوتن و پەیداکردنی سەروەت وسامانیان بۆ دەڕازێنێتەوە بە هەموو شێوازێکی سەخت و دژوار، وە هانیان دەدا بۆ دەستبەسراگرتنی هەموو ئەو ماڵ و موڵکەی کە کەسی ناپاك وخیانەتکار هەیەتی لە گەڵ سوێندانیدا، بەڵام ڕاست ئەوەیە کە بەڵگەگەلێکی ڕاست و دروست و یەکلاکەرەوە لە سەر ناپاکی ئەو کەسە دامەزرێنێت، نەك بە شێوازێکی ناشەرعی مامەڵەی لە گەڵدا بکرێت.

لە پێشەوای موسڵمانانەوە (عمر)ی کوڕی (عبدالعزیز) بۆمان باسکراوە کە گەنجێك بۆی نووسی: کەسانێك ناپاکیان لە ماڵی خوادا کردووەو، ناتوام ئەوەی بە دەستیان کەوتووە لێیان وەرگرمەوە، مەگەر سزایان بدەم. ئەویش بۆی نووسی: حەز دەکەم ئەوان بە خیانەت و

ناپاکیەکەیان بگەڕێنەوە بۆ لای خوای تعالی بەڵام خۆم بـە خـوێن ڕشـتنی ئەوانـەوە بـۆ لای نەگەڕێمەوە(٢٠٢).

دەیەم: بەخشین و خەیرو چاکەداری و صەدەقەیان بۆ دەرازێنێتەوە پاش بە زۆر داگیرکردنی سـەروەت وسـامانی خـەڵکی، وایـان پێـشان دەدات کـە بەخـشین تـاوانی داگیرکردنەکـە دەسڕێتەوەو، دەڵێت: دیرهەمێکی بەخشین تـاوانی بە زۆر داگیرکردنی دە دیرهەم دەسڕێتەوە.

ئەمە مەحاڵە، چونکە تاوانی بە زۆر داگیرکردنەکە ماوەو، بەخشینی دیرهـەم ئەگـەر لـە ڕێگەی بە زۆر داگیرکردنـەوە بەدەسـتهاتبوو بـەلای خـواوە قبـوڵ نییـە، هـەروەها ئەگـەر بەخشینەکە لە سەروەت و سامانی حەڵاڵیشەوە بێت، دیـسان تـاوانی بـە زۆر داگیرکردنەکـە لانابات، چونکە بەخشین بە هەژاران پەیوەستبوونی ئەستۆی مرۆڤ بە مافی کەسـێکی تـرەوە پاك ناکاتەوە بەڵکو تاوانەکەی لە ئەستۆدا دەمێنێتەوە.

یازدەیەم: لە گەڵ سووربوون لە سەر تـاوان و سەرپێـچیەکان دیـدەنی پیـاو چـاکانیان بـۆ دەرازێنێتەوەو، داوا لەو پیاوچاکانە دەکەن نزای خەیریان بۆ بکەن و، وایان بە خەیاڵدا دێنێت کە ئەم دیدەنیە تاوانی سەرپێچیەکان سووك دەکاتەوە، بەڵام هەرگیز ئـەم خـەیرە ئـەو شـەڕە لانابات.

دوازدەیەم: هەندێ لە کاربەدەستان بۆ سەرووتری خۆیان کار دەکـەن، بۆیـە کـە فـەرمانی ستەم پێکردنی پێ دەدات، سـتەم دەکـات و، ئیبلیـسیش سـەریان لێدەشـێوێنێت وایـان بـە خەیاڵدا دێنێت کە تاوانەکە لە سەر ئەمیری سەرەوەی خۆیەتی و ناکەوێتە ئەستۆی ئەم.

بەڵام ئەمـە پووچـە، چـونکە یارمەتیـدەرە بـۆ جێبـەجێکردنی سـتەم و، هـەر کەسـێك یارمەتیدەر بێت بۆ جێبەجێکردنی سەرپێچیەکانی کەسانی تر ئەوا خۆشی بـە سەرپێـچیکارو یاخی دەژمێردرێت، چونکە پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ لە مەی خواردنـەوەدا

---

٢٠٢ _ ئەمە: ئەوپەڕی دادپەروەریە، هەروەها لوتکەی لە خواترسان و خواپەرستی و دوورکەوتنەوەیە لـە تاوان.

نـەفرینی لـە دە کـەس کـردووە(٢٠٣)، هـەروەها ((لعـنَ آكـل الربـا، وموكِلَـهُ، وكاتِبَـهُ، و شـاهديهِ))(٢٠٤) واتـە: ((نـەفرینی لـە سـووخۆرو، کەسـی سـوودەرو، نووسـەرو، هـەردوو شایەتەکەی کردووە)).

هەروەها لەم بوارەدا کاربەدەست هەڵدەستێت بە وەرگرتنی بـاجی سـەروەت وسـامان بـۆ کەسی سەرووتری خۆی، ئەگەرچی دەزانێت فەرمانڕەواکەی ئەو ماڵ و سامانە بە فـیڕۆ دەدات و، خیانەت و ناپاکی دەکات، بۆیە ئەمەش دیسان یارمەتیدەری سەر ستەمکرنە.

(مالك)ی کوڕی (دینار) دەیفەرموو: بەسە بۆ کەسێك بە خیانـەتکارو ناپـاك لـە قەڵـەم بدرێت کە دەبێت بە سەرڕاستی ناپاکان.

خوای تعالی ڕێنمویکارە بۆ ڕێگەی ڕاست.

---

٢٠٣ _ أخرجـه أبـوداود (٣٦٧٤)، وأحمـد (٢ / ٧١)، والطيالـسي (١٩٥٧)، والطحـاوي في ((مـشكل الآثار)) (٤ / ٣٠٦)، والبيهقي (٨ / ٢٨٧) " من طرق عن ابن عمر. وهو صحيح.

٢٠٤ _ رواه مسلم (٩٥٥ _ مختصره) عن جابر.

# بەشی هەشتەم

## باسی سەرلێشێواندنەکانی ئیبلیس بەرامبەر بە خواپەرستان لە پەرستنەکاندا

نووسەر دەفەرمێت:

بزانە ئەو دەروازە گەورەیەی کە ئیبلیس پیایدا دەچیتە ژوورەوە بۆ سەرلێشێواندنی خەڵك نەفامیە، ئیبلیس زۆر بە ئارامی پیایدا دەچێتە ژوورەوە بۆ سەرلێشێواندنی نەفامان، بەڵام زانا، ئیبلیس توانای چوونە ژوورەوەی نییە بۆ سەرلێشێواندنی، مەگەر بەدزیەوە، ئیبلیس کەمی زانستی زۆرێك لە نەفامانی بەکارهێناوە بۆ سەرلێشێواندنیان، چونکە تێکڕایان کار بە جۆرەکانی پەرستن دەکەن و، بەتەواوەتی خۆیان لە فێربوونی زانستدا چاك و تۆکمە نەکردووە.

سەرەتای سەرلێشێواندنەکانی ئیبلیس بەرامبەر بەم کۆمەڵە ئەوەیە کەوا پەرستنەکان لە فێربوونی زانست پەسەندتر دەکەن و بەچاکتری دادەنێن، بەڵام گومانی تێدا نییە کە فێربوونی زانست لە ئەنجامدانی (النافلة)کان _ هەر پەرستنێك ئەنجام بدرێت زیاد لە (واجب)ی بنەڕەت _ چاکترە، وای بە خەیاڵدا هێناون کە مەبەست بە زانست کارو کردەوە ئەنجامدانە، لە کردەوەکانیش تەنها ئەو کردەوانە تێگەشتوون کە بە ئەندامەکانی لەش ئەنجام دەدرێت، نەیانزانیوە کە کردەوە کردەوەی دڵەو، کردەوەی دڵیش لەو کردەوانە چاکترە کە بە ئەندامەکانی لەش ئەنجام دەدرێت.

(مُطَرِّف)ی كوڕی (عبدِالله) فەرموویەتی: فەزڵی فێربوونی زانست لە فـەزڵی عیبـادەت و پەرستن خەیرترە (٢٠٥).

(یوسُف)ی كوڕی (أسـباط) فەرموویەتی: دەوازەیەكی زانست كە فێـری دەبـی لـە حـەفتا غەزا چاكترە.

(المُعافَی)ی كوڕی (عِمْران) فەرموویـەتی: نووسـینی یـەك فـەرموودە لـە شـەو نوێـژێك بەلامەوە خۆشەویسترە.

نووسەر دەفەرمێت:

كاتێ ئیبلیس توانی بەم سەرلێشێواندنەوە بەسەرداپاندا تێپەڕێ و، ئەوانیش هەستان بـە پەسندتركردنی ئەو پەرستنانەی كە بە ئەندامەكانی لەش ئـەنجام دەدرێـت بەسـەر فێربـوونی زانستدا، ئەوجا ئیبلیس بە توانابوو زۆر بە سانایی لە هەموو جۆرەكـانی پەرسـتندا سـەریان لێبشێوێنێت.

---

٢٠٥ _ رواه عنه أبوخيثمة في ((العلم)) (رقم ١٣).

وقد صحع مرفوعاً: أخرجه البزار (رقـم ١٣٩)، والحـاكم (١ / ٩٢ _ ٩٣)، والطبراني في ((الأوسـط)) (ق ٢٠ _ مجمع البحرين)، وأبونعيم في ((حلية الأولياء)) (٢ / ٢١١ _ ٢١٢)، والبيهقي في ((المدخل)) (رقـم ٤٥٥) " من طريق عبدالله بن عبدالقدوس عن الأعمش عن مُطَرِّف عن حذيفة.

وسنده محتمل التحسين.

وله طريق أخرى:

أخرجها الحاكم (١ / ٩٢)، والبيهقي في ((المدخل)) (رقم ٤٥٤)، وفي ((الزهـد)) (رقـم ٢٠٣) " مـن طريـق حمزة الزيات عن الأعمش عن الحكم بن عُتبة عن مصعب بن سعد عن أبيه.

وسنده حسن.

## * باسی سەرلێشێواندنەکانی ئیبلیس بەرامبەر بەم کۆمەڵە لە خۆپاکردنەوەداو ئەو شتانەی کە لە پێش و پاشی مرۆڤەوە دەردەچێت ( الأستطابة والحَدَث ):

لەم بارەوە: فەرمانیان پێدەدا زۆر لە ئاودەستخانەدا بمێننەوە ، ئەوەش زیان بە جگەر دەگەیەنێت، لە ڕاستیدا پێویستە مانەوە تا ئەندازەیەك بێت.

پاشان کەسانێك هەڵدەستن و، ڕێدەکەن و، دەکۆکن و، پێیەکی بەرز دەکاتەوەو ئەویتر دادەنێتەوە، بە لایەوە بەم شێوە خۆی پاك دەکاتەوە لە پاشماوەی ئەو میزەی لە ئەندامی نێرینەیدا ماوەتەوە ، بەڵام چەند ئەم کردارە زیاتر ئەنجام بدات، میزەکە بەردەوام دادەبەزێت!!

بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم شتە دەڵێین: ئاو دەپاڵێورێتە نێو میزڵدان و، تیایدا کۆ دەبێتەوە، ئەگەر مرۆڤ بۆ میزکردن ئامادەبوو، ئەوەی کۆبۆتەوە دەردەچێت، بۆیە ئەگەر ڕێبکات و بکۆکێت و بوەستێت، بەردەوام هێندی تری میز دەپاڵێورێتە نێو میزڵدان، چونکە پاڵاوتنەکە ناوەستێت، لە ڕاستیدا بەسە بۆ مرۆڤ لە نێوان دوو پەنجەیدا ئەندامی نێرینەی خۆی بدۆشێت و، دوای ئەوەش بە ئاو بیشوات.

ئیبلیس بۆ کەسانێکی تر بەکارهێنانی ئاوێکی زۆریان بۆ دەڕازێنێتەوە، کەچی لە ڕاستیدا پاش نەمانی سەرچاوەی پیسیەکە حەوت جار ئاو بە سەراکردنی بەسە بە پێی توندترین ڕێباوەڕەکان ! ئەگەر بەردیشی بەکارهێنا بۆ جێگەیەك لە دەرەچەی مرۆڤ تێپەڕ نەبێت، سێ بەردی بەسە ئەگەر خۆی پێ پاك کردەوە، هەرکەسیش ڕازی نەبێت بەوەی شەرع پێی ڕازی بووە، لەڕووی شەرعەوە بیدعەچیەو شوێنکەوتەکاری خواو پێغەمبەرەکەی نییە.

والله الموفق.

## ✸ باسی سەرلێشێواندنەكانی ئیبلیس بەرامبەر بە مرۆڤ لە بواری دەستنوێژ شتندا :

ئیبلیس لە بواری نیێت هێناندا سەر لە كەسانێك دەشێوێنێت، بۆیە تەماشا دەكەیت ئەو كەسە دەڵێت: (أرفعُ الحدث) واتە: تارات دەشۆم، پاشان دەڵێت: (أستبيح الصلاة) واتە: نوێژ حەڵاڵ دەكەم، پاشان دوبارەی دەكاتەوەو دەڵێت: (أرفع الحدث)!

هۆكاری ئەم سەرلێشێواندنەش نەفامبوونە بە شەرع، چونكە نیەت بە دڵە نەك بە گوتن، بۆیە جێبەجێكردنی بە گوتن شتێكی پێویست نییە، پاشان دووبارەكردنەوەی دەستەواژەكە هیچ مانایەكی نییە.

سەر لە كەسانێكیش دەشێوێنێت بە تێڕوانینی ئاوی دەستنوێژەكەو، دەڵێت: چۆن دەزانیت ئەم ئاوە پاكەو ؟ بەو جۆرە هەموو ئیحتمالێكی دووری بە خەیاڵدا دێنێت، كەچی بەسیەتی تەماشای فەتوای شەرعی بكات كە وای داناوە بنەڕەت لە ئاودا پاكێتیەو، بە ئیحتمال واز لە بنەڕەت ناهێنرێت.

سەر لە كەسانێكیش دەشێوێنێت بە بەكارهێنانی ئاوی زۆر، ئەم شتە چوار شتی (مَكروه) كۆدەكاتەوە:

بەفیڕۆدانی ئاو.

بە سەربردنی تەمەنی بەنرخ لە شتێكدا كە نە (واجب)و نە سوننەتە.

چوونە دەرەوە لە سنووری شەریعەت، چونكە ڕازی نەبوو بەوەی شەریعەت پێی ڕازی بووە سەبارەت بە بەكارهێنانی ئاوی كەم.

دەچێتە نێو شتانێكەوە كە شەریعەت قەدەغەی كردووە وەكو زیاد لە سێ جار ئاو بەكارهێنان.

پێدەچێ دەستنوێژەكە درێژ بكاتەوەو، كاتی نوێژەكەش تێپەڕێت، یا سەرەتای نوێژەكەی لە دەست بچێت، كە چاكەی زیاتری تیدایە، یا نوێژە بە كۆمەڵەكەی لە دەست بچێت.

ئیبلیس بەوە سەری لێ دەشێوێنێت کە پێی دەڵێت تۆ بەو دەستنوێژ شتنە لە پەرستنێکدای ئەکەر دروست نەبێت نوێژەکەت دروست نابێت.

بەڵام ئەگەر بە وردی سەرنجی کارویاری خۆی بدایە، دەیزانی لە سەرپێچی و کەمتەرخەمیدایە، کەسانێکیشمان بینی بە وردی دیقەتی ئەم دوودڵی و ئەندێشە خراپانە دەدات بەڵام بە تەنگی خواردن و خواردنەوەکەیەوە نایەت و، زمانیشی لە غەیبەتکردن ناپارێزێت، بەڵام خۆزگە کارەکەی پێچەوانە بکردایەتەوە، لە فەرموودەدا هاتووە:

عن عبدالله بن عمرو بن العاص أن النبيّ _ صلى الله عليه وسلم _ مرَّ بسعدٍ وهو يتوضأ، فقال:

((ما هذا السَّرَفُ يا سعدُ ؟)).

قال: أفي الوضوء سَرَفٌ؟

قال: ((نعم، وإنْ كُنْتَ على نهرٍ جارٍ))(٢٠٦). واتە: (عبدالله)ی کوڕی (عمرو)ی کوڕی (العاص) فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ بەلای (سعد)دا تێپەڕ بوو کە دەستنوێژی دەشت و، فەرمووی:

((ئەم بە فیڕۆدانە چییە ئەی (سعد) ؟)).

ئەویش فەرمووی: دەستنوێژ شتنیش بەفیڕودانی تێدایە ؟

فەرمووی: ((بەڵێ، ئەگەر بە سەر دەریایەکی لە بەر ڕۆشتوشەوە بیت)).

---

٢٠٦ _ رواه ابن ماجة (٤٢٥), وأحمد (٧٠٦٥) " من طريق قُتيبة بن سعيد عن ابن لهيعة عن حُيَيّ المعافري عن عبدالرحمن الحُبُلي عن ابن عَمْرو به.

وسنده حسن " لما قيل في حُيَيّ.

وقد ذكرتُ في غير هذا الموضع أن رواية قُتيبة عن أبن لهيعة منتقاة، فهو صحيحة إن شاء الله.

وبهذا أخذَ شيخُنا أخيراً _ ولله الحمد.

وعن أبي نعامَةَ أنَّ عبدالله بن مُغَفَّل سمع ابنه يقول: اللهمَّ إنِّي أسألُكَ الفردوسَ، وأسألُك القصرَ الأبيضَ عن يمينِ الجنةِ إذا دخَلْتُها ! فقالَ عبدُالله: سَلِ اللهَ الجَنَّةَ، وتعَوَّذْ بهِ مِن النارِ، فإنِّي سمعتُ النبيَّ _ صلى الله عليه وسلم _ يقولُ:

((سَيكونُ في هذه الأمةِ قومٌ يعتدونَ في الدعاءِ و الطهورِ)) (٢٠٧). واته: (أبي نعامة) دەفەرمێت: (عبدالله)ی کوڕی (مُغَفَّل) گوێبیستی کوڕەکەی خۆی بوو دەیفەرموو: پەروەردگارا داوای فیردەوست لێ دەکەم، داوای تەلارێکی سپیت لێ دەکەم بەلای ڕاستی بەهەشتەوە بێت ئەگەر چوومە بەهەشتەوە! (عبدالله)ش فەرمووی: لە خوا داوای بەهەشت بکەو، پەناشی پێ بگرە لە ئاگر، چونکە گوێبیستی پێغەمبەری خوا بووم _ صلى الله عليه وسلم _ دەیفەرموو:

((کۆمەڵێك لە ئومەتەکەم پەیدا دەبن لە نزاکردن و خۆپاکردنەوەدا سنوور دەبەزێنن)).

لە (ابن شَوْذَب)ەوە دەڵێت: (الحسن) تانەی لە کەسانێك دەداو دەیگوت: کەسانێك بە مەشکەیەك ئاو دەستنوێژ دەشۆن، بە شەڵتەیەکیش خۆیان دەشۆن، ئاو بە خویاندا دەکەن و ئاو بە خۆیاندا دەکەن و، دەست بەخۆیاندا دەهێنن و دەست بەخۆیاندا دەهێنن، ئەشکەنجەی خۆیان دەدەن و پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ کاردەکەن.

(أبوالوفاء)ی کوڕی (عقیل) دەڵێت: چاکترین دەستکەوت بەلای ژیرانەوە کاتە (٢٠٨) کەمترین شتێکیش پەرستنی پێوە بکرێت ئاوە.

لە خوو ڕەفتاری پێغەمبەری خواوە _ صلى الله عليه وسلم _ نەزانراوە پەرستنی بە زۆری بە کارهێنانی ئاوەوە کردبێت.

---

٢٠٧ _ رواه أبو داود (رقم ٩٦)، وابن ماجة (٣٨٦٤)، وأحمد (٤ / ٨٦).

وسنده صحيح.

وفي الباب عن سعد بن أبي وقاص:

رواه الطيالسي (ص ٢٨)، وأحمد (١٤٨٣)، وأبوداود (١٤٨٠)، والدورقي في ((مسند سعد)) (٩١)، وفيه جهالةٌ.

٢٠٨ _ ولي رسالة لطيفة فيها جلاءُ هذه المسألة المهمة، وبيان مدى قيمتها في حياة المسلم، اسمها: ((المؤتَمَن في بيان قيمة الزمن))، يسر الله إتمامها ونشرها.

## ✸ باسی سەرلێشێواندنەكانی ئیبلیس لە بواری بانگداندا :

لەو سەرلێشێواندنە لەرانەوەی دەنگە لە بانگداندا.

ئەمەش (مكروه) بووە بەلای پێشەوا (مالك)ی كوڕی (أنس) و زانایانی دیكەوە بە كەراهەتێكی توند، چونكە بانگەكە لە جێگەی قەدرو ڕێزەوە دەردەچێنێ بۆ چواندنی بە گۆرانی.

لەم بارەشەوە بانگی بەیان تێكەڵ بە زیكرو (سبحان الله) و وەعز دەكەن (٢٠٩)، بە جۆرێك بانگەكە دەخەنە ناوەڕاستەوەو، تێكەڵ دەبێت، بەلای زانایانەوە (مكروه) بووە هەر شتێكی زیاد بخرێتە سەر بانگ (٢١٠).

كەسانێكیشمان بینیوە شەوان بە زۆری لە سەر منارەی مزگەوتەكان دەوەستێت و، وەعزوو ئامۆژگاری پێشكەش دەكات و، خواپەرستی بیری خەڵك دەخاتەوە، كەسانێكیش لەوانە سورەتێكی قورئان بە دەنگێكی بەرز دەخوێنێتەوەو، نووستن لە خەڵك قەدەغە دەكاتو، خوێندنەوە لە كەسانی شەو نوێژیش تێك دەدات، هەموو ئەمانە ناپەسەندەو خوای تعالی نایەوێت.

---

٢٠٩ _ وەكو باروحاڵی وەڵاتی خۆمان، بۆیە سكاڵای خۆمان بۆ لای خوای تعالی بەرز دەكەینەوە سەبارەت بە خراپبوونی باروحاڵ.

٢١٠ _ لە نامیلكەیەكمدا بە ناوی ((الإيذان بمهمَّات مسائل الأذان)) وردكاری و درێژەپێدانێكی زۆرم داوە بەو شتانەی كە نووسەر لێرەدا بە پوختی و بە كورتی لێی دواوە.

## ✱ باسی سەرلێشێواندنەکانی ئیبلیس بەرامبەر بە مرۆڤ لە پاکی و خاوێنیدا:

لەم بارەوە ئیبلیس سەریان لێدەشێوێنێت سەبارەت بەو پۆشاکەی کە بۆ خۆداپۆشین بەکاردەهێنرێت، بۆیە کەسانێکیان بەدیدەکەیت جلی پاك چەند جارێك دەشواتەوەو، ڕەنگە موسڵمانێك دەستی لێبات جلەکەی بشواتەوە.

هەشیانە جلەکانی لە ڕووباری دیجلەدا دەشوات، چونکە بە بۆچونی خۆی شتنی لەماڵەوە جێگەی ئەوە ناگرێتەوە.

هەشیانە جلەکانی بۆ نێو بیرەکە شۆڕ دەکاتەوە، بە هاوشێوەی ڕەفتاری جولەکە !

هاوەڵانی پێغەمبەری خوا _ صلی الله علیەوسلم _ ئەم ڕەفتارەیان ئەنجام نەدەدا، بەڵکو کاتێ وەڵاتی فارسیان ڕزگارکرد بە پۆشاکی ئەوانەوە نوێژیان دەکرد، هەروەها ڕاخەرو نوێن و جلەکانی ئەوانیان بەکاردەهێنا.

کەسانێکی دودڵ و بەگومان کە دڵۆپێکی ئاوی بە سەردا دەتکێت، هەموو پۆشاکەکەی دەشوات و، ڕەنگە بە هۆی ئەوەوە لە نوێژی بە کۆمەڵیش دواکەوێت.

لەوانە کەسانێك واز لە نوێژی بە کۆمەڵ دەهێنن بەهۆی بارانێکی کەمەوە، لەوە دەترسن ئاوپرژێنیان بکات.

با هیچ کەسێك گومانی وانەبات من قەدەغەی پاکێتی و خۆپاراستن دەکەم ! بەڵام زێدەڕۆیی زیاد کە لە سنووری شەرع دەچێتە دەرەوەو کات بەفیڕۆ دەدات ئەوەیە کە قەدەغەی خەڵکی لێدەکەین.

هەروەها لە نیێتی نوێژدا ئیبلیس سەریان لێدەشێوێنێت، کەسانێکیان دەڵێت: فلان نوێژ دەکەم، پاشان ئەمە دووبارە دەکاتەوە، چونکە بە بۆچونی خۆی نیێتەکەی بەتاڵ کردۆتەوە، نیێتیش بەتاڵ نابێتەوە، ئەگەرچی هیچ قایلبونێك لە نێوان زانایاندا بەدیناکرێت سەبارەت بە زمان گوتنی نیێت.

هەشـیانە (الله أکـبر) دەکـات، پاشـان هەڵیدەوەشـێنێتەوە، پاشـان (الله أکـبر) دەکـات، پاشانیش هەڵی دەوەشێنێتەوە، ئینجا کە ئیمام چووە ڕکـوع، کەسـی دودڵ و بـەگومـان (الله أکبر) دەکات و، لە گەڵیدا دەچێتە ڕکوع !

باشە خۆزگە بزانیبا ئەو کاتەی لە گەڵ پێشەوادا چووە ڕکوع چ شتێك نێتەکەی بۆ هێنـاو چەسپاندی ؟! بەڵام با بزانین ئـەوە هـــــیچ شـتێك نییـە تـەنها ئـەوە نـەبێ کـە ئیبلـیس ویستویەتی چاکەو فەزیڵەتەکەی لە کیس بات.

کەسانێك لە دودڵ و بەگومانەکان سوێند دەخوات: کە جگە لەم جارە (الله أکبر) ناکەم، تا ئەو ئاستەی کەسانێکیان سوێند بەخوا دەخوات کە ئەگەر (الله أکبر)ی دووبارە کردەوە واز لە سەروەت وسامانەکەی دەهێنێ، یا خێزانەکەی تەڵاق دەدات !

هەموو ئەمانە لە سەرلێشێواندنەکانی ئیبلیسەوەیە.

شەریعەتیش نەرمونیان و ئاسان و سانایەو، لەم بەڵایانەوە بەدوورە، پێغەمبـەری خـوا _ صلی الله علیه وسلم _و هاوەڵانی شتێك لەمانەیان تووش نەبووە.

لە (أبي حـازم)ەوە بۆمـان دەگێڕنەوە کە جارێکیان چـووە مزگەوتـەوە، ئیبلـیس دودڵـی و گومانی بۆ دروست کرد، کەوا بەبێ دەستنوێژ نوێژ دەکەیت، ئەویش گوتی: ئامۆژگاریت بـەم ئاستە نەگەشتووە !

بۆ بەدەرخستنی ئەم جۆرە سەرلێشێواندنە بە کەسی دودڵ و بـەگومان دەگوترێـت: ئەگـەر دەتەوێت نێت بێنی، نێت هێنراوە، چونکە هەسـتای نوێـژە فەرزەکـە بکـەیت، ئەمـە خـۆی نێتەو، جێگەکەشی دڵە (٢١١) نەك بە گوتن، وە ئەگەر دەتەوێت گوتنەکەت ڕاست بکەیتەوە، گوتنی پێویست نییە، پاشانیش بە دروستی گوتوتە، ئیتر بۆ دووبارەی دەکەیتەوە ؟

---

٢١١ _ زۆرێك لە کەسانی ئاسایی و، کەسانی ((هەڵگری بڕوانامەش)) دەبیـنین پـێش (تکـبیرة الأحـرام) دەوەستێت کۆششی نێت هێنان دەکات و، بە پەلە پەل و منگـە مـنگ قـسە بـە هەنـدێ وشـەی نادیـار دەکات، و.... و....، هەموو ئەمانە لە ئایندا هیچ بنەڕەتێکیان نی یە، وەکو ئـەوەی نووسـەر ئامـاژەی پێداوە.

نووسەر دەفەرمێت:

هەندێ لە شێخەکان باسێکی سەرسوڕمێنیان لە (ابن عقیل)ەوە بۆ گێڕامەوە کەوا پیاوێك چاوی پێ کەوت و، گوتی: من ئەندامێکم دەشۆم و دەڵێم: نەمشتووە، (ألله أکبر) دەکەم و، دەڵێم: (الله أکبر)م نەکردووە. (ابن عقیل)یش پێی فەرموو: کەوابوو واز لە نوێژ بێنە، لە سەر تۆ (واجب) نیە !

کۆمەڵێکیش بە (ابن عقیل)یان گوت: چۆن ئەوە دەڵێی ؟ ئەویش پێی فەرموون: پێغەمبەری خوا _ صلی الله علیه وسلم دەفەرمێت:

((رُفِعَ القلمُ عن المجنونِ حتى يفيق))(٢١٢) واتە: ((پێنووسی سەپاندن(التکلیف)و سەرزەنشتکردن لە سەر شێت هەڵگیراوە تا بە هۆش خۆی دێتەوە)).

بۆیە هەرکەس (الله أکبر) بکات و، بڵێت: (الله أکبر)م نەکردووە، ئاقڵ وژیر نییە، شێتیش نوێژی لە سەر (واجب) نییە.

نووسەر دەفەرمێت:

بزانە کە هۆکاری دودڵیی و بە گومانی لە نیێتدا تەنها خەم و خەفەتێکە (خَبَلٌ) لە بیروهۆشی مرۆڤدا دەخولێتەوەو، نەفامیەکیشە بە شەرع، بەلای هەمووانەوە زانراوە ئەگەر زانایەك هاتە دیدەنی کەسێك و، ئەویش لە پێشیدا هەستاو (٢١٣)، گوتی: نیێتمە هەڵدەستم وەکو ڕێزگرتنێك بۆ هاتنە ژوورەوەی ئەم زانایەو لە بەر ئەو زانستەی پێیەتی و بەدەم و چاوم

---

٢١٢ _ رواه أبوداود (٤٣٩٨)، والنسائي (٣ / ١٠٠)، والدارمي (٢ / ١٧١)، وابن ماجة (٢٠٤١)، وأحمد (٦ / ١٠٠ _ ١٠١ و ١٤٤) " من طريق الأسود عن عائشة، بألفاظ قريبة. وسنده صحيح. وفي الباب عن عدة من الصحابة، ينظر له ((نصب الراية)) (٤ / ١٦٢).

٢١٣ _ مەسەلەی هەستان لە پێشی کەسێکدا کە دێتە ژوورەوە _ نووسەر نموونەیەکی بۆ هێناوەتەوە _ لە کۆنەوە زانایان جیاوازیان لە سەر ئەم مەسەلە هەبووە. ڕای ڕاستیش بەلای ئێمەوە (مکروە)ە، بەدەر لە پێشوازیکرنی ڕێبوارێك، یا چاوپێکەوتنی میوانێك بۆ ئەوەی لە شوێنی خۆیدا دایبنیشێنێت و، هتد، کە هیچ پەیوندیەکی بەو بوارانەوە نەبێت کە بە هۆیەوە خەڵکی هەڵدەستن بە شێوەیەکی ئاسایی.

رووی تێدەکەم، دڵنیابن ئەو کەسە بە گێل و گەمژە لە قەڵەم دەدرێت، چونکە ئەمەی لە بیروهۆشدا بۆ دروست بوو لەو کاتەوەی زاناکەی بەدیکرد.

بۆیە هەستانی مرۆڤ بۆ بە جێهێنانی فەرزێکی نوێژ کارێکە لە نەفسی مرۆڤدا دروست دەبێت، لە یەك باروحاڵداو، زەمەنەکەشی درێژە ناکێشێت، بەڵام زەمەنی ڕێکخستنی دەستەواژەی گوفتارەکانی نێت هێنان درێژە دەکێشێت، بە گوفتار نێت هێنانیش پێویست نییەو، دودڵی و بەگومانیش نەفامیەکی پەتیە.

کەسی دودڵ و بە گومان خۆی ماندوو دەکات بۆ ئەوەی لە دڵیدا ڕوپامایی و، بەجێهێنانو، فەرزیەتی نێتەکە لە یەك باری وردی درێژی فراوان لە ئاخاوتندا ئامادە بکاتو، لە دڵی خۆشیوە دەیڵێتەوەو، ئەوەش مەحاڵە، ئەگەر خۆی ماندوو بکردایەو ئەوەی بۆ هەستان لە پێشی زاناکەدا بگوتایە، بەلایەوە قورس دەبوو!

بۆیە هەرکەس ئەمە بزانێت، نێتیش دەزانێت.

پاشانیش شیاوە نێت پێشی (الله أكبر) بخرێت بە زەمەنێکی کەم، بە مەرجێك هەڵی نەوەشێنێتەوە.

ئیتر بۆچی مرۆڤ خۆی ماندوو بکات و نێتەکە بە (الله أكبر)ەکەوە بلکێنێت، چونکە ئەگەر پێشتر نێتی هێناو، هەڵینەوەشانەوە، با دڵنیابێت کە بە(الله أكبر)ەکەوە لکاوە.

وعن مِسْعرٍ قالَ: أخرجَ إليَّ مَعْنُ بنُ عبدالرحمنِ كتاباً، وحَلفَ باللهِ إنَّه خَطُّ أبيهِ، وإذا فيهِ: قالَ عبَاللهِ: والذي لا إلهَ غيرُه ما رأيْتُ أحداً أشدَّ على المتنطعِينَ مِن رسولِ اللهِ _ صلى الله عليه وسلم _، ولا رأيْتُ بعدَهُ أشدَّ خوفاً عليهِم مِن أبي بكرٍ، وإنِّي لأظُنُّ عُمَرَ كانَ أشَدَّ أهلِ الأرضِ خوفاً عليهِم (٢١٤).

---

٢١٤ _ رواه الطبراني في ((الكبير)) (١٠٣٦٧)، والدارمي في ((سننه)) (١ / ٥٣).

وقال الهيثمي في ((مجمع الزوائد)) (١٠ / ٢٥١):

((ورجاله ثقات)).

قلت: وسنده صحيح.

له (مِسْعرٍ)ەوه دەڵێت: (مَعْنُ)ی كوڕی (عبدالرحمن) كتێبێكی بۆ دەرهێنـام و، سـوێندی خوارد كه به دەست و خەتی بابی نووسراوە، تیایدا نووسرابوو: (عبدالله) دەڵێت: سـوێند بـەو خوایەی كه هیچ هاوەڵێكی نییه هیچ كەسێكم نەبینیووه ئەوەندەی پێغەمبەری خوا _ صـلی الله علیه وسلم _ توند بێ بەرامبەر بەو كەسانەی زۆر له خۆیان دەكەن و له سنوور دەردەچن له قسەو ڕەوانبێژی دەربڕیندا، پاش ئەویش هیچ كەسێكم نەبینیوه ئەوەنـدەی ئیمـامی (أبـي بكر) بۆیان ترسابێ، واش دەزانم ئیمامی (عمر) لەهـەموو خـەڵكی سـەر زەوی زیـاتر بۆیـان دەترسا نەوەكا بەهۆی ئەوەوە تووشی شتێكی نەویستراو بن.

## ✵ ئیبلیس له نوێژدا سەریان لێ دەشێوێنێت:

کەسانێکی دوو دڵ و بەگومان ئەگەر نیەتەکەشی دروست بێت و، (الله أکبر) بکات، بیروهۆشی بەلای نوێژەکەیەوە نابێ، وەکو ئەوەی مەبەست بە نوێژکردن تەنها (الله أکبر) بێت.

ئەمە سەرلێشێواندنێکە بەوە ئاشکرا دەبێت کە (الله أکبر) دەویسترێت بۆ چوونە نێو پەرستنەکەوە، ئیتر چۆن پەرستنەکە پشت گوێ بخرێت کە وەکو مالێکەو، مرۆڤ تەنها خۆی بە پاراستنی دەرگاکەوە خەریك بکات ؟!

کەسانێك لە دودڵ و بەگومانەکان (الله أکبر)ی بۆ دروست دەبێت لە پشتی پێشەوای نوێژەوە، بەڵام ڕکاتی یەکەم کەمی ماوەو ئەویش هەتاوەکو (دعاء الأستفتاح)و، (أعوذ بالله من الشیطان الرجیم) دەخوێنێت، پێشەوا دەچێتە ڕکوع.

ئەمەش دیسان سەرلێشێواندنە، چونکە کە دەستیکرد بە خوێندنی (دعاء الأستفتاح) و (أعوذ بالله من الشیطان الرجیم) دەستیکرد بە بەجێهێنانی دوو سوننەت، بەڵام وازی لە یەکسەر خوێندنی سورەتی (الفاتحة)ی هێنا کە کارێکی پێوستە بۆ نوێژخوێن بەلای زۆربەی زانایانەوە، بۆیە دەبێ سوننەتی پێش نەخرێت ئەگەر ماوەی ڕکاتی یەکەم کەمی مابوو.

نووسەر دەفەرمێت:

لە زەمەنی منداڵیمدا لە پشتی شێخمانەوە (أبوبکر الدِّینَوَرِيّ) فیقهزانەوە نوێژم دەکرد، جارێکیان بەدیکردم ئەوەم دەکرد، ئەوەبوو پێی فەرمووم: کورِم ! زانایان ڕایان جیاوازبوو سەبارەت بە (واجب)یتی خوێندنی سورەتی (الفاتحة) لە پشتی پێشەواوە، بەڵام جیاوازیان لە نێواندا نەبووە سەبارەت بەوەی کە (دعاء الأستفتاح) سوننەتە، بۆیە کار بە (واجب)ەکان بکەو، واز لە سوننەتەکان بێنە (٢١٥).

---

٢١٥ _ واتە: لە کاتی بەراوردکردنیدا بە (واجب)ەکان، نەك بە ڕەهایی واز لە سوننەتەکان بێنێت !

## ✱ وازهێنان له سوننه‌ته‌كان:

ئیبلیس سه‌ری له كۆمه‌ڵانێك شێواندووه‌و، وای لێكردوون واز له زۆرێك له سوننه‌ته‌كان بێنن له به‌ر چه‌ند هۆكارێك له بیروهۆشیاندا دروست بووه:

بۆیه كه‌سانێك له ڕیزی یه‌كه‌می نوێژی به كۆمه‌ڵ دواده‌كه‌وێت و، ده‌ڵێت: له ڕاستیدا مه‌به‌ست ته‌نها نزیكبوونه‌وه‌ی دڵانه.

كه‌سانێكیش له نوێژدا ده‌ست له سه‌ر ده‌ست دانانێت و، ده‌ڵێت: حه‌زم به‌وه نییه دڵكزیه‌كی (الخشوع) ئه‌وتۆ ده‌ربڕم له دڵمدا نه‌بێت.

ئه‌م دوو ڕه‌فتاره‌مان له هه‌ندێ گه‌وره پیاوچاكانه‌وه بۆ باسكراوه !

ئه‌مه كارێكه كه‌می زانستی شه‌رعی دروستی ده‌كات، ففي ((الصحيحين)) من حديث أبي هُريرة _ رضي الله عنه _ عن النبـيّ _ صلى الله عليه وسلم _ أنَّه قالَ:

((لو يعلَمُ النَّاسُ ما لهم في النداءِ والصفِّ الأوَّلِ، ثم لم يَجِدوا إلا أن يَسْتَهِموا عليهِ لاسْتَهَموا))(٢١٦) واته: له (أبي هريرة)ه‌وه _ خوای لێ ڕازی بێت _ فه‌رموویه‌تی: پێغه‌مبه‌ری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ فه‌رمووی: ((ئه‌گه‌ر خه‌ڵكی بیانزانیبا بانگ و ڕیزی یه‌كه‌می نوێژ چیان تێدایه، پاشان ئه‌وه‌یان ده‌ستیان نه‌كه‌وتایه مه‌گه‌ر به‌تیروپشك، دڵنیابن تیروپشكیان بۆ ده‌كرد)).

وفي أفرادِ مسلم من حديثهِ عن النبـيّ _ صلى الله عليه وسلم _ أنَّه قال:

((خيرُ صفوفِ الرجالِ أوَّلُها، وشرُّها أخِرُها))(٢١٧) واته: پێغه‌مبه‌ری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ فه‌رمووی: ((چاكترین ریزی پیاوان یه‌كه‌م ڕیزه‌و، خراپترینیشیان دوا ڕیزه)).

---

٢١٦ _ رواه البخاري (٢ / ١١٦)، ومسلم (١٩١٤).

٢١٧ _ رواه مسلم (٤٤٠).

بەڵام دەست لە سەر دەست دانان لە نوێژدا، سوننەتە، روى أبوداود في ((سننه)) أنَّ ابن الزبير قال: وضع اليدِ على اليدِ من السنَّةِ (٢١٨) واتە: ئیمامی (أبوداود) لە ((سنن))ەكەیدا لە (ابن الزبير)ەوە دەگێڕێتەوە فەرموویەتی: دەست لە سەر دەست دانان لە نوێژدا سوننەتە.

وإنَّ ابنَ مسعودٍ كانَ يُصَلّي، فوضَعَ يدهُ اليُسرى على اليمنى، فرآهُ النبيّ _ صلى الله عليه وسلم _، فوضعَ يدَهُ اليُمنى على اليُسرى (٢١٩) واتە: (ابن مسعود) نوێژی دەكردو، دەستی چەپی لە سەر دەستی ڕاستی دانابوو، پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ كردەوەكەی (ابن مسعود)ی بەدیكرد، بۆیە هەستاو دەستی ڕاستی لە سەر دەستی چەپی دانا.

نووسەر دەفەرمێت:

با بەلاتەوە گران نەبێت كاتێ نكۆڵی لەو كەسانە دەكەین كە دەڵێن: مەبەست نزیكبوونەوەی دڵانە، یا دەست لە سەر دەست دانانێم لە نوێژدا، با لە كەسە گەورەكانیش بێت ! چونكە شەرع نكۆڵیكارە نەك ئێمە.

بە پێشەوا (أحمد)ی كوڕی (حنبل)یان گوت _ بەڕەحمەتی خوا بێت _ (ابن المبارك) ئاوەهاو ئاوەها دەفەرمێت: ئەویش فەرمووی: (ابن المبارك) لە ئاسمان نەهاتۆتە خوارێ !

هەروەها پێیان گوت: (إبراهيم)ی كوڕی (أدهم) دەڵێت. ئەویش فەرمووی: باسی پیاوە بچوكەكانم بۆ دەكەن ؟ كار بە بنەڕەتەكە بكەن !

---

٢١٨ _ رواه أبوداود (٧٥٤)، والمِزّي في ((تهذيب الكمال)) (٩ / ٣٥٠) " من طريق العلاء بن صالح عن زرعة عنه.

وسنده حسن في الشواهد.

٢١٩ _ رواه أبوداود (٧٥٥)، والنسائي (٢ / ١٢٦) بسند حسن.

بۆیە پێویستە واز لە شەرع نەهێنرێت لە بەر گوفتاری کەسێکی بەڕێز لـە دلـدا، چـونکە شەرع بەڕێزو گەورەترە، هەڵەکردنی مرۆڤیش لە لێکدانەوەدا (تأویل) هەر ڕوودەدات، چونکە لەوانەیە ئەو کەسە فەرموودەکانی پێ نەگەشتبێت[٢٢٠].

یبلیس سەری لە کەسانێکی نوێـژخوێن شـێواندووە سـەبارەت بـە (مخارجِ الحروفِ) واتـە چۆنیەتی دەرهێنانی پیتەکان لە شوێن و دەرەچەی ڕاستی خۆی لە زارەوە، بۆیـە ئـەو کەسـە بەدیدەکەیت دەڵێت: الحَمْدُ... الحَمْدُ... بە دووبارەکردنەوەی وشەکەش لە یاسای ئەدەبی نوێـژ دەچێتە دەرەوە.

جـار بـە جـاریش سـەریان لێدەشـێوێنێت کاتێـك جەڕانـدنی پیتـەکان (التـشدید) بـە جێدەهێنێن.

جار بە جاریش لە کاتی گۆکردنی پیتی (ضاد)ی وشەی (المَغْضُوبِ)دا.

دڵنیابن کەسانێکم بینیوە بە جۆرێك وشەی ﴿ المَغْـضوبِ... ﴾ دەخوێنێتەوە کە تفـی نێـو زاری لە گەڵ گۆکردنی پیتی (الضاد)دا دەکاتە دەرەوە بە هـۆی زیـاد جەڕانـدنی پیتەکـەوە، کەچی لە ڕاستیدا تەنها بەجێهێنانی خوێندنەوەی پیتەکەیەو هیچی تر.

ئیبلیس ئەم کەسانە لە سنوری شەرعی خوێندنەوەی قورئان دەباتـە دەرەوە، بەزێـدەڕۆیی کردن لە گۆکردنی پیتەکاندا خەریکیان دەکات، بۆ ئەوەی لە خوێندنەوەکە بە باشی تێنەگەن، هەموو ئەم دودڵی و بە گومانیەش لە ئیبلیسەوەیە.

---

٢٢٠ _ ئەمە داوای لێبوردنێکە لە لایەن نووسەرەوە _ بەڕەحمەتی خوا بێت _ بۆ ئەو کەسانەی کـە بـە هەڵەیان داناوە. ئاشکراشە کە بەهەڵەدانانی کەسی بەرامبەر مانای ئەوە نـی یـە کەسـی بەرامبـەر ئـیتر تووشی تاوان دەبێت، وەکو ئەوەی کە مەسەلەکە بەلای خەڵکـەوە تێکـەڵ و پێکـەڵ بـووەو، سـەریان لـێ شێواوە، بۆیە دەبی باش بیر بکەیتەوە.

بڕوانە پێشەکی کتێبەکەم (توفیق الباري في حکم الصلاة بین السواري) طبع دار ابن القیّم _ الدَّمَّام.

وفي أفرادِ مسلمٍ من حديثِ عثمانَ بن أبي العاصِ قال: قلتُ لرسولِ اللهِ _ صلى الله عليه وسلم _ إنَّ الشيطانَ قد حالَ بيْني وبينَ صلاتي وقراءَتي يلبِّسُها عليَّ، فقالَ رسولُ اللهِ _ صلى الله عليه وسلم _:

((ذاكَ شيطانٌ يُقالُ لهُ: خِنْزَب، فإذا أحْسَسْتَهُ " فتعوَّذْ باللهِ منهُ ثلاثاً، واتْفُلْ عن يسارِك))(٢٢١) واته: (عثمان)ى كوڕى (أبي العاص) فەرمووى: بە پێغەمبەرى خوام _ صلى الله عليه وسلم _ گوت: شەيتان قەدەغەى نێوان من و نوێژەكەم و خوێندنەوەكەى كردووم سەرم لێدەشێوێنێت و گومانم بۆ دروست دەكات، پێغەمبەرى خواش _ صلى الله عليه وسلم _ فەرمووى:

((ئەوە شەيتانێكە بە خينزيب ناو دەبرێت، بۆيە ئەگەر هەستت پىێ كرد، سىێ جار _ أعوذ بالله من الشيطان الرجيم _ بڵێ و، بەلا تەنيشتى چەپى خۆتدا تف بكە)).

ئەو كردەوەم بەجێهێنا، خواى تعالى لێى دورخستمەوە.

ئيبليس سەرى لە خەڵكێكى زۆرى خواپەرستە نەفامەكان شێواندووە، بۆيە وايان بەخەياڵدا دێت كە پەرستن هەستان و دانيشتنە بە تەنهاو هيچى تر، بۆيە لەو بوارەدا بەردەوام خۆيان ماندوو دەكەن، كەچى هەندێ لە (واجب)ەكانى سەر شانيان بەجێ ناهێنن و، بەخۆيان نازانن.

لە كۆمەڵێك وردبوومەتەوە دەبينم سڵاوى نوێژ دەدەنەوە لە گەڵ سڵاودانەوەى پێشەوادا، ئەگەرچى هێشتا (التحيات)ى نوێژەكەيان وەكو پێويستى سەرشانيان نەخوێندووەو هەندێكى ماوە تەواوى بكەن، ئەوەش كارێكە پێشەوا لە جياتى ئەوان تاوانى هەڵێناگرێت.

سەرى لە كەسانێكى تريش شێواندووە، نوێژ درێژ دەكەنەوەو، قورئانى زۆرى تێدا دەخوێنن، بەڵام واز لە سوننەتەكانى نوێژ دەهێنن و، كارگەلێكى (مَكروه)و نەويستراوى تێدا ئەنجام دەدەن.

---

٢٢١ _ رواه مسلم (٢٢٠٣).

دیدەنی کەسانێکی خواپەرستم کرد تەماشا دەکەم بەرۆژ نوێژی سوننەت دەکات، لە خوێندنەوەکەیدا دەنگ بەرز دەکاتەوە، پێم گوت: بەرۆژ بەرزکردنەوەی دەنگ لە خوێندندا (مَکروه)و نەویستراوە([222])، پێی گوتم: بە بەرزکردنەوەی دنگ نووستن لە خۆم دووردەخەمەوە. ئەوەبوو پێم گوت: واز لە سوننەتەکان ناهێنرێت لە بەر نەنووستنی تۆ، بۆیە هەرکات نووستنت بەسەردا زاڵ بوو، بنوو، چونکە نەفسی خۆت هەقی بە سەرتەوەیە.

٢٢٢ _ هەروەها لە شەویشدا، چونکە بنەڕەت لە زیکرو نزاو خوێندندا خوێندنێتی بە نهێنی نەك بە ئاشکرا. لە کۆنیشەوە نامیلکەیەکیم لەو بارەوە نووسیەوە، بەڵکو خوای تعالی کاتی چاو پیاخشاندنەوەیەم بۆ بڕەخسێنێت بۆ ئەوەی بتوانام بڵاوی بکەمەوە.

## ✸ زۆر شەو نوێژ کردن:

ئیبلیس سەر لە کۆمەڵانێکی خواپەرست دەشێوێنێت و، شەو نوێژێکی زۆر دەکەن، کەسی وایان تێدایە هەموو شەوەکە نانوێ، بە شەونوێژو نوێژی چێشتەنگاو زۆر شادومانە زیاتر لە شادومانیەکەی بۆ بە جێهێنانی فەرزەکان، دواتر پێش سەرلەبەیان ڕادەکشێت و، نوێژە فەرزەکەی بەیانی لە دەست دەچێت، یا هەڵدەستێت و، تاوەکو خۆی بۆ ئامادە دەکات، نوێژی بە کۆمەڵی لە دەست دەچێت، یا لە بەر زۆر نەنووستنی تەمەبڵ دەبێت و، توانای پەیداکردنی بژێوی بۆ خێزانەکەی نابێت.

شێخێکی خواپەرستم بینی، بە (حسينٌ القزوينيُّ) ناودەبرا، بە ڕۆژ لە مزگەوتی مەنصوردا زۆر ڕێی دەکرد، سەبارەت بە هۆکاری ڕێکردنی ئەو شێخە لە خەڵکم پرسی، پێیان گوتم: بۆ ئەوەی نەنوێت ! ئەوەبوو گوتم: ئەمە نەفامیە بەوەی شەرع و ئەقڵ پێویستی دەکات:

لە ڕووی شەرعەوە، فإنَّ النبيّ _ صلى الله عليه وسلم _ قالَ:

((إنَّ لنفسِكَ عليكَ حقاً، فقُمْ ونَمْ))(٢٢٣) واتە: پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ فەرموویەتی: ((نەفسی خۆت هەقی بە سەرتەوەیە، کەوابوو شەونوێژ بکەو بشخەوە)).

وكان يقولُ:

((عليكُمْ هَدْياً قاصِداً " فإنَّهُ مَن يشادَّ هذا الدينَ يَغْلِبْهُ))(٢٢٤) واتە: پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ دەیفەرموو: ((لە سەر ڕێگەیەکی میانڕەوبن کە سەختی و نارِحەتی تێدا نەبێت، چونکە هەرکەس پەرستنێکی زیاد بەجێبێنێت کە لە سەرووی توانای خۆیەوە

---

٢٢٣ _ رواه أبوداود (١٣٦٩) عن عائشة " بسند فيه ضعف.

لكن له شاهداً في ((الصحيحين)) عن ابن عمرو، فيصح به، وسيأتي بعد صفحات عند المصنف.

٢٢٤ _ رواه أحمد (٥ / ٣٥٠)، والحاكم (١ / ٣١٢)، والبيهقي (٣ / ١٨)، وابن أبي عاصم (رقم ٩٥) " عن بُريدة.

وسنده صحيح.

بێت دەرەنجام دەبێتە هۆی کەمتەرخەمی لە بەجێهێنانی کردەوەکانداو واز لە پێویستیەکانی سەر شانی دێنێت)).

وعن أنس بنِ مالكٍ قالَ: دخَلَ رسولُ اللهِ _ صلى الله عليه وسلم _ المسجدَ، وحبلٌ ممدودٌ بينَ ساريتينِ، فقالَ: ((وما هذا ؟)) قالوا: لزينبَ " تُصَلِّي، فإذا كسلتْ أو فترتْ " أمسكتْ بهِ. فقالَ: ((حُلُّوهُ)). ثم قالَ:

((ليُصَلِّ أحدُكُم نشاطَهُ، فإذا كسلَ أو فتَرَ " فلْيَقْعُدْ))(٢٢٥) واتە: لە (أنس)ی کوڕی (مالك)ەوە دەفەرمێت: پێغەمبەری خوا _ صلی الله علیه وسلم _ چووە مزگەوتەوە، حبلێکی بەدیکرد لە نێوان دوو کۆڵەکەدا درێژکرابوو، فەرمووی: ((ئەمە چی یە ؟)) گوتیان: هی زەینەبە، نوێژ دەکات، هەرکات هەستی بە سستی یا بە لەش قورسی کرد، دەستی پێوە دەگرێت. فەرمووی: ((بیکەنەوە)). پاشان فەرمووی:

((با کەسێکتان لە کاتی چالاکیدا نوێژ بکات، ئەگەر هەستی بە سستی یا لەش قورسی کرد، با دانیشێت))

وعن عائشةَ قالتْ: قالَ رسولُ اللهِ _ صلى الله عليه وسلم _:

((إذا نَعِسَ أحدُكُم " فليَرْقُدْ حتى يذهَبَ عنهُ النومُ، فإنَّه إذا صلَّى وهو ينعسُ " لعلَّه يذهبُ ليستغفرَ، فيذهبُ فيسبَ نفسَهُ))(٢٢٦) واتە: لە خاتوو (عائشة)ەوە دەفەرمێت: پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم فەرمووی: ((ئەگەر کەسێکتان خەوی هات، با ڕاکشێت تا خەوەکەی دەچێت، چونکە ئەگەر بە خواڵویی نوێژ بکات ڕەنگە لە جیاتی ئەوەی داوای لێخۆشبوون بکات جوێن بە خۆی بدات)).

لە ڕووی ئەقڵیشەوە: نووستن ئەو هێزانەی کە بە شەوبێداری (سَهَر) شەکەت بووە، نوێ دەکاتەوە، بۆیە ئەگەر مرۆڤ نووستن لە خۆی دوورخاتەوە، لەو کاتەدا کە پێویستی پێیەتی، کاریگەریەکی خراپ لە سەر جەستەو ئەقڵی دروست دەکات.

---

٢٢٥ _ رواه البخاري (٣ / ٢٧٨).

٢٢٦ _ رواه البخاري (١ / ٢٧١)، ومسلم (٧٨٦).

پەنا دەگرین بە خوا لە نەفامی.

ئەگەر کەسێك بڵێت: بۆمان باسکراوە کە کۆمەڵێك لە پێشینی چاك هەموو شەوەکەیان زیندوو دەکردەوە ؟!

وەڵامەکەی: ئەوان پلە بە پلە لە فێرکردنی نەفسدا سەرکەوتن تاوەکو توانای ئەنجام دانی ئەوەیان بۆ دروست بوو، بڕواو متمانەیەکی تەواویشیان بە خۆیان بوو کەوا توانای پاراستنی نوێژی بەیانیان بە کۆمەڵ دەبێت، هەروەها خۆیان بە پشووی نیوەڕۆ(٢٢٧) پشت ئەستوور دەکرد، لە گەڵ کەمی خۆراك خواردندا، بۆیە ئەوەیان بۆ دروست بوو، پاشان پێمان نەگەشتووە پێغەمبەری خوا _ صلى اللە علیە وسلم _ شەوبێداریەکی کردبێت تیایدا نەنووستبێت، بۆیە سوننەتەکەی پێغەمبەری خوایە _ صلى الله علیە وسلم _ کە پەیڕەو دەکرێت.

ئیبلیس سەری لە کەسانێکی شەونوێژان شێواندووە، وای لێکردوون بە ڕۆژ باسی بکەن، ڕەنگە کەسانێکیش لەوانە بڵێت: ئەم بەیانیە فڵان کەسی بانگ بێژ لە کاتی خۆیدا بانگی فەرموو ! بۆ ئەوەی خەڵکی بزانن کە بە خەبەر بووە !!

بۆیە کەمترین ئەو شتانەی کە تووشی دەبێ _ ئەگەر لە ڕووپامایی ڕزگاری بوو _ ئەوەیە کە پەرستنەکەی لە دیوانی نهێنیەوە بۆ دیوانی ئاشکرایی دەگوازێتەوەو، بەوەش پاداشتەکەی کەم دەبێتەوە.

---

٢٢٧ _ پشووی نیوەڕۆ، هەندێ کەس واگومان دەبن تەنها پەیوەستە بە نووستنەوە، بەڵام ئاوەها نی یە.

## ✸ لە قورئاندا سەریان لێدەشێوێنێت:

ئیبلیس سەری لە کەسانێکی تر شێواندووە، کە تاك بوونەتەوە لە مزگەوتەکاندا بۆ نوێـژو خواپەرستی، تا ئەو ئاستەی بەوەوە ناسران و، خەڵکێکیشیان لـە دەوروبـەر کۆبۆتـەوەو، لـە پشتیانەوە نوێژ دەکەن، تـا ئـەم باروحاڵـەیان بـە نێـو خەڵکیـدا بڵـاو بۆتـەوە، ئـەوەش لـە پیلانەکانی ئیبلیسە، کە بە هۆی ئەوەوە نەفس بەهێز دەبێت بۆ زیاتر خوا پەرسـتی، چـونکە دەزانێت هەواڵی بە نێو خەڵکیدا بڵاو دەبێتەوەو پیاهەڵدان و ستایش کردنـی زیـاتر بەدەسـت دێنێت.

وعن زيدِ بنِ ثابتٍ أنَّ النبـيَّ _ صلى الله عليه وسلم _ قالَ:

((إنَّ أفضلَ صلاةِ المرءِ في بيتِه " إلا الصلاة المكتوبةَ))(٢٢٨) واتە: لە (زیـد)ی کـوڕی (ثابت)ەوە دەفەرمێت: پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ فەرموویەتی:

((چاکترین نوێژی کەسێك ئەو نوێژەیە کە لە ماڵەکەی خۆیدا دەیکـات، جگـە لـە نوێـژە فەرزەکان)).

(عامِرُ)ی کوڕی (عبدِالقيس) بەلایەوە ناپەسەند بوو خـەڵکی ببیـنن نوێـژ دەکـات، لـە مزگەوتیشدا نوێژە سوننەتەکانی نەدەکرد.

(ابنُ أبي ليلى) ئەگەر نوێژی بکردایەو کەسێك دیدەنی بکردایە، ڕادەکشا.

ئیبلیس سـەری لـە کۆمـەڵێکی تـری خواپەرسـتان شـێواند، کـە دەگریـان و، خـەڵکیان بەدەوربەردا بوو، پێدەچێ ئەمەیان تووش بێ و، نـەتوانرێت دوور بخرێتـەوە، بـەڵام هەرکـەس توانای شاردنەوەی هەبێت و، ئاشکرای بکات، ئەوا تووشی ڕوپامایی بووە.

لە (عاصم)ەوە دەڵێـت: ئەگـەر (أبـو وائـل) لـە ماڵەکـەی خۆیـدا نوێـژی بکردایـە، بـە هەنسکدان هەنسکی دەدا، ئەگەر دونیای پێدرایە بۆ ئەوەی ئەوە بکات و یـەکێك ببینێـت، هەرگیز نەیدەکرد.

---

٢٢٨ _ رواه البخاري (٧٣١)، ومسلم (٧٨١).

(أيُّوبُ السَّخْتِيانِيُّ) ئەگەر گریان بە سەریدا زاڵ بوایە، هەڵدەستا.

ئیبلیس سەری لە کۆمەڵێکی تری خواپەرستان شێواندووە، تەماشایان دەکەیت بە شەو ڕۆژ نوێژ دەکەن، کەچی ئاوڕێك لە چاکردنی عەیبێکی ناوەکی خۆیان نادەنەوەو، بە دوای پەیداکردنی خۆراك و بژێویدا ناگەڕێن، کەچی ئاوڕدانەوە لە چاککردنی عەیب و بژێوی پەیداکردن لە زۆرێتی نوێژکردنی سوننەت لە پێشترە.

## ✹ ئیبلیس لە خوێندنی قورئاندا سەریان لێدەشێوێنێت:

ئیبلیس سەری لە کەسانێك شێواندووە بە زۆر خوێندنی قورئان، بۆیە تەماشا دەکەیت بە خوێندنێکی خێراو بەبێ تێگەشتن قورئان دەخوێنن، بەبێ (تَرتیل)و بەبێ دڵنیابوون، ئەمەش بارێکی ستایشکراو نییە.

نووسەر دەفەرمێت:

ئیبلیس سەری لە کەسانێکی قورئان خوێن شێواندووەو، وای لێکردوون بە شەو لە منارەی مزگەوتەکانەوە قورئان بخوێنن، بە دەنگێکی بەرزی بە کۆمەڵ، (جُزء)ێك یا دوو (جُزء)، ئەمە خۆی بۆ خۆی کۆکردنەوەیەکە لە نێوان ئازاردانی خەڵك بەوەی نووستنیان لێ قەدەغە دەکەن و، لە نێوان تووشبوون بە ڕووپامایی.

کەسانێکیشیان لە مزگەوتەکەی خۆیداو لە کاتی بانگداندا قورئان دەخوێنێت، چونکە کاتی کۆبوونەوەی خەڵکە لە مزگەوتەکە.

نووسەر دەفەرمێت:

لە سەرسوڕمێنترین ئەو شتانەی کە بینیبێتم، پیاوێك هەبوو کە نوێژی بەیانی ڕۆژی هەینی بە خەڵکەکە دەکرد، ئاوڕی دەدایەوەو، (المعوِّذتين) دەخوێندو، پاشان بە نزای خەتمی قورئان نزای دەکرد، بۆ ئەوەی بە خەڵکەکە ڕاگەیەنێت من خەتمەکەم تەواو کردووە.

ئەمە ڕێبازی پێشینی چاك نەبوو، چونکە پێشینی چاك پەرستنەکانیان دەشاردەوە.

ئەوەبوو کاروکردەوەی (الربيع)ی کوڕی (خُثیم) هەرهەمووی بە نهێنی بوو، کاتی وادەبوو قورئانی دەخوێند بەڵام لەو کاتەدا کەسێك دەهاتە دیدەنی، یەکسەر بەپۆشاکەکەی قورئانەکەی دادەپۆشی.

پێشەوا (أحمد)ی کوڕی (حنبل) زۆر قورئانی دەخوێندو، نەیدەزانی کەی خەتمی دەکات.

# * باسی سەرلێشێواندنەکانی ئیبلیس بەرامبەر بە خەڵك لە چۆنیەتی بەڕۆژووبوونیاندا :

نووسەر دەفەرمێت:

ئیبلیس سەری لە کەسانێك شێواندووەو، ڕۆژووگرتنێکی بەردەوامیی بۆ ڕازاندونەتەوە، ئەمە شیاوە ئەگەر مرۆڤ ئەو ڕۆژانە بە ڕۆژوو نەبێت کە ڕۆژوو گرتنی تێدا حەرامە، بەڵام بەڵاکەی لە دوو ڕووە دەستنیشان دەکرێت:

یەکەم: پێدەچێ تووشی بێهێزی بێت و، کارێك بە مرۆڤ بکات توانای پەیداکردنی بژێوی بۆ ماڵەوە نەبێت و، واشی لێبکات کە توانای ڕاگرتنی داوێن پاکی خێزانەکەی نەمێنێت، وفي ((الصحيحين)) عن رسول الله _ صلى الله عليه وسلم _:

((إنَّ لزوجكَ عليكَ حقاً))(٢٢٩) واتە: پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ فەرموویەتی: ((خێزانەکەت هەقی بە سەرتەوەیە)).

بۆیە بەم سوننەتە چەندین فەرز دەفەوتێت.

دووەم: بەو کردەوە سوننەتی چاکترو بە فەزیڵەتتر دەفەوتێت، فإنَّهُ قد صحَّ عن رسول الله _ صلى الله عليه وسلم _ أنَّه قال:

((أفضَلَ الصيامِ صيامُ داودَ _ عليهِ الصلاةُ والسلامُ _ كانَ يصومُ يوماً ويُفْطِرُ يوماً))(٢٣٠) واتە: پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ فەرموویەتی:

((چاکترین بەڕۆژووبوون بە ڕۆژووبوونی (داود) پێغەمبەرە _ عليه الصلاة والسلام _ ڕۆژێك بەڕۆژوو دەبوو و ڕۆژێکیش دەیشکاند)).

وعن عبدالله بنِ عمرو قال: لقيني رسولُ اللهِ _ صلى الله عليه وسلم _، فقالَ: ((ألَمْ أُحَدِّثْ عنكَ أنك تقومُ الليل ؟ وأنتَ الذي تقولُ: لأقومَنَّ الليلَ ولأصومَنَّ النهارِ !)).

---

٢٢٩ _ تقدم تخريجه.

٢٣٠ _ رواه البخاري (٤ / ١٩١)، ومسلم (١١٥٩).

قال: نعم يا رسولَ اللهِ ! قد قلتُ ذلك.

فقالَ: ((فقُمْ ونَمْ، وصُمْ وأفْطِرْ، وصُمْ مِن كلِّ شهرٍ ثلاثةَ أيامٍ، ولكَ مثلُ صيامِ الدهرِ))

قالَ: قلتُ: يا رسولَ اللهِ ! إنِّي أُطيقُ أفضل مِن ذلك.

قال: ((فصمْ يوماً، وافطِرْ يوماً، فإنَّهُ أعدلُ الصومِ، وهو صيامُ داودَ _ عليهِ السلامِ _))

قلتُ: إنِّي أُطيقُ أفضلَ من ذلك.

فقالَ رسولُ اللهِ _ صلى الله عليه وسلم _: ((لا أفضَلَ مِن ذلك)).

أخرجاه في ((الصحيحين)) (٢٣١).

واته: له (عبدالله)ى كوڕى (عمرو)ەوە دەفەرمێت: پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ چاوی پێکەوتم و، فەرمووی:

((ئایا باسی تۆیان بۆ نەکردم کە شەو نوێژ دەکەیت ؟ تۆشی کە دەڵێیت: بە دڵنیاییی شەو نوێژ دەکەم و بە ڕۆژیش بە ڕۆژوو دەبم !)).

فەرمووی: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ! ئەوەم گوتووە.

پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ فەرمووی: ((شەونوێژ بکەو بشنوو، بەڕۆژوو بەو بیشیشکێنە، هەموو مانگێك سێ ڕۆژ بە ڕۆژوو بەو، بە هاوشێوەی پاداشتی بەڕۆژووگرتنی ساڵێکت دەبێ)).

فەرمووی: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ! من توانای لەوە زیارم هەیە.

پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ فەرمووی: ((باشە ڕۆژێك بە ڕۆژووبەو، ڕۆژێکیش بیشکێنە، چونکە چاکترین بەڕۆژووبوونە، کە بەڕۆژووبوونی (داود) پێغەمبەرە _ عليه السلام _)).

گوتم: من توانای لەوە زیاترم هەیە.

پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ فەرمووی: ((هیچ شتێك لەوە چاکتر نییە)).

---

٢٣١ _ في بعض طُرُق الحديث السابق، وانظر ((جامع الأصول)) (٦ / ٣٣٠).

## ✱ ئیبلیس سەریان لێدەشێوێنێت لە نیێتی بەڕۆژووبووندا :

پێدەچیَ هەواڵی کەسێکی خواپەرست بڵاوبێتەوە کەوا بە درێژای ساڵ بەڕۆژووە، ئەو خواپەرستە بەو بڵاوبوونەوەیە دەزانێت و، ئیتر هیچ ڕۆژێك نایشکێنێت، ئەگەر بیشیشکێنێت شکاندنەکەی دەشارێتەوە، بۆ ئەوەی شەرافەت و ڕێزداریی نەڕۆخێ، ئەوە لە ڕووپامایە شاراوەکانە، چونکە ئەگەر دڵسۆزی و، داپۆشینی باروحاڵی دەویست، لە ئامادەبوونی کەسانێکدا دەیشکاند کە دەزانن بەردەوام خەیکی ڕۆژوو گرتنە، پاشان دەگەڕایەوە بۆ ڕۆژوو گرتن و، کەسیش پیَ نەدەزانی.

کەسانێکیش بەڕۆژووبوونەوەکەی باس دەکات و، دەڵێت: ئەمڕۆ بیست ساڵە نەمشکاندووە، ئیبلیس سەری لێدەشێوێنێت و پێی دەڵێت تۆ باسی بەڕۆژووبوونەکەت دەکەی بۆ ئەوەی خەڵکی چاوت لێبکەن و شوێنی کردارەکەت بکەون. خواش بە مەبەستەکان زاناترە.

پێشەوا (سُفیانُ الثوريُّ) _ خوای لیَ ڕازی بێت _ فەرموویەتی: بەندە کردەوەکانی بە نهێنی ئەنجام دەدات، بەڵام شەیتان وازی لێناهێنێت تاوەکو باسی دەکات، بە باسکردنیشی لە دیوانی نهێنییەوە بۆ دیوانی ئاشکرایی دەیگوازێتەوە.

کەسانێکیش خووی بە ڕۆژووگرتنی ڕۆژانی دووشەم و پێنج شەمەوە گرتووە، ئەگەر بانگهێشتی خواردنێك کرا، دەڵێت: ئەمڕۆ پێنج شەمە. ئەگەر بیگوتبا: من بەڕۆژووم، تەنها مەینەتێك دەبوو، بەڵام کە گوتی: ئەمڕۆ پێنج شەمە، مانای وایە من هەموو پێنج شەمێك بەڕۆژووم.

کەسانێکیش بە چاوێکی سووکەوە تەماشای خەڵك دەکات، هەر لەبەر ئەوەی خۆی بەڕۆژووەو ئەوان بەڕۆژوو نین !

کەسانێکیش دەست لە ڕۆژوو هەڵناگرن، بەڵام گوێ بەوە نادەن لە سەر چ شتێك دەیشکێنێت، لە کاتی بەڕۆژووبوونیشدا خۆی لە غەیبەت و، تەماشای حرام و، قسەی بێسوود دوور ناخاتەوە، ئیبلیس وای بە خەیاڵدا هێناوە کە بەڕۆژووبوونەکەت تاوانەکەت لە سەر لادەبات، بەڵام هەموو ئەمانە لە سەرلێشێواندنەکانی ئیبلیسە.

## * ئیبلیس لە بواری حەجدا سەریان لێدەشێوێنێت:

نووسەر دەفەرمێت:

پێدەچێ مرۆڤ یەك جار فەرزی حەج بەجێبێنێت، بەڵام جارێکی تر بەبێ ڕازیبوونی دایكو باب دەگەڕێتەوەو، ئەمەش هەڵەیە.

لەوانەیە دەرچوێت بۆ حەج بەڵام قەرزو مافی خەڵکی هێشتا بەسەرەوە بێت، وە لەوانەیە بۆ گەشت و سەیران دەرچوێت، وە لەوانەشە بە ماڵ و سامانێکی بە گوماناویەوە دەرچوێت.

کەسی واشی تێدایە حەزی بەوەیە پێشوازی لێبکرێت و(٢٣٢) پێی بگوترێت: حاجی.

جەماوەریشیان لە ڕێگەی حەجدا فەرزەکانی پاك و خاوێنی و نوێژ پشت گوێ دەخەن و، بە دڵانێکی پیس و ناخێکی ناپاکەوە لە دەوری کەعبە کۆدەبنەوە.

ئیبلیس شێوەی حەجیان پیشان دەداو، فریویان دەدا، بەڵام لە ڕاستیدا مەبەست بە حەج نزیکبوونەوەیە بەدڵ نەك تەنها بە جەستە، ئەوەش لە گەڵ خواپەرستی و لە خواترساندا بەدیدێت.

کەسی وایان تێدایە کە بۆ حەج دەچێت، هیمەتی خۆی تەنها بۆ ژماردنی حەجەکانی ئاراستەکردووە، بۆیە دەڵێت: بیست وەستانم هەیە.

چەندین کەسی هاوتەنیشتی (مجاور) کەعبە مانەوەیان درێژەی کێشاو، دەستیان نەدایە پاکبوونەوەی ناخی خۆیان، ڕەنگە هیمەتی خۆی ئاراستە کردبێ بۆ (فتوح)ێك(٢٣٣) پێی بگات.

---

٢٣٢ _ نزیك بەمەو پێش ڕۆشتنیان فەرمان دەکەن بەڕازاندنەوەی ماڵ و، دانانی درەخت لەسەر دەرگای ماڵەوە کاتی گەڕانەوەیان.

٢٣٣ _ بەزۆری ئەم (فتوح)ە شەیتانی دەبێت، وەك ئەوەی خاوەنی کتێبی (الفتوحات المكية)و، کەسانی تری نەزان و گێل و گومڕا تووشی بوونە.

وانظر رسالة ((حياة ابن العربي وعقيدته)) للشيخ تقي الدين الفاسي _ بتعليقي، نشر دار ابن الجوزي _ الدَّمَّام _.

لەوانەیە بڵێت: ئەمڕۆ بیست ساڵە هاوتەنیشتی (مجاور) کەعبەم.

چەندین کەسیشم لە ڕێگەی مەکە دیوە، کە دەچن بۆ حەج، لە سەر ئاو لە هاوڕێ و ڕەفیقەکانی دەداو، لە ڕێگەدا بێزاریان دەکات.

ئیبلیس سەری لە کەسانێك شێواندووە کە دەچن بۆ حەج، نوێژەکان پشت گوێ دەخەن و، لە فەرۆشتنیشدا ترازوو بازی دەکەن، واگومان دەبن حەجەکە تاوانەکەیان لە سەر لادەبات.

ئیبلیس سەری لە کەسانێکیان شێواندووە، بۆیە لە ڕێ و ڕەسمەکانی حەجدا بیدعە دروست دەکەن، کۆمەڵێکم بینی لە ئیحرام بەستندا شتی نوێ دروست دەکەن و، تەنها شانێکیان بەدەردەخەن (٢٣٤)، چەندین ڕۆژ لە بەر هەتاو دەمێننەوەو، پێستی لەشیان دادەماڵرێت و، سەریان دەئاوسێت، خۆیانی پێ دەڕازێننەوە لە پێش چاوی خەڵکدا.

وعن ابن عباس _ رضي الله عنهما _ أنَّ النبيّ _ صلى الله عليه وسلم _ رأى رجلاً يطوفُ بالكعبَةِ بزِمامٍ أو غيرِه، فقَطَعَهُ (٢٣٥) واتە: لە (ابن عباس)ەوە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ پیاوێکی بینی بە دەوری کەعبەدا دەسوڕێتەوەو دەستیشی بەستووە بە دەستی پیاوێکی ترەوە بە حەبلێك لە پێست یا پەتێك یا هەر شتێکی تر، ئەوەبوو پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ لەت لەتی کرد.

نووسەر دەفەرمێت:

ئەم فەرموودە قەدەغەی داهێنانی شتی نوێ لە ئاییندا دەکات، ئەگەرچی مەبەست بەوە خواپەرستی و گوێڕایەڵی پەروەردگاریش بێت.

---

٢٣٤ _ ئەمەش لە هەڵە خراپەکانە کە تاوەکو ئەمڕۆ زۆرێك لە حاجیەکان ئەنجامی دەدەن.

٢٣٥ _ چونکە هاوشێوەی سنور تێپەڕاندنە لە پەرستندا.

والحديث رواه البخاري (٣ / ٣٨٦).

## ✱ ئیبلیس لە بواری پشت بەستندا سەریان لێدەشێوێنێت:

ئیبلیس سەری لە کەسانێك شێواندووە لەوانەی بانگەشەی پشت بەستن دەکەن، بۆیە بەبێ توێشووی ڕێگا چوونە دەرەوەو، وایان دەزانی ئەوە پشت بەستنە، بەڵام لەو پەڕی هەڵەدان.

پیاوێك بە پێشەوا (أحمد)ی کوڕی (حنبل)ی گوت _ خوای لێ ڕازی بێت _: دەمەوێ بەبێ توێشووی ڕێگا بچمە دەرەوە بۆ مەککە، ئیمامی (أحمد)یش پێی فەرموو: کەواتە بەبێ یاوەری کاروانی خەڵك بچۆ دەرەوە. گوتی: نەخێر، تەنها لە گەڵ ئەواندا دەچمە دەروە. بۆیە ئەویش فەرمووی: کەواتە پشتت بە کیسەو هەگبەی خەڵکەکە بەستووە !

داوا لە خوای پەروەردگار دەکەین سەرکەوتوومان بکات.

# ✸ باسی سەرلێشێواندنەکانی ئیبلیس بەرامبەر بە غەزاکاران:

نووسەر دەفەرمێت:

ئیبلیس سەری لە خەڵکێکی زۆر شێواندووە، چونکە چوونە دەرەوە بۆ تێکۆشان لە پێناوی خواداو نیەتیان شانازیکردن و ڕووپامایی بوو، بۆ ئەوەی بگوترێت: فڵان کەس غەزاکارە، لەوانەیە مەبەستی ئەوە بێ کە بگوترێت: ئازایە. یاخود دەستکەوتەکانی جەنگی دەستکەوێت.

بەڵام لەڕاستیدا کاروکردەوە تەنها بەبەنیەتە.

وعن أبي موسى قالَ: جاءَ رجلٌ الى النبيّ _ صلى الله عليه وسلم _، فقالَ: يارسولَ الله ! أرأيْتَ الرجلَ يقاتِلُ شجَاعَةً، ويُقَاتِلُ حَمِيَّةً ، ويُقَاتِلُ رِيَاءً. فأيُّ ذَلِكَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ – صلى الله عليه وسلم –: ((مَنْ قَاتَلَ لِتَكُونَ كَلِمَةُ اللَّهِ هِيَ الْعُلْيَا، فَهُوَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ)). أخرجاه في الصحيحين (٢٣٦) واتە: لە (أبي موسى)ەوە _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی: پیاوێك هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _و فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا ! ئەگەر پیاوێك بجەنگێت بۆ ئەوەی لە نێو خەڵکیدا بەئازایەتی بەناوبانگ بێت و، پیاوێکیش بجەنگێت بۆ سەرخستنی قەوم و نیشتمانەکەی و، پیاوێکیش بۆ ڕووپامایی. کامیان لە پێناوی خوادان، پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ فەرمووی: ((هەرکەس بجەنگێت بۆ ئەوەی وشەی خوای گەورە بەرزو بڵند بێت، ئەوە لە پێناوی خوادایە)).

---

٢٣٦ _ رواه البخاري (٦ / ٢١)، ومسلم (١٩٠٤).

وعَنْ بْنِ مَسْعُودٍ _ رضي الله عنه _ قَالَ:

إِيَّاكُمْ أَنْ تَقُولُوا: مَاتَ فُلاَنٌ شَهِيدًا ، أَوْ قُتِلَ فُلاَنٌ شَهِيدًا ، فَإِنَّ الرَّجُلَ يُقَاتِلُ لِيَغْنَمَ ، وَيُقَاتِلُ لِيُذْكَرَ ، وَيُقَاتِلُ لِيُرَى مَكَانُهُ(٢٣٧) واته: له (ابن مسعود)ەوه _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی: نەکەن بڵێن: فڵان کەس شەهیدە، یاخود فڵان کەس بەشەهیدی کوژرا، چونکە بەڕاستی پیاو هەیە دەجەنگێت بۆ ئەوەی لە دەستکەوتەکانی جەنگی پێبدرێت، دەجەنگێت بۆ ئەوەی باس بکرێت، دەجەنگێت شوێنەکەی ببینرێت.

وعن أبي هريرة _ رضي الله عنه _ قالَ: إِنَّ أَوَّلَ النَّاسِ يُقْضَى فِيهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ثَلَاثَةٌ: رَجُلٌ اسْتُشْهِدَ، فَأُتِيَ بِهِ، فَعَرَّفَهُ نِعَمَهُ، فَعَرَفَهَا، فَقَالَ: وَمَا عَمِلْتَ فِيهَا ؟ قَالَ: قَاتَلْتُ فِيكَ حَتَّى قُتِلْتُ. قَالَ: كَذَبْتَ، وَلَكِنَّكَ قَاتَلْتَ، لِيُقَالَ: هُوَ جَرِيءٌ، فَقَدْ قِيلَ، ثُمَّ أَمَرَ بِهِ، فَسُحِبَ عَلَى وَجْهِهِ، حَتَّى أُلْقِيَ فِي النَّارِ. وَرَجُلٌ تَعَلَّمَ الْعِلْمَ، وَعَلَّمَهُ، وَقَرَأَ الْقُرآنَ، فَأُتِيَ بِهِ، فعرَّفَهُ نِعَمَهُ، فَعَرَفَهَا، فَقَالَ: مَا عَمِلْتَ فِيهَا ؟ قَالَ: تَعَلَّمْتُ فِيكَ الْعِلْمَ، وَعَلَّمْتُهُ، وَقَرَأْتُ فِيكَ الْقُرآنَ، فَقَالَ: كَذَبْتَ، وَلَكِنَّكَ تَعَلَّمْتَ، لِيُقَالَ: هُوَ عَالِمٌ، فَقَدْ قِيلَ، وَقَرَأْتَ الْقُرْآنَ، لِيُقَالَ: هُوَ قَارِئٌ، فَقَدْ قِيلَ. ثُمَّ أَمَرَ بِهِ، فَسُحِبَ عَلَى وَجْهِهِ حَتَّى أُلْقِيَ فِي النَّارِ.

وَرَجُلٌ وَسَّعَ اللَّهُ عَلَيْهِ، وَأَعْطَاهُ مِنْ أَصْنَافِ الْمَالِ كُلِّهِ، فَأُتِيَ بِهِ، فَعَرَّفَهُ نِعَمَهُ، فَعَرَفَهَا، فَقَالَ: مَا عَمِلْتَ فِيهَا ؟ قَالَ: مَا تَرَكْتُ مِنْ سَبِيلٍ تُحِبُّ أَنْ يُنْفَقَ فِيهَا إِلَّا أَنْفَقْتُ فِيهَا لَكَ. قَالَ:

---

٢٣٧ _ ئەمە پەندو، ئامۆژگاری و، قەدەغەکردنی تێدایە بۆ ئەو کەسانەی وشەی شەهید بەکاردەهێنن بۆ هەرکەسێك ئارەزوویان لێبێت و خۆشیان بوێت بەبێ هیچ خۆپاراستن و ترسێك لە خوای _ سبحانه وتعالى _. بنەڕەتی ڕاستیش ئەوەیە کەوا هەرکەسێك ویستی شتێك لەمانە بڵێت با دوایدا بڵێت: ((نحسبه كذلك، ولا نزكّي على الله أحداً)) واتە: ((ئاوەهای دەزانین و، لە جیاتی خوای تعالى بۆ هیچ کەسێك پاکانە ناکەین)). پێشەوا (البخاري) لە (صحیح)ەکەیدا بەشێکی ناوناوە بە (بەشی: ناگوترێت: فلان کەس شەهیدە). براشمان (جزّاع الشمّري) نامیلکەیەکی هەیە بەناونیشانی (الرأي السديد في أنه لا يُقال: فلان شهيد)، واتە (ڕای بەجێ سەبارەت بەوەی ناگوترێت: فڵان کەس شەهیدە) لە کوێت چاپکراوە، بەسوودە لە دەروازەکەیدا، باتەماشا بکرێت.

كَذَبْتَ، وَلَكِنَّكَ فَعَلْتَ، لِيُقَالَ: هُوَ جَوَّادٌ، فَقَدْ قِيلَ. ثُمَّ أَمَرَ بِهِ، فَسُحِبَ عَلَى وَجْهِهِ حَتَّى أُلْقِيَ فِي النارِ. انفردَ بإخراجِهِ مسلمٌ(٢٣٨) واته: لـه (أبـي هريـرة)ەوە _ خـوای لـیٚ ڕازی بێـت _ فەرموویەتی: یەکەم کەسانێك فەرمانیان بەسەردا دەدرێت سیانن:

پیاوێك شەهید بوو، هێنراو، خوای تعالی نیعمەتەکانی خۆی بۆ باسکرد کە پێی بەخـشی بوو، ئەویش دانی پێدانا، خوای تعالی پێی فەرموو: چ کارێکت پێکرد ؟ گـوتی: لـە پێنـاوی تۆدا جەنگام تا کوژرام. خوای تعالی فەرمووی: درۆت گوت، بەڵکو جەنگای، بۆ ئەوەی بڵێن: بوێرو ئازایە، دڵنیابە گوترا، پاشان فەرمانی پێکراو، بەسەر ڕوویـدا ڕاکێـشرا، تـا فڕێدرایـە دۆزەخەوە.

پیاوێکیش زانست فێربوو و، فێری خەڵکیشی دەکردو، قورئانی دەخوێند، هێنـراو، خـوای تعالی نیعمەتەکانی خۆی بۆ باسکرد کە پێی بەخشی بوو، ئەویش دانی پێدانا، خوای تعـالی پێی فەرموو: چ کارێکت پێکرد ؟ گـوتی: لـە پێنـاوی تـۆدا زانـست فێربـووم و، خەڵکیـشم فێرکردو، لە پێناوی تـۆدا قورئـانم خوێنـد. خـوای تعـالی فـەرمووی: درۆت گـوت، بـەڵکو فێربووی، بۆ ئەوەی بگوترێت: زانایە، دڵنیابە گوترا، قورئانیشت خوێند، بۆ ئەوەی بگوترێت: قورئان دەخوێنێت، دڵنیابە گوترا، پاشـان فـەرمانی پێکـراو، بەسـەر ڕوویـدا ڕاکێـشرا، تـا فڕێدرایە دۆزەخەوە.

پیاوێکیش خوای تعالی ڕزق و ڕۆزی بەسەردا ڕشتبوو، هەموو جۆرەکانی مـاڵ و سـامانی پێبەخشیبوو،، هێنراو، خوای تعالی نیعمەتەکانی خۆی بۆ باسـکرد کـە پێـی بەخـشی بـوو، ئەویش دانی پێدانا، خوای تعالی پێی فەرموو: چ کارێکت پێکرد ؟ گـوتی: هـیچ ڕێگەیـەکم

---

٢٣٨ _ برقم (١٩٠٥).

بەڕاستی ئەو سیٚ کەسەو هاوشێوەکانیان جێگەی سەرسوڕمانن، لە دونیـادا لەگـەڵ خەڵکـدا درۆ دەکـەن، بەخواستی بەدەستهێنانی پێشەوایەتی و، شان و شەوکەت و بەچاکە باسکردن، پاشان لە ڕۆژی قیامەتیشدا ناترسن و لە گەڵ خوای گەورەدا درۆ دەکەن، بەڵام خوای گـەورە ئابڕوویـان دەبـات و، کاروباریـان ئاشـکرا دەکات.

نەهێشتووە کە تۆ حەزت بکەیت تیایدا ببەخشرێت مەگەر لە پێناوی تۆدا بەخشیومە. خوای تعالی فەرمووی: درۆت گوت، بەڵکو بەخشیت، بۆ ئـەوەی بگوترێـت: بەخـشندەیە، دڵنیابـە گوترا، پاشان فەرمانی پێکراو، بەسەر ڕوویدا ڕاکێشرا، تا فڕێدرایە دۆزەخەوە.

## ✸ ئیبلیس له دەستكەوتەكانی جەنگدا سەریان لیّ دەشێوێنێت:

بەڕاستی ئیبلیس سەر لە تێكۆشەر دەشێوێنێت ئەگەر دەستكەوتەكانی جەنگی بەدەستهێنا، چونكە لەوانەیە شتانێك لە دەستكەوتەكە بەرێت بەبیّ ئەوەی مافی بردنی هەبیّ، ئەمەش بۆ چەند هۆكارێك دەگەڕێتەوە:

پێدەچیّ ئەو كەسە كەم زانست بیّ و، وابزانێت ماڵ و دارایی بێباوەڕان حەڵاڵ و ڕێگەپێدراوە (المُباح) بۆ ئەو كەسەی كە دەیبات، وە نازانێت (غلول) واتە ناپاكی وشت بردن لە دەستكەوتەكانی جەنگ سەرپێچیە.

وفي ((الصحيحين)) من حديث أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ:

خَرَجْنَا مَعَ رسولِ اللهِ -صلى الله عليه وسلم- إِلَى خَيْبَرَ، فَفَتَحَ اللَّهُ عَلَيْنَا، فَلَمْ نَغْنَمْ ذَهَبًا وَلاَ وَرِقًا، غَنِمْنَا الْمَتَاعَ وَالطَّعَامَ وَالثِّيَابَ، ثُمَّ انْطَلَقْنَا إِلَى الْوَادِي، وَمَعَ رَسُولِ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- عَبْدٌ لَهُ، فَلَمَّا نَزَلْنَا، قَامَ عَبْدُ رَسُولِ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- يَحُلُّ، فَرُمِيَ بِسَهْمٍ، فَكَانَ فِيهِ حَتْفُهُ، فلما قُلْنَا لهُ: هَنِيئًا لَهُ الشَّهَادَةُ يَا رَسُولَ اللَّهِ ! فقَالَ ((كَلاَّ، وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ إِنَّ الشَّمْلَةَ لَتَلْتَهِبُ عَلَيْهِ نَارًا، أَخَذَهَا مِنَ الْغَنَائِمِ يَوْمَ خَيْبَرَ، لَمْ تُصِبْهَا الْمَقَاسِمُ)). قَالَ: فَفَزِعَ النَّاسُ، فَجَاءَ رَجُلٌ بِشِرَاكٍ أَوْ شِرَاكَيْنِ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَصَبْتُهُ يَوْمَ خَيْبَرَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- ((شِرَاكٌ مِنْ نَارٍ، أَوْ شِرَاكَانِ مِنْ نَارٍ)).

واتە: لە (أبي هُريرة)ەوە _ خوای لیّ ڕازی بێت _ فەرموویەتی:

لە گەڵ پێغەمبەری خوادا _ صلى الله عليه وسلم _ چووینە دەرەوە بۆ خەیبەر، ئەوەبوو خوای تعالى سەركەوتنی پیّ بەخشین و، زێڕو زیومان دەست نەكەوت، بەڵكو شتومەك و خواردن و پۆشاكمان دەستكەوت، پاشان كەوتینەڕیّ بەرەو چەمەكە، پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ بەندەیەكی خۆی لە گەڵدا بوو، بەندەكەی پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ چوو باروبارگەكە داگرێت، تیرێكی بۆ هاوێشتراو، بویە هۆی مردنی، كاتێك پێمان گوت: شەهیدێكەی پیرۆز بیّ ئەی پێغەمبەری خوا ! فەرمووی ((نەخێر، بەو زاتەی نەفسی محمدی بەدەستە (الشَملة)كە _ بەرگێكی فراوانە بۆ خۆپێچانەوەو داپۆشین بەكاردێت_

بەسەریەوە گڕدەگرێت و دەبێ بەئاگر، ڕۆژی خەیبەر لە دەستکەوتەکانی جەنگ بردی، کە بەری دابەشکرنەکان نەکەوتبوو)).

(أبوهُريرة) فەرمووی: خەڵکەکە زەنەقیان چوو، ئەوەبوو پیاوێك قەیتانێك (شِراك) یاخود دوو قەیتانی هێناو، گوتی: لە ڕۆژی خەیبەردا دەستم کەوت، پێغەمبەری خواش _ صلى الله عليه وسلم _ فەرمووی:

((قەیتانێك لە ئاگر، یاخود دوو قەیتان لە ئاگر)).

هەروەها پێدەچێ کەسی غەزاکار بەحەرامکردنەکە بزانێت، بەڵام شتومەکی زۆر دەبینێت و، ناتوانێت ئارام بگرێت و لەو شتانە نەبات، لەوانەشە واتێبگات تێکۆشانی لە پێناوی خوادا تاوانی ئەو کارەی لە سەر لادەبات.

ئالێرەدا ڕۆڵی ئیمان و زانستی مرۆڤ دەردەکەوێت.

## ✹ باسی سەرلێشێواندنەکانی ئیبلیس بەرامبەر بە فەرمانکاران بەچاکەو قەدەغەکاران لە خراپە:

ئەمانە دوو جۆرن: زاناو نەفام:

ئیبلیس بەدوو ڕێگە سەر لە زانا دەشێوێنێت:

**ڕێگەی یەکەم:** خۆ ڕازاندنەوە بەو زانستەو، هەوڵدان بۆ ناوبانگ دەرکردن و، خۆبەزلزانین لە ئەنجامی بەجێهێنانی ئەو کارەوە.

بە (إسناد)ێك بۆمان باسکراوە کەوا (أحمد)ی کوڕی (أبي الحَوَاري)، گوتویەتی: گوێبیستی (أبا سليمان) بووم دەیگوت: گوێبیستی (أبا جعفرٍ المنصورَ) بووم لە وتاری ڕۆژی هەینیدا دەگریا، منیش تووڕەبوون ڕوی تێکردم و، نیەتێکم بۆ دروست بوو کە هەستم و، بەو ناستە زانستەی هەمە دەربارەی ئەو ڕەفتارەی کە ئەنجامی دا، ئامۆژگاریەکی بکەم، ئەگەر لە سەر مینبەرەکە دابەزی.

گوتی: بەڵام بەچاکم نەزانی هەستم بۆ لای خەلیفەیەك و، ئامۆژگاری بکەم و، خەڵکی دانیشتبن و، چاویان تێبڕیبێتم و، بەو هۆیەوە خۆڕازاندنەوەیکم تووش بێ و، ئەویش فەرمانم پێکات و، بەهەڵە بکوژرێم، بۆیە دانیشتم و بێدەنگ بووم.

**ڕێگەی دووەم:** تووڕەبوون بۆ خودی خۆی، پێدەچێ ئەمە هەر لە سەرەتاوە ڕووبدات، لەوانەشە لە باروحاڵی ئەو کەسەدا ڕووبدات کە فەرمان بەچاکە دەکات، بەهۆی ئەو سووکایەتی و گاڵتەپێکردنەی کە ڕووبەڕووی کەسی قەدەغەکار دەکرێتەوەو، بەوەش دەبێ بەناکۆکی و دوژمنایەتیەك بۆ خودی خۆی، وەکو ئەوەی پێشەوا (عمر)ی کوڕی (عبدالعزيز) بە پیاوێکی فەرموو: ئەگەر تووڕە نەبوایەم سزام دەدای.

لەڕاستیدا مەبەستی ئەوەبوو کە تۆ تووڕەت کردوم، بۆیە ترسام سزادان لەبەر تووڕەبون بۆ خواو و تووڕەبون لەبەر خودی خۆم تێکەڵ بەیەکتر بن.

وە ئەگەر کەسی فەرمانکار بەچاکە نەفام بوو، ئەوا شەیتان یاری پێ دەکات، لەڕاستیدا کاروبارەکەی خۆی زیاتر خراپ دەکات بەبەراوردی چاکردنی، چونکە پێدەچێ قەدەغە لە شتێك بکات، کەچی ئەو شتە بە کۆڕایی شیاو (جائز) بێت، پێدەچێ نکۆڵیی لەوانە بکات کە ڕەفیقەکەی لێکدانەوەی تێدا کردووەو (تأوَّلَ فیـهِ) تیایدا پەیڕەوی هەندێ ڕێباوەڕی کردووە(٢٣٩)، لەوانەیە دەرگا بشکێنێت و، بەدیواردا هەڵگەڕێت و، لێدانی ئەو کەسانە بکات کە خراپە دەکەن و، ناویان بزڕێنێت و قسەی خراپیشیان پێ بڵێت، بەڵام ئەگەر ئەوان بەوشەیەك وەڵامی بەنەوە بەلایەوە قورس دەبێ، بۆیە وای لێدێت تووڕەبونەکەی بۆ خودی خۆی دەبێ نەك بۆ ئاین.

لە سەرلێشێواندنەکانی ئیبلیس بەرامبەر بەکەسی قەدەغەکار ئەوەیە کە ئەگەر قەدەغەی شتێك بکات، پاشان لە نێو کۆمەڵێکی خەڵکدا دادەنیشێت و وەسفی کردەوەکانی خۆی دەکات و، شانازی پێوە دەکات و، جوێن بەکەسانی خاوەن کردەوە خراپەکان دەدات بەشێوەی جوێندانی کەسێکی زۆر تووڕەبوو لێیان و، نەفرینیان لێدەکات، بەڵام پێدەچێ ئەو کەسانە تەوبەشیان کردبێ و، لەوانەیە لەئەویش چاکتربن، لەبەر پەشیمان بونەوەی ئەو کەسانەو خۆبەزلزانینی کەسی قەدەغەکار، لە میانەی باسەکشیدا عەورەتی موسڵمانان ئاشکرا دەکات، چونکە کەسانێك لەو شتانە تێدەگەیەنێت کە نازانن، کەچی داپۆشین و پاراستی موسڵمان واجبە چەند لە تواناد بێت.

بیستومە کەسانێك کە بە کاری قەدەغەکردن نەفامن، پەلاماری قەومێك دەدەن پاش ئەوەی دڵنیادەبن لەو خراپانەی کە تیایاندایە، لێدانیان دەکەن بەلێدانێکی توندوتیژو، قاپ وقاچاغ دەشکێنن و، هۆکاری هەموو ئەمانەش دەگەڕێتەوە بۆ نەفامی.

بەڵام ئەگەر زانا قەدەغەو نکۆڵیی بکات، تۆ هیچ ترسێکت لێ نابێ.

---

٢٣٩ _ بەمەرجێك ئەو کارەی ڕوویەکی لە زانستدا هەبێ، یاخود گومانی بەڵگەیەك لە ئارادا بێت، نەك ڕێگەپێدانی فەقیهێك، یاخود زەڵلەی زانایەك.

درێژەپێدانی ئەمەش جێگەیەکی تری هەیە.

پێشینی چاك میهرەبان بوون و بەبەزەیی بوون لە نکۆڵیکردندا.

(صِلةُ)ی کوڕی (أُشَیْم) پیاوێکی بەدیکرد لەگەڵ ژنێکدا قسەدەکات، ئەوەبوو فەرمووی: دڵنیابن خوای تعالی دەتانبینێت، خوا ئێمەو ئێوەش داپۆشێت و بمانپارێزێت.

هەروەها بەلای قەومێکدا تێپەڕ دەبوو یاریان دەکرد، دەیفەرموو: ئەی برایانم ! چ دەڵێن سەبارەت بەو کەسەی بەنیازی سەفەرێکە، بەڵام بەدرێژای شەو نووست و، بەدرێژایی ڕۆژ یاری کرد، کەی سەفەرەکەی تەواو بکات.

ئەوەبوو پیاوێکیان وریا بویەوەو، گوتی: ئەی قەومەکەم ! لەڕاستیدا ئەمە فێرمان دەکات، بۆیە خۆی و ڕەفیقەکانی پەشیمان بونەوەو تەوبەیان کرد.

ئەو تەنها کەسەش کە لەهەموو خەڵك شایستەترە بۆ ئەوەی بەمیهرەبانی و بە سۆزەوە نکۆڵی و قەدەغەی خراپەی لێ بکرێت ئەمیرو کاربەدەستانە، جێگەی خۆیەتی پێیان بگوترێت: بەڕاستی خوای تعالی ئێوەی بەرز کردۆتەوە، بۆیە ڕێزی نیعمەتەکانی بزانن، چونکە بەڕاستی نیعمەت بە سوپاسکوزاری بەردەوام دەبێ و، جوان نییە نیعمەتەکانی خوای تعالی بەسەرپێچیکردن بەرەنگار بکرێتەوە.

ئیبلیس سەری لەهەندێ دیندار شێواندووە، چونکە شتی خراپ بەدیدەکات، کەچی قەدەغەو نکۆڵیی لێ ناکات و، دەڵێت: لەڕاستیدا ئەوەی فەرمان بەچاکەو قەدەغەی خراپە دەکات کەسێکی کارچاکە، منیش کارچاك نیم، کەوابوو چۆن فەرمانی چاکە بەکەسی تر بکەم ؟!

ئەمەش هەڵەیە، چونکە پیویستە فەرمان بکات و قەدەغە بکات ئەگەچی ئەو سەرپێچیە لە خودی خۆشیدا بێت، بەڵام هەرکاتێك نکۆڵی و قەدەغە بکات و نەفسی خۆی بەدوورگرتبێت لە خراپەو کاری نابەجێ، فەرمانکردن و قەدەغەکردنەکەی گاریگەرتر دەبێ، ئەگەر نەفسی خۆشی بەدوور نەگرتبێت لە خراپەو کاری نابەجێ، هێندەی نامێنێت نکۆڵی و قەدەغەکردنەکەی کارنەکات، بۆیە پێوستە کەسی قەدەغەکارو نکۆڵیکار نەفسی خۆی

بەدووربگرێت لە خراپەو کاری نابەجێ، بۆ ئـەوەی نکـۆڵیی و قەدەغەکردنەکـەی گاریگـەرتر بێت.

(ابنُ عَقِيل) دەڵێت: لە زەمەنی ئێمەداو لە ڕۆژانـی فەرمانڕەوایـەتی (القـائم)دا، (أَبـابکر الأقفـاليّ)م بـینی، ئەگـەر بـۆ نکـۆڵیکردن و قەدەغـەکردنی شـتێکی خـراپ هەسـتایە، بەشێخانێکی دەگوت شوێنم کەوە کە تەنها لە بەری کاری دەسـتی خۆیـان دەخـوارد، وەکـو (أبي بکرِ الخبَّـازِ)و، کۆمەڵێك کەوا کەسێکیان تێدا نـەبوو صـەدەقەو خێـر وەرگـرن، یـاخود لەکەدار کرابن بەقبوڵکردنی بەخشینێك، ڕۆژ بەرۆژوو بوون و، شەوانیش شەونوێژیان دەکـرد، دەگریان، بۆیە ئەگـەر کەسـێکی تێکـەڵکاری شـوێن بکەوتایـە، دەیگەڕانـەوەو، دەیگـوت: هەرکات بەیاوەری کەسێکی تێکەڵکار بەرەنگاری سوپاکە بوینەوە، سوپاکە هەڵدێت !

# بەشی نۆیەم

## باسی سەرلێشێواندنەکانی ئیبلیس بەرامبەر بە زاهیدان و خوا پەرستان:

پێدەچێ کەسی ئاسایی گوێبیستی ئەوە بێت کە لە قورئانی پیرۆزو فەرموودەدا دونیـا زەم کراوە، ئیتر وای بەخەیاڵدا بێت کە رێگەی رزگاربوون وازهێنانە لە دونیـا، کەچـی نـەیزانیوە دونیای زەمکراو مانای چی یە، بۆیە ئیبلیس سەری لـێ دەشـێوێنێت وای بەخەیاڵـدا دێنێـت کموا تۆ لە رۆژی قیامەتدا رزگاربوونت مەحاڵە مەگەر واز لە دونیا بێنیت، بۆیە رووی خـۆی هەڵدەگرێت و بەرەو چیاو کێوەکان دەچێتە دەرەوە، بەوەش لـە نوێـژی هـەینی و، کۆمـەڵ و، زانست فێربوون دوردەکەوێتەوەو، وەکو گیاندارێکی کێوی لێدێت و، ئیبلـیس وای بەخەیاڵـدا دێنێت کە ئەوە زوهدی راستە ! بۆ ئەم کارە نەکات لە کاتێکدا بیستویەتی فڵان کـەس رووی خۆی هەڵگرتوەو، فڵان کەسیش لە چیایەکدا خوا پەرستی دەکرد ! رەنگە ئەو کەسـە خێزانـی هەبێ و، تیابەچن، یاخود دایکی هەبێ و، بۆ رۆشتنی بگری ! رەنگە وەکو پێویست پایەکانی نوێژ نەزانێت ! رەنگە مافی خەڵکی بەلاوە بێ و نەیدابێتەوەو لێی دەرنەچوبێت !

لەراستیدا ئیبلیس دەتوانێت سەر لەم کەسە بشێوێنێت، چونکە زانستی کەمە، یەکێك لە نەفامیەکانیشی ئەوەیە لە نەفسی خۆی رازیە، سەبارەت بەو ئەندازە زانـستەی کـە پێیـەتی، بەڵام ئەگەر هاوەڵێتی زاناو فەقیهێکی بۆ برەخسایە، فێری دەکرد کـەوا دونیـا وەکـو خـودی خۆی زەم ناکرێت، چۆن ئەو شتەی کە خوای تعالی بەخشیویەتی زەم دەکرێت و، بۆ مانـەوەی ئـەوەی ئـادەم زەرورە، هۆکـارێکی سەرکیـشە بـۆ بەدەسـتهێنانی زانـست و بـەجێهێنانی پەرستنەکان ، لە خۆراك و خواردنەوەو مزگەوتێك نوێژی تێـدا بکـات، لەراسـتیدا زەمکـراو ئەوەیە کە شتەکان رێگەیەکی حەرام و ناحەڵاڵ بەکاربهێنرێت، یاخود بەشێوازێکی بـەفیرۆدان بەکاربهێنرێت، نەك بەپێی ئەندازەی پێویست، وە نەفس تەصرفی پێوە بکات بە هەڵەشەیی و

نازیری، نەك بەپێی ئیزنی شەرع، دڵنیابن چوونە دەرەوە بۆ چیاو كێوان بەتەنیایی قەدەغە كراوە، فإنَّ النبيّ (صلى الله عليه وسلم): نَهى أنْ يبيتَ الرجلُ وحدَهُ([240]) واتە: پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ قەدەغەی كردووە پیاو بەشەوان بەتەنها بمێنێتەوە، بۆیە وازهێنان لە كۆمەڵ و نوێژی هەینی خەسارۆمەندیەو قازانج نیە، دوركەوتنەوە لە زانست و زانایان سوڵتانی نەفامی بەهێز دەكات، بەجێهێشتنی دایك و باب لەم بارەدا دەبێتە هۆی ڕەنجانی دڵیان و ڕەنجانی دڵیشیان لە تاوانە گەورەكانە.

بەڵام ئەو كەسانەی هەواڵیان بیستراوە كە چۆنەتە دەرەوە بۆ چیایەك، دەگونجێ باروحاڵیان وابێت كە خاوخێزانیان و، دایك و، بابیان نەبێ، بۆیە چوونەتە دەرەوە بۆ شوێنێك بۆ ئەوەی هەموویان پێكەوە خواپەرستی بكەن، وە هەركەسێكیش هۆكارێكی ڕاست و دروستی نەبێ بۆ چوونە دەرەوە، ئەوا لەسەر هەڵەیە هەركەسێك بێت.

كەسانێك لە پێشینی چاك فەرموویانە: چوینە دەرەوە بۆ چیایەك خواپەرستی بكەین، (سُفيانُ الثوريُّ) هاتە لامان و، گەڕاندینیەوە.

---

٢٤٠ _ رواه أحمد (٥٦٥٠) عن ابن عمر.

وسنده صحيح.

وقال الهيثمي في ((المجمع)) (٨ / ١٠٤).

((رجاله رجال الصحيح)).

## ✱ ئیبلیس سەر لە زاهیدان دەشێوێنێت:

لەو سەرلێشێواندنانەی کە ئیبلیس بەرامبەر بەزاهیدان دەیکات: وایان لێدەکات ڕوو لە فێربوونی زانست وەرگێڕن و خۆیان بە زوهدو دونیانەویستیەوە خەریك بکەن، بەڕاستی داوای شتێکی نزمتر دەکەن لە جیاتی شتێکی بەرزترو خێرتر، چونکە سوودو کەڵکی کەسی زاهید لە بەردەرگای ماڵەکەی خۆی تێپەڕ نابێت ، بەڵام سوودی کەسی زانا تەنها پەیوەست نییە بەخۆیەوە بەڵکو تێپەڕ دەبێ و خەڵکی تریش دەگرێتەوە، چەندها کەسی خواپەرستی گمڕاندۆتەوە بۆ ڕێگەی ڕاست و دروست.

لە سەرلێشێواندنەکانی تری ئیبلیس بەرامبەر بەم کۆمەڵە: وایان بەخەیاڵدا دێنێت کە زوهد وازلێهێنانی شتە ڕێپێدراوەکانە(المُباحات)، بۆیە کەسانێکیان لە نانی جۆ زیاتر ناخۆن، کەسانێکیان تامی میوە ناکەن، کەسانێکیان خۆراك کەم دەکەنەوە تا جەستەیان وشك دەبێتەوەو، سزای نەفسی خۆشیان دەدەن بەپۆشینی خوری و، ئاوی ساردیش لە خۆیان قەدەغە دەکەن.

بەڵام ئەمە ڕێبازی پێغەمبەری خوا _ صلی الله علیه وسلم _ نییەو، ڕێبازی هاوەڵانیی و شوێنکەوتوانی هاوەڵانیش نییە، لەڕاستیدا برسیان دەبوو ئەگەر هیچ شتێکیان دەستنەکەوتایە، بەڵام کە دەستیان کەوتایە ؛ دەیانخوارد.

بەڕاستی پێغەمبەری خوا _ صلی الله علیه وسلم _ گۆشتی دەخواردو، حەزی لێبوو، مریشکی دەخواردو، حەزی لە حەلوا بوو، وە ئاوی ساردیشی بۆ دەهێنرا(٢٤١).

پیاوێك دەیگوت: من (الخَبِیصَ)(٢٤٢) ناخۆم، چونکە ناتوانم بەچاکی سوپاسی خوا بکەم!

پێشەوا (الحسنُ البصريُّ)یش فەرمووی:

ئەمە پیاوێکی گێلە، ئایا توانیویەتی سوپاسی خوا بکات لەسەر ئاوە ساردەکە ؟!

---

٢٤١ _ وهذا كله صحيح ثابت، ولولا خشية الإطالة لخرَّجتها بالتفصيل.

٢٤٢ _ الخَبِیصَ: ئەو حەلوایەیە کە لە خورماو ڕۆن و شارد دروست دەکرێت، بڕوانە: الجامع الكبير للسيوطي، ص ٨٤٨. وەرگێڕ.

پێشەوا (سفیانُ الثوريُّ) ئەگەر سەفەری بکردایە، گۆشتی بـرژاو و (الفـالوذج)ی(٢٤٣) لـە گەڵ خۆیدا دەبرد.

پێویستە مرۆڤ بزانێت کەوا نەفسی هۆکـاری گواسـتنەوەیەتی، بۆیـە پێویـستە بەسـۆزو بەنەرمی مامەڵەی لەگەڵدا بکات، تا بەجێگەی مەبەستی دەگەیەنێت، بـا ئـەو شـتانەی بـۆ بەرێت کە چاکی دەکات و، ئەو شتانە بەجێبهێڵێت کە زیانی پێدەگەیەنێت، وەکو تێربـوون و ڕۆچون لە بەکارهێنانی شەهەوات و ئارەزوودا، چونکە ئەو شتانە زیان بـە جەسـتەو ئـاینیش دەگەیەنێت.

پاشان خەڵك لە داب و نەریتیاندا جیاوازن، بۆیە ئەگـەر دەشـتەکیەکان خـوری بپۆشـن و تەنها شیر بخۆنەوە، سەرزەنشتیان ناکەین، چونکە جەستەیان ئـەوە هەڵـدەگرێت، وە خـەڵکی دەوروبەری شار ئەگەر خوری بپۆشن و، (کوامخ) (٢٤٤) بخۆن، دیسان سەرزەنشتیان ناکەین و، ناشڵێین لە نێو ئەمانەدا کەسانێك هەن زۆریـان لـە نەفـسی خۆیـان کـردووەو خۆیـان تـووش کردووە، چونکە ئەمە داب ونەریتی قەومەکەیە.

بەڵام ئەگەر جەستە ئاسوودە بوو، وە لەسەر خۆشگوزەرانی پەروەردە بوبو، ئێمە قەدەغەی خاوەنەکەی دەکەین کە زۆری لێ بکات و خۆی تووش بکات و شتانێکی لەسەر هەڵگرێت کە زیانی پێگەیەنێت، بـەڵام ئەگـەر زوهـدی هەڵبـژاردو وازلێهێنـانی شـەهەوات و ئـارەزواتی بەچاکتر دانا: هۆکاری ئەمـە دەگەڕێتـەوە بـۆ ئـەوەی کـەوا شـتی حـەڵاڵ دەسـت بڵـاوی و زێدەڕۆیی‌و سنورشکان هەڵناگرێت، یاخود خـۆراکی بەلـەزەت واپێویـست دەکـات زۆری لـێ بخورێت و، دەرەنجام مرۆڤەکە نووستن و تەمبەڵی زۆر دەبێ، لێرەدا ئەم کەسە پێویستە بزانێت

---

٢٤٣ _ الفالوذج: حەلوایەکە لە ئاردو ئاو هەنگوێن دروست دەکرا، بڕوانە: سنن ابن ماجة، باب الفالوذج. وەرگێر.

٢٤٤ _ کوامخ: واتە پێخۆر، یاخود ترشیات و زەڵاتەو شتی وا کە ئیشتیهای خـواردن بکاتـەوە، بڕوانـە: المعجم الوسیط، وەرگێڕ.

کەوا وازلێهێنانی چ شتێك زیانی پێدەگەیەنێت و چ شتێکیش زیانی پێناگەیەنێت، ئینجا ئەندازەیەك بەکاردێنێ بەشی بکات بەبێ ئەوەی زیان بە خۆدی خۆی بگەیەنێت.

ناوپیش نادرێتەوە لە قسەکانی (الحارثِ المحاسبيُّ) و (أبي طالبٍ المكيُّ) کە باسی کەمکردنەوەی خۆراك و، کۆشش دەکەن بەرامبەر بەنەفس بەوەی واز لە شتە ڕێپێدراوەکان (المُباحات) بهێنرێت ؛ چونکە پەیڕەوکردنی دانەری شەرع (الشارع)و هاوەڵانی شایستەترە.

(ابنُ عقيلٍ) دەیفەرموو: ئای کە کردەوەتان لە خواپەرستیدا سەسوڕمێنە ! یا شوێنکەوتنی هەواوئارەزوویەکە، یا گۆشەنشینیەکی داهێنراوە، لە نێوان شادومانبوون بەهەڵەشەیی لاوێتی و یاریکردن و، لە نێوان پشت گوێ خستنی مافەکان و، دستلێهەڵگرتنی خاووخێزان، ئەوەبۆ بەگوێرەی ئەقڵ و شەرع خواپەرستی ناکەن.

لە سەرلێشێواندنەکانی تریشی: وایان بەخەیاڵدا دێنێت کە زوهد بریتیە لە ڕازی بوون بە نزمترین و بێ بەهاترین خۆراك و پۆشاك و هیچیتر، ئەوان بەمە ڕازین و، دڵیشیان ئارەزووی سەرۆکایەتی و پێشەنگێتی و، شان و شەوکەت و شکۆمەندی دەکات، چاوەڕێ دەکەن ئەمیرو سەرکردەکان دیدەنیان بکەن، وە ڕێزی دەوڵەمەندان دەگرن بەبێ هەژاران، وە ملیان کەچ دەکەن لە کاتی چاوپێکەوتنی خەڵکدا، وەکو ئەوەی لە (مُشاهد)یەکەوە(٢٤٥) دەرچووبن، ڕەنگە کەسی واشیان تێدابێ ماڵ و دارایی بگەڕێنێتەوە، بۆ ئەوەی نەگوترێت: لە زوهدەوە بۆی دەرکەوتووە، لە بواری نامشۆکردنی خەڵك بۆ لایان و، ماچکردنی دەستیان، ئەمانە لە نێو فراوانترین دەروازەکانی دۆستایەتی و پشتگیریەکانی دونیادان، چونکە مەبەستی دونیا سەرۆکایەتی و پێشەنگێتی بەدەستهێنانە.

---

٢٤٥ _ المشاهدة: بەپێی بۆچۆنی تەصوف بینینێکی ڕاستەوخۆی غەیب و حەقیقەت و ڕاستیەکانی خوایە بەچاو، بۆ دڵنیابوون بگەڕێرەوە بۆ ئەم سایتە: www.dorar.com. وەرگێڕ.

## ✸ ئیبلیس سەر لە خواپەرستان دەشێوێنێت:

ڕووپامـایی شـاراوە (خفـيُّ الريـاء) زۆرتـرین شـتێکە کـە ئیبلـیس بەکاریـدەهێنێ بـۆ سەرلێشێواندنی زاهیدان و خواپەرستان، بەڵام ڕووپامایی ئاشکرا، وەکو بەدەرخـستنی لاوازی و، ڕوو زەردبوونەوەو، خۆڵاوی بوون و بژبوونی پرچ، بۆ ئەوەی زوهدی پێ بزانرێـت، هـەروەها نزمکردنەوەی دەنگ بۆ بەدەرخستنی دڵکزی (خشوع)، هـەروەها ڕووپامـایی کـردن بەنوێـژو صەدەقە، ناچنە بواری سەرلێشێواندنەوە، چونکە شتگەلێکی وەکو ئەم دیاردانە شاراوە نابن.

لەڕاستیدا تەنها ئاماژە بۆ ڕووپامایی شاراوە دەکەین، پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ فەرموویەتی: ((إِنَّما الأعمالُ بالنِّيَّاتِ))(٢٤٦). واتە: ((لەڕاستیدا کـاروکردەوە تـەنها بەنیێتە)).

وە هەرکاتێك کردەوە لەبەر خوای تعالی ئەنجام نەدرا، قبوڵ نابێ.

(مالكُ)ی کوڕی (دینارٍ) فەرموویەتی: بەو کەسەی ڕاسـتگۆ نییـە بڵـێن: خـۆت مانـدوو مەکە !

بزانە مرۆڤی ئیماندار کردەوەکانی تەنها بۆ خوای تعالی ئەنجام دەدات، بـەڵام ڕووپامـایی شارەوەی تێکەڵ دەبێ و، کارەکەی لێ تێك دەدات و، ئیتر ڕزگاربوونی لەو ڕووپامایە شـاراوە قورس دەبێ.

لە (یسارٍ)ەوە دەڵێت: (یوسُفُ)ی کوڕی (أسـباطٍ) پێی گوتم: ڕاست و دروستی کـردەوە لـە خراپیەکەی جیابکەونەوەو فێری بن، چونکە من لە ماوەی بیست ودوو ساڵدا فێری بووم.

پیاوچاکان لە ترسـی ڕووپامایـدا کردەوەکانیـان دەشـاردەوە بـۆ ئـەوەی پـارێزراو بێـت، دەشیانپرازاندەوە بەدژەکانی، وەکو (ابنُ سیرینَ) کە بەڕۆژ پێدەکەنی و، بەشەو دەگریا.

هەروەها (ابـنُ أدهـم) ئەگـەر نـەخۆش بکەوتایـە، ئـەو خۆراکانـەی بـەلاوە دەبینـرا کـە تەندروستان دەیانخوارد.

---

٢٤٦ _ رواه البخاري (١ / ٧)، ومسلم (١٩٠٧) " عن عمر (رضي الله عنه).

(بَكّارِ)ی كوڕی (عبدِاللهِ) گوێبیستی (وهب)ی كوڕی (مُنَبِّه) بوو دەیگوت: پیاوێك هەبوو چاكترینی خەڵكی زەمەنەكەی خۆی بوو، خەڵكی دیدەنیان دەكردو، ئەویش ئامۆژگاری دەكردن، ڕۆژێك لای كۆبونەوەو، ئەویش گوتی: ئێمە لە دونیا چوینە دەرەوەو، خاووخێزان و ماڵ و سەرەوەتمان بەجێهێشت لە ترسی بێدادی و ستەمی بێ سنور. بەڵام لەم باروحاڵەتەشماندا بێدادی و ستەمێكی بێ سنورمان تێكەڵ بوە زیاتر لەوەی كە تێكەڵ بەخاوەن ماڵ و سەروەتان دەبێت، لە ماڵ وسەروەتەكانیاندا، وادەبینم كەسێكمان حەزی بەوەیە پێویستیەكانی بۆ جێبەجێ بكرێت و، ئەگەر چاویشیان پێكەوت سڵاوی لێ بكرێت و، بەویقارو ڕێزەوە تەماشای بكرێت، لەبەر پایە ئاینیەكەی.

ئەو گوفتارانە بڵاوبویەوە تا بەپاشا گەشت، زۆر پێی سەرسام بوو، بۆیە سواربوو تا دیدەنی بكات و، سڵاوی لێ بكات و، تەماشای بكات، كە پیاوێك پاشای بینی، پێی گوت: ئەمە پاشایە هاتووە بۆ لات بۆ ئەوەی سڵاوت لێ بكات ! ئەویش گوتی: ئەی لە بەر چ شتێك هاتووە ؟ پیاوەكەش گوتی: لە بەر ئەو گوفتارانەی كە لە وەعزو ئامۆژگاریەكەتدا باست كرد. بۆیە لە خزمەتكارەكەی خۆی پرسی: ئایا هیچ خۆراكێكت هەیە ؟ گوتی: شتێك لە بەری ئەو درەختەی كە كە ڕۆژووت پێ دەشكان، فەرمانیدا بیهێنن، خۆشی لەسەر بەڕەیەك دانیشت و، خۆراكەكەی خرایە پێش دەست و، دەستی بەخواردنی كرد، پێشتریش بەردەوام بەڕۆژوو بوو و، نەشیدەشكاند، پاشا لەسەر سەری وەستاو، سڵاوی لێكرد، بەوەڵامدانەوەیەكی كز وەڵامی دایەوەو، دیسان دەستی كردەوە بە خۆراك خواردنەكەی، پاشاكە گوتی: پیاوەكە لە كوێ یە، پێی گوترا: ئەمە خۆیەتی ! گوتی: ئەمەی كە دەخوات؟! گوتیان: بەڵێ. گوتی: هیچ خەیرێك بەلای ئەمەوە نییە ؟ ئەوەبوو پشتی هەڵكردو ڕۆشت، پیاوەكە گوتی: سوپاست بۆ ئەو خوایەی لێی دورخستیتەوە.

(ریوایە)تێكی دیكە لە (وهب)ەوە هاتووە كەوا كاتێك پاشاكە هات، خزمەتكارەكە هەستاو خۆراكەكەی خستە پێش دەستی، ئەویش سەوزەواتەكەی لە پارویەكی گەورەدا كۆدەكردەوەو، دیكرد بە زەیتەكەداو، بەتوندی و بەبێ پەروا دەیخوارد، پاشاكە پێی گوت: ئەی

فلان تۆ چونیت ؟ گوتی: وەکو خەڵك. ئەوەبوو پاشاکە جەڵەوی وەڵاخەکەی گەڕاندەوەو، گوتی: هیچ خێرێك لەمەدا نییە. بۆیە گوتی: سوپاست بۆ خوا کە لێی دورخستمەوە لە کاتێکدا لۆمەی دەکردم.

کەسانێك لە زاهیدان هەن زوهد لە ناوەوەو دەرەوەش بەکاردەهێنن، بەڵام ئەوەش دەزانن کە ئەگەر زوهدو وازهێنانەکانی خۆیان لە دونیا بۆ هاوەڵانیان یاخود بۆ خێزانەکانیان باس بکەن، ئەوا ئارامگرتنیان بەلاوە ئاسانتر دەبێ.

بەڵام ئەگەر دەیانویست بەڕاستی لە زوهدەکانیاندا دڵسۆز بن، ئەوا لە گەڵ خاوخێزانەکانی خۆیاندا دەیانخوارد بەو ئەندازەیەی کە شکۆمەندی نەفسیان لە سەر نەدەماو، قسەی خەڵکیان لەسەر خۆیان دەبڕی.

(داودُ)ی کوڕی (أبّي هندٍ) بیست ساڵ بەڕۆژوو بوو، کەچی خاوخێزانەکەی پێیان نەدەزانی، چونکە خۆراکەکەی خۆی هەڵدەگرت و، بۆ بازار دەچوو، لەڕێگەش بەخێرو صەدەقەی دەکرد، بۆیە خەڵکی بازار وایان دەزانی لە ماڵەوە خواردویەتی و، ماڵەوەش وایاندەزانی لە بازار خواردویەتی.

ئا ئاوەها بوون خەڵکی (٢٤٧).

---

٢٤٧ _ ئەوانە چاکترین خەڵك بوون، بەرەحمەتی خوا بن، خوا گەورە بەخێر ئێمەش بەوان بگەیەنێت.

## ✸ ڕەخنەگرتن لە ڕێبازی زاهیدان:

زاهیدان کەسی وایان تێدایە ئەوپەڕی هێزی بریتیە لە دابڕان و مانەوە لە مزگەوتێکدا یاخود لە خەلوەتگەیکدا (رباط) یاخود لە چیایەکدا، چونکە حەزو لەزەتی لەوەدایە کە خەڵك بە تەنیایەکەی بزانن، پێدەچێ بۆ دابڕانەکەشی بەهانە بهێنێتەوە بەوەی کە دەترسم لە کاتی چوونە دەرەوەمدا خراپە ببینم.

لەو ڕەفتارەیدا مەبەستگەلێکی هەیە: لەوانە خۆبەزلزانین و بەسووك سەیرکردنی خەڵك، هەروەها دەترسێت خەڵك کەمتەرخەمبن لە خزمەتکردنیدا، هەروەها پاراستنی ناموس و سەرکردەیی و پێشەنگێتیەکەی، چونکە تێکەڵبوونی خەڵك ئەوانە لادەبات، ئەویش دەیەوێت هەڵنان و ستایشکردن و ناوبانگی بمێنێت، لەوانەشە مەبەستی ئەوە بێت کە عەیب و خراپەو نەفامیەکانی بەزانست داپۆشێت، بۆچۆنی ئاوەهایەو، حەزیشی بەوەیە دیدەنی بکرێت و دیدەنی نەکات، وە شادومان دەبێ بە هاتنی ئەمیرو سەرکردەکان بۆ لای و، خەلکی ئاسایی لەبەر دەرگاکەیدا کۆبنەوەو، دەستی ماچ بکەن، سەەردانی نەخۆش و، ئامادەبونی ناشتنی تەرمی مردووان واز لێدەهێنێت و، بەهاوەڵانی دەڵێت: گلەی لەسەر شێخ لابەرن، چونکە ئەمە عادەتی ئەوە !

نەخێر عادەتێکەو پێچەوانەی شەریعەتە.

ئەم مرۆڤە ئەگەر پێویستی بە خۆراك بێ و، هیچ کەسێکی بەدینەکرد بۆی بکرێت، لە سەر برسێتی ئارام دەگرێت، بۆ ئەوەی بەخودی خۆی نەچێتە دەرەوە بۆ کڕینیی و، شان و شەوکەتی نەمێنێت بەهۆی ڕێکردنیەوە لە نێوان خەلکی ئاسایدا، وە ئەگەر بچوایەتە دەرەوەو، پێداویستیەکانی بکڕیبا، ناوبانگی لێ دەبڕاو، لە ناخی خۆیەوە نەفرەتی لە پاراستنی ڕازو فرت و فێڵەکانی دەکرد.

بەڵام پێغەمبەری خوا _ صلی الله علیه وسلم _ دەچووە دەرەوە بۆ بازاڕ، پێداویستیەکەی دەکڕی و، خۆشی هەڵیدەگرت، ئیمامی (أبوبکر) _ خوای لێ ڕازی بێت _ بەشانەکانی پۆشاکی هەڵدەگرت، دەیکڕی و، دەیفرۆشت.

لـە (عبـدِاللهِ)ی کـوڕی (حنظلـةَ)ەوە دەڵێـت: (عبـدُاللهِ)ی کـوڕی (سَـلامٍ) تێپــەڕبوو و گورزەیەکی داروچیلکەی بەسەری هـەڵگرتبوو، خـەڵکی پێیـان گـوت: چ هـانی داوی ئەمـە بکەیت لـە کاتێکـدا خـوای تعـالی دەوڵەمەنـدی کـردووی ؟ فـەرمووی: ویـستم بـەم کـارە خۆبەزلزانین لە خۆم دورخەمەوە، چونکە گوێبیستی پێغەمبەری خوا بووم _ صـلی الله علیـە وسلم _ دەیفەرموو: ((لا یدخُلُ الجنَّةَ عبدٌ في قلبِهِ مثقالُ ذَرَّةٍ مِن الكِبْرِ))(٢٤٨) واتـە: ((هـەر بەندەیەك بەئەندازەی کێشی گەردیلەیەك خۆبەزلزانین لە دڵیدا بێت ناچێتە بەهەشتەوە)).

نووسەر دەفەرمێت:

ئەمەی کە باسم کرد سەبارەت بەچوونە دەرەوە بۆ کڕینی پێداویستی و دەسـتبەرداربوونی شەرم و خۆپارێزی، ڕەوشت و عادەتی پێشینە چاکە دێرینەکان بوو، بەڕاستی ئـەو ڕەوشـت و عادەتە گۆڕا وەکو چۆن باروحاڵ و جل و بەرگیش گۆڕا، ئەمڕۆ بەباشـی دانـانێم زانـا بـچێتە دەرەوە بۆ کڕینی پێداویستیەکانی(٢٤٩)، چـونکە ئـەوە نـورو ڕونـاکی زانـست بـۆ نـەفامان دەخاتەڕوو، بەلایانەوە ڕێزلێنانیشی ڕەوایە، ڕاگرتنی دڵیشیان لە شتێکی وەکو ئەمەدا مـرۆڤ تووشی ڕووپامایی دەکات، لە تواناشدا نییە قەدەغەی بەکارهێنانی ئەو شـتانە بکرێـت کـە هەیبەت و ڕێز لە دڵاندا دروست دەکەن.

---

٢٤٨ _ قال المنذري في ((الترغيب والترهيب)) (٥ / ١٨٧):

((رواه الطبراني بإسناد حسن)).

وكذا قال الهيثمي في ((مجمع الزوائد)) (١ / ٩٩).

وانظر ((صحيح الجامع الصغير وزيادته)) (رقم ٧٦٧٤) لشيخنا الألباني.

وللمرفوع منه طرق عدّة صحيحة.

٢٤٩ _ بەتایبەت لەو بازاڕانەی کە هەندێ شتی نابەجێی تێدا بڵاوبۆتەوە وەکو خراپەکاری و، دووربوون لـە زیکری خواو، تێکەڵبوونی پیاوان و ژنان و، جگە لەوەش لە بەد ڕەوشتیەکانی دیکە.

بەڵام ئەگەر جێگەیەك هەبێ و کڕین و فرۆشتنی تێدا ئەنجام بدرێت و، هێچ شتێك لەوانەی تێدا نـەبێ کـە ئاماژەم پێدا، ئەوا هیچ ڕێگرێك نی یە بۆ چونەدەرەو کڕینی و، هتد..

هەموو ئەو شتانەش کە پێشینی چاك دەیانکردو، ئەورۆژە دڵانی خەڵکی پیێ نـەدەگۆڕدرا پێویستە ئەمرۆ نەکرێت.

پێشەوا (الأوزاعيُّ) فەرموویەتی: پێدەکەنین و شۆخی و گاڵتەوگەپمان دەرکرد، بـەڵام ئەگەر وامان لێهاتبێت خەڵکی شوێنمان بکەون، وادەزانم چیتر ئەوەمان پیێ ناکرێت.

لە (إِبـراهیمَ)ی کـوڕی (أَدْهَـم)ەوە بۆمـان دەگێڕنـەوە کـەوا ڕۆژێـك هاوەڵـانی شـۆخی و گاڵتەوگەپیان دەکرد، لەو کاتەدا پیاوێك لە دەرگای دا، ئەوەبوو فەرمانی پیێ کردن بێدەنگ و کپ بن، ئەوانیش گوتیان: فێری ڕووپامایمان دەکەی ؟! فەرمووی: من حەزم بەوە نییە بـەهۆی ئێوەوە سەرپێچی خوای تعالی بکرێت.

نووسەر دەفەرمێت:

لەڕاستیدا لەوە دەترسا کەسانی نەفام بڵێن: تەماشای ئەم زاهیدانە بکەن چ دەکەن ؟

چونکە کەسانی ئاسایی پێشبینی ناکەن خواپەرستان شتانێکی وەکو ئەوە ئەنجام بەن.

## ✱ ئیبلیس سەریان لێدەشێوێنێت سەبارەت بەخووگرتن بەئەنجامدانی شتانێکەوە کە پێویست نیە:

لەم کۆمەڵە کەسانێك هەن ئەگەر داوای لێبکرێت پۆشاکە نەرمونیانەکانی بپۆشێت، ئەنجامی نادات، نەوەکا شان وشەوکەتی لە زوهدا کەم بێتەوە، ئەگەر ڕوحی دەرچێت خۆراك ناخوات و خەڵکی بیبینن، نەفسی خۆی دەپارێزێت لە زەردەخەنە سەرەڕای پێکەنین، چونکە ئیبلیس وای بەخەیاڵدا دێنێت ئەمە بۆ چاکردنی خەڵکە، کەچی لەڕاستیدا ئەو تەنها ڕووپامایەکەو، یاسای ڕازو فێڵەکانی خۆی پێ دەپارێزێت، دەبینیت سەری دانواندوەو، ئاسەواری خەفتباری بەڕوخساریەوە دیارە، ئەگەر تەنیاش بێتەوە، دەبێ بە شێری (شَرى)(٢٥٠).

پێشینی چاك خۆیان لە هەموو ئەو شتانە دوردەخستەوە کە دەبویە هۆکاری ئاماژە بۆکردنیان، وە هەڵدەهاتن لەو شوێنەی تیایدا ئاماژەیان بۆ دەکرا.

(یوسفُ)ی کوڕی (أَسباطٍ) دەڵێت: بەپێ لە (سَبَج)ەوە دەرچووم، تا گەشتمە (المِصِّیصةَ)و(٢٥١) تورەکەکەم بەملمەوە بوو، ئەم کەسە لە نێو فرۆشگاکەیەوە هەستاو سڵاوی لێدەکردم و، ئەو کەسەش سڵاوی دەکرد، دواتر کە تورەکەکەم فڕێداو، چوومە مزگەوتەوە دوو ڕکات نوێژ بکەم، هەموویان چاویان تێبڕیم و، پیاوێکیش لە پێشمدا هەستاو منی گرتەئەستۆ! لە دڵی خۆمەوە گوتم: تا چەند بەرامبەر بەم ڕەفتارانە دڵی خۆم ڕاگرم ؟! بۆیە تورەکەکەم هەڵگرت و، بەماندویەتی و ئارقی خۆمەوە گەڕامەوە بۆ (سَبَج)، ئیتر نەگەڕامەوە بۆ دڵم تاوەکو دوو ساڵ.

---

٢٥٠ _ شَرى: ناوی شوێنێکە، بڕوانە: لسان العرب. وەرگێڕ.

٢٥١ _ سَبَج، المِصِّیصة: ناوی دوو شوێنن.

زاهیدان کەسی وایان تێدایە پۆشاکی شـڕو کـون کـون دەپۆشـێت و نایدورێتــەوە، واز لــە چاکردنی مێزەرەکەشی دێنێ و، ڕیشیشی شانە ناکات، بۆ ئەوەی وابیینرێت کە بەتەمای هێچ خێرێکی دونیایی نیە !

ئەم ڕفتارە یەکێکە لە دەروازەکانی ڕووپامای، بۆیە ئەگەر ئەم زاهیدە ڕاستگۆیەو واز لەو شتانە دێنێ _ وەکو ئەوەی بە (داودَ الطائيِّ) گـوترا: ئایـا ڕیـشت شـانە ناکـەیت ؟ گـوتی: دڵنیابن من سەرقاڵم _ بادڵنیا بێت ڕێگەیەکی دیکـەی گرتۆتەبـەر، چـونکە ئەمـە ڕێبـازی پێغەمبەری خوا _ صلی الله علیه وسلم _و هاوەڵانی نییە، پێغەمبـەری خـوا _ صـلی الله علیه وسلم _ ڕیشی شانە دەکردو، چـەوری دەکـردو، بـۆنی خۆشیـشی بـەکاردەهێناو(٢٥٢)، سەرقاڵترین خەڵکیش بوو بە ڕۆژی دوایەوە.

هەردوو پێشەوایان (أبوبكرٍ) و (عمر) _ خوایان لێ ڕازی بێت _ بەخەنـەو (الكَـتْم)(٢٥٣) پرچی سەریان ڕەنگ دەکردو، لە هەموو هاوەڵانیش زیاتر لەخوا دەترسان و، لـە هەمووشـیان زاهیدتر بوون.

بۆیە هەرکەس بانگەشەی پلەیەك بکات لە سوننەت و کـردەوەی گـەورەکان زیـاتر بێـت، ئاوری لێنادرێتەوە. لە زاهیداندا کەسی وا بەدیدەکرێت کە بەردەوام دەبێ لەسەر بێدەنگی و، تەنیا دەبێتەوەو، تێکەڵاوی خاوخێزانی نابێت، بۆیە بەڕەوشتی ناشیرینی ئازاریـان دەدات و، فەرمایشتەکەی پێغەمبەری خوای _ صلی الله علیه وسلم _ بیردەچێتەوە: ((إنَّ لأهلِكَ عليكَ حقاً))(٢٥٤) واتە: ((بەڕاستی خاوخێزانەکەت هەقیان بەسەرتەوە هەیە)).

---

٢٥٢ _ وهذا كلُّه صحيحٌ ثابتٌ " كمـا تـراه في ((شمائـل الترمـذي))، و ((أخـلاق النبـي)) لأبـي الـشيخ، وغيرها.

٢٥٣ _ الكَتْم: ڕووەکێکە تێکەڵ بە وەسمە دەکرێت و بۆ ڕەنگکردنی پرچ بەکاردێت، بڕوانە: الطب النبوي، ابن القيم. وەرگێڕ.

٢٥٤ _ تقدَّم تخريجه.

پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ شۆخی و گاڵتەوگەپی دەکرد، ئەوەبوو لە گەڵ منداڵاندا یاری دەکردو، لە گەڵ خێزانەکانیدا دەدواو، لە گەڵ خاتوو (عائشة)شدا _ خوای لیّ ڕازی بێت _ پێشبڕکێی دەکرد(٢٥٥)... وە چەندین ڕەوشتی جوانی نەرم ونیانی دیکەش.

ئا ئەم کەسەی کە خۆی کردوە بەزاهیدو، هاوسەرەکەی کردوە بەبێوەژن و، منداڵەکەی کردوە بە هەتیو و، لێیان تاك بۆتەوەو، ڕەوشتیشی ناشیرینە، وای بەخەیاڵدا دێت ئەو شتانە سەرقاڵی دەکات و ناهێڵێت بە قیامەتەوە خەریك بێت، بەڵام نازانێت _ لەبەر کەمی زانستی _ کە شادی و کەیفخۆشی لە گەڵ خاووخێزاندا یارمەتیدەرە بۆ ئەنجامدانی ئەو کردەوانەی کە ڕۆژی دوایی پیّ مسۆگر دەکرێت.

وفي ((الصحيحين)) أنَّ النبـيّ (صلى الله عليه وسلم) قال لجابر:

((هلَّا تزوَّجْتَ بِكراً تُلاعِبُها و تُلاعِبُك))(٢٥٦).

واتە: پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ بە (جابر)ی فەرموو:

((بۆ کچێکت نەخواست گەمەت لە گەڵدا بکات و گەمەی لە گەڵدا بکەی)).

پێدەچێ زاهید قەدەغەکردنی نەفسی خۆی بەسەردا زاڵ بێت و، واز لە جووتبوونی خێزانی بێنێت و، فەرزێك بەکردەوەیەکی ناستایشکراو بفەوتێنێت.

زاهیدان کەسی وایان تێدایە کردەوکانی خۆی دەبینێت و، پێی سەرسام دەبێت، ئەگەر پێی گوترا: تۆ لە کۆڵەکەکانی زەمینیت (أوتاد الأرض)(٢٥٧) “ وای بەخەیاڵدا دێت ئەوە ڕاستە !

کەسی واش هەیە چاوەڕێی دەرکەوتنی کەراماتی _ کاریّ ناسروشتی بێت و لە غەیری پێغەمبەرانەوە ببینرێت _ خۆی دەکات، وای بەخەیاڵدا دێت کە ئەگەر نزیکی ئاو بکەوێتەوە دەتوانێت بەسەریدا ڕێ بکات، ئەگەر شتێکی تووش بیّ و، دەستی بەنزاکردن کردو، وەڵامی نەدرایەوە، لە ناخەوە ڕێنگە ڕێنگ دەکات و بێزاری دەردەبڕێت، وەکو ئەوەی کرێکار بێت و

---

٢٥٥ _ وهو صحيح أيضاً، وانظر التعليق قبل السابق.

٢٥٦ _ رواه البخاري (٩ / ١٠٤)، ومسلم (٧١٥).

٢٥٧ _ أوتاد الأرض: دەستەواژەیەکی صۆفیەکانەو هیچ بنەڕەتێکی لە قورئان و سوننەتدا نییە.

داوای کرێی کارەکەی خۆی بکات، بەڵام ئەگەر تێگەشتنی پێدرایە، دەیزانی بەندەیەو موڵکی یەکێکی ترە، بەندەش منەت بەکارەکەیەوە ناکات، ئەگەر تەماشای بکردایە کە خوای تعالی ڕێنومایی کردوە بۆ کارکردن، دەیزانی پێویستە سوپاسگوزاری بکات، ئەو کاتەش دەترسا کەمتەرخەمی تێدا بکات، وە پێویست بوو ئەمەندە بەتەنگی کردەوەکانی خۆیەوە بهاتایە بۆ ئەوەی هیچ کەمتەرخەمیەکی تێدا نەکردایە، بەگەشتایەتە ئەو ئاستەی سەرقاڵیی بکردایەو، چیتر چاوەڕێ نەبوایە تا بەهۆیەوە خوای تعالی لەدونیادا کەرامات و شتی تری بۆ بڕەخسێنێت، هەوەکو ئەوەی لە پێشینی چاکدا کەسی وابوو دەیگوت: لە خوای تعالی داوای ئێخۆشبوون دەکەم سەبارەت بەکەمی ڕاستگۆیم لە گوفتارەکانمدا. پێشی گوترا: ئایا هیچ کردەوەیەکت ئەنجام داوە وابزانیت لێت قبوڵ دەکرێت ؟ گوتی: ئەگەر بشبێت، ترسم لەوەیە بدرێتەوە بەسەرما.

لەو سەرلێشێواندنانەی کە ئیبلیس بەرامبەر بە کۆمەڵێك لە زاهیدانی دەکات و، لە دەروازەی کەمی زانستەوە بۆیان دەچێتە ژورەوە ئەوەیە کە بە واقیعاتی خۆیان کاردەکەن و، نە گوفتاری زاناو فەقیهان ئاوڕنادەنەوە.

(ابنُ عقيلٍ) دەفەرمێت: (أبو إسحاقَ الخَزَّاز) پیاوێکی کارچاك بوو، یەکەم کەس بوو کە کتێبی خوای تێگەیاندم و حاڵی کردم، ڕەوشت و عادەتی وابوو لە مانگی ڕەمەزاندا وازی لە قسەکردن دەهێناو، تەنها بە ئایەتەکانی قورئان دەدوا، سەبارەت بەو پێداویستیانەی ڕوو بە ڕووی دەبویەوە، ئەوەبوو کاتێ مۆڵەتی هاتنەژورەوەی کەسێکی بدایە دەیگوت: ﴿ ادْخُلُوا عَلَيْهِمُ البَابَ ﴾ المائدة: ٢٣ ﴾ واتە: لە دەرگاوە بچنە ژورەوە بۆ لایان، لە ئێوارەی بەرۆژوبونیشدا بەکورەکەی خۆی دەگوت: ﴿ مِن بَقْلِها وقِثَّائِها ﴾ البقرة: ٦١ ﴾ واتە: فەرمانی پێدەکرد کەوا سەوزەوات و خەیارو ترۆزی بۆ بکڕێت ! منیش پێم گوت: ئەمەی کە بەپەرستنی دادەنێی لە ڕاستیدا سەرپێچیە. بەلایەوە قورس بوو، گوتم: ئەم قورئانە پیرۆزە بۆ

ڕوونكردەوەی حوكمە شەرعیەكان دابەزێنراوەو، بـۆ ئەنجامـدانی شـت و مەبەسـتی دونیـایی بەكارناهێنرێت، ئەوەبوو هەجری كردم و، گوێی لە بەڵگەكانم نەگرت(٢٥٨) .

پێشینی چاك قەدەغەی زاهیدیان دەكرد فەتوا بدات ئەگەرچی زانستێكی زۆریشی بزانیبا، چونكە مەرجەكانی فـەتوای تێـدا كۆنـەبوبۆوە، ئـەی ئەگـەر ئـەو بێـسەروبەریەی كەسـانی ئەمڕۆیان ببینیایە چیان دەگوت كە خۆیان كردوە بەزاهیدو بەواقیعات فەتوا دەدەن ؟!

لە (إسماعيلَ)ی كـوڕی (شَـبَّة)ەوە دەڵێـت: چـوومە دیـدەنی (أحمدَ)ی كـوڕی (حنبـلٍ) ــ (أحمدُ)ی كوڕی (حرب)یش لە مەككەوە هاتبووە دیدەنی ـ، ئەوەبوو (أحمدَ)ی كوڕی (حنبـلٍ) پێی فەرمووم: كێ یە ئەو خوراسانیەی كە هات ؟ منیش گوتم: زوهـدی ئاوهـاو ئاوەهایـەو، وەرەع و دورکەوتنەوەی لە گوناهو تاوان ئاوهاو ئاوەهایە ! فەرمووی: ئەو كەسەی بانگەشـەی ئەو شتانە بۆ خۆی دەكات پێویستە خۆی نەخاتە بواری فەتواداناوە(٢٥٩).

---

٢٥٨ ـ هاوشێوەی ئەم پیاوە لەم چەرخەدا زۆرن لەو كەسانەی خۆیان بە شێخ كـردوە، نـەئاوڕ لـە بەهانـە دەدنەوەو، نە گوێ لە بەڵگە دەگرن، تەنها ڕازیبوونە بەوەی لە باب و باپیران و شێخەكانیانەوە بۆیان بەجێ ماوە، یاخود لە وەڵاتەكانی خۆیاندا لەسەری ڕاهاتوون، بۆ ڕاگرتنی دڵی ڕەمەكی خەڵك و، مـەرایی كـردن بۆ خەڵكی ئاژاوەگێڕو هەرچی وپەرچی.

٢٥٩ ـ مەسەلەی فەتوادان مەسەلەیەكی زۆر گرنگە، بـەلای زۆرێـك لـە خەڵكـەوە تێگەشـتنی تێكـەڵ وپێكەڵ دەبێت، بۆیە پێویستە بەوردی لێـی بكۆڵرێتـەوەو هەڵبـسەنگێنرێت و، بەشـێنەیی و پەلەنـەكردن كاری پێبكرێت.

ولتُنْظَر رسالة ((صلاح العالَم بإفتاء العالِم)) للشيخ حامد العمادي، بتحقيقي وتعليقـي، طبـع دار عمـار، عمان.

## * له نێوان زاهیدان و خوا پەرستاندا:

لەو سەرلێشێواندنانەی کە ئیبلیس بەرامبەر بەزاهیدانی دەکات: بەسووك سەیرکردن و زەمکردنی زانایانە، ئەمانە دەڵێن: مەبەست کردەوەیە، بەڵام نەیانزانیوە زانست نورو ڕوناکی دڵە، ئەگەر جێگەوپایەی زانایانیان لە بواری پاراستنی شەریعەتدا بزانیبا، کە وەکو جێگەوپایەی پێغەمبەرانە(٢٦٠)، ئەوجا لە ئاستی ڕەوانبێژاندا خۆیان بەلاڵ دادەناو، لە ئاستی بیناو زیرەکانیشدا خۆیان بەکوێر دادەنا، زانایان نیشاندەری ڕێگەن و، خەڵکیش بەدوایانەوەن، کەچی ساغ و تەواوی ئەوان بەتەنیا ڕێ دەکات.

وفي ((الصحيحين)) من حديث سهْلِ بنِ سعد أن النبيَّ _ صلى الله عليه وسلم _ قالَ لعليٍّ ابنِ أبي طالبٍ _ رضي الله عنه _:

((واللهِ لأنْ يَهْدي الله بكَ رجلاً واحداً خيرٌ لكَ من حُمُرِ النَّعَمِ))(٢٦١) واتە: لە (سهْلِ)ی کوڕی (سعد)ەوە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ بە (علي) کوڕی (أبي طالب)ی فەرموو:

((سوێند بەخوا ئەگەر خوای تعالى تۆ بکا بەهۆکاری ڕێنیشاندانی یەك پیاو بۆ ڕێگەی ڕاست لە وشترە سوورەکان بۆ تۆ چاکترە)).

لەو عەیب و ناتەواویانەی دەیدەنە پاڵ زانایان: زانایان بەفراوانی هەندێ لە ڕێپێدراوەکان (المباحات) بەکاردێنن کە خۆیانی پێ بەهێز دەکەن بۆ خوێندنی زانست، هەروەها عەیب و ناتەواوی دەدەنە پاڵ ئەوانەی ماڵ و دارایی کۆدەکەنەوە !

---

٢٦٠ _ چونکە زانایان میراتگری پێغەمبەرانن " وەکو ئەوەی بە (صحيح)ی لە پێغەمبەری خواوە (صلى الله عليه وسلم) هاتووە.

فرواه أبوداود (٣٦٤١)، وابن ماجة (٢٢٣)، وابن حبان (٨٨)، وأحمد (٥ / ١٩٦)، وفي سنده ضعفٌ.

وله طريقٌ أخرى في ((سنن أبي داود)) (٣٦٤٢) يتقوَّى بها.

٢٦١ _ رواه البخاري (٧ / ٥٨)، ومسلم (٢٤٠٦).

بەڵام ئەگەر لە مانـای ڕێپێـدراو (مُبـاح) تێگەشـتنایە، دەیـانزانی ئـەو کەسـەی کـاری پێدەکات زەم ناکرێت و، ئەپەڕی شتەکە ئەوەیە کە شـتی تـر هەیـە لـە سـامان کۆکردنـەوە شایستەترە، ئایا چاکە ئەو کەسەی کە شەونوێژ دەکات عـەیب و ناتـەواوی بداتـە پـاڵ ئـەو کەسەی کە نوێژە فەرزەکەی کردو نووست ؟!

وەی بۆ زانایان لە کەسی زاهیدی نەفام کە بەزانستی ئەو زاهیدە قایل دەبێ و، وادەبینێت کە زیادە فەرزە.

لە (مالك)ی کوڕی (دینـارِ)ەوە _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی: دڵنیابن شەیتان بە (القُرَّاءِ) واتە: خوێنەران یاری دەکات، وەکو چۆن منداڵان یاری بەگوێز دەکەن.

لێرەدا مەبەست بە (القُرَّاءِ) زاهیدانە، ئەمەش ناوێکی ناسراوی کۆنی ئەوانە.

واللە الموفق للصواب، وإليه المرجعُ والمآبُ.

# بەشی دەیەم

# سەبارەت بە سەرلێشێواندنەکانی ئیبلیس بەرامبەر بە صوفیەکان لە کۆمەڵی زاهیدان:

نووسەر دەفەرمێت:

صوفیەکان لە کۆمەڵی زاهیدانن(٢٦٢)، پێشتر باسی سەرلێشێواندنەکانی ئیبلیسمان بۆکردن بەرامبەر بە زاهیدان، بەڵام صوفیەکان لە زاهیدان تاك بونەتەوە بەهەندێ سیفات و باروحاڵ، نیشانەش کراون بەهەندێ نیشانە، بۆیە پێویستمان بەوەبوو لە باسکردندا تاکیان بکەینەوە.

تەصوف ڕێبازێکە بەزوهدێکی پەتی دەستی پێکرد، پاشان تایەفەکە مۆڵەتی بیستن و سەماکردنیان بەنەفسی خۆیان دا، ئەوەبوو داواکارانی ڕۆژی دوایی لە خەڵکانی ئاسایی هەواداریان بوون، لەبەر ئەو زوهدەی دەریاندەبڕی، کەسانی داواکاری دونیاش هەواداریان بوون، لەبەر ئەو حەسانەوە بێ قرەو مشەو یاریکردنەی کە بەلایانەوەبوو.

بۆیە پێویستە سەرلێشێواندنەکانی ئیبلیس بەرامبەر بەم تایەفە ئاشکرا بکەین، بەتایبەت لە ڕێگەو ڕێبازی کۆمەڵەکەدا، ئەوەش ئاشکرا نابێت مەگەر بە باس کردن و ئاشکراکردنی بنەڕەتی ڕێگەو ڕێبازو لقەکانی ئەهلی تەصوف و، باسکردنی کاروباریان.

والله الموفّقُ للصوابِ.

نووسەر دەفەرمێت:

لە زەمەنی پێغەمبەری خوادا _ صلى الله عليه وسلم _ وابەستەگی و هاوگریی (النِّسبةُ) مرۆڤ بۆ ئیمان و ئیسلام بوو، دەگوترا: موسڵمان و ئیماندار (مۆمن)، پاشان ناوی زاهیدو خواپەرست (عابد) هاتە ئاراوە، پاشان کۆمەڵانێکیش پەیدا بوون بەزوهدو بە

٢٦٢ _ انظر ما سيأتي تعليقاً في التفريق بين الزُّهَّاد والصُّوفية.

خواپەرستیەوە(التعبُّد) پابەندبوون، لە دونیا وازیان هێناو، خۆیان بۆ خواپەرستی (العبادة) تەرخانکرد، بۆ بەجێهێنانی ئەو خواپەرستیە ڕەوش و شێوازێکیشیان پیادەکرد پێی تاکبوونەوە، ڕەوشت و ئاکارێکیشیان پیادەکرد ئیتر بویە ڕەوشت و ئاکاریان، گوتراوە یەکەم کەسێك تاك بویەوەو ئەو ڕەوەش و شێوازو ڕەوشتانەی بەکارهێنابێ بۆ خزمەتی خوای تعالیو لە مالّە پیرۆزەکەیدا، پیاوێك بوو پێی دەگوترا: (صُوفة)و ناویشی (الغَوْث)ی کوڕی (مُرّ)(٢٦٣) بوو، بۆیە نیسبەتیان دراوتە پالّ ئەو کەسە، چونکە خۆیان بەو کەسە دەچواند، سەبارەت بە دابڕانیان بۆ خوای تعالی، ئیتر بە (الصوفیة) ناونران !

(أبومحمد عبدالغني) کوڕی (سعید الحافظ) دەلّێت: لە (الولید)ی کوڕی (القاسم)م پرسی: نیسبەتی صوفی دەدرێتەپالّ چ شتێك ؟ گوتی: لەسەردەمی نەفامیدا قەومێك هەبوون، پێیان دەگوترا: صوفە، بۆ خوای تعالی دابڕان و، لە کەعبەدا مانەوەو سەقامگیربوون، هەرکەسێك خۆی بەوان بچوێنێت، بەصوفی ناودەبرێت.

---

٢٦٣ _ بەراوردی بکە لە گەلّ ((تاج العروس))و (٦ / ١٦٩)، ((سیرة ابن هشام))دا (١ / ٤٠).
بەلّام ئەوان (!) شلّەژاون لەم دانەپالّەدا (النسبة) بەشلّەژنێکی گەورە، وەکو ئەوەی نووسەر دواتر باسی دەکات.

## * ڕوونکردنەوەی تێکچون و شەڵەژان و هاودژبونیان بەیەکتر سەبارەت بە ڕوونکردنەوەی نیسبەتی خۆیان:

نووسەر دەفەرمێت:

کەسانێك وای بۆ دەچن کە تەصوف دەگەڕێتەوە بۆ (أهلِ الصُّفّةِ)، لەڕاستیدا ئەو بۆچونیان بۆ دروست بوو، چونکە (أهلِ الصُّفّةِ)یان بەدیکرد لەسەر سیفەتی ئەو (صوفة) بوون کە پێشتر باسمان کرد، لەبواری دابڕان بۆ خوای تعالی و، خووپێوەگرتنی هەژاریدا، چونکە (أهلِ الصُّفّةِ) هەژار بوون، دەهاتنە خزمەتی پێغەمبەری خوا _ صلی الله علیه وسلم _و، ماڵ و خاوخێزانیان نەبوو، بۆیە (الصُّفّة) واتە سەیوانێکیان لە مزگەوتی پێغەمبەری خوادا _ صلی الله علیه وسلم _ بۆ دروست کرا، ئیتر ناونران بە (أهلِ الصُّفّةِ) واتە خەڵکی سەیوانەکە.

لە (الحسنِ)ەوە دەڵێت: (الصُّفّة)یەك واتە سەیوانێك بۆ هەژارانی موسڵمانان دروست کراو، موسڵمانانیش چەند لە توانایاندا بوایە خێرو صەدەقەو یارمەتیان دەگەیاندە ئەوێ.

نووسەر دەفەرمێت:

ئەم کۆمەڵە لە بەر زەرورەت لە مزگەوتدا دانیشتن، لە خێرو صەدەقەشیان خوارد لەبەر زەرورەت، کاتێك خوای تعالی دەروی خێری لە موسڵمانان کردەوە، لەو باروحاڵە وازیان هێناو، چوونە دەرەوە.

بۆیە گەڕاندنەوەی صوفی بۆ (أهلِ الصُّفّةِ) هەڵەیە، چونکە ئەگەر وابوایە، دەگوترا (صُفّيّ).

کەسانێك وای بۆ دەچن کە نیسبەتی صوفی دەگەڕێتەوە بۆ (الصوفانة)، کە سەوزەیەکی توکنی کورتەو، بۆ ئەو سەوزەیە گەڕێنراونەتەوە، چونکە بە ڕووەکەکانی بیابان قایل بوونە، ئەمەش دیسان هەڵەیە ؛ چونکە ئەگەر بۆ ئەو ڕووەکە بگەڕێنرایەنەوە، دەگوترا: صوفانی.

کەسانێکیش نیسبەتیان بۆ (صوفة القفا) واتە توکە وردەکانی پشتەمل دەگەڕێنێتەوە.

کەسانێکی دیکەش گوتویانە: بەڵکو نیسبەتیان بۆ (الصُّوف) واتە خوری دەگەڕێتەوە. ئەمە ئەگەری ڕوودانی دەکرێت !

بەڵام بۆچونی ڕاست یەکەمە.

پێش ساڵی دووسەدی کۆچی ئەم ناوە بۆ قەومەکە دەرکەوت، کە پێشنانیان ناوەکەیان بەدەرخست، تیایدا دووان و، بەچەندین دەستەواژە سیفەتەکانیان دەربڕی، پوختەکەی ئەوەبوو کە بەلایانەوە تەصوف پاککردنەوەی نەفسە، کۆشش کردنە بەرامبەر بە سروشتی مرۆڤ بۆ دورخستنەوەی لە رەوشتە خراپەکان، وە هاندانێتی بۆ پیادەکردنی ڕەوشتە چاکەکان کە لە دونیادا ستایش و پیاهەڵدان دەستەبەر بکات و، لە قیامەتیشدا پاداشت دەستەبەر بکات.

پێشینانی قەومەکە لەسەر ئەمە بوون، بەڵام ئیبلیس لە چەند شتێکدا سەری لێشێواندن، پاشان سەری لە شوێنکەوتوانیشیان شێواند کە لە پاش ئەوانەوە هاتن، هەر سەدەیەك تێپەڕ بوایە، ئیبلیس تەماحی لە سەدەی دووەمدا زیاتر دەبوو، بەو جۆرە سەرلێشێواندنەکانی بەرامبەر بە صوفیەکان زیاتر بوو، تاوەکو بەسەر پاشینانیاندا زاڵ بوو بەئەو پەڕی زاڵ بوون.

بنەڕەتی سەرلێشێواندنەکانی ئیبلیس بەرامبەر بەصوفیەکان ئەوەبوو کە دوری خستنەوە لە زانست و، وای بەخەیاڵدا هێنان کە مەبەست تەنها کاروکردەوەیە، وە کاتێك چرای زانستی لێ کوژاندنەوە، لە تاریکی ونەفامیدا نقوم بوون، وای بەخەیاڵی کەسانێکیاندا هێنا کە مەبەست وازلێهێنانی دونیایە بەگشتی، بۆیە ڕەتی ئەو شتانەیان کردەوە کە جەستەی چاك دەکردنەوە، ماڵ و سەرەوەتیان بە دووپشك دەچواند، دەشیان گوت بۆ بەرژەوەندیەکان خوڵقێنراوە، سنوریان تێپەڕاندو بارێکی زیاتریان دەخستە سەر نەفسی خۆیان، تا ئەو ئاستەی کەسانێکیان تێدا بوو ڕانەدەکشا.

ئەمانە مەبەست و نیازیان چاك بوو، بەڵام لەسەر ڕێگەی ڕاست نەبوون، کەسانێکیان تێدا بوو _ لەبەر کەمی زانستی _ کاری بەو فەرموودە هەڵبەستراوانە (موضوع) دەکرد کە بەدیدەکردو نەشیدەزانی !

پاشان کۆمەڵانێکی دیکە هاتن و سەبارەت بە برسێتی و، هەژاری و، وەسواس و دوودڵیی و، ئەندێشەکان قسەیان بۆ کردن و، چەندین کتێبیان بۆ دانان، وەکو (الحارث المحاسبيّ)، هەروەها کەسانی دیکەش هاتن و ڕێباوەڕی (مذهَب) تەصوفیان ڕێکوپێك

کردەوەو، بەسیفاتگەلێکی تایبەت تاکیان کردەوە, ئیتر بەو سیفاتانە لە شتی دیکە جیادەکرانەوە، وەکو تایبەتمەندبوون بەپۆشینی (المرقعة) واتە جلەپینەکراوەکەو، بیستن و، سۆزی بەتین و، سەماکردن و، چەپڵەڕێزان، وە جیاشبونەوە بەزیادیی لە پاکو خاوێنیدا.

پاشان شتەکە گەشەی دەکردو، شێخەکان شێوەو باری دیکەیان بۆ دادەنان و، بەواقیعاتی خۆیان قسەیان دەکردو، لە زانایان دوردەکەوتنەوە، هەروەها دیدو بۆچونیشیان سەبارەت بەو باروحاڵەی کە تیایدابوون یاخود سەبارەت بە زانستەکان جیادەبۆوە تاوەکو ناوی (علم الباطن)(٢٦٤) واتە زانستی دەرونی یاخود ناوەوەیی یان لێناو، زانستی شەریعەتیشیان بە (علم الظاهر) واتە زانستی دەرەکی دانا.

کەسانێکیشیان برسێتی دەریهێنان بەرەو ئەندێشەو خیاڵاتێکی بۆگەن، ئەوەبوو بانگەشەی عیشقی خوای هەق و خۆشەویستی و شەیدابوونیان دەکرد، وەکو ئەوەی خەیاڵی کەسێکی شێوە جوانیان کردبێ و خۆشیان ویستبێ، ئەمانە لە نێوان کوفرو بیدعەدان.

پاشان چەندەها ڕێگەو ڕێبازگەلی جیاواز پەلی بەم تایەفە هاوێشت، بیروباوەڕیان بۆگەن بوون: ئەوەبوو کەسانێکیان باوەڕیان بە (الحُلول)(٢٦٥) هەبوو، کەسانێکی تریشیان باوەڕیان بە (الإتحاد)(٢٦٦) هەبوو.

ئیبلیس بەردەوام لەگەڵ جۆرەکانی بیدعەدا تێکەڵی دەکردن، تا ئەو ئاستەی چەندین سوننەتی پوچیان بۆ خۆیان دانا.

---

٢٦٤ _ علم الباطن: لە هەندێ زانای ئەهلی تەصوفیان پرسی (علم الباطن) چی یە ؟ گوتی: ((نهێنیەکە خوای تعالی دەیخاتە دڵی بەندەکانیەوە، کە پێشتر پێشانی هیچ پەریەك یاخود نادەمیزادێکی نەداوە، ئەو نهێنیەش پەیوەندی بە هەموو زانست و زانیاریەکی دونیایی و ڕۆژی قیامەتەوە هەیە. داواکارین خوای تعالی لە باوەڕی پروپوچ بەدورمان بگرێت. بروانە:محمد حامد الناصر، بدع الإعتقاد وأخطارها على المجتمعات، وەرگێڕ.

٢٦٥ _ واتە بوونی خوای _ سبحانه وتعالى _ لە نێو خولقێنراوەکان و داهێنراوانی خۆیدا ! عیاذاً بالله.

٢٦٦ _ واتە یەکگرتنی خولقێنراوان لە گەڵ خوای _ عزَّوجلَّ _دا ! وحشاه.

(أبوعبـدالرَّحمن الـسُّلَمِيُّ)يـش هـات و، كتـێبی ((الـسُّنن))ی بـۆ دانـان، ((حقـائقَ التَّفسيرِ))يشی(٢٦٧) بۆ كۆكردنەوەو، شتانێكی سەرسوڕمێنی لـە صـوفيەكانەوە باسـكردووە سەبارەت بە تەفسيركردنی قورئان، بۆ ئەو مەبەستە پشتيان بە هەموو شـتێك بەسـتووە كـە كەوتۆتە دەستيان بەبێ (إسناد)كردنی بۆ بنـەڕەتێك لـە بنەڕەتـەكانی زانـست، لـە ڕاسـتيدا بەپێی بۆچونی ڕێبازو ڕێباوەڕەكانی خۆيان تەفسيريان كردووە.

سەرسـوڕمان لەوەدايـە كـە لـە بـواری خۆراكـدا وەرەع و خۆپـەدورگرتن لـە هەڵـەوتاوان بەكاردێنن، كەچی لە بواری تەفسيريكردنی قورئاندا شادو كەيفخۆشن (٢٦٨).

٢٦٧ _ پێشەوا (الذهبي) لە ((سير أعلام النبلاء)دا (١٧ / ٢٥٢) دەفەرمێت:

شتانێك لە ((حقائقَ التَّفسيرِ))ەكەيدا هەيە لە بنەڕەتەوە شياو و گونجـاو نـين، هەنـدێ لـە پێـشەوايان بـە بەزەندیقيەت و خوانەناسـی كۆمـەڵێی (الباطنيـة)يـان دانـاوە، هەندێكيـشيان بـە (عرفـان) و (الحقيقـة) دايدەنێن(!!) پەنا دەگرين بەخوای تعالی لە نەفامی و قـسەكردن بـەپێی هـەواوئارەزوو، چـونكە هـەموو چاكەيەك لە شوێنكەوتنی سوننەت و، دەستگرتن بە ڕێگەو ڕێبازی هاوەڵان و (التـابعين)ەوەيـە _ خوايـان لێ ڕازی بێت_.

٢٦٨ _ واتـە لـە ئاسـتی قورئانـدا وەرع و خۆپـەدورگرتن لـە گونـاهو تـاوان بـەكارناهێنن و قـسە لـە تەفسيركردنيدا دەكەن بەبێ زانست و بەبێ بەڵگە.

## ✱ له كتێبه گۆڕاو و نووسینه گومڕاكانیان:

نووسەر دەفەرمێت:

(أَبونَصْر السَّرَّاج) كتێبێكی بۆ دانان بەناوی ((لُمَع الصُّوفية)) چەندەها بیروباوەڕی ناشیرین‌و گوفتاری سووك‌و ڕیسواكراوی تێدا باس كردووە _إن شاء الله_ كۆمەڵێكی باس دەكەین.

هەروەها (أبوطالبِ المكّيُّ) كتێبی ((قوتَ القلوبِ))ی بۆ دانان و، چەندەها فەرموودەی پووچی تێدا باس كرد، لەگەڵ چەندەها نوێژی شەو و ڕۆژ كە بۆ هیچ بنەڕەتێكی شەرعی (إسناد)ی ناكات، لە گەڵ چەندین شتی تری هەڵبەستراو (موضوع)، وە تیایدا چەندەها بیروباوەڕی پوچ باس دەكات و، بەزۆری دەستەواژەی: ((قالَ بعضَ المُكاشَفين))ی[٢٦٩] تێدا بەكاردەهێنێت، ئەمەش قسەیەكی پوچە، هەر لەم كتێبەشدا لە كەسانێكی صوفیەوە باس دەكات كەوا لە دونیادا خوای _ عزَّوجلَّ _ بۆ هەندێ لە وەلیەكانی خۆی بەدەردەكەوێت (يتجلى لبعض أوليائه) !

(أبو طاهرِ محمدُ)ی كوڕی (العَلّافِ) دەڵێت: (أبوطالبِ المكّيُّ) پاش مردنی (أبي الحسينِ)ی كوڕی (سالِم) چووە بەصرە، ئەوەبوو سەرپێبوونی خۆی بۆ گوفتارەكانی دەربڕی، پاشان چووە بەغداو، لە كۆڕێكی وەعزو ئامۆژگاریدا خەڵكی لێ كۆبۆوە، قسەكانی تێكەڵ وپێكەڵ كردو، ئەوەی لێوەی پارێزراوە گوتبووی: هیچ شتێك ئەوەندی خوای خوڵقێنەر بۆ خوڵقێنراو بەزیان نییە ! بۆیە خەڵك بەكەسێكی بیدعەچیان داناو، هەجریان كردو، ئەویش چیتر وتاری بۆ خەڵك نەدەدا.

---

٢٦٩ _ المكاشفة: بەپێی بیروباوەڕی صوفیەكان هەموو غەیب و نادیارەكان بۆ مرۆڤ دەردەكەوێت و بەو هۆیەشەوە تێكڕای زاست و زانیایەكان دەزانێ بەبێ هیچ بیركردنەوەو تێڕوانینێك. بۆ دڵنیابوون بگەڕێرەوە بۆ سایتی:. www.dorar.net. وەرگێڕ.

(الخطيبُ) دەڵێت: (أبوطالبِ المكّيُّ) کتێبێکی داناوە بەناوی ((قوتَ القلوبِ)) لە سەر زمانی صوفیەکان، تیایدا شتانێکی ناپەسەندو ناشرین و بەدزیو دانراوی لە بواری سیفاتدا باسکردووە.

نووسەر دەفەرمێت:

(أبونُعیم الأصبهانيُّ)یش هات و کتێبی ((الحِلْیةِ))ی (٢٧٠) بۆ دانان و، لە سنوری تەصوفدا شتانێکی ناپەسەندو خراپی باس کردوە، تا ئەو ئاستەی شەرم نەیگرتووەو کەسانێکی پایەرزی وەکو (أبابکرٍ) و (عمرَ) و (عثمانَ) و (عليّ) و گەورە هاوەڵان _ خوایان لێ ڕازی بێت _ لە ڕیزی صوفیەکاندا باس دەکات، تیایدا شتانێکی سەرسوڕمێن لەو

---

٢٧٠ _ الحِلیة: کتێبێکە بەبێ لێکۆڵینەوەو بەبێ (تخریج)کردن چاپ کراوە !
بۆیان گێڕاومەتەوە کەوا کەسانێکی سەربە هەندێك زانست لەو کەسانەی کە فەرمودە پیشەیان نی یە (خۆی و پیرەکەی) هەڵساون بە (تخریج)کردنی ! وە قسە لەسەر کردنی ! ئەمەش زۆر سەرسوڕمێنە !
کەوابوو ئەفسوس بۆ زانست و هەڵگرانی، ڕەحمەتی خوا لە پێشەوا (الذهبي) بێت کە لە کتێبی (تذکرة الحفاظ)دا (١ / ٤) دەفەرمێت:
((... لە کوێ یە فەرموودەناسی و، لە کوێ یە فەرموودەناسان، هێندەی نەماوە نەیانبینم مەگەر لە نێو کتێبێکدا، یاخود لە ژێر خاکدا...))
دەڵێم _ شیخ علی حسن _ ئەمە لەسەر دەمی ئەودا، کە فەرموودەناسان و، زانایان و، شکۆمەندی ئیسلام و موسڵمانان لە ئارادا بوو، ئەی ئەمڕۆ ئەوانە لە کوێن ؟!
با کەسانێك کە زانست نازانن مەگەر چەند پیتێك لە خوا بترسن، خەریکی دەربەڕاندنی سنگن پێش پێگەشتن، بەڕاستی شتانێکی سەرسوڕمێنیان هێناوەتە کایەوە، دڵنیابن شتەکەش بەو جۆرەیە کە خوای تعالی دەفەرمێت: ﴿ فَأَمَّا الزَّبَدُ فَيَذْهَبُ جُفَاءً وَأَمَّا مَا يَنْفَعُ النَّاسَ فَيَمْكُثُ فِي الأَرْضِ ﴾ الرعد: ١٧ ﴾
واتە: ﴿ فأَمَّا الزَّبَدُ فَيَذْهَبُ جُفَاءً ﴾ جا کەفەکە دەڕوات و لەناودەچێ ﴿ وَأَمَّا مَا يَنْفَعُ النَّاسَ ﴾ بەڵام ئەوەی کە سوود دەگەیەنێ بەخەڵکی ﴿ فَيَمْكُثُ فِي الأَرْضِ ﴾ لە زەویدا دەمێنێتەوە، پوختەی تەفسیری قورئان.

هاوەڵانەوە باس دەکات، هەروەها کەسانێکی دیکەی وەکو (شُرَيح القاضـي) و (الحسنَ البَصْرِيُّ) و (سُفيانَ الثورِيَّ) و (أحمد)ی کوڕی (حنبل)یش دەخاتە ڕیزی صوفیەکانەوە !!

هەروەها (السُّلَمِيُّ) لـە کتـێبی (طبقـات الـصوفية)دا: (الفُضَيْلَ) و (إبـراهيمَ)ی کـوڕی (أدهمَ)و (معروف الكَرْخِيُّ) لە صوفیەکاندا باس دەکـات، بـەوەی ئامـاژەی پێـداوە کـە لـە زاهیدانن(٢٧١).

تەصوف ڕێباوەڕێکی ناسراوەو سنووری زوهد تێدەپەڕێت، ئەو شتەی کە پەنجە ڕادەکێشێت بۆ جیاوازی نێوانیان ئەوەیە کە هیچ کەسێك زەمی زوهدی نەکردووە، کەچی زەمی تەصوفیان کردوە بەپێی ئەوەی کە دواتر باس دەکرێت.

هەروەها (عبدُالكريمِ)ی کوڕی (هُوزان القُشَيْرِيُّ) کتـێبی ((الرِّسـالةِ))ی(٢٧٢) بـۆ دانـان و تیایدا گوتارگەلێکی سەرسوڕمێنی سەبارەت بە ((الفناء والبقاء، والقبض والبسط، والوقـت والحال، والوَجْدِ والوجودِ، والجمع والتفرقة، والصحو والسُّكرِ، والذَّوقِ والشربِ، والمحوِ والإثبات، والتجلّي والمُحاضرةِ، والمكاشفةِ واللوائحِ، والطوالع واللوامـع، والتكـوينِ والـتمكينِ، والـشريعةِ والحقيقةِ))(٢٧٣) باس کردووە...

وە چەندین تێکەڵ وپێکەڵ کردنی دیکەش کە هیچ بایـەخێکی نییـەو، ڕاڤەکردنیـشی لـە خودی وشەکان سەرسوڕمێنترە!

---

٢٧١ _ تەصوف شتێکی ترەو زوهد نی یە، چونکە چەندەها بیروباوەڕو هزرو فلسەفەو شتی تریش تێکەڵ بەتەصوف بووە، تازە داهێنراوەو زوهد هیچ پەیوەندیەکی بەوانەوە نی یە، ئەو کەسانەی نیسبەتی زاهیدان دەگەڕێننەوە بۆ تەصوف بەڕەهایی " بێ دادی دەکەن و نەیانپێکاوە، بەڵکو شتەکە وردەکاری تێدایە لەژێر ڕۆشنایی ئەوەدا کە نووسەر _ بەڕەحمەتی خوا بێت _ باسی دەکات.

٢٧٢ _ کە ناوبانگە بە ((الرسالة القشيرية))، بەناوی دانەرەکەیەوە.

٢٧٣ _ هەموو ئەم وشانەش هیچ بنەڕەتێکیان نییەو تازەن و بەدیهێنراون !!

هەروەها (محمد)ی کوڕی (طاهرِ المقدسيُّ) هات و کتـێبی ((صـفوةَ التـصوُّف))ی(٢٧٤) بـۆ دانان و، شتانێکی تێدا باس دەکات بەڕاستی مرۆڤی ئاقڵ و ژیـر شـەرم دەیگـرێ و نـاتوانێ باسی بکات، چەند شتێك کە بۆ باس کردن بشێت لەو کتێبـە لـە شـوێنەکانی خۆیـدا بـاس دەکەین _ إن شاء الله _.

شێخمان (أبوالفضل)ی کوڕی (ناصر الحافظُ) دەیفەرموو: (ابنُ طاهرٍ) بـاوەڕی بـە ڕێبـازی ڕەوادیتن و بێ شەرمی (الإباحة) هەبوو.

فـەرمووی: کتێبێکـی دانـابوو سـەبارەت بـە شـیاوێتی تەماشـاکردنی منـداڵی جـوانی لووسکەی تووك دەرنەهاتوو، تیایدا چیرۆکێك لە (يحيى)ی کوڕی (مَعین)ەوە باس دەکـات کـە گوایە گوتویەتی: لە مصر کچێکی جوانم بینی، صەلواتی خـوای لەسـەر بـێ ! پێـی گـوترا: صلواتی لەسەر دەدەی ؟ گوتی: صەلاتی خوا لە سەر ئەو و لەسەر هەموو جوانێك بێت.

شێخمان (ابن ناصر) دەیفەرموو: (ابـنُ طـاهرٍ) لـەو کەسـانە نییـە گوفتارەکـانی بکرێـت بەبەڵگە.

هەروەها (أبوحامدِ الغَزَّاليُّ) هات و، لە سەر ڕێبازی تەصـوف کتـێبی ((الإحیـاء))ی بـۆ دانان، لە فەرموودەی پوچ پڕیکرد، لە کاتێکدا بەپوچێتی ئەو فەرموودانەی نەدەزانی، تا ئەو ئاستەی لە (علم المکاشفة)دا قسەی کردو، لە یاسای (الفقه) چووە دەرەوەو گوتی:

---

٢٧٤ _ نووسەر لە کتێبی ((المنتظم))دا(٩ / ١٧٨) دەفەرمێت:

((کتێبێکی داناوەو ناوی ناوە ((صفوة التصوف)) ئەو کەسەی تەماشای بکات پێـی پێدەکـەنێ و، سـەری سوڕدەمێنێ کە چۆن بەڵگە بۆ ڕێباوەڕکانی تەصوف دەهێنێتەوە بە فەرموودەگەلێك کە گونجاوی نی یە)).
گوفتارەکانی نووسەر کچەزاکەی خۆشی (سِبطه) لە کتێبی ((مرآة الزمان))دا (٨ / ٣٠) ئاماژەی پێداوە.
دەڵێم _ شیخ علی حسن _ نووسەرانی دیکە لە کتێبەکانی خۆیاندا چەندین بڕگەی ئەو کتێبـەیان وەکـوو نموونە نووسیوە، بە تەماشاکردنی ئەو بڕگانە بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە ئەو کتێبە هیچ پایەیەکی لە هەقـدا نی یە، خوا لە نووسەرەکەی خۆش بێت.

مەبەست بەو هەسارەو خۆرو مانگەی کـە پێغەمبـەر (إبـراهیم) _ صـلوات الله علیـه _ بینینی نورو ڕووناکیگەلێك بوون و بریتی بوون لە پەردەکانی خوای (حُجُبُ الله) _ عزَّوجلَّ_، وە مەبەست ئەم هەسارەو خۆرو مانگە زانراوە نەبوو !

ئەم گوفتارە لە هەمان ڕەگەزی گوفتاری کۆمـەڵی (الباطنیَّةِ)یەکانە !

لـە کتـێبی (المُفْـصِحِ بـالأحوالِ)یـشدا (الغَزَّالـيُّ) دیـسان دەڵێـت: صـوفیەکان لـە کـاتی بمناگابونیاندا فریشتەکان و، ڕوحی پێغەمبەران دەبینن و، دەنگ گەلێکیشیان لێوە دەبیستن، سوودو کەلکیشیان لێوەردەگرن، پاشان باروحاڵەکە لە تەماشاکردنی وێنـەوە سـەردەکەوێت و بڵند دەبێتەوە بەرەو پلەگەلێك کە سنوری قسەکردن تەسـك دەبێتـەوەو توانـای وەسـفی ئـەو باروحاڵانەی نامێنێت.

نووسەر دەفەرمێت:

هۆکاری هەستانی ئەم کەسـانە بەنوسـینی شـتانێکی ئاوەهـا کـەمی زانینیـان بـوو بـە سوننەتو ئیسلام و (آثار)، وەرگرتنی هەندێ شتیش بوو کـە لـە ڕێگـەو ڕێبـازی تەصـوفدا بەپەسـندیان دادەنـا، لەڕاسـتیدا ئـەو شتانەشـیان پەسـەند کـرد، چـونکە بەچـاك دانـان و ستایشکردنی زوهد لە نەفسەکاندا جێگیر بووە، هەروەها باروحاڵەتێکیـشیان بەدینـەکرد لـە باروحاڵەتی ئەم قەومە چاکتر بێت، هـیچ گوفتارێکیـشیان بەدینـەکرد لـە گوفتـاری ئەوانـە ناسکتر بێت(٢٧٥)، ژیانامـەی پێشینی چاکیش جۆرێك لە زبرێتی تێدایە، دوای ئەوەش مەیلی خەڵك بۆ لای صوفیەکان توندترە، چونکە وەکو پێشتر ئاماژەمان پێدا ڕێگەو ڕێبازێکـە ڕووی دەرەوەی پاکێتی و خواپەرستیە، ناوەوەشی حەوانەوەو بیستنەو، سروشـتی مـرۆڤیش مـەیلی دەکات.

---

٢٧٥ _ با شوێنکەوتوانی سوننەت و بانگخوازانی ئاگاداری ئەمەبن، چونکە ئەمە زۆر وردە، ئەوەیە کـە هەگبەی بیدعەچیانی پڕکردووە، ئەوانە زانستیان پێ نـی یـە، بۆیـە گوفتاریـان نـەرم کـردەوەو، شـێوازو ڕەفتاریان جوان کردەوەو، توانیان بەم سەرلێشێواندنە خەڵك کۆکەنەوە!

پێشینانی تەصوف لە سوڵتان و ئەمیرەکان دوردەکەوتنەوە، پاشان بون بەهاوڕێ(٢٧٦).

کۆی ئەو کتێبانەی کە دانراوەن بەهیچ بنەڕەتێکی شەرعی پاڵپشت نەکراون، لەڕاستیدا تەنها واقیعاتێکەو هەندیەکیان لە هەندێکیانەوە قۆزتویانەتەوەو، نوسیویانەو، ناویان ناوە بە زانستی دەرونی و ناوەوەیی (علم الباطن).

(إسحاق)ی کوڕی (حيَّة) دەڵێت: گوێبیستی پێشەوا (أحمدَ)ی کوڕی (حنبلٍ) بووم کە سەبارەت بە بیرو یادو ئەندێشە پرسیاری لێکرا ؟ فەرمووی: نە هاوەڵان و نە تابعين تیایدا نەدواون(٢٧٧).

نووسەر دەفەرمێت:

لە پێشەوا (أحمدَ)ی کوڕی (حنبلٍ)ەوە باسیان بۆ کردوین کەوا گوێبیستی قسەکانی (الحارثِ المحاسبيِّ) بوو، بۆیە بەهاوەڵێکی خۆی فەرموو: وام پێ باشە تۆ لە گەڵیاندا دانەنیشیت.

لە (سعيدِ)ی کوڕی (عَمْرِو البَرْذَعيِّ)وە دەڵێت: من ئامادەبووم کە (أبازُرعةَ) سەبارەت بە (الحارثِ المحاسبيِّ)و کتێبەکانی پرسیاری لێکرا ؟ بەکەسی پرسیارکاری فەرموو: لەم کتێبانە دورکەوەرەوە، ئەم کتێبانە کتێبی بیدعەو گومراین، شوێنی (أثر) بکەوە، چونکە شتانێکی تێدا دەبینیت کە چیتر پێویستت بەو کتێبانە نابێت.

پێی گوترا: ئەم کتێبانە پەندو ئامۆژگاری تێدایە !

فەرمووی: ئەو کەسەی پەندو ئامۆژگاری لە کتێبی خوا وەرنەگرێت، ئەوا پەندو ئامۆژگاری لەم کتێبانە وەرناگرێت، ئایا پێتان گەشتووە کە (مالك)ی کوڕی (أنس)و، (سفيانَ الثوريِّ)و، (الأوزاعيِّ)و، پێشەوایانی پێشین کتێبەکانی خۆیان لە سەر بیرو یادو ئەندێشەی خراپ و ئەم شتانە دانابێت ؟! ئەم قەومە پێچەوانەی ئەهلی زانست بونەتەوە، جارێکیان

٢٧٦ _ چونکە مەراییان بۆ دەکەن و کاسەلێسیان بۆدەکەن و، بەرامبەر بەسەرپێچیەکانیان بێدەنگ دەبن.

٢٧٧ _ هەموو شتێکی بەو جۆرەش، پوچەو ڕەت کراوەتەوە.

(الحارثِ المحاسبيٍّ)مان بۆ دەهێنن و، جارێکیان (عبدالرحیمِ الـدَّیْبُلِيُّ)و، جارێکیـان (حـاتِمِ الأصمِّ)و، جارێکیان (شقیقٍ).

پاشان فەرموی: ئای کە خەڵکی بۆ بیدعە خێران !

نووسەر دەفەرمێت:

(أبوبکرِ الخلالُ) لە ((کتاب السنة))دا لە پێشەوا (أحمدَ)ی کوڕی (حنبلٍ)ەوە بـاس دەکـات کموا فەرموویەتی: وریای خەڵك لە (الحارث) بکەنەوە بەتوندترین وریایی، (الحـارث) بنـەڕەتی بەڵاکەیە، فڵان و فڵان لە گەڵ (الحارث)دا دانیشتن، ئەوەبوو بەرەو بیروارِی (جَهْمٍ) دەریهێنـان، بەردەوام پەناگەی قسەزانانە (أصحاب الکلام)، (الحارث) وەکو شـێرێکەو خـۆی حەشـارداوە، تەماشا بکە چ ڕۆژێك پەلاماری خەڵك دەدات !

## ✱ پێشینانی تەصوف دانی پێدا دەنێن کەوا پشت بەستن بەقورئان و سوننەتە:

پێشنانی تەصوف دانیان بەوەدا دەنا کەوا دەبێ تەنها پشت بەقورئان وسوننەت ببەسترێت، بەڵام شەیتان سەری لێشێواندن، چونکە زانستیان کەم بوو !

(أبوسليمان الدَّاراني) دەڵێت: پێدەچێ خاڵێك لە خاڵەکانی قەومەکە چەند ڕۆژێك لە نەفسمدا جێگیربێ، بەڵام تەنها بەدوو شایەتی بەداد نەبێ قبوڵی ناکەم: قورئان و سوننەت.

لە (عبدالحميدِ الحُبُلِيِّ)ەوە دەڵێت: گوێبیستی (سَرِيّ) بووم دەیگوت: هەرکەس بانگەشەی ئەوە بکات کە بە (علم الباطن) شتێك دەزانێ و، پێچەوانەی ڕواڵەتی حوکمە شەرعیەکان بێت، ئەوا بەهەڵەدا چووە.

لە (الجُنَيْدِ)ەوە دەڵێت: ئەم ڕێباوەڕەمان بە هەردوو بەبنچینەکانەوە پابەندە: قورئان و سوننەت.

هەروەها دەڵێت: زانینمان وابەستەکراوە بەقورئان وسوننەتەوە، هەرکەس قورئان لەبەرنەکات و، فەرموودە نەنوسێت و، خۆی لە فیقهدا شارەزا نەکات، پەیڕەوی ناکرێت.

هەروەها دەڵێت: تەصوفمان لە قسەی دەماودەم و گوتی گوتیەوە وەرنەگرتووە، بەڵکو لە برسێتی، وازهێنان لە دونیا، دابڕان لە شتە باو و پەسەندکراوەکانەوە (المألوفات والمستحسنات) وەرگرتووە، چونکە تەصوف واتە بەپاك و بێگەردی مامەڵەکردن لەگەڵ خوای _ سبحانه وتعالى _دا، بنچینەکەشی جیابوونەوەیە لە دونیا.

(أبوالحُسَيْنُ النُّوريُّ) بەکەسانێك لە هاوەڵانی خۆی گوت: هەرکەسێکت بینی لەگەڵ خوای _ عزَّوجل _دا بانگەشەی باروحاڵەتێك دەکات و، ئەو باروحاڵەتە لە سنووری زانستی شەرع دەیباتە دەرەوە، نزیکی مەبەرەوە، وەهەرکەسێکت بینی بانگەشەی باروحاڵەتێك دەکات و هیچ بەڵگەیەك پەنجەی بۆ ڕاناکێشێت و، شتێکی ئاشکرا شایەتی بۆ نادات، ئەوا لە دینەکەیدا تاوانباری بکە.

لە (أبي جعفرٍ)ەوە دەڵێت: هەرکەس گوفتارو کردەوەو باروحاڵی بەتەرازووی قورئان وسوننەت نەکێشێت و، بیرو یادو ئەندێشەکانی تاوانبار نەکات، لە دیوانی پیاواندا حیسابی بۆ مەکە.

نووسەر دەفەرمێت:

هەرچەند ئەو گوفتارانەی سەرەوە لە شێخەکانیانەوە جێگیربووە، بەڵام چەندین هەڵە لە هەندێ شێخی دیکەیانەوە بەدەرکەوت، چونکە لە زانستەوە دووربوون، بۆیە ئەگەر ئەمەیان بەڕاست و دروستی لێوە باسکرابێت، ئەوا پێویستە بەرپەرچیان بدرێتەوە، چونکە خۆشویستن‌و لایەنگرتن لە هەقدا نییە(٢٧٨)، ئەگەر ئەوەشیان بەڕاست و دروستی لێوە باس نەکرابێت، ئەوا هەستاوین بەوریاکردنەوەی جەماوەری خەڵك لە هاوشێوەی ئەو گوفتارانەو، ئەو ڕێباوەڕە لەهەر کەسێکەوە دەرچوبێت.

بەڵام ئەو کەسانەی خۆیان چواندووە بەم قەومەو، لەمانیش نین، هەڵەیان زۆرە، ئێمە هەندێ لەو هەڵانەی پێمان گەشتووە باس دەکەین، خوای تعالی دەزانی ئێمە کە هەڵەی هەڵەکاران بەدەردەخەین مەبەستمان تەنها پاك ڕاگرتنی شەریعەتە، خەمخۆریە بەرامبەر بەشەریعەت لە هەر ناتەواوی و کەم وکوڕیەك، پەیوەندیمان بە بێژەرو بکەرەوە نییە، لەڕاستیدا مەبەستمان بەوە تەنها بەجێهێنانی ئەمانەتی زانستیە، بەردەوام هەر یەکێکیش لەزانایان هەڵەی هاوەڵەکەی بەدەردەخات، بەمەبەستی ڕوونکردنەوەی هەق، نەك لەبەر ئاشکراکردنی نەنگ و ناتەواوی کەسی هەڵەکار.

هیچ بایەخێکیش بەقسەی کەسانێکی نەفام نادرێت کە دەڵێن: چۆن بەرپەرچی فلان کەسی زاهید دەداتەوە کە داوای بەرەکەت و بەخت باشی پێدەکرێت، چونکە لەڕاستیدا گوێ ڕایەڵی کردن تەنها بۆ ئەو شتانە دەبێت کە شەریعەت هێناویەتی، نەك بۆ کەسەکان، ڕەنگە پیاو لە

٢٧٨ _ ئەمەش بنەڕەتێکی گرنگە لە بنەڕەتەکانی بانگەوازکردن بۆ خوای تعالی، کە بریتیە لە بەرپەرچدانەوەی کەسی پێچەوانەکاری هەق بەبەڵگەکانی هەق.

وەلیەکان و لە کەسانی بەهەشت بێت و، چەندەها هەڵەشی هەبێت، بۆیە پلەوپایەکەی قەدەغەی بەدەرخستنی زەڵلەکانی ناکات.

بزانە ئەو کەسەی تەنها تەماشای بەگەورەدانانی کەسێك دەکات و بەبەڵگەوە تەماشای ئەو شتانە ناکات کە لێی وەشاوەتەوە(٢٧٩)، وەکو ئەو کەسەی لێدێت کە تەنها تەماشای ئەو موعجیزاتە نائاسابەدەرانەی دەکرد کە لەسەر دەستی عیسای مەسیح بەدیدەهات _ صلواتُ اللهِ علیهِ _ وە تەماشای خودی عیسای نەدەکرد، بۆیە بانگەشەی خوایەتی بۆ کرد، بەڵام ئەگەر تەماشای خودی خۆی بکردایە، کەبەخواردن نەبوایە هەڵنەئەستا، لە شایستەیی خۆی زیاتری پێنەدەدا.

لە (یحیی)ی کوڕی (سعیدٍ)ەوە دەڵێت: لە پێشەوایان (شُعبةَ) و (سفیانّ)ی کوڕی (سعیدٍ) و (سفیان)ی کوڕی (عُیَیْنة) و (مالَك)ی کوڕی (أنس)م پرسی سەبارەت بە پیاوێك کە فەرموودە لەبەرناکات یاخود لە فەرموودەدا تۆمەتبار دەکرێت ؟ هەموویان گوتیان: کاروباری ڕوون دەکرێتەوەو ئاشکرا دەکرێت.

پێشەوا (أحمدُ)ی کوڕی (حنبلٍ) بەپیاودا هەڵی دەداو ستایشی دەکردو، ڕۆدەچوو، پاشان هەڵەکانی لە شتەکاندا یەك لە دوای یەك باس دەکرد، وە فەرمووی: فلان کەس پیاوێکی چاکە، ئەگەر ئەو خەسڵەتەی تێدا نەبوایە.

سەبارەت بە (سَرِيّ السَّقَطِيّ) فەرمووی: شێخ، بە خواردنی پاك وچاك ناسراوە.

پاشان بۆی باسکرا کەوا (سَرِيّ السَّقَطِيّ) گوتویەتی: خوای _ عزَّوجلَّ _ کاتێك پیتەکانی خوڵقاند پیتی (باء) سوژدەی برد. ئەوەبوو فەرمووی: خەڵکی لیّ دوورخەنەوە !

---

٢٧٩ _ چونکە بەڵگە ئەو بنەڕەتەیە کە بینای لەسەر دەکرێت، بۆیە هەرکەس پێچەوانەی بەڵگە کار بکات، تەنها زیان بەخودی خۆی دەگەیەنێت، بۆیە تەماشاکردن بۆ بەڵگەیە، نەك بۆ خودی کەسەکە

## ✸ باسی سەرلێشێواندنەکانی ئیبلیس لە بواری بیروباوەڕدا:

لە (أبي عبدالله الرَّمْلِيّ)وە دەڵێت: (أبوحمزَة) (٢٨٠) لە مزگەوتی (طَرسوس)دا قسەی کرد، ئەوەبوو کوشتیان، ڕۆژێکیش قسەی دەکرد، قەلەڕەشێك لەسەربانی مزگەوتەکەوە قیڕاندنی، (أبوحمزَة) هاواری کردو، گوتی: گوێم لە فەرمانتە گوێم لە فەرمانتە. بۆیە درایە پاڵ زەندیقیەت و، گوتیان حلولیەکی زیندیقەو، ئەسپەکەشی لەپێش دەرگای مزگەوتەکەدا فرۆشرا بەبانگەوازکردن: ئەمە ئەسپی زەندیقێکە.

لە (أبي بكرٍ الفَرْغاني)وە دەڵێت: (أبوحمزَة) ئەگەر گوێبیستی شتێك بوایە، دەیگوت: گوێم لە فەرمانتە گوێم لە فەرمانتە، بۆیە پێیان دەگوت: حەلولی.

(السَّرَّاجُ) دەڵێت: پێم گەشتووە کە کۆمەڵێك لە حلولیەکان وارادەگەیەنن کە خوای ـ عزَّوجلَّ ـ جەستەگەلێکی هەڵبژاردووەو (حلَّ فيها) بەماناکانی پەروەردگاریتی چۆتە نێویانەوەو، ماناکانی کەسێتی لەسەریان لابردووە، کەسانێکیشیان دەیانگوت: چۆتە نێو شتە پەسەندکراوەکانەوە (حالٌ في المستحسنات).

دەڵێت: پێم گەشتووە کەوا کۆمەلە خەڵکێکی (الشام) بانگەشەی بینینی خوای تعالی دەکەن بەدڵ لە دونیادا، هەروەکو چۆن لە ڕۆژی دوایدا بەچاوەکان دەبینرێ.

(السَّرَّاجُ) دەڵێت: پێم گەشتووە کەوا خزمەتکارەکەی (خليل) شایەتی داوە کەوا گوێبیستی (أبوالحُسَيْنُ النُّوريُّ) بووە گوتویەتی: من عیشقی خوام و ئەویش عیشقی منە. (النُّوريُّ) دەیگوت: گوێبیستی خوا بووم دەیفەرموو ﴿ يُحِبُّهُمْ ويُحِبُّونَهُ ﴾ المائدة: ٥٤ ﴾ واتە: خۆشی دەوێن و خۆشیان دەوێ(٢٨١)، عیشقیش لە خۆشەویستی زیاتر نییە.

---

٢٨٠ ـ أبوحمزة: (محمد)ی کوڕی (إبراهيم البغدادي) صوفیە، ساڵی دووسەدو شەصت و نۆ مردووە، هەواڵی لە ((حلية الأولياء)دایە (١٠ / ٣٢١).

پێشەوا (الذهبي) لە (سير أعلام النبلاء)دا (١٣ / ١٦٦) لە ژیانامەکەیدا فەرموویەتی:

((أبي حمزة چەوتڕەوی و لە مەبەست لادانی تێدایە)).

٢٨١ ـ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

(القاضي أبويَعْلى) دەیگوت: حلولیەکان وای بۆ دەچوون کەوا خوای تعالی عیشق دەکرێت.

نووسەر دەفەرمێت:

ئەمە نەفامیەکە لە سێ ڕۆوە:

یەکەم: لە ڕوانگەی ناوەوە، چونکە بەلای زمانەوانانەوە عیشق بەتەنها لە بواری خواستندا (النکاح) بەکاردێت.

دووەم: سیفاتی خوای تعالی هاتووەو گواستراوەتەوە (منقولةٌ)، کە لە زمانی عەرەبیدا وشەی (يُحِبُ)ی بۆ کاردێت، نەك عیشق.

سێ یەم: چۆن زانیویەتی خوای تعالی خۆشی دەوێ، بۆیە ئەمە تەنها بانگەشەیەکەو بەبێ بونی هیچ بەلگەیەك.

لە (أبي عبدِالرحمنِ السُّلَميّ)وە دەلێت: لە (عَمْرو المَكّيِّ)ەوە دەگێڕنەوە گوتویەتی: لە کۆلانەکانی مەککەدا لە گەلّ (الحُسَين)ی کوڕی (منصور)دا(٢٨٢) ڕێم دەکردو، قورئانم دەخوێندەوە، گوێبیستی خوێندنەکەم بوو، گوتی: لەتوانامدایە وەکو ئەم قورئانە بلێم، بۆیە لێی جیابوومەوەو بەجێم هێشت.

بە (إسناد)ێك لە (أبي القاسم الرَّازيِّ)وە دەلێت: (أبوبکر)ی کوڕی (مَمْشاذ) گوتی: لە (الدِّينَوَرِ) پیاوێك دیدەنی کردین، تورەکەیەکی بەلاوە بوو، شەو و ڕۆژ بەجێی نەدەهێشت، تورەکەکەیان پشکنی، نامەیەکی (حلاج)یان تێدا دۆزیەوە ناونیشانەکەی ئاوەها بوو: لە (الرحمن الرحيم)ەوە بۆ فلان کەسی کوڕی فلان کەس.

ئەوەبوو نامەکەی بۆ (بغداد)ی پایتەخت نێردراو، (حلاج)یشیان لەوێ ئامادەکرد، نامەکەیان پیشاندا، گوتی: ئەمە دەست وخەتی منەو، من نوسیومە.

گوتیان: بانگەشەی پێغەمبەرایەتیت دەکرد، گەشتیتە ئەو ئاستەی بانگەشەی پەروەردگارێتی بکەی !

---

٢٨٢ _ الحسين بن منصور: حەللاجی کوژراوە بەهۆی زەندیقیەتەوە.

گوتی: بانگەشەی پەروەردگاریتی ناکەم، بەڵکو ئەمە بەلامانەوە (عين الجمع)ە(٢٨٣)، ئایا نووسەر تەنها خوای تعالی نییە، دەستیش تیایدا ئامێرێکە !

پێی گوترا: ئایا کەسی دیکەت لە گەڵدایە ؟

گوتی: بەڵێ، (ابن عَطَاء)و، (أبومحمد الجُرَيري)و، (أبوبكر الشِّبْلي). (أبومحمد الجُرَيري) پەنهان دەکات، (الشِّبلي) پەنهان دەکات، بۆیە ئەگەر کەسێك هەبێت ئەم گوفتارانە بەئاشکرا بڵێت (ابن عَطَاء)ە.

ئەوەبوو (الجُرَيري) هێنراو، لێیان پرسی، گوتی: بێژەری ئەمە کافرەو، هەرکەس ئەمە بڵێت دەکوژرێت.

لە (الشِّبلي)یشیان پرسی، گوتی: هەرکەس ئەمە بڵێت قەدەغە دەکرێت.

سەبارەت بەگوفتارەکەی (حلاج) لە (ابن عَطَاء)یان پرسی، ئەویش هەمان بیروڕای (حلاج)ی هەبوو، بۆیە ئەوە بوو بەهۆکاری کوشتنی.

سەبارەت بە مانای ئەم دێڕە شیعرانە لە (أبوعبدالله)ی کوڕی (خفیف)یان پرسی:

سبحان من اظهر ناسوتُهُ
سـّر سنـا لاهوتِه الثاقب
ثـم بدا في خلقه ظـاهراً
في صورة الآكل و الشارب
حتّى لقد عَـايَنَهُ خَلْقُـه
كلحْظةِ الحـاجب بالحاجب

واتە: پاك و بێگەردی بۆ خوا کە سروشتە مرۆڤیەکەی خۆی بەدەرخست و، ئەو سروشتە مرۆڤیە نهێنیەکی تێدایە، کە دەبێتە هۆی ڕۆشنکردنەوەی سروشتە خوایە کاریگەرە بەدەستەڵاتە فەرمان بەجێهێنەرەکەی.

---

٢٨٣ _ عين الجمع: دەستەواژەیەکی صوفیەو ناوێکە لە ناوەکانی یەکبوون (واتە یەکگرتن و یەك خستنی خوای خولقێنەرو بەندەی خولقێنراو لە یەك یەکەدا (وحدة واحدة). داواکارین خوای تعالی لە بیروباوەڕی پووچ بەدورمان بگرێت. بڕوانە: http://www.saaid.net/book/index.php. وەرگێڕ.

له دێڕی دووەم و سێ یەمیشدا بەئاشکرا بانگەشەی ئەوە دەکـات کـە خـوای تعـالى لـە مــەخلوقاتی خۆیــدا بەدەردەکــەوێت و تەنانــەت لــەو کــردارو ڕەفتــارە سروشتیانەشــدا بەدەردەکەوێت کە لەسەری بەدیهێنراون وەکو خواردن و خواردنەوەو، خو و ڕەفتــاری دیکــەش کە خوای تعالى مرۆڤی لەسەر بەدیهێناوە، بەبانگەشەی ئەم پیاوە زاتی خوا دابەزیوەتــە نێــو هەموو شتێك.

له دێڕی چوارەمیشدا بانگەشەی ئەوە دەکات کە هەموو مەخلوقات دەیبینن وەکـو چـۆن دوو چاو یەکتر دەبینن.

ئەوەبوو شێخ گوتی: نەفرینی خوا لە بێژەری ئەم دێڕە شیعرانە بێت.

(عیسی)ی کوڕی (فُورَك) دەڵێت: ئەمە شیعری (الحسین)ی کوڕی (منصور)ە.

دەشڵێت: ئەگەر ئەمە بیروباوەڕی بێت، کافرە، بەڵام لەوانەیە بۆی هەڵبەسترابێت.

نووسەر دەفەرمێت:

زانایانی هاوچەرخ لەسەر حەڵاڵکردنی خوێنی (الحلّاج) پێکهاتن ویەك دەنگ بوون، یەکـەم کەس کە گوتی: خوێنی حەڵاڵە: (أبوعمرِو القاضي) بوو، زانایانی دیکەش هـاودەنگی بـوون، بەڵام (أبوالعباس)ی کوڕی (سُرَیْج) بەرامبەری بێدەنگ بوو، وە گوتی: نازانم چ دەڵێت.

یەك دەنگیش (إجماع) بەڵگەیەکی لە هەڵە پارێزراوە.

عن أبي هريرةَ " قال: قال رسولُ اللهِ _ صلى الله عليه وسلم _:

((إنَّ الله أجارَكُمْ أنْ تَجْتَمعوا على ضلالةٍ كُلُّكُم))(٢٨٤).

---

٢٨٤ _ كذا هنا، عن أبي هريرة، ولم أره عنه.

فقد خرَّجه السخاوي في ((المقاصد الحسنة)) (رقم ١٢٨٨) عن أبي بصرة، وعن أبـي مالـك الأشـعري، وابـن عمر، وأنس، وابن عباس، وغيرهم.

ورواه الطبراني في ((الكبير)) (١٣٦٢٣ و ١٣٦٢٤) من طريقين عن عمرو بن دينار عن ابن عمر به.

وقال الهيثمي في ((مجمع الزوائد)) (٥ / ٢١٨):

((رواه الطبراني بإسنادين رجال أحدهما ثقات، خلا مرزوق مولى آل طلحة، وهو ثقة)).

فهو حديثٌ صحيحٌ.

واته: له (أبي هريرة)ەوه، فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ فەرمووی:

((بەڕاستی خوای تعالی پاراستوونی لەوەی هەرهەمووتان بەیەکەوه لەسەر گومڕایەك کۆبنەوه)).

له (أبي بكرِ محمدِ)ی کوڕی (داودِ الفقيهِ الأصبهاني)وه دەڵێت: ئەگەر ئەو پەیامە هەق بێ کە خوای _ عزَّوجلَّ _ بۆ پێغەمبەرەکەی دایبەزاندووه، بەڕاستی ئەوەی که (الحلّاج) دەیڵێت پووچە.

زۆر توندیش بوو بەرامبەری.

نووسەر دەفەرمێت:

کۆمەڵێك له صوفیەکان بوون بەلایەنگری (الحلّاج)، بەهۆی نەفامی و، بەتەنگەوەنەهاتن و، کوێنەدانیان بەیەك دەنگی زانایان.

ئەوەبوو (إبراهيم)ی کوڕی (محمدِ النَّصْراباذِيّ) دەیگوت: ئەگەر پاش پێغەمبەران و ڕاستگۆیان یەکخواپەرستێك هەبێ، ئەوه (الحلّاج)ه.

دەڵێم _ ابن الجوزي _ زۆربەی چیرۆك خوانان و، صوفیەکانی زەمەنی ئێمە لەسەر ئەم ڕێبازەن، چونکه هەر هەموویان بەشەرع نەفامن و، له زانستی گێڕانەوەی فەرموودەشەوه (النقل) بەدوورن.

له باس وخواسەکانی (الحلّاج)دا کتێبێکم کۆکردۆتەوه، فڕوفێڵ و، پێشێلکاریەکانیم تێدا ڕوون کردۆتەوه، له گەڵ ئەو گوفتارانەی که زانایان سەبارەت بەم پیاوه گوتویانە.

خواش یارمەتیدەره له سەرکوتکردنی نەفاماندا.

## ✸ باسی سەرلێشێواندنەكانی ئیبلیس بەرامبەر بەصوفیەكان لە بواری پاكردنەوەدا (الگهارە):

نووسەر دەفەرمێت:

پێشتر باسی سەرلێشێواندنەكانی ئیبلیسمان بۆ كردن بەرامبەر بەخواپەرستان لە بواری پاكردنەوەدا، بەڵام لە صوفیەكاندا سنوری تێپەڕاند، ئەندێشەی خراپی بەلاوە بەهێزكردن بۆ بەكارهێنانی ئاوی زۆر، تا ئەو ئاستەی پێم گەشتووە كەوا (ابن عَقیل)(٢٨٥) چووە خەڵوەتگەیەكی(رباط) صوفیەكانەوە، دەستنوێژی شت، صوفیەكان پێی پێكەنین چونكە ئاوێكی كەمی بەكارهێنا، كەچی نەیاندەزانی ئەو كەسەی بەچاكی دەستنوێژ بشوات یەك (رطل)(٢٨٦) ئاوی بەسە.

پێم گەشتووە كەوا (أبي حامدِ الشّیرازی) بە هەژارێكی صوفی گوت: لە كوێ دەستنوێژ دەشۆی ؟ گوتی: لە ڕووبار، لە خۆپاككردنەوەدا دودڵیم هەیە. ئەویش گوتی : پێشتر صوفیەكان گاڵتەیان بەشەیتان دەكرد، ئێستا شەیتان گاڵتەیان پێ دەكات.

---

٢٨٥ _ ابن عَقیل: شێخی پێشەوا _ ابن الجوزي _یە.

٢٨٦ _ رطل: (ابن قتیبة) لە (غریب الحدیث)دا فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا _ صلى الله علیە وسلم _ بە(المُدُّ) واتە بە گوێلێك ئاو دەستنوێژی دەشت، (المُدُّ)یش (رطل)ێك و سێ یەكی (رطل)ێكە. یاخود بە كێشی سەردەم الرطل = ٤٥٠ غرام. بڕوانە: http://ar.wikipedia.org/wiki/. وەرگێڕ.

## * باسی سەرلێشێواندنەكانی ئیبلیس بەرامبەر بەصوفیەكان لە نوێژدا:

نووسەر دەفەرمێت:

پێشتر باسی سەرلێشێواندنەكانی ئیبلیسمان بۆ كردن بەرامبەر بەخواپەرستان لـە نوێـژدا، هەروەها سەر لە صوفیەكانیش دەشێوێنێت و، زیادیشی دەكات.

(محمدُ)ی كوڕی (طاهرِ المقدسيُّ) باس دەكات كەوا لەو سوننەتانەی تیایـدا تـاك دەبنـەوەو پەیوەستەگی خۆیانی بـۆ دەردەبـڕن دوو ركـات نوێژكردنـە پـاش پۆشـینی (المُرَقَّعَـةِ)و (٢٨٧) تەوبەكردن، بەڵگەشی بۆ هێناوەتەوە بەفەرموودەكەی (ثُمامة)ی كوڕی (أُثالٍ) ((أنَّ النبـيَّ _ صلى الله عليه وسلم _ أمـرهُ حينَ أسـلمَ أنْ يغْتَسِلَ))(٢٨٨). واتـە: ((كـاتێ موسـڵمان بـوو پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ فەرمانی دایە خۆی بشوات)).

نووسەر دەفەرمێت:

چەند ناشیرینە نەفام خۆی لە شتێكدا هەڵقورتێنێت كە پەیوەندی بـەوەوە نـەبێ ! چـونكە (ثُمامة) كافر بوو، پاشان موسڵمان بوو، ئەگەر كافر موسڵمان بوو، پێویـستە خـۆی بـشوات بەپێی ڕێباوەڕی كۆمەڵێ لە فیقهزانان، لەوانە پێشەوا (أحمد)ی كوڕی (حنبل)ە.

بەڵام سەبارەت بەدوو ڕكات نوێژكردن، هیچ یەكێك لەزانایان فەرمانی نوێـژكردنی نـەداوە بەو كەسانەی كە موسڵمان دەبن ، فەرموودەكەی (ثُمامـة)ش باسی نوێژكردنی تێدا نییە، بـۆ ئەوەی قیاسی لەسەر بكرێت، ئایا لە واقیعـدا ئەمـە تـەنها بیدعەیـەك نییـەو ناویـان نـاوە سوننەت ؟!

---

٢٨٧ _ جۆرێكە لە پۆشاكی صوفیەكان و، ئەو ناوەی لێنراوە چونكە پینەی پێوەیە.

٢٨٨ _ رواه البيهقي في ((السنن الكبرى)) (١ / ١٧١) عن أبي هريرة.

وسنده صحيح.

وأصل القصّة في ((الصحيحين)) دون هذا الشاهد.

پاشان ناشیرینترین گوفتاری ئەوەیە کە دەڵێ: بەڕاستی صـوفیەکان بەسـوننەتگەلێك تـاك دەبنەوە، چونکە ئەو سوننەتانە ئەگەر پەیوەستەگی بەشەرعەوە هەبێ، ئەوا موسڵمانان تیایدا یەکسانن و، فیقهزانانیش زۆر بەچـاکی دەیـانزانی، ئـیتر لـە چ ڕوویەکـەوە صـوفیەکان بـەو سوننەتانە تاك دەبنەوە، ئەگەر بەپێی بیروڕای خۆشیان بێـت، بەڕاسـتی لـە ئەنجامـدانی ئـەو سوننەتانەدا تاك بونەتەوە، تەنها لەبەر ئەوەی خۆیان دایانهێناوە.

## ✸ باسی سەرلێشێواندنەکانی ئیبلیس بەرامبەر بەصوفیەکان لە شوێنی نیشتەجێ بووندا:

نووسەر دەفەرمێت:

بەڵام بونیادنانی خەڵوەتگە (رباط)، کۆمەڵێك لە خواپەرستانی دێرین ئەم شوێنەیان هەڵدەبژارد بۆ ئەوەی لە خەڵك تاك بنەوەو خواپەرستی تێدا بکەن، نیازو مەبەستی ئەم کەسانە ئەگەر ڕاستیش بێ، ئەوا لە شەش ڕووە بەهەڵەدا چوونە:

یەکەمیان: ئەوان ئەم بینایەیان بەدیهێناوە، کەچی بینای کۆمەڵی موسڵمانان تەنها مزگەوتە.

دووەم: ئەوان بینایەکی هاوشێوەیان بۆ مزگەوت داناوە کە دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی موسڵمانان لە مزگەوتەکاندا.

سێ یەم: پاداشتی هەنگاونانیان بۆ مزگەوت لە کیس خۆیان بردوە.

چوارەم: خۆیان چواندوە بەگاوران کە تاك بونەتەوە بەدێرو کەنیسەکان.

پێنجەم: ژنیان نەهێناوە کەچی لاون و، زۆربەشیان پێویستیان بەژن هێنانە.

شەشەم: ئاڵایەکیان بۆ خۆیان داناوە دەڵێ ئەمانە زاهیدن و، پێویستە دیدەنیان بکرێتو، فڕوبەرەکەتیان لێ وەرگیرێت.

وە ئەگەر مەبەستیشیان ڕاست ودروست نەبێ، ئەوا بەڕاستی دوکان و جێگەگەلێکیان بۆ یاری کردن بە(الکُوبةِ)(٢٨٩) دروستکردووە، جەوێکی لەبار بۆ بێکاری، هێمایەك بۆ زوهد بەدەرخستن.

جەماوەری پاشیانانی تەصوفمان بینیوە لە خەڵوەتگەکاندا(رباط) خۆیان لە ماندوویەتی پەیداکردنی پڕێوی حەوانۆتەوەو، سەرقاڵن بەخواردن و خواردنەوەو گۆرانی و سەماکردنەوە،

---

٢٨٩ _ الکُوبة: جۆرێکە لەو ئامێرانەی کە بۆ ڕابواردن و کات بەسەربردن بەکاردێت، کە یا یاری زارە یاخود تەپڵە.

لەهەموو ستەمکارێك داوای دونیا دەکەن، لەوەرگرتنی بەخشینی ئەو کەسانە خۆیان ناپارێزن کە بەناهەق ماڵی خەڵك وەردەگرن.

زۆربەی خەڵوەتگەکانیان (رباط) لەلایەن ستەمکارانەوە دروست کراوەو، ماڵ ودارایی پیسیشیان بۆ تەرخان کردووە.

ئیبلیس سەری لێشێواندوون و وای بەخەیاڵدا هێناون کە ئەو ماڵەتان پێدەگات رۆزی ئێوەیەو، کێشەی وەرەع و خۆبەدورگرتن لە هەڵەو تاوان لەسەر نەفسی خۆتان لابەرن، بۆیە ئەرکی نارەحەتیان سورخواردنە بەدەوری چێشتخانەو، خواردن و، ئاوی ساردکراودا، ئەی باشە برسێتی (بِشرْ) لە کوێ یە، وەرع و خۆبەدورگرتن لە هەڵەوتاوانی (سَرِيّ) لە کوێ یە، جددیاتی (الجُنَيْدِ) لە کوێ یە ؟

زۆربەی کاتی ئەمانە بە رابواردن و لەزەت لە قسەکردن، یاخود دیدەنی کەسانی دونیاویستانەوە بەسەردەچێت، ئەگەر یەکێکیشیان سەرکەوێت، ئەوا سەری بە نێو (زُرْمانِق)ەکەیەوە(٢٩٠) دەکات و، (السوداءُ)ی(٢٩١) بەسەردا زاڵ دەبێ و، دەڵێت: دڵم لە پەروەردگارمەوە بۆی باس کردم !

پێم گەشتووە کەوا پیاوێك لە خەڵوەتگەیەکدا (رباط) قورئانی خوێند، قەدەغەیان کرد، کۆمەڵێکیش لە خەڵوەتگەیکدا (رباط) فەرموودەیان خوێند، پێیان گوتن: ئەمە شوێنی ئەو کارە نییە.

واللە الموفق.

---

٢٩٠ _ زُرْمانِق: جووبەیەکە لەخوری، معرَّبة. ((قاموس)) (ص ١١٤٩).

٢٩١ _ السوداء: لە نەخۆشیەکانی ئەقڵە.

## ✱ باسی سەرلێشێواندنەکانی ئیبلیس بەرامبەر بەصوفیەکان سەبارەت وازهێنانیان لە ماڵ وسەرەووت وسامانیان و خۆڕزگارکردن لێی:

ئیبلیس سەری لە پێشانی تەصوف دەشێواند، چونکە لە زوهدا ڕاستگۆبوون، عەیبی ماڵو سەروەتی پیشاندەدان، لەشەڕی دەیترساندن، بۆیە لەو ماڵ وسەروەتە خۆیان ڕزگار دەکردو، لەسەر ڕاخەری هەژاری دادەنیشتن، مەبەستیان چاك بوو، بەڵام ڕەفتاریان لەو بارەوە هەڵە بوو، چونکە زانستیان کەم بوو.

بەڵام ئێستا، ئیبلیس ئەو بارەی لەسەر سووك کراوەتەوە، چونکە ئەگەر کەسێکیان ماڵو سەروەتی هەبێ، هەڵدەستێ و بەفێڕۆدان ولەناوبردن خەرجی دەکات.

خاوەنی ئەم ڕفتارە سەرزەنشت ناکەم ئەگەر دەست بەرێ بۆ زیادە ماڵێك کە بۆ خۆی پاشەکەوتی کردبێ، یاخود پیشەسازیەکی هەبێ و پێویستی بەخەڵك نەبێ، یاخود ماڵ وسامانەکەی گومانێکی تێدا بێ و، بیکابە بەخێرو صەدەقە.

بەڵام ئەگەر هەستێ و سەراپای ماڵ وسەروەتە حەڵاڵەکەی دەرهێنێ و، پاشان چاوەڕێی دەستی خەڵکی بکات و، خاوخێزانەکەی هەژار بکات، ئەوا خۆی تووشی منەتی برایان یاخود خێروصەدەقەکەنیان دەکات، یاخود لە ستەمکاران و کەسە بەگومانەکان دەبات، ئا ئەمەیە کرداری زەمکراوی قەدەغەلێکراو.

سەرم سوڕنامێنێ لەو زاهیدانەی لەبەر کەمی زانستیان بەم کارە هەستاون، بەڵام بەرامبەر بەکەسانێك سەرم سوڕدەمێنێ ئەقڵ و زانستیان پێیە، چۆن هانی خەڵك دەدەن بۆ ئەم کارەو، فەرمانی پێدەکەن، لەگەڵ ئەوەی کە دژایەتی ئەقڵ وشەرع دەکات ؟!

**(الحــارث المحاســبي)**(٢٩٢) گوفتــارێكی زۆری لــەم بــارەوە باســكردووە، **(أبوحامـد الغزالي)**یش(٢٩٣) هەستا بەبونیادنانی و سەرخستنی.

بەلای منەوە (الحارث) لە (أبوحامد) بەهانەدارترە، چونكە (أبوحامد) زانـاترو فەقیـە تـر بوو، بەڵام كە خۆی خستە نێو چوارچێوەی تەصوفەوە، وای لەسەر پێویـست دەكـرد هەسـتێ بەسەرخستنیی.

٢٩٢ _ فی ((رسالة المسترشدین)) !

٢٩٣ _ فی ((إحیائه)) !

## ✸ ڕەخنەگرتن لە ڕێبازی صوفیەكان سەبارەت بەوازهێنانیان لە سەرەووەت و سامانەكانیان:

بەچەند ڕێگەیەك وەڵامی ئەم گوفتارە دەدەینەوە:

بۆ ڕێزی ماڵ وسامان، خوای _ عزَّوجلَّ _ ڕێزێكی گەورەی بۆ داناوەو، فەرمانی بە پاراستنی داوە، چونكە كردویەتی بەكۆڵەكەو پاڵپشتی مرۆڤی ڕێزدار، كە بەڕاستی ڕێزدارە، خوای تعالی دەفەرمێت:

﴿ وَلا تُؤْتُوا السُّفَهَاءَ أَمْوَالَكُمُ الَّتِي جَعَلَ اللَّهُ لَكُمْ قِيَامًا ﴾﴿النساء: ٥﴾ واتە: ﴿ وَلا تُؤْتُوا السُّفَهَاءَ﴾ مەیدەن بەگێل و نەفامتان ﴿ أَمْوَالَكُمُ ﴾ ماڵەكانتان ﴿ الَّتِي جَعَلَ اللَّهُ لَكُمْ﴾ نە بارێكدا خوای تعالی ئەو ماڵانەی بۆ كردون ﴿ قِيَامًا ﴾بەهۆی ڕاوەستانی ژیانتان(٢٩٤).

خوای تعالی قەدەغەی كردووە ماڵ وسامان بدرێتە دەستی كەسانی بیٰ ئەقڵ وناژیر، دەفەرمێت:

﴿ فَإِنْ آنَسْتُمْ مِنْهُمْ رُشْدًا فَادْفَعُوا إِلَيْهِمْ أَمْوَالَهُمْ ﴾﴿ النساء: ٦ ﴾ واتە: ﴿ فَإِنْ آنَسْتُمْ ﴾ ئینجا ئەگەر هەستان كرد ﴿ مِنْهُمْ رُشْدًا ﴾ لەواندا ژیری (وپێگەیشتن) ﴿ فَادْفَعُوا إِلَيْهِمْ أَمْوَالَهُمْ ﴾ ئەوە سامان و ماڵەكانیان پیٰ بدەنەوە(٢٩٥).

وقد صحَّ عن رسولِ اللهِ أنَّه نهى عن إضاعةِ المالِ(٢٩٦) واتە: پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ قەدەغەی كردوە ماڵ و سامان بەفیڕۆ بدرێت.

وقالَ رسول الله _ صلى الله عليه وسلم _ لسعدٍ: ((لأَنْ تَتْرُكَ وَرَثَتَكَ أَغْنِيَاءَ خَيْرٌ لَكَ مِنْ أَنْ تَتْرُكَهُم عَالَةً يَتَكَفَّفُونَ النَّاسَ))(٢٩٧) واتە پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ بە

---

٢٩٤ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

٢٩٥ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

٢٩٦ _ رواه البخاري (١٤٧٧)، ومسلم (٥٩٣ / ١٢ / ٥٩٣). عن المغيرة.

٢٩٧ _ رواه البخاري (٥ / ٣٦٣)، ومسلم (١٦٢٨) " عن سعد.

(سعد)ى فەرموو: ((ئەگەر واريسەكانت بەدەولّەمەندى بەجێبێلّيت زۆر چاكترە لەوەى كە بەهەژارى بەجێيان بێلّيت و دەست لە خەلّك پان بكەنەوە)).

وقالَ رسول الله _ صلى الله عليه وسلم _:

((ما نَفَعَني مالُ كَمالِ أَبي بكرٍ))(٢٩٨) واتە پێغەمبەرى خوا _ صلى الله عليه وسلم _ فەرمووى: ((هيچ مالّ و سامانێك سودى پێنەگەياندم بەئەندازەى مالّ و سامانەكەى (أبي بكر))).

وعن عَمْرو بن العاص قالَ: بعثَ إليَّ رسولَ اللهِ _ صلى الله عليه وسلم _ فقالَ:

((خُذْ عليكَ ثيابَكَ وسلاحَك، ثم ائْتِني))

فأتيتُهُ، فقال:

((إِنِّي أُريدُ أن أبعثَكَ على جيشٍ فيُسلِّمَكَ اللهُ ويُغْنِمَكَ، وأرغبُ لك في المالِ رغبةً صالحَةً)).

فقلتُ: يا رسولَ اللهِ ! ما أَسلمْتُ مِن أَجْلِ المالِ، ولكنِّي أَسلمتُ رغبةً في الإسلامِ ! فقال:

((يا عمرو ! نِعْمَ المالُ الصالحُ للرجلِ الصالحِ))(٢٩٩).

واتە: لە (عَمْرو)ى كورِى (العاص)ەوە _ خواى لێ رِازى بێت _ فەرموويەتى: پێغەمبەرى خوا _ صلى الله عليه وسلم _ ناردى بەشوێنمداو فەرمووى:

((جلەكانت بپۆشەو چەكەكەت هەلّگرەو، پاشان وەرە بۆ لام))

منيش چوومە خزمەتى، ئەوەبوو فەرمووى:

---

٢٩٨ _ رواه ابن ماجة (٩٤)، وأحمد (٢ / ١٥٣) " عن أبي هريرة.

وسنده صحيح.

٢٩٩ _ رواه أحمد (٤ / ١٩٧ و ٢٠٢)، والحاكم (٢ / ٢)، وابن حبان (١٨٩) " عنه.

وسنده حسن.

((من دەمەویٚ تۆ بكەم بەسەركردەی سوپایەك و بتنێرم و، خوای تعالی ڕووسوورت بكات‌و، دەستكەوتەكانی جەنگت بداتێ، وە حەزم بەوەیە ماڵ و سامانت دەستكەوێت بەحەزپێكردنێكی چاك)).

منیش گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ! لەبەر ماڵ و سامان موسڵمان نەبووم، بەڵكو موسڵمان بووم لەبەر ئەوەی حەزم بەئیسلامە ! فەرمووی:

((ئەی (عمرو) ! چەند باشە ماڵ و سامانی چاك بۆ پیاوی چاك)).

نووسەر دەفەرمێت:

ئەم فەرموودانە (صحیح)ن و، پێچەوانەی بیروباوەڕی صوفیەكانە كە گوایە زۆركردنی ماڵ وسامان پەرژین و سزایەو، ڕاگیركردنی سەروەت وسامان پێچەوانەی پشت بەستنە.

نكۆڵیی لەوە ناكرێت كە ترس لە فیتنەو ئاشوبی ماڵ و سامان دەكرێت و، لە ترسی ئەوەدا، خەڵكێكی زۆر خۆیان لیٚ دورخستۆتەوە، بۆیە لەو ڕووەوە كۆكردنەوەی سەروەت و سامان قورس وگران دەبیٚ، دوریشە دڵ بێوەی بیٚ و حەزی پیٚ نەبیٚ، لەگەڵ بونی ماڵ و سامانیشدا زۆر دەگمەنە دڵ خۆی بەیادكردنەوەی ڕۆژی دوایەوە سەرقاڵ بكات، ئالەبەر ئەمەیە كەوا لە فیتنەو ئاشوبی ترساون.

بەڵام سەبارەت بەكۆكردنەوەی ماڵ وسامان، ئەو كەسەی بەحەڵاڵی تەنها ئەوەندە كۆیكاتەوە كە پێویستیەكانی جێبەجیٚ بكات و پێی قایل بیٚ، ئەوە دەبیٚ هەر بكرێت، بەڵام ئەو كەسەی خوازیاری كۆكردنەوەو زۆركردنی ماڵ وسامانە، تەماشای مەبەستەكەی دەكەین، بۆیە ئەگەر مەبەستی خودی خۆهەڵكێشان و شانازی كردن بوو، ئەوا مەبەستەكەی خراپە، وە ئەگەر مەبەستیشی ئەوەبیٚ كە خۆی و خاوخێزانەكەی لە كاری ناڕەواو حەرام بەدوربن، بۆ ڕووداو نەهامەتی ڕۆژگارەكانی خۆی و ئەوانیش پاشەكەوت بكات، لە ڕادەی پێویست زیاتر بۆ دۆست و برایانی خەرج بكات، دەوڵەمەندكردنی هەژاران بیٚ، ئەنجامدانی بەرژەوەندیەكان بیٚ، ئەوا بۆ ئەو مەبەستانەی پاداشت دەدرێتەوەو، كۆكردنەوەشی بەپێی ئەم نیٚتە لەزۆر پەرستنەكان چاكترە.

نیِّتی کەسانێکی زۆری هاوەڵان _ خوا لە هەموویان ڕازی بێت _ سەبارەت بەکۆکردنەوەی ماڵ وسامان پاك بوو، چونکە مەبەستیان لە کۆکردنەوەیدا چاك بوو، بۆیە سووربوون لەسەری‌و، داوای زیادکردنیشیان دەکرد.

نووسەر دەفەرمێت:

لەمەش تەواوتر ئەوەبوو کە (یعقوبَ) پێغەمبەر _ علیهِ الصلاةُ والسلامُ _ کە کوڕەکانی پێیان گوت: ﴿ وَنزدَادُ كَيْلَ بَعِيرٍ ﴾ یوسف: ٦٥ ﴾ واتە: وباری وشترێکیش دانەوێڵەی زیاد دەهێنین([٣٠٠])، ئارەزووی کردو، (بِنْیامینَ)ی([٣٠١]) لەگەڵدا ناردن.

(شُعیب)یش بەتەمای زیادکردنی ئەوەبوو کە بەدەستی دەهێنێ، بۆیە فەرمووی: ﴿ فَإِنْ أَتْمَمْتَ عَشْرًا فَمِنْ عِنْدِكَ ﴾ القصص: ٢٧ ﴾ واتە: ئەگەر دەساڵت تەواو کرد ئەوە لە پیاوەتی خۆتەوەیە([٣٠٢]).

وأنَّ أَيُّوبَ _ عليه السلام _ لما عُوفِيَ" خرَّ عليهِ جَرَادٌ مِن ذهبٍ، فأخذ يَحْشُو في ثوبِهِ، يستكثرُ منهُ، فقيلَ لهُ: أما شبعْتَ ؟ قالَ: ياربِّ ! مَن يَشْبَعُ مِن فضلِك([٣٠٣]) واتە: (أَيُّوب) _ علیه السلام _ کە چاك بویەوە، کولەیەکی زۆری زێڕینی بەسەردا باری، ئەویش دەستیکرد بەپڕکردنی پۆشاکەکەی خۆی، دەیەویست ماڵ وسامانەکەی پێ زیاد بکات، پێی گوترا: ئایا تێر نەبووی ؟ ئەویش فەرمووی: ئەی پەروەردگارم ! کێ لە فەزڵ و چاکەی تۆ تێر دەبێ.

ئەمە شتێکە لە خووی مرۆڤدا چەسپیوە، بۆیە ئەگەر بۆ مەبەستی چاك ئاڕاستەکرا، ئەوا دەبێ بەخەیرێکی پوخت.

بەڵام گوفتارەکانی (المحاسبي)، هەڵەیەو پەنجەڕادەکێشێت بۆ نەفامبوون بەزانست، وە کە دەڵێت: ((خوای _ عزَّوجلَّ _ قەدەغەی بەندەکانی خۆی کردووە ماڵ وسامان کۆکەنەوەو،

---

٣٠٠ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

٣٠١ _ لەو ناوانەیە کەلە هەواڵە ئیسرائیلیەکاندا هاتووە.

٣٠٢ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

٣٠٣ _ رواه البخاري (٣٣٩١) عن أبي هُريرة.

پێغەمبەری خوا _ صلی الله علیه وسلم _ قەدەغەی ئومەتەکەی خۆی کردووە ماڵ و سامان کۆکەنەوە))، ئەمە شتێکی مەحاڵە، بەڵکو لەڕاستیدا قەدەغەکردنەکە بۆ خراپی مەبەستە لە کۆکردنەوەدا، یاخود لەسەرچاوەی ناحەڵاڵەوە کۆبکرێتەوە.

وە کە دەڵێت: ((وازهێنان لە ماڵ وسامانی حەڵاڵ لە کۆکردنەوەی چاکترە))، ئاوەها نییە، بەڵکو هەرکات مەبەست لە کۆکردنەوەی سەروەت و سامان دروست بوو، ئەوا کۆکردنەوەی چاکترە بەبێ هیچ جیاوازیەك لەنێوان زانایاندا.

ئەمە ڕێباوەڕی فەقیهەکانە، وە سەرم سوڕدەمێنێ لە بێدەنگ بوونی (أبي حامد)، بەڵکو بەوەشەوە نەوەستاوەو هەستاوە بەسەرخستنی ئەو گوفتارانە، باشە چۆن دەڵێت: ((نەبوونی ماڵ و سامان لە بوونی چاکترە، ئەگەرچی لە ڕووە خێرەکانیشدا خەرج بکرێت)) ؟!

وە ئەگەر بانگەشەی (الإجماع)ی لەسەر پێچەوانەی ئەمە بکردایە، بەدڵنیایی ڕاست دەبوو، بەڵام تەصوفەکەی شتێکی ترەو فەتواکەشی شتێکی ترە.

وە سەبارەت بەو گوفتارەی کە دەڵێت: ((پێویستە مورید واز لە ماڵ و سامانەکەی بهێنێت و لێی بچێتە دەرەوە))، پێشتر ڕوونمان کردەوە کە ئەگەر ماڵ و سامانەکە حەرام بێت، یاخود گومانی تێدا بێت، یاخود ئەو کەسە بەکەم قایل بێت، یاخود بەبژێوی پەیداکردن ڕازی بێت، ڕەوایە وازی لێ بهێنێت و لەماڵ و سامانەکەی بچێتە دەرەوە، بەپێچەوانەشەوە هیچ ڕوویەك نییە بۆ وازهێنان لە ماڵ و سامان.

سەبارەت بە پێغەمبەرانیش، (إبراهیم) پێغەمبەر _ علیه الصلاة والسلام _ کشت وکاڵو ماڵ وسامانی هەبوو، هەروەها (شُعیب)و، جگە لەویش.

(سعیدُ)ی کوڕی (المسیَّب) _ خوای لێ ڕازی بێت _ دەیفەرموو: ئەو کەسەی بەدوای ماڵو سامان پەیداکردندا نەگەڕێت، هیچ خەیرێکی تێدا نییە، بۆ ئەوەی قەرزەکانی پێ بداتەوە، ئابڕو و ناموسی پێ بپارێزێ، پەیوەندی خزمایەتی پێ بەجێبێنێ، کە مردیش، بۆ واریسەکانی بەجێی بێڵێت.

(ابنُ المسیَّب) لەپاش مردنی چوارسەد دیناری بەجێهێشت.

پێشتریش ئەوەمان بۆ باسکردن کە هاوەڵان لە پاش خۆیان بەجێیان هێڵا.

(سـفيانُ الثـوريُّ) _ خـوای لـێ ڕازی بێـت _ پـاش مردنـی دووسـەدی بەجێهێـشت، دەشیفەرموو: ماڵ وسامان لەم زەمەندا چەکە.

بەردەوام پێـشینی چـاك ستایـشی مـاڵ و سـامانیان دەکـردو، بـۆ کارەسـات و ڕووداوە دژوارەکـان و، یارمەتیـدانی هـەژاران کۆیـان دەکـردەوە، لەڕاسـتیدا کۆمـەڵێك خۆیـان لـێ دوردەخستەوە چونکە بەلایانەوە پەسەندتربوو خۆیان بەپەرستنەوە سەرقاڵ بکەن و، هیمـەتیان کۆکەنەوە، بۆیـە بەکـەم قایـل بـوون، کـەوابوو ئەگـەر گوفتابێـژی سـەرەوە بیگوتبـا: کـەم کۆکردنەوەی لەپێشترە، شتەکە شیاوترو مـاقوڵتر دەبـوو، بـەڵام ئـەو نزیکـی پلـەی تـاوانی کردۆتەوە !

## ✱ ئارامگرتن لەسەر هەژاری و نەخۆشی:

بزانە هەژاری نەخۆشییە، بۆیە هەرکەس گرفتاری بوو و ئارامی گرت، لە سەر ئەو ئارامگرتنەی پاداشتی دەدرێتەوە، پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ فەرموویەتی: ((يدخُلُ الفقراءُ الجنةَ قبلَ الأغنياءِ بخمس مئةِ عامٍ))(٣٠٤) واتە: هەژاران پێشی دەوڵەمەندان بە پێنج سەد ساڵ دەچنە بەهەشتەوە.

لەبەر پلەبەرزی ئەو ئارامی و خۆڕاگریەی کە لەسەر نەهامەتیەکان دەیگرن.

ماڵ وسامان نیعمەتەو، نیعمەتیش پێویستی بەسوپاسگوزاریە، وە دەوڵەمەندیش ئەگەرچی ماندوبێ و خۆی بخاتە مەترسیەوە هەر وەکو موفتی و تێکۆشەرە لە پێناوی خوادا، هەژاریش وەکو گوشەگیرێکە.

(أبوعبدالرحمنِ السُّلَميُّ)(٣٠٥) لە کتێبی ((سُنَنِ الصوفيةِ))داو لەبەشی: (كراهيةِ أن يُخَلِّفَ الفقيرُ شيئاً)، واتە: (نەویستراوە هەژار شتێك بەجێ بێلێت)، ئەو فەرموودەیەی باسکردووە کەوا پیاوێك لە (أهل الصُفَّةِ) مردو دوو دیناری بەجێهێشت، پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ فەرمووی:

((كَيَّتانِ))(٣٠٦) واتە: دوو داخ کردنە.

نووسەر دەفەرمێت:

کەسێ ئەمە دەکاتە بەڵگە لە بارودۆخەکە تێنەگەشتبێت، چونکە ئەو هەژارە لەبردنی خێرو صەدەقەدا تەنگی بەهەژارەکانی تر هەڵدەچنی و، پارەکەی خۆی دەگرتەوەو بۆ خۆی خەرجی نەدەکرد ، بۆیە پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ فەرمووی: ((كَيَّتانِ))،

---

٣٠٤ _ كما رواه أحمد (٢ / ٥١٣)، وابن ماجة (٤١٢٢)، والترمذي (٢٣٥٣) " من طرق عن أبي هريرة. وسنده صحيح.

٣٠٥ _ انظر أقوال العلماء فيه في مقدمتي لكتاب ((تخريج الأربعين السلمية)(ص١٣) للسخاوي.

٣٠٦ _ رواه أحمد (٧٨٨) عن علي، وفي سنده جهالة " كما جزم به الشيخ أحمد شاكر، وله شواهد عدَّة تصحِّحه، انظرها في ((الإتمام لتخريج أحاديث المسند الإمام)) (رقم ٩٥٣٤).

ئەگەر خودی دەست بەرداربوونی ماڵ وسامان نەویستراو و مەكروە نەبوایە، پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ بە (سعد)ی نەدەفەرموو:

((إِنَّكَ أَنْ تَذَرَ ورَثَتَكَ أَغنياءَ خيرٌ مِنْ أَنْ تَذَرَهمْ عالَةً يَتَكَفَّفونَ النَّاسَ))(٣٠٧) واتە: ((ئەگەر واریسەكانت بەدەوڵەمەندی بەجێبێڵیت زۆر چاكترە لەوەی كە بەهەژاری بەجێیان بێڵیت و دەست لە خەڵك پان بكەنەوە)).

وە هاوەڵانیش لە پاش خۆیان هیچ شتێكیان بەجێنەدەهێڵا.

وقد قالَ عمرُ بنُ الخطابِ _ رضي الله عنه _: حثَّ رسولُ اللهِ _ صلى الله عليه وسلم _ على الصدقةِ، فجئتُ بنصفِ مالي، فقالَ رسولُ اللهِ _ صلى الله عليه وسلم _:

((وما أَبْقَيْتَ لأهلِكَ ؟))(٣٠٨).

فقلتُ: مثلَهُ.

فلم يُنْكِرْ عليهِ رسولُ اللهِ _ صلى الله عليه وسلم.

واتە: پێشەوا (عمرُ)ی كوڕی (الخطابِ) _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ هانی خەڵكی دەدا بۆ خێرو صەدەقەكردن، منیش نیوەی ماڵەكەم هێنا، پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ فەرمووی:

((بۆ خاوخێزانت چیت بەجێ هێڵاوە؟)).

گوتم: ئەوەندەی ئەوەی كە هێناومە.

بۆیە پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ نكۆڵیی لێ نەكرد.

(ابنُ جريرِ الطبريُّ) دەڵێت: ئەم فەرموودە بەڵگەی پوچبوونەوەی گوفتاری صوفیە نەفامەكانی تێدایە: كە گوایە مرۆڤ نابێ هیچ شتێكی ئەمڕۆی بۆ سبەینێ پاشكەوت بكات، هەركەسێكیش سەروەت وسامان كۆبكاتەوە كەسێكی بەگومان و كەمباوەڕە بەرامبەر بەپەروەردگاری و، بەهەقی پشتبەستنیش پشتی پێ نەبەستووە.

---

٣٠٧ _ تقدم تخريجه.

٣٠٨ _ حديثٌ صحيحٌ. انظر تخريجه في ((تخريج الأربعين السلمية)) (رقم ٤).

(ابنُ جريرٍ) دەڵێت: هەروەها فەرمامایشتی پێغەمبەری خـوا _ صـلى الله عليـه وسـلم: ((اتَّخِذوا الغَنَمَ " فإِنَّها بَرَكَةٌ))(٣٠٩) واته ((مەڕ بەخێوکەن، چونکه فڕوبەرەکـەتی تێدایـه)). بەڵگەی پوچێتی گوفتاری ئەو صوفیانەیه که دەڵێن بەندەی خوا پشت بەستنی تـەواو نابێـت مەگەر ڕۆژ بکاتەوەو هیچ شتێکی نەبێت، هەروەها ئێوارەش بکاتەوەو هیچی نەبێت، ئەی بۆ تەماشای ئەم فەرموودەیه ناکەن: ((ادَّخَرَ رسولُ اللهِ _ صلى الله عليه وسلم _ لأزواجه قـوتَ سَنَةٍ !))(٣١٠) واته: ((پێغەمبـەری خـوا _ صـلى الله عليـه وسـلم _ بـژێوی سـاڵێکی بـۆ خێزانەکانی پاشەکەوت دەکرد)).

---

٣٠٩ _ رواه الخطيب (٧ / ١١) عن عائشة " بسند صحيح.

وله طريق آخر في ((سنن ابن ماجة)) (٢٣٠٤)، وهو صحيح أيضاً.

٣١٠ _ رواه البخاري (٥٣٥٧)، ومسلم (١٧٥٧) (٥٠) " عن عمر _ رضي الله عنه _.

## * ڕەخنەگرتن لەو ڕێگایانەی صوفیەکان لە بواری پشتبەستندا بەکاریدێنن:

کەسانێك وازیان لە سەرەوت و سامانە پاکەکانیان هێناو، پاشان گەڕانەوەو ناچاری شتی پیس بوون و، داوایان لە خەڵك دەکرد، چونکە پێویستیێتی مرۆڤ کۆتای نایەت، ئاقڵیش ئەو کەسەیە کە خۆی بۆ ئایندە ئامادە دەکات، نموونەی ئەو کەسانەی کە سەرەتا دەستیان بەزوهد کردو وازیان لە سەرەوەت و سامانەکانیان هێنا، وەکو نموونەی کەسێکە کاتێ کە ڕێگەی مەککەی گرتەبەرو تێنویەتیەکەی شکا، هستا بە پرژو بڵاو کردنەوەی ئەو ئاوەی کە بەلایەوەبوو !

نووسەر دەفەرمێت:

لە دەست وخەتی (أَبي الوفاءِ)ی کوڕی (عقیلٍ)ەوە وەرم گرتووە، دەڵێت: (ابنُ شاذانَ) دەڵێت: کۆمەڵێك لە صوفیەکان چوونە دیدەنی (الشِّبْلي)، ئەویش پیاوێکی ڕەوانەی لای کەسێکی دەوڵەمەند کردو داوای پارەی لێدەکرد بۆ ئەوەی بیکات بەخەرجی بژێوی بۆیان، بەڵام دەوڵەمەندەکە پیاوەکەی گەڕانەوەو، گوتی: ئەی (أبابکر) ! تۆ هەق دەناسی، دەی داوات لەو بکردایە ! (الشِّبْلي) دیسان پیاوەکەی خۆی بۆ لای گەڕانەوەو، پێی گوت: پێی بڵێ: دونیا سووك وڕیسوایەو، لە سووك وڕیسوایەکی وەکو تۆ داوای دەکەم، هەقیش لە هەق داوا دەکەم. ئەوەبوو سەد دیناری بۆ نارد !

(ابنُ عقیلٍ) دەڵێت: ئەگەرچی پیاوەکە سەد دینارەکەی بۆ نارد بۆ ڕزگاربوون لەو قسە ناشیرینەو هاوشێوەکانی، بەڵام (الشِّبْلي) چەپەڵ لە پارەکەی خواردو، کردی بەخوارکی میوانەکانیشی.

کەسانێکیان کاڵاوشمەکی هەبوو، لەناوی بردو، گوتی: دەمەوێ متمانەم تەنها بەخوا بێ !

ئەمە کەم تێگەشتنە، چونکە واتێدەگەن پشتبەستن بەکارنەهێنانی هۆیەکانەو، وازهێنانە لە ماڵ وسامان، ئەم جۆرە کەسانە ئەگەر لە مانای ڕاستی پشتبەستن تێگەشتنایە _

بەڕاستی پشتبەستن متمانەی دڵە بەخوای _ عزَّوجلَّ _، نەك وازهێنان لە شێوەکانی ماڵو سامان _ ئەم قسانەیان نەدەگوت، بەڵام تێگەشتنیان کەم بوو.

دڵنیابن گەورە هاوەڵان و (تابعین) بازرگانیان دەکردو، ماڵ وسامانیان کۆدەکردەوەو، هیچ کەسێکیشیان ئاوەهایان نەدەفەرموو.

لە پێشەوا (أبي بکر الصدِّيق)ەوە _ خوای لیّ ڕازی بێت _ بۆیان باسکردوین کەوا پێی گوترا واز لە بژێوی پەیداکردن بهێنێت لەبەر ئەوەی سەرقاڵە بەخیلافەتەوە، ئەویش فەرمووی: ئەی چۆن خۆراکی خاوخێزانەکم بدەم ؟

ئا ئەمە گوفتارێکی نەویستراو و نادروستە بولای صوفیەکانەوە، بێژەری ئەم گوفتارە لە پشتبەستن دەکەنە درەوە.

هەروەها نکۆڵیی لەو کەسەش دەکەن کە دەڵێت: ئەم خۆراکە زیانم پێدەگەیەنێت !

## ✸ زوهدی صوفیەکان لەماڵ وساماندا:

نووسەر دەفەرمێت:

پێشتر ئاماژەمان پێدا کەوا پێشینانی تەصوف وازیان لەماڵ وسامانەکانیان دەهێنا وەکو زوهدێك، بەیادیشمان هێنانەوە کە مەبەستیان لەو بارەوە خەیر بوو، بەڵام لەم کردەوەیدا هەڵەبوون، چونکە بەیادمان هێنانەوە کە بەو کارەیان پێچەوانەکاری شەرع و ئەقڵ دەبوونەوە.

بەڵام پاشینانیان، هەواداری دونیاو، کۆکردنەوەی ماڵ وسامان بوون، لەهەر ڕوویەکەوە بێت، ئەوەیان بەپەسەند دادەنا بۆ بەدەستهێنانی حەسانەوەیەکی بێ قرەو مشەو، وەکو حەزکردنێکیش لە هەواو ئارەزووات:

کەسانێکیان توانای بژێوی پەیداکردنی هەیەو، کارناکات و، لە خەڵوەتگەیەکدا(رباط) یاخود لە مزگەوتێکدا دادەنیشێت و، پشت بە خێروصەدەقەی خەڵك دەبەستێ و، دڵی بەلێدانی دەرگاکانەوە بەستراوە !

ومعلومٌ أَنَّ الصدقةَ ((لا تحلُّ لغنيٍّ، ولا لذي مِرَّةٍ سويٍّ)(٣١١) واتە: زانراوە ((خێروصەدەقە بۆ دەوڵەمەندو، کەسی بەهێز، کە ئەندامەکانی جەستەی ڕاست و تەندروست بن، حەڵاڵ نییە)).

گوێ نادەن بەو کەسەی بۆیان دەنێرێت، بۆیە پێدەچێ کەسانی ستەمکارو باجگری زۆردار بۆیان بنێرن و، ڕەتی نەکەنەوە.

لەو بارەوە بۆ خۆیان چەند وشەیەکیان داناوە:

لەوانە: ئەوەیان ناوناوە بە (الفتوح)(٣١٢).

وە لەوانە: ڕۆژیان هەر دەبێ پێمان بگات.

---

٣١١ _ كما صحَّ عن النبـي _ صلى الله عليه وسلم _، ورواه عنه جماعةٌ من أصحابِه.
انظر تخريجه في: ((نصب الراية)) (٢ / ٤٠٠ _ ٤٠١)، و ((إرواء الغليل)) (رقم ٨٧٧).

٣١٢ _ وهي فتوح شيطانية " كما سبق بيانه تعليقاً. تەماشای پەراوێزی (٢٢٨) بکە.

وه لەوانە: ئەمە لە خواوەیە، بۆی ڕەت ناکرێتەوەو، جگە لەو سوپاسگوزاری هیچ کەسی تر نابین.

هەموو ئەمانە ناسازی شەریعەتن و، نەفامیشە بەرامبەر بە شەرع، پێچەوانەی ئەوەشە کە پێشینی چاك لەسەری دەچوون، پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ فەرموویەتی: ((الْحَلَالُ بَيِّنٌ، وَالْحَرَامُ بَيِّنٌ، وَبَيْنَهُمَا مُشَبَّهَاتٌ، لَا يَعْلَمُهَا كَثِيرٌ مِنْ النَّاسِ " فَمَنْ اتَّقَى الشُّبُهَاتِ " فقد اسْتَبْرَأَ لِدِينِهِ وَعِرْضِهِ))(٣١٣) واتە: ((حەڵاڵ ئاشکرایەو، حەرامیش ئاشکرایە، بەڵام لە نێوانیاندا کاروباری گوماناوی هەیەو ؛ بەلای زۆرێك لە خەڵکەوە حەڵاڵو حەرامێتی نەزانراوە، بۆیە هەرکەسێك خۆی لەو کاروبارە گوماناویانە بپارێزێ، بەڕاستی سەرفەرازێتی بۆ ئاین و ئابڕووی بەدەست هێناوە)).

پێشەوا (أبوبكر الصدِّيقُ) _ خوای لێ ڕازی بێت _ خۆی ڕشانەوە بەهۆی خواردنی شتێکی گوماناویەوە.

پیاوچاکان بەخشینی ستەمکارو، ئەو کەسانەی کە گومان لە ماڵ و سامانیاندا بوو وەرنەدەگرت.

زۆرێك لە پێشینی چاك بەخشین و دیاری و توێشووی برایانیان وەرنەدەگرت، بۆ پاکێتی و ڕاستی و خۆدوورخستنەوە لە خراپ.

لە (أبي بكرِ المَرْوَزِي)وە دەڵێت: باسی پیاوێك لە فەرموودەناسانم بۆ (أبـي عبـدِاللهِ)(٣١٤) کرد، ئەویش _ بەڕەحمەتی خوا بێت _ فەرمووی: ئای چ پیاوێك بوو، ئەگەر سیفەتێکی تێدا نەبوایە.

پاشان بێدەنگ بوو، پاشان فەرمووی: پیاو ناتوانێت هەموو سیفاتەکان تەواو بکات.

منیش پێم گوت: ئەی خاوەنی سوننەت نەبوو ؟

---

٣١٣ _ رواه البخاري (١ / ١١٧)، ومسلم (١٥٩٩) " عن النعمان بن بشير.

٣١٤ _ مەبەستی پێشەوا (أحمد)ی کوڕی (حنبل) بوو.

ئەوەبوو فەرمووی: بەدڵنیاییی، لێشمەوە نووسیوە، بەڵام یەك سیفەت: گوێی نەدەدایەو لە هەموو کەسێکەوە دەیبرد.

نووسەر دەفەرمێت:

پێمان گەشتووە کەوا کەسێك لەصوفیەکان چووە دیدەنییەکێك لە ئەمیرە ستەمکارەکان، ئامۆژگاری و مۆچیاری کردو، ئەویش شتێکی دایە، صوفیەکە وەریگرت و، ئەمیرەکەش گوتی: هەموومان ڕاوچین، بەڵام تۆڕەکان جیاوازە.

پاشان سەربەرزی و شکۆ و خۆپاراستن بەرامبەر بەمەیل نەکردنی دونیا لە کوێ یە ؟ پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ فەرموویەتی: ((اليَدُ العُلْيَا خَيْرٌ مِن اليَدِ السُّفْلَى))(٣١٥) واتە: ((دەستێکی بەرزتر لە دەستێکی خواروو چاکترە)).

مەبەست بەدەستێکی بەرزتر واتە دەستێکی بەخشەر، زانایان ئاوەها ڕاڤەیان کردووە(٣١٦)، ئەمە بۆچونی ڕاستی و هەقیقەتە، کەسانێکی دیکەش (تأویل)ی(٣١٧) دەکەن بەوەی کە گوایە مەبەست بەدەستێکی بەرزتر دەستێکی داواکارە!

بۆیە (ابنُ قُتَيْبَة) دەڵێت: واتێدەگەم ئەمە (تأویل)ی کەسانێکە کە بەلایانەوە خۆشە لە خەڵك داوا بکەن.

نووسەر دەفەرمێت:

پێشینانی تەصوف تەماشای بەدەستهێنانی ماڵ وسامانیان دەکرد کە لە چ ڕوویەکەوە دەستیان کەوتووە، وە بەدوای خۆراکی خۆیاندا دەگەڕان.

سەبارەت بە (السَّرِيِّ السَّقَطِيِّ) لە پێشەوا (أحمد)ی کوڕی (حنبل)یان پرسی ؟ _ وەکو پێشتر ئاماژەی پێدرا _ ئەوەبوو فەرمووی: شێخێکی ناوسراوە بەخۆراکی پاك و چاك.

---

٣١٥ _ رواه البخاري (٣ / ٢٦٥)، ومسلم (١٠٤٢) " عن أبي هريرة.

٣١٦ _ وقد ورد هذا مرفوعاً في الحديث نفسه، لكنه مُدْرَج " كما قال السخاوي في ((تخريج الأربعين السلمية)) (ص١٠٧).

٣١٧ _ تأویل: واتە ڕاڤەکردن، ڕوون کردنەوەی مانا. وەرگێر.

(السَّرِيُّ) دەڵێت: بۆ غەزا هاوەڵێتی کۆمەڵێکم کرد،ماڵێکمان بەکرێ گرت و، تەنورێکم تێدا دانا، بەڵام خۆیان لە خواردنی نانی ئەو تەنورەش دەپاراست.

بەڵام هەرکەسێك تەماشای ئەو شتە نوێ یانە بکات کە لە صوفیەکانی زەمەنی خۆماندا دێتە کایەوە _ وەکو ئەوەی گوێ نادەن سەرەوەت و سامانیان لە چ جێگەیەکەوە دەستیان دەکەوێ _ سەری سوڕدەمێنێ(٣١٨)!

چوومە ژوورەوە بۆ دیدەنی خەڵوەتگەیەك (رباط)، هەواڵی شێخەکەیەم پرسی ؟ پێم گوترا: چووە بۆ دیدەنی فڵان ئەمیر بۆ پیرۆزبای لێکردنی ئەو جل وبەرگەی کە بەدیاریی پێی بەخشراوە، ئەو ئەمیرە لە گەورە ستەمکارانیش بوو، ئەوەبوو گوتم: تیابچن، ئەوەتان بەس نەبوو کە دوکانێکتان کردەوە، هەتا شمەك وکاڵاکانیش دەخەنە سەر سەرتان و دەیگەڕێنن ! کەسێکتان دادەنیشێ و کاسبی ناکات لەگەڵ ئەوەی کە تواناداره بیکات ، پشت بە خێرو صەدەقەو بەخشش و دیاری دەبەستێ، پاشان ئەمەش تێری ناکات و بەسەر ستەمکاراندا دەگەڕێ و، داوایان لێدەکات پێی بدەن و، پیرۆزبایی جل وبەرگێکیان لێدەکات کە حەڵاڵ نیەو، دەستەڵاتێك کە دادپەروەری تێدا نییە، سوێند بەخوا ئێوە زیان بەئیسلام دەگەیەنن زیاد لەهەموو زیانبەخشێکی تر.

نووسەر دەفەرمێت:

کۆمەڵێك لە شێخەکانیان ماڵ و سامان لە کاروباری گوماناویەوە کۆ دەکەنەوەو، پاشان دابەش دەبن:

لەوانە کەسانێکیان بانگەشەی زوهد دەکەن لەگەڵ فرەیی ماڵ وساماندا، سووربونی لەسەر کۆکردنەوەی _ ئەم بانگەشەیە دژایەتی باروحاڵ دەکات _.

کەسانێکیشیان هەژاریی بەدەردەخات لەگەڵ کۆکردەنەوەی ماڵ و ساماندا.

وە زۆربەی ئەم کەسانە لەبردنی زەکاتیشدا تەنگ بەهەژان هەڵدەچنن، ئەمەشیان بۆ شیاو نییە.

---

٣١٨ _ سەرسوڕمان زیاتر دەبێ ئەگەر بیر لە کردەوەی صوفیەکانی زەمەنی ئێمە بکەیتەوە، پاش زەمەنی پێشەوا _ ابن الجوزي _ دانەری ئەم کتێبە بەنزیکەی هەزار ساڵ.

## ✸ باسی سەرلێشێواندنەکانی ئیبلیس بەرامبەر بەصوفیەکان لە پۆشاکیاندا:

نووسەر دەفەرمێت:

کاتێ پێشینانی تەصوف گوێبیست بوون کەوا پێغەمبەری خوا _ صلی الله علیه وسلم _ پۆشاکەکەی پینە دەکات(٣١٩)، وە پێشەوا (عمرَ)ی کوڕی (الخطابِ) _ خوای لێ ڕازی بێت _ بەپۆشاکەکەیەوە پینە هەبوو، وە (أُوَيس القَرَنيٌّ) لە شوێنی خۆڵ و پیسی پینەی هەڵدەگرت و، لە ئاوی ڕووباری فورات دەیشت و، دەیدوریەوەو، پاشان دەیپۆشی، ئەوانیش پۆشاکی پێنەکراویان هەڵبژارد !

بەڵام لە (القیاس)کردندا دورکەوتنەوە، چونکە پێغەمبەری خوا _ صلی الله علیه وسلم_و هاوەڵانی پۆشاکی کۆنیان پەسەند دەکردو ، بۆ زوهدێتی ڕوویان لە دونیا وەردەگێڕاو، زۆریەشیان بەهۆی هەژاریەوە ئەوانەی دەپۆشی، وەکو ئەوەی لە (مَسْلَمة)ی کوڕی (عبدِالملكِ)ەوە باسیان بۆ کردوین کەوا چووە دیدەنی پێشەوا (عُمَرَ)ی کوڕی (عبدِالعزیزِ)و تەماشای کرد کراسێکی پیسی لەبەردایە، بۆیە بە (فاطمةَ)ی خێزانی (عُمَرَ)ی کوڕی (عبدِالعزیزِ) گوت: کراسەکەی ئەمیری موسڵمانان بشۆ. ئەویش گوتی:

سوێند بەخوا لەوە زیاتر کراسی دیکەی نییە.

لێرەدا ئەگەر ئەمە لەبەر هەژاری و مەبەستی زوهدێتی نەبێ ؛ هیچ مانایەکی نییە !

---

٣١٩ _ رواه أحمد (٦ / ١٠٦و١٢١و١٢٦و١٦٧و٢٤١-٢٤٢و٢٦٠) من طرق عن عائشة.

وهو صحيح.

وفي الباب عن غيرها.

# ✸ زوهد له پۆشاكدا:

نووسەر دەفەرمێت:

بەڵام صوفیەكانی زەمەنی ئێمە، دەچن دوو یاخود سێ پۆشاك دەهێنن و، هەر دانەیەكیان ڕەنگێكی هەیە، پارچە پارچەی دەكەن و، بەیەكەوە دەیدورنەوە، بۆیە ئەو پۆشاكانە دوو وەسف كۆدەكەنەوە: ناوبانگی و، چێژو لەزەت وەرگرتن، چونكە پۆشینی ئەم جۆرە پۆشاكە پینەكراوانە بەلای خەڵكێكی زۆرەوە لە دیبای ئاورێشم بەناوبانگترە، بەوەش خاوەنەكەی بەزاهید ناوبانگ دەبێ، تەماشا دەكەی خۆیان دەكەنە شێوەیەكی پیناوی وەكو پێشینی چاك، ئاوەها بیردەكەنەوە، بەڵام ئیبلیس سەری لێشێواندن و، پێی گوتن: ئێوە صوفین، چونكە صوفیەكان پینەكراویان دەپۆشی و، ئێوەش ئاوەهان، تۆ بڵێی نەیانزانیبێ كە تەصوف مانایە نەك شێوە ؟!

ئەمانە خۆچواندنیان لە شێوەو مانادا لەدەست چوو:

لە شێوەدا، پێشینان لەبەر زەرورەت پینەیان دەكرد، مەبەستیان بەو پینەكراوانە خۆچاكردن نەبوو، پۆشاكگەلی ڕەنگ جیاوازیان نەدەبردو، لەهەر پۆشاكێك پارچەیەك ببڕن و، پاشان بیاندورنەوە بەشێوەكی جوان و، بە (المُرقعات)ی ناوبەرن !

بەڵام پێشەوا (عُمَرُ)ی كوڕی (خطاب) _ خوای لێ ڕازی بێت _ كە هاتە (بیت المقدس) ئەو كاتەی كە قەشەو ڕاهیبەكان پرسیاری ئەمیری موسڵمانانیان كردو، موسڵمانانیش سەركردەی سوپاكانیان پیشان دان؛ وەكو (أبي عُبیدَة)و، (خالد)ی كوڕی (الولید)و، كەسانی دیكە، ئایا ئەمیرتان هەیە یاخود نەء ؟ گوتیان: جگە لەمانە ئەمیرێكی دیكەمان هەیە. گوتیان: ئەو كەسە ئەمیری ئەمانەیە ؟ گوتیان: بەڵێ، (عُمَرُ)ی كوڕی (خطاب)ە _ خوای لێ ڕازی بێت _. گوتیان: بنێرن بابێت و چاومان پێ بكەوێت، ئەگەر هات، بەبێ جەنگ خۆمان بەدەستانەوە دەدەین، ئەگەر ئەویش نەبوو، ئەوا نەخێر، ئەگەر گەمارۆشمان بەن دەرەقەتمان نایەن، بۆیە موسڵمانان پیاوێكیان بۆ لای (عُمَرُ)ی كوڕی (خطاب) _ خوای لێ ڕازی بێت_ ناردوو هەواڵی ئەوەیان پێدا، ئەوەبوو تەشریفی هێناو پۆشاكێكی پۆشیبوو كە حەڤدە پینەی

پێوەبوو، پینەیەکیان لە پێستەبوو، کە قەشەو ڕوهبانەکان لەسەر ئەم سیفەتە چاویان پێکەوت، بەبێ جەنگ (بیت المقدس)یان تەسلیمی کرد.

ئەمە لە چ ئاستێکی ئەو ڕەفتارانەدایە کە صوفیە نەفامەکانی زەمەنی ئێمە ئەنجامی دەدەن؟!

داوای لێبوردن لە خوای تعالی دەکەین.

لەڕووی ماناشەوە، ئەو پێشینانە خاوەن ڕاهاتن و زوهد بوون.

نووسەر دەفەرمێت:

لەو کەسە زەمکراوانە پیاوی وایان تێدایە لە ژێر پۆشاکەوە خوری دەپۆشێت، سەرقۆڵەکەشی دەسوڕێنێتەوە بۆ ئەوەی پۆشینەکەی ببینرێت، ئەمە دزێکی شەوانەیە !

کەسانێکیشیان پۆشاکی نەرم بەسەر جەستەیەوە دەپۆشێت و، پاشان خوری بەسەردا دەپۆشێت، ئەمەش دزێکی ڕۆژیی ئاشکرایە.

کەسانێکی دیکەش هاتن و، ویستی خۆچواندنیان بەصوفیەکان هەبوو، بەڵام پێست وشکێتی و شڕۆڵی و پەڕپوتیان بەلاوە قورس بوو، وە حەزیان بەخۆش گوزەرانی بوو، واشیان پێ باش نەبوو لە شێوەی تەصوف بچنەدەرەوە، بۆ ئەوەی دەستکەوت وبژێویان نەبڕدرێت، بۆیە (الفوطة)و(٣٢٠)، پۆشاکی چاك و، مێزەری ڕومی چاکیان دەپۆشی، بەڵام بەبێ نەخش و نیگار، مێزەرێکی سەریان بەنرخی پێنج پۆشاکە لە ئاورێشم !

ئیبلیس سەری لێشێواندن وای بەخەیاڵدا هێنان کە ئێوە لەو صوفیانەن کە خاوەن نەفسێکی بەهادارن ! لەڕاستیدا ویستیان نێوان شێوازەکانی تەصوف و خۆشگوزەرانی ئەهلی دونیا کۆکەنەوە.

---

٣٢٠ _ الفوطة: پۆشاکێکی کورتی ئەستور و زبر بوو کە لە (السِّند)ەوە دەهێنراو وەکو (الإزار)ێك واتە بۆ بەشی خوارەوەی جەستە بەکاردەهات، هەروەها گوتراوە پۆشاکێك بووە لە خوری، بڕوانە: لسان العرب. وەرگێڕ.

نیشانەشیان هاوەڵێتی ئەمیران و، دوورکەوتنەوەیە لە هەژاران، چونکە خۆیان بەزل و بەگەورە دادەنێن.

پێغەمبەر (عیسی) _ صلوات الله وسلامه علیه _ دەیفەرموو:

((ئەی نەوەی (إسرائیل) ئەوە چیتانە کە دێن بۆ لام پۆشاکی ڕاهیبانتان پۆشیوەو، دڵەکانیشتان دڵی گورگە دڕندەکانن، جلی پاشایان بپۆشن و، دڵەکانیشتان بەترس نەرم ونیان کەنەوە)).

لە (مالك)ی کوڕی (دینارِ)ەوە(٣٢١) فەرموویەتی: لەم خەڵکە کەسانێك هەن ئەگەر چاویان بەخوێنەران و پیاوچاکان بکەوێت، لەگەڵ ئەواندا بەشێك دەبەن، وە ئەگەر چاویان بەزۆردارەکان و دونیاویستانیش بکەوێت لەگەڵ ئەوانیشدا بەشێك دەبن، بۆیە ئێوە لە خوێنەرانی ڕەحمان بن، خوا پشتیوانتان بێت.

هەروەها فەرموویەتی: ئێوە لە زەمەنێکی دێزەی نارەحەت و قورسدان، کەس زەمەنەکەنتان نابینێ مەگەر کەسێکی بینای زرنگ، ئێوە لە زەمەنێکدان خراپەکار زۆرە، زمانیان لە دەمیاندا ئاوساوە، بەکردەوەی ڕۆژی دوایی داوای دونیا دەکەن، بۆیە بۆ پارێزگاری نەفسی خۆتان وریایان بن، نەوەکا بکەونە داویانەوە.

لە (محمد)ی کوڕی (خَفیف)ەوە دەڵێت: بە(رُوَیـم)م(٣٢٢) گوت: ئامۆژگاریم بکە. ئەویش فەرمووی: کەمترین شتێك لەم کارەدا بەخشینی ڕوحە، ئەگینا کاربە گوتە پڕوپوچەکانی تەصوف مەکە.

٣٢١ _ ساڵی (١٢٧ك) مردوەو، یەکێکە لە باوەڕپێکراوانی (التـابعین)و پیاوماقوڵانیان، ژیانامەی لە ((سیر أعلام النبلاء))دایە (٥ / ٣٦٢).

٣٢٢ _ ناوی (رُوَیم)ی کوڕی (أحمد)ە، ساڵی (٣٠٣ك) مردووە، ژیانامەی لە (المنتظم)دایە (٦ / ١٣٦) کە پێشەوا _ ابن الجوزی _ نوسیویەتی.

پیاوێك بە (الشّبْلِيٌ) گوت _ کە لە مزگەوت دانیشتبوو _ کۆمەڵێك لە هاوەڵانت هـاتن، ئەویش کە چوو، پۆشاکی (المرقعـات) و (الفوطـة)ی لەبـەردا بیـنین، ئـەوەبوو ئـەم شـیعرەی خوێندەوە:

أما الخِيامُ فَإِنّها كَخيــامِهِم        وَأرى نِساءَ الحَيِّ غَيرَ نِسائِهِ

واتە: بەڵام چادرەکان وەکو چادرەکانی ئەوانــە... وە ژنـانی گەڕەکەکـە دەبیـنم ژنـانێکی دیکەن.

نووسەر دەفەرمێت:

بزانە خۆچواندن و لەمەبەست لادانی ئەم صوفیانەی زەمەنی ئێمە بەوانەی پێـشتر شـاراوە نییە مەگەر بەلای هەر نادان و گەمژەیەکەوە، بەڵام کەسانی زرنگ و هۆشیار، دەزانن ئەمـە سەرلێشێواندنێکی سادە.

## ✱ پۆشینی (الُفوطةِ) و (المرَقَّعاتِ):

نووسەر دەفەرمێت:

((لەڕاستیدا حەزم بە پۆشینی (الُفوطةِ) و (المرَقَّعاتِ) نییە لەچوار ڕووەوە:

یەکەمیان: ئەوانە لەپۆشاکی پێشینی چاك نین، بەڵکو پێشینی چاك لەبەر زەروورەت پینەی پۆشاکەکانیان دەکرد.

دووەم: خۆ واپیشاندانی هەژاری لەخۆ دەگرێت، کەچی مرۆڤ فەرمانی پێکراوە ئەو نیعمەتانەی خوا بەدەر بخات کە پێی بەخشیوە(٣٢٣).

سێ یەم: لەڕاستیدا پۆشینی ئەوانە بەدەرخستنی زوهدە، کەچی فەرمانی شاردنەوەی زوهدمان پێکراوە.

چوارەم: بەڕاستی خۆچواندنە بەوانەی لە شەریعەت لایانداوە، وەهەرکەسیش خۆی بەقەومێك بچوێنێت، یەکێکە لە ئەوان.

عن ابن عمر قال: قال رسولُ اللهِ _ صلى الله عليه وسلم _:

((مَن تشبَّهَ بقومٍ " فهُو منهُم))(٣٢٤) واتە: لە (ابن عمر)ەوە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ فەرمووی: ((هەرکەسێ خۆی بەقەومێك بچوێنێت، ئەوا لە گوناه و خێر بەرکەوتنندا وەکو یەکێك دەبێ لە ئەوان)).

لە (محمدِ)ی کوڕی (طاهرِ)ەوە دەڵێت: لە گەشتی دووەمدا چوومە (بغداد)، چوومە خزمەتی شێخ (أبامحمدٍ عبدَاللهِ)ی کوڕی (أحمدَ السُّكَّرِيِّ) بۆ ئەوەی زانستی فەرموودەی لێوە فێربم _ کە یەکێك بوو لە نکۆڵیکارانی ئەم تایەفە _ دەستم بەخوێندنەوە کرد. شێخ پێی

---

٣٢٣ _ رواه الترمذي (٢٨١٩)، وقال:

((حديث حسن))، وهو كما قال.

وله طرق أخرى عدّة، فانظر ((الشكر)) (ص٣٢ _ ٣٤) لابن أبي الدنيا والتعليق عليه.

٣٢٤ _ وهو حديث صحيح، خرجته بتوسع في أوائل كتاب ((الحِكَم الجديرة بالإذاعة)) (ص٨ _ ٩) لابن رجب الحنبلي، وهو تحت الطبع.

گوتم: ئەی شێخ ! تۆ ئەگەر لەم صوفیە نەفامانە بوایەی، گلەیم لێ نەدەکردی، تۆ پیاوێکی لە ئەهلی عیلم، بەفەرموودەی پێغەمبەری خوا _ صلی الله علیه وسلم _ کردەوە دەکەی و، کۆششی فێربوونی دەکەی. منیش گوتم: ئەی شێخ ! نکۆڵیی چ شتێکم لێدەکەی، با تەماشا بکەم، ئەگەر بنەڕەتێکی لە شەریعەتدا هەبێ، دەستی پێوە دەگرم، ئەگەر هیچ بنەڕەتێکیشی لە شەریعەتدا نەبوو، وازی لێدێنم. پێی گوتم: ئەم (الشوازِكُ)ە(٣٢٥) چی یە بە پۆشاکە (مرقَّعَة)کەتەوە ؟ منیش گوتم: ئەی شێخ ! ئەمە (أسماءُ)ی کچی (أبـي بكـرٍ)ە _ خوای لێ ڕازی بێت _ لە فەرموودەیەکدا هەواڵی پێداوین ((أَنَّ رسولَ اللهِ _ صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ _كَـانَ لَـهُ جُبَّـةٌ مَكْفُوفَـةُ الْجَيْـبِ ، وَالْكُمَّـيْنِ ، وَالْفَـرْجَيْنِ بِالـدِّيبَاجِ))(٣٢٦) واتـە: ((پێغەمبەری خوا _ صلی الله علیه وسلم _ جوبەیەکی هەبوو کە یەخەو سەردەستەکانی و، هەردوو لای بەرۆکەکانی بە دیبای ئاورێشم پەراوێزچین کرابوو))، لەڕاستیدا نکـۆڵیی لێکـرا چونکە ئەو (الشوازِكُ)انە لە ڕەگەزی پۆشاکەکە نەبوو و تەنها بۆ جوانی بەدەرخستن بوو، بەڵام ئاوڕێشمی دیباجی لەڕەگەزی پۆشاکەکە نیە، وە ئاورێشمی دیبـاج لـە جوبەکـە نییـە، بۆیـە بەمە بۆمان ساخ دەبێتەوە کە ئەوە بنەڕەتێکی لە شەریعەتدا هەیەو، هاوشێوەی شیاوە.

نووسەر دەفەرمێت:

(الـسُّكَرِيُّ) لـە نکـۆڵیی کردنەکەیـدا پێکـای و، فیقـە و تێگەشـتنی (ابـنِ طـاهرٍ) لـە وەڵامدانەوەیدا کەم بوو، چونکە هەموو جوبەویـەك یەخـەو، سەردەسـتەکانی و هـەردوو لای بەرۆکەکەی پەراوێزچین کراوەو نـەڕیت وایـە ئاوەهـا بپۆشـرێت، بۆیـە هـیچ ناوبانگیـەك لـە پۆشینیدا نییە، بەڵام بەکارهێنانی (الشوازِكُ)، ناوداری شێوەو، ناوداری بانگەشەکردنی زوهد کۆدەکاتەوە.

پێشتر هەواڵم پێدای ئەوانە دەچن پۆشاکی ساغ دەبڕن، بۆ ئەوەی بیکـەن بـە (الـشوازِكُ)، نـەك لەبـەر زەرورەت، بـەڵکو مەبەسـتیان ناوداریـە، چـونکە شـتێکی چـاك و جوانـە،

---

٣٢٥ _ الشوازِكُ: جۆرە کوتاڵێکە بە شێوەی شریتەو لە ئاورێشم دروستکراوە.

٣٢٦ _ رواه مسلم (رقم ٢٠٦٩) عنها.

وەمەبەستیشیان ناودەرکردنە بەزوهد، بۆیە (کراهە)تی جێگیر بووە، ئەوەبوو کۆمەڵێك لە شێخەکانی خۆشیان حەزیان پێ نەبوو، وەکو پێشتر ڕوونمان کردەوە.

لە (جعفر الحَذَّاء)ەوە دەڵێت: کاتێ صوفیەکان سوودەکانیان لە دڵاندا ون کرد، خۆیان بە ڕواڵەتی دەرەوەوەو، ڕازاندنیەوە خەریك کرد _ مەبەستی ئەوانەیە کە پۆشاکی ڕەنگاوڕەنگو (الفوطة) دەپۆشن _.

لە (أبي الحسن الحَنْظَليّ)وە، دەڵێت: (محمدُ)ی کوڕی (محمدِ)ی کوڕی (علي الكَتَّاني) تەماشایەکی ئەو کەسانەی کرد کە (المُرقَّعاتِ)یان پۆشیوەو، گوتی: براکانم! ئەگەر پۆشاکەکانتان سازیارو ڕێکی نیازو نێتان بێت، ئەوا بەڕاستی حەزتان بەوەیە خەڵکی پێتان بزانن و لێتان بەئاگابن، وە ئەگەر پێچەوانەی نیازو نێتان بێت، سوێند بەخوای کەعبە تیاچوون.

لە (نَصْر)ی کوڕی (أَبي نَصْر)ەوە دەڵێت: (أبو عبدِالله محمدُ)ی کوڕی (عبدِالخالقِ الدِّينَوَرِيُّ) بە کەسانێك لە هاوەڵانی خۆی گوت:

سەرسام مەبە بەم پۆشاکەی لەبەریاندا دیارە، چونکە ڕواڵەتی دەرەوەیان نەڕازاندەوە، تاوەکو دینداریان لە ناوەڕۆکدا گەندەڵ بوو.

## ✹ زۆر پینەکردنی پۆشاك:

نووسەر دەفەرمێت:

لە صوفیەکاندا کەسانێك هەن پۆشاکە (المُرَقَّعَة)ەکەیان زۆر پینەدەکەن تاوەکو چڕ دەبێ و لەسنوور دەچێتە دەرەوە.

وابڕیاریشیان داوە کە ئەم پۆشاکە (المُرَقَّعَة) بەدەستی شێخ نەبێ ناپۆشرێت، بۆ ڕەوابەخشین بەو کارەیان (إسناد)ێکی پێوەنداریشیان بۆ داناوە، هەرهەمووی درۆو مەحاڵە.

(محمدِ)ی کوڕی (طاهرٍ) لە ((کتێبەکەیدا)) دەڵێت: بەشێك سەبارەت بەسوننەتێتی پۆشینی جل و بەرگە کۆنەکە (الخِرقة) بەدەستی شێخ.

ئەمەی بەسوننەت داناوەو، فەرموودەکەی (أُمِّ خالدٍ)ی کردوّتە بەڵگە: أنَّ النبيّ _ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ _ أُتِيَ بِثِيَابٍ فِيهَا خَمِيصَةٌ سَوْدَاءُ ، فَقَالَ: ((مَنْ تَرَوْنَ أَكْسُو هَذِهِ؟)) فَسكتَ القَوْمُ ، فَقَالَ رسول اللهِ _ صلى الله عليه وسلم _: ((ائْتُونِي بِأُمِّ خَالِدٍ)) ، قالَ: فَأُتِيَ بِي، فَأَلْبَسَنيهَا بِيَدِهِ ، وَقَالَ: ((أَبْلِي وَأَخْلِقِي))(٣٢٧) واتە: پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم_ پۆشاکی بۆ هێنراو (خَمِيصَةٌ)یەکی ڕەشی تێدا بوو، فەرمووی: ((مەزەندەی چ کەسێك دەکەن ئەمەی لەبەر بکەم ؟)) خەڵکەکە بێدەنگ بوون، پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ فەرمووی: (((أُمِّ خَالِدٍ)م بۆ بێنن)). فەرمووی: هێنامیان، ئەوەبوو پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ بەدەستەکانی خۆی پۆشاکەکەی لەبەر کردم و، فەرمووی: ((تەمەن درێژ بیت تا ئەمەت لەبەردا کۆن و شڕ دەبێ)).

نووسەر دەفەرمێت:

لەڕاستیدا پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ بەدەستی خۆی پۆشاکەکەی لەبەرکرد چونکە کچێکی منداڵ بوو، بابی کچەکە (خالدَ)ی کوڕی (سعیدِ)ی کوڕی (ابنِ

---

٣٢٧ _ رواه البخاري (٣٠٧١).

الخمیصة: پۆشاکێکی ڕەش یاخود سوورەو وێنەی چیاو شاخ و شتی تری تێدایە، بڕوانە: لسان العرب، وەرگێڕ.

العاصِ) بوو، دایکیشی (هُمَیْنة)ی(٣٢٨) کچی (خَلَف)ی بوو، بۆ (الحبشةِ) کۆچیان کردو، لەوێ (أُمِّ خَالِدٍ)یان بوو، پاشان گەڕانەوە، پێغەمبەری خواش _ صلی الله علیه وسلم _ ڕێزی گرت چونکە منداڵ بوو، هەرچەند شتەکە ئاوەها ڕێکەوت بوو، بەڵام ئەمە بەسوننەت نابێ ! وە نەرێتی پێغەمبەری خوا _ صلی الله علیه وسلم _ ئەوەنەبوو بەدەستی خۆی جل بۆ خەڵکی بپۆشێ، وە هیچ کەسێك لە هاوەڵان و، (تابعین)یش ئاوەهایان نەکردووە.

پاشان بەلای صوفیەکانەوە سوننەت نییە منداڵەکان بپۆشرێن بەبێ گەورەکان، وە سوننەتیش نییە جلە کۆنەکە (الخِرقة) ڕەش بێ، بەڵکو دەبێ (مَرَقَّعَة)بێ یاخود (فوطَةً)) !!

دەی باشتر وابوو پۆشینی جلی کۆنی (الخِرقة) ڕەشیان بکردایە بەسوننەت، وەکو ئەوەی لە فەرموودەکەی (أُمِّ خَالِدٍ)دا(٣٢٩) هاتووە.

(محمدٍ)ی کوڕی (طاهرٍ) لە ((کتێبەکەیدا)) دەڵێت: بەشێك دەربارەی سوننەتێتی مەرج دانانی شێخ بۆ مورید کەوا دەبێ (المُرَقَّعَة) بپۆشێت.

فەرموودەکەی (عُبادَة)ی کردوتە بەڵگە کە فەرموویەتی: ((بَایَعْنَا رَسُول الله - صلی الله علیه وسلم - عَلَى السَّمْعِ والطَّاعَةِ في العُسْرِ واليُسْرِ))(٣٣٠) واتە: ((پێغەمبەری خوا _ صلی الله علیه وسلم _ پەیمانی لە گەڵدا بەستین لەسەر گوێدێری و گوێڕایەڵی کردن لە کاتەکانی تەنگانەو خۆشی و گوشادیشدا)).

---

٣٢٨ _ راجع ((تجرید أسماء الصحابة)) (٢ / ٣٠٩) للذهبي.

٣٢٩ _ (السخاوي) لە (المقاصد الحسنة)دا (رقم ٨٥٢) سەبارەت بە جلە کۆنی (الخِرقة) صوفیەکان دەڵێت: ((ابن دِحْیة وابن الصلاح دەڵێن): ئەمە شتێکی پووچە. (ابن حجر)یش دەڵێت: لە ڕێگەکانیدا شتێك نی یە جێگیر بوبێت، لە هیچ فەرموودەیەکی (صحیح) یاخود (حسن) یاخود (ضعیف)یشدا نەهاتووە کەوا پێغەمبەری خوا _ صلی الله علیه وسلم _ لەسەر ئەو شێوەیەی کە لەنێوان صوفیەکاندا باوە _ جلی کۆنی (الخِرقة) بۆ یەکێك لە هاوەڵانی بپۆشێت، وە فەرمانی بەهیچ یەکێك لە هاوەڵانی خۆی نەکردووە ئەوە بپۆشن)).

٣٣٠ _ رواه البخاري (١٣ / ١٦٧)، ومسلم (١٧٠٩).

نووسەر دەفەرمێت:

بڕوانە ئەم فیقهـ و تێگەشتنە وردە ! باشە مەرجەکەی شێخ بۆ مورید لەچ ئاستێکی مەرجدانانەکەی پێغەمبەری خوادایە _ صلى الله عليه وسلم _ کە (واجب)ێتی گوێڕایەڵی و گوێڕایلێکردنی داناوە سەبارەت بەپەیمان بەستنی ئیسلامی پێویست(٣٣١).

بەڵام هەستنایان بەپۆشینی جلی ڕەنگاوڕەنگ، ئەگەر شین بێت، ئەوا چاکەو پایەبەرزی سپیان لە دەست دەدات، ئەگەر (الفُوطة)ش بێت، ئەوە پۆشاکی ناودارییەو، ناودارییەکەشی لە ناوداری شین زیاترە، ئەگەر (المُرَقَّعَة)ش بێت، ناودارییەکەی زۆر زیاترە.

شەرع فەرمانی بەپۆشینی پۆشاکی سپی کردووەو، پۆشینی پۆشاکی ناوداری قەدەغە کردووە.

سەبارەت بەپۆشینی پۆشاکی سپی:

عن ابن عباسٍ _ رضي الله عنهُما _ قال: قال رسولُ اللهِ _ صلى الله عليه وسلم _: ((الْبَسوا مِن ثيابكُم البِيضَ، فإنها مِن خيرِ ثيابكُم، وكَفِّنوا فيها مَوْتاكم))(٣٣٢) واتە: لە (ابن عباس)ەوە _ خوا لە خۆی وبابیشی ڕازی بێت _ فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ فەرمووی:

((سپی پۆشاکەکانتان بپۆشن، چونکە یەکێکە لە خێردارترین پۆشاکەکانتان و، کفنی مردووەکانیشتانی تێدا بکەن)).

(محمدِ)ی کوڕی (طاهرِ) لە ((کتێبەکەیدا)) دەڵێت: بەشێك سەبارەت بە سوننەتێتی پۆشینی جل وبەرگی ڕەنگاوڕەنگ.

---

٣٣١ _ هاوشێوەی ئەمە بەتەواوی _ لەگەڵ جیاوازبوون لە شێوەو مانادا _ کۆمەڵە ئیسلامیەکان لەم چەرخەدا ئەنجامی دەدەن، سەبارەت بەوەرگرتنی پەیمان و نیشانەو بەو هاوشێوانە، کە بەدڵنیایی شتێکی پووچە.

٣٣٢ _ أخرجه أبوداود (٢ / ١٧٦)، والترمذي (٩٩٤)، وابن ماجة (٣٥٦٦)، وأحمد (٣٤٢٦). وسنده صحيح.

ئەم فەرموودانەشی کردۆتە بەڵگە:

أنَّ النبـيّ _ صلواتُ الله عليه وسلامُه _ لبس حُلَّةً حمراءَ(٣٣٣) واتە: پێغەمبەری خـوا _ صلى الله عليه وسلم _ قاتێکی سووری پۆشی.

أنَّه دخلَ يومَ الفتحِ، وعليهِ عمامةٌ سـوداء(٣٣٤) واتە: پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليـه وسلم _ کە چووە مەککەوە لەڕۆژی ڕزگارکردنیدا، مێزەرێکی ڕەشی بەسەرەوە بوو.

نووسەر دەفەرمێت:

نکۆڵیی ناکرێت کە پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ ئەمەی پۆشیبێ، نکـۆڵیی لەوەش ناکرێ کـە پۆشـینی ئـەم جـۆرە پۆشـاکانە شـیاو نـەبێ، وقـد رُوِيَ أنَّـه كـانَ يعجِبُـهُ الحِبَرَة(٣٣٥) واتە: (ڕیوایە)ت کراوە کەوا پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليـه وسـلم _ حـەزی بەپۆشینی (الحِبَرَة) بوو، لەڕاستیدا سوننەت ئەمەیـە کـە فـەرمانی پێکـراوەو دەبـێ مرۆڤـ لەسـەری بەردەوام بێـت، ئـەوان ڕەش و سووریـشیان دەپۆشـی، بـەڵام (فوطَـةً) و (مَرَقَّعَـة) ؛ پۆشاکی ناوبانگین.

---

٣٣٣ _ رواه البخاري (٥٨٤٨) عن البراء.

وفي الباب عدة أحاديث.

٣٣٤ _ رواه مسلم (١٣٥٨) عن جابر.

٣٣٥ _ رواه البخاري (٥٨١٢)، ومسلم (٢٠٧٩) " عن أنس.

تنبيه:

تصدير المـصنف _ رحمـه الله _ للحـديث بـصيغة التمـريض لـيس دقيقـاً، فالحـديث صـحيح " إلا إذا أراد الإختـصار " كما يقول بعض أهل العلم.

الحِبَـرَة: پۆشاکێکی میللداری یەمەنی بوو لە لۆکە یاخود کـەتان دروسـت دەکـرا، بڕوانـە: لـسان العـرب، ومرگێڕ.

## ✸ قەدەغەکردنی پۆشاکی ناوداری و کەراهەتبوونی:

سەبارەت بەپۆشاکی ناوداری و کەراهەتبوونی، فعنْ أبي ذرّ عن النبيّ _ صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ _ أنّه قال: ((مَنْ لَبِسَ ثَوْبَ شُهْرَةٍ " أعرضَ اللهُ عنهُ حتى يضَعَهُ))(٣٣٦) واتە: لە (أبي ذرّ)ەوە لە پێغەمبەری خواوە _ صلى الله عليه وسلم _ فەرموویەتی: ((هەرکەسێ پۆشاکێك بپۆشێت مەبەستی بەوە ناوبانگ دەرکردن بێ؛ خوای تعالى تەماشای ناکات بەتەماشاکردنی ڕەحمەت وبەزەیی تاوەکو دایدەکەنێت)).

وعن ابن عمر قال: قال رسولُ اللهِ _ صلى الله عليه وسلم _:

((مَنْ لَبِسَ ثَوْبَ شُهْرَةٍ " ألبَسَهُ الله ثوبَ المذلّةِ يومَ القيامةِ))(٣٣٧) واتە: لە (ابن عمر)ەوە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ فەرمووی: ((هەرکەسێ پۆشاکێك بپۆشێت و مەبەستی بەوە ناوبانگ دەرکردن بێ، خوای تعالى لە ڕۆژی قیامەتدا پۆشاکی سووکی و ڕیسوای لەبەر دەکات)).

نووسەر دەفەرمێت:

بۆیان باسکردوین کەوا (ابن عمر) _ خوا لە خۆی و باییشی ڕازی بێت _ پۆشاکێکی ناشیرینی لەبەر کوڕەکەیدا بینی، ئەوەبوو فەرمووی: کوڕم ئەمە مەپۆشە، ئەمە پۆشاکی ناوبانگ دەرکردنە.

---

٣٣٦ _ رواه ابن ماجة (١٢٥٨ _ زوائده).

وحسنه البوصيري.

قلت: وليس كما قال، ففي الإسناد ضعف، لكنه يتقوى بشواهده، فانظر ((مجمع الزوائد)) (٥ / ١٣٥) للهيثمي.

ثم رأيت أحمد في ((الزهد)) (٢ / ٧٩) يروي نحوه عن أبي ذرّ موقوفاً، وفي سنده ضعف أيضاً.

ويشهد له أيضاً ما بعده.

٣٣٧ _ رواه أحمد (٥٦٦٤)، وأبوداود (٤٠٢٩)، وابن ماجة (٣٦٠٦).

وفي سنده ضعف، لكنه يتقوى بما قبله.

# ✸ پۆشینی خوری:

نووسەر دەفەرمێت:

کەسانێك لە صوفیەکان خوری دەپۆشن و، بەهانەش دەێننەوە کەوا پێغەمبەری خوا _ صلی الله علیه وسلم _ خوری پۆشیوەو، بەوەش کە سەبارەت بە فەزڵ و چاکێتی پۆشینی خوری هاتووە.

أما لبسُ رسولِ اللهِ _ صلی الله علیه وسلم _ الصوفَ(٣٣٨) واتە: پێغەمبەری خوا _ صلی الله علیه وسلم _ خوری پۆشیوە، بەڵام پێغەمبەری خوا _ صلی الله علیه وسلم _ لە هەندێ کاتدا دەیپۆشی و، پۆشینیشی بەلای عەرەبەوە هیچ ناوبانگیەکی تێدا نەبوو.

وە ئەوەی سەبارەت بەفەزڵ و چاکێتی پۆشینی خوری گێڕدراوەتەوە، (موضوع)ەو هیچ شتێکی جێگیر نەبووە.

کەسی پۆشەری خوریش لەدوو باروحاڵەت بەدەر نییە:

یا ڕاهاتووە لەسەر پۆشینی خوری و ئەو پۆشاکە ئەستورو زبرانەی لەگەڵ خوریدا چوون یەکن، لێرەدا ئەوە بۆ ئەو کەسە (مکروە) نابێ، چونکە بەوە ناوبانگ نابێ.

یاخود کەسێکی خۆشگوزەرانەو پێی ڕانەهاتووە، بۆیە پێویستە ئەم کەسە نەیپۆشێت لە دوو ڕۆوە:

یەکەمیان: شتێکی بەسەر نەفسی خۆیدا سەپاندووە کە توانای بەرگەکرتنی نییە، بۆیە ئەمەی بۆ شیاو نیە.

دووەم: بەم پۆشینەی نێوان دوو شت کۆدەکاتەوە کە بریتین لە ناوبانگی و بەدەرخستنی زوهد.

---

٣٣٨ _ رواه البخاري (٥٧٩٩)، ومسلم (٢٧٤) (٧٩) " عن المغيرة.

ويوّب له البخاري: (باب: لبس جبة الصُّوف في الغزو).

لە (خالد)ی کوڕی (شَوْذَب)ەوە دەڵێت: (الحَسَن)م بینی، کاتێ (فَرْقَدٌ) هاتە دیدەنی، ئەوەبوو (الحَسَن) پۆشاکەکەی گرت و، بۆ لای خۆی ڕایکێشاو، گوتی: ئەی (فُرَیْقِدُ) ! ئەی کوڕەکەی دایکی (فُرَیْقِدُ) ! چاکێتی لەم پۆشاکەدا نییە، لەڕاستیدا چاکێتی ئەوەیە کە لە دڵدا دڵدا جێگیر دەبێ و، بەکردەوەش پشت ڕاستی دەکاتەوە.

پیاوێك لەوانەی خوریان دەپۆشی چووە دیدەنی (الحَسَن)، جوبەیەکی خوری و، عەبایەکی خوری پۆشیبوو، وە مێزەرێکی خوریشی بەسەرەوەبوو، ئەوەبوو دانیشت و، چاوەکانی بەرەو زەوی دانواندبوو، سەری بەرز نەدەکردەوە، وەکو ئەوەی (الحَسَن) سەری سوڕ بمێنێت بەرامبەری، بۆیە (الحَسَن) گوتی:

کەسانێك خۆبەزلزانینیان خستۆتە سنگیانەوە، سوێند بەخوا بەم خوری پۆشینە ئاینەکەیان ناشیرین کردووە.

(ابنُ عقیلٍ) دەڵێت: ئەمە گوفتاری پیاوێکە خەڵکی ناسیبێ و، پۆشاك فریوی نەدابێ، کەسانێکم لەمانە بینیوە جوبەیەکی خوری دەپۆشێ، ئەگەر کەسێك پێی بڵێت: ئەی (أبا فلانٍ) ! یەکسەر لەخۆی و کەسانی پەست و نیگەرانی دەوروبەریەوە حەزنەکردن و نکۆڵیی کردن بەدەردەکەوێت، ئیتر دەزانرێت کەوا خوری بەلای ئەمانەوە کارێکی ئەوتۆی کردووە کە دیبای ئاورێشم بەلای خەڵکی پەست و نیگەرانەکەوە نەیکردووە.

لە (أحمدَ)ی کوڕی (عُمر)ی کوڕی (یونُس)ەوە دڵێت: (الثوريُّ) پیاوێکی صوفی بەدیکردو، پێی گوت: ئەم پۆشاکەت بیدعەیە(٣٣٩).

---

٣٣٩ _ ئەمە ڕاگەیاندنێکی ئاشکرایە لەم پێشەوا پێشینە چاکەوە کەوا پۆشاك شتێکی گرنگە لەژیانی موسڵماناندا، وە سوننەت فەرامۆشی نەکردوەو وازی لێ نەهێناوە بەبێ ڕوونکردنەوە.

بۆیە هەرکەس _ دوای ئەمە _ بانگەشەی ئەوە بکات کە موسڵمانان پۆشاکێکی زانراویان نی یە، ئەوە لە ڕاستی لایداوە.

بۆ زانینی وردەکاری زیاتر سەبارەت بەم مەسەلەیە بگەڕێرەوە بۆ نامیلکەکەم ((تبصیر الناس بأحکام اللباس)).

لە (الحسنِ)ی کوڕی (الربیع)ەوە دەڵێت: گوێبیستی (عبدَ اللهِ)ی کوڕی (المبارکِ) بووم بەپیاوێکی دەگوت کە پۆشاکێکی خوری ناوبانگیی پۆشیبوو: حەزم بەمە نییە، حەزم بەمە نییە.

لە (یزیدَ السقّا)وە هاوڕێی (محمد)ی کوڕی (إدریس الأنباري)، دەڵێت: لاوێکم بینی پۆشاکێکی (مُسوحٌ)ی(٣٤٠) پۆشیبوو. دەڵێت: پێم گوت: چ کەسێك لە زانایان ئەمەیان پۆشیووە ؟ چ کەسێك لە زانایان ئەمەیان کردووە ؟ لاوەکەش گوتی: (بِشرُ)ی کوڕی (الحارث) بینیمی، بەڵام نکۆڵیی لێ نەکردم. گوتی: چووم بۆ دیدەنی (بِشرُ)و، پێم گوت: ئەی (أبانصر)! فلان کەسم بینی جوبەیەکی (مُسوحٌ)ی پۆشیبوو، نکۆڵیم لێکرد، ئەویش گوتی: (أبونصر) بینیمی و، نکۆڵیی لێ نەکردم. گوتی: (بِشرُ) پێی گوتم: ئەی (أباخالد) ڕاوێژی پێنەکردم ! ئەگەر پێم بگوتایە، پێی دەگوتم فلان پوشیویەتی و، فلان پۆشیویەتی.

(أبي سُلیمانَ الدَّاراني) بەپیاوێکی گوت کە خوری پۆشیبوو: تۆ ئامێری زاهیدانت بەدەرخستووە، ئەم خوریە چ بۆ کردووی ؟ پیاوەکە بێدەنگ بوو، پێی گوت: ڕواڵەتی دەرەوەت لۆکەیی دەبێ و، ناوەڕۆکت صوفی.

لە (النَّضرِ)ی کوڕی (شُمَیْلِ)ەوە دەڵێت: بەکەسێکی صۆفیم گوت: جوبە خوریەکەت دەفرۆشی ؟ ئەویش گوتی: ئەگەر ڕاوچی تۆڕەکەی بفرۆشێ، بەچ ڕاو بکات.

(أبوجعفرِ الطبريُّ) دەڵێت: ئەو کەسە بەهەڵەدا چووە کە پۆشاکی خوری و موو لە پۆشاکی نۆکەو کەتان پەسەندتر دەکات، لەگەڵ بوونی ڕێگەی گونجاو بۆ دەستکەوتنی بەحەڵالی، هەروەها ئەو کەسەش کە سەزەوات و نیسك دەخوات و، بەسەر نانی گەنمدا هەڵیدەبژێرێت، وە ئەو کەسەش کە لە خواردنی گۆشت وازی هێناوە لەترسی ئارەزووکردنی ژنان.

---

٣٤٠ _ مُسوحٌ: جل وبەرگێکە لە موو، بەتاکی دەگوترێت: (مِسْحٌ).

نووسەر دەفەرمێت:

پێشینی چـاك پۆشـاكی نێوەنـدیان دەپۆشـی، نەبـەرزو، نـە لەنێوەنـد كـەمتر، چـاكترین پۆشاكیان بۆ نوێژەكانی هەینی و، هەردوو جەژنەكەو، چاوپێكەوتنی برایان دەپۆشی، بەدەر لە چاكەكانیشیان بەلاوە ناشیرین نەبوو.

وقد أَخرجَ مسلمٌ في ((صحيحه))(٣٤١) من حديثِ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ _ رضيَ الله عنه _ أَنَّهُ رَأَى حُلَّةَ سِيَرَاءَ(٣٤٢) تُبَاعُ عِنْدَ بَابِ الْمَسْجِدِ، فَقَالَ: لِرَسُولَ اللَّهِ _ صلى الله عليه وسلم _ لَوْ اشْتَرَيْتَها لِيَوْمِ الْجُمُعَةِ وَلِلْوَفْدِ إِذَا قَدِمُوا عَلَيْكَ ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ _ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ _:

((إِنَّمَا يَلْبَسُ هَذِهِ مَنْ لَا خَلَاقَ لَهُ فِي الْآخِرَةِ)).

واتە: (عُمَرَ)ی كوڕی (الْخَطَّابِ) _ خوای لێ ڕازی بێت _ (حُلَّةَ سِيَرَاءَ)ێكی بـەدیكرد لـە بەر دەرگای مزگەوتدا خرابووە ڕوو بۆ فرۆشتن، ئەوەبوو بەپێغەمبەری خوای _ صلى الله عليه وسلم _ فەرموو: ئەگەر بتكڕیباو بـۆ نوێـژی هـەینی و بـۆ ئـەو شـاندانەی دێنـە خزمـەتت بتپۆشیبا ؟ پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ فەرمووی:

((لەڕاستیدا كەسێك ئەمە دەپۆشێ كە لەڕۆژی دوایدا بەشی نەبێ)).

پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ نكۆڵیی لەوە نـەكرد كـەوا ئـەو پۆشـاكە بـۆ خۆجوانكردنەوە بەكاربێت، بەڵكو نكۆڵیی لێ كرد چونكە لە ئاوریشم بوو.

نووسەر دەفەرمێت:

لە (أَبي العاليةِ)وە دەڵێت: ئەگەر موسڵمانان بچوایەنە دیدەنی یەكتر، خۆیان دەڕازانەوە.

لە (ابن عونٍ)ەوە لە (محمدٍ)ەوە دەڵێت: كۆچكردوان و پشتیوانان پۆشاكی بەرزو بەهاداریان دەپۆشی.

---

٣٤١ _ (رقم ٢٩٦٨).

وأصله في ((صحيح البخاري)) (١٠/ ٢٤٤).

٣٤٢ _ حُلَّةَ سِيَرَاءَ: پۆشاكێكە خەتی زەرد تێدایە، یاخود ئاوریشمی تێكەڵە.

(تميمٌ الدَّارِيُّ) قاتێكى بەهەزار كڕيبوو، بەڵام نوێژى پێوە دەكرد.

دەڵێم _ ابن الجوزي _ (ابنُ مسعودٍ) _ خواى لێ ڕازى بێت _ پۆشاكەكەى لە هەموو كەسان چاكتر بوو، لەهەموو كەسان بۆنى خۆشتر بوو، هەروەها (الحسنُ البصريُّ) چاكترين پۆشاكى دەپۆشى.

(مالكُ)ى كوڕى (أنسٍ) پۆشاكى (العَدَنيَّةَ)ى(٣٤٣) چاكى دەپۆشى.

پۆشاكى پێشەوا (أحمدَ)ى كوڕى (حنبلٍ) بەنزيكەى دينارێك دەكڕدرا.

تا ئاستێك زوهديان پەسەند دەكرد، پێدەچێ لە ماڵەكانى خۆياندا پۆشاكى كۆنيشيان پۆشيايە، بەڵام كە بچوايەنەتە دەرەوە، خۆيان دەڕازانەوەو، دور دەكەوتنەوە لە پۆشينى پۆشاكى خراپ و پۆشاكى بەرزى بەهادار كە پۆشينەكەى ناوبانگى تێدا بوو.

لە (عيسى)ى كوڕى (حازِم)ەوە دەڵێت: پۆشاكى (إبراهيمَ)ى كوڕى (أدهَمَ) كەتان، لۆكە، فەرو بوو، هيچ پۆشاكێكى خورى ياخود، ناوبانگيم لەبەريدا نەبينيوە.

لە (الربيع)ى كوڕى (يونُس)ەوە دەڵێت: (أبوجعفرِ المنصورُ) دەڵێت: ڕووتبوونەوەى لەڕادەبەدەر لە پۆشاكى ناوزڕێن چاكترە.

---

٣٤٣ _ پۆشاكى (العَدَنيَّةَ): جۆرە پۆشاكێكى چاك بوو لە نەيسابور دروست دەكرا، بڕوانە: المرتضى الزبيدي، تاج العروس من جواهر القاموس. وەرگێڕ.

هەروەها گوتراوە جۆرە پۆشاكێكە لە (عَدن) لە يەمەن دروست دەكرا، بڕوانە: ابن سيدة، المخصص، وەرگێڕ.

# ✵ ئەو پۆشاكەی زوهد بەدەردەخات:

نووسەر دەفەرمێت:

بزانە ئەو پۆشاكەی خاوەنەكەی عەیبدار دەكات، ئەوەیە كە بەدەرخستنی زوهدو، بەدەرخستنی هەژاری لەخۆ دەگرێت، وەكو ئەوەی زمانێكی سكاڵاكار بێ بەرامبەر بەخوای _ عزوجلَّ _، هەروەها هۆكارێكە بۆ ئەوەی خاوەنەكەی بەسووك تەماشا بكرێت.

هەموو ئەمانە (مكروه)ەو قەدەغەی لێكراوە.

عن مالِك بن نَضْلَةَ قالَ: أَتَيْتُ رَسُولَ اللهِ _ صلى الله عليه وسلم _ وَأَنا قَشِفُ الْهَيْئَةِ ، فَقَالَ:

((هَلْ لَكَ مَالٌ ؟)).

قُلْتُ: نَعَمْ.

قَالَ: ((مِنْ أَيِّ الْمَالِ ؟)).

قُلْتُ: مِنْ كُلِّ الْمَالِ قد آتاني الله عزَّوجلَّ: الإِبِلِ، وَالْخَيْلِ، وَالرَّقِيقِ، وَالْغَنَمِ.

قَالَ: ((فَإِذَا أَتَاكَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ مَالا، فَلْيُرَ عَلَيْكَ))(٣٤٤).

---

٣٤٤ _ رواه أحمد (٣ / ٤٧٣)، والحاكم (٤ / ١٨١)، والطبراني في ((الكبير)) (١٩ / ٢٤١) " من طريق شعبة عن أبي إسحاق عن أبي الأحوص عن أبيه.

وهذا سند صحيح.

فرواية شعبة عن أبي إسحاق جليلة.

وتوبع أبوإسحاق:

أخرجه أحمد (٣ / ٤٧٣ _ ٤٧٤)، والطبراني في ((الكبير)) (١٩ / ٢٤٦) و ((الصغير)) (رقم ٤٨٩) " من طريق عبدالملك بن عمير عن أبي الأحوص به.

وله طرق أخرى في ((السنن))، وهي من طريق أبي إسحاق عن غير شعبة عنه.

واته: له (مالِك)ی کوڕی (نَضْلَةَ)ەوە فەرموویەتی: چوومە خزمـەتی پێغەمبـەری خـوا _ صلى الله عليه وسلم _ لە کاتێکدا کە پـەڕپوتی و جـل وبـەرگ شـڕۆڵی و گـوزەران خراپـی بەڕوخسارمەوە دیاربوو، پێی فەرمووم:

((ئایا ماڵ و سامانت هەیە ؟)).

گوتم: بەڵێ.

فەرمووی: ((لە چ جۆرە ماڵ و سامانێك ؟)).

گوتم: خوای تعالی لە هەموو جۆرە ماڵ و سامانێکی پێی بەخشیوم: لە وشترو، ئەسـپو، کۆیلەو، مەڕ.

ئەوەبوو فەرمووی: ((لەبەر ئەوەی خوای تعالی ماڵ وسامانی پێی بەخشیوی، بـا پێتـەوە دیار بێ)).

# ✱ چاك بوونی پۆشاك:

ئەگەر كەسێك بڵێت: چاك كردنی پۆشاك هەواو ئارەزووی نەفسەو، فەرمانمان پێكراوە ئاگاداری بین، هەروەها خۆڕازاندنەوەیە بۆ خەڵكی، كەچی فەرمانمان پێكراوە بەوەی كردەوەكانمان بۆ خوا بێت نەك بۆ خەڵك ؟!

وەڵامەكەی: هەموو ئەوەی نەفس ئارەزووی دەكات زەم ناكرێت، هەموو خۆڕازاندنەوەیەك بۆ خەڵكیش (مكروه) نابێ، لەڕاستیدا قەدەغەی ئەوە دەكرێت كە شەرع قەدەغەی كردبێ، یاخود بۆ ڕووپامای (رياء) بێ لە بواری دینەوە، مرۆڤ حەزی بەوەیە بەجوانی ببینرێت، ئەوە بەشی نەفسەو، لەم بارەیەوە لۆمەی ناكرێت، بۆیە پرچی دادەهێنێ و، لە ئاوێنەدا تەماشای خۆی دەكات و، مێزەرەكەی ڕێك دەكاتەوەو، بەری نەرمی جل وبەرگی زبر بەناودا ـ واتە دەیخاتە ڕووی پێستی ـ دەپۆشی و، ڕواڵەتی دەرەوەی جوانیشی بەدەرەوەدا.

ئەمانە هیچ شتێكی تێدا نییە (مكروه) بێ یا زەم بكرێت.

نووسەر دەفەرمێت:

ئەگەر گوترا: چ دەڵێن سەبارەت بەوەی كە (سَرِيّ السَّقَطِي) گوتویەتی: ئەگەر هەستم بەوە كرد مرۆڤێك دێتە ژوورەوە بۆ دیدەنیم، ئاوەها بەرپشم دەكەم ـ دەستی هێنا بەسەر ڕیشیدا وەكو ئەوەی بیەوێ ڕێكی كاتەوە لەبەر ئەو كەسەی دێتە ژوورەوە بۆ دیدەنیكردنی ـ بەڕاستی ئاوەها دەكەم كەچی لەوەش دەترسێم خوای تعالى بەئاگر سزام بدات !

وەڵامەكەی: لێرەدا (سَرِيّ) شتەكەی هەڵگرتۆتە سەر لایەنی ڕووپامایی لە ڕوانگەی دینەوە، وەكو بەدەرخستنی دڵكزی (التخشّع)و شتی دیكە لەبەرامبەر ئەو كەسەدا كە دێتە دیدەنی، بەڵام ئەگەر مەبەستی چاككردنی شێوەو ڕوخساری خۆی بێ، نەوەكو بەشێوازێكی ناشیرین ببینرێت، ئەمە زەم ناكرێت، بۆیە ئەگەر هەركەسێك باوەڕی وابێ ئەو كارەی زەمكراوە، ئەوە هەرگیز ڕووپامایی نەزانیوەو، لە زەمكراویش تێنەگەشتووە.

عَنْ ابْنِ مَسْعُودٍ عَنْ النبـيّ _ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ _ قَالَ:
((لا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ مَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ ذَرَّةٍ مِنْ كِبْرٍ))
فَقَالَ رَجُلٌ: إِنَّ أَحَدَنا يُحِبُّ أَنْ يَكُونَ ثَوْبُهُ حَسَنًا وَنَعْلُهُ حَسَنَة.
قَالَ: إِنَّ اللَّهَ جَمِيلٌ يُحِبُّ الْجَمَالَ ، الْكِبْرُ: بَطَرُ الْحَقِّ وَغَمْطُ النَّاسِ
انفردَ بهِ مسلمٌ(٣٤٥).

واتە: لە (ابْنِ مَسْعُودٍ)ەوە لە پێغەمبەری خواوە _ صلى الله عليه وسلم _ فەرموویەتی: ((ئـەو کەسـەی کـە بەئەنـدازەی کێـشی گـەردێك خۆبـەزلزانینی لـە دڵـدا بـێ ناچـێتە بەهەشتەوە))

پیاوێکیش فـەرمووی: هـەر یـەکێك لـە ئێمـە حـەزی بەوەیـە پۆشـاکەکەی چـاك بـێ و نەعلەکانی چاك بێ.

ئەوەبوو پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليـه وسـلم _ فـەرمووی: ((خـوا جوانـەو حـەزی بەجوانیە، خۆبەزلزانین بریتیە لە نکۆڵیی کردنی هەق و بەنزم و سووك تەماشکردنی خەڵك)).

وە مانای (کِبْرُ): واتە خۆبەزلزانینی ئەو کەسەی نکۆڵیی لە هەق دەکات.

وە (غَمَطَ): واتە: گاڵتەپێکردن و، بەسووك تەماشاکردن.

نووسەر دەفەرێت:

صوفیەکان کەسانێکیان تێدا بوو پۆشاکی بەرزو بەهاداریان دەپۆشی.

(أبوعبدِالله أحمدُ)ی کوڕی (عطاء) دەڵێت:

(أبوالعباسِ)ی کوڕی (عَطَاء) پۆشاکی بەرزو بـەهاداری لۆکـەو کـەتانی دەپۆشـی و، بـە تەزبیحی(٣٤٦)(لۆلۆ) (تسبیحات)ی دەکردو، پۆشاکی درێژیشی پەسەندتر دەکرد.

---

٣٤٥ _ برقم (٩١).

٣٤٦ _ ئەمە بیدعەیە، وەکو ئەوەی _ لەرووی فیقهی و فەرموودەیی و مێژوویەوە _ لێم کۆڵیوەتەوە لە کتێبەکەمدا: ((إحكام المباني في نقض وصول التهاني))، وهو تحت الطبع في مكتبة المعارف _ الرياض.

دەڵێم _ ابن الجوزي _ ئەوەی کە ئەو پیاوە پۆشیویەتی وەکو پۆشاکی (الْمُرَقَّعات)ە لە ڕووی ناوبانگیەوە، بۆیە پۆشاکی ئەهلی خێر دەبێ نێوەند بێ، تەماشاکە شەیتان چۆن یاری بەم کەسانە دەکات لە دوولاوە کە پێك ناگەن.

نووسەر دەفەرمێت:

لە صوفیەکاندا کەسانێك هەبوون ئەگەر پۆشاکێکی بپۆشیایە، هەندێکی کون دەکرد، وە پێدەچێ پۆشاکی بەهاداریشی خراپ کردایە.

لە (عیسی)ی کوڕی (عليّ الوزير)ەوە، دەڵێت: ڕۆژێك (ابنُ مجاهدٍ) لای بابم بوو، لە دەرگا درا، بەبابم گوترا: (الشِّبْليُّ)یە. گوتی: با بێتە ژوورەوە. ئەوەبوو (ابنُ مجاهدٍ) گوتی: ئا ئێستا لە پێش دەستی تۆدا بێدەنگی دەکەم. نەریتی (الشِّبْليُّ) وابوو کە ئەگەر پۆشاکێکی بپۆشیایە جێگەیەکی کون دەکرد، کە دانیشت، (ابنُ مجاهدٍ) پێی گوت: ئەی (أبابكر) ! لە کوێی زانستدا بینیوتە ئەو شتە خراپ بکرێت کە سوودی لێ وەردەگیرێت ؟ (الشِّبْليُّ)یش پێی گوت: لە کوێی زانستدا ؟ گوێ لەم ئایەتە بگرە: ﴿فَطَفِقَ مَسْحًا بِالسُّوقِ وَالأَعْنَاقِ﴾ ﴿ص: ٣٣﴾؟

گوتی: (ابنُ مجاهدٍ) بێدەنگ بوو. بابیشم پێی گوت: ویستت بێدەنگی بکەی بەڵام بێدەنگی کردی. پاشان (الشِّبْليُّ) بە (ابنُ مجاهدٍ)ی گوت: خەڵکی کوڕان تۆ خوێنەری ئەم کاتەی، باشە لە چ ئایەتێکی قورئاندایە کەوا خۆشەویست سزای خۆشەویستەکەی نادات ؟ گوتی: (ابنُ مجاهدٍ) بێدەنگ بوو، بابم پێی گوت: بەڵگەکەت بڵێ ئەی (أبابكر) ! ئەوەبوو گوتی: خوای تعالی دەفەرمێت: ﴿ وَقَالَتِ الْيَهُودُ وَالنَّصَارَى: نَحْنُ أَبْنَاءُ اللَّهِ وَأَحِبَّاؤُهُ قُلْ فَلِمَ يُعَذِّبُكُمْ بِذُنُوبِكُمْ ﴾﴿ المائدة: ١٨ ﴾ واتە: ﴿ وَقَالَتِ الْيَهُودُ وَالنَّصَارَى ﴾ جوولەکەو گاورەکان دەیان وت ﴿ نَحْنُ أَبْنَاءُ اللَّهِ وَأَحِبَّاؤُهُ ﴾ ئێمە کوڕان و خۆشەویستانی خواین ﴿ قُلْ فَلِمَ يُعَذِّبُكُمْ

بِذُنُوبِكُمْ ﴾ بلّیٚ دەی بۆچی سزاتان دەدات بەهۆی گوناهە کانتانەوە(٣٤٧). (ابنُ مجاهدٍ) گـوتی: وەکو ئەوەی هەرگیز نەمبیستبیٚ !

دەلّیٚم _ ابن الجوزي _ ئەمە باسیٚکە من بەگومانم سەبارەت بە ڕاسـتی و دروسـتیەکەی، چونکە (الحسنَ)ی کوڕی (غالـب)(٣٤٨) باوەڕی پیٚ نەدەکرا: لە (أَبـي بكـرِ الخطيـبِ)ەوە(٣٤٩)، گوویـەتی: (الحـسنَ)ی کـوڕی (غالـب) بانگەشـەی شـتانیٚکی دەکـرد کەچـی پاشـان درۆ و هەلّبەستنیمان بۆ دەرکەوت.

ئەگەر باسەکە ڕاست بیٚ، بەڕاستی کەم تیٚگەشـتنی (الـشِّبْلِيُّ) بـەدەردەخات کـاتیٚ ئـەو ئایەتـەی بەبەلّگـە دانـاوە، وە کـەم تیٚگەشـتنی (ابـنُ مجاهـدٍ)یـش بـەدەردەخات کـە لـە وەلاّمدانەوەیدا بیٚدەنگی نواندوە، کاتیٚ ئـەم ئایەتـەی بەبەلّگـە دانـا ﴿ فَطَفِقَ مَسْحًا بِالسُّوقِ وَالأعْنَاقِ ﴾ ؛ چونکە شیاو نییە ئەنجامدانی کاری خراپ بدریٚتە پالّ پیٚغەمبەریٚکی پاریٚزراو لـە هەلّەو تاوان (معصوم).

ڕاڤەکارانی(٣٥٠) قورئانیش بۆچونی جیاوازیان هـەبووە سـەبارەت بـەمانای ئـەم ئایەتـە، نموەبوو کەسـانیٚکیان دەیگـوت: دەسـتی هیٚنـا بەسـەر دەسـت و قـاچ و مـل و یـالّی ئـەو ئەسپانەداو، گوتی: تۆ لە پیٚناوی خوادای.

بۆیە ئەمە ئیصلاح و چاك کردنە.

کەسانیٚکیشیان گوتوویانە: سەری بڕین.

وە سەربڕینی ئەسپ و خواردنی گۆشتەکەی شیاوە، بۆیە شتیٚکی نـەکردووە تـاوانی تیٚـدا بیٚ.

---

٣٤٧ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

٣٤٨ _ یەکیٚکە لەو کەسانەی دەیگیٚڕنەوە.

٣٤٩ _ في ((تاريخ بغداد)) (٧ / ٤٠٠).

٣٥٠ _ انظر ((زاد المسير)) (٧ / ١٣٠) للمصنف.

بەڵام خراپ کردن و کونکردنی پۆشاکی دروست، نەك لە پێناو مەبەستێکی ڕاست و دروستدا، بەڕاستی شیاو نییە، دەشێ لە شەریعەتی (سلیمان) پێغەمبەردا شیاوێتی ئەوەی تێدا بێ کە ئەنجامی داو، لە شەریعەتی خۆماندا نەبێ.

(أبو عبدِالله أحمدُ)ی کوڕی (عطاء) دەڵێت: ڕێباوەڕی (أبـي علـيّ الرُّوذْباري) ئەوەبوو سەرقۆڵەکانی کون دەکردو، کراسەکەشی هەڵدەتەقان.

گوتی: پۆشاکی بەنرخ و بەهاداری دەکرد بەدوو بەشەوە، بەنیوەیەکی سەرەوەی جەستەی خۆی دەپۆشی و، نیوەکەی تریشی دەکرد بە (الإزار)و نیوەی خوارەوەی جەستەی پێ دەپۆشی، تا ئەو ئاستەی ڕۆژێك چووە گەرماو، پۆشاکێکی لەبەردا بوو، ڕەفیقەکانی شتێکیان پێ نەبوو بیکەن بە (الإزار)و خوارەوەی جەستەیان داپۆشن، ئەوەبوو بەگوێرەی ژمارەیان پۆشاکەکەی خۆی پارچە پارچە کردو، ئەوانیش کردیانە (الإزار)و خوارەوەی جەستەیان پێ داپۆشی، پێشنیازیشی کرد کەوا ئەگەر چوونە دەرەوە پارچەکان بەخاوەن گەرماوەکە بەن.

(ابنُ عطاءٍ) گوتی: (أبوسعيدِ الكازَروني) پێی گوتم: ئەو ڕۆژە من لە گەڵیدا بووم و، ئەو پۆشاکەی کە پارچە پارچەی کرد بەنزیکەی سی دینار دەنرخێنرا.

لە (أبي الحسنِ البُوشَنْجي)وە دەڵێت: (قَبجَةٌ) واتە پۆڕێکم هەبوو بە سەد دیرهەم داواکرا، شەوێك دوو کەسی غەریب بوون بوون بەمیوانم، بەدایکم گوت: شتێکت هەیە بۆ میوانەکانم.

گوتی: نەخێر، جگە لەنان هیچی ترمان نییە، پۆڕەکەم سەربڕی و، بۆم بردن.

نووسەر _ بەڕەحمەتی خوا بێت _ دەفەرمێت:

لە توانایدا بوو قەرز بکات و، پاشان پۆڕەکە بفرۆشێت و، قەرزەکە بداتەوە، بەڕاستی کەمتەرخەمی نواندووە.

(أحمـدُ الغزَالـيُّ)(٣٥١) لـه (بغـداد) بـوو، جارێـك چـوو بـۆ (المُحَـوَّلِ)(٣٥٢)، گەشـتە ناعورێك(٣٥٣) دەنگێكی كزی لێوە دەبیسترا، بۆیە (طَیْلَسانَهُ)ەكەی(٣٥٤) فڕێ دایـە سـەری، ئەوەبوو ناعورەكە سوڕی خواردو، (طَیْلَسانَهُ)ەكەی دڕا.

نووسەر _ بەڕەحمەتی خوا بێت _ دەفەرمێت:

تەماشای ئەم نەفامی و خراپ بەكارهێنان و كەمتەرخەمی و دووربوون لە زانستەوە بكە، فإنَّهُ قد صحَّ عن رسول الله _ صلى الله عليه وسلم _ أنه نهى عـن إِضـاعةِ المـالِ(٣٥٥) واتـە: پێغەمبەری خـوا _ صـلى الله عليـه وسـلم _ لـە فەرموودەیـەكی (صـحیح)دا: قەدەغـەی فەوتاندنی ماڵ وسامانی كردووە.

ئەگەر پیاوێك دینارێكی ساغی لەت وكوت بكردایەو، بیبەخشیایە، بەلای فیقهزانەكانەوە بەكەسێكی كەمتەرخەم دادەنرا، ئەی ئەم بەفیڕۆدانە حەرامكراوە دەبێ چۆن بێ ؟ !

هاوتای ئەمە دڕاندنی پۆشاكیانە لە كاتی سۆزی بەتیندا وەكو ئەوەی دواتر باس دەكرێ _ إن شـاء الله _، پاشـان واڕادەگەیـەنن ئەمـە (حالـە)تێكـەو، دڵنیـابن هـیچ خێرێـك لـە (حالە)تێكەدا نییە كە دژیە شەرع بێ.

---

٣٥١ _ أحمدُ الغزاليُّ: برای (أبي حامد الغزَالي)یەو، ساڵی (٥٢٠ك) مردووە.

٣٥٢ _ المُحَوَّلِ: دێیەك بوو نزیكەی (فرسخ)ێك واتە (٥ — ٦) كیلۆمەتر لە (بغداد)ەوە دوور بوو. ((معجم یاقوت)) (٥ / ٦٦).

٣٥٣ _ ناعور: چەرخێكە ئاو سـەردەخات، خـودی ئاوەكـە ناعورەكـە سـوڕ دەدات و، دەنگیـشی لێـوە دەبیسترێت، بە(ناعور)یش ناونراوە لەبەر ئەو دەنگەی لێوەی دەبیسترێت لە كاتی سـوڕخواردنیدا، چـونكە لە زمانی عەرەبیدا دەگوترێت (نعر الرجل) واتە پیاوەكە هاواری كرد، هەروەها دەگوترێـت (أمـرأة نعـارة) واتە ژنێكی هاوارو قیژەكار، بڕوانە: أبومنصور الجواليقي، شرح أدب الكاتب، ج١، ص٢٨. وەرگێڕ.

٣٥٤ _ طَیْلَسانَهُ: پۆشاكێكە دەكرێتە شان و دەوری جەستە دەدات و، بەتایبـەت دەچـنرێت بـۆ پۆشـین و هیچ بڕین و دوورینەوەیەكی تێدا نی یە، بڕوانە: الخكيب البغدادي، الجامع لأخـلاق الـرواي وأدب الـسامع، ج٤، ص١٤٨، وەرگێڕ.

٣٥٥ - رواه البخاري (٢٤٠٨)، ومسلم (٥٩٣) " عن المغيرة.

ئایا پێت وایە کوێلەی نەفسی خۆیان بن ؟ یاخود فـەرمانیان پێکرابـێ بـەبیروڕای خۆیـان کاربکەن ؟ ئەگەر زانیبێتیان بەم کردەوانەیان سەرپێچی شەرع دەکەن و، بەڵام لە ئەنجامدنیدا هەر بەردەوام بوون، بەڕاستی کەللەڕەقیە، وە ئەگەر نەشزانن، سوێند بەخوا ئەوە نەفامیـەکی توندە.

## ✸ زێدەڕۆیی لە پۆشاك كورتكردنەوەدا :

نووسەر دەفەرمێت:

كەسانێك لەصوفیەكان لە پۆشاك كورتكردنەوەدا زێدەڕۆیی دەكەن، ئەمەش دیسان ناوبانگیە.

عن أبي سعيدٍ أنَّه سُئِلَ عن الإزارِ، فقالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ _ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ _ يَقُولُ:

((إِزَارُ الْمسلمِ إِلَى أَنْصَافِ السَاقَيْنِ، لَا جُنَاحَ _ أَو لا حَرَجَ _ عليهِ مَا بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْكَعْبَيْنِ، مَا كَانَ أَسْفَلَ مِنْ ذلكَ " فهو فِي النَّارِ))(٣٥٦).

واتە: سەبارەت بە (الإزار) لە (أبي سعيدِ)یان پرسی، ئەویش فەرمووی: گوێبیستی پێغەمبەری خوا بووم _ صلى الله عليه وسلم _ دەیفەرموو:

(((الإزار)ی موسڵمان تا نیوەی لاقەكانە، تاوانی نابێت، ئەگەر لە نێوان نیوەی لاقەكان و قاپەكاندا بن، ئەگەر لەوە خوارتر بوو، لە ئاگردایە)).

لە (معمرِ)ەوە دەڵێت: كراسەكەی (أيُّوبَ) كەمێك درێژی و واڵاكردنی پەراوێزی تێدا بوو، لەو بارەوە پێی گوترا: ئەویش فەرمووی: قەیناكا ناوبانگی ئەمڕۆ لە كورتكردنەوەدایە.

(إسحاقُ)ی كوڕی (إبراهیمَ)ی كوڕی (هانيءٍ) دەگێڕێتەوەو دەڵێت: ڕۆژێك چوومە ژوورەوە بۆ دیدەنی پێشەوا (أبي عبدالله أحمدَ)ی كوڕی (حنبل)و كراسێكم پۆشیبوو لەخوار ئەژنۆ و سەرەوەی لاقمدا بوو، ئەوەبوو فەرمووی: ئەمە چی یە ؟ وە نكوڵیی لێكردو، فەرمووی: ئەمە بەیەكجاری نابێت(٣٥٧).

---

٣٥٦ _ رواه مالك في ((الموطأ)) (٢ / ٩١٤)، وأحمد في ((مسنده)) (٣ / ٥) " عن أبي سعيد.

وسنده صحيح.

ورواه مختصراً: أبوداود (٤٠٩٣)، وابن ماجة (٣٥٧٣).

وفي الباب عن عدَّة من الصحابة.

٣٥٧ _ چونكە لە بنەڕەتدا سوننەت ئەوەیە بەبێ لە سنور دەرچوون یاخود كەمتەرخەمی بێ، زیادەڕەوی یاخود فەرامۆشكردن بێت.

## ✸ كەسانێك لە صوفیەكان پارچە پەڕۆیەك (خِرْقَةٌ) لەجێگەی مێزەر بۆ سەریان بەكاردێنن:

نووسەر دەفەرمێت:

صوفیەكان كەسی وایان تێدایە پارچەپەڕۆیەك (خِرْقَةً) لە جێگەی مێزەر بۆ سەری بەكاردەهێنێ، ئەمەش دیسان ناوبانگ دەركردنە، چونكە پێچەوانەی پۆشاكی ئەهلی وڵاتەكەیە(٣٥٨) وە هەموو شتێك ناوبانگیی تێدا بێ، (مكروه)ە.

(بِشْرُ)ی كوڕی (الحارثِ) دەڵێت: (ابنَ المبارَكِ) ڕۆژی هەینی چووە مزگەوتەوە، كڵاوێكی (قلنسوة) بەسەرەوەبوو، تەماشایەكی خەڵكەكەی كرد كڵاویان بەسەرەوە نەبوو، بۆیە كڵاوەكەی لەسەری كردەوەو، خستیە نێو قۆڵەكەیەوە.

---

٣٥٨ _ ئەمە مەرجێكی چاكە.

## ✸ یەك پۆشاكی:

نووسەر دەفەرمێت:

كەسانێكیان تێدا بوو جگە لە یەك پۆشاك هیچی تری نەبوو، وەكو زوهدێك لـە دونیـادا، ئەمە چاكە، بەڵام ئەگەر لە توانایدا بێ پۆشاكێكی دیكەی بۆ ڕۆژانـی هـەینی و جەژنـەكان هەبێ شیاوترو چاكترە.

عن عبدِاللهِ بنِ سلامٍ قالَ: خَطَبَنا رسولُ اللهِ _ صلى الله عليه وسلم _ في يومِ جمعةٍ، فقال: ((مَا عَلَى أَحَدِكُمْ لَوِ اشْتَرَى ثَوْبَيْنِ لِيَوْمِ جُمُعَتِهِ سِوَى ثَوْبِ مَهِنَتِهِ))(٣٥٩).

واتە: لە (عبدِاللهِ)ی كوڕی (سلامٍ)ەوە فەرموویەتی: پێغەمبەری خـوا _ صـلى الله عليـه وسلم _ لە ڕۆژی هەینیەكدا وتاری بۆ خوێندینەوەو فەرمووی:

((كەستان تاوانی نابێ ئەگەر دوو پۆشاك بۆ ڕۆژانی هـەینی بكڕێـت، جگـە لـە پۆشـاكی پیشەو كارەكەی)).

## ✸ باسی سەلێشێواندنەكانی ئیبلیس بەرامبەر بەصوفیەكان لە خۆراك و خواردنەوەیاندا:

نووسەر دەفەرمێت:

ئیبلیس لە سەرلێشێواندنەكانیدا بەرامبـەر بـە صـوفیە پێـشینەكان زێـدەڕۆیی كـردووە، فەرمانی كەمكردنەوەی خۆراك و، زبری و، سەختێتی و، كەمكردنـەوەی خواردنـەوەی ئـاوی ساردی پێكردن، بەڵام ئیبلیس كە بە پاشینانی صوفیەكان گەشت، لە مانـدوون حەوایـەوەو، خۆی بەسەرسامبوون بەزۆری خواردنیان و خۆشگوزەرانیانەوە خەریك كرد !!

---

٣٥٩ _ رواه أبوداود (١٠٧٨)، وابن ماجة (١٠٩٥).

وسنده صحيح.

وله شاهد عن عائشة.

## ✸ باسی چەمکێك لەوەی پێشینانیان ئەنجامیان داوە:

نووسەر _ بەرِەحمەتی خوا بێت _ دەفەرمێت:

کەسانێك لەم قەومە ڕۆژانێـك دەمایـەوە خـۆراکی نـەدەخوارد، تـا هێـزی لاواز دەبـوو، کەسانێکیشیان هەموو ڕۆژێ شتێکی زۆر کەمی دەخوارد کەوا جەستەی پێ هەڵنەدەستا.

لە (سهلِ)ی کوڕی (عبدِاللهِ)ەوە بۆیـان باسـکردوین کـەوا لـە سـەرەتای بەصـۆفی بونیـدا بەدیرهەمێك دۆشاوی خورمای دەکڕی و، بەدوو دیرهەمیش ڕۆنی دەکڕی و، بەدیرهەمێکیش ئاردی برنجی دەکڕی، تێکەڵیی دەکردن و، پاشان دەیکرد بە سێ سەدو شەصت تۆپەڵەوە، هەر شەوێك بەدانەیەکیان فتاری دەکرد.

(أبوحامدِ الغزالَي) سەبارەت بە (سهلٌ) دەڵێت: ماوەیەك بەگەڵای درەختی نـەبك دەژیـا، سێ ساڵیش هاڕاوەی کای دەخوارد، سێ ساڵیش بەسێ دیرهەم ژیانی گوزەراند.

لە (أبي جعفرِ الحدَّادِ)ەوە دەڵێت: ڕۆژێ (أبوترابِ) نزیکم بـۆوەو لـەو کاتـەدا مـن بەسـەر گۆمێك ئاوەوە بووم، کە شازدە ڕۆژبـوو هـیچ شـتێکم نـەخواردبوو، لـەو ماوەیـەدا ئاویـشم نەخواردبوو، پێی گوتم: ئالێرەدا بۆ دانیشتووی ؟ گوتم: مـن لـە نێـوان زانـین و دڵنیـایی دام (العلم واليقين)، وە چاوەڕێی سەرکەوتنی یەکێکیانم، تا لەگەڵیـدا بم ! ئـەوەبوو گـوتی: پلـەو پایەی خۆتت دەبێ.

لە (أبي عبدِاللهِ)ی کوڕی (زیدِ)ەوە دەڵێت: چل ساڵە خۆراکم بەنەفسی خۆم نەداوە مەگـەر ئەو کاتانەی کە خوای تعالى گۆشتی مردارەوەبووی بۆ حەڵاڵ کردبێ !!

لە (عیسی)ی کوڕی (آدم)ەوە دەڵێت: پیاوێك هاتە دیدەنی (أبي يزيدَ)، گوتی: دەمەوێ لە مزگەوتەکەت دانیشم کە تۆی تێدای. گوتی: تۆ بەرگەی ئەوە ناگری. گوتی: حەز دەکەم لـەو بارەوە بوارم بۆ بڕەخسێنی. ئەوەبوو مۆڵەتی دایە، پیاوەکە ڕۆژی دانیشت هیـچی نـەخواردو، ئارامی گرت، بۆ ڕۆژی دووەم، پێی گوت: مامۆسـتا ! پێویـستمان بەوەیـە کـە پێویـستمان پێیەتی. گوتی: ئەی لاو ! پێویـستمان بەخوایـە ! گـوتی: ئـەی مامۆسـتا ! خـۆراکم دەوێ. گوتی: ئەی لاو ! خۆراکمان گوێڕایەڵی و پەرستنی خوایە. گـوتی: ئـەی مامۆسـتا ! شـتێکم

دموێ جەستەم ڕاگرێت بۆ گوێڕایەڵی و پەرستنی خوای تعالی. گوتی: ئـەی لاو ! جەسـتەکان بەبێ خوای تعالی ڕاناوەستن !!

لە (إبراهیمَ الخوَّاصِ)وە دەڵێت: برایەکم کە هاوەڵێتی (أَباتراب)ی دەکـرد بـۆی باسـکردم، کەوا ڕۆژێك صـوفیەکی بـەدیکرد دەسـتی ڕاکێـشا بـۆ توێکڵـە کاڵـەکێك و، سـێ ڕۆژ بـوو بەبرسێتی مابۆوە، پێی گوت: تۆ چیتر بە کەڵکی تەصوف نایەیەت، بچۆ بـۆ بـازارو کاسـبی بکە، واتە بەبۆچونی ئەو نابێ دەست بۆ ئەوەش بەرێت.

لە (أَبي عليّ الرُّوذْبـاري)وە دەڵێت: ئەگەر صوفی پـاش پێـنج ڕۆژ گـوتی: برسـیمە، ئـەوا ناچاری بازاڕی بکەن و، فەرمان بدەن با کاسبی بکات.

لە (أَبي أَحمدَ الصغیرِ)ەوە دەڵێت: (أَبو عبدِاللهِ)ی کوڕی (خفیـفٍ) فەرمانی پێکردم هەموو شەوێك دە دەنك مێوژی بدەمێ بۆ ئەوەی فتاری پێ بکات، شـەوێك بـەزەیم پێـدا هاتـەوەو، پازدە دەنکم بۆ برد، ئەوەبوو تەماشای کردم و، گوتی: کێ فـەرمانی ئەمـەی پـێ کردیـت ؟ ئەوەبوو دە دەنکی خواردو، وازی لەوانی تر هێنا!

## ✱ وازهێنـان له گۆشت خواردن:

نووسەر دەفەرمێت:

قەومێکیان تێدا بوو گۆشتیان نەدەخوارد، تا ئەو ئاستەی کەسانێکیان تێدا بوو دەیگوت: بای دیرهەمێك گۆشت خواردن چل ڕۆژ دڵ ڕەق دەکات !

کەسانێکیشیان تێدا بوو وازی لە خواردنی هەموو خۆراکێکی پاك و چـاك هێنـابوو، ئـەو فەرموودەیەی دەکردە بەڵگە کە خاتوو (عائـشة) _ خـوای لـێ ڕازی بێـت _ دەیگێڕێتـەوەو دەفەرمێت: قالَ رسولُ اللهِ _ صلى الله عليه وسلم _: ((احْرِموا أَنفُسَكُم طيِّبَ الطَّعامِ، فإنَّما قويَ الشيطانُ أَنْ يجْريَ في العُروقِ بها))(٣٦٠).

واته: پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ فەرموویەتی:

((خواردنی خۆش و چاك لە خۆتان قەدەغە بکەن، لەڕاسـتێدا شـەیتان توانیویـەتی بـەنێو ڕەگەکاندا تێی پەڕێنێت)).

کەسانێکیشیان دەستی هەڵدەگرت لە خواردنەوەی ئاوی ڕوون و پاك.

کەسانێکیـشیان دەسـتی هەڵـدەگرت لـە خواردنـەوەی ئـاوی سـاردو، ئـاوی گـەرمی دەخواردەوە.

---

٣٦٠ _ رواه المصنف في ((الموضوعات)) (٣ / ٣٠)، ثم قال:

((هذا حديث موضوع على رسول الله _ صلى الله عليه و سلم _، والمتهم به بزيع. قال أحمد: أحاديثه مناكير، لا يتابعه عليها أحدٌ. قال الدارقطني: هو متروك)).

وانظر ((تنزيه الشريعة)) (٢ / ٢٤٠) لأبن عراق.

وسيُبَيِّن المصنف وضعَه بعدُ.

کەسانێکیشیان ئاوەکەی دەکردە نێو دەفرێکەوەو دەیخستە نێو کونێکەوە لە زەویدا، بۆیە گەرم دەبوو.

کەسانێکیشیان سزای نەفسی خۆی دەدا بەوەی ماوەیەك وازی لە ئاوخواردنەوە دەهێنا:

(أبي حامدِ الغَزَّاليُّ) لە (أبي يزيدَ)ەوە دەگێڕێتەوە کەوا گوتویەتی: بانگی نەفسی خۆمم کرد بۆ لای خوای _ عزَّوجلَّ _، بەڵام سواری هەوەس و ئارەزووی خۆی بوو، بۆیە بڕیارم دا یەك ساڵ ئاو نەخواتەوەو، ساڵێکیش چێژی نووستن نەکات، ئەوەبوو گوێڕایەڵبوونی پەروەردگاری بۆ بەجێهێنام !!

نووسەر دەفەرمێت:

(أبوطالبِ المکيُّ)(٣٦١) ڕێکخستنێکی تایبەتی دانابوو بۆ ئەم قەومە لە خۆراك خواردندا، ئەوەبوو دەیگوت: بەباشی دادەنێم مورید لەشەو ڕۆژێکدا لە دوو نان زیاتر بخوات.

دەڵێت: کەسانێك کاری لە خۆراکەکەی خۆی دەکردو، کەمی دەکردەوە، کەسانێکیشیان خۆراکەکەی بە بنکی لقی دارەخورما دەپێوا، وە لەبەر ئەوەی هەموو ڕۆژێك کەمێك وشك دەبێتەوە، بۆیە ئەندازەی خۆراکەکەشی بەگوێرەی ئەوە کەم دەبویەوە.

دەڵێت: کەسانێك کاری لە خۆراکەکەی دەکردو، سەرەتا هەموو ڕۆژێك دەیخواردو، پاشان پلە پلە سەردەکەوت و دوو ڕۆژ جارێك خۆراکی دەخوارد، پاشان سێ ڕۆژ جارێك و بەو جۆرە.

دەڵێت: برسێتی خوێنی دڵ کەم دەکاتەوەو، بەوەش سپی دەبێتەوەو، سپێتیەکەشی نورو ڕوناکیەتی، وە بەزو پیوەکەی دەتوێنێتەوەو، بەو توانەوەش نەرمونیان دەبێتەوە، نەرمونیانیەکەشی کلیلی (المکاشفةِ)یە(٣٦٢).

---

٣٦١ _ أبوطالبِ المکيُّ: دانەری کتێبی (قوت القلوب)ەو، ساڵی (٣٨٦ك) مردووە، ژیانامەی لە کتێبی (البداية والنهاية)دایە (١١ / ٣١٩).

خەڵکی (بغداد) لێی دورکەوتنەوەو بەئەهلی بیدعەیان دانا " وەکو ئەوەی لە کتێبی (تاریخ بغداد)دا (٨٩/٣) هاتووە.

٣٦٢ _ هەموو ئەمانەش بەهۆی سەرلێشێواندنەکانی شەیتان و، هەڵخەڵەتاندنەکانی ئیبلیسەوەیە.

نووسەر دەفەرمێت:

(أبوعبدالله محمد)ی کوڕی (علي التِّرمـذيُّ)(٣٦٣) کتێبێکـی بـۆ دانـان بـەناوی (رياضـة النفوسِ)، لەو کتێبەدا دەڵێت:

پێویستە کەسی دەستپێکاری ئەم ڕێبازە دوو مانگی یەك لەدوای یەك بەڕۆژوو بـێ وەکـو تەوبەو پەشیمان بونەوەیەك بۆ خوای تعالی، پاشـان بیـشکێنێت و، شـتێکی کـەم بخـوات و، پارچە پارچە نان بخوات و، واز لە پێخۆرەکان و، میوەو، چێژو لـەزەت و، دانیـشتن لـە گـەڵ برایانداو، تەماشاکردنی کتێب بهێنێت، وە هەموو ئەمانە دڵخۆشکاری نەفسن، بۆیـە نـەفس ئەو چێژەی لێ قەدەغە دەکرێت، تا لە خەم و خەفەت پڕ بێت.

---

٣٦٣ _ أبوعبدالله محمد بن عليّ الترمذيُّ: ناسراوە بە (الحكيم الترمذی)، ئەم پیاوە (أبوعیـسى الترمـذي) خاوەنی ((السنن)) نی یە، (الحكيم الترمذي) ساڵی (٣٢٠ك) مردووە.

لە (تِرْمِذ) خەڵك ئەم پیاوەیان هەجرکردو لێی دورکەوتنەوە لەبەر ئـەوەی هەسـتا بـەدانانی کتـێبی (خـتم الولاية).

(كمال الدين)ی کوڕی (العديم) لەو بەشەیدا کە نوسیوتی بەناوی ((المُلحة في الرد على أبي طلحة)) دەڵێت:

((... ئەم (الحكيم الترمذي)ە لە ئـەهلی فەرموودەناسـان نـەبوو، هـیچ گێڕانەوەیـەکی نـی یـە، وە هـیچ زانستێکی دەربارەی ڕێگەو پیشەکەی نی یە، بەڵکو گوتـەو قـسە هەیـە سـەبارەت بـەوەی هەسـتاوە بـە ئاماژەدان بەتەصوف و ڕێگەکانی و، بانگەشەی (کـشف)و بەدەرخـستنی کاروبـارە نادیـارو ڕاسـتیەکانی دەکرد، تا ئەو ئاستەی لە ڕێساو یاسای فیقهزانەکان چووە دەرەوەو، شایـستەی تانەلێـدان و گاڵتـەپێکردن بوو، وە پێشەوایانی فیقهزانان و تەصوفیش تانەیان لێداو، بەوەش لەڕێبازی جێی ڕەزامەندی دەریانهێنـاو، گوتیان: بەڕاستی شتانێکی خستۆتە نێـو زانـستی شـەریعەتەوە کـە بەهۆیـەوە لـە کۆمـەڵی موسـڵمانان جیادەبێتەوە، کتێبە ترسناکەکانیشی بەفەرموودەی (موضـوع) و بەهەواڵی نەبیـستراو (ریوایـە)ت نـەکراو پڕکردووە، هەموو کاروبارە شەرعیەکانیشی لێکداوەتەوە بەلێکدانەوەیەکی لاواز کە ئەقڵ وەری ناگرێت)).

بەم جۆرە پێشەوا (ابن حجر) لـە کتـێبی (لـسان المیـزان)دا (٥ / ٣٠٩) وەریگرتـووەو، پاشـان گفتوگـۆو قسەشی لەسەری کردووە چاکتر وایە بخوێندرێتەوە !

نووسەر دەفەرمێت:

کەسانێك لە پاشینان (الأربعينيَّة)یان بۆ داهێناون: واتە کەسێکیان چل ڕۆژ دەمێنێتەوە نان ناخوات، بەڵام زەیتەکان دەخوات و، میوەیەکی زۆری بەلەزەت دەخوات.

ئەمە کورتەیەکی بەیادهێنانەوەی ئەو ڕەفتارانەیە کە پەیڕەوی دەکەن لە خۆراك خواردنەکانیاندا، ئەوەی باسکراوە پەنجە ڕادەکێشێت بۆ ئەوەش کە باس نەکراوە.

## ✸ ئاشکراکردنی سەرلێشێواندنەکانی ئیبلیس بەرامبەر بەصوفیەکان لەم کردوانەداو ڕوونکردنەوەی هەڵەکان تیایدا:

نووسەر دەفەرمێت:

ئەوەی لە (سَهْلٍ)ەوە باسکراوە، کردەوەیەکی شیاو نییە، چونکە نەفس لە لایەن خوای تعالاوە ناچاری شتێك کراوە کە ناتوانێت بەرگەی بگرێت، سەرەڕای ئەوەش خوای _ عزَّوجلَّ _ بەپێدانی گەنم ڕێزی بۆ نەوەی ئادەم داناوەو، توێکڵەکەشی بۆ ئاژەڵەکانیان داناوە، بۆیە نابێ کێبڕکێی ئاژەڵەکان بکرێت لە کا خواردندا، پاشان دەبێ چ خۆراکێك لە کا خواردندا هەبێ ؟!

شتانێکی وەکو ئەمە زۆر لەوە بەناوبانگترە کە پێویست بەرپەرچدانەوە بکات.

(أبوحامدٍ) دەڵێت: (سَهْلٍ) وای بۆ دەچوو کە نوێژی کەسی برسی کەوا برسێتی لاوازی کردوەو، بەدانیشتنەوە نوێژ دەکات، زۆر لەوە چاکترە کە خۆراك خواردن بەهێزی بکات و، بە ڕاوەستانەوە نوێژ بکات.

نووسەر دەفەرمێت:

دەڵێم ئەمە هەڵەیە، بەڵکو ئەگەر خۆی بەهێز بکات بۆ ئەوەی بتوانێ هەستێت، خواردنەکەی دەبێتە پەرستن، چونکە یارمەتیدەری دەبێ بۆ بەجێهێنانی پەرستنەکان، وە ئەگەر خۆی برسی کرد تا ئەو ئاستەی بەدانیشتنەوە نوێژ بکات، ئەوا دەبێتە هۆی وازهێنان لە فەرزەکان و، ئەوەی بۆ شیاو نابێ.

ئەگەر خۆراك خواردنەکە مردارەوە بووش بێت، شیاو نییە وازی لێ بێنێت، ئیتر چۆن شیاو بێ کە خۆراکەکە حەڵاڵ بێ ؟!

پاشان ئەم برسێتیە کە پەکخەری هۆیەکانی پەرستنە دەبێ چ نزێکبوونەوەیەکی تێدابێ لە خوای پەروەردگارەوە ؟!

بەڵام گوفتارەکەی (الحدَّاد): ((من چاوەڕێ دەکەم تا زانست (العلم) یاخود دڵنیایی (الیقین) سەردەکەوێ))، ئەوپەڕی نەفامیە، چونکە هیچ دژ بەیەك بوونێك لە نێوان زانست و

دڵنیایدا (العلم والیقین) نییه، لەڕاستیدا دڵنیایی (الیقین) بەرزترین پلەکانی زانستە (العلم)، وە لە چ شوێنێکی زانست و دڵنیایدا هەیە (العلم والیقین) واز لەو شتانە بهێنرێت کەوا نەفس پێویستی پێیەتی وەکو خواردن و خواردنەوە؟!

لەڕاستیدا کاتێ ئاماژەی بۆ زانست (العلم) کردووە، مەبەستی ئەوەیە کە شەرع فەرمانی پێکردووە، وە کاتێ ئاماژەی بۆ دڵنیایی (الیقین) کردووە مەبەستی هێزی ئارامگرتنە ! واتە یا فەرمانی شەرع سەردەکەوێ و دەخوات یا هێزی ئارامگرتن سەردەکەوێ و لەسەر نەخواردن بەردەوام دەبێ.

ئەمە تێکەڵکردنێکی ناشیرینە.

هەروەها گوفتاری ئەو کەسەی گوتویەتی: ((نەمخواردووە تا ئەو کاتەی خواردنی گۆشتی مردارەوەبووی بۆ حەڵاڵ دەبوو))، بەڕاستی کاری بەبیروڕا بێ بایەخ و نەویستراوەکەی خۆی کردووەو، زۆری لە نەفسی خۆی کردووە لەگەڵ هەبوونی حەڵاڵدا.

گوفتارەکەی (أبـي يزيـدَ): ((خـۆراك بەلامانـەوە گوێڕایـەڵیی و پەرسـتنی خوایـە))، گوفتارێکی لاوازو بێ هێزە، چونکە جەستە واپێکهێنراوە کە پێویستی بەخواردن هەبێ، تـا ئەو ئاستەی خەڵکی ئاگریش پێویستیان بەخۆراکە.

نووسەر دەفەرمێت:

بەڵام کەمکردنەوەکەی (ابنِ خفیفٍ)، کردەوەیەکی ناشیرینەو، بەچاك دانانرێت، وە هیچ کەسێك ئەم هەواڵانە لەو کەسانەوە ناگێڕێتەوە بەشێوەیەك کە کردەوەکانیان بەچاك دابنێ ، مەگەر کەسێکی نەفام بە بنەڕەتەکانی شەرع، بەڵام کەسی زانای بەتوانای لێهاتوو، ترسی گوفتاری کەسی بەگەورەدانراوی نییە، ئەی دەبێ کردەوەی کەسی نەفامی تووشبووی بەنەخۆشی (البِرسام)(٣٦٤) ی بەلاوە چۆن بێ.

---

٣٦٤ _ البِرسام: واتە نەخۆشی (ذات الجنب)، کە هەوکردنی پەردەی چواردەوری سی یەکانە. ((المعجم الوجيز)) (ص٤٥).

بەڵام سەبارەت بەوەی گۆشت ناخۆن، ئەمە ڕێباوەڕی تایەفەی (البراهمة)یـە(٣٦٥) کـە وای بۆ دەچن نابێ ئاژەڵ سەربڕدرێت، بەڵام خوای _ عزَّوجلَّ _ بەبەرژەوەندی جەستەکان زانـاترە، بۆیە ڕێی داوە گۆشت بخورێت، بۆ ئەوەی جەستە بەهێز بێت، چونکە خواردنی گۆشت هێزەکان بەهێزتر دەکات و، وازلێهێنانیشی لاوازی دەکات و، ڕەوشت خراپ دەکات.

وقد كان رسولُ اللهِ _ صلى الله عليه وسلم _ يأكُلُ اللحمَ، ويحبُّ الـذِّراع مَـن الـشاةِ(٣٦٦) واتە: بەڕاستی پێغەمبـەری خـوا _ صـلى الله عليـه وسـلم _ گۆشـتی دەخـواردو، حـەزی بەگۆشتی دەستی مەڕ بوو.

(الحَسَنُ البصريُّ) هەموو ڕۆژێك گۆشتی دەکڕی.

پێشینی چاکیش لەسەر ئەم ڕێبازە بوون، مەگەر کەسێکیان هـەژارو دەسـتکورت بوایـە، ماوەی گۆشت خواردنی دور دەکەوتەوە، لەبەر ئەو هەژاریە.

بەڵام ئەو کەسەی حەزو ئارەزووەکانی لە نەفسی خۆی قەدەغە کردووە، ئەگـەر بەتـەواوی وبەڕەهایی بوو ئەوا کارێکی چاك نیە، چونکە خـوای _ عزَّوجـلَّ _ نـەوەی ئـادەمی لەسـەر گـەرمی و سـاردی و، وشـکێتی و تـەڕێتی خولّقانـدووەو، تەندروستیـشی بەیەکـسانبوونی خەڵتەکانەوە پێوەند کردووە: خوێن، بەڵغەم، (المِرَّة الصفراء)، (المِرَّة السوداء)، بۆیـە جـار بـە جار هەندێ لەم خەڵتانە زیاد دەکەن، سروشتی مرۆڤـ مەیلی ئـەو شـتە دەکـات کـە کـەمی بکاتەوە، وەکو ئەوەی جار بە جار کە (المِرَّة الصفراء) زیاد دەکات سروشـت و خـووی مرۆڤـ مەیلی ترشێتی دەکات، یاخود کە بەڵغەم کەم دەبێتەوە، نەفس حەز بە تەڕاتیەکان دەکات.

سروشت وخووی مرۆڤـ بەجۆرێ پێکهێنراوە مەیلی ئەو شتانە بکات کە سازیارو گونجـاوی نەفسە، بۆیە ئەگەر نەفس مەیلی ئەو شتانە بکات کە چاکی دەکاتەوە، بـەڵام لێـی قەدەغـە

---

٣٦٥ _ البراهمـةِ: تایەفەیەکن لە وەڵاتی (هنـد) دەرکـەوتن دەگەڕێنـەوە بـۆ سـەرگەورەکەیان کـە نـاوی (براهم)ە، بڕوانە: الشهرستاني، الملل والنحل، بتحقيق: محمد سيد كيلاني، ج٢، ص٢٤٩. وەرگێڕ.

٣٦٦ _ رواه البخاري (٣٣٤٠)، ومسلم (١٩٤) عن أبي هريرة.

کرا، ئەوا بەرەنگاری دانایی خوای تعالی بەشتێك کراوە کە ڕەتی بکاتەوە، پاشان ئەو ڕەفتارە کار لە جەستە دەکات و، ئیتر ئەو کارە دژبە شەرع و ئەقڵ دەبێ.

زانراوە کە جەستە وەڵاخی نەوەی ئادەمە، وە هەر کاتێك لەگەڵ وەڵاخەکەدا بەنەرمی و بەبەزەیەوە مامەڵە نەکرێت، بەجێ ناگات.

لەڕاستیدا زانستی ئەم کەسانە کەم بوو، بۆیە بەپێی بیروڕا بۆگەنەکانی خۆیان دەدوان، ئەگەر بەڵگەش بهێننەوە، فەرموودەیەکی (ضعیفٍ) یاخود (موضوعٍ) دەکەنە بەڵگە، یاخود بەخراپ لێی تێدەگەن !

بەڕاستی سەرم سوڕما لەوەی کە چۆن (أبي حامدِ الغزَّاليٌّ) فیقهزان لە پلەی فیقهزانیەوە دابەزیوەتە سەر ڕێباوەڕی ئەمانە ؟! تا ئەو ئاستەی گوتویەتی:

ئەگەر نەفسی مورید ئارەزووی جووتبوونی کرد پێویستە هەردوو کرداری خواردن و جووتبوون پێکەوە ئەنجام نەدات، دوو شەهوەت و ئارەزوو بەنەفسی خۆی بدات و، دەرەنجام بەسەریدا زاڵ بێت.

ئەمە ئەوپەڕی ناشیرینیە، چونکە پێخۆر حەزو ئارەزوویەکە بەسەر خۆراکەوە، جووتبونیش حەزو ئارەزویەکی ترەو باسێکی ترە....

ئایا لە فەرموودەی (صحیح)دا(٣٦٧) نەهاتووە: أنَّ رسولَ اللهِ _ صلى الله عليه وسلم _ طافَ على نسائِه بغُسلٍ واحدٍ. واتە: پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ بەسەر هەموو خێزانەکانیدا گەڕاو لە گەڵیاندا جووت بوو و پاشان یەك غوسڵی کرد.

ئایا لە (الصحیحین)دا(٣٦٨) نەهاتووە: أنَّ رسولَ اللهِ _ صلى الله عليه وسلم _ كان يأكُلُ القِثَّاءَ بالرُّطَبِ ؟ واتە: پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ کالیاری بەخورمای تەڕی تازەپێگەیوە دەخوارد. هەردوکیشیان شەهوەت ئارەزوون.

---

٣٦٧ _ رواه البخاري (٥٢١٥) عن أنس.

٣٦٨ _ رواه البخاري (٥٤٤٠)، ومسلم (٢٠٤٣) " عن عبدالله بن جعفر.

أوَ ما أكلَ عندَ أبي الهيثمِ بنِ التَّيِّهان خُبزاً، وشِواءً، وبُسراً، وشربَ ماءً بارداً(٣٦٩) واتـه: ئايا پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ له مـاڵی (أبـي الهيـثم)ی کـوڕی (التَّيِّهـان) نانو، برژاو و، ئەو خورمایەی تازە شـیرینی تێکـەوتووە (البُـسر) نـەخواردو، ئـاوی سـاردی نەخواردەوە.

ئایا (الثوريُّ) گۆشـت و، تـرێ و، (الفـالوذج)ی نـەدەخواردو، پاشـان هەڵدەسـتاو نوێـژی دەکرد؟!

ئایا جۆو، کاو، (القَتَّ)(٣٧٠) وەکو ئالف بەئەسپ نادرێت، وە ئایا گەڵای دارو لەوەڕ بەمێ وشتر نادرێ؟!

لەڕاستیدا هەندێ لە پێشینانی دێرین قەدەغەی خواردنی دوو پێخۆریان کردووە، ئەگەر بە بەردەوامی خورا، ئەوەکا ببێتە عادەتێـك بەلایانـەوەو، پێویـست بـەپارە تێـچونێکی زیـاتر بکات، لەڕاستیدا مرۆڤ هاندراوە لەزیدە شەهەوات و ئارەزوات دورکەوێتـەوە، ئـەوەکا ببێتـە هۆکارێك بۆ زۆر خواردن و، نووستن و، ئیتر مرۆڤ ئـارمگرتنی بەرامبـەریان کـەم بێتـەوەو، بەردەوام حـەز بـەخواردنیان بکـات و، واپێویـست بکـات هـەموو تەمـەنی بفـەوتێنێت بـۆ بەدەسـتهێنانیان و، ڕەنگـە هـەوەڵی بەدەسـت هێنانیـشیان بـدات، ئەگـەر لەڕێگەیـەکی حەرامیشەوە بێت.

ئا ئەمە ڕێبازی پێشینی چاکە سەبارەت بەوازهێنان لەزێدە شەهەوات و ئارەزووات.

ئـەو فەرموودەیـەش کـە کردویانەتـە بەڵگـە: ((احْرِمـوا أنفـسَكُم طيِّـبَ الطعـامِ...)) فەرموودەیەکی (موضوع)ەو، دەستەکانی (بزيع الراوي) هەڵیبەستووە(٣٧١).

---

٣٦٩ _ رواه الترمذي في ((الشمائل)) (رقم ١١٣ مختصره)، وانظر تعليق شيخنا عليه.

٣٧٠ _ جۆرێکە لە دانەوێڵەو، دەشتەکیەکان دەیخۆن.

٣٧١ _ تقدم الكلام عليه.

بەڵام ئەگەر مرۆڤ خۆراكی خۆی سنوردار بكات و نانی جۆ و، خوێی زبرو بێ تام بخوات، ئەوا میزاجی خراپ دەبێ، چونكە نانی جۆ وشك و وشكەرەوەیەو، خوێش وشك و قەبزكارە، زیان بەمێشك و چاو دەگەیەنێت.

وە كەمكردنەوەی خۆراك دەبێتە هۆی وشكردنەوەی گەدەو تەسكبونەوەی.

بزانە جۆری خواردنی زەمكراو لەڕاستیدا تەنها تێربوونی لەڕادەبەدەرە.

چاكترین ئەدەب كە شایستەی پەیڕەو كردن بێت لە خواردندا ئەدەبی شەرع دانەرە(٣٧٢)_صلى الله عليه وسلم _:

عن المقدامِ بنِ مَعدي كَرِب قال: سمعتُ رسولَ اللهِ _ صلى الله عليه وسلم _ قالَ:

((ما ملأَ آدَمِيٌّ وعاءً شَرّاً مِنْ بطنِه، حَسْبُ ابنِ آدمَ أكلاتٌ يُقِمْنَ صُلْبَه، فإنْ كان لابُدَّ، فَثُلُثٌ طعامٌ، وثُلُثٌ شرَابٌ، وثُلُثٌ لِنَفَسِهِ))(٣٧٣) واتە: لە (المقدامِ)ی كوڕی (مَعدي كَرب)ەوە _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ فەرمووی: ((ئەوەی ئادەم هیچ توورەكەیەكی پڕ نەكردووە لە سك خراپتر بێت، چەند پاروویەك بەسە بۆ ئەوەی ئادەم پشتی پێ ڕاست بكاتەوە، بەڵام ئەگەر حەزی بە خۆراكی زیاتر بوو، با سێ یەكی

---

٣٧٢ _ كەسانێك لە ئەهلی زانست قەدەغەی بەكارهێنانی وشەی شەرع دانەر (الشارع) دەكەن بۆ خودی پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _، چونكە خوای _ سبحانه وتعالى _ شەرع دانەرە، وەكو ئەوەی دەفەرمێت: ﴿ شَرَعَ لَكُمْ مِنَ الدِّينِ مَا وَصَّى بِهِ نُوحًا وَالَّذِي أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ... ﴾﴿ الشورى: ١٣ ﴾ واتە: ﴿ شَرَعَ لَكُمْ مِنَ الدِّينِ ﴾ ئەو ئاینەی بۆ داناون ﴿ مَا وَصَّى بِهِ نُوحًا ﴾ كە فەرمانی داووە بە نوح و ﴿وَالَّذِي أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ ﴾ ئەوەش نیگامان كردووە بۆ تۆ.

پێغەمبەرەكەشی ڕاگەێن و پەیامبەری سروشەكەیەتی بۆ مرۆڤایەتی.

بڕوانە: ((معجم المناهي اللفظية)) (ص٣٠٤) للشيخ بكر أبوزيد.

٣٧٣ _ رواه الترمذي (٢٣٨١)، وابن ماجة (٣٣٤٩)، والحاكم (٤ / ١٢١)، وابن حبان (١٣٤٨) " من طرق عنه.

وسنده صحيح.

سکی بۆ خواردەمەنی بێت و، سێ یەکیشی بۆ خواردنەوەی بێت و، سێ یەکیشی بۆ هەناسەدانی بێت)).

دەڵێم _ ابن الجوزي _ شەرع فەرمانی بەئەوەندە خواردن کردووە، کە نەفسی پێ بژێ، ڕاست بێتەوە، پاراستنی ڕاگرێت، بتوانێت لەپێناو بەرژەوەندیەکانیدا کۆشش بکات، ئەگەر (أبْقراط)(٣٧٤) گوێبیستی ئەم دابەشکردنە بوایە لە فەرمایشتی پێغەمبەری خوادا _ صلی الله علیه وسلم _ کە دەفەرمێت: ((سێ یەکی... وە سێ یەکی... وە سێ یەکی))، بەدڵنیایی سەبارەت بەم حیکمەت و داناییە سەرسام دەبوو، چونکە خواردن و خواردنەوە قەبارەیان لە گەدەدا گەورە دەبێ و، لە پڕبوون نزیك دەبێتەوەو، بۆ نەفەسدان نزیك بەسێ یەکی دەمێنێتەوە، ئەمەش نێوەنجیترین شتەکانە، بۆیە ئەگەر تۆزێك کەم بویەوە زیانی نییە، بەڵام ئەگەر کەم بوونەوەکە زیاتر بوو، هێز لاواز دەکات و، ڕێڕەوکان بەرامبەر بەخۆراکەکان تەسك دەکاتەوە.

---

٣٧٤ _ أبْقراط: لە پزیشکانی یونانی کۆنە.

# ✱ تەصوف و برسێتی:

نووسەر دەفەرمێت:

ئەوە بزانە کە صوفیەکان فەرمانی خۆراك کەمکردنەوە بەلاوان و کەسانی تریش دەدەن لەوانەی کە پەیڕەویان دەکەن:

وە لەو شتانەی کە زۆر زیانمەندە بۆ لاو برسێتیە، چونکە کەسانی بەتەمەن بەرامبەر بە برسێتی ئارام دەگرن، هەروەها پەکەوتەکانیش، بەڵام لاوان، هیچ ئارامگرتنێکیان بەرامبەر بەبرسێتی نییە.

هۆکاری ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە گەرمی لاو زۆرە، بۆیە هەرسکردنی چاك دەبێ و، شیی بوونەوەی جەستەشی زۆر دەبێ، کەوابوو پێویستی بەخواردنێکی زۆر دەبێ، وەکو چۆن چرای نوێ نەوتێکی زۆری دەوێ، بۆیە ئەگەر لاو لە کاتی گەورەبوون و گەشەکردنیدا بەرامبەر بەبرسێتی ئارامگرتنی بەکارهێنا، گەشەکردنی نەفسی خۆی دەوەستێنێت، بۆیە نموونەی وەکو کەسێکی لێ دێت کە بنەڕەتی دیوار بڕۆخێنێت، لە پاشدا گەدە _ لەبەر نەبونی خۆراك _ دەستی ڕادەکێشێت بۆ زیدە خۆراکە کۆبۆوەکانی نێو لاکانی جەستەو، لاکانی جەستەش خەڵتە خۆراکی پێ دەبەخشێ، دەرەنجام بیرو زەین و جەستە خراپ دەبێ.

ئەمە بنەڕەتێکی گەورەیەو پێویستی بەتێوردبونەوەیە.

نووسەر دەفەرمێت:

زانایان باسی ئەو خۆراك کەمکردنەوانەیان کردووە کە جەستە لاواز دەکات:

(عقبةُ)ی کوڕی (مُكْرِم) لە پێشەوا (أحمدَ)ی کوڕی (حنبلٍ)ی پرسی و گوتی: ئەو کەسانەی کەم دەخۆن و، خۆراکیان کەم دەکەنەوە ؟ پێشەوا (أحمدَ)ی کوڕی (حنبلٍ)یش فەرمووی: ئەوەم پێ باش نییە، چونکە گوێبیستی (عبدَالرحمنِ)ی کوڕی (مَهْدي) بووم دەیفەرموو: قەومێك ئەوەیان کردو، لە ئەنجامدانی فەرزەکان دابڕین.

لە (داودَ)ی کوڕی (صُبيحٍ)ەوە دەڵێت: بە(عبدَالرحمنِ)ی کوڕی (مَهْدي)م گوت: ئەی (أباسعيد) ! شارەکەی ئێمە قەومێك لەو صوفیانەی تێدایە ! ئەویش فەرمووی: نزیکی ئەوانە

مەبەرەوە، ئێمە کەسانێکمان لەو قەومە بینیوە ئەو ڕەفتارە بەرەو شێتی دەریهێنان، کەسانێکیش لەوانەی بەرەو زندیقیەت دەرهێنا.

لە (المروزيّ)وە دەڵێت: پیاوێك لە (أباعبدِاللهِ أحمدَ)ی کوڕی (حنبلٍ)ی پرسی و گوتی: پازدە ساڵە ئیبلیس زۆر هۆگرم بوەو لەڕەکەبەرایەتیمدا پێداگرەو، سوورە لەسەر ئازاردانم و، ڕەنگە گومان و ئەندێشەی خراپیشم بۆ دروست بکات و، بیر لە خوای تعالی دەکەمەوە، ئەویش لە وەڵامیدا فەرمووی: تۆ لەوانەیە بەردەوام بەڕۆژوو بیت، بیشکێنەو، چەوری بخۆ و، لەگەڵ چیرۆك خوانانْدا دانیشە.

نووسەر دەفەرمێت:

ئەم قەومە کەسی وایان تێدایە خۆراکی خراپ دەخوات و، لە خۆراکی چەور بەتەواوی دورکەوتۆتەوە، بۆیە لە گەدەیدا خەڵتەگەلێکی نەگەیو کۆدەبێتەوەو، گەدەش ماوەیەك بەکاریدەهێنێ، چونکە دەبێ شتێك هەبێ هەرسی بکات، بۆیە ئەگەر هەرس کردنی ئەو خۆراکەی کە تێیدایە تەواو بکات و، هیچی تری دەست نەکەوێت، ناچار خەڵتەکان وەردەگرێ و، هەرسی دەکات و، بەخۆراکی دەکات، دەرەنجام ئەو خۆراکە خراپە دەبێتە هۆکاری دروستبوونی گومان و ئەندێشەی خراپ و، شێتی و، بەدڕەوشتی. ئەم کەسانەی کە خۆراك کەم دەکەنەوە لەگەڵ ئەو کەمکردنەوەیەدا خراپترین خۆراك دەخۆن، بۆیە خەڵتەکانیان زۆر دەبێ و، گەدەش بەهەرسکردنی ئەو خەڵتانەوە سەرقاڵ دەبێ، پلە بە پلە لە گەڵ ئەو کەمکردنەوەیەدا ڕادێ و، گەدەیان تەسك دەبێتەوەو، بەو جۆرە دەتوانن چەندین ڕۆژ لەسەر خۆراك نەخواردن ئارام بگرن، ئەوەش کە یارمەتیان دەدات تەنها هێزی لاوێتیە، دەرەنجامیش لەو باوەڕەدا دەبن کە توانای ئارامگرتن لەسەر برسێتی و خۆراك نەخوادن کەرامەتە !

لەڕاستیدا هۆکارەکەشی تەنها ئەوەبوو کە پێم ئاشنا کردی.

نووسەر دەفەرمێت:

ئەگەر گوترا: چۆن قەدەغەی کەمکردنەوەی خواردن دەکەن، لە کاتێکدا (ریوایە)ت کراوە کەوا (عمرَ) _ خوای لێ ڕازی بێت _ هەموو ڕۆژێك یازدە پاروی دەخوارد ؟!

(ابنَ الزُّبَير) هەفتەیەك دەمایەوە بەبێ خواردن !

(إبراهيمَ التَّيميًّ)یش دوو مانگ مایەوە !

دەڵێین _ ابن الجوزي _ ڕەنگە مرۆڤ هەندێ کات توانای ئەنجامدانی ئەو شتەی هەبێ، بەڵام لەسەری بەردەوام نابێ و، مەبەستیشیان خۆبەرزکردنەوە نییە بۆ زیاتر.

پێشینی چاك کەسی وایان تێدا بوو لەبەر دەستکورتی بەرسێتی دەکێشا، هەشیانبوو لە سەر ئارامگرتن ڕاهاتبوو، بۆیە برسێتی زیانی بەجەستەی نەدەگەیاند.

لە عەرەبدا کەسانێك هەن چەندین ڕۆژ لە شیر زیاتر ناخۆنەوە.

ئێمە فەرمان بەتێربوون ناکەین، لەڕاستیدا قەدەغەی برسێتیەك دەکەین هێز لاواز بکات و، زیان بەجەستە بگەیەنێت، وە ئەگەر جەستە لاواز بوو، پەرستنیش کەم دەبێت، چونکە ئەگەر لەم بارەدا هێزی لاوێتی یارمەتی جەستە بات بۆ ئەوەی کارەکانی هەڵسوڕێنێت، دڵنیابن ڕۆژێکیش پیری دێت و جەستە دادەنیشێنێت .

لە (أنسٍ)ەوە _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی: چوار گوێل (الصاع) خورما بۆ پێشەوا (عمرَ)ی کوڕی (الخطَّابِ) دادەنرا، هەمووی دەخوارد، هەتا خراپەکانیشی دەخوارد.

لە (إبراهیمَ)ی کوڕی (أدهَمَ)ەوە دەگێڕنەوە کەوا کەرێ و، هەنگوێن و، نانی کڕی، پێی گوترا: هەموو ئەمانە دەخۆی ؟! گوتی: هەرکات دەستڕۆ بین، پیاوانە دەیخوێن و، هەرکاتیش دەستکورت بین، پیاوانە ئارام دەگرین.

## ✸ ئاوی خواردنەوە:

نووسەر دەفەرمێت:

بەڵام خواردنەوە لە ئاوی ڕوونی پاك، بەڕاستی ئەو كردەوە چاكە بوو كە پێغەمبەری خوا _ صلی الله علیه وسلم _ هەڵیدەبژارد:

عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ أَنَّ رَسُولَ اللَّه صلى الله عليه وسلم أَتَى قَوْمًا مِنْ الْأَنْصَارِ يَعُودُ مَرِيضًا، فَاسْتَسقى _ وَجَدْوَلٌ قَرِيبٌ مِنْهُ _ فَقَالَ:

((إِنْ كَانَ عِنْدَكُمْ مَاءٌ بَاتَ فِي شَنٍّ، وَإِلَّا كَرَعْنَا))

أخرجه البخاري(٣٧٥).

واتە: لە (جَابِرِ)ی كوڕی (عَبْدِ اللَّهِ)وە _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا _ صلی الله علیه وسلم _ چووە دیدەنی قەومێك لە پشتیوانان بەمەبەستی سەردانی نەخۆشێك، داوای ئاوی خواردنەوەی كرد _ جۆگەیەكیش نزیكی بوو _ فەرمووی:

((ئەگەر ئاوتان هەیەو لە كونەیەكی كۆندا ماوەتەوە بۆمان بێنە، ئەگینا بەدەمان ئاو لە جۆگەكە دەخۆینەوە)).

وعن عائشةَ _ رضي الله عنها _ أَنَّ رسولَ اللهِ _ صلى الله عليه وسلم _ كانَ يَسْتَقَى لَهُ العذبُ مِن بئرِ السُّقيا(٣٧٦).

واتە: لە خاتوو (عائشةَ)وە _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا _ صلی الله علیه وسلم _ ئاوی شیرینی خۆشی لە (بئرِ السُّقيا) وە بۆ دەهێنرا.

نووسەر دەفەرمێت:

---

٣٧٥ _ (١٠ / ٦٧).

٣٧٦ _ رواه أحمد (٦ / ١٠٠)، وأبوداود (٣٧٣٥).

وسنده حسن.

بئرِ السُّقيا: بیرێك بوو ئاوەكەی شیرین و خۆش بوو، ماوەی دوو ڕۆژ لە مەدینەوە دوور بوو، لە نێوان مەدینەو مەكەدا، بڕوانە: جلال الدين السيوطي، الشمائل الشريفة، ص٣١٣. وەرگێڕ.

پێویسته بزانرێت کەوا ئاوی لێڵ بەردی گورچیلەو، کونیلەی داخراو (السَّدَدَ) لـه جگـەردا دروست دەکات.

بەڵام ئاوی سارد، ئەگەر ساردیەکەی مامناوەند بێـت، گـەدە پتـەو و مەحکـەم دەکـات، شەهەوەت وئارەزوو بەهێز دەکات، ڕەنگ وبۆ چاك و جوان دەکاتەوە، ڕێگـە لـە بۆگـەنبوونی خـوێن (عَفَـنَ الـدَّمِ) دەگرێـت، ناهێڵێـت بـۆخ و هەڵماتکـەکان بـەرەو مێـشك بەرزبنـەوەو، تەندروستی دەپارێزێت.

وە ئەگەر ئاوەکە گەرم بوو، بەدهەرسی و، لەش خاوبونەوەو، سیسبوونی جەسـتە دروسـت دەکات، نەخۆشیەکانی (الإستسقاءِ)و(٣٧٧)(الـدِّقّ)(٣٧٨) دروست دەکات، وە ئەگـەر بەهـەتاو گەرم بکرێت، ترسی ئەوەی لێدەکرێت کە نەخۆشی بەڵەکی دروست بکات(٣٧٩).

کەسانێکی زاهیـد هـەبوون دەیـانگوت: ئەگـەر خـۆراکی خـۆش بخوێـت و، ئـاوی سـارد بخوێتەوە، ئیتر چ کاتێ حەزبە مردن دەکەی ؟!

هەروەها (أبوحامدِ الغزالـيُّ) دەڵێت: ئەگەر مرۆڤـ ئەو شتانە بخوات کە بەلایـەوە خۆشـە، دڵی ڕەق دەبێ و، حەز بەمردن ناکات، وە ئەگەر ڕێگەی ئارەزووات لە نەفسی خۆی بگرێتو، قەدەغەی خۆشی و چێژەکانی لێ بکات، ئیتر نەفسی حەز بەوە دەکات کە بەمردن لـە دونیـا قوتار بێت.

---

٣٧٧ _ الإستسقاء: ئاوە بۆ کۆبونەوەی شلەمەنیەکی تایبەت لە بۆشایی بریتۆنی جەستەداو ئەم نەخۆشیە چاکبونەوەی کەمە، بڕوانە: مەلا محمودی گەلالەیی، قاموسی ڕستە. وەرگێڕ.

٣٧٨ _ الدِّقُّ: بەلەرزوتایەك دەگوترێ ڕۆژانە دوبارە بێتەوە، بڕوانـە: مـەلا محمـودی گەلالـەیی، قامـوسی ڕستە. وەرگێڕ.

٣٧٩ _ ئەمە لەڕووی پزیشکێتی کۆنەوە، بەڵام هیچ فەرموودەیەکی (صحیح) لەم بارەوە نەهاتووە، وەکو ئەوەی پێشەوا (الزیعلي) لە کتێبی ((نصب الرایة))دا (١ / ١٠١ _ ١٠٣) بەدرێژی باسی کردووە.

نووسەر دەفەرمێت:

بەڕاستی سەرسوڕمانە ! چۆن ئەم گوفتـارە لـە کەسـێکی فیقهزانـەوە دەردەچـێت ! ئایـا دەزانی نەفسی مرۆڤـ ئەگەر لە هەموو جۆرەکانی سزاداندا بتلێتـەوە حـەز بـەمردن ناکـات ! پاشان چۆن سزادانی جەستە شیاو دەبێ لە کاتێکـدا خـوای تعـالی دەفـەرمێت ﴿ وَلَا تَقْتُلُوا أَنْفُسَكُمْ ﴾ النسـاء: ٢٩ ﴾ واتە: خۆتان مەکوژن (یان خۆتان مەفەوتێنن بـەتاوان)(٣٨٠)، وە خوای تعالی ڕازی بووە ئێمە لە سەفەردا بەڕۆژوو نەبین چونکە بەزەی بە ئێمـەدا هاتۆتـەوە، دەفەرمێت: ﴿ يُرِيدُ اللَّهُ بِكُمُ الْيُسْرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ الْعُسْرَ ﴾ البقرة: ١٨٥ ﴾ واتە: ﴿ يُرِيدُ اللَّهُ بِكُمُ الْيُسْرَ ﴾ خوا ئاسانی ئـەوێ بـۆ ئێـوە ﴿ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ الْعُسْرَ ﴾ وە گرانـی ناوێـت بـۆ ئێوە(٣٨١). ئایا گوێدرێژەکەی ئێمە ئەوە نییە کە پێویستە بەجێگەکەمان بگەیەنێت ؟!

وكَيْفَ لا نَأْوِي لها وَهيَ التي... بها قَطَعْنا السَّهْلَ والحُزُونا.

واتە: چۆن دڵمان بۆ نەسـوتێ لـە کاتێکـدا بـەهۆی... ئـەوەوە هـەموو دەشـت و جێگـە دژوارەکانمان بڕی.

بەڵام ئەو سزادانەی کە (أبي يزيدَ) بۆ نەفسی خۆی بەکاریدەهێناو، یـەك سـاڵ ئـاوی لـێ قەدەغە دەکرد، ئەوە باروحاڵەتێکی زەمکراوەو، هیچ کەس بەچاکی دانانێت مەگەر کەسـانی نەفام.

ڕووی زەمکردنیشی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە نەفس هەقی بەسەرمانەوە هەیەو، ڕێگریـی کردن لەوەی کە خاوەن هەق هەقەکەی خۆی دەستکەوێتەوە ستەمەو، حەڵاڵ نییـە بـۆ مرۆڤـ زیان بەنەفسی خۆی بگەیەنێت، بۆیە نابێ مرۆڤـ بەهاوینان لەبەر هەتاوەکە دانیشێت، تا ئەو ڕادەیەی زیانی پی دەگات و، بەهەمان شێوە نابێ لە نێو بەفری زستانیشدا بمێنێتەوە.

وە ئاو تەڕاتیە بنەڕەتیەکانی جەستە دەپارێزێت و، گوزەر بەخۆراکـەکان دەکـات بـۆ نێـو بەشەکانی جەستە، وە نەفسی مرۆڤـ بەهۆی خۆراکەکانەوە ڕادەوەستێت، بۆیە ئەگەر خۆراکی

---

٣٨٠ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

٣٨١ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

ئادەمیەکانی لیٚ قەدەغە بکریٚت و، ئاویشی لیٚ قەدەغەکرا، ئەوا خـودی خـۆی یارمەتیـدەر بووە بۆ تیٚکشکانیی و، ئەمەش هەڵەیەکی ناشیرینە.

هەروەها ئەگەر نووستنیشی لیٚ قەدەغەکرا.

(ابنُ عقیلٍ) دەڵیٚت:

شـیاو نیـە جـەماوەری خـەڵك نـە سـزاکان بەسـەر نەفـسی خۆیانـدا بـسەپیٚنن و، نەوەرشیگرنەوە، ئەمە ڕیٚنوێنیمان دەکات کە هەستانی مرۆڤـ بەسەپاندنی سزا بەسەر نەفسی خۆیدا شیاو نییەو، ئەگەر ئەنجامیشی بدات، پیٚشەوا دووبارەی دەکاتەوە(٣٨٢)، ئەم نەفسانەی بە ئیٚمە بەخشراوە ئەسپاردەی خوایـە، تـا ئـەو ئاسـتەی مـافی تەصـرف کـردن بـەموڵك و سامانەوە بەتەواوی بەخاوەنەکانی نەدراوە، مەگەر بۆ چەند روویەکی تایبەت(٣٨٣)

بەڵام ئەوەی (أبوطالبِ المكيُّ) ڕیٚکیخستووە، ئەوە بارکردنی نەفـسە بەشـتیٚك کـە لاوازی دەکات، لەڕاستیدا برسیٚتی ستایش دەکریٚت ئەگەر بەئەندازەیەکی گونجاو بیٚت.

---

٣٨٢ _ ئەمە دەقیٚکی باشە لە نیٚو ئەو دەقە زۆرانەدا کە سـەپاندنی سـزا شـەرعیەکان بەتـەنها دەخاتـە ئەستۆی پیٚشەوای موسڵمانەوە کە جیٚبەجیٚکاریەتی، بەڵام کە کەسانیٚك وا لـە گوفتـاری (إمـام الحـرمین) تیٚگەشتوون شیاویٚتی داوە بەشتیٚکی تر، ئەوە بەناڕاستەیەکی تردا چـووە، هـەروەها هـەموو ئـەوەی کـە نوسیویەتی سەبارەت بەبەرپەرچدانەوەی نامیلکەکەم ((البیعة...)) لاوازە.

منیش وەڵامیٚکی وردم بۆ بەرپەرچدانەوەکەی نوسیبوو، بەڵام خوای _ سبحانە وتعالی _ بە وتەکەی بـرای چاکەکار شیٚخ (بکر أبوزید) وەڵامی دایەوە، کاتیٚ وەسـفی بەپەرچـدانەوەکەی دەکـات و دەڵیٚـت: ((کـلام متهافت)) واتە گوفتاریٚکی دارِۆخاوە یەك لە دوای یەك، وەکو ئـەوەی لـە کتیٚبەکـە پیرۆزەکەیـدا ((حکـم الإنتماء)) نووسیوەتی (ص١٣٤)، خوای تعالی پاداشتی خیٚری بداتەوە.

٣٨٣ _ لە توانادایە گوفتاری نووسەر ئالیٚرەدا بکریٚت بـەڕیٚنویٚن و بەڵگـە بـۆ ڕووداویٚـك ئـەمڕۆ قـسەی لەبارەوە زۆر بووەو، بریتیـە لـە بەخـشینی ئەندامـەکانی جەسـتە، مەسـەلەیەکە زانایـانی هاوچـەرخمان جیاوازیان تیٚکەوتووە لە نیٚوان شیاویٚتی و قەدەغەکردنیدا، لیٚرەدا ئـەم گوفتـارەی (ابـنُ عقیـلٍ) گوفتـاری قەدەغەکاران پشت ئەستور دەکات، واالله _ تعالی _ أعلم.

وەباس کردنی بەدیهاتنی (المكاشفة) لەوێدا پووچە.

وە ئەو کتێبەی (الحكيمُ الترمذيُّ) دایناوە، لە ئایندا بیدعەیەو، بەڕای بۆگەنی خۆی قسەی کردووە.

بەچ ڕوویەك شیاوە مرۆڤ دوو مانگ بەڕۆژوو بێت لە کاتی تەوبەکردندا ؟!

وە سوودی نەخواردنی میوە ڕێ پێدراوەکان چی یە ؟!

وە ئەگەر تەماشای کتێب نەکرێت، چ ڕێگەوڕێبازێك پەیڕەو بکرێت ؟!

(الأربعينيَّـة)ش فەرموودەیـەکی پووچـە، پـشتبەستن بەفەرموودەیـەکی پـووچ ڕێکیـان خستووە:

((مَن أخلَصَ للهِ أربعينَ صباحاً " لم يَجُبَّ الإخلاصَ أبداً))(٣٨٤) واتە: ((ئەو کەسـەی چـل ڕۆژ دڵسۆزیی بۆ خوای تعالی بنوێنێت، ئیتر هەرگیز دڵسۆزیەکەی نابچڕێنێت)).

باشە هۆی چیە کە بەچل ڕۆژ مەزەندە کراوە ؟!

---

٣٨٤ _ رواه المصنِّف في ((الموضوعات)) (٣ / ١٤٤ _ ١٤٥) من طرق واهية بلفظ:

((من أخلص لله أربعين صباحاً " ظهرت ينابيع الحكمة من قلبه)). واتـە: ئـەم فەرموودەیـە (موضـوع)ەو نووسەر لە ((الموضوعات))دا دەیگێڕێتەوە بەم بێژەیە: ((هەرکەسێك چـل ڕۆژ دڵـسۆزی بـۆ خـوای تعـالی بنوێنێت، سەرچاوەکانی دانایی لە دڵیەوە بەدەردەکەوێت)).

پاشان نووسەر لەسەر (إسناد)ی فەرموودەکە دەدوێ و، دواتریش فەرموویەتی:

((کۆمەڵێك لە صوفی و زاهیدان کاریان بەم فەرموودەیە کرد، کە فەرموودەیەکی جێگیر نی یە، بۆیـە چـل ڕۆژ بەتەنها لە خەڵوەتخانە دادەنیشتن و، دەستیان لە نان خواردن هەڵدەگرت، کەسانێکیشیان میـوەو، ئـەو شتانەی دەخوارد کە بەهاکەی دوو ئەوەندەی بەهای نان بوو، دوای چل ڕۆژەکە دەچوونە دەرەوەو، بێ هودە قسەیان دەکردو، وایان بەخەیاڵدا دەهات کە قسەکانیان داناییە !

ئەگەر فەرموودەکە (صحيح)یش بێت، دڵسۆزی هەر پەیوەستە بەمەبەسـتبوونی دڵـەوە، نـەك بـەکردەوەی جەستە. زانستی چاکیش لەلایەن خواوەیە)).

پاشان ئەگەر مەزەندەشمان بەو جۆرە بێ، ئەوا دڵسۆزیی کاری دڵە ! ئەی خـۆراك خـواردن پەیوەندی بەمەوە چی یە ؟ پاشان چ شـتێك قەدەغـەکردنی میـوەو قەدەغـەکردنی نـانی بـۆ ڕازاندنەوە ؟!

ئایا هەموو ئەمانە تەنها نەفامی نییە ؟!

لە (عبـدالکریمِ القُـشَیْري)وە(٣٨٥) ؛ دەڵێـت: بەڵگـەی صـوفیەکان لـە بەڵگـەی هـەموو کەسێکی تـر ئاشـکراترە، بناغـەی ڕێباوەڕەکەشـیان لـە بناغـەی هـەموو ڕێبـاوەڕێکی تـر بەهێزترە، چونکە خەڵك یا خـاوەن زانایـانی (النقـل والأثـر)(٣٨٦) ، وە یـا خـاوەن زانایـانی (العقل والفکر)ن(٣٨٧)، بەڵام شێخانی ئەم تایەفە لەم کۆمەڵانە زیاتر بەرزبونەوەو سەرکەوتن، ئـەوەی بـۆ خـەڵك نادیـارو غەیبــە، بـۆ ئـەوان ئاشـکراو دەرکـەوتووە(٣٨٨)، ئـەوان (أهـل

---

٣٨٥ _ عبدالکریمِ القُشَیْري: خاوەنی ((الرسالة القشیریة))و، ساڵی (٤٦٥ك) مردووە، ((الرسـالة))ەکـەی داهێنان و سەرپێچی و فەرموودەی لاوازی تێدایە، لە گەڵ ئەوەشدا بـە (سـند)ی خـۆی لـە (أبـي سُـلیمان الداراني)وە دەگێڕێتەوە کە گوتویەتی: ((ڕەنگە پەڵەیەك لە پەڵـەکانی قەومەکـە چـەند ڕۆژێـك بکەوێتـە دڵمەوە، بەڵام لێی وەرناگرم تەنها بەدوو شایەتی بەداد نەبێ کە قورئان و سوننەتن)).

کما في ((سیر أعلام النبلاء)) (١٨ / ٢٣١)، وقد نقلَهُ المصنِّف في أواخرِ هذا الکتاب.

٣٨٦ _ مەبەستی شوێنکەوتووی فەرموودەناسانە، بڕوانە: عبدالرحمن عبدالخالق، الفکر الصوفي في ضـوء الکتاب والسنة، ص ١٠٣. وەرگێڕ.

٣٨٧ _ مەبەستی فەیلەسوفان و قسەناسانی وەکو (المعتزلة)و (الأشعریة)ن، بڕوانە: عبدالرحمن عبـدالخالق، الفکر الصوفي في ضوء الکتاب والسنة، ص١٠٣. وەرگێڕ.

٣٨٨ _ مەبەستی ئەوەیە کە ئەوەی بەلای خەڵکەوە نادیارو غەیبە صوفیەکان دەیبینن و تەماشای دەکەن واتە تەماشای خوای تعالی و بەهەشت و ئاگر دەکەن بەچاو بۆیە پێویستیان بەبەڵگەکانی قورئان وسوننەت نییە وەکو زانایانی (الأثر)، وە پێویستیشیان بەبەڵگە ئەقلیـەکان نـی یـە وەکـو فەیلەسـوفان و زانایـانی قسەناس، بڕوانە: عبدالرحمن عبدالخالق، الفکر الصوفي في ضوء الکتاب والسنة، ص ١٠٣. وەرگێڕ.

الوصالِ)ن(٣٨٩)، بەڵام خەڵك ئەهلی بەڵگەن، بۆیە پێویستە موریدانی ئەم تایەفە واز لە هەموو پەیوەندیە دونیایەکانیان بهێنن، سەرەتای ئەوانەش وازهێنانە لە ماڵ و سامان، وازهێنانە لە شان و شەوکەوت، نەنوێت مەگەر نوستنی بەسەردا زاڵ بێ، پلە بە پلە واز لە خۆراکیش بهێنێت(٣٩٠).

دەڵێم _ ابن الجوزي _ ئەو کەسەی کەمترین تێگەشتنی هەبێ دەزانێ ئەم قسانە پووچ و تێکەڵ وپێکەڵە، چونکە ئەو کەسەی واز لە بەڵگەکانی قورئان وسوننەت وڕێبازو ژیانامەی هاوەڵان بهێنێ، بەیەکێك لە خەڵك ناژمێردرێ، هەموو کەسێکیش کار بەبەڵگە دەکات، باسکردنی (الوصالِ)یش قسەیەکی پووچە.

بۆیە داواکارین خوای تعالی بمانپارێزی لە پووچی و تێکەڵ وپێکەڵیی موریدان و شێخەکان.

والله الموفقُ.

٣٨٩ _ أهل الوصالِ: بەبانگەشەی خۆیان واتە: لەگەڵ خوادان. بڕوانە: عبدالرحمن عبدالخالق، الفكر الصوفي في ضوء الكتاب والسنة، ص١٠٣. وەرگێڕ.

٣٩٠_ ئەمە گوفتارەکانم پشت ڕاست دەکاتەوە کە لە پەراوێزی پێشودا نووسیم.

# ✹ هاودژبوونیان بەیەکتر:

نووسەر دەفەرمێت:

وقد رُوِّينا في حديث آخرَ عن النبيّ _ صلى الله عليه وسلم _ أنه قالَ:

((إنَّ الله _ عزَّ وجلَّ _ يحبُّ أن يرى آثارَ نعمَتِهِ على عبدِهِ))(٣٩١).

واتە: لە فەرموودەیەکی تردا بۆیان باسکردووین کەوا پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ فەرموویەتی:

((بەڕاستی خوای _ عزَّ وجلَّ _ حەزی بەوەیە ئاسەواری نیعمەتەکانی بەسەر بەندەکەیەوە ببینێت)).

(بكْر)ی کوڕی (عبدالله) دەڵێت: هەرکەسێ شتێکی خێری لە خاوخێزان ومال وسامانی پێدراو، پێوە بینرا، ئەوا بەخۆشەویستی خواو، سوپاسگوزاری نیعمەتەکانی خوا ناودەبرێت، وە هەرکەسیش خێرێکی پێدراو، پێوە نەبینرا، ئەوا بەناخۆشەویستی خواو، دوژمنی نیعمەتەکانی خوای _ عزَّوجلَّ _ ناودەبرێت.

ئەو خۆراك کەمکردنەوە لەڕادە بەدەرەی کە شەرع قەدەغەی لێکردووین، لە صوفیەکانی زەمەنی خۆماندا پێچەوانە بۆتەوە، بۆیە هەموو هیمەتیان بۆ خواردن ئاڕاستە کردووە، وەکو چۆن هیمەتی پێشانیان بەرەو برسێتی ئاڕاستەکرابوو.

ژەمی بەیانیان و ئێواران حەلوایان هەیەو، هەموو ئەوانە یاخود زۆربەیان بەهۆی ماڵ وسامانێکی پیسەوە بەدەست هێناوە.

وازیان لە کەسابەتی دونیا هێناوەو، ڕوویان لەپەرستنەکانیش وەرگێڕاوە، نوێنی بێکاریان ڕاخستوەو، زۆربەیان هیمەتیان بۆ هیچ شتێك ئاڕاستە نەکردووە، مەگەر بۆ خواردن و یاری کردن.

---

٣٩١ _ رواه الترمذي (٢٨٢٠) عن عبدالله بن عمرو، وقال:
((حديث حسن)).
وهو كما قال.

كەسانێکیانم بینیوە کە ئەگەر ئامادەی زیافەتێك ببێ، زێدەڕۆیی لە خواردندا دەکـات و، پاشان لە خواردنەکان هەڵدەبژێرێ، ڕەنگە بـەبێ مۆڵـەتی خـاوەن مـاڵ سەرقۆڵەکانیـشی پـڕ بکات، بە کۆڕایی زانایان ئەم ڕەفتارە حەرامە.

شێخێکیانم بینی کەمێك خواردنی برد، بۆ ئەوەی بۆ ماڵـەوەی هـەڵگرێت، بـەڵام خـاوەن ماڵەکە ڕاپەری و لێی سەندەوە.

## ✸ باسی سەرلێشێواندنەکانی ئیبلیس بەرامبەر بەصوفیەکان لە بواری گوێگرتن و سەماکردن و سۆزدا :

نووسەر دەفەرمێت:

بزانە گوێگرتن لە گۆرانی دوو شت کۆدەکاتەوە:

یەکەمیان: دڵ خەریك دەکات و، ناهێڵێت بیر لە گەورەیی خوای تعالی بکاتەوەو، پەرستنەکانی بۆ ئەنجام بات.

دووەم: مەیلی بەرەو ئارەزوواتی هەنووکەیی ئاراستە دەکات، کە بانگی دەکات بۆ ئەوەی لە سەراپایی شەهوەت و ئارەزووە هەستیەکانەوە بەدەستی بێنێت، کە زۆربەی جووتبوونە، تەواوی چێژەکەشی تەنها لە نوێبوونەوەکاندایە (المتَجَدِّدات)، هیچ ڕێگەیەکیش نییە بۆ بەدەستهێنانی زۆریی نوێبوونەوەکان (المتَجَدِّدات) بەحەڵاڵیی، بۆیە هانی داوێن پیسی دەدات.

گۆرانی و داوێن پیسی سازان وگونجانیان لە نێواندایە، لەو ڕووەوە کە گۆرانی چێژی ڕووحەو، داوێن پیسی گەورەترین چێژی نەفسە، هۆی ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە چێژوەرگرتن لە شتێك هانی مرۆڤ دەدات بۆ چێژوەرگرتن لە شتێکی تری جگە لە خۆی، بەتایبەت ئەو شتەی لە گەڵیدا دەسازێت و دەگونجێت.

کاتێ ئیبلیس نائومێدبوو لە خواپەرستانەوە گوێبیستی شتێك لە دەنگی حەرام بێت وەکو ئامێری عود، تەماشای ئەو مانایەی کرد کە بەهۆی ئامێری عودەوە دەستگیر دەبێ، بۆیە لە چوارچێوەی ئەو گۆرانیانەدا بۆی تۆمارکردن کە بەبێ ئامێری عود دەگوترێ و، بۆشی ڕازاندنەوە.

لەڕاستیدا مەبەستی ئیبلیس تەنها ئەوەیە پلە بە پلە حەرامەکانیان بۆ بڕازێنێتەوە، وە فیقهزان ئەو کەسەیە کە تەماشای هۆیەکان و ئەنجامەکان دەکات و، بیر لە مەبەستەکان دەکاتەوە(٣٩٢).

---

٣٩٢ _ ئەمە بناغەیەکی (قاعدة) زۆر گرنگە.

وەکو ئەوەی کە تەماشاکردنی لاوی نێرینەی لووسکە ڕێپێدراوە، بە مەرجێك مرۆڤ لە نەهەژینی شەهوەت و ئارەزوو دڵنیابێ، بەڵام ئەگەر دڵنیانەبوو، تەماشاکردنی جایز نییە.

وە ماچکردنی کچی منداڵی تەمەن سێ ساڵ جایزە، چونکە بەزۆری شەهوەت و ئارەزووی تێدا نابێ، بەڵام ئەگەر هەستی بەشەهوەت ئارەزوو کرد، حەرام دەبێ.

هەروەها تاك بوونەوە لە گەڵ ژنانی مەحرمدا، ئەگەر ترسی ئەوانەی تێدا بوو، حەرام دەبێ.

بۆیە بیر لەم بناغە (قاعدة) بکەرەوە.

## ✹ ڕای صوفیەکان سەبارەت بەگۆرانی:

نووسەر دەفەرمێت:

خەڵك سەبارەت بەگۆرانی ڕای جیاوازیان گوتوەو، بەدرێژی لەو بارەیەوە دواون :

کەسانێکیان بە حەرامیان داناوە.

کەسانێکیان ڕێیان پێداوە، بەبێ کەراهەت.

کەسانێکیشیان بە مەکروهیان داناوە لەگەڵ ڕێپێدراویدا.

بەڵام بۆ گوفتاری جیاکەرەوە دەڵێین: پێویستە تەماشای بنچینەی شتەکە بکرێت، پاشان حوکمی حەرامێتی یاخود مەکروهی یا شتی تری بەسەردا دەدرێت.

گۆرانیش ناوێکەو بۆ چەند شتێك بەکاردێت:

لەوانە گۆرانی حاجیەکانە لە ڕێگاوبانەکاندا، چونکە خەڵکێکی عەجەم بۆ حەج دێن و، لەڕێگەوبانەکاندا دەنگ بەرز دەکەنەوەو، لە وەسفی کەعبەو زەمزەم و مەقامدا شیعر دەخوێننەوە ، گوێبیستبوونی ئەو شیعرانە ڕێپێدراوە، دەنگ بەرزکردنەوەیان بەو شیعرانە هیچ هەژان و خرۆشانێکی نەفس دروست ناکات، بەجۆرێك لە نێوەنجێتی بچێتە دەرەوە.

ئەوانەی هەمان حوکم دەیانگرێتەوە: غەزاکارەکانن، ئەمانە بەدەنگی بەرز شیعر دەخوێننەوەو، هانی خەڵکی پێ دەدەن بۆ غەزا.

هەروەها ئەو زۆرانبازو شمشێربازانەی کە بۆ جەنگان بەدەنگی بەرز شیعر دەخوێننەوە، لە کاتی دەستەویەخە بووندا.

هەروەها شیعری وشترەوانان لە ڕێگەی مەککەدا، وەکو ئەوەی کە کەسێکیان گوتویەتی:

بَشَّرَها دليلُها وقـالا

غداً تَرَين الطَّلْحَ والجِبَالا.

واتە: ڕێنیشاندەرەکەی مژدەی دایەو گوتی

سبەینێ درەختی (الطَّلْحَ)ی گەورەی دڕکاوی و چیا دەبینی.

ئەم جۆرە شیعر خوێندنەوەیە وشترو ئادەمیش دەجولێنێ، بەڵام ئەو جوڵاندنە هیچ هەژانو خرۆشانێكی نەفسی لەگەڵدا نابێ، بە ئاستێك لە نێوەنجێتی بچێتە دەرەوە.

نووسەر دەفەرمێت:

پێغەمبەری خوا _ صلی الله علیه وسلم _ وشترەوانێكی هەبوو پێی دەگوترا: (أَنْجَشَةُ)، كە شیعری دەخوێندەوە وشترەكان لە ڕۆشتنندا خێرا دەبوونەوە، بۆیە پێغەمبەری خوا _ صلی الله علیه وسلم _ فەرمووی: ((ئەی (أَنْجَشَةُ) ! لە سەرخۆ وشتری شووشەكان لێبخوڕە))(٣٩٣).

وفي حديث سلمةَ بن الأكوع قال: خرجنا مع رسول الله _ صلى الله عليه وسلم _ إلى خيبر فَسِرْنا ليلاً، فقال رجلٌ مِن القومِ لعامِرِ بنِ الأكوعِ: ألا تُسْمِعُنَا مِن هُنَيَّاتِك ؟ وكان عامرٌ رجلاً شاعراً، فنزلَ يَحْدُو بالقولِ " يقولُ:

لاهُمَّ لولا أَنْتَ ما اهْتَدَيْنا
ولا تَصَدَّقْنا ولا صَلَّيْنَا
فألْقِيَنْ سَكِينَةً علينا
وَثَبِّتِ الأقدامَ إنْ لاقَيْنَا

فقال رسول الله _ صلى الله عليه وسلم _: ((مَن هذا السائِقُ ؟))

قالوا: عامِرُ بنُ الأكْوَعِ.

فقالَ: ((يرْحَمُهُ الله))(٣٩٤).

---

٣٩٣ _ وشتری شووشەكان: واتە وشتری ئافرەتەكان چونكە پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ چواندونیەتی بەشووشە لەبەر لاوازی ئارامگرتن و خۆڕاگریان بەرامبەر بەرووداوەكان، یاخود مەبەستی ئەوەبوو كە نەوەكا شیعرە ناسك و گۆرانیەكەی (أَنْجَشَةُ) كاریان تێبكات، هەروەها گوتراوە چونكە وشتر ئەگەر شیعرو گۆرانی وشتراونی بیست ڕێكردنی خێرا دەبێتەوەو، دەبێتە هۆی ماندووكردنی ئەو كەسەی سواری بووە، بڕوانە: لسان العرب. وەرگێڕ.

٣٩٤ _ رواه البخاري (٦١٤٨) عن سلمةَ بن الأكوع.

واتە: لە فەرموودەکەی (سلمةَ)ی کوڕی (الأکوع)دا هاتووە دەفەرمێت: لەخزمەتی پێغەمبەری خوادا _ صلى الله علیه وسلم _ چووینە دەرەوە بۆ (خیبر)و بەشەو ڕێمان کرد، ئەوەبوو پیاوێك لە قەومەکە بە (عامِر)ی کوڕی (الأکوع)ی فەرموو: ئەوەبۆ گوێبیستی هەندێ لە گوفتارو شیعرەکانی خۆتمان ناکەی؟ (عامِر)یش شاعیر بوو، بۆیە دابەزی و بەدەنگێکی بەرزی خۆش شیعری وشترەوانیی دەخوێندەوەو، دەیفەرموو:

پەروەردگارا ئەگەر تۆ نەبوایەی ڕێنوێنیی ڕێگەی ڕاست نەدەکراین

وە نەخێرو صەدەقەمان دەکردو نەنوێژیشمان دەکرد

کەوابوو دڵئارامیمان پێ ببەخشەو

پێمان جێگیر بکە ئەگەر ڕوو بە ڕووی دوژمن بوینەوە

پێغەمبەری خوا _ صلى الله علیه وسلم _ فەرمووی: ((ئەم کەسە کێ یە کە وشترەکان لێدەخوڕێت ؟))

فەرموویان: (عامِر)ی کوڕی (الأکوع)ە.

فەرمووی: ((خوا ڕەحمی پێ بکات)).

لە پێشەوا (الشافعي)وە _ خوای لێ ڕازی بێت _ باسیان بۆ کردوین کە فەرموویەتی: بەڵام گوێبیستبوونی شیعری وشترەوانان و شیعری دەشتەکیەکان بەدەنگی بەرزی خۆش، هیچی تێدا نییە.

هەر لە چوارچێوەی ئەم ڕەگەزەوە شیعریان بەدەنگی بەرزی خۆش لە مەدینە دەخوێندەوەو، پێدەچێ (٣٩٥) لە گەڵێدا دەفیشیان لێدایە.

---

٣٩٥ _ بەدوو مەرج: أ _ بۆ ژنان بێ. ب _ لە بۆنەکانی هاوسەرگیریی یاخود جەژنەکاندا بێ.

بەشێکی کورتیشم سەبارەت بەلێدانی (الدُّف) نووسی لە ژێر ناونیشانی: ((تیسیر العزیز الحمید في حکم الدُّف المستعمل مع الأناشید))، کە لە گۆڤاری زانکۆی سەلەفی لە هندو، لە گۆڤاری (المجتمع)ی کوێتی بڵاوکرایەوە.

پاشان فراوانم کردو، بەدرێژی باسم لێوە کرد لە بەشێکی تاکدا بەناونیشانی: ((الجواب السدید لمن سأل عن حکم الدفوف والأناشید))، خوای تعالى تەواوکردن و بڵاوکردنەوەیم بۆ ئاسان بکات.

ومنه ما رَوَتْهُ عَائِشَةَ _ رضي الله عنها _ أَنَّ أَبَا بَكْرٍ دَخَلَ عَلَيْهَا وَعِنْدَهَا جَارِيَتَانِ فِي أَيَّامَ مِنًى ، تَضْرِبَانِ بِدُفَّيْنِ، وَرَسُولُ اللَّهِ - صلى الله عليه وسلم - مُسَجّى عليهِ بِثَوْبِهِ، فَانْتَهَرَهُمَا أبوبكرٍ ، فَكَشَفَ رَسُولُ اللَّهِ - صلى الله عليه وسلم - عَنْ وَجْهِهِ، وَقَالَ: ((دَعْهُنَّ يَا أَبَا بَكْرٍ ! فَإِنَّهَا أَيَّامُ عِيدٍ))(٣٩٦).

واته هەروەها ئەوەی کە خاتوو (عَائِشَة) _ خوای لێ ڕازی بێت _ دەیگێڕێتەوە: کە (أبابَكْرٍ) چۆتە دیدەنی و هاوکات دوو کچۆڵەی لابووە لە ڕۆژانی جەژنی قورباندا و لە ڕۆژانی (مِنىً)دا، هەردوکیان دوو دەفیان لێدەداو، پێغەمبەری خواش _ صلى الله عليه وسلم _ بەپۆشاکەکەی داپۆشرابوو، (أبابَكْرٍ) پێیاندا هەڵشاخی، پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ پۆشاکەکەی لەسەر ڕووی موبارەکی لاداو، فەرمووی: (((أبابَكْرٍ) وازیان لێ بێنە ! ئەم ڕۆژانە ڕۆژانی جەژنە)).

نووسەر دەفەرمێت:

وادەردەکەوێت ئەم دوو کچە منداڵ بوون (٣٩٧)، چونکە خاتوو (عَائِشَة) _ خوای لێ ڕازی بێت _ منداڵ بوو، پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ کچۆڵەی بۆ دەکردە ژوورەوەو، پێکەوە یاریان دەکرد.

نووسەر دەفەرمێت:

لە ڕوانگەی ئەوەوە کە باسمان کرد ئەو گۆرانیەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە دەیانگوت، لەوە نەبوو کە هەژان و خرۆشانی نەفس دروست بکات، دەفەکانیشیان وەکو ئەم دەفانەی ئەمڕۆ نەبوو.

---

٣٩٦ _ رواه البخاري (٢ / ٤٤٥)، ومسلم (٣ / ٢١).

وانظر زيادةً في تخريجه وبيان زياداته في ((تخريج الأربعين السلمية)) (رقم ٣٩) للسخاوي _ بتحقيقي.

٣٩٧ _ ويؤيد هذا الوجه المعنى اللغويّ لـ ((الجارية))، فهي صغيرة السن.

وانظر تعليقي على جزء ((تنوير العينين في طرق حديث أسماء في كشف الوجه والكفين)) (ق١١) بقلمي، ففيه زيادة.

هەروەها ئەو شیعرانەی کە زاهیدان بەدەنگی بەرزی خۆش دەیخوێننەوە، هانی دڵان دەدات بۆ بەیادهێنانەوەی ڕۆژی دوای و، بەزوهدیاتی ناو دەبەن، وەکو ئەوەی کەسانێکیان دەڵێن:

يا غَادِياً فِي غَفْلَةٍ وَرائِحـاً
إلى مَتى تَسْتَحْسِنُ القَبائِحا
وكَمْ إلى كَمْ لا تخافُ مَوْقِفاً
يَسْتَنْطِقُ اللهُ بِـهِ الجوارِحَـا
يا عَجَباً مِنْكَ وأَنْتَ مُبْصِرٌ
كيفَ تَجَنَّبْتَ الطريق الواضِحا

واتە:

ئەی ئەو کەسەی بەبێ ئاگا دێیت و دەچی
تاوەکو کەی کردەوە ناشیرینەکان بەچاك دادەنێی
وە تاوەکو چەند لە بارو هەڵویست ناترسێی
کاتێ خوای تعالی ئەندامەکانی لەشت لێ دەهێنێتە قسەکردن
ئای کە جێگەی سەرسوڕمانیت کە دەبینی و
چۆن لە ڕێگای ئاشکرا دوردەکەویتەوە

پێشەوا (أحمدُ)ی کوڕی (حنبلٍ) ئاماژەی بۆ ڕێپێدراوێتی شتێکی وەکو ئەوە کردوە، (عَبْدوسُ) دەڵێ: گوێبیستی (أباحامدِ الخُلْقانيَّ) بووم بە پێشەوا (أحمدُ)ی کوڕی (حنبلٍ)ی دەگوت: ئەی (أباعبدالله) ! ئەم شیعرە ناسکانەی کە دەربارەی بەیادهێنانەوەی بەهەشت و ئاگر دەگوترێت، چ شتێکی لەبارەوە دەڵێی؟ فەرمووی: وەکو چ شیعرێك ؟ گوتی: دەڵێن:

إذا ما قــــالَ لي رَبِّي     أما اسْتَحْيَيْتَ تَعْصِني
وتُخْفي الذَّنبَ مَن خَلْقي     وبِــالعِصْيــانِ تَأتِيِنِي

واتە: ئەگەر پەروەردکارم پێی گوتم   ئایا شەرم ناتگرێ کە سەرپێچم دەکەی
تاوان لە بەدیهێنراوانم دەشاریتەوەو   بەسەرپێچیەوە بۆ لام دێی.

فەرمووی: دوبارە بۆم بیخوێنەرەوە. منیش دوبارە بۆم خوێندەوە، ئەوەبوو هەستاو، چووە ماڵەکەی خۆیەوەو، دەرگاکەی پێوەداو، گوێبیستی بووم بەدەنگی بەرز لە ماڵەوە دەگریاو دەیفەرموو:

إذا ما قـــالَ لي رَبِّي أَما اسْتَحْيَيْتَ تَعْصِني
وتُخْفي الذَّنبَ مَـن خَلْقي وبـالعِصْيـــانِ تَـأتِيْنِي

بەڵام ئەو شیعرانەی کەسانی شیوەن و گریانکەر دەیڵێن و، خەم وخەفەت و گریانی پێ دەجوڵێنێنن، قەدەغەی لێ دەکرێت، لەبەر حەرامێتی شیوەن وگریان و، لەبەر ئەو وشەو دەستەواژە حەرامانەی بەکاریدێنن.

جۆرێکی دیکەی شیعر گوتن: شیعری گۆرانی ئەو گۆرانی بێژانەیە کە یەکلابونەتەوە بۆ گۆرانی گوتن و، وەسفی شتە پەسەندکراوەکان و، مەی و، شتی دیکەی تێدا دەکەن، هەستی مرۆڤ دەجوڵێنێ و، لە نێوەنجێتی دەیباتە دەرەوە، ناوەڕۆکی مرۆڤ بۆ حەزپێکردنی ئارەزوو و ڕابواردن دەهەژێنێ و، بریتیە لەو گۆرانیە ناسراوانەی ئەم زەمەنە، وەکو ئەم شاعیرە کە دەڵێت:

ذَهَبِيُّ اللونِ تَحْسَبُ مِن
وجْنَتَيْهِ النَّـارُ تَقْتَدحُ
خَوَّفُونِي مِن فَضِيحَتِـهِ
لَيْتَهُ وافى وأَفْتَضِـحُ

واتە: ڕەنگی زێڕینە وادەزانی
گۆناکـــانی ئاگر دەکاتەوە
لە ئابڕوچوون ترســــاندمیان
خۆزگە بهاتباو ئاشکرا بوایەم

بۆ ئەم گۆرانیانە چەندین ئاوازی جۆراوجۆریان داناوەو، هەر هەمووی بیسەر لە بواری نێوەنجێتی دەباتە دەرەوەو، ناوەڕۆکی بەرەو ئارەزوو و ڕابواردن دەهەژێنێ(٣٩٨).

شتێکیان هەیە ناویان ناوە (البَسیط)(٣٩٩)، بەشێنەیی دڵان بێزار دەکات، پاشان بەدەنگی بەرز شیعرو سروود دەڵێنەوە، دەنگە دەنگ و هەرایەك دروست دەکەن، کە دڵانی پێ ناحەوێتەوە.

لێدانی (القضیب)یشیان(٤٠٠) بۆ زیاد کردوە، کە بە ئیقاعێکی تایبەت بەگوێرەی شیعر خوێندنەوەو گۆرانیەکە لێ دەدرێ، هەروەها دەفی زرزرەدارو، شمشاڵ لە جێگەی زوڕناش لێ دەدەن، ئەمە گۆرانی ناسراوی ئەمڕۆیە.

نووسەر دەفەرمێت:

پێش ئەوەی سەبارەت بەرێپێدراوێتی، یاخود حەرامێتی، یاخود کەراهەتی ئەم جۆرە گۆرانیە بدوێین، دەڵێین:

پێویستە کەسی وشیاری ئاقڵ ئامۆژگاریی خۆی و براکانیشی بکات و، وریای سەرلێشێواندنەکانی ئیبلیس بێت، بەوەی ئەم جۆرە گۆرانیە خرۆشێنەرە بەرێرەوی بەشە ڕێپێدراوەکانی پێشەوەدا تێنەپەڕێنێت کە گۆرانیان پێ دەڵێن، هەمووی بەیەك شێوە لێك نەداتەوەو، بڵێت: فڵان کەس ڕێی پێداوەو، فڵان کەس بە مەکروهی داناوە.

باسەکەمان بە ئامۆژگاری نەفس و برایان دەست پێ دەکەین:

زانراوە خووی ئادەمیەکان لەیەکترەوە نزیکن و، بەکەمی جیاوازن، بۆیە ئەگەر لاوێکی جەستە ساغ، میزاج تەندروست بانگەشەی ئەوە بکات کە شتە پەسەندکراوەکان بێزاری

---

٣٩٨ _ نووسەر _ بەرەحمەتی خوا بێت _ ئەگەر گۆرانیەکانی زەمەنی ئێمەی گوێبیست بوایە، کە وەسفی گۆناو، باسی قەدی تێدا دەکرێت، دڵنیابن بۆ ڕۆڵەی باپیران ڕەحمەتی دەنارد ؟!

٣٩٩ _ جۆرێك بووە لە گۆرانیەکانی ئەو سەردەمە.

٤٠٠ _ القضیب: دوو دارە لە درەختی ئەبنوس دروست دەکرێت درێژی هەر یەکێکیان دوو باڵ ونیوە بەلێدانی یەکێکیان بەوی تردا دەنگیان دەبیسترێت، بڕوانە: المشتولي، سلوة الأحزان للأجتناب عن مجالسة الأحداث والنسوان، ص٣٥٠ وەرگێڕ.

ناکاتو، بەلایەوە هیچ کارتێکەریەك دروست ناکات و، بۆ ئاینەکەی هیچ زیانێکی نابێ، بەدرۆی دەخەینەوە، چونکە دەزانین خووی رێك و بەرانبەر ئەوەیە کە ئەو شتانە کاری تێدەکات.

ئەگەر بۆشمان روون بویەوە گوفتارەکەی راستە، یەکسەر دەزانین نەخۆشیەکی هەیەو لە نێوەنجێتی چۆتە دەرەوە.

ئەگەر بیانووی هێنایەوەو، گوتی: لەراستیدا تەماشای شتە پەسەندکراوەکان دەکەم تەنها بۆ پەند وەرگرتن، چونکە سەرم سوردەمێنێ لە چاکێتی و جوانێتی دروست کردنی گەورەیی و رەشێتی چاو و، باریکی و تەنکی لووت و، سپێتی پوخت !

پێی دەڵێین: شتە رێپێدراوە هەمەچەشنەکان بەسە بۆ پەند وەرگرتن، ئالێرەدا مەیلی خوو میزاجت خەریکت دەکات و ناهێڵێت بیر بکەیتەوە، وە بۆ ئەوەی بە شەهوەت و ئارەزووەکانت بتگەیەنێ، ناهێڵێت بیرکردنەوە بوونی هەبێ، چونکە مەیلی خوو و میزاج دەتخەڵەتێنێ و چەواشەت دەکات.

هەروەها ئەو کەسەی دەڵێت: ئەم گۆرانیە هەژێنەرە بێزارکارەی خوو و میزاج، کە هۆکاری جوڵاندنی خوو و میزاجە بۆ عیشق و خۆشەویستنی دونیا، کارم تێناکات و، ئاور بەدڵم ناداتەوە بۆ خۆشەویستنی ئەو دونیایەی تیایدا وەسف کراوە.

بەدرۆی دەخەینەوە، لەبەر هاوبەشایەتی و هاوشێوایەتی خوو و میزاجەکان، پاشان ئەگەرچی ئەو دڵەشی کە پڕە لە ترسانی خوای _ عزَّوجلَّ _ لە هەواو ئارەزووە دوربێ، بەدڵنیایی بیستنی ئەو شتانە خوو و میزاجی راکێشتی لای خۆی دەکات، با دوورکەوتنەوەی لە سەفەری ترسانی خوادا درێژەشی کێشابێ.

وە ناشیرینی ناشیرینەکان پووچی و درۆکردنە.

پاشان پووچی و درۆکردن چۆن بەسەر زاتێکدا تێدەپەرێت کە نهێنی وشاراوەکان دەزانێ ؟!

پاشان ئەگەر شتەكە بەو جۆرەش بیٚ كە ئەم صۆفیە بانگەشەی بۆ دەكات، پێویستە ڕێی پیٚ نەدەین مەگەر بۆ ئەو كەسانەی كە ئەمە سیفەتیانە، بەڵام قەومەكە بەرەهایی ڕێیان پیٚ داوە بۆ لاوی دەستپێكارو، منداڵی نەفام، تا ئەو ئاستەی (أَبوحامدِ الغَزَّاليُّ) دەڵێت:

بەڕاستی هۆنراوەی خۆشەویستی كە وەسفی گۆناو، چەناكەو، جوانی قەدو باڵاو، هەموو وسفەكانی دیكەی ژنانی تێدایە، ڕاست ئەوەیە كە حەرام نییە !!

نووسەر دەفەرمێت:

بەڵام ئەو كەسەی دەڵێت: من بۆ دونیا گوێبیستی گۆرانی نابم، لەڕاستیدا تەنها چەند ئاماژەیەكی لیٚ وەردەگرم، ئەم كەسە لە دوو ڕۆوە بەهەڵەدا چووە:

یەكەمیان: خوو و میزاج دەستپێشكەر دەبیٚ و بۆ مەبەستەكانی دەچیٚ پێش وەرگرتنی ئەو ئاماژانە، بۆیە نموونەی وەكو ئەو كەسە دەبیٚ كە دەڵێت: من تەماشای ئەم ژنە جوانە دەكەم، بۆ ئەوەی بیر لە جوانی دروستكردنی بكەمەوە.

دووەم: ئەو شتانەی تێدا دەگمەنە بۆ ئەوەی ئاماژەی پیٚ بكرێت بۆ خوای خولقێنەر، بەڕاستی خوای تعالی زۆر لەوە گەورەترو شكۆمەندترە كە پێی بگوترێت: عیشقی دەكرێت و، لەو عیشقەدا مرۆڤ شەیداو سەرگەردان دەبیٚ، لەڕاستیدا بەشی ئێمە لە ناسینی خوای پەروەردگاردا تەنها ترس و هەیبەت و بەگەورەدانانە.

لێرەدا ئامۆژگاریەكە تەواو بوو، ئینجا باسی ئەوە دەكەین كە دەربارەی گۆرانی گوتراوە:

بەڵام ڕێباوەڕی پێشەوا (أَحمَدَ) _ بەڕەحمەتی خوا بێت _:

گۆرانی لە زەمەنی ئەودا خوێندنەوەی شیعری زوهد بوو، بەڵام لەبەر ئەوەی بەئاوازەوە دەیانخوێندەوە، ئەو (ریوایە)تانەی لەوەوە باسكراون جیاوازبوون:

(عبدُاللهِ)ی كوڕی لێوەی دەگێڕێتەوە كەوا فەرموویەتی: گۆرانی نیفاق و دووڕوویی لە دڵدا دەچێنێت، حەزی لیٚ ناكەم.

(إسماعيلُ)ی کوڕی (إسحاقَ الثَّقفيُّ) دەگێڕێتەوە کەوا سەبارەت بە گوێبیستبوونی قەسیدە لێیان پرسی ؟ ئەویش فەرمووی:

حەزم لێ ناکەم، ئەوە بیدعەیە، دانیشتنیان لەگەڵدا ناکرێت.

(أبوالحارثِ) لێوەی دەگێڕێتەوە کەوا فەرموویەتی: (التَّغبيرُ)(٤٠١): بیدعەیەو، داهێنراوە.

(يعقوبُ)ی کوڕی (بُخْتَان) لێوەی دەگێڕێتەوە کەوا فەرموویەتی: حەزم بە (التَّغبيرُ) نییە، وە قەدەغەی کردووە مرۆڤ گوێبیستی بێت.

نووسەر دەفەرمێت:

هەموو ئەو (ریوایە)تانە بەڵگەی (کراهە)ت و نەویستراوێتی گۆرانیە.

(أبوبكرِ الخَلَّال) دەڵێت: پێشەوا (أحمدُ) حەزی بە هۆنراوە نەبوو کە بەئاوازەوە بخوێنـدرێت، چونکە پێی گوترا: ئەو کەسانە گوێ بەهیچ نادەن و هەموو گوفتارو کردارێك دەکەن.

پاشان هەندێ گوفتاریان لێوە گێڕاوەتەوە پەنجە ڕادەکێشێت بۆ ئەوەی کە ئاسـایەو هیـچی تێدا نییە.

(المروزيُّ) دەڵێت: سەبارەت بەهۆنراوە کە بەئاوازەوە بخوێندرێت لە (أباعبـدِاللهِ)م پرسـی ؟ ئەوەبوو فەرمووی: بیدعەیە. پێم گوت: هەجریان بکـەین ولێیـان دورکەوینـەوە ؟ فـەرمووی: نایانگەیەنێت بەو ئاستەی هەموو ئەوانەیان بەرامبەر بکرێت(٤٠٢).

نووسەر دەفەرمێت:

باسیان بۆ کردوین کەوا پێشەوا (أحمدُ) گوێبیستی گۆرانی بیژێك بوو لای (صالحِ)ی کوڕی، بەڵام نکوڵیی لێنەکرد، بۆیە (صالحِ)یش پێی فەرموو: بابە ! پێشتر نکوڵیـت لەمـە دەکـرد ؟ فەرمووی: لەڕاستیدا پێیان گوتم: گوفتـارو کـرداری ناپەسـەندی تێـدا بـەکاردێنن، بۆیـە بـە (مكروه)م دانا، بەڵام ئەمە، بە (مكروه) دانانێم.

---

٤٠١ _ التغبير: (لا إله إلا الله)کردن و خوێندنەوەی شتی تر بەدەنگی بـەرزی بـەئاوازەوە. ((القـاموس)) (٥٧٦).

٤٠٢ _ انظر جزء ((اتِّباع السنن واجتناب البدع)) (ص٧٣و٨٩) للضياء المقدسي.

دەڵـێم _ ابـن الجـوزي _: هاوەڵانـان لـە (أبـوبكرِ الخَلّـال) و (عبـدالعزيزِ)ی هاوەڵیـەوە ڕێپێدراوێتی (إباحـة) گۆرانی دەگێڕنەوە، لەڕاستیدا هەردوکیان پەنجـەیان ڕاکێـشاوە بـۆ ئـەو هۆنراوە زوهدیانەی کە بەئاوازەوە لە زەمەنی ئەوانـدا دەخوێندرایـەوە، ئـەوەش کـە پێـشەوا (أحمدُ) بە (مکروه)و نەویستراوی دانەناوە دیسان لەو بوارەدا بووە.

بەڵگە بۆ ئەو گوفتارەم ئەوەیە کە لە پێشەوا (أحمدَ)ی کوڕی (حنبلٍ)یان پرسـی سـەبارەت بەپیاوێك مردو و کوڕێك و کەنیزەکێکی گۆرانی بێـژی لـە پـاش خـۆی بـەجێهێڵا، کوڕەکـە پێویستی بوو کەنیزەکەکە بفرۆشێت ؟ ئەوەبوو فەرمووی: نافرۆشرێت بەوەی کە گۆرانی بێـژە. پێی گوترا: ئەگەر وەکو گۆرانی بێژ بفرۆشرێت نرخی سـیی هـەزار دیرهەمـەو، ئەگـەر وەکـو گۆرانی بێژیش نەفرۆشرێت ڕەنگە بیست دینـار بکـات. فـەرمووی: نافرۆشـرێت بـەوەی کـە گۆرانی بێژە.

نووسەر دەفەرمێت:

لەڕاستیدا ئەوەی فەرموو چونکە کەنیزەکەکە بـەهۆنراوەی زوهـدیات گـۆرانی نـەدەگوت، بەڵکو بەشیعری هەژێنەر گۆرانی دەگوت کە خووی مرۆڤـی بـەرەو عیـشق دەوروژان، ئەمـە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە گۆرانی قەدەغەیە، چونکە ئەگەر قەدەغە نەبوایە، مۆڵەتی نـەدەدا بەوەی ماڵ وسامانەکە لەدەست هەتیوەکە بچێت.

(المروزيُّ) لە پێشەوا (أحمدَ)ی کوڕی (حنبلٍ)ەوە دەگێڕێتـەوە، فەرموویـەتی: دەسـتکەوتی کەسی نێرەمووك (المُخَنَّث) پیسە، بەهۆی گۆرانیەوە پەیدای دەکات.

ئەمە لەبەر ئەوەیە کە کەسـی نێرەمـووك بـەهۆنراوەی زوهـدی گـۆرانی ناڵێـت، بـەڵکو بەهۆنراوەی خۆشەویستی، یاخود شیوەن گۆرانی دەڵێت، کەوابوو لە کۆی هـەموو ئەمانـەوە دەرکەوت کە هەدوو (ریوایە)تەکـە لـە پێـشەوا (أحمـدَ)ەوە سـەبارەت بـە (کراهـە)تـی و نـا (کراهە)تی پەیوەندە بە زوهدیاتی ئاوازدارەوە، بەڵام گۆرانی ناسراوی ئەمڕۆی بەلاوە قەدەغـە بووە.

ئەی ئەگەر ئەو زیادانەی بزانیبا کە خەڵکی دایانهێناوە هەڵوێستی چ دەبوو ؟!

بەڵام ڕێباوەڕی پێشەوا (مالك)ی كوڕی (أنس) _ بەڕەحمەتی خوا بێت _:

لە (إسحاقَ)ی كوڕی (عیسى الطَّبّاع)ەوە دەڵێت: لە پێشەوا (مالك)ی كوڕی (أنس)م پرسی دەربارەی ئەو گۆرانیانەی كە خەڵكی مەدینە ڕێی پێ دەدەن ؟ ئەوەبوو فەرمووی:

لەڕاستیدا تەنها دەرچووان لەڕێگەی هەق و ڕاستی (الفساق) ئەنجامی دەدەن.

لە (أبي الطَّیِّبِ الطَّبَريِّ)ەوە، دەڵێت: بەڵام (مالك)ی كوڕی (أنس)، ڕێگریی لە گۆرانی گوتن و گوێبیستبوونی كردووەو، دەڵێت: ئەگەر مرۆڤ كەنیزەكێكی كڕی و، تەماشای كرد گۆرانی بێژە، بۆی هەیە بیگەڕێنێتەوە، بەو عەیبەی كە تێیدایە. ئەمە ڕێباوەڕی هەموو خەڵكی مەدینەیە، جگە لە (إبراهیمَ)ی كوڕی (سعدٍ) بەتەنها، چونكە (زكریَّا الساجِيُّ) دەگێڕێتەوە كەوا لای وابوو ئاسایەو هیچی تێدا نییە.

بەڵام ڕێباوەڕی پێشەوا (أبي حنیفة) _ خوای لێ ڕازی بێت _:

لە (أبي الطَّیِّبِ الطَّبَريِّ)ەوە، دەڵێت: (أبو حنیفة) گۆرانی بەلاوە (مكروه)و نەویستراو بووە لەگەڵ ڕێدانی بەخواردنەوەی (النبیذِ)(٤٠٣)، گوێبیستبوونی گۆرانی بەتاوان دادەنا.

دەڵێت: ڕێباوەڕی هەموو خەڵكی كوفە وەكو (إبراهیمَ)و، (الشَّعبيِّ)و، (حمَّادٍ)و، (سُفیانَ الثوريِّ)و، كەسانی تری جگە لەوانەش هەر بەو جۆرەیەو، لەو بارەوە هیچ جیاوازییەكیان لە نێواندا نییە.

دەڵێت: نەزانراوە خەڵكی بەصرە جیاوازیان تێدا بێ سەبارەت بە (مكروه)و نەویستراوێتی ئەو شتەو، قەدەغەكردنی، بەدەر لەوەی كە لە (عُبیدِاللهِ)ی كوڕی (الحسنِ العنبريِّ)ەوە گێڕدراوەتەوە كەوا بەلایەوە ئاسایی بووەو هێچی تێدا نەبووە.

بەڵام ڕێباوەڕی پێشەوا (الشافعيِّ) _ بەڕەحمەتی خوا بێت _:

---

٤٠٣ _ النبیذ: بریتیە لە خورما یاخود ترێ و ئاو لە نێو دەفرێكدا تێكەڵ دەكرێت، بۆئەوەی ببێ بە شەربەت، سودێكی زۆری هەیە بۆ زیادكردنی هێزو پاراستنی تەندروستی، پێغەمبەری خوا _ صلى الله علیه وسلم _ پاش سێ نەیدەخواردەوە نەوەكا گۆڕابێ و سەرخۆش بكات. بڕوانە: علي بن نایف الشحود، موسوعة الدفاع عن رسول الله _ صلى الله علیه وسلم _. وەرگێڕ.

لە (الحسنِ)ی کوڕی (عبدِالعزیزِ الجَرَوِيَ)وە دەڵێت: گوێبیستی (محمدَ)ی کوڕی (إدریسَ الشافعيٌ) بووم دەیفەرموو:

لە عێراق شتێکم بەجێهێشت زیندیق و خوانەنساکان دایانهێنابوو، ناویان نابوو (التَّغبیرَ)، خەڵکیان پێ خەریك دەکرد بۆ ئەوەی ئاوڕ لە قورئان نەدەنەوە(٤٠٤).

نووسەر دەفەرمێت:

(أبومنصورِ الأزهريُّ) بەیادمان دەهێنێتەوە کەوا: ئەهلی (التَّغبیرَ) قەومێك بوون بەدەنگی بەرزی بەئاوازەوە نزاو پاڕانەوەیان دەکرد، ئەو شیعرەش کە بۆ یادکردنەوەی خوای _ عزَّوجلَّ _ بەدەنگی بەرزی بەئاوازەوە تیایدا دەیانخوێندەوە بە (التَّغبیرَ) ناویان نابوو، وە ئەگەر بەئاوازەوە بیانبیستبا نەفسیان دەهەژاو دەخرۆشاو، سەمایان دەکرد، بۆیە بە (المُغَبِّرةً) ناونران. واتە ئەو خەڵکەی بەئاوازەوە یادی خوا دەکەنەوە یا شتی تر دەخوێننەوە.

(الزَّجاجُ) دەڵێت: بە (المُغَبِّرةً) ناونراون، لەبەر هەستانیان بە دورخستنەوەی خەڵك لە دونیاو، هاندانیان بەرەو ڕۆژی دوایی.

پێشەوا (الشافعي) فەرموویەتی: گۆرانی بۆ ڕابواردن و خۆ خەریك کردنە بۆیە (مکروه)و نەویستراوە، لە شتی پوچ دەچێ و، هەرکەس زۆر گوێی لێ بگرێت یاخود بیڵێت، بەنادان و هەرزە دەژمێردرێ و، شایەتیەکەی ڕەت دەکرێتەوە.

(الطَّبَريُّ) دەڵێت: زانایانی هەموو وەڵاتان کۆڕان لەسەر (کراهە)ت ونەویستراوێتی گۆرانیو، خەڵك لێ قەدەغەکردنی، لەڕاستیدا تەنها (إبراهیم)ی کوڕی (سعدِ)و، (عُبیدُاللهِ العَنْبَريُّ) لە کۆمەڵ جیابوونەوەو ڕای جیاوازیان هەبووە.

دەڵێم _ ابن الجوزي _: گەورە هاوەڵانی (الشافعيٌ) _ خوایان لێ ڕازی بێت _ نکوڵیی لە بیستنی دەکەن، بەڵام پێشانانیان، نەزانراوە جیاوازیان لە نێواندا هەبێ، وە گەورە پاشینانیان، نکوڵیی لێ دەکەن، لەوانە (أبي الطَّیِّبِ الطَّبَريّ)یە، کە سەبارەت بە گۆرانی و زەمکردنی کتێبێکی دانراوی هەیە.

---

٤٠٤ _ انظر ((جزء اتباع السنن)) (ص٨٩).

دەڵێت: گۆرانی و، گوێبیستبوونی و، لێدانی (القضیب) جایز نییە.

دەڵێت: هەرکەسێ شیاوێتی ئەمە بداتە پاڵ (الشافعيٌ)، درۆی بەدەمیەوە هەڵبەستووە.

لە کتێبی (أدب القضاءِ)دا پێشەوا (الشافعيٌ) بڕیاری داوە کەوا ئەگەر پیاو لەسەر گوێبیستبوونی گۆرانی بەردەوام بوو، شایەتیێکەی ڕەت دەکرێتەوەو، دادپەروەریشی پوچ دەبێتەوە.

دەڵێم _ ابن الجوزي _: ئەمە گوفتاری زانایانی (الشافعيٌ)و خواپەرستانیانە، لەڕاستیدا تەنها پاشینانیان ڕێیان بەوە داوە، بەتایبەت ئەو کەسانەی زانستیان کەم بوەو، هەواو ئارەزوواتیان بەسەردا زاڵ بووە.

وە فیقهزانی هاوەڵانمان دەڵێن: شایەتی گۆرانی بێژو سەماکەر قبوڵ ناکرێت.

# ✱ باسكردنی ئەو بەڵگانەی كە سەبارەت بە (كراهه)تبوونی گۆرانی و شیوەن و قەدەغەكردنی هاتوون:

نووسەر دەفەرمێت:

هاوەڵانمان پشتیان بە بەڵگەكانی قورئان و سوننەت و مانا بەست:

بەڵگەكان لە قورئاندا، سێ ئایەتە:

ئایەتی یەكەم: خوای تعالی دەفەرمێت: ﴿ وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَشْتَرِي لَهْوَ الْحَدِيثِ﴾ ﴿لقمان: ٦ ﴾. واتە: هەندێ لە خەڵكی هەیە قسەو باسی بێهودە دەكڕێ (وەك ئەفسانەو گۆرانی و مۆسیقا)(٤٠٥).

عن أبي الصهباءِ قالَ: سألتُ ابنَ مسعودٍ عن قولِ اللهِ _ عزَّ وجلَّ _: ﴿وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَشْتَرِي لَهْوَ الْحَدِيثِ ﴾ " قالَ: هُو واللهِ الغناءُ(٤٠٦).

واتە: لە (أبي الصهباءِ)وە دەڵێت: سەبارەت بە ئایەتی ﴿وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَشْتَرِي لَهْوَ الْحَدِيثِ ﴾، لە (ابن مسعودِ)م پرسی، فەرمووی:

سوێند بەخوا مەبەست بە ئەوە گۆرانی یە.

وعنِ ابنِ عباسٍ: ﴿ وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَشْتَرِي لَهْوَ الْحَدِيثِ ﴾ ؛ قالَ:
هُو الغناءُ وأشباهُهُ(٤٠٧).

واتە: (ابنِ عباسٍ) سەبارەت بە ئایەتی: ﴿ وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَشْتَرِي لَهْوَ الْحَدِيثِ ﴾، فەرموویەتی:

ئەوە گۆرانی و هاوشێوەكانێتی.

---

٤٠٥ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

٤٠٦ _ رواه ابن جرير (٢١ / ٦٢)، والحاكم (٢ / ٤١١).
وسنده حسن.

٤٠٧ _ رواه ابن جرير (٢١ / ٦١)، وابن أبي شيبة (٦ / ٣١٠).
وفي سنده ضعف، ولكن له طريقاً أخرى عند ابن جرير (٢١ / ٦١ _ ٦٢) يتقّوى بها.

له (سعيد)ی كوڕی (يَسار)وه دهڵێت: سهبارهت به ﴿ لَهْوَ الْحَدِيثِ ﴾ له (عِكرمَـةَ)م پرسی، فهرمووی:

گۆرانيه.

ههروهها (الحسنُ)و، (سعيدُ)ی كوڕی (جُبَيْر)و، (قتادةُ)و، (النَّخَعيُّ) ئاوهايان فهرمووه.

**ئايهتی دووهم: خوای تعالى دهفهرمێت: ﴿ وأَنْتُم سامِدونَ ﴾﴿ النجم: ٦١ ﴾.**

(ابنِ عباسٍ) سهبارهت به ئايهتی: ﴿ وأَنْتُم سامِدونَ ﴾ ؛ فهرموويهتی:

ووشهی (سامِدون) بهشێوه زاری (الحِمْيَرِيَّةِ)(٤٠٨) واته: گۆرانی. ئهوان دهڵێن: (سَـمَدَ لنـا): واته: گۆرانی بۆ گوتين.

(مجاهدٌ) دهڵێت: مهبهستی گۆرانييه، خهڵكی يهمهن دهڵێن: (سَمَدَ فلانٌ) واته فلـان كـهس گۆرانی گوت.

**ئايهتی سێ يهم: خوای تعالى دهفهرمێت: ﴿ وَاسْتَفْزِزْ مَنِ اسْتَطَعْتَ مِنْهُمْ بِصَوْتِكَ وَأَجْلِبْ عَلَيْهِمْ بِخَيْلِكَ ﴾﴿ الإسراء: ٦٤ ﴾** واته: ﴿ وَاسْتَفْزِزْ مَنِ اسْتَطَعْتَ مِنْهُمْ ﴾ وههركهس لهوانـه دهتـوانی گـومڕای بكـه ﴿ بِـصَوْتِكَ﴾ بـهدهنگت (بـهگۆرانيت) ﴿ وَأَجْلِـبْ عَلَـيْهِمْ ﴾ و بـده بهسهرياندا و تێ يان خوڕه ﴿ بخَيْلِكَ ﴾ بهسواری(٤٠٩).

له (مجاهـدٌ)هوه دهڵێـت: ئايـهتی: ﴿وَاسْـتَفْزِزْ مَـنِ اسْـتَطَعْتَ مِـنْهُمْ بِـصَوْتِكَ﴾ مهبهسـتی: گۆرانیو شمشاڵه.

**بهڵگهكان له سوننهتدا:**

عَنْ نَافِعٍ عن ابْنَ عُمَرَ _ رضي الله عنه _ أَنَّه سَمِعَ صَوْتَ زَمَّارَةِ رَاعٍ، فَوَضَعَ أُصْبُعَيْهِ فِـي أُذُنَيْهِ، وَعَدَلَ رَاحِلَتَهُ عَنْ الطَّرِيقِ، وَهُوَ يَقُولُ: يَا نَافِعُ ! أَتَسْمَعُ ؟ فَـأَقُولُ: نَعَـمْ. فَيَمْـضِي، حَتَّـى قُلْتُ: لَا. فَوَضَعَ يَدَيْهِ، وَأَعَادَ رَاحِلَتَهُ إِلَى الطَّرِيقِ، وَقَالَ:

رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ _ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ _ سَمِعَ صَوْتَ زَمَّارَةِ رَاعٍ، فَصَنَعَ مِثْلَ هَذَا(٤١٠).

---

٤٠٨ _ أخرجه ابن جرير (٢٧ / ٨٢)، والبيهقي (١٠ / ٢٢٣). وسنده صحيح.

٤٠٩ _ مهلا محمد مهلا صالح، پوختهی تهفسيری قورئان.

٤١٠ _ رواه أبوداود (٤٩٢٥)، والبيهقي (١٠ / ٢٢٢) " بسند حسن.

وانظر تعليقي على (اتباع السنن)) (رقم ٤٥).

واته: له (نَافِعٍ)ەوە فەرموویەتی: (ابْنَ عُمَرَ) _ خوای لیّ ڕازی بێت _ گوێبیستی دەنگی شمشاڵی شوانێك بوو، هەردوو پەنجەی خستە سەر هەردوو گوێی و، وشترەکەی لەو ڕێگەیە لاداو، فەرمووی: ئەی (نَافِعٍ) ! ئایا هەر دەبیستی ؟ دەمگوت: بەڵێ. بۆیە دەڕۆشت، تا گوتم: نەخێر. دەستی دانایەوەو، وشترەکەی بۆ ڕێگەکەی خۆی گەڕاندەوەو، فەرمووی:

پێغەمبەری خوام _ صلی الله علیه وسلم _ بینی گوێبیستی دەنگی شمشاڵی شوانێك بوو، وەکو ئەمەی کرد.

نووسەر دەفەرمێت:

ئەگەر ئاوەها ڕەفتاریان کردبێ بەرامبەر بە دەنگێك کە مرۆڤ لە نێوەنجێتی نەباتە دەرەوە، ئەی دەبێ گۆرانی خەڵکی ئەم زەمەنە و شمشاڵ لێدانیان چۆن بێ(٤١١).

وروى عبدُ الرحمنِ بنُ عَوْفٍ عن النبيِّ _ صلى الله عليه وسلم _ أنَّه قالَ:

((إِنَّما نهيتُ عن صوتَيْنِ أحمَقَيْنِ فاجِرينِ: صوتُ مِزمارٍ عندَ نِعْمَةٍ، وصوتُ رنَّةٍ عندَ مُصيبةٍ))(٤١٢).

واته: (عبدُالرحمنِ)ی کوڕی (عَوْفٍ) له پێغەمبەری خواوە _ صلی الله علیه وسلم _ دەگێڕێتەوە کەوا فەرموویەتی:

((لەڕاستیدا قەدەغەی دوو دەنگی بێ ئەقڵی خراپەکارم لێکراوە: دەنگی شمشاڵ لەکاتی نیعمەتدا، وە دەنگی هاوارکردنێکی خەماوی لە کاتی بەڵاو کارەساتدا)).

---

٤١١ _ بڕوانە ((مجموع فتاوى شيخ الإسلام ابن تيمية)) (٣٠ / ٢١٢) بۆ وەرگرتنی باسی تەواو دەربارەی ئەم بابەتەو، بەرپەرچدانەوەی ئەو کەسانەی کە دەیکەن بەبەڵگە بۆ شیاوێتی گوێبیستبوونی ئامێرە مۆسیقیەکان (المعازف).

٤١٢ _ رواه ابن سعد (١ / ١٣٨)، والترمذي (١٠٠٥)، والطيالسي (١٦٨٣) " بسند ضعيف.
وله شواهد تُقَوِّيه، ذكرتها في التعليق على ((أربعين الآجُرِّي)) (رقم ٣٦)، فلتنظر.
فهو حسنٌ إن شاء الله.

وعن ابن عمرَ قال: دخلتُ مع رسولِ اللهِ _ صلى الله عليه وسلم _ فَإِذَا ابْنُهُ إِبْرَاهِيمُ يَجُودُ بِنَفْسِهِ، فأخذهُ رسولُ اللهِ فَوَضَعَهُ فِي حِجْرِهِ، فَفَاضَتْ عَيْنَاهُ، فقلتُ: يا رسولَ اللهِ ! أَتَبْكِي وَتَنْهَانا عن البكاءِ ؟ ! فَقَالَ:

((لستُ أنهى عَنِ الْبُكَاءِ ، إِنَّمَا نَهَيْتُ عَنِ صَوْتَيْنِ أَحْمَقَيْنِ فَاجِرَيْنِ: صَوْتٍ عِنْدَ نِعْمَةِ لَعِبٍ ولهوٍ وَمَزَامِيرِ الشَيْطَانِ ، وَصَوْتٍ عِنْدَ مُصِيبَةٍ: ضرب وجهٍ ، وَشَقِّ جُيُوبٍ ، وَرَنَّةِ شيطانٍ))(٤١٣).

واتە: لە (ابن عمر)ەوە فەرموویەتی: بەیاوەری پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ چوومە ژوورەوەو، هاوکات (إبراهیم)ی کوڕی لەسەرەمەرگدا بوو، ئەوەبوو پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ هەڵیگرت و لە باوەشی خۆی داینـاو، چـاوەکانی فرمێـسکی ڕشـت، منیش گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ! ئایا خـۆت دەگریـی و قەدەغـەی گریانمـان لێدەکـەی ؟!

فەرمووی:

((قەدەغەی گریان ناکەم، لەڕاستیدا قەدەغەی دوو دەنگی بـێ ئـەقڵی خراپـەکار دەکـەم: دەنگێك لە کاتی نیعمەتدا وەکو یاریکردن و ڕابواردن و شمشاڵی شەیتان، وەدەنگێك لە کـاتی بەڵاو کارەستدا: لێدانی ڕوومەت و، یەخە دڕین و، هاواری خەماوی شەیتانیانە)).

بەڵام (أثر)ەکان:

(ابنُ مسعودٍ) فەرموویەتی: گۆرانی دووڕووی (النفاق) لە دڵدا دەڕوێنێت، وەکو چـۆن ئـاو سەوزە دەڕوێنێت.

وقَالَ: إِذَا رَكِبَ الرَّجُلُ الدَّابَّةَ، ولم يُسَمِّ " رَدِفَهُ الشَّيْطَانُ، وقَالَ تغنَّهْ. فَإِنَ لَمْ يُحْسِنْ " قَالَ لَهُ: تَمَنَّهْ(٤١٤).

---

٤١٣ _ انظر ((الأربعين الآجرية)) (رقم ٣٦)، ففيه تخريجها مستوفىً.

٤١٤ _ أخرجه عبدالرزاق في ((المصنف)) (١٠ / ٣٩٧) " بسند صحيح.

واته: هەروەها فەرموویەتی: هەرکاتێك پیاو سواری چوارپێکەی بوو، یادی خوای نەکردەوە، شەیتان لە پشتیەوە سوار دەبێ و، دەڵێت گۆرانی بڵێ. ئەگەر نەیزانی، ئینجا پێی دەڵێت: ئارەزووت بەرەو قسەی هیچ و پوچ بکەرەوە.

(ابن عمرَ) _ خوای لێ ڕازی بێت _ بەلای قەومێکدا تێپەڕ بوو ئیحرامیان بەستبوو، پیاوێکیان لەگەڵدا بوو گۆرانی دەگوت، فەرمووی:

ئەی خوا گوێبیستان نەبێ.

وە بەلای کچۆڵەیەکدا تێپەڕبوو گۆرانی دەگوت، فەرمووی:

ئەگەر شەیتان وازی لە کەسێك بهێنیبا، وازی لەمە دەهێنا.

پیاوێك سەبارەت بەگۆرانی لە (القاسمَ)ی کوڕی (محمدٍ) پرسی، ئەویش فەرمووی: قەدەغەت دەکەم و، بە (مکروە)ی دادەنێم بۆت. پیاوەکە گوتی: ئایا حەرامە ؟ فەرمووی: ئەی برازام تەماشاکە ! ئەگەر خوای تعالی هەق و پووچی لێك جیاکاتەوە(٤١٥) گۆرانی دەخاتە لای کامیانەوە؟

لە (الشعبيِّ)وە دەڵێت: نەفرەت کراوە لە گۆرانی بێژو ئەو کەسەی کە گۆرانی بۆ دەڵێت.

(عمرُ)ی کوڕی (عبدالعزیز) بۆ مامۆستاو ئەدەب دەری کوڕەکەی دەنوسێ و دەڵێت:

با یەکەم شتێك لە ئەدەبەکەتەوە فێری بن و بڕوای پێ بکەن، ڕق لێبونەوەی ڕابواردن و ئارەزووات بێ، کە سەرەتای دروستبوونی لەلایەن شەیتانەوەیەو، دەرەنجامەکەشی تووڕەبوونی خوای _ عزَّوجلَّ _ە، چونکە لە زانایانی باوەڕپێکراوەوە پێم گەشتووە، کە هێنانی ئامێرە مۆسیقیەکان (المعازف) و، گوێبیستبوونی گۆرانی و، حەز پێکردن و، پێ سەرسامبوونی، دووڕوویی (النفاق) لە دڵدا دەڕوێنێ، وەکو چۆن ئاو گژوگیاکان دەڕوێنێ، سوێند بەخوا خۆپاراستن لەو شتانەو، وازهێنان لە ئامادەبوونی ئەو شوێنانە، بۆ کەسی ژیرو ئاقڵ زۆر چاکترە لە بەردەوام بوون لەسەر دووڕوویی (النفاق) لە دڵدا.

(فُضیلُ)ی کوڕی (عِیَاضٍ) دەڵێت: گۆرانی نزای داوێن پیسی و زیناکردنە.

---

٤١٥ _ وەڵامێکی ژیرانەیە.

(الضَّحَّاكُ) دەڵێت: گۆرانی دڵ بۆگەن دەکات و، پەروەردگاریش تووڕە دەکات.

(يزيدُ)ی کوڕی (الوليدِ) دەڵێت: ئەی (بني أُميَّةَ) ! دورکەونەوە لە گۆرانی، چونکە شەهوەت و ئارەزوو زیاد دەکات و، پیاوەتی و جوامێردیی دەڕۆخێنێت، بەراستی نوێنەری مەی وشەرابەو، ئەوە دەکات کە سەرخۆشبوون دەیکات، ئەگەر چار نییەو دەبێ هەر گوێبیستی بن(٤١٦)، ئەوا ژنانی لێ دوورخەنەوە، چونکە گۆرانی بانگخوازی داوێن پیسیە.

دەڵێم _ ابن الجوزي _: دەنگی گۆرانی چەندەها خوارپەست و زاهیدانی سەرلێشێواند، کۆمەڵێ لە هەواڵی ئەوانمان لەو کتێبەماندا باسکردووە، کە ناومان ناوە بە (ذم الهوى)(٤١٧).

نووسەر دەفەمێت:

بەڵام لەڕووی ماناوە، پێشتر ڕوونمان کردەوە کە گۆرانی مرۆڤ لە نێوەنجێتی دەباتە دەرەوە، وە ئەقڵ وژیری دەگۆڕێت.

ئەمە بەوە ڕوون دەبێتەوە کە مرۆڤ ئەگەر هەژاو نەفسی خرۆشا، کردەوانێك ئەنجام دەدات کە لەکاتی تەندروستیدا خودی خۆی بە ناشیرینی دادەنێت، وەکو جوڵاندنی سەرو، چەپڵەلێدانو، لێدانی زەوی بەپێیەکانی... وە چەندین ڕەفتاری دیکەش کە کەسانی بێ ئەقڵ وبێ ئەرزش ئەنجامی دەدەن، گۆرانی ئەوە پێویست دەکات، بەڵکو کاریگەریەکەی نزێك بەکاریگەری مەی وشەرابە سەبارەت بە داپۆشینی ئەقڵ، بۆیە پێویستە قەدەغەی بکرێت.

لە (أَبي سعيدِ الخَرَّاز)ەوە دەڵێت: لای (محمد)ی کوڕی (منصور) باسی ئەهلی قەسیدە کرا، گوتی: ئەوانە هەڵهاتوانن لە خوای _ عزَّوجلَّ _، ئەگەر ملکەچی فەرمانەکانی خواو پێغەمبەرەکەی بونایەو، باوەڕیان پێکردنایە، خوای تعالى نیازو نێتی چاك دەکردن و، چیتر ئەو شتانە کاری تێنەدەکردن.

(أَبوعبدالله)ی کوڕی (بطَّةَ العُكْبَريُّ) دەڵێت: کەسێك سەبارەت بەگۆرانی پرسیاری لێکردم، منیش قەدەغەی ئەوەم لێکردو، پێم ڕاگەیاند لەو شتانەیە کە زانایان نکۆڵیان

---

٤١٦ _ ئەی بۆ ؟!

٤١٧ _ چاپکراوەو لەبەردەستایە.

لێکردووەو، هەرزەو نادانەکان بەچاکیان داناوە، لەڕاستیدا تـەنها تایەفەیـەك ئـەنجامی دەدەن کە بە صۆفی نـاودەبرێن و، زانایـانیش بـە (الجَبْرِيَّـةَ)یـان ناویـان دەبـەن: خـەڵکێکن خـاوەن هیمتێکی سووکن، خاوەن شەرعێکی بیدعیـەتن، زوهـد دەردەخـەن و، هـەموو هۆیـەکانیان گومڕایە، بانگەشەی ئەشق و خۆشەویستی دەکەن، بەوازهێنانی تـرس و ئومێـدبوون (الخوف والرجاء)، کە لە لاو و ژنانەوە گوێبیستی دەبن، دەهەژێن و دەخرۆشـێن و، لەهۆشـی خۆیـان دەچنەوەو، خۆیان دەبورێننەوەو، خۆیان وادەردەخەن کە مردوون، بانگەشەی ئەوە دەکـەن کـە هەموو ئەوانە بەهۆی زۆری خۆشویستنیانەوەیە بۆ پـەروەردگاریان و، ئارەزووکردنیانـە بـۆی، بەرزی وبڵندی بۆ خوای تعالی سەبارەت بەوەی کە دەیڵێن.

## ✸ باسی ئەو گومانانەی کە کەسانێك بەکاریان هێناوە بۆ ڕێدان بەگوێ گرتن لە گۆرانی:

لەوانە فەرموودەکەی خاتوو (عائشةَ)یە _ خوای لێ ڕازی بێت _ کە دوو کەنیزەکەکە لە لایدا دوو دەفیان لێدەدا. لە هەندێ بێژەکانیدا هاتووە:

دَخَلَ عليَّ أَبو بَكْرٍ وَعِنْدِى جَارِيَتَانِ مِنْ جَوَارِى الأَنْصَارِ تُغَنِّيَانِ بِمَا تَقَاوَلَتِ بِهِ الأَنْصَارُ يَوْمَ بُعَاثٍ، فَقَالَ أَبو بَكْرٍ: أَمَزْمُورُ الشَّيْطَانِ فِى بَيْتِ رَسُولِ اللَّهِ _ صلى الله عليه وسلم _ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ _ صلى الله عليه وسلم _

((دَعْهُما يَا أَبَا بَكْرٍ ! إِنَّ لِكُلِّ قَوْمٍ عِيدًا، وَهَذَا عِيدُنَا))

وقد سَبَقَ ذِكرُ الحديثِ(٤١٨).

واتە: خاتوو (عائشةَ) _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی: (أَبوبَكْرٍ) هاتە دیدەنیم، کە هاوکات دوو کەنیزەك لە کەنیزەکەکانی پێشتیوانانم لابوو گۆرانیان دەگوت بەوەی پشتیوانان دەماودەم دەیانگوتەوە لە ڕۆژی (بُعاثٍ)دا، بۆیە (أَبوبَكْرٍ) فەرمووی: شمشاڵی شەیتان لە ماڵی پێغەمبەری خوادایە _ صلى الله عليه وسلم _، ئەوەبوو پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ فەرمووی:

((ئەی (أَبابَكْرٍ) وازیان لێ بێنە ! چونکە هەر قەومێك جەژنێکی هەیەو، ئەمەش جەژنی ئێمەیە)).

ومنها حديث فَضَالَةَ بْنِ عُبَيْدٍ عن النبيِّ _ صلى الله عليه وسلم _ أَنَّه قالَ:

لَلَّهُ أَشَدُّ أَذَنًا إِلَى الرَّجُلِ الْحَسَنِ الصَّوْتِ بِالْقُرْآنِ مِنْ صَاحِبِ الْقَيْنَةِ إِلَى قَيْنَتِهِ(٤١٩).

واتە: لەوانە فەرموودەکەی (فَضَالَةَ)ی کوڕی (عُبَيْدٍ)ە کە لە پێغەمبەری خواوە _ صلى الله عليه وسلم _ دەیگێڕێتەوەو فەرموویەتی:

دڵنیابن کە خوای تعالى زۆر زۆر گوێبیسترە بۆ پیاوێك کە بەدەنگی بەرزی خۆش قورئان دەخوێنێت لە خاوەن کەنیزەکێکی گۆرانی بێژ بۆ گۆرانی کەنیزەکەکەی.

---

٤١٨ _ وسبق تخريجه.

٤١٩ _ سيأتيك تخريجه عند الجواب عليه.

(ابنُ طاهرٍ) دەڵێت: ڕووی بیانووەکەی ئەوەیە کە حەڵاڵێتی گوێبیستبوونی گۆرانی سەلماندووە، بەڵام جایز نییە بەشتێکی حەرام (القیاس) بکرێت.

ومنها حديثُ أبي هريرةَ - رضي الله عنه – عن النبيّ _ صلى الله عليه وسلم _ أنَّه قالَ:

((ما أذِنَ اللهُ _ عزَّوجلَّ _ لشيءٍ ما أَذِنَ لِنبيّ أنْ يتَغنَّى بالقُرآن))(٣٢٠).

واتە: لەوانە فەرمودەکەی (أبي هريرةَ)یە _ خوای لێ ڕازی بێت _ لە پێغەمبەری خواوە _ صلى الله عليه وسلم _ کە فەرموویەتی:

((خوای _ عزَّوجلَّ _ گوێبیستی هیچ شتێك نەبووە بەئەندازەی گوێبیستبوونی بۆ ئەو پێغەمبەرەی کە بە چاك وجوانی و بەئاوازەوە قورئان دەخوێنێتەوە)).

ومنها حديث محمد بن حاطبٍ عن النبيّ _ صلى الله عليه وسلم _ أنه قالَ:

((فصلُ ما بينَ الحلالِ والحرامِ الضربُ بالدُّف))(٣٢١).

واتە: لەوانە فەرمودەکەی (محمد)ی کوڕی (حاطب)ە لە پێغەمبەری خواوە _ صلى الله عليه وسلم _ کە فەرموویەتی:

((جیاکەرەوەی نێوان حەڵاڵ و حەرام دەف لێدانە)).

وەڵامەکانی: بەڵام فەرمودەکەی خاتوو (عائشةَ) _ خوای لێ ڕازی بێت _ پێشتر دەربارەی دواین و، ڕوونمان کردەوە ئەوان شیعریان بەدەنگی بەرزی خۆش دەخوێندەوەو، لە بەر ئەوەی بەو شێوازە دەخوێندرایەوە، بۆیە بە گۆرانی ناونرا، لەبەر جۆرە جێگیریەك لە خوێندنەوەی شیعرەکەو، لەرانەوەو دەنگدانەوەوە، شتی وەکو ئەوە خوو و میزاج لە نێوەنجێتی ناباتە دەرەوە.

---

٣٢٠ _ رواه البخاري (٦ / ٢٣٦)، ومسلم (٧٩٢).

٣٢١ _ رواه الترمذي (١ / ٢٠٢)، والنسائي (٢ / ٩١)، وأحمد (٣ / ٤١٨) " بسند حسن.

وه چۆن ئەو شتەی كە لە لایەن دڵانێكی دڵسۆزەوەو لەو زەمەنە تەواو و بێ لەكەیەدا ڕووی داوه، بكرێتە بەڵگە بۆ ڕێدان بەم دەنگە جۆش و خرۆشكارانەی كە لە لایەن نەفسانێكەوه ڕوودەدات، كە بەئارەزووات داگیركراوه، لە زەمەنێكی لێڵ ولیخندا ؟

ئەمە هیچ نەیەو تەنها بەهەڵە تێگەشتنە !

أوَلیسَ قدْ صحَّ في الحدیثِ عن عائشةَ _ رضي الله عنها _ أنَّها قالت:

لو رأى رسولُ الله -صلى الله علیه وسلم- ما أحدَثَ النساءُ ، لمنعهنَّ المساجِدَ([422]).

واتە: ئایا بە (صحیح)ی لە خاتوو (عائشةَ)ەوه _ خوای لێ رازی بێت _ (ریوایە)ت نەكراوه كە فەرموویەتی:

ئەگەر پێغەمبەری خوا _ صلى الله علیه وسلم _ تەماشای ئەم شتانەی بكردایە كە ژنان دایانهێناوه _ وەكو دەرخستنی ڕازاوەیی و بۆنی خۆش و پۆشاكی جوان _ قەدەغەی مزگەوتەكانی لێدەكردن.

لەڕاستیدا پێویستە موفتی باروحاڵ هەڵسەنگێنێت، وەكو چۆن پێویستە پزیشك زەمەن و تەمەن و شوێن و وەڵات هەڵسەنگێنێت، پاشان بە گوێرەی ئەوه وەسف و چارەسەری بۆ بكات.

وه گۆرانی گوتن بەوەی كە پشتیوانان دەماودەم لە ڕۆژی (بُعاث)دا دەیانگوتەوه، لە چ ئاستێكی گورانی گوتنی لووسكەیەكی بێ تووكی ئارەزوولێكراودایە، كە بەئامیرگەلێكی بەلاوه خۆش و، پیشەیەك كە نەفسی بۆ ڕادەكێشرێت و، شیعرگەلێكی خۆشەویستی (غزلیات) كە تیایدا وەسفی ئاسكی نێرو مێ و، خاڵ و، ڕوومەت و، قەدو باڵاو، ڕێك وپێكی دەكرێت گۆرانی دەڵێت؟!

ئایا لەوێدا خووی مرۆڤ ڕادەوستێت ؟! ئەیهو زۆر دووره، بەڵكو ئارەزووی شتە بەلەزەتەكە دەكات!

---

٤٢٢ _ رواه البخاري (٢ / ٢٩٠)، ومسلم (٤٤٥).

هیچ کەسێك ناتوانێ بانگەشەی ئەوە بکات کە هەست بەو لەزەت و ئارەزوواتە ناکات، مەگەر کەسێکی درۆزن، یا کەسێکی بەدەر لە سنووری مرۆڤایەتی.

هەرکەسێکیش بانگەشەی ئەوە بکات کە لەو شتە ئاماژەیەك وەردەگرێت بۆ خوای خولقێنەر، بەڕاستی شتگەلێکی بەرامبەر بەخوای تعالی بەکارهێناوە کە شایستەی نییە، چونکە خوو و میزاجی پێشی دەکەوێت و دەچێت بۆ لای ئەو هەواو ئارەزوواتەی بەدیدەکاتو، توانای وەرگرتنی هیچ ئاماژەیەکی نابێ.

(أبوالطیِّبِ الطبريُّ) بەوەڵامێکی دیکە وەڵامی ئەم فەرموودەیەی داوەتەوە، دەڵێت:

ئەم فەرموودە بەڵگەیە بۆ ئێمە، چونکە (أبابَکْرٍ) ئەوەی بە شمشاڵی شەیتان ناونـاوە، پێغەمبەری خواش _ صلی الله علیه وسلم _ نکۆڵیی لە فەرمایشتەکەی (أبي بَکْرٍ) نەکرد، نەڕاستیدا تەنها قەدەغەی کرد لە نکۆڵیی کردندا توندونیژ بێت، لەبەر چاکێتی پلەو پایەو بلندیەکەی خۆی، بەتایبەت لە ڕۆژی جەژندا.

خاتوو (عائشةَ) _ خوای لێ ڕازی بێت _ لەو کاتەدا منداڵ بوو، بەڵام پاش باڵغبوونی و وەرگرتنی زانست جگە لە زەمکردنی گۆرانی، هیچ کەس شتێکی تری لێوە نەگێڕاوەتەوە.

(القاسمُ)ی کوڕی (محمدٍ)ی برازاشی کە زانستی لەوەوە وەرگرتبوو، زەمی گۆرانی دەکردو، ڕێگریی لە گوێبیستبوونی دەکرد.

نووسەر دەفەرمێت:

وە ئەو ڕابواردنەی (اللهو) کە لە فەرموودەکەی تردا باس کراوە، بەڕاشکاوی باسی گۆرانی نەکردووە، بۆیە دەشێ مەبەستی شیعر خوێندنەوە یاخود شتی تر بێ بەدەنگی بەرزی خۆش.

بەڵام چواندنی بەگوێگرتن لە کەنیزەکی گۆرانی بێژ (القَيْنَةِ)(٤٢٣)، هیچ ڕێگرێك نییە کـە لێچوو حەرام بێت، چونکە مرۆڤ ئەگەر گوتی: هەستم بەلـەزەتی هـەنگوێن کـرد زیـاتر لـە لەزەتی مەی وشەراب، گوفتارەکەی ڕاست دەبـێ، لەراسـتیدا چـواندنەکە بـە گـوێگرتن بـوو لەهەردوو بارەکەدا، بۆیە ئەگەر یەکێکیان حەڵاڵ بێ یاخود حەرام بێ ڕێگریی لـە چـواندنەکە ناکات، تەماشاکە پێغەمبەری خوا _ علیه الصلاة والسلام _ فەرموویەتی:

((إِنَّكُم لَتَرَوْنَ ربَّكُمْ كما تَرَوْنَ القمرَ))(٤٢٤).

واتە: ((دڵنیابن ئێوە پەروەردگارتان دەبینن وەکو چۆن مانگ دەبینن)).

لێرەدا دیسان بینینی چواندووە بەبینینێکی ئاشکراو ڕوون، چونکە جیاوازیەکەی نێوانیـان لەوەدایە کە بینەر توانای بینینی مانگی هەیە، بەڵام خوای هەق پاك وبێگـەردەو دوورە لـەو شتەوە(٤٢٥).

فیقهزانان سەبارەت بـەئاوی دەسـتنوێژ دەڵـێن: ئەندامـەکانی جەسـتەی تـەڕبوو بـەئاوی دەستنوێژ وشك ناکرێنەوە، چونکە ئاسەواری پەرستنە، بۆیە سـوننەت نییـە بـسڕدرێن(٤٢٦)،

---

٤٢٣ _ ولم يصحَّ الحديث أصلاً، وكما يقولُ العلماء:
((التأويل فرع التصحيح)).
فقد رواه أحمد (٦ / ١٩)، والحاكم (١ / ٥٧٠) " بسند منقطع.
ووصله أحمد (٦ / ٢٠) أيضاً، وابن ماجة (١٣٤٠) " بذكرِ راوٍ ضعيفٍ !
فلا يصحُّ !

٤٢٤ _ أخرجه البخاري (٥٥٤)، ومسلم (٦٣٣) " عن جرير بن عبدالله.

٤٢٥ _ هو _ سبحانه _ منزَّه عن أن يُحيط به أحدٌ من خلقه، أمـا أنـه هـل يُـرى في جهـة، أو لا جهـة " ففيه تفصيلٌ، كما تراه في ((شرح الطحاوية)) (١ / ٢٢٠)، والأصل: الإيمان بالغيـب إيمانـا مطلقـاً، سـائلين الله أن ينعم علينا بالنظر إلى وجهه الكريم، إنه جوادٌ كريم.

٤٢٦ _ ئەمە بەدواداچوونی بۆ دەکرێت، چونکە بە (صحيح)ی لە پێغەمبەری خواوە _ صـلى الله عليـه وسلم _ باسکراوە کەوا پارچە پەڕۆیەکی هەبوو پاش دەستنوێژگرتن خۆی پێ وشك دەکردەوە.
وهو حديث صحيح " كما تراه في تعليقي على ((المُتَواري علـى أبـواب البخـاري)) (ص٨١) لابـن المُنَيِّـر _ طبع دار عمَّار _ عمَّان.

وەکو چۆن خوێنی شەهید ناسڕدرێت و پاك ناکرێتەوە، لێرەدا هەستاون بەکۆکردنـەوەی نێـوان ئەم دوانە، لەڕووی ڕێکەوتنیانـەوە کـە هـەردووکیان پەرسـتنن، ئەگەرچـی هـەردووکیان لـە پاکێتی و پیسێتیدا جیادەبنەوە.

(ابنِ طاهرِ)یش کە دەڵێت (القیاس) تەنها بەپێی شتێکی ڕێپێدراو (مباحِ) دەکرێت: ئـەوە فیقهی صوفیەکانە، نەك زانستی زانایان.

بـەڵام فەرمایـشتی: ((یتغَنَّـی بـالقرآن))، (سـفیانُ)ی کـوڕی (عُیَیْنـةَ) ڕاڤـەی کـردوەو، فەرموویەتی:

واتە: (یستغنی بە): واتە قورئانی بەسەو پێویستی بەهیچی تر نابێ.

پێشەوا (الشافعيُّ) ڕاڤەی کردوەو، فەرموویەتی: واتە: (یتحَزَّنُ ویترَنَّـمُ) واتە نرم کردنـەوەو باریك کردنەوەو لەراندنەوەو دەنگی خۆش.

کەسانی تری جگە لەوانیش گوتوویانە: (یجعلُهُ مکانَ غنـاءِ الرُکبـانِ إذا سـاروا) واتـە لـە جیاتی (غناء الرکبان)(٤٢٧) دەیلێتەوە کاتێ کە ڕێ دەکەن.

بەڵام سەبارەت بەلێدانی دەف، کۆمەڵێك لە (تـابعین) دەفەکانیان دەشـکاند، کەچـی ئـەو دەفانە بەم جۆرەی ئەمڕۆش نەبوو، ئەی دەبێ هەڵوێستیان چ بوایە ئەگەر ئەمانەی ئـەمڕۆیان بەدیکردایە ؟!

(الحسنُ البصريُّ) دەیگوت: دەف لە سوننەتی پێغەمبەران نییە.

بەڵام فەرمایشتی پێغەمبەری خوا _ صـلی الله علیـە وسـلم _ ((فَـصْلُ مَـا بـینَ الحَلالِ والحَرامِ...))

(أبوعبیدِ القاسمُ)ی کوڕی (سلّام) دەڵێت: هەرکەس بردویەتی بۆ لای صوفیەکان، بەڕاستی فەرمایشتەکانی پێغەمبەری خوای _ صلی الله علیە وسلم _ بەهەڵە لێکداوەتـەوە، چـونکە

---

٤٢٧ _ غنـاو الرکبـان: جۆرێکـە لـە گـۆرانی وشـترەوانان (الحُداء) دەچـێت، بـەڵام لـەو ناسـکترەو درێژکردنەوەشی تێدایە، بڕوانە: النور الکاشف في بیان حکم الغناء والمعازف، ص٤٢. وەرگێڕ.

لەڕاستیدا بەلای ئێمەوە مەبەست بە فەرموودەکە تەنها ئاشکراکردنی هاوسەرگیریە بەلێدانی دەف و، جەنجاڵبوون و، شلەژانی دەنگ و، زیکرە لە نێو خەڵکدا لە کاتی ئاشکراکردنەکەدا.

دەڵێم _ ابن الجوزي _: ئەگەر مەبەستی فەرموودەکە هەڵبگیرێتە سەر دەف لێدان بەهەقیقەت، بەدڵنیایی ڕاست و شیاو دەبێ، چونکە پێشەوا (أَحمدُ)ی کوڕی (حنبلٍ) فەرموویەتی: ئومیدەوارم دەف لێدان لە ئاهەنگی ژن گواستنەوەو بەو هاوشێوانە ئاسایی بێ و هیچی تێدا نەبێ(٤٢٨)، وە تەپڵ بە(مکروه)و نەویستراو دادەنێم.

وعن عامِرَ بن سَعْد البَجَليِّ قالَ: طلبتُ ثابتَ بنَ سعدٍ، وكانَ بدرياً، فوجدتُه في عُرسٍ له. قالَ: وإذا جوارٍ يغَنِّينَ ويضربْنَ بالدُّفوفِ. فقلتُ: ألا تنهى عن هذا ؟! قالَ: لا، إنَّ رسولَ الله _ صلى الله عليه وسلم _ رخَّصَ لنا في هذا(٤٢٩).

واته لە (عامِر)ی کوڕی (سَعْدِ البَجَليِّ)وە دەڵێت: بەدوای (ثابتَ)ی کوڕی (سعدٍ) دەگەڕام، کە یەکێك بوو لە بەشداربووانی شەڕی بەدر، لە نێو ئاهەنگێکی ژن گواستنەوەی خۆیدا بینیمەوە. (عامِر) دەڵێت: بینیم چەندین کەنیزەك گۆرانی دەڵێن و دەف لێدەدەن. پێم گوت: ئایا قەدەغەی ئەوە ناکەی ؟! فەرمووی: نەخێر، بەڕاستی پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ مۆڵەتی ئەمەی پێداوین.

نووسەر دەفەرمێت:

هەموو ئەو شتانەی کە کردویانەتە بەڵگە شیاو نییە بکرێت بەڕێنوێن بۆ جایزبوونی ئەم گۆرانیە ناسراوە کارتێکەرەی سەر خووی مرۆڤ.

---

٤٢٨ _ وە هەردوو جەژنەکەو، هیچی تر، چونکە دەقەکانی ڕێپێدان دەربارەی ئەم باروحاڵەتانە هاتوون، وەکو پێشتر ئاماژەی بۆ کرا.

٤٢٩ _ رواه الطبراني في ((الكبير)) (١٧ / ٢٤٧)، والبيهقي (٧ / ٢٨٩)، والطيالسي (١٢٢١)، والحاكم (٢ / ١٨٤).

وسنده صحيح.

کەسانێکی شەیدای تەصوف شتانێکیان بۆ کردوون بەبەڵگـە کـە هـیچ بەڵگـەیکی تێـدا نییە، لەو کەسانە (أَبونُعَيم الأصفهانيُّ)ە، دەڵێت:

(البراءُ)ی کوڕی (مالكٍ) مەیلی گوێبیستنی دەکـردو، چـێژی لـە ئـاوازی چـاك و خـۆش وەردەگرت (التَّرنم).

نووسەر دەفەرمێت:

لەڕاستیدا (أَبونُعَيم) ئەمەی لە (البراءُ)ەوە باس کردوە، چونکە لێـوەی دەگێڕێتـەوە(٤٣٠) کەوا ڕۆژێك ڕاکشاو، بەدەنگێکی خۆش شتێکی گوت (تَّرَنَّمَ) !

تەماشای ئەم بەڵگە هێنانەوە سادە بکە، چونکە مرۆڤـ بەدەر نابێ لەوەی کـە بـەدەنگی خۆش شتێك بڵێت (یـترنم)، باشە گـوتنی شـتێك بـەدەنگی خـۆش (الـترنم) لـە چ ئاسـتێکی گوێبیستبوونی گۆرانی هەژێنەری خرۆشیاردایە ؟!

(محمدُ)ی کوڕی (طاهرٍ) شتانێکی بۆ کردوون بەبەڵگە، ئەگەر لەبەر ئەوە نەبێ کـە ڕەنگـە کەسێکی نەفام شتێك وەکو ئەوە بدۆزێتـەوەو، فریـو بخـوات و، پێـی بخەڵـەتێت، شایـستەی باسکردن نییە، چونکە شتێکی ئەوتۆ نییە:

لەوانە: لە کتێبەکەیدا دەڵێت: بەشی داواکردن لە گۆرانی بێژو سوننەتبوونی.

لێرەدا داواکردنی لە گۆرانی بێـژی کـردووە بەسـوننەت و، ئەوەشـی کردوتـە بەڵگـە کـە (عَمْرو)ی کوڕی (الشَّرِيدِ) لە باببیەوە دەیگێڕێتەوەو دەڵێت: اسْتَنْشَدَني رسولُ اللهِ _ صـلى الله عليه وسلم _ مِن شعرِ أُميَّةَ، فأخذَ يقولُ: ((هِيَ، هِيَ))، حتى أنشدتُه مئةَ قافيةٍ(٤٣١).

واتە پێغەمبەری خوا _ صـلى الله عليـه وسـلم _ داوای لێکـردم شـیعری (أُمیـَّةَ)ی بـۆ بخوێنمەوە، ئەوەبوو دەیفەرمو (هیتریش، هیتریش)، تاوەکو صەد دێرم بەدەنگی بەرزی خۆش بۆ خوێندەوە.

---

٤٣٠ _ في ((حلية الأولياء)) (١ / ٣٥٠).

٤٣١ _ رواه مسلم (٢٢٥٥) (١).

نووسەر دەفەرمێت:

تەماشای بەڵگە هێنانەوەکەی (ابنِ طاهرٍ) بکە چەند سەرسوڕمێنە ! کە بەڵگە بۆ جایزبوونی گۆرانی گوتن دەهێنێتەوە بەخوێندنەوەی شیعر بەدەنگی بەرزی خۆش ؟! لێرەدا نموونەی وەکو نموونەی کەسێکە بڵێت: شیاوە بەبەر لەپ بەسەر پشتی ئامێری عودا بدرێ، بۆیە شیاوە بەژێ یەکانیشی (أوتار) لێبدرێت ! یاخود بڵێت: شیاوە ترێ بگوشرێت و لە هەمان ڕۆژەدا بخورێتەوە، بۆیە شیاوە پاش چەند ڕۆژێك لێی بخورێتەوە ! بەڕاستی بیری چووە کە خوێندنەوەی شیعر بەدەنگی بەرزی خۆش ئەو هەژان و خرۆشانەی تێدا نابێ کە گۆرانی دروستی دەکات.

لەڕاستیدا ئەمەم باس کرد، تەنها لەبەر ئەوەی ئەندازەی فیقهی ئەم پیاوەو هەڵهێنجانەکەی (استنباطهِ) بزانرێت، ئەگینا زەمەن زۆر لەوە شکۆدارترە بەم شتە تێکەڵ و پێکەڵانە لەناوبچێت.

لە (أبي الطَّيِّبِ الطبريٌّ)وە دەڵێت: بەڵام گوێبیستبوونی گۆرانی لە ژنانی نامەحرەمەوە، هاوەڵانی (الشافعيُّ) فەرموویانە: جایز نییە، ئەگەر ئازاد بێ یاخود کوێلە بێ.

دەڵێت: (الشافعيُّ) فەرموویەتی: ئەگەر خاوەنی کەنیزەکەکە خەڵك بۆ گوێبیستبوونی گۆرانیەکەی کۆکاتەوە، ئەوا بێ ئەقڵ ونادانەو، شایەتیەکەی ڕەت دەکرێتەوە.

پاشان گوفتارەکانی توندوتیژ دەکاتەوەو، دەڵێت: گەوادە (دیاثة).

لەڕاستیدا خاوەنەکەی بەکەسێکی نادان و، خراپەکارو، بێ ئاین ناوزەند کردووە، چونکە خەڵکەکەی بۆ پووچێتی بانگ کردووە، وە هەرکەسێکیش بۆ پووچی بانگەواز بکات، کەسێکی نادان و، خراپەکارو، بێ ئاینە.

نووسەر دەفەرمێت:

لە (أبي عبدالرحمن السُّلَمِي)وە دەڵێت: (سعدُ)ی کوڕی (عبدِاللهِ الدمشقيُّ) کەنیزەکێکی گۆرانی بێژی کڕی، کە بۆ صوفیە هەژارەکان بەدەنگی خۆش هۆنراوەی بۆ دەگوتنەوە.

نووسەر دەفەرمێت:

(أبوطالبِ المكّيُّ) لە کتێبەکەیدا(٤٣٢) باس دەکات و دەڵێت: بە (مروانَ القاضي) گەشتین، کە چەندین کەنیزەکی هەبوو ئاوازی خۆشیان (التلحين) دەگوتەوەو، بـۆ صـوفیەکان ئامـادەی کردبوون.

دەڵێت: (عطاءٍ) دوو کەنیزەکی هەبوو ئاوازی خۆشیان دەگـوت (تُلَحِّنـان)، وە براکانیـشی ئاوازی خۆشیان لە هەردووکیانەوە دەبیست.

نووسەر دەفەرمێت:

بەڵام (سعدٌ الدمشقيُّ)، پیاوێکی نەفامە، ئـەو باسـەی دەربـارەی (عطـاءِ)یـش گـوتراوە مەحاڵ و درۆیە، وە ئەو باسەی دەربارەی (مروان) گوتراوە ئەگەر ڕاستیش بێ، ئەوا پیـاوێکی خراپەکارەو لە گوێڕاڵی پەروەردگار لایداوە (فاسق)، بەڵگە لەسەر ئەوەی گوتمان ئەوەیە کە لە پێشەوا (الشافعي)وە _ خوای لێ ڕازی بێت _ گێڕامانەوە، وە ئەم قەومـە بەزانـست نـەفام بوون، بۆیە هەواداری ئارەزووات بوون !

ئەگەر گوترا: چ دەڵێی سەبارەت بەوەی لە (المُغيرةَ)ەوە دەیگێڕنەوە کە گوتویەتی: (عَوْنُ)ی کـوڕی (عبـدالله) چیرۆکی دەگێڕایـەوە (يقُـصُّ)، ئەگـەر دەسـتی خـاڵی بوایـە، فـەرمانی بەکەنیزەکێك دەکرد چیرۆکی بگێڕایەتەوەو، گـۆرانی بگوتایـەو، شـادومانی بکردنایـەو، وای لێکردنایە کە بێنە جۆش وخرۆش . (المُغيرةَ) دەڵێت: کەسێکم بۆ لای نـارد _ یـاخود ویـستم کەسـێکی بـۆ لا بنێـرم _: تـۆ لـە مـاڵێکی ئـەهلی ڕاسـتگۆیت، خـوای _ عزَّوجـلَّ _ پێغەمبەرەکەی _ صلى الله عليه وسلم _ بۆ خراپەکاری و بێ ئـەقڵێتی نـەناردووە، وە ئـەم کردارەت کرداری کەسێکی خراپەکاری بێ ئەقڵە.

وەڵامەکەی: ئێمە گومانی وانابەین (عَـوْنُ) فەرمانی بەکەنیزەکەکـەی کردبـێ چیرۆك بـۆ پیاوان بگێڕێتەوە، بەڵکو حەزی بەوە بـوو خـۆی بەتـەنها گوێبیـستی بێـت، کەنیزەکەکـەش موڵکی خۆی بـوو، (المُغـيرةَ)ی فیقهـزانیش ئـەو گوفتـارەی پـێ گـوت و، بـە(مکـروه) دانـا

---

٤٣٢ _ ((قوت القلوب)).

کەنیزەکەکە گۆرانی بۆ بڵێت و بیهێنێتە جۆش و خرۆش، کەوابوو لێرەدا چ گومانێکت دەبێ سەبارەت بە کەنیزەکێك پیاوان گوێبیستیان بن و، سەمایان پێ بکەن و، بیانهێننە جۆش و خرۆش.

(أبوطالبِ المكّيُّ) بۆ جایزبوونی گوێبیستبوونی گۆرانی خەونی (منامات) بۆ کردونەتە بەڵگە، گوێبیستبوونیشی کردوۆتە چەند جۆرێکەوە، بەڵام ئەمە دابشکردنێکی صوفیەو هیچ بنەڕەتێکی نییە.

پێشتر بەیادمان هێنانەوە کە ئەو کەسەی وارادەگەیەنێت کە گوێبیستی گۆرانی دەبێ و، بەلایەوە کاری تێ ناکات بە ئاستێك نەفسی بەرەو ئارەزووات بجوڵێنێت، ئەوە درۆزنە.

لە (أبي الطَّيِّبِ الطبريِّ)وە دەڵێت: کەسانێکیان دەڵێن: ئێمە بەو سروشت و خووە گوێبیستی گۆرانی نابین کە تایبەتمەندان و خەڵکی ئاسای گوێبیستی دەبن !

دەڵێت: ئەمە نەفامیەکی زۆر گەورەیە لەم کەسانەوە لەبەر دوو شت:

یەکەمیان: بە پێی ئەو قسانەی خۆی بێ دەبێ ئامێرەکانی عود و سەمتور و هەموو ئامیرەکانی دیکەی ڕابواردن بەحەڵاڵ دابنێ، چونکە بەسروشت و خوویەك گوێبیستی دەبێ کە هێچ مرۆڤێك هاوبەشی لەگەڵدا ناکات، لێرەدا ئەگەر ئەو ئامێرانە بەحەڵاڵ دانەنێت، ئەوا هەستاوە بەدژکاری و هەڵوەشاندنەوەی قسەکانی خۆی و، ئەگەر بەحەڵاڵیشیان دابنێ، ئەوا خراپەکارەو لە گوێڕایەڵی پەروەردگار لایداوە.

دووەم: ئەم کەسە لە لایەکی ترەوە بانگەشەی ئەوە دەکات کە لە سروشت و خووی ئادەمیزاد جیابۆتەوەو، گەشتۆتە پلەی فریشتەکان !

ئەگەر ئەم کەسە بانگەشەکارە ئەمە بڵێت، ئەوا دروی بەدەم سروشت و خووی خۆیەوە هەڵبەستووە، هەموو ژیرو ئاقڵێکیش ئەگەر بگەڕێتەوە بۆ نەفسی خۆی درۆی ئەو کەسە دەزانێ، وە دەبێ ئەو کەسە چیتر تێکۆشەر نەبێ بەرامبەر بەنەفسی خۆی و، پێچەوانەکاری ئارەزووەکانی خۆی نەبێ و، هیچ پاداشتێکیشی نەبێ لەبەرامبەر وازهێنانی لە شەهەوات و ئارەزووات چونکە گەشتۆتە پلەی فریشتەکان، ئەمەش هیچ کەسێکی ژیرو ئاقڵ نایڵێت.

وه ئه‌گه‌ر بلێت: من له‌سه‌ر سروشت وخووی ئاده‌میزادم كه دارێـژراوه له‌سـه‌ر شـه‌هوه‌ت و ئاره‌زوو. پێی ده‌لێین: كه‌وابوو چۆن گوێبیستی گۆرانی هه‌ژێنه‌ری خرۆشێنه‌ر ده‌بـێ به‌سروشـت وخوویه‌كی دیكه، یاخود ده‌هه‌ژێی و ده‌خرۆشێی و، شتێكی دیكه له نه‌فستدا چێنراوه.

له (أبوعليّ الرُّوذْباريُّ)یان پرسی سـه‌باره‌ت بـه‌و كه‌سـه‌ی گوێبیـستی گـۆرانی و ئـامێره موسیقیه‌كان (الملاهـي) بووه‌و ده‌لێت: ئه‌مه بـۆ مـن حه‌لاڵـه، چـونكه گه‌شـتومه‌ته پله‌یـه‌ك جیاوازی باروحاڵه‌كان كارم تێناكات، ئه‌وه‌بوو گوتی:

به‌ڵێ، سوێند به‌خوا گه‌شتووه ! به‌ڵام گه‌شتووته سه‌قه‌ره‌ی دۆزه‌خ.

نووسه‌ر ده‌فه‌رمێت:

ده‌لێین _ ابن الجوزي _: نكـۆڵیی لـه‌وه ناكرێـت كـه پێده‌چـێ مرۆڤـ گوێبیـستی دیـڕه شیعرێك، یاخود قسه‌یه‌كی نه‌سته‌ق بێ و، وه‌كو ئاماژه وه‌ریگرێت و، ماناكه‌ی بێزاری بكات، نه‌ك له‌به‌ر ئه‌وه‌ی ده‌نگێكی هه‌ژێنه‌ره، وه‌كو ئه‌و موریده‌ی كه گوێبیستی ژنه گۆرانی بێـژێك بوو ده‌یگوت:

كُلَّ يَوْمٍ تَتَلَوَّنْ... غَيْرُ هَذَا بِكَ أَجْمَلُ

واته: هه‌موو ڕۆژێ ڕه‌وشت و باروحاڵت ده‌گۆڕێت... به‌ڵام ئه‌مه‌ت پێوه جوانه.

ئه‌وه‌بوو هاوارێكی كردو مرد.

ئه‌م موریده مه‌به‌ستی نه‌بوو گوێبیستی ژنه گۆرانی بێژه‌كه بێ و، ئـاوڕی لـه ئاوازه‌كـه‌ش نه‌دایه‌وه، به‌ڵكو له ڕاستیدا ته‌نها ماناكه كوشتی.

پاشان گوێبیستبوونی وشه‌یه‌ك یاخود دێڕێك شیعر كـه لـه بنه‌ڕه‌تـدا مه‌به‌سـتی بیـستنی نه‌بێ، هه‌رگیز وه‌كو بیستنی ئه‌و دێڕه شـیعره زۆره جـۆش و خرۆشـكاره نـابێ، كـه لێـدانی (القضيب)و، چه‌پڵه‌لێدان و، شتی تریشی ده‌چێته‌پاڵ.

پاشان ئه‌و كه‌سه بیسه‌ره مه‌به‌ستی نه‌بوو گوێبیست بێ، ئه‌گه‌ر پرسیاریـشی لێكردینایـه: ئایا بۆ من جایزه مه‌به‌ستم بیستنی ئه‌وه بێت ؟ قه‌ده‌غه‌مان ده‌كرد.

نووسەر دەفەرمێت:

(أبوحامدِ الطُّوسيُّ)(٤٣٣) شتانێکی بۆ کردوونەتە بەڵگە، کە تیایدا لەپلەو پایەی بەرزی تێگەشتنی خۆی دابەزیووە، کۆی گوفتارەکانی دەڵێت:

هیچ دەق و (القیاس)ێك نییە پەنجە ڕاکێشێت بۆ حەرامێتی گوێبیستبوون.

وەڵامی ئەم گوفتارەی ئەوەبوو کە پێشتر باسمان کرد.

هەروەها دەڵێت: هیچ ڕوو و بەهانەیەك نییە بۆ حرامکردنی دەنگێکی خۆش، وە ئەگەر هاوکێشیش (موزون) بوو، دیسان حەرام نابێ، وە ئەگەر تاك حەرام نەبێ، ئەوا کۆش حەرام نابێ، چونکە ئەگەر تاکی ڕێپێدراوەکان (المباحات) کۆبوونەوە، بەکۆ حەڵاڵ دەبن.

دەڵێت: بەڵام تەماشای چۆنیەتی لێ تێگەشتنی شتەکە دەکرێت، بۆیە ئەگەر شتێکی قەدەغەکراوی تێدا بێ، ئەوا دارشتن و هەڵبەستنی حەرام دەبێ و، گوتنیشی حەرام دەبێ.

دەڵێم ـ ابن الجوزي ـ: من سەرم سوڕدەمێنێ لە قسانێکی وەکو ئەمە، چونکە ئەگەر ژێ (الوتَر) بەتەنها بەبێ عود یاخود عود بەتەنها بەبێ ژێ لێدرێت، حەرام نابێ و، هیچ خۆشی و جۆش وخرۆشێك دروست ناکات، بەڵام ئەگەر کۆبونەوەو بوون بەعودێکی تەواو و پێکەوە لێدران بەشێوازێکی تایبەت، ئەوجا حەرام دەبێ و، بێزاریش دەکات.

هەروەها خواردنەوەی ئاوی ترێ جایزە، بەڵام ئەگەر توندیەکی جۆش وخرۆشکاری تێدا بەدیهات، حەرام دەبێ.

هەروەها ئەو کۆبونەوەیەی کە باسی دەکات، جۆش وخرۆشێك دروست دەکات، خووی مرۆڤ لە نێوەنجێتی دەباتە دەرەوە، لەبەر ئەوە ڕێگریی لێ دەکرێت.

---

٤٣٣ ـ هو الغزالي في ((إحيائه)).

(ابنُ عقيلٍ) دەڵێت: دەنگەکان سێ جۆرن: حەرام، (مکروە)، ڕێپێدراو (مُباح):

حەرام: شمشاڵ، نای، (السُّرنا)(٤٣٤)، سەمتور، عود، ڕەبابەو، شتی دیکەی بەو شێوانە، پێشەوا (أحمدُ)ی کوڕی (حنبلٍ) بڕیاری لەسەر حەرامێتیان داوە، هەروەها (الجرَّافة) (والجَنَك)(٤٣٥) یشیان دەخرێتە پاڵ، چونکە ئەمانە جۆش وخرۆش هێنەرن و، مرۆڤ لە نێوەنجێتی دەبەنە دەرەوەو، کار لە سرووشت و خووی زۆربەی خەڵك دەکات، بەهاوشێوەی ئەو کارەی کە مادەی سەرخۆشکەر بە مرۆڤی دەکات، ئەمانە حەرامن ئەگەر لەکاتی خەم و خەفەتێکدا بەکار بێت کە بیوروژێنێت، یاخود لەکاتی خۆشیدا، چونکە پێغەمبەری خوا _ صلی الله علیه وسلم _ قەدەغەی دوو دەنگی بێ ئەقڵی خراپەکاری کردووە: دەنگێك لەکاتی نیعمەتدا، وە دەنگێك لە کاتی بەڵاو کارەساتدا.

(المکروە): (القضیب)ە، بەڵام خودی خۆی جۆش وخرۆشکار نییە، بەڵکو جۆش وخرۆشی دروست دەکات، کاتێ لە گەڵ گۆرانی و شتی تردا لێدەدرێت، کەوابوو ئەم سەر بە گۆرانییە، گۆرانیش (المکروە)ە. کەسانێك لە هاوەڵانمان (القضیب) بە حەرام دادەنێن، وەکو چۆن نامیرەکانی تری ڕابواردن بەحەرام دادەنێن(٤٣٦)، بۆیە حوکمەکەی دوو ڕووی دەبێ ؛ وەکو خودی گۆرانی.

ڕێپێدراو (مُباح): دەفە، پێشتر لە پێشەوا (أحمدُ)ی کوڕی (حنبلٍ)ەوە باسمان بۆ کردن کەوا فەرموویەتی: ئومێدەوارم دەف لێدان لە ئاهەنگی بووك گواستنەوەو بەو هاوشێوانە ئاسایی بێ و هیچی تێدا نەبێ، وە تەپڵ بە (المکروە) دادەنێم(٤٣٧).

---

٤٣٤ _ السرنا: ئامێرێکە لە شمشاڵ دەچێ و لە دار یاخود کانزا دروست دەکرێت، لایەکی تەسکەو گونجاوە بۆ فووپیاکردن، بەڵام لاکەی دیکەی پانە. سەرچاوە لەسەر ئینتەرنێت: www.shorufat.com. وەرگێڕ.

٤٣٥ _ _ الجنك: گیتار، چەنك، تەمورە. بڕوانە: فەرهەنگی شیرینی نوێ. وەرگێڕ.

٤٣٦ _ وهذا أرجح.

٤٣٧ _ پێشتر ئەوەمان ڕوون کردەوە کە دەف لێدان پەیوەستە بە ئاهانگی بووك گواستنەوەو هەردوو جەژنەکەوەو، هیچیتر.

(أَبوحامدٍ) دەیگوت: هەرکەس خوای خۆشبوێت و، ئاشقی بێ و، تامەزرۆی چاوپێکەوتنی بێ، ئەوا بۆ ئەو کەسە گوێبیستن زیاتر ئیشقەکەی بەرامبەر بەخوای تعالی دەچەسپێنێت.

نووسەر دەفەرمێت:

زۆر ناشیرینە سەبارەت بەخوای _ عزَّوجلَّ _ بگوترێت: ئیشقی دەکرێت، پێشتر هەڵەی ئەم گوفتارەمان ڕوون کردەوە.

باشە ئەبێ گوفتاری ئەم گۆرانی بێژە چ چەسپانێك بۆ ئیشقەکەی دروست بکات:

ذَهَبِيُّ اللونِ تَحْسَبُ مِن

وجْنَتَيْهِ النَّارُ تَقْتَدِحُ

واتە: ڕەنگی زێڕینە وادەزانی

گۆناکانی ئاگر دەکاتەوە

(ابنُ عقيلٍ) گوێبیستی کەسێکی صوفی بوو دەیگوت: هەرکات شێخانی ئەم تایەفە سروشت و خوویان بێزار بێت، کەسێك بە گۆرانی و هۆنراوە گوتنەوە بۆ لای خوا دەیانگەڕێنێتەوە.

ئەوەبوو (ابنُ عقيلٍ)یش گوتی: ئەم بێژەرە بێ ئابڕووە، لەڕاستیدا دڵان تەنها بەپەیمانی خواو هەڕەشەکانی لە قورئان و، بەسوننەتی پێغەمبەرەکەی _ صلى الله عليه وسلم _ دەگەڕێنرێتەوە بۆ لای خوای تعالی، چونکە دەفەرمێت: ﴿ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ آيَاتُهُ زَادَتْهُمْ إِيمَانًا﴾ ﴿الأنفال: ٢ ﴾ واتە ﴿ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ آيَاتُهُ ﴾ کاتێکیش ئایەتەکانی خوا بخوێنرێتەوە بەسەریاندا ﴿ زَادَتْهُمْ إِيمَانًا ﴾ بڕوایان زیاد دەبێت(٤٣٨)، نەیفەرمووە: ئەگەر هۆنراوەو گۆرانی بۆ گوترا، جۆش وخرۆشی ڕوی تێ دەکات.

وە هەرکەس نەفسی فریویدا بۆ پەندو عیبرەت وەرگرتن لەو شتانەی کە ئادەمیزاد بەچاکی دادەنێ، وەکو خۆشی دەنگ، ئەوا گرفتار بووە، بەڵکو پێویستە بۆ پەندو عیبرەت وەرگرتن

٤٣٨ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

تەماشای ئەو شتانە بکەین کە خوای تعالی بەرەو ڕووی کردوینەتەوە: وشتر، ئەسپ، بایەکانو، شتی دیکەی بەو جۆرە، چونکە شتانێکی بینراون و سروشت و خووی مرۆڤ ناهێنێتە جۆش وخرۆش، بەڵکو دڵی مرۆڤ والێدەکات دروستکاری بەدیهێنەر بەگەورە دابنێت و، پەندو عیبرەتی لێ وەرگرێت.

لەڕاستیدا تەنها شەیتان هەڵیخەڵەتاندن، بۆیە بوون بەکوێلەی شەهەوەت و ئارەزوواتی نەفسی خۆتان، بەوەشەوە نەوەستان تاوەکو گوتیان: ئەمە ڕاستی و هەقیقەتە، نەخێر ئێوە زیندیقن لە پۆشاکی خواپەرستاندا، چڵێس و بەهەڵپەن لە پۆشاکی زاهیدان و دونیانەویستاندا، (مُشَبِّهَةٌ)ن بڕواتان وایە کە خوای _ عزَّوجلَّ _ ئیشق دەکرێت و ئارەزووی دەکرێت و، خووی پێوە دەگیرێت و دڵ سوکنایی پێ دێت !

ئەمە خراپترین تێگەشتنە، چونکە خوای _ عزَّوجلَّ _ شتەکانی هاوچەشن و هاوشێوە (مشاکلە) دروست کردووە، بۆیە خوو بەیەکترەوە دەگرن و، هەست بەئازار دەکەن بەپێی ڕەگەزە توخمیەکانیان و، بەپێی پێکهاتە لەیەك چووەکانیان لە شێوە نوێ یەکاندا.

ئالێرەوە سەرزەنشت و هەواداری و ئیشقی یەکتر کردنیان بۆ دروست بوو، بۆیە بەئەندازەی نزیکبونەوەیان لە شێوەدا، ئەوا خوو پێوەگرتن و، دڵ سوکنایان بەیکتر زیاتر دەچەسپێت.

تۆ تەماشاکە هەر یەکێك لە ئێمە بەئاو دڵی سوکنایی دێت، چونکە لەشی ئاوی تێدایە، بەڕووك و گژوگیا دڵی سوکنایە، لەبەر نزیکیی مرۆڤ لە زیندەوەرێتیێ وەو لەبواری هێزی پەرەو گەشەکردنی هەردوکیانەوە، بە ئاژەڵان دڵی سوکنایە، چونکە تایبەترین جۆرە کە هاوبەشی دەکات، یاخود نزیکترین شتێکە لێیەوە، باشە هاوبەشی لە نێوان خوای خولقێنەرو مرۆڤی خولقێنراو لە کوێ دایە، بۆ ئەوەی هەواداربوون و ئیشق و ئارەزووبوونی خوا ڕوویدات؟! وە ئەو سازیاربوون و گونجانەی نێوان قوڕو ئاو و خوای ئاسمانەکان لە کوێ دایە ؟!

لەڕاستیدا ئەمانە خەیاڵی شێوەیەکیان بۆ خوای _ سبحانە وتعالی _ کردووە، کە لە دڵاندا دەچەسپێت، بەڵام ئەوە شێوەی خوای _ عزَّوجلَّ _ نییە، بەڵکو بتێکە سروشتو خووو شەیتان وێنەو شێوەیان کێشاوە، وە خوای تعالی وەسفێکی نییە سروشت و خووی ئادەمیزاد

مەیلی بکات، یاخود نەفسەکان نارەزووی بکەن، بەڵکو لەڕاستیدا تەنها لێکترازان و لێك جویێ بوونەوەو جیاوازی پەروەردگارێتی لە خولقێنراوی بەدیهێنراو، لە نەفسی مرۆڤەکاندا هەیبەت و شکۆمەندی بەرامبەر بە پەروەردگاریان دروست دەکات، بۆیە ئەو خۆشەویستی خوایەی کە صوفیەکان بانگەشەی دەکەن لەڕاستیدا تەنها خەیاڵاتی پوچن.

بۆیە پەنا دەگرین بەخوا لە ئەندێشەو خەیاڵاتی خراپ و، کۆسپ و بەرهەڵستکارو ڕێگرە سروشتیەکان کە پێویستە بەحوکمی شەرع لە دڵاندا بسڕێتەوە، وەکو چۆن پێویستە بتەکان بشکێنرێت.

## ✸ رەخنەگرتن لە ڕێبازگەلی صوفیەکان لە بواری گوێ گرتندا:

نووسەر دەفەرمێت:

کۆمەڵێك لە پێشینانی تەصوف نکۆڵیان دەکرد کەسانێك کە تازە دێنە ڕیزی صوفیەکانەوە گوێبیستی گۆرانی بن، چونکە دەیانزانی چ شتێك دڵیان دەوروژێنێ:

لە (عبداللە)ی کوڕی (صالح)وە دەڵێت: (الجُنیدُ) پێی گوتم: ئەگەر موریدت بینی گوێبیستی گۆرانی و شتی تر (السماع) دەبێ، بزانە پاشماوەی هەندێ یاری تێدا ماوە.

لە (أحمدَ)ی کوڕی (محمدِ البرذَعيُّ)وە دەڵێت: گوێبیستی (أباالحسینِ النُّوريَّ) بووم بە کەسانێك لە هاوەڵانی خۆی دەگوت: ئەگەر موریدت بینی گوێبیستی هۆنراوە دەبێ و، هەواداری خۆشگوزەرانیە، بەئومێدی خەیری مەبە.

دەڵێم _ ابن الجوزي _: ئەمە گوفتاری شێخانی ئەم قەوەمەن، لەڕاستیدا تەنها پاشینانیان ڕێی حەزپێکردنی ڕابواردنیان بەنەفسی خۆیان داوە، بۆیە شەڕیان لە خۆیان تێپەڕیوو بۆ دەوروبەر، لە دوو ڕۆوە:

یەکەمیان: بەدگومانی خەڵکی ئاسایی بەرامبەر بە پێشینانیان، چونکە واتێدەگەن هەموویان ئاوەها بوون.

دووەم: بۆ خەڵکی ئاسایی بوێری و زاتکردنیان دروست کرد، بۆ یاریی کردن، چونکە کەسانی ڕەمەك و ئاسایی هیچ بەڵگەیەکیان نییە بۆ ئەو یاریانەی کە دەیکەن، تەنها ئەوە نەبێ کە دەڵێن: فڵان کەس ئاوەها دەکات و ئاوەها دەکات(٤٣٩).

نووسەر دەفەرمێت:

گوێگرتن بەدڵی کەسانێکیانەوە لکاوە، بۆیە پەسەندێتیان داوە بەسەر خوێندنی قورئانداو، لە کاتی گوێگرتندا دڵیان ناسك دەبێتەوە، بەئاستێك لە خوێندنی قورئاندا ئەو ئەندازە دڵ

---

٤٣٩ _ لە نێو زۆرێك لە خەڵکی ئاسایی و هاوشێوەی خەڵکی ئاسایی ئەم سەردەمە هەمان قسە بڵاوە، ئەگەر فەرمانی کارێکیان پێ بکەی، یاخود قەدەغەی شتێکیان لێ بکەی.

ناسكيەيان بۆ دروست نابیٚ(٤٤٠)، ئەمە دەگەڕێتـەوە بـۆ هـەواو ئارەزوويـەكی نـاوەكی كـە بەسـەرياندا زاڵ بـووە, دەگەڕێتـەوە بـۆ سروشـت و خوويـەكی خـراپ، بـەڵام ئـەم كەسـانە تێگەشتنێكی ديكەيان هەيە !

لە (أبي عبدالرحمنِ السُّلَميّ)وە دەڵێـت: لـە ژيـانی مامۆسـتا (أبـي سـهلِ الـصُّعْلوكيِّ)دا ڕەوانەكرام بۆ (مَرْوِ)، پێش دەرچوونم لە ڕۆژانی هەينيدا بەيانيان مامۆسـتا كـۆڕی خوێنـدنی قورئان و خەتمەی هەبوو، كاتی دەرچونم تەماشام كرد كۆڕەكەی لاداوەو، بـۆ (ابـنِ الفَرَغـاني) لەهەمان كاتدا نيشتگەيەكی گۆرانی گوتنی داناوە، بەهۆی ئـەوەوە شـتێك چـووە دڵمـەوەو، دەمگوت: بەڕاستی كۆڕی دەرسی قورئان و خەتمەی بـە نيـشتگەی گـۆرانی گـوتن گۆڕيـوە ! ئەوەبوو ڕۆژێك پێی گوتم: خەڵك چ دەڵێن ؟ منيش گـوتم: دەڵـێن: كـۆڕی دەرسـی قورئـان و خەتمـەی هـەڵگرتوەو، نيـشتگەی گـۆرانی گـوتنی دانـاوە. ئـەويش گـوتی: هەركـەس بەمامۆستاكەی بڵێت: بۆچی، سەركەوتوو نابیٚ(٤٤١).

دەڵێم _ ابن الجـوزي _: ئەمانە بـانگخوازانی تەصـوفن، دەڵـێن: شـێخ باروحـاڵی خـۆی دەدرێتە دەستی خۆی، بەڵام ئێمە كەسمان نييە باروحاڵی خۆی بدرێتە دەستی خـۆی، چـونكە ئادەميزاد بەشەرع و ئەقڵ لە مەبەست ونيازەكانی دوردەخرێتەوەو، ئاژەڵانيش بە قامچی !!

---

٤٤٠ _ ئەمە لای زۆرێك لە لاوان ڕوودەدات، بەتايبەت ئەوانەی سروود بەدەف لێدانەوە گوێی پڕ كردوون، بۆيە ئەوانيش هەموو كاتەكانی خۆيانيان بۆ تەرخان كردووە ! زانستيان بیر چـۆتەوەو، وازيـان لـە زانايـان هێناوە! خوای تعالی ڕێنوێنی ڕێگەی ڕاستيان بكات.

جا ئايا كەسێك هەيە پەندو عيبرەت وەرگرێ.

٤٤١ _ لە كتێبی ((سير أعلام النبلاء))دا گوفتارێكی پێشەوا (الذهبـي)م لەسەر ئەم باسە خوێندۆتـەوە، كە دەڵێت: ((بەڵێ سوێند بەخوا سەركەوتوو دەبیٚ)) !

## ✱ حوكمى گۆرانى بەلاى صوفيەكانەوە:

كۆمەڵێك لە صوفيەكان لەو بڕوایەدان ئەم گۆرانیەی کە پێشتر لە قەومێکەوە باسی حەرامێتیمان بۆ باسکردن و، لە کەسانی دیکەشەوە (کراهە)ت و ناپەسەندێتیمان بۆ گێڕانەوە، بۆ کەسانێکی تر (مُسْتَحَبٌ)و پەسەندە:

لە (أبي عليّ الدَّقاقُ)ەوە دەڵێت: گوێ گرتن بۆ خەڵکی ڕەمەك و تاسایی حەرامە، چونکە نەفس و ئارەزوواتیان تێدا ماوە، بۆ زاهیدان (مُباح)و ڕێگەدراوە، چونکە تێدەکۆشن و نەفسیان لەشەهەوەت و ئارەزووات دەگەڕێننەوە، بۆ هاوەڵانیشمان (مُستَحَبُ)و پەسەندە، چونکە دڵیان زیندووە !!

نووسەر دەفەرمێت:

لە پێنج ڕۆوە ئەمە هەڵەیە:

یەکەمیان: ئێمە پێشتر لە (أبي حامدِ الغزاليّ)وە گێڕامانەوە کەوا گوێ گرتن (مُباح)و ڕێگەدراوە بۆ هەموو کەسێك، (أبي حامدِ)یش لەم کەسە زاناترە.

دووەم: سرووشت و خووی نەفس گۆڕانی بەسەردا نایەت و، لەڕاستیدا تێکۆشان بەرامبەر بەنەفس تەنها بەکاتی کاری دەوەستێنێت، بۆیە هەرکەس بانگەشەی گۆڕینی سروشت و خوو بکات، بانگەشەی مەحاڵ دەکات، وە هەرکاتێك شتێك هات و سرووشت وخووی ورووژاندو، ئەوش نەما کە نەفسی خۆی لێ دوردەخاتەوە، خوو ونەرێتیشی بۆ هەواو ئارەزواتی جاران دەگەڕێتەوە.

سێیەم: زانایان سەبارەت بەحەرامکردن و ڕێگەپێدانی گۆرانی جیاوازیان تێکەوتووە(٤٤٢)، هیچ کەسێکیشیان تەماشای کەسی گوێ گری نەکردووە، چونکە دەیانزانی سروشت وخووی هەموو ئادەمیزاد یەکسانن، بۆیە هەرکەس بانگەشەی ئەوە بکات کە

---

٤٤٢ _ جەماوەریش بەپێشینان و پاشینانەوە لەسەر حەرام کردنین.

سروشت وخوویەکی تایبەتی هەیەو لە سروشت وخووی ئادەمیزاد بەدەرە، بانگەشەی بۆ شتێکی مەحاڵ کردووە.

چوارەم: کۆڕایی دروست بووە لەسەر ئەوەی کە (مُستَحَبُ)و پەسەند نییە، لەڕاستیدا ئەوپەڕی حوکمی (الإباحةُ)و ڕێگەدراوێتیە(٤٤٣)، بۆیە بانگەشەکردن بۆ (استحباب)و پەسەندبوونی گۆرانی، چوونە دەرەوەیە لە کۆڕایی زانایان .

پێنجەم: بەم قسەبێ پێویستە گوێبیستبوونی ئامێری عود (مُباح)و ڕێگەدراو بێ یاخود (مُستَحَبُ)و پەسەند بێ بۆ ئەو کەسانەی کە سروشت و خوویان ناگۆڕێت، چونکە لەڕاستیدا گۆرانی حرام کرا لەبەر ئەوەی کاردەکاتە سەر سرووشت و خووی مرۆڤ، وە بۆ هەواو ئارەزووات بانگی دەکات، بۆیە ئەگەر مرۆڤ دڵنیابوو بۆ ئەوە بانگی ناکات، پێوستە ڕێگەی پێدرێت !

**نووسەر دەفەرمێت:**

کەسانێکیان وایان ڕادەگەیاند ئەم گوێ گرتنە کردەوەیەکی چاکەو هۆکاری نزیك بوونەوەیە لە خوای _ عزَّوجلَّ _ەوە:

(أبوطالبِ المكيُّ) دەڵێت: شێخێکمان لە (الجُنَيْدِ)ەوە بۆی باس کردم و گوتی: لە سێ جێگەدا ڕەحمەت وبەزەیی بەسەر ئەم تایەفەدا دادەبەزێ: لەکاتی خواردندا، چونکە ناخۆن مەگەر لەکاتی برسێتی و پێویستیەکی زۆردا، لە کاتی دەرس خوێندندا، چونکە بەنێو پلەو پایەی ڕاستگۆیان و باروحاڵی پێغەمبەراندا تێدەپەڕن، لە کاتی گوێگرتندا، چونکە بەسۆزەوە گوێ دەگرن و، هەق دەبینن !

دەڵێم _ ابن الجوزي _: لە کاتێکدا ئەگەر ئەمە بە (صحیح)ی لە (الجُنَيْدِ)ەوە هاتبێت و، ئێمەش بەرامبەر بەو پیاوە نیّت پاك و بێ گومان بین، ئەوا هەڵدەگیرێتە سەر ئەو هۆنراوە زوهدیانەی کە ئەوان گوێبیستی دەبوون، چونکە دڵ ناسکی و گریانی بۆ دروست دەکردن،

---

٤٤٣ _ ئەمە گوفتارێکی ناپەسەندە (مرجوح)، وەکو پێشتر بڕیاری لەسەر درا.

بەڵام بۆ ئەوەی لە کاتی وەسفی (سُعْدی) و (لیلی)دا ڕەحمەت و بەزەیی دابەزێت و، ئینجا هەڵبگێڕێتە سەر سیفاتی خوای _ سبحانه وتعالی _، ئەوا جایز نیە مرۆڤ باوەڕی وای هەبێ ! ئەگەر دروستیش بێ ئاماژە (الإشارة) لەوە وەربگێڕێت، ئاماژەکە لە لایەن زاڵبونی سروشت خووەوە نقوم کراوە.

ئەوەی پەنجە ڕادەکێشێت بۆ ئەو شتەی کە باروحاڵەکەی (الجُنَیْدِ)مان پێ لێکدایەوە، ئەوەیە کە ئەو هۆنراوەی لە زەمەنی ئەودا بەدەنگی خۆش دەگوترا وەکو ئەوەی ئەمڕۆ نەبوو، کەچی کەسانێك لە پاشینان گوفتارەکانی (الجُنَیْدِ)یان هەڵگرتۆتە سەر هەموو ئەو گۆرانیانەی کە دەگوترێت.

لە (عبدِالوهَّابِ)ی کوڕی (المُبارَك الحافظُ)ەوە دەڵێت: (أبوالوفاءِ الفَیْروزَبادِيُّ) شێخی خەڵوەتگەی (رباطِ) (الزَّوْزَنيُّ) ڕەفیقم بوو، ئەوەبوو پێی دەگوتم: سوێند بەخوا من نزات بۆ دەکەم و یادت دەکەمەوە لەکاتی دانانی سەرین و گۆرانیدا. دەڵێت: شێخ (عبدِالوهَّابِ) سەری سوڕدەماو، دەیگوت: تۆ بڵێی ئەم پیاوە باوەڕی وابێ ئەوە کاتی نزا گیرابوونە ؟! بەڕاستی کارەساتێکی گەورەیە !

(ابنُ عقیلٍ) دەڵێت: بەڕاستی لێمانەوە بیستوون کەوا نزا لە کاتی گۆرانی وشترەواندا و لە کاتی ئامادەبوونی سەریندا گیرایە، چونکە لەو بڕوایەدان کارێکی چاکەو هۆکاری نزیك بونەوەیەو، مرۆڤ پێی نزیك دەبێتەوە لە خوای تعالی.

دەڵێت: ئەمە کوفرە، چونکە هەر کەسێك لەو بڕوایەدا بێت کە حەرام یاخود (مکروه)و ناپەسەند هۆکاری نزیك بوونەوەیە (قربة)، بەم بڕوابونەی کافر دەبێ.

دەڵێت: خەڵکی لە نێوان حەرامبوون و (کراهة)تیدان.

(صالحُ المُرِّيُّ) دەڵێت: درەنگترین هەستانەوەیەك بۆ کەسێکی کەوتوو، کەسێکە ئارەزووات کەواندویەتی، کەچی واڕادەگەیەنێت ئەوە هۆکاری نزیکبوونەوەیە بۆ خوای تعالی، پێ جێگیرترین کەسێکیش لە ڕۆژی قیامەتدا ئەو کەسەیە کە لە هەموو خەڵك زیاتر کار بە کیتابی خواو سوننەتی پێغەمبەرەکەی (محمد) _ صلی الله علیه وسلم _ دەکات.

# ✸ باسی سەرلێشێواندنەکانی ئیبلیس بەرامبەر بە صوفیەکان لە بواری سۆزدا:

**نووسەر دەفەرمێت:**

ئەم تایەفە ئەگەر گوێبیستی گۆرانی بن سۆز بەخۆیان دێنن، چەپڵەلێدەدەن و، هاوار دەکەن و، پۆشاکەکانیان دەدڕن.

بەڕاستی لەوەدا ئیبلیس سەری لێشێواندوون و، سنوری تێپەڕاندووە.

ئەوەیان کردوتە بەڵگە کە گوایە کاتێ ئەم ئایەتە دابەزێنرا: ﴿ وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمَوْعِدُهُمْ أَجْمَعِينَ﴾ ﴿ الحجر: ٤٣ ﴾ واتە: وە بێگومان دۆزەخ جێگای هەموویانە(٤٤٤). (سلمانُ الفارسيُّ) هاوارێکی کردو، بەسەر سەریدا کەوت و، پاشان چووە دەرەوەو سێ ڕۆژ هەڵهات.

ئەوەشیان کردۆتە بەڵگە کە (أبو وائلٍ) دەیگێڕێتەوەو دەڵێت: بەیاوەری (عبداللهِ) چوینە دەرەوەو (الربيعُ)ی کوڕی (خُثَيم)یشیمان لە گەڵدا بوو، بەلای ئاسنگەرێکدا تێپەڕبووین، (عبداللهِ) هەستاو تەماشای ئاسنێکی کرد، کە لەنێو ئاگرەکەدا بوو، (الربيعُ)یش تەماشای کرد، ئەوەبوو بەلادا لاربویەوەو، خەریك بوو بکەوێت.

پاشان (عبداللهِ) بەرێ کەوت تاوەکو بە ئاگرخانێك گەشتین، لەسەر ڕۆخی ڕوباری فورات، کاتێ (عبداللهِ) ئاگرەکەی لە نێویدا بەدیکرد، کە دەگڕا، ئەم ئایەتی خوێندەوە: ﴿إِذَا رَأَتْهُمْ مِنْ مَكَانٍ بَعِيدٍ سَمِعُوا لَهَا تَغَيُّظًا وَزَفِيرً، وَإِذَا أُلْقُوا مِنْهَا مَكَانًا ضَيِّقًا مُقَرَّنِينَ دَعَوْا هُنَالِكَ ثُبُورًا، لا تَدْعُوا الْيَوْمَ ثُبُورًا وَاحِدًا وَادْعُوا ثُبُورًا كَثِيرًا﴾ ﴿الفرقان: ١٢ _ ١٤ ﴾ واتە ﴿إِذَا رَأَتْهُمْ مِنْ مَكَانٍ بَعِيدٍ﴾ کاتێ (ئەم ئاگرە) لە دورەوە ئەوان دەبینێت ﴿ سَمِعُوا لَهَا تَغَيُّظًا وَزَفِيرً﴾ نرکەو ناڵەی گڕو بڵێسەی دەبیسن (کەنیشانەی ڕق و قینی زۆریەتی لێیان) ﴿وَإِذَا أُلْقُوا مِنْهَا مَكَانًا ضَيِّقًا ﴾ وەکاتێ فڕێ دەدرێنە جێگایەکی تەنگ لە دۆزەخدا ﴿مُقَرَّنِينَ﴾ بەجووت کراوی دەست و قاچ و ملیان لە کۆت و زنجیردا (یا لەشیان بەکۆت و زنجیر پێکەوە

---

٤٤٤ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

بمسراوه) ﴿ دَعَوْا هُنَالِكَ ثُبُورًا ﴾ لەوێدا داوای تیاچوون ومردن دەکەن ﴿ لا تَدْعُوا الْيَوْمَ ثُبُورًا وَاحِدًا ﴾ ئەمڕۆ داوای تەنیا مردنێك مەکەن ﴿ وَادْعُوا ثُبُورًا كَثِيرًا ﴾ بەڵکو داوای مردنی زۆر بکەن(٤٤٥)، ئەوەبوو (الربيعُ) بورایەوەو، بۆ لای کەسوکاری هەڵمانگرت و، (عبدالله) بەلایەوە دانیشت تا نوێژی نیوەڕۆ بکات، بەڵام بەهۆش خۆی نەهاتەوە، پاشان بەلایەوە دانیشت تاوەکو کاتی عەسر، بەڵام بەهۆش خۆی نەهاتەوە، پاشان بەلایەوە دانیشت تاوەکو مەغریب، ئەوەبوو خەبری بویەوەو، (عبدالله)ش گەڕایەوە لای کەسوکاری.

ئەم تاقمە دەڵێن: بەڕاستی لە خەڵکێکی زۆری خواپەرستانەوە بڵاوبۆتەوە، کەوا ئەگەر گوێبیستی قورئان بوایەن، کەسانێکیان دەمردن، کەسانێکیان دەبورانەوە، کەسانێکیشیان هاواریان دەکرد.

ئەمە لە کتێبە زوهدیەکاندا زۆرە.

وەڵامەکەی: ئەوەی لە (سلمانَ الفارسي)وە دەیگێڕێتەوە، مەحاڵ ودرویە، پاشان هیچ (اسناد)ێکی نیە، ئایەتەکەش لە مەکە دابەزی و، لەڕاستیدا (سلمانَ الفارسي) لە مەدینە موسڵمان بوو، وە لە هیچ یەکێك لە هاوەڵانەوە شتێکی بەم جۆرە باس نەکراوە.

بەڵام باسەکەی (الربيعُ)ی کوڕی (خُثَيمٍ)، (راوي)ەکانی جێگەی متمانەپێکردن نین !

پێشەوا (أحمدُ)ی کوڕی (حنبلٍ) دەیفەرموو: (عیسی)ی کوڕی (سُلیم) لە (أبي وائلٍ)ەوە، (لا أعرفه) واتە نایناسم.

(حمزةَ الزياتِ) بە (سفیانَ)ی گوتبوو: دەگێڕنەوە کەوا (الربيعُ)ی کوڕی (خُثَيمٍ) بوراوەتەوە. گوتی: کێ ئەمە دەگێڕێتەوە ؟! لەڕاستیدا تەنها ئەو چیرۆك خوانە دەیگێڕێتەوە _ مەبەستی (عیسی)ی کوڕی (سُلیم) بوو _ ئەوەبوو چاوم پێکەوت و، گوتم: تۆ لە کێ وە دەگێڕیتەوە ؟! ئەم گوفتارەی بە(عیسی) گوت و مەبەستی ئەوەبوو نکۆڵیی لێ بکات !

---

٤٤٥ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

**نووسەر دەفەرمێت:**

ئەمە (سفيانُ الثوريُّ)ە نکۆڵیی لەوە دەکات کەوا (الربيعُ)ی کوڕی (خُثَيمٍ) شتی وای بەسەر هاتبێ، چونکە پیاوەکە لەسەر ڕاڕەوی یەکەمینان بوو، هیچ کەسێك لە هاوەڵان و (تابعين)یش شتی وایان بەسەر نەدەهات.

لە ڕوانگەی وادانانی ڕاستێتی شتەکەوە دەڵێین _ ابن الجوزي _: ڕەنگە مرۆڤ بەهۆی ترسەوە ببورێتەوە، ترسەکە بێدەنگ و خامۆشی بکات و، جووڵەی تێدا نەمێنێت، وەکو مردووی لێبێت، لێرەدا نیشانەی کەسی ڕاستگۆ ئەوەیە کە ئەگەر لەو کاتەدا بەسەر دیوارێکەوە بێ، دەکەوێتە خوارەوە، چونکە هۆشی نەماوە، بەڵام کەسانێك بانگەشەی سۆز بکەن و، خۆیان بپارێزن بۆ ئەوەی پێیان هەڵنەخلسکێت و، پاشان ئەو سنورەش تێپەڕێنن بۆ دڕاندنی پۆشاك و، هەموو کارێکی ناشیرین و ناپەسەند لە شەرعدا ئەنجام بدرێت، بێگومان دەزانین ئەو کەسە شەیتان یاری پێ دەکات.

**نووسەر دەفەرمێت:**

بزانە _ خوا سەرکەوتوت بکات _ بەدڵنیایی دڵی هاوەڵان پاك و بێگەردترین دڵان بوون، لەکاتی سۆزیشدا لە گریان و دڵکزیی (خشوع) زیاتر سنوریان نەدەبەزاند.

وهذا حديثُ الْعِرْبَاضِ بْنِ سَارِيَةَ: ((وَعَظَنَا رَسُولُ الله _ صلى الله عليه وَسَلَّمَ _ مَوْعِظَةً بَلِيغَةً ، ذَرَفَتْ مِنْهَا الْعُيُونُ ، وَوَجِلَتْ مِنْهَا الْقُلُوبُ))(٤٤٦).

واتە ئەمە فەرموودەکەی (العِرْبَاضِ)ی کوڕی (سَارِيَة)یە کە دەفەرمێت: ((پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ ئامۆژگاری کردین بە ئامۆژگاریەکی زۆر ڕەوان، بەهۆیە چاوەکان فرمێسکیان دەڕشت و، دڵەکانیش دەترسان)).

---

٤٤٦ _ رواه أحمد (٤ / ١٢٦ و ١٢٧)، وأبوداود (٤٦٠٧)، والترمذي (٢٧٦)، وابن ماجة (٤٢و ٤٣و ٤٤).

وصحَّحه الضياء المقدسي في ((اتباع السنن)) (رقم ٢).

وانظر لزيادة التخريج تعليقي عليه.

(أبوبكرِ الآجُرِّيُّ) دەڵێت: (العِربَاضِ) نەیفەرموو: هاوارمان کرد ! لە سنگی خۆمانـان دا ! وەکو زۆرێك لە نەفامان دەیکەن، کەوا شەیتان یاریان پێدەکات !

لە (حُصَیْن)ی کوڕی (عبـدالرحمنِ)ەوە دەڵێـت: بـە (أسمـاءَ)ی کـچی (أبـي بکـرِ)م گـوت: باروحاڵی هاوەڵانی پێغەمبەری خوا _ صلی الله علیه وسلم _و خاوخێزانی لەکاتی خوێندنی قورئاندا چۆن بوو ؟ فەرمووی: بەجۆرە بوون کە خوا باسیان دەکات _ یاخود بەو شێوە بـوون کە خوای تعالی وەسفیان دەکات _ چاوانیان فرمێسکی دەڕشـت و، پێـستیان تـەزووی پێـدا دەهات، پێم گوت: ئالێرە پیاوانێك هەن ئەگەر قورئان بەسەر هەرکەسـێکیاندا بخوێنرێتـەوە، دەبورێتەوە، ئەوەبوو فەرمووی: پەنا دەگرم خوا لە شەیتانی نەفرەت لێکراو !

لە (عِکْرِمَةَ)ەوە دەڵێت: لە (أسماءَ)ی کـچی (أبـي بکـرِ)م پرسـی: ئایـا هـیچ کەسـێ لـە پێشینی چاك لە ترساندا دەبورایەوە ؟ فەرمووی: نەخێر، بەڵکو دەگریان.

لە (أبي حازمِ)ەوە دەڵێت: (ابنُ عُمر) _ خوای لێ ڕازی بێت _ بەلای پیـاوێکی عێراقیـدا تێپەڕبوو کەوتبوو، فەرمووی: ئەمە چێتی ؟ گوتیـان ئەگـەر قورئـانی بەسـەردا بخوێنرێتـەوە ئەمەی تووش دەبێ ! فەرمووی: ئێمە بەدڵنیایی لە خوای تعالی دەترسێین و ناشکەوین !!

لە (قَتادةَ)ەوە دەڵێت: بە(أنس)ی کوڕی (مالـكِ)یـان گـوت: کەسـانێك ئەگـەر قورئانیـان بەسەردا بخوێنرێتەوە دەتۆقن و دەبورێنەوە ! فەرمووی: ئەمە لە کردەوەکانی (الخوارج)ە.

لە (أحمـدَ)ی کـوڕی (سـعیدِ الدمـشقيُّ)وە دەڵێـت: (عبـدَاللهِ)ی کـوڕی (الـزُّبیرِ) هـەواڵی پێگەشت کەوا (عـامر)ی کوڕی هاوڕێیەتی کۆمەڵێکی کردووە، کە لەکاتی خوێندنی قورئاندا دەتۆقن و دەبورێنەوە، ئەوەبوو پێی گوت: ئـەی (عـامرُ) ! ئەگـەر بـزانم هاوڕێیـەتی ئەوانـە دەکەی کە لە کاتی خوێندنی قورئاندا دەبورێنەوە، دڵنیابە فەلاقەت دەکەم.

لە (عامرِ)ی کوڕی (عبدَاللهِ)ی کوڕی (الزُّبیرِ)ەوە دەڵێت: هاتم بۆ لای بابم، پێی گـوتم: لـە کوێ بووی ؟ گوتم: کۆمەڵانێکم دۆزیوەتەوە لەوان چاکترم چـاو پـێ نەکـەوتووە یـادو زیکـری خوای _ عزَّجلَّ _ دەکەن، کەسانێکیان دەلەرزێن تا دەبورێتەوە، لەترسی خوای _عزَّجلَّ_دا، منیش لە گەڵیاندا دانیشتم.

بابم فەرمووی: چیتر لە گەڵیاندا دامەنیشە.

بابم تەماشای کردم وەکو ئەوەی قسەکانی کاری تێنەکردبێتم، ئەوەبوو فەرمووی: پێغەمبەری خوام بینی _ صلی الله علیه وسلم _ قورئانی دەخوێندەوەو، (أبابکرِ) و (عُمر)یشم بینی قورئانیان دەخوێندەوەو، ئەمەیان تووش نەدەبوو، ئایا بەبۆچۆنی تۆ ئەمانە لە (أبابکرِ) و (عُمر) دڵکزترن (أخشع) بۆ خوای تعالی؟!

تەماشام کرد ئەوە ئاوەهایە، بۆیە وازم لێ هێنان(٤٤٧).

لە (عمرو)ی کوڕی (مالك)ەوە دەڵێت: لە کاتێکدا ئێمە لای (أبي الجَوزاءِ) دانیشتبوین و، قسەی بۆ دەکردین، لە پڕ پیاوێك کەوتە خواریّ و، تێکچوو، (أبو الجَوزاءِ)یش بەبازدان هەوڵیدا بگاتە لای، پێی گوترا: ئەی (أبا الجوزاءِ) ! ئەم پیاوە نەخۆشی (المُوتَةُ)ی(٤٤٨) هەیە، گوتی: بەڕاستی وامدەزانی لەو کەسانەیە کە سۆز بەخۆیان دێنن و خۆیان وەکو مردوو لێ دەکەن، ئەگەر لەوان بوایە فەرمانم دەکرد، لە مزگەوت بکرێتە دەرەوە(٤٤٩)، چونکە خوای تعالی دەفەرمێت: ﴿ تَرَى أَعْيُنَهُمْ تَفِيضُ مِنَ الدَّمْعِ ﴾﴿ المائدة: ٨٣ ﴾ واتە ﴿ تَرَى أَعْيُنَهُمْ ﴾ دەبینی چاوەکانیان ﴿ تَفِيضُ مِنَ الدَّمْعِ ﴾ لە فرمێسك (پڕدەبیّ)و دەڕژیّ(٤٥٠)، یا فەرموویەتی: ﴿ تَقْشَعِرُّ مِنْهُ جُلُودُ الَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ ﴾﴿ الزمر: ٢٣ ﴾ واتە ئەو کەسانەی لە

---

٤٤٧ _ ئەمە ڕەوانترین پەندو عیبرەتی تێدایە بۆ زۆرێك لەو لاوانەی فریودەخۆن بە کەسانی ئەهلی بیدعەت بەهۆی ڕواڵەتی ئەو چاکێتیەی بەئەهلی بیدعەتەوە دەردەکەوێت، کەچی لە گومڕایدا نقوم بوونە، ئەوانە لە بواری حوکمدا سوننەتیان نەکردۆتە پێشەنگ ، بەڵکو سۆزو ئارەزوواتی خۆیانیان کردۆتە پێشەنگ !

٤٤٨ _ المُوتَةُ: جۆرێکە لە فیّ و پەرکەم.

٤٤٩ _ أورده الضیاء في ((اتباع السنن)) (ص٨٨)، فانظره بتعلیقي.

٤٥٠ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

پەروەرگاریان دەترسن پێستیان تەزووی پیادێ (بەبیستنی قورئان)(٤٥١)، بۆیە دەبێ ڕەفتاریان بەگوێرەی فەرمانی خوا بێ، نەك بە خۆ بوراندنەوە.

(جریرِ)ی کوڕی (حازمٍ)، (محمد)ی کوڕی (سیرینَ)ی بینی پێی دەگوترا: ئالێرە پیاوانێك هەن ئەگەر قورئان بەسەر کەسێکیاندا بخوێندرێتەوە دەبورێتەوە، ئەوەبوو (محمد)ی کوڕی (سیرینَ)یش فەرمووی: کەوابوو کەسێکیان لەسەر دیوارێك دادەنیشێنرێت، پاشان قورئانی بەسەردا دەخوێندرێتەوە، لە سەرتاوە تا کۆتایی، ئەگەر کەوتە خوارێ، ئەوە ڕاستگۆیە !

چونکە (محمد)ی کوڕی (سیرینَ) وای بۆ دەچوو ئەو کاریان خۆدەرخستن و خۆوانیشاندان زۆر لەخۆکردنەو، ئەو کارە بەراست و بەهەق لە دڵەوە ئەنجام نادەن.

ڕۆژێك (الحَسَنِ) وەعزو ئامۆژگاری دەکرد، پیاوێك لە نیشتگەکەیدا نەفەسێکی بەرزی دا، ئەوەبوو پێی گوت: ئەگەر ئەوەت بۆ خوا ئەنجام دابێت، دڵنیابە شوهەرەت و ناوبانگی خۆتت دەرکرد، ئەگەر بۆ شتێکی تری جگە لە خواش بێ، بەڕاستی تیاچویت.

لە (عبدِالکریمِ)ی کوڕی (رُشَیْدِ)ەوە دەڵێت: لە ئەڵقەکەی (الحَسَنِ)دا بووم، پیاوێك دەستیکرد بەگریان و، دەنگی بەرز بویەوە، (الحَسَنِ)یش فەرمووی: بەڕاستی شەیتانە کە ئەم پیاوەی هێناوەتە گریان ئێستا.

لە (أبي صفوانَ)ەوە دەڵێت: (الفُضَیْلُ)ی کوڕی (عِیاضٍ) بەکوڕەکەی خۆی گوت کە کەوتبوو: کوڕم ! ئەگەر ڕاست دەکەیت، دڵنیابە خۆتت ئاشکرا کردووە، ئەگەر درۆش بکەیت، بەڕاستی تیاچووی و نەفسی خۆتت فەوتاندووە.

لە (محمدِ)ی کوڕی (أحمدَ النَّجارِ المُرتَعِش)ەوە دەڵێت: (أباعُثمانَ سعیدَ)ی کوڕی (ابنَ عثمانَ)ی واعیزم بینی، کەمرۆڤێك لە پێش دەستیدا سۆزی بەخۆی هێنابوو، پێی گوت: کوڕم! ئەگەر ڕاستگۆ بیت، بەڕاستی هەرچیت هەبوو ئاشکرات کرد، ئەگەر درۆش بکەی، بەڕاستی هاوبەشت بۆ خوا بڕیار داوە.

---

٤٥١ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

## ✱ ڕەخنەگرتن لە ڕێبازگەلی صوفیەکان لە بواری سۆزدا :

نووسەر دەفەرمێت:

ئەگەر کەسێك بلێت: لەراستیدا بەرامبەر بەڕاسگۆیان ئەم قسانە دەکرێ، نەك بەرامبەر بەئەهلی ڕوپامای (الریاء)، ئەی چ دەلێی سەبارەت بەکەسێك سۆزی پێگەشتبێ و، توانای لە خۆ دورخستنەوەی نەبێ !

وەڵامەکەی: سەرەتای سۆز بێزاریەکە لە ناوەڕۆکدا، ئەگەر مرۆڤ توانی واز بەنەفسی خۆی بێنێ، بۆ ئەوەی کەس بەباروحالی نەزانێ، شەیتان لێی نائومێد دەبێ و، لێی دوردەکەوێتەوە، وەکو (أَيُّوبُ السَّخْتِيانيُّ) کاتێ فەرموودەی باس کردایە دەترساو، ئاو بە چاوو لوتێدا دەهاتە خوارێ، بۆیە لووتی دەسڕی و، دەیگوت: ئای کە هەڵامەتەکەم توندە !

بەڵام ئەگەر مرۆڤ نەفسی خۆی پشت گوێ خست و، گوێی بەئاشکرابوونی سۆزەکەی نەدا، یاخود حەزی بەوەبوو خەڵك پێی بزانن، شەیتان لووتبەرزی دەیگرێ و، ئەمیش بێزار دەبێ، بەئەندازەی لووتبەرزیەکەی شەیتان.

## ✸ دورخستنەوەی سۆز:

ئەگەر کەسێك بڵێت: وادادەنێین باسەکەمان سەبارەت بەو کەسەیە کە تێکۆشاوە بۆ لادانی سۆزەکەی، بەڵام توانای ئەوەی نەبوو، وە شتەکەی بەسەردا زاڵ بوو، کەوابوو لە کویێ وە شەیتان دەچێتە ژورەوە.

وەڵامەکەی: ئێمە نکۆڵیی لە لاوازی سروشت و خووی هەندێ کەس ناکەین بەرامبەر بە لادانی سۆز، کەچی نیشانەی کەسی ڕاستگۆ ئەوەیە کە توانای لادانی سۆزەکەی نابێت و، ناشزانێت چ بەسەر هاتووە، بۆیە ئەم باروحاڵەی لە ڕەگەزی ئەو فەرمایشتەی خوای تعالایە کە دەفەرمێت: ﴿ وَخَرَّ مُوسىَ صَعِقاً ﴾﴿ الأعراف: ١٤٣ ﴾ واتە موساش بەبێ هۆشی کەوت بەڕوودا(٤٥٢).

لە (خالدِ)ی کوڕی (خِدَاش)ەوە دەڵێت: (عبدِاللهِ)ی کوڕی (وهبٍ) کتێبی ((أهوالِ القيامةِ)) واتە مەترسیەکانی قیامەتی بۆ خوێنرایەوە، ئەوەبوو کەوت و لە هۆش خۆی چۆوە، نیتر یەك وشە قسەی نەکرد تاوەکو پاش چەند ڕۆژێك مرد.

نووسەر دەفەرمێت:

بەڕاستی خەڵکێکی زۆر بەهۆی گوێبیستبوونی وەعزەوە مردوون و، کەسانێکیش لە هۆشی خۆیان چونەتەوە.

بەڵام ئەم سۆز بەخۆ هێنانەو ئەو جوڵانەوانەی کە کەسە سۆزبەخۆهێنەرەکان دەیکەن و، ئەو هاوارکردن و، تێکچوون و، بێ سەروبەر کردارکردنە، ڕواڵەتی وادەردەکەوێت کە مرۆڤ خۆی بەخۆی دەیکات و، شەیتانیش یارمەتیدەریەتی.

ئەگەر گوترا: ئایا کەسی دڵسۆز تووشی کەموکوڕی دەبێ بەهۆی ئەم باروحاڵە سۆزەوە کە کوتوپڕ تووشی بووە ؟

---

٤٥٢ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

دەگوترێت: بەڵێ: لە دوو لاوە:

**یەكەمیان:** بەڕاستی ئەگەر زانستی بەهێز بوایە، وازدەهێنا.

**دووەم:** سەرپێچی ڕێبازی هاوەڵان و (التابعين) ڕەفتاری كـردووەو، ئەمــەش بەســە وەكـو كەم وكوڕیەك.

لە (خَلَف)ی كـوڕی (حَوْشَـب)ەوە دەڵـێ: (خَـوَّاتٌ) لـە كـاتی زیكـردا دەلـەرزا، ئـەوەبوو (إبـراهیمُ) پێی گوت: ئەگەر خۆتت بۆ دەگیرێ، گوێ بەوە نادەم كە بایەخت پێ نەدەم ! ئەگەر توانای خۆگرتنیشت نیە، بەڕاستی پێچەوانەی ئەوانی پێش خۆتت ئەنجام داوە.

لە (ریواية)تێكیشدا: سەرپێچی كەسانی لە خۆت چاكترت ئەنجام داوە.

دەڵێم _ ابن الجوزي _: مەبەست بە (إبراهیمُ): (إبراهیمُ النَّخَعـيُّ)ە، پیاوێك بـوو دەسـتی بەسوننەتەوە گرتبوو، بەتوندی پەیڕوی (الأثر)و پێشینی چاكی پێش خۆی دەكرد.

(خَوَّاتٌ)یش لـە پیاوچـاكان بـوو، لـە خـۆ وانیـشاندان و خـۆ وادەرخـستنەوە (التـصنُّعُ) بەدووربوو، كەچی (إبراهیمُ) گوفتاری وای پێ دەڵێ، ئەی ئەبێ ئەو كەسانەی باروحاڵەیان لـە خۆ وانیشاندان و خۆ وادەرخستنەوە (التصنُّعُ) بەدور نییە چۆن بێ ؟!

## ✱ ئەهلی تەصوف ئەگەر جۆش و خرۆشی گرتنی چەپلەلێدەدەن :

له (أَبي عليّ الكاتبِ)ەوه دەڵێت: (ابنُ بَنانٍ) سۆزی بەخۆی دەهێناو، (أَبوسعيدالخَرَّاز)یش چەپڵەی بۆ لێدەدا !

نووسەر دەفەرمێت:

چەپڵەلێدان کارێکی ناشیرین و ناپەسەندە، جۆش و خرۆش هێنەرەو، مرۆڤ لە نێوەنجێتی دەباتە دەرەوەو، ژیرو ئاقڵانیش خۆیان لێ بەدور دەگرن، بکەرانی خۆیان دەچوێنن بەو هاوبەش پەرستانەی کە لە ماڵی خوادا چەپڵەیان لێدەدا ، ئەوەبوو خوای _ عزَّوجلَّ _ زەمی ئەو کردەوەی کردن و، فەرمووی: ﴿ وَمَا كَانَ صَلاتُهُمْ عِنْدَ الْبَيْتِ إِلا مُكَاءً وَتَصْدِيَةً ﴾ (الأنفال: ٣٥) واتە ﴿ وَمَا كَانَ صَلاتُهُمْ عِنْدَ الْبَيْتِ ﴾ وە نوێژی ئەوان (بت پەرستان) لە ماڵی خوادا هیچ نییە ﴿ إِلا مُكَاءً ﴾ جگە لە فیکە کردن ﴿ وَتَصْدِيَةً ﴾ ولە چەپڵەلێدان نەبێت(٤٥٣).

هەروەها چواندنی تێدایە بە ژنان، بۆیە ژیرو ئاقڵ خۆی بەدور دەگرێت کە لە ئاستی نارامیی و هیبەت و ڕێزی خۆی دابەزێ و کردەوەی کافران و ژنان ئەنجام بدات.

---

٤٥٣ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

## ✵ ئەگەر جۆش و خرۆشیەکەیان بەهێز بوو سەما دەکەن:

ئەگەر جۆش و خرۆشیان بەهێزبوو سەما دەکەن.

کەسانێکیان گوفتاری خوای تعالی سەبارەت بە (أَیوبَ) پێغەمبەر دەکەنە بەڵگە: ﴿أرْكُضْ بِرِجْلِكَ﴾ ﴿ص: ٤٢ ﴾ واتە پێت بدە بەزەویدا(٤٥٤).

دەڵێم _ ابن الجوزي _: ئەمـە بەڵگـە هێنانەوەیـەکی سـاردە، چـونکە ئەگـەر فـەرمانی پێکردایە لە خۆشیاندا پێی بەزەویدا بدات، دەبـووە بهانەیـەك بـۆ ئـەوان، بـەڵام لەڕاسـتیدا فەرمانی پێکرد پێی بەزەویدا بدات، بۆ ئەوەی ئاوەکە هەڵقوڵێت.

(أبنُ عقیلٍ) دەڵێت: کەسێك تاقیکراوەتەوەو پاشان بۆ لادانی ئەو بەڵایە فەرمانی پێکراوە پێی بەزەویدا بدات بۆ _ هەڵقوڵینی ئاوەکە وەکـو مـوعجیزە _ باشـە بـاری ئـەم کەسـە چ بەڵگەیەکی تێدایە بۆ ڕێدان بە سەماکردن ؟!

ئەگەر جوڵاندنەوەی قاچێك کە جرِوجانەوەر لاوازی کردووە، جایز بێت بکرێت بەبەڵگە بـێ بۆ شیاوێتی سەماکردن لە ئیسلامدا، ئەوا جـایزە فەرمایـشتی خـوای تعـالی سـەبارەت بـە (موسی) پێغەمبەر: ﴿ اضْرِبْ بِعَصاكَ الحَجَرَ ﴾﴿ البقـرة: ٦٠ ﴾ واتـە گۆچـانەکەت بـدە بـەو (تاشە) بەردەدا(٤٥٥)، بەڵگە بێ بۆ ئەوەی بێ ڕوحە وشکەکان (جماد) بەدار لێیان درێت.

پەنادەگرین بەخوا لە یاریکردن بەشەرع.

کەسانێك لە پشتگیرانیان ئەوەی بۆ کردوون بەبەڵگە کەوا پێغەمبـەری خـوا _ صـلی الله علیه وسلم _ بە (علـي) فەرمووی: ((تۆ لە منـی و منـیش لـە تـۆم))، ئـەوەبوو (علـي) لـە خۆشیدا لەسەر یەك قاچ هەڵبەزی، بە(جعفـر)یـشی فـەرمووی: ((تـۆ (خَلْـق)ت واتـە شـیوەی دەروەت وەکو سپیتی و درێژی وهتد، وە (خُلُق)ت واتە شـێوەی ناوەکیـت وەکـو میهربـانی و

---

٤٥٤ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

٤٥٥ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

زانين و هتد له من دهچیّ))، ئهوهبوو (جعفر)یش له خۆشیدا له سهر یهك قاچ ههڵبهزی، وقالَ لزيدٍ: ((أنتَ أخونا ومولانا))، فحجلَ(٤٥٦)، واته به (زيدِ)یشی فهرموو: ((تـۆ بـرای ئیمـانی ئێمهو ئازادكراوی ئێمهی))، ئهوهبوو (زيدِ)یش له خۆشیدا لهسهر یهك قاچ ههڵبهزی.

ومنهُم من احتجَّ بأنَّ الحبشةَ زَفَنَتْ والنبـيّ _ صلى الله عليه وسلم _ ينظرُ إليهِم(٤٥٧).

واته كهسانێكیـشیان ئـهوهیان كردۆتـه بهڵگـه كـهوا حهبهشـهیهكان سـهمایان دهكـردو، پێغهمبهری خواش _ صلى الله عليه وسلم _ تهماشای دهكردن.

وهڵامهكهی: (الحَجـل)، جۆرێكه له ڕێكردن و ههڵبهزین، له كاتی خۆشیدا دهكرێـت، ئـیتر ئهمه كهی له سهماكردن دهچیّ.

ههروهها (زَفْنُ الحبـشة) جۆرێكه له ڕێكردن له گهڵ خوێندنهوهی شیعری ناسك، لـه كـاتی ڕووبهڕووبوونهوهی دوژمـندا ئهنجام دهدرێت(٤٥٨).

ههروهها (أبوعبدالرحمنِ الـسُّلمي) بهڵگهی بۆ هێناونهتـهوه لهسـهر شـیاوێتی سـهماكردن بهوهی له (سعيدِ)ی كوڕی (المسيَّب)هوه دهگێڕێتهوه: كه گوایـه بهههنـدیّ كۆڵـانی مهككـهدا تێپهڕ بوو و، گوێبیستی (الأخضرَ الحَدَّاءَ) بوو لـه مـاڵی (العـاصِ)ی كـوڕی (وائـلِ)دا بهمـه گۆرانی دهگوت:

تضوّع مِـسكاً بطنُ نَعْمَانَ أن مَشَتْ ... بـــه زينبٌ في نِسـوة عَطِراتِ
ولّـا رأت رَكْبَ النمــيريّ أعرضتْ ... وكُنَّ مِنَ انْ يَلْقَيْنَـــه حَذِرات.

---

٤٥٦ _ رواه البيهقي في ((السنن الكبرى)) (١٠ / ٢٢٦).

وفي سنده هانيء بن هانيء، منكر الحديث.

وذِكرالحَجْل فيه منكَر، فقد تفرَّدَ به، وورد من طرق كثيرة صحيحه دونه.

وانظر تعليقي على ((تخريج الأربعين السلمية في التصوُّف)) (ص١٤٩) للسخاوي، ففيه زيادة بيان.

٤٥٧ _ رواه مسلم (٨٩٢) (٢٠).

٤٥٨ _ پێشهوا (النووي) فهرموویهتی:

((زانایان ئهوهیان لێكداوهتهوه بهوهی بهچهكهكهنیانهوه ههڵدهپـهڕین و، بـه حهربهكـهنیان یاریـان دهكـرد، بهشـێوازێكی نزیـك بهسـهماكردن، چـونكه هـهموو (ریوایـه)تـهكان باسـی یـاریكردنی ئـهوان دهكـهن بهحهربهكانیانهوه، بۆیه ئهم وشهیه لێكدهدرێتهوه بهگوێرهی گونجانی له گهڵ ههموو (ریوایه)تهكاندا))..

واته: بۆنی میسك له (بطنُ نَعْمَانَ)دا بڵاودەبێتەوە ئەگەر

زەینەب له نێو ژن گەڵێکی بۆن خۆشدا له نێویدا ڕێ بکات

کاتێ زەینەب کاروانی (النميريّ) بەدیکرد ڕووی وەرگێڕا

کەچی پێش ئێستا بەپارێزەوە چاویان پێ دەکەوت.

دەڵێت: ماوەیەك پێی بەزەویدا کێشاو، گوتی: ئەمە لەوانەیە کە گوێبیستبوونی بەلەزەتە. ئەوان شیعریان بۆ (سعیدِ)ی کوڕی (المسّیب) دەگێڕایەوە.

نووسەر دەفەرمێت:

(إسناد)ی ئەم باسە (مقطوع)و تارێکە(٤٥٩) بە(صحيح)ی لە (ابن المسيّب)ەوە نەگێڕدراوەتەوەو، ئەمە شیعری ئەو نییەو، (ابن المسيّب) زۆر لەوە بەرێزتر بوو، ناوبانگی ئەم دێڕە شیعرانە دەگەڕێتەوە بۆ (محمَّد)ی کوڕی (عبدِالله)ی کوڕی (نُمَيْرِ النُّمَيْرِيٌّ) شاعیر !

پاشان گریمان (ابن المسيّب) پێیەکانی بەزەویدا کێشابێ، ئەوە هێچ بەهانەیەکی تێدا نییە بۆ شیاوێتی سەماکردن، چونکە پێدەچێ مرۆڤ پێیەکانی بەزەویدا بکێشێ، یاخود بەدەستی لە شتێکی زەوی بدات و گوێبیستی بێ و، بەسەما ناونابرێت.

چەند ناشیرینە ئەم خۆپێوەندکردنە ! وە جارێك یا دووجار لێدانی پێ بەزەویدا لە چ ئاستێکی سەماکردنی ئەواندایە، کە بەهۆیەوە لە ڕاڕەوی ژیرو ئاقڵان دەچنە دەرەوە !

پاشان با وازبێن لە بەڵگە هێنانەوە، وەرن با پێکەوە ئەقڵ بکەین بەدادوەر: سەماکردن چ مانایەکی تێدایە بەدەر لە یاریکردن، کە لە بنەڕەتدا تەنها بۆ منداڵان سازیارو گونجاوە ؟!

وە چ تێدایە تاوەکو دڵان بەرەوە ڕۆژی دوایی بجوڵێنێت ؟!

سوێند بەخوا ئەمە تەنها کەللەڕەقیەکی ساردە.

شێخێك لە (الغزَالي)وە بۆی باسکردم کەوا گوتویەتی: سەماکردن گەمژەیەکە لە نێوان هەردوو شاندا مەگەر بەماندووبون لاچێت.

---

٤٥٩ _ وقال السخاوي في ((تخريج الأربعين السلمية)) (ص١٤٨)

((وعجبتُ للمصنف كيف اقتصر على هذه الحكاية المنقطعة ؟!)).

(أبوالوفاءِ)ی كوڕی (عَقيلٍ) دەڵێت: قورئان لەسـەر قەدەغـەی سـەماكردن بڕیـاری داوە، خـوای _ عزَّوجـلَّ _ دەفـەرمێت: ﴿ولا تَمْـشِ في الأرضِ مرَحـاً ﴾﴿ لقمـان: ١٨ ﴾ واتــە وە بەكەشخەو بەفیزەوە مـەڕۆ بەزەویـدا(٥٦٠). وە زەمـی ئـەو كەسەشـی كـردووە كـە شـانازی دەكاتو گەورەیی دەنوێنێ و، دەفـەرمێت: ﴿ إنَّ الله لا يُحِـبُّ كُـلَّ مُخْتـالٍ فخـورٍ﴾ ﴿لقمـان: ١٨﴾ واتــە چـونكە بەڕاسـتی هـیچ خۆیـەزلزانێكی شـانازیكەرێكی خـۆش نـاوێ(٤٦١)، سـەماكردنیش توندترین خۆشی و لەخۆباییبون و لووتبەرزیە.

ئایا ئێمە نەبوین كە (النبیذ)مان بەپێی مەی و شەراب (القیاس) كرد چونكە هـەردوكیان لە بـواری جـۆش و خـرۆش كـردن و، سـەرخۆش كردنـدا سـازیارن ؟! كـەوابوو بـۆ ئـامێری (القضیب)و بەئاوازەوە شیعر خوێندنەوە بەپێی سەمتوورو شمشاڵ و تەپڵ (القیـاس) نەكـەین، چونكە هەردوو لا وەكو یەك جۆش وخرۆشكارن ؟!

ئایا شتێك هەیە ئەقڵ و شكۆداری سووك بكات و، مرۆڤ لە ڕاڕەوی حەوسەڵەو خۆڕاگرتنو ئەدەب بەرێتە دەرەوە، لە كەسێكی ڕیشدار ناشیرینتر بێ كە سـەما دەكـات ؟! ئـەی ئەگـەر كەسانی بەتەمەن بن سەمابكەن و چەپڵەلێبەن لەسەر ئیقاعی ئاوازو لێدانی (القضیب) دەبـێ چۆن بێ، بەتایبەت ئەگەر دەنگی ژنان و لووسكەی بێ تووكی تێدا بێ ؟!

ئایا باشە كەسێك مـردن و پرسـیارو (الحشر) و (الـصراط)ی لـە پێـشەوە بـێ و، پاشـان بـەدڵنیایی یـا بـۆ بەهەشـت یـاخود بـۆ دۆزەخ دەچـێت، یـاخی بـی و بەلەسـە بـی و، بـە سـەماكردنەوە هەڵبەزین و دابەزین بكات، وەكو چۆن ئاژەڵ بەلەسە دەبێ و هەڵـدەتیزێنێت و، وەكو ژنانیش چەپڵە لێدات.

سوێند بەخوا شێخانی زەمەنی خۆمم بینیوە ددانێكیان دەرنەكەوتووەو نەبینراوە لە كـاتی زەردەخەنەیەكدا سەرەڕای پێكەنین، لەگەڵ ئەوەی بەردەوام تێكەڵیان بووم، وەكـو شـێخ (أبـي القاسم)ی كوڕی (زَیْدان)و، (عبدِالملك)ی كوڕی (بِشران)و، (أبـي طـاهرِ)ی كـوڕی (العلّـافِ)و، (الجُنَیدِ)و، (الدَّینَوَريِّ).

---

٥٦٠ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

٤٦١ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

## ✱ بارەكانى جۆش وخرۆشە توندەكان بەلاى صوفيەكانەوە:

ئەگەر لەكاتى سەماكردندا جۆش و خرۆشى بەسەر صوفيەكاندا زاڵ بوو، ئەوا يەكێك لە دانيشتوان دەوروبەرى خۆى ڕادەكێشىێ، بۆ ئەوەى لەگەڵيدا هەستێت، ئينجا كە هەستا، هەموويان بەدواى يەكدا هەڵدەستن، ئەگەر كەسێكيان مێزەرەكەى لابەرێ و سەرى ڕووت بكات، هەموويان سەريان ڕووت دەكەن وەكو قايلبونێك بۆ ئەو كەسە !

بەلاى ژيرو ئاقڵەوە شاراوە نييە كە سەرِ ڕووتكردن بەناشيرين دادەنرێ (٤٦٢)، وە نەمانى پياوەتى و جوانمەردى تێدايە(٤٦٣)، دەبێ بەهۆكارى وازهێنان لە ئەدەبێك، لەڕاستيدا تەنها لە ڕيوڕەسمەكانى حەجدا (المناسك) سەر ڕووت دەكرێت، وەكو بەجێهێنانى پەرستنێك و وەكو سەرشۆڕكردنێك بۆ خواى تعالى.

ئەگەر جۆش و خرۆشيەكەيان توند بوو، پۆشاكەكانيان بەسەر گۆرانى بێژەكەدا فڕێ دەدەن، كەسانێكيان بەساغى فڕێى دەدات و، كەسانێكيشيان كونى دەكات و پاشان فڕێى دەدات.

كەسانێكى نەفام بەڵگەى بۆ هێناونەتەوەو، دەڵێن: ئەمانە لە بێ ئاگايدان، بۆيە لۆمەو سەرزەنشت ناكرێن، چونكە كاتێ (موسى) _ عليه السلام _ خەمى بەسەردا زاڵ بوو، بەهۆى ئەوەوە كە قەومەكەى گوێرەكەكەيان پەرست، پارچە تەختەكانى (الألواح) فڕێداو، شكاندى و، بەخۆى نەزانى چ كردووە !

بۆ وەڵامەكەى دەڵێين _ ابن الجوزي _: كێ لە (موسى)وە _ عليه السلام _ دەگێڕێتەوە كەوا پارچە تەختەكانى فڕێدا بەفڕێدانێكى شكێنەر، چونكە ئەوەى قورئان باسى دەكات تەنها دانانێتى، كەوابوو چۆن بزانين شكاوە ؟!

پاشان ئەگەر گوترا: پارچە تەختەكان شكان، باشە چۆن بزانين كەوا مەبەستى (موسى) _ عليه السلام _ ئەوەبوو بيشكێنێت.

---

٤٦٢ _ چونكە پێچەوانەى سوننەتى پێغەمبەرى خوا _ صلى الله عليه وسلم _و ڕێبازەكەيەتى.

٤٦٣ _ ئەمە بۆ داب ونەرێتەكانى خەڵك دەگەڕێتەوە، لە زەمەنە جياوازەكاندا، والله أعلم.

پاشان ئەگەر هەستین به (تصحیح)کردنـی گوفتـاری ئـەو کەسـە ، دەڵـێین: (موسـی) لـە باروحاڵی بێ ئاگایدا بوو، هەتا ئەگەر لەو کاتەدا دەریایەکی ئاگرینی لە پێشدا بوایـە، خـۆی دەخستە نێوی، بەڵام چ کەسێك توانـای پـشت ڕاسـت کردنـەوەی بێئاگـایی (غیبـتهم) ئـەم صوفیانەی دەبێ، لە کاتێکدا ماناکان لەهیتر دەناسنەوەو، پارێز لە بیرە ئاوێك دەکەن ئەگـەر لایان بێ !

پاشان چۆن باروحاڵی پێغەمبەران بەپێی باروحاڵی ئەو کەسە بێ ئەقڵ و نادانانە (القیاس) بکرێت.

لاوێکی صوفیم بینی لە بازەڕەکاندا ڕێی دەکردو، هاواری دەکردو، منداڵـانیش بەدوایـەوە ڕێیان دەکرد، زۆر قسەی دەکردو بەزمانی ژاوەژاو هەراو هوریـای دروسـت دەکـردو، دەچـووە دەرەوە بۆ نوێژە هەینی، چەندین هاواری دەکرد لەو کاتەدا کە نوێژی هەینی دەکرد، سەبارەت بەنوێژی ئەو پیاوە لێیان پرسیم ؟ منیش گوتم: ئەگەر لـە کـاتی هاوارکردنیـدا بـێ ئاگـابێ، بەڕاستی دەستنوێژەکەی شکاوە(٤٦٤)، ئەگەر ئاگاشی لـە خـۆی بـێ ئـەوا، بـەدڵنیایی ئـەو ڕەفتارەی تەنها بۆ خۆ وانیشاندان و خۆ وادەرخستنە.

ئەو لاوە پیاوێکی تۆکمـەو بـەهێز بـوو، هـیچ کـارێکی نـەدەکرد، بـەڵکو هـەموو ڕۆژێ زەمبیلەیەکی بەنێو خەڵکیدا بۆ دەگەڕێنراو، هەندێ شـتی بـۆ کـۆ دەکرایـەوە، کـە خـۆی و هاوەڵانی دەیانخوارد.

دڵنیابن ئەمە باروحاڵی بخۆرانە نەك پشت بەستووان !

پاشان گریان ئەم تایەفە بەهۆی بێئاگابونەوە هاوار دەکەن، ئەوا خۆ تـووش کـردن بـەوەی ئەقڵیان داپۆشێ و بێئاگایان بکات، وەکو لە گۆرانی گوێگرتن و، شتی تری جـۆش و خـرۆش هێنەر، قەدەغەی لێکراوە، بەهاوشێوەی خۆ تووشکردن بەهەمووشتێك کە زیانی زیاتر بێ.

---

٤٦٤ _ لەبەر بێ ئاگابوونی، چونکە ئەم بارە گومانی ئەوەی لێ دەکرێت دەستوێژ بشکێنێت.

سەبارەت بەوەی سۆز بەخۆیان دەهێنن و پۆشاکەکانیان دەدڕن لە (ابنُ عقیلٍ)یان پرسی(٤٦٥)، بەڵام پیش (ابنُ عقیلٍ) پیاوێك وەڵامی دایەوەو گوتی: ئەوان ئاگایان لە کردەوەکانی خۆیان نییە(٤٦٦)!

پاشان (ابنُ عقیلٍ) فەرمووی: ئەگەر لەو شوێنانە ئامادەبن و، پێشتر زانبێتیان کە گۆرانی و شتی جۆش وخرۆش هێنەر بەسەر ئەو شوێنەدا زاڵەو، بەو هۆیەوە بێ ئاگادەبن و ئەقڵیان نامێنێت، تاوانبار دەبن، بەهۆی ئەو خەڵەفان و ئەقڵ تێکچون و شتی ترەوە کە تووشیان دەبێ و خراپیان دەکات، خیتابی شەرعیشیان لە سەر دەمێنێ، چونکە پیش ئەوەی لەو جێگەیە ئامادەبن شەرع فەرمانی پێکردوون کە لەو جێگایانەی تووشی ئەوەیان دەکات دوورکەونەوە، وەکو چۆن قەدەغەی هەموو خواردنەوەیەکی سەرخۆشکەریان لێکراوە، بەڵام ئەگەر سەرخۆش بوون و، ماڵ وسامانی خۆیان بەفیڕۆدا، فەرمانی شەرعیان بەرامبەر دەمێنیێو تاوانبار دەبن.

هەروەها ئەم جۆش و خرۆشەی کە ئەهلی تەصوف بەسۆزی ناودەبەن، ئەگەر تیایدا ڕاست بکەن، ئەوا تەنها سەرخۆش بونێکی سروشت و خووی مرۆڤە، ئەگەر درۆش بکەن، ئەوا (النبیذ)ە، ئەگەر بەهۆش و بەئاگاش بن، ئەوا بێەوەی نابن و یەکێك لەو دوو باروحاڵەتەیان تووش دەبێ، بۆیە دورکەوتنەوە لە شوینی گوماناوی (واجب)ە.

سەبارەت بە هەستانیان بە دڕین و کونکردنی پۆشاکەکانیان (ابنُ طاهرٍ) فەرموودەکەی خاتوو (عائشە)ی _ خوای لێ ڕازی بێت _ بۆ کردون بەبەڵگە کە فەرموویەتی: نَصَبْتُ حَجْلَةً لي فيها رَقْمٌ، فمدَّها النبيّ _ صلى الله عليه وسلم _ فشقَّها(٤٦٧). واتە فەرموویەتی:

---

٤٦٥ _ حديث النهي عن إضاعة المال تقدّم تخريجه.
وأما النهي عن شَقِّ الجيوب " فقد رواه البخاري (٣ / ١٣٣)، ومسلم (١٠٣) " عن ابن مسعود، بلفظ: ((ليس منَّا مَن ضَرَبَ الخدود، وشقَّ الجيوب)). واتە: پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ فەرموویەتی: ((لە ئێمە نی یە ئەو کەسەی لە ڕوومەتی خۆی دەداو یەخەی خۆی دادەڕێت)).

٤٦٦ _ کەوابوو شێتن !!

٤٦٧ _ رواه البخاري (٢١٠٥)، ومسلم (١٠ / ١٣٥)، وانظر لشرح الحديث والأستنباط الفقهيٍّ منه كتاب ((آداب الزفاف)) (ص١٨٦) لشيخنا الألباني _ يرحمه الله _.

پەردەیەکم دامەزراندبوو بەشێوەی گومەز، وێنەو نیگاری نەخشێنراوی تێدا بوو، ئەوەبوو پێغەمبەری خوا _ صلی الله علیه وسلم _ ڕایکێشاو دڕاندی.

نووسەر دەفەرمێت:

تەماشای ئەندازەی فیقهی ئەم پیاوە داماوە بکە، چۆن باروحاڵی کەسێك کە پۆشاکەکەی دەدڕێنێت و خراپی دەکات _ پێغەمبەری خوا _ صلی الله علیه وسلم _ قەدەغەی بەفیڕۆدانی ماڵ وسامانی کردووە _ (القیاس) دەکاتە سەر ڕاکێشانی پەردەیەك، بۆ ئەوەی دابەزێنرێت بەڵام بەبێ مەبەست دڕا، یاخود بەقەستەوە دڕاندی لەبەر ئەو وێنەو نیگارانەی تیایدا بوو.

ئەمە توندی و پێداگرتنی دانەری شەرعە سەبارەت بە قەدەغەکراوەکان، کما أَمَـرَ بکسْرِ الدِّنانِ في الخُمورِ(٤٦٨) واتە وەکو چۆن فەرمانیدا دەفرەکانی مەی و شەراب بشکێنرێت.

ئەگەر کەسێك پۆشاکەکەی خۆی بدڕێنێت و، پاشان وای ڕاگەیاند کە بێ ئاگاو بێ هۆش بووە، پێی دەڵێین: شەیتان بێ ئاگاو بێ هۆشی کردویت، چونکە ئەگەر لە گەڵ هەقدا بوایەی، بەدڵنیاییی دەیپاراستی، چونکە هەق خراپ نابێ.

---

٤٦٨ _ رواه الترمذي (١٢٩٣) عن أبي طلحة، وفي سنده ضعف، وقال الترمذي: ((وفي الباب عن جابر، وعائشة، وأبي سعيد، وابن مسعود، وابن عمر، وأنس)).

فهو صحيح.

## ✸ ڕەخنەگرتن لە ڕێبازگەلی صوفیەکان سەبارەت بە دڕاندنی پۆشاکەکانیان و پارچە پارچە کردنی:

شێخە صوفیەکان دەربارەی پارچە پۆشاکە دڕاوە فڕێدراوەکان (الخِرَق المرمیة) دواون و دەڵێن:

(محمدُ)ی کوڕی (طاهرٍ) دەڵێت: بەڵگەمان لەسەر ئەوەی کە پارچە پۆشاك ئەگەر فڕێدرا دەبێ بەموڵکی ئەو کەسەی بەهۆیەوە فڕێدراوە فەرموودەکەی (جریرٍ)ە(٤٦٩) کە فەرموویەتی: جاءَ قَومٌ مُجتابي النِّمار ، فحَضَّ رسولُ اللهِ _ صلى الله عليه وسلم _ على الصَّدَقَةِ، فجاءَ رجلٌ من الأنصارِ بصَرَّةٍ، فتتابَعَ الناسُ، حتى رأيتُ كَوْمَيْنِ مِن ثيابٍ و طعام. واتە خەڵکێکی هەژار کە عەباکانیان کون کردبو و سەریان لێوە دەرهێنابوو هاتنە خزمەتی پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _، ئەویش هانی خێرو صەدەقەی دا، پیاوێك لە پشتیوانان هات و کیسەیەکی هێنا، ئەوەبوو خەڵکی بەدوایەکدا هاتن، تا دوو کۆمەڵی گەورە خۆراك و پۆشاکم بینی.

دەڵێت: بەڵگەمان لەسەر ئەوەی کە ئەگەر کۆمەڵێ کەس لە کاتی دابەشکردنی پارچە پۆشاکەکاندا (الخِرقة) هاتن بەشیان بۆ دیاری دەکرێت فەرموودەکەی (أبي مُوسى)یە(٤٧٠) کە فەرموویەتی: قُدِمَ على رسولِ اللهِ _ صلى الله عليه وسلم _ بغنيمةٍ وسَلَبٍ، فأسْهَمَ لنا. واتە پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ دەستکەوت و غەنیمەتی بۆ هێنراو، بەشی بۆ ئێمەش دیاری کرد.

نووسەر دەفەرمێت:

بەڕاستی ئەم پیاوە یاری بەشەریعەت کردووەو، بە تێگەشتنە خراپەکەی خۆی شتانێکی دەرهێناوە، کە واتێگەشتووە سازیاری ڕێباوەڕی پێشینانە لە صوفیەکان، بەڵام ئێمە شتی وامان لە پێشینانیاندا نەبینیوە.

---

٤٦٩ _ رواه مسلم (٥٣٣ _ مختصره).

٤٧٠ _ رواه البخاري (٣١٣٦)، ومسلم (٢٥٠٢).

خراپی دەرهێنانەکەی بەوە ڕوون دەبێتەوە کە ئەو کەسەی پۆشاکەکەی کون کردو، فڕێیدا، ئەگەر بەهۆش و بەئاگابێ، شیاو نابێ هەستێت بە کونکردنی و، ئەگەر ئاگاشی لە خۆی نەبێ، ئەوا لە ڕوانگەی شەرعەوە ناتوانێ هیچ تەصرفێکی شیاو (جائز) بکات، نە بەخەڵاتکردن ونە بەکردنە مولکیش.

هەروەها بانگەشەی ئەوە دەکەن کە ئەو پۆشاکەی فڕێی دەدا وەکو هەر شتێکی ترە کە لە مرۆڤ بکەوێتە خوارەوەو، پێی نەزانێ، کەوابوو لێرەدا بۆ هیچ کەسێك شیاو نابێ بیکات بەمولکی خۆی، وە ئەگەر لە کاتی بەئاگابونیشیدا فڕێی دابێ، بەڵام نەك بۆ کەسێك، ئەوا هیچ ڕوویەك نییە پشتی پێ ببەسترێت بۆ ئەوەی بکرێت بەموڵك.

ئەگەر بەسەر گۆرانی بێژەکەشدا فڕێی بدات، ناتوانێ بیکات بەمولکی خۆی، چونکە هیچ شتێك ناکرێ بەموڵك مەگەر بەگرێبەستی شەرعی، فڕێدانیش گرێبەست نییە.

پاشان گریمان پۆشاکە فڕیدراوەکە مولکی گۆرانی بێژەکەیە، بەچ ڕوویەك کەسانی تر دەتوانن تەصروفی پێوە بکەن.

پاشان ئەگەر تەصروفیشی پێوە بکەن، کون کونی دەکەن، ئەوەش لە دوو ڕۆوە شیاو نییە:

یەکەمیان: تەصروف بەشتێکەوە دەکەن کە هی خۆیان نییە.

دووەم: بەفیڕۆدانی ماڵ و سامانە

پاشان لەچ ڕوویەکەوە بەشی ئەو کەسانە دەدرێت کە لەوێ ئامادەنەبوونە ؟

بەڵام فەرموودەکەی (أبي موسى)، زانایان دەفەرمن بەتایبەت (الخطابي): دەشێ پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ بەڕەزابوونی خۆی بەشی ئەوانەی دابێ کە ئامادەی ڕووداوەکە بوون، یاخود بەشی دابێتن لەو پێنج یەکەی (الخُمُسِ) کە هەقی خۆیەتی.

بەپێی ڕێباوەڕی صوفیەکان پارچە پۆشاکاکە (الخِرقة) دەردرێ بەهەر کەسێکی هاتوو، ئەمەش ڕێباوەڕێکە لە کۆڕایی موسلمانان بەدەرە.

ئەوەی ئەمان بەبیروڕا خراپەکانیان هەستاون بەدانانی ناچوێنم بەهیچ شتێك مەگەر بەوەی کە خەڵکانی سەردەمی نەفامی دایناباوو سەبارەت بە حوکمەکانی (البَحيرةِ و السائبةِ والوصيلةِ والحامِ)(٤٧١).

(ابنُ طاهرٍ) _ کە یەکێکە لە گەورەکانیان _ دەڵێت: شێخەکانمان کۆڕان لەسەر ئەوەی پارچە پۆشاکی دڕاو (الخِرقة المُخَرَّقة)، وە ئەوەی لە پارچە ساغەکان بڵاوبۆتەوەو گونجاوی خۆیەتی، هەموو ئەوانە بەحوکمی کۆکردنەوە دەبێ، با بەو جۆرە تەصروفی پێوە بکەن کە شێخەکان ڕایان لەسەریەتی ! ئەوەشیان کردۆتە بەڵگە کە ئیمامی (عُمَرَ) _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی: دەستکەوتی جەنگ بۆ ئەوانەیە کە ئامادەی ڕووداوەکە بوونە، بەڵام شێخمان (أبوإسماعيلَ الأنصاري) بەپێچەوانەی ئەوانەوە پارچە پۆشاکەکانی کردۆتە دوو جۆرەوە:

ئەوەی دڕاوە، بەسەر هەمووواندا دابەش دەکرێت.

ئەوەشی ساغە، بەگۆرانی بێژەکە دەدرێ !

فەرموودەکەی (سلمَةَ)ی کردۆتە بەڵگە: ((مَنْ قَتَلَ الرجلَ ؟)). قالوا: سلمةُ بنُ الأكوَعِ. قالَ: ((لهُ سَلَبُهُ أَجْمَعُ))(٤٧٢). واتە: ((کێ پیاوەکەی کوشتووە ؟)). گوتیان: (سلمةُ)ی کوڕی (الأكوَع). فەرمووی: (هەموو شتی کوژراوەکە دەبات)).

کەوابوو کوشتن لەلایەن گۆرانی بێژەکەوە هاتۆتە کایەوە، بۆیە دەبێ شتەکان بەرێت.

نووسەر دەفەرمێت:

براکانم _ خوای تعالی من و ئێوەش لەسەرلێشێواندنەکانی ئیبلیس پارێزراو بکات _ تەنها تەماشای یاریکردنی ئەم نەفامانە بەشەریعەت و، کۆڕایی شێخەکانیان بکەن _ ئەوانەی کۆڕاییان پشقلێك ناهێنێت _، چونکە شێخانی فیقهزان کۆڕان سەبارەت بەوەی کە

---

٤٧١ _ لە سەرەتای کتێبەکەدا باس کران.

٤٧٢ _ رواه مسلم (١٧٥٤)، وأبوداود (٢٦٥٤).

وأصله في صحيح البخاري.

شتی بەخشێنراو بۆ ئەو کەسەیە کە پێی بەخشراوە، بەیەکسانی ئەگەر دڕاویی یاخود ساغ بیّو، بۆ هیچ کەسێکی تر نییە تەصرۆفی پێوە بکات.

پاشان کۆژراو هەموو شتەکانی دەبردرێت، باشە ئەوان بۆ سنورداریان کردووە بەوەی کە فڕێ دەدرێت !

پاشان پێویستە شتەکە بەپێچەوانەی گوفتارەکانی (الأنصاريُّ)وە بێ، چونکە دڕانی پۆشاکەکە بەهۆی سۆزەوە بوو، بۆیە پێویستە پۆشاکە دڕاوەکان بۆ گۆرانی بێژەکە بێت نەك ساغەکان !

وە هەموو گوفتارەکانیان لەم بارەوە مەحاڵ و بیٚ هودە قسەکردنە.

(أبوعبدِاللهِ التَّكريتيُّ الصوفيُّ) باسی (أَبي الفُتوحِ الإسفراييني) بۆ کردم _ بەمنداڵی ئەم پیاوەم بینیبو _ کە لە خەڵوەتەگەیەکداو (رباط) لە نێو کۆمەڵێکی زۆر خەڵکدا ئامادە بوو، کە لەوێدا سەرین و، (قضیب)و، دەفی زرزرەدار هەیە، ئەویش هەستاو سەمای کرد، تا مێزەرەکەی کەوتە خواریّ و، بەسەر ڕووتی مایەوە !

(التَّكريتيُّ) گوتی: ڕۆژێ بە سۆڵەوە (خُف) سەمای کرد، پاشان بیری کەوتەوە کە بەلای تایەفەکەوە سەماکردن بەسۆڵەوە هەڵەیە، بۆیە لە خەڵکەکە تاك بویەوەو، دایکەندن و، پاشان عەبایەکی ئاورێشمی بەسەر شانەوەبوو دایکەندو، خستیە بەردەستیان بۆ کەفارەت و سڕینەوەی ئەو تاوانە، ئەوانیش پارچە پارچەیان کردو لە نێوان خۆیاندا دابەشیان کرد.

بەڵام هەستانیان بەدڕاندنی پۆشاکە فڕێدراوەکەو پارچە پارچەکردنی، پێشتر ڕوونمان کردەوە کە خاوەنی پۆشاکەکە ئەگەر بۆ گۆرانی بێژەکەی فڕێ دابیّ، نابیّ بە موڵکی خۆی بەخودی فڕێدانەکە، تا خاوەنەکەی هەڵدەستیّ و دەیکات بەموڵکی گۆرانی بێژەکە، ئەگەر هەستاو کردی بەموڵکی گۆرانی بێژەکە، کەسانی تر لە چ ڕوویەکەوە دەتوانن تەصرۆفی پێوە بکەن ؟

هەندێ فەقیهیانم بەدیکرد پۆشاکەکەی دەدڕیّ و، پاشان دابەشی دەکردو، دەیگوت: سوود لەم پارچانە وەردەگیرێت، ئەمە چەوت بەکارهێنان نییە !

منیش گوتم _ ابن الجوزي _: ئەمە جگە لە چەوت بەکارهێنان دەبیّ چ بیّ !

شێخێکی دیکەیانم بەدیکرد دەیگوت: پۆشاکم پارچە پارچە دەکرد لە وەڵاتی خۆمان، پارچەیەکی بەر پیاوێك کەوت و، دەفرێکی لێ دروست کردو، بەپێنج دیناری فرۆشت، منیش پێم گوت: شەرع رێگەی بەم هەڵەشەیی و ناژیریانە نەداوە لەبەر ئەم قسە سەیرو سەمەرانە.

لەم دوو پیاوە سەرم سوڕ دەمێنێ بەتایبەت (أبوحامدِ الطوسيُّ)، کە دەڵێت: رێگە دراوە (مُباح) پۆشاکەکانیان بدڕێنن و، بیکەن بە پارچە پارچەی چوار گۆشەوە کە گونجاو بێ، بۆ پینەکردنی جلّ و بەرگ و ڕاخەرو بەرماڵ، چونکە پۆشاك دەدڕێنرێت بۆ ئەوەی کراسی لێ بدورێنرێت و، ئەوە بەفەوتان دانانرێت !

بەڕاستی لەم پیاوە سەرم سوڕما کە چۆن خۆشەویستی رێباوەڕی تەصوف لە (أصول الفقه)و رێباوەڕی پێشەوا (الشافعي) دوری خستەوەو، تەنها تەماشای سودوەرگرتنێکی تایبەتی کرد.

پاشان کە دەڵێت: چوار گۆشە، چ مانایەکی تێدایە. چونکە بەدرێژی بڕینیش دیسان سوودی لێ وەردەگیرێت!

پاشان ئەگەر پۆشاکەکە بدڕێنرێت و بکرێ بە (قراملَ)یش(٤٧٣) " بەدڵنیایی سودی لێ وەردەگیرێت، ئەگەر شمشێر بشکێت و ببێ بەدوو لەتەوە، بەدڵنیایی سوود لە لەتێکی وەردەگیرێت، بەڵام شەرع تەماشای سوودە طشتیەکان دەکات، ئەوەش کە کەم دەکات و بەکەڵکی سوود لێوەرگرتن نایەت بەفەوتاندن و خراپ بوون ناوی دەبا، لەبەر ئەمەیە کە رێگری کراوە لە شکاندنی دیرهەم، چونکە بەهایەکی لێ لادەبات، سەرەڕای شکاوەکە، سەرسوڕمان لەوەدا نییە ئیبلیس سەر لە نەفامەکانیان بشێوێنێت، بەڵکو لە فیقهزانەکانیان سەرسوڕدەمێنێ کە بیدعەی صوفیەکانیان هەڵبژاردووە بەسەر حوکمی (أبي حنيفةَ) و (الشافعيٌ) و (أحمدَ)دا _ خوایان لێ ڕازی بێت _.

بەڕاستی زێدەڕۆیەکی زۆریان کردووە لە داهێنانەکانیانداو، کەسانێکیش بەهانەی بۆ هێناونەتەوە، چونکە مەیلی هەواو ئارەزووەکانی ئەوانی کردووە.

---

٤٧٣ _ قراملَ: هەر شتێکە ژنان پرچی خۆیان پێ دەبەستن، وەکو قژو، صوف و، بەو هاوشێوانە.

لــە ڕێبــاوەڕی ئەوانــدا ســەریان ڕووت دەکــەن لــەکاتی (استغفر الله)کردنــدا، ئەمــەش بیدعەیەکە پیاوەتی و جوانمەردی لەناو دەبات و، دژبە ویقارو هەیبەتە، ئەگەر شەرع فەرمانی بەڕووتکردنی نەکردایە لە کاتی ئیحرامــدا، ئــەوا هــیچ بەهانەیــەك لــە ئــارادا نــەدەبوو بــۆ ڕووتکردنی.

## * باسی سەرلێشێواندنەکانی ئیبلیس بەرامبەر بەزۆرێك لە صوفیەکان لە بواری هاوەڵێتی لاوان و هەراشاندا:

نووسەر دەفەرمێت:

بزانە زۆرێك لە صوفیەکان دەرگای تەماشاکردنی ژنانی نامەحرمیان لە خۆیان داخستتوە، چونکە لە هاوەڵێتیانەوە بەدورن و، وازیان لە تێکەڵاوبونیان هێناوەو، تەنها خۆیان بەخواپەرستیەوە خەریك کردووەو، لە هاوسەرگیری وازیان هێناوە.

بەڵام هاوەڵێتی لاوان و هەراشانیان بۆ ڕێکەوت بوو، لەڕووی خۆویستی و بەمەبەستی زهدایەتیەوە، ئیبلیسیش هەواداری ئەوانەی کردن.

بزانە صوفیەکان لەبواری هاوەڵێتی هەراشان و لاواندا حەوت جۆرن:

بەشی یەکەم: پیسترینی قەومەکەن، ئەمانە بریتین لە کەسانێك خۆیان بەصوفیێکان چواندوەو، باسی (الحلول) دەکەن.

لە (أَبي نصرِ عبدِاللة)ی کوڕی (عليّ السَّرَّاج)ەوە دەڵێت: پێم گەشتووە کەوا کۆمەڵێك لە (الحلول)یەکان وایان ڕاگەیاندوە کەوا خوای تعالی جەستەگەلێکی هەڵبژاردوەو دابەزیوەتە نێویان بەماناکانی پەروەردگارێتی.

کەسانێکیشیان دەیان گوت: دابەزیوەتە نێو شتە چاکەکان (المستحسنات).

(أبوعبدِاللهِ)ی کوڕی (حامدٍ) کە یەکێکە لە هاوەڵانمان باس دەکات کەوا تایەفەیەك لە صوفیەکان دەڵێن:

کە گوایە ئەوان لە دونیادا خوای _ عزَّوجلَّ _ دەبینن، شیاوێتیشیان بەوە داوە کە لەسەر سیفەتی ئادەمیزاد بێ، نکۆڵیشیان لەوە نەکردووە کەوا دابەزیبێتە نێو وێنەیەکی چاك وجوان، تا ئەو ئاستەی وەکو لاوێکی ڕەش بینیویانە.

بەشی دووەم: قەومێکن لە جل وبەرگ پۆشیندا، خویان بەصوفیەکان دەچوێنن، بەڵام مەبەستیان دەرچوونە لەڕێگەی هەق وڕاستی.

بەشی سێ یەم: قەومێکن ڕێگە بەتەماشاکردنی ڕوخسارە جوان و چاکەکان دەدەن.

(أبوعبدالرحمن السُّلميُّ) کتێبێکی داناوەو ناوی ناوە: ((سُنن الصُّوفيةِ)، لـە کۆتایەکەیـدا دەڵێت: ((بەشێك سەبارەت بەکۆی ڕێپێدراوەکانیان))، تیایدا ئەوەمان بەیاد دەهێنێتـەوە کـە صوفیەکان ڕێیان داوە بەسەماکردن و، گـۆرانی و، تەماشـاکردنی ڕوخـساری جـوان، ئـەوەی کردۆتە بەڵگە کە لە پێغەمبەری خواوە _ صلى الله عليه وسـلم _ (ڕیوایـە)ت کـراوە کـەوا فەرموویەتی:

((أطلبوا الخيرَ عندَ حِسانِ الوجوهِ)). واتە: ((لای ڕوخسارە جوانەکان خوازیاری خەیربن)).

هەروەها فەرموویەتی:

((ثلاثةٌ تجلو البصرَ: النظرُ الى الخُضْرةِ، والنظرُ الى الماءِ، والنظرُ الى الوجهِ الحسنِ)). واتە: ((ســێ شــت چــاو ڕوون دەکاتــەوە: تەماشــاکردنی ســەوزایی و، تەماشــاکردنی ئــاو و، تەماشاکردنی ڕوخساری جوان)).

نووسەر دەفەرمێت:

ئەم دوو فەرموودەیە بەبنەڕتێکی ڕاست لە پێغەمبەری خواوە _ صلى الله عليه وسـلم _ نەهاتووە.

سەبارەت بە فەرموودەی یەکەم، (العُقَيْليُّ) دەڵێت: ئەمە لە پێغەمبەری خـواوە _ صـلى الله عليه وسلم _ جێگیر نەبووە(٤٧٤).

وە فەرموودەی دووەمیش(٤٧٥) فەرموودەیـەکی (مـوضـوعٌ)ە و، زانایـانیش جیاوازیـان لـە نێواندا نییە سەبارەت بەوەی کە (أبي البَخْتَرِيِّ) درۆزنەوە فەرموودە هەڵدەبەستێت.

---

٤٧٤ _ ورواه المصنِّف في ((الموضوعات)) (١ / ١٥٩ _ ١٦٤) " من طـرق عـدَّة ثـم تكلَّم عليها طـويلاً مبيناً شدة ضعفها ووهائها.

وانظر ((تخريج الإحياء)) (٣ / ١٠٥) للحافظ العراقي.

٤٧٥ _ رواه المصنف في ((الموضوعات)) (١ / ١٦٣)، ثم قال:

((باطل)).

وقد حاول السيوطي في ((اللآلىء)) (١ / ١١٧) تعقُّبه " ليقول بحُسن الحديث، فلم يُحسن، وكذا فعَلَ بعضُ الغُماريِّين !

وه (أحمدُ)ى كورِى (عُبيدِ)يش، كەسێكى نەناسراوه.

پاشان پێويست بوو (أبوعبدالرحمنِ السُّلميٌّ) كـه باسـى تەماشـاكردنى ڕوخـسارى جـوان دەكات، بەتەماشاكردنى ڕووخسارى خێزان ياخود كەنيزەكـەوه سـنوردارى بكردايـه، چـونكە خوێندنەوەى فەرموودەكە بەدگومانى بۆ مرۆڤ دروست دەكات.

شێخمان (محمد)ى كورِى (ناصرِ الحافظُ) دەڵێت: (ابـنُ طـاهرِ المقدسـيُّ) كتێبێكـى دانـابوو سەبارەت بەشياوێتى تەماشاكردنى لاوى لووسكەى بێ تووك(٤٧٦).

نووسەر دەفەرمێت:

فيقهزانان دەڵێن: هەركەس لەكاتى تەماشـاكردنى لاوى لووسـكەى بێتوكـدا شـەهوەت و ئارەزووى هەژا، ئەوا حەرامە تەماشاى بكات، هـەركاتێكيش مرۆڤـ واى ڕاگەيانـد كـە لـە كاتى تەماشاكردنى لاوى لوسكەى بێتوكى جواندا شەهوەت و ئارەزووى ناهـەژێ، كەسـێكى درۆزنە، لەڕاستيدا بەڕەهايى ڕێگە بەمە دراوه، چـونكە ئەگـەر قەدەغـەكرا، مرۆڤـ بـەهۆى زۆرى تێكەڵاوبونەوە تووشى تاوان دەبێ، لێرەدا ئەگەر مرۆڤـ سووربوو لەسـەر تەماشـاكردنى لووسكە، ئەوا ڕەفتارى ئەم كەسە پەنجە ڕادەكێشێت بـۆ ئـەوەى كـە بـەگوێرەى شـەهوەت و ئارەزووەكانى جوڵاوەتەوه.

(سعيدُ)ى كورِى (المسَّيبِ) دەڵێت: ئەگەر پياوتان بەديكرد سـووره لەسـەر تەماشـاكردنى لاوى لووسكەى بێتوك، تاوانبارى بكەن.

بتَشي ضوارةم: قەومێكن دەڵێن: ئێمە بەتەماشاكردنێكى شەهەوەت و ئارەزوانەوه تەماشا ناكەين، بەڵكو بەتەماشاكردنێكى پەنـدو ئامۆژگـارى وەرگرتنـەوه تەماشـا دەكـەين، بۆيـە تەماشاكردن زيانمان پێ ناگەيەنێ!!

ئەمە مەحاڵە، چونكە سروشت و خـووى هـەموو ئـادەميزاد يەكـسانە، بۆيـە هەركـەس بانگەشەى داوێن پاكى و بەدورگرتنى نەفسى خۆى بكات لە خراپەو وادابنێت لە هاوڕەگـەزى خۆى جياوازترە، بانگەشەى شتێكى مەحاڵ دەكات.

---

٤٧٦ _ وانظر ((سير أعلام النبلاء)) (١٩ / ٣٦١) للامام الذهبي، ففيه كلام آخر عنه.

ئەوەبوو پێشتر لەمیانەی باسی گوێگرتندا ئەمەمان ڕوون کردەوە.

لە (خیرِ النَّسَّاجِ)ەوە دەڵێت: لەگەڵ (مُحارِبِ)ی کوڕی (حسَّان الصوفيِّ)دا لە مزگەوتی (الخِیفِ) بووین و، ئیحرامیشمان بەستبوو، لاوێکی جوانی خەڵکی (المغربِ) لە گەڵماندا دانیشت، (مُحارِبِ)م بینی تەماشای ئەو لاوە دەکات بەجۆرێك من ئەو ڕەفتارەیم بەخراپ دانا، بۆیە پاش ئەوەی لاوەکە هەستا پێم گوت: تۆ لە ئیحرامدای لە مانگێکی حەرامداو لە شارێکی حەرامداو لە ڕێ و ڕسمێکی حەجدا ، کەچی تۆم بینی تەماشای ئەو لاوت کرد بەهاوشێوەی تەماشاکردنی کەسێکی شەیدا(٤٧٧). ئەوەبوو گوتی: ئەمە بەمن دەڵێی ئەی دڵو چاو شەهوانی و بەئارەزوو، ئایا نەتزانیوە سێ شت قەدەغەی کردوم بکەومە داوی ئیبلیسەوە ؟! منیش گوتم: ئەو سێ شتە چین ؟ گوتی: نهێنی ئیمان و، پاك وخاوێنی ئیسلامو، گەورەترینیشیان شەرم کردنە لە خوای تعالی ئەوەکا بمبینێ لە کاتێکدا من خەریکی ئەنجامدانی تاوانێك بم کە قەدەغەی کردوم، پاشان بورایەوە، تا خەڵکمان لەسەر کۆبویەوە.

نووسەر دەفەرمێت:

تەماشای نەفامێتی ئەم گێلە بکەن، کە واتێگەشتووە سەرپێچیکردن تەنها داوێن پیسی و نەنجامدانی کاری خراپەی لەڕادە بەدەرەو، نەیزانیوە کە خودی تەماشاکردن بەشەهوەت و بە ئارەزووەوە حەرام دەبێت، وە هەوڵیداوە ئاسەواری خووی سروشتی ئادەمیزادی لەسەر خۆی لابەرێت، لەکاتێکدا کە بەشەهوەت و ئارەزۆوە تەماشا دەکات، قسەکانی خۆی بەدرۆ دەخاتەوە.

زانایەك بۆی باسکردم کەوا منداڵێکی لوسکەی بێتوك بۆی باسکردبو و گوتبوی: فلان کەسی صۆفی کە خۆشی دەوێم، پێی گوتم: ئەی کوڕەکەم ! خوای تعالی لە تۆدا ڕووتێکردن و ئاوڕدانەوەو هاتوچۆی هەیەو، پێویستی منی خستۆتە تۆ !

---

٤٧٧ _ دیسان ئەمەش تەماشاکردنێکی حەرامە!!

باسکراوە کەوا کۆمەڵێك لە صوفیەکان چوونە دیدەنی (أحمدَ الغزاليّ)(٤٧٨) کـە هاوکـات لاوێکی لووسکەی بێتوکی لابوو، بەتەنها لە گەڵیدا دانیشتبوو، لە نێوان هەردوکیشیاندا گوڵ دانرابـوو، کـە جارێـك تەماشـای گوڵەکـەی دەکـردو، جـارێکیش تەماشـای لاوە لوسـکە بێتوکەکەی دەکرد، کە دانیشتن، پیاوێکیان پێی گوت: لەوانەیە جەوەکـەمان لـێ تێکـدابی ! ئەویش گوتی: ئەرێ بەخوا. ئەوەبوو کۆمەڵەکە لە ڕووی سۆزەوە هاواریان لێ بەرز بویەوە !!

نووسەر دەفەرمێت:

من لە ڕەفتاری ئەم پیاوە سەرم سوڕ نامێنێ، کە پۆشاکی شەرم و شـکۆی لـەڕووی خـۆی هەڵماڵیوە، بەڵکو لەو ئاژەڵە چواریێ ئامادەبوانە سـەرم سـوڕ دەمـێنێ، کـە چـۆن بێـدەنگ بوونو، نکۆڵیان لە ڕەفتارەکەی نەکرد ؟! دڵنیابن شەریعەت لە دڵی زۆرێك لە خەڵکیدا سـارد بۆتەوە.

لە (أبي الطِّيبِ الطبَّريِّ)وە دەڵێت: هەواڵی ئەم تایەفەم پێگەشتووە کە گوێبیستی گۆرانی دەبن، تەماشاکردنی ڕووی لووسکەی بێتوکیشیان خستۆتە پاڵی، پێدەچێ بەخشڵ و پۆشاكو پـەراوێزی ڕەنگکـراویش بیڕازێننـەوەو، دوای ئـەوەش واڕادەگەیـەنن کـە مەبەسـتیان بـەوە زیادبونی ئیمانە بەتەماشاکردن و، پەند وەرگرتن و دابەسـتنی بەڵگەیـە بـەوەی کـە کـردەوە بەدیهێنراوەکان دەکەن بەبەڵگەی بوونی پەروەردگار، ئەمە ئەوپەڕی شوێنکەوتنی ئارەزوواتو خەڵەتاندنی ئەقڵ و دژایەتیکردنی زانستە،

خوای تعالی دەفەرمێت: ﴿ وفِي أَنْفُسِكُمْ أَفـلا تُبْـصِرونَ ﴾﴿ الـذاريات: ٢١ ﴾ واتـە: ﴿ وفِي أَنْفُسِكُمْ ﴾ وە لە خودی خۆشتاندا (بەڵگەی زۆر هەیە) ﴿ أفـلا تُبْـصِرونَ ﴾ دەی ئایـا بـۆ ورد نابنەوەو سەرنج نادەن(٤٧٩).

---

٤٧٨ _ برای (أبي حامد الغزالي)یە، کە پێشتریش ئاماژەی پێدرا!

٤٧٩ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

هەروەها دەفەرمێت: ﴿ أفلا يَنْظُرُونَ إِلى الإبلِ كيفَ خُلِقَتْ ﴾﴿ الغاشية: ١٧﴾ واتە: دەی بۆ ورد نابنەوە لە حوشتر کە چۆن دروست کراوە(٤٨٠)، هەروەها دەفەرمێت: ﴿أَوَلَمْ يَنْظُروا في مَلَكوتِ السَّماواتِ والأرضِ﴾﴿ الأعراف: ١٨٥ ﴾ واتە: ﴿ أَوَلَمْ يَنْظُروا ﴾ ئايا ئەوانە نارِوانن؟ ﴿في مَلَكوتِ السَّماواتِ والأرضِ ﴾ لەو موڵکە گەورەو فراوانەی لە ئاسمانەکان و زەوی دا هەیە(٤٨١).

تەماشا دەکەی خۆیان دورخستۆتەوە لەوەی خوای تعالی فەرمانی پێکردون پەندو ئامۆژگاری لێوەربگرن، بۆ شتانێك کە قەدەغەی لێکردون.

لەڕاستیدا ئەم تایەفە ئەو شتانە ئەنجام دەدەن کە ئاماژەمان پێدا پاش جۆرەها خواردنی بەلەزەت و خۆش، ئینجا کە نەفسیان تێربوو، داوای بیستنی گۆرانی و، سەماو، تەماشاکردنی ڕووی لووسکەو بێتوکیان لێدەکات، بەڵام ئەگەر خۆراکیان کەم کردایەتەوە، ئارەزووی بیستن و تەماشاکردنیان نەدەکرد.

(أبوالطَّيِّبِ) دەڵێت: کەسێکیان لە شیعرەکانیدا باروحاڵی ئەوانە باس دەکات کە گوێبیستی گۆرانی دەبن و، ئەوەی هەستی پێدەکەن لە کاتی گوێگرتنداو، دەڵێت:

أَتَذْكُرُ وَقْتَنا وقَدِ اجْتَمَعْنا
على طِيبِ السَّماعِ إلى الصَّباحِ
ودارَتْ بيْنَنا كَأسُ الأغَاني
فأسْكَرَتِ النُّفوسَ بغَيْرِ راحِ
فلمْ تَرَ فيهِمُ إلا نَشَاوى
سُروراً والسُّرورُ هُناكَ صَاحِي
ولْم نَمْلِكْ سوى الُمهْجاتِ شيئاً
أرقْناها لألحاظٍ مِلاحِ

---

٤٨٠ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

٤٨١ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

واته: کاتەکەمانت بیردێتەوە کە کۆبوینەوە

لەسەر بیستنی گۆرانی خۆش تاوەکو سەر لەبەیان

وە کاسی گۆرانی لە نێوانماندا سوڕدراو

نەفســـــەکانی سەرخۆش کردین بەبێ حەوانەوە

کەست تیایاندا نەدەبینی مەگەر سەرمەمەست بوو

لـــە دڵخۆشیداو دڵخۆشی وای لێدەکردی بەئاگابی

لە دڵ زیاتر هیچی ترمـــــان نەبوو کـــە

نەرمونیانمــــــان کردبۆوە بۆ کاتگەلێکی زۆر خۆش

دەڵێت: ئەگەر گوێبیستبوونی گۆرانی ئەو کاریگەریەی هەبێ کە ئەم کەسە باسی دەکات، کەوابوو گوێبیستبوونی گۆرانی دەبێ چ کەڵکێك یاخود سوودێك ببەخشێت ؟!

(ابنُ عَقيـلٍ) دەڵێت: گوفتـاری ئـەو کەسـانەی دەڵـێن: لـە تەماشـاکردنی وینـەی جـوان ناترسێم. هیچ نییە، چونکە شەریعەت وەکو پەیامێکی گشتی هاتووە، جیـاوازی لـە نێـوان کەسەکاندا ناکات، ئەوا ئایەتەکانی قورئانیش نکۆڵیی لەم جۆرە بانگەشەیە دەکەن.

خوای تعالی دەفەرمێت: ﴿ قُلْ لِلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُـرُوجَهُمْ﴾ ﴿النـور: ٣٠﴾ واتە ﴿ قُلْ لِلْمُـؤْمِنِينَ ﴾ (ئەی محمد _ صلى الله عليه وسـلم) بلّـێ بـەپیاوانی ئیمانـدار ﴿يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ ﴾ چاوی خۆیان (لەسەیرکردنی نامەحرەم) داخەن و بپارێزن ﴿ وَيَحْفَظُـوا فُرُوجَهُمْ ﴾ وە عەورەتیان بپارێزن (لەداوێن پیسی)(٤٨٢).

هەروەها دەفەرمێت: ﴿ أَفَلا يَنْظُرُونَ إِلَـى الإِبِـلِ كَيْـفَ خُلِقَـتْ (١٧) وَإِلَـى السَّمَاءِ كَيْـفَ رُفِعَتْ (١٨) وَإِلَى الْجِبَالِ كَيْفَ نُصِبَتْ (١٩) ﴾﴿ الغاشية: ١٧ _ ١٩ ﴾ واته: ﴿ أَفَلا يَنْظُرُونَ إِلَى الإِبِلِ كَيْفَ خُلِقَتْ ﴾ دەی بۆ وردنابنەوە لە حوشتر کە چۆن دروست کراوە ﴿ وَإِلَى السَّمَاءِ كَيْفَ رُفِعَتْ ﴾ وە لـە ئاسمـان کـە چـۆن بەرزکراوەتـەوە ﴿ وَإِلَـى الْجِبَـالِ كَيْـفَ نُـصِبَتْ ﴾ وە لەشاخەکان کە چۆن داکوتراون و دامەزرێنراون(٤٨٣).

---

٤٨٢ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

٤٨٣ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

لەڕوانگەی ئەم ئایەتانەوە ڕوون دەبێتەوە کە خوای تعالی تەماشـاکردنی حـەڵاڵ نـەکردوە مەگەر بۆ وێنەگەلێك کە نەفس مەیلی نـەکات و، هیـچی تێـدا نـەبێ بـۆی، بـەڵکو پەنـدو ئامۆژگاریەکی لێوەردەگرێت کە هیچ شەهوەت و ئارەزوویەکی تێکەڵ نابێ و، هیچ لـەزەت و چێژێکی تووش نابێ.

بەڵام وێنەی شەهوەت و ئارەزووات، پەندی شەهوەت و ئارەزوو دەردەبـڕێ، بۆیـە هـەموو وێنەیەك کە پەندو ئامۆژگاری تێدا نەبێ، پێویستە تەماشا نەکرێت، چونکە پێدەچـێ ببێتـە هۆکاری فیتنەو بەڵا دروستکردنێك، بۆیـە خـوای تعـالی پـەیامی پێغەمبەرایـەتی بـەژنێك نەداوەو، نەشیکردوە نە بەقازی و، نە بەپێشەواو، نە بەبانگ بێـژ، چـونکە جێگـەی فیتنـەو بەڵاو شەهوەت و ئارەزووە.

هەر کەسێکیش بڵێت: من لە تەماشاکردنی وێنە جوانەکاندا پەنـدو ئامۆژگـاری دەبیـنم، بەدرۆی دەخەینەوە، وە هەر کەسێکیش نەفسی خۆی بەخوو سرووشتێك جیابکاتەوە بەجۆرێك لە خوو و سروشتی خۆمان جیاوازتر بێ بە بانگەشـەی خـۆی، دیـسان بـەدرۆی دەخەینـەوە، چونکە لەڕاستیدا ئەوە تەنها شەیتانە کە ئەو کەسە بانگەشەکارانە هەڵدەخەڵەتێنێت.

بڤشي ئێنجەم: قەومێکن هاوەڵێتی لووسکەی بێتوکیان کردو، نەفـسی خۆیـان لـە داوێـن پیسی و کاری خراپ قەدەغە کردو، واتێدەگەن ئـەوە تێکۆشـانە بەرامبـەر بەنـەفس، بـەڵام نەیانزانیوە کاتێ هاوەڵێتیان دەکەن و بەشەهوەت و ئارەزووەوە تەماشـایان دەکـەن، خـۆی بـۆ خۆی سەرپێچیە، ئەمە لە خەسڵەتە زەمکراوەکانی تەصوفە.

پێشینە دێرینەکانیان لەسەر شتێکی دیکەی جگە لەمە بوون، وە گوتراوە: لەسـەر ئەمـە بوونە، بە بەڵگەوە، بەڵگەکەش شیعرەکەی (أبوعليّ الرُّوذباريّ)ە کە دەڵێت:

أُنَزِّهُ فِي رَوْضِ الْمَحَاسِنِ مُقْلَتِي
وَأَمْنَعُ نَفْسِي أَنْ تَنَـالَ مُحَرَّمَا
وَأَحْمِلُ مِنْ ثِقْلِ الْهَوَى مَا لَوْ أَنَّهُ
يُصَبُّ عَلَى الصَّخْرِ الْأَصَمِّ تَهَدَّمَا

واته: چاوەکانم بەنێو باخچەی جوانەکاندا دەگەڕێنم و

نەفسم قەدەغە دەکەم شتێکی حەرام ئەنجام بدات

ئەوەندە قورسی هەواو ئارەزووم هەڵگرتووە ئەگەر

بخرێتە سەر تاوێرێکی ڕەق دەیڕۆخێنێت

نووسەر دەفەرمێت:

دواتر باسەکەی (یوسفَ)ی کوڕی (الحسینِ)و، گوفتارەکەی دێتە پێشەوە کە گوتبووی: صەد جاری تەواو پەیمانم بەپەروەردگارم دا هاوەڵێتی لاو منداڵ نەکـەم، بـەڵام قـەدە جوانـەکان و، چاوە مەستەکان سوێندەکەی بەتاڵ کردمەوە !

ئیبلیس تەماشای کرد ئەمانە قـەومێکن لەگەڵیـدا بـەرەو کـاری خراپـە ڕاکـێش نـابن، ئەوەبوو سەرەتاکانی بۆ ڕازاندنەوە، بۆیە هەستان بەچـێژ وەرگـرتن لـە تەماشـاو، هـاوەڵێتی کردنو، دەمەتەقێ کردن، سوربوون لەسەر ئەوەی بەرگری لەنەفسی خۆیان بکەن، بـۆ ئـەوەی تووشی داوێن پیسی و کاری خراپە نەبن، بەڵام ئەگەر ڕاستیش بکەن و، ئەوەیان بۆ بـەدیبێ، ئەوا دڵیان بەشتێکی ترەوە پەیوەند بووە، کە لە حەقیقەتدا پێویستە بەبەجێهێنانی فـەرمانی خوای تعالاوە پەیوەند بێ، کاتەکانی خۆشیان _ کە پێویستە دڵ بەشتێکەوە سەرقاڵ بـێ کـە سوودی بۆ ڕۆژی دوای هەبێ _ بەتێکۆشان بەرامبەر بەنـەفس و خـوو و سروشـتی خۆیانـەوە بەسەر دەبەن، بۆ ئەوەی تووشی کاری خراپە نەبن.

هەموو ئەمانە نەفامی و، دەرچوونە لە ئادابەکانی شەرع، چونکە خوای تعـالی فـەرمانی بەچاو داگرتن کردووە، کە ڕێگایەکە بۆ دڵ، بـۆ ئـەوەی دڵ تەسـلیمی خـوای تعـالی بـێ و، شتێکی نامۆی تێکەڵ نەبێ.

نموونەی ئەمانە وەکو نموونەی کەسێکە چوبێ بۆ لای جانەوەرێکی دڕندە لە جەنگەڵێکـدا، کە جانەوەرەکە بیری بەلای ئەمەوە نەبێ و نەیبینێ، بەڵام ئـەم کەسـە وازی لـێ نـەهێنێ و، بیوروژێنێ و، لە گەڵیدا بەشەڕ بێ و، بەرگری بکات، ئای کە ساغ و سەڵامەتی ئەم کەسە لە برینەوە بە دورنابێ، ئەگەر نەشفەوتێ و تیانەچێ !!

## ✸ تێکۆشان بەرامبەر بەنەفس:

ئەمانە کەسانێکیان تێدایە ماوەیەك بەهێز بەرامبەر بەنەفسی خۆی تێدەکۆشا، پاشان لاواز بوو، بۆیە خوودی نەفسی بۆ کاری خراپە بانگی دەکرد، ئەو کاتە نەفسی خۆی لە هاوەڵێتی لووسکەی بێتووکان قەدەغەکرد.

لە (أبي حمزةَ)ەوە دەڵێت: بە(محمدِ)ی کوڕی (العلاءِ الدِّمشقيِّ)م گوت کە سەرگەورەی صوفیەکان بوو و تەماشام کرد ماوەیەك لەگەڵ لاوێکی جوانی پاك و تەمیزدا ڕێ دەکات و، پاشان لێی جیابۆوە، منیش پێم گوت: بۆ لەو لاوە دورکەوتیتەوە کە دەمبینی لەگەڵتدا بوو، پاش ئەوەی پەیوەندیت لە گەڵیدا هەبوو و مەیلیت دەکرد ؟ گوتی: سوێند بەخوا بەبێ ڕق و بەبێ بیزاری لێی جیابومەوە. پێم گوت: بۆ ئەوەت کرد ؟ گوتی: تەماشام کرد ئەگەر بەتەنیا لەگەڵیدا بم و، لێم نزیك بێتەوە، دڵم بانگم دەکات بۆ شتێك، ئەگەر ئەنجامی بدەم، لەبەر چاوی خوای تعالی دەکەوم، لەبەر ئەوە لێی دورکەوتمەوە، بۆ پاك ڕاگرتنی خوای تعالیو، پاشان خۆشم لە دەروازەکانی فیتنەو بەڵاو ئاشوب دوردەخەمەوە.

## ✸ تەوبەو پەشیمانی و زۆری گریان:

کەسانێکیان تەوبەی کردو زۆر گریا سەبارەت بەچاو بەرەڵا کردنەکەی خۆی:

لە (خَيْرِ النَّسَّاجِ)ەوە دەڵێت: لە گەڵ (أُمَيَّةَ)یەی کوڕی (الصامتِ الصوفيِّ)دا بووم، کە تەماشای لاوێکی کردو، یەکسەر ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنْتُمْ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴾﴿ الحديد: ٤ ﴾ واتە ﴿ وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنْتُمْ ﴾ وە لەهەر کوێ بن خوا لەگەڵتانە (بەزانیاری و ئاگاداری) ﴿ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴾ وە خوا بینایە بەهەرچی کە دەیکەن(٤٨٤).

پاشان گوتی: چۆن لە زیندانی خوای تعالی دەباز بین لەکاتێکدا بەفریشتەی دڵڕەقی توندوتیژ پاراستویەتی، خوای تعالی گەورەو پیرۆز بێت، ئای ئەم شتە گەورەیە کە دەیەوێت تاقیم بکاتەوە تیایدا، بەتەماشاکردنم بۆ ئەم لاوە، تەماشاکردنی خۆمم بەهیچ شتێك نەچواندووە مەگەر بەقامیش و زەلێك کە لە ڕۆژێکی بادا ئاگری تێبەربووە، کە هیچی بەجێنەهێڵا.

پاشان گوتی: داوای لێخۆش بوون لە خوای تعالی دەکەم، لە بەڵایەك کە چاوەکانم تووشی دڵی کردم، بەڕاستی ترسام لەو تاوانان و سەرپێچیانە ڕزگارم نەبێ، کە بەرامبەر بە خوای تعالی ئەنجامم داوە، ئەگەرچی بەکردەوەی حەفتا ڕاسگۆشەوە بۆ ڕۆژی قیامەت گەڕابێتمەوە.

پاشان گریا تا هێندەی نەمابوو بمرێ، گوێم لێ بوو لەکاتی گریانەکەیدا دەیگوت: ئەی چاوەکان بەگریان سەرقاڵت دەکەم بۆ ئەوەی تەماشای بەڵا نەکەیت.

---

٤٨٤ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

## ✱ نەخۆش کەوتن بەهۆی خۆشەویستی بەهێزەوە:

کەسانێکیشیان بەهۆی خۆشەویستی زۆر بەهێزەوە، نەخۆشی یاری پێکردن:

لە (أبي حمزة الصوفيّ)وە دەڵێت: (عبدُاللهِ)ی کوڕی (موسى) یەکێك بوو لە سەرکردەی صوفیەکان و ڕیشسپییەکانیان، ئەوەبوو لە بازاڕێکدا تەماشای لاوێکی کردوو، شەیدای بوو، بەناستێك هێندەی نەمابوو بەهۆی ئەوین و خۆشەویستی ئەو لاوەوە ئەقڵی تێکچێ، هەموو ڕۆژێك لەڕێگەی هاتوچۆی لاوەکەدا دەوەستا کاتێ دەهات و دەچوو، بۆ ئەوەی بیبینێ، بەڵاکەی درێژەی کێشاو، نەخۆشی ولاوازی لەجوڵەی خست و، نەیدەتوانی هەنگاوێك ڕێ بکات، منیش ڕۆژێك چوومە سەردانی و، پێم گوت: ئەی (أبامحمد) ! باس وخواست چی یە؟ ئەو شتە چی یە تۆی گەیاندۆتە ئەم باروحاڵەی کە تیایدا دەتبینم ؟ گوتی: شتانێکە خوای تعالى تاقیکردومەتەوە تیایدا، منیش نەمتوانی ئارم بگرم لەسەر تاقیکردنەوەکەو، وزەو توانام بەسەریدا نەبوو، دەگونجێ تاوانی واهەبێ مرۆڤ بەبچوك بێتە بەر چاوی، بەڵام بەلای خوای پەروەردگارەوە لە تاوانێکی گەورە گەورەتر بێ، ئەو کەسەی تووشی تەماشاکردنی حەرام دەبێ شایستەیەتی نەخۆشیەکانی درێژە بکێشێ، پاشان گریا. گوتم: چ دەتگرێنێ ؟ گوتی: دەترسێم بەدەختی و سەرگەردانیم لە ئاگردا درێژە بکێشێ. پاشان بەجێم هێڵاو بەزەیم پێدا دەهاتەوە، لەبەر ئەو باروحاڵ خراپیەی تیایدا بینیم.

(أبو حمزةَ) دەڵێت: (محمدُ)ی کوڕی (عبدِاللهِ)ی کوری (الأشعثِ الدِّمشقيُّ) _ لە چاکترین بەندەکانی خوا بوو _ تەماشای لاوێکی جوانی کرد، ئەوەبوو بورایەوەو، بۆ ماڵەکەی خۆی هەڵگیراو برایەوە، نەخۆشی ڕووی تێکرد، تا ئەو ئاستەی دانیشت لەبەر پێیەکانی، کە لەتوانایدا نەبوو کاتێکی درێژ لەسەریان بوەستێ، ئێمەش دەچوین و سەردانیمان دەکردو، لەباروحاڵ و بەسەرهاتیمان دەپرسی و، ئەویش نە باس وخواسی خۆی بۆ دەگێڕاینەوەو، نە هۆکاری نەخۆشیەکەشی، بەڵام خەڵکی باسی تەماشاکردنەکەیان دەکرد، تا ئەو باس و خواسە بەلاوەکە گەشت و، ئەویش هات بۆ سەردانی، ئەوەبوو بەهاتنی لاوەکە دڵی گەشایەوەو، جوڵایەوەو، بەڕویدا پێکەنی و، بەبینینی پێخۆشحاڵ بوو، ئیتر لاوەکە بەردەوام سەردانی

دەكرد تا توانى لەسەر پێیەكانى بوەستىٚ و، بۆ باروحاڵى پێشووى گەڕایەوە، ئەوەبوو ڕۆژێـك لاوەكە داواى لێكرد لەگەڵیدا بچێتە ماڵەكەى، بەڵام ڕەازى نەبوو، منیش بەشێخم گوت: بـۆ حەزت بەوە نییە ؟ گوتى: من لەبەڵا پارێزراو نیم و، لە فیتنەش دڵنیانیم و، لەوەش دەترسێم شەیتان بەڵاو فیتنەیەكم بەسەر بێنىٚ و، خراپەو سەرپێچیەك لەنێوان من و ئەودا ڕوویدات و، لە خەسارۆمەندان بم !

## ✹ خۆکوشتن بۆ ئەوەی تووشی داوێن پیسی و کاری خراپە نەبێ:

نەفسی کەسانێکیان ئارەزووی داوێن پیسی و کاری خراپەی دەکرد، بۆیە خۆی کوشت:

لە (الحُسَين)ی کوڕی (محمدِ الدَّامَغانيّ)وە دەڵێت: لەوەڵاتی فارس صۆفیەکی گەورە هەبوو، گرفتاری لاوێك بوو، توانای ڕاگرتنی ئەو نەفسەی خۆی نەبوو، کە بۆ ئەنجامدانی داوێن پیسیو کاری خراپە بانگی دەکرد، ئەوەبوو هەستی بە چاودێری خوای _ عزَّوجلَّ _ی کردو، پاشان لەسەر ئەو ئارەزووە پەشیمان بویەوەو، ماڵەکەشی بەشوێنێکی بەرزەوە بوو، وە لەپشت ماڵەکەیەوە دەریایەکی ئاو هەبوو، کە پەشیمان بونەوە گرتی، چووە سەریانەکەو، خۆی فڕێ دایە نێو ئاوەکەوەو، ئەم ئایەتەی خوای تعالای خوێندەوە کە دەفەرمێت: ﴿فَتُوبُوا إِلَى بَارِئِكُمْ فَاقْتُلُوا أَنْفُسَكُمْ﴾ ﴿البقرة: ٥٤﴾ واتە ﴿فَتُوبُوا إِلَى بَارِئِكُمْ﴾ کەواتە بگەڕێنەوە بەپەشیمانی بۆ لای بەدی هێنەرتان ﴿فَاقْتُلُوا أَنْفُسَكُمْ﴾ و خۆتان بکوژن (بێ تاوانتان تاوانبارتان بکوژێت)(٤٨٥)، ئەوەبوو لە دەریاکەدا خنکا.

نووسەر دەفەرمێت:

تەماشای ئیبلیس بکەن چۆن ئەم هەژارەی پلە بە پلە خەڵەتاند، لە تەماشاکردنی ئەم لووسکە بێتوکەوە، ئینجا بەردەوام تەماشاکردنی، تا خۆشەویستی لاوەکەی لەدڵدا جێگیرکرد، ئینجا هانی ئەنجامدانی کاری خراپەو داوێن پیسی دەدا، ئینجا کاتێ تەماشای کرد خۆی دەگرێ و ئەنجامی نادات، بۆی ڕازاندەوە بەنەفامی خۆی بکوژێت، ئەوەبوو خۆی کوشت. پێدەچێ ئەم پیاوە ویست و ئارەزووی داوێن پیسی و کاری خراپەی کردبێ و سوور

---

٤٨٥ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

نەبویێ لەسەر ئەنجامدانی، کەچی تەنها ویست و ئارەزووکردن بـەبێ ئەنجامـدان لـە شـەرعدا بەخشراوە، چونکە پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ دەفەرمێت:

((عُفِيَ لأمَّتي عَمَّا حَدَّثَتْ بِهِ نُفُوسَهَا))(٤٨٦).

واتە فەرموویەتی: ((ئومەتەکەم بەخشراوە لەو ئەندێشەو بیرو خەیاڵاتانەی کە بەنەفسیاندا دێت)).

پاشان پیاوەکە لـەو ویـست و ئارەزووانـەش پەشـیمان بویـەوەو، ((پەشـیمان بوونـەوەش تەوبەیە))(٤٨٧).

بەڵام ئیبلیس وای بەخەیاڵدا هێنا کە پەشیمان بوونەوەی تەواو ئەوەیە کە خۆی بکوژێـت، وەکو ئەوەی (بنو إسرائيلَ) ئەنجامیان دا، ئەوان فەرمانی ئـەوەیان پێکـرا بـەگوفتاری خـوای تعالی: ﴿ فَاقْتُلُوا أَنْفُسَكُمْ ﴾ واتە خۆتان بکـوژن، بـەڵام ئێمـە قەدەغـەی ئـەوەمان لێکـراوە بەگوفتاری خوای تعـالی: ﴿ ولا تقتُلـوا أَنْفُسَكُمْ ﴾﴿ البقـرة: ٥٤ ﴾ واتـە خۆتـان مـەکوژن، بەڕاستی تاوانێکی هەرەگەورەی ئەنجام دا.

وفي ((الصحيحين))(٤٨٨) عن النبـيِّ _ صلى الله عليه وسلم _ أَنَّه قالَ:

((مَن تردَّى مِن جَبَلٍ، فقَتَلَ نفسهُ " فهو يتَرَدَّى في نارِ جهنَّمَ خالداً مخلَّداً فيها أبداً)).

واتە پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ فەرموویەتی:

((هەرکەس لە چیایەك خۆی فڕێداتە خوارەو، خۆی بکوژێت، ئـەوا بـەردەوام لـە دۆزخـدا دەکەوێتە خوارەوەو، بەهەتا هەتای تیایدا دەمێنێتەوە)).

---

٤٨٦ _ رواه البخاري (١١ / ٤٧٨)، ومسلم (١٢٧) " عن أبي هريرة بلفظ:
((إن الله تجاوز لأمتي عما حدثت به أنفسها)).

٤٨٧ _ وقد صحَّ هذا الكلام مرفوعاً الى النبـي _ صلى الله عليه وسـلم _، ولـي جـزءٌ خـاصٌّ في تخريجـه وجمع طرقه، عنوانه: ((دفع الحَوْبـة في طـرق حـديث: النـدم توبـة))، هـو الجـزء التاسـع عـشر مـن سلـستي ((الأجزاء الحديثية))، يسر الله إتمامه.

٤٨٨ _ رواه البخاري (١٠ / ٢٦١)، ومسلم (١٠٩) " عن أبي هريرة.

کەسانێکیش لە صوفیەکان جیابوونەوە خرایە نێوان خۆی و خۆشەویستەکەیەوە، بۆیە هەستا بەکوشتنی خۆشەویستەکەی:

پێم گەشتووە کەوا صوفیەك لە خەڵوەتگەیەکدا (رباط) بوو، لای خۆمان لە بەغداد، منداڵێکیشی لەگەڵدا بوو لەو ماڵەی تیایدا دەژیا، خەڵکیش قسەیان پێگوت، تا لێکیان جیاکردنەوە، صوفیەکەش چووە ژورەوەو چەقۆیەکی بەدەستەوەبوو، هەستا بەکوشتنی منداڵەکەو، ئینجا بەلایەوە دانیشت و دەگریا، خەڵکی خەڵوەتگەکەش هاتن و، بینیان و، لەباروحاڵیان پرسی و، ئەویش دانی بەکوشتنی منداڵەکەدا نا، بۆیە بەرزیان کردەوە بۆ لای سەرۆکی پۆلیس، لەویش دانی بەتاوانەکەیدا نا، بابی منداڵەکەش هات و دەگریا، صوفیەکەش دانیشت و دەگریاو، بەسەرۆکی پۆلیسی دەگوت: توخوا لەبەر ئەم تاوانەم منیش بکوژە، سەرۆکی پۆلیسیش پێی گوت: ئیستا لێم بوردیت. صوفیەکەش هەستاو چوو بۆ لای گۆری منداڵەکەو، بۆی دەگریا، دواتریش بەردەوام لەجیاتی منداڵەکە حەجی دەکردو پاداشتەکەی پێدەبەخشی(٤٨٩).

---

٤٨٩ _ ئەم کارە پێچەوانەی ڕاستیە، چونکە بەخشینی پاداشت بەهیچ کەس ناگات مەگەر لە منداڵەوە بۆ دایك و باب، وەکو ئەوەی لە کتێبی (أحكام الجنائز)دا(ص١٧٣_ ١٧٦) پێشەوامان (الألباني) _ متَّع الله بعلومه _ لێکۆڵینەوەی لەسەر نوسیوە.

## ✱ نزیکبوونەوە لە فیتنەو ئاشوب و کەوتنە نێوی:

کەسانێك لەمانە لە فیتنەو ئاشـوب نزیـك بوونـەوەو، کەوتنـە نێـوی و، بانگەشـەکانی ئارامگرتن و تێکۆشان بەرامبەر بەئارەزووەکانی نەفس سوودی پێ نەگەیاندن.

لـە (إدریـسَ)ی کـوڕی (إدریـسَ)ەوە دەڵێـت: لـە مـصر لای کۆمـەڵێکی صـوفیەکان ئامادەبووم، لاوێکی لووسکەی بێتوکیـان هـەبوو گـۆرانی بـۆ دەگـوتن، گـوتی: پیاوێکیـان باروحاڵەکەی بەسەردا زاڵ بوو و، نەیزانی چ بکات، بۆیە گوتی: ئـەی لاو ! بڵـێ: (لا إلـه إلا الله). لاوەکەش گوتی: (لا إله إلا الله). ئەوەبوو گوتی: ئەو دەمە ماچ دەکـەم کـە گـوتی (لا إله إلا الله) !!

بەشی شەشەم(٤٩٠): کەسانێکن مەبەستیان هاوەڵێتی لووسکە بێ تووکەکان نەبوو، بەڵکو مەبەستیان ئەوەبوو منداڵەکە تەوبە بکات و، زوهد بکات و، بەویست و خواست هاوەڵێتیـان بکات، ئیبلیسیش سەریان لێ دەشێوێنێت و، دەڵێت: لەخەیر قەدەغەی مەکەن.

پاشان تەماشاکردنیان بۆ لاوەکە دوبارە دەبێتەوە بـەبێ مەبەسـت، تـا فیتنـەو ئاشـوبێك لەدڵدا دروست دەکات و، ئینجا شەیتان زەفەریان پێ دەبات، بـە ئەنـدازەی تـوانینی خـۆی، پێدەچێ ئەو کەسانە متمانەشیان بەدین و ئیمانەکەی خۆیان هەبێ، بەڵام شەیتان ورووژاندنی و هانی دان و، فرێی دانە نێو ئەوپەڕی تاوان و سەرپێچیەوە.

نووسەر دەفەرمێت:

هەڵەیان لەوەدایە خۆیان تووشی فیتنەو ئاشوب دەکەن و، هاوەڵێتی کەسانێك دەکـەن کـە مرۆڤـ بێوەی نابێ لە کاتی هاوەڵێتیاندا.

شتی وەکو ئەمە لە هەموو چەرخێکدا زۆرە، لە صوفیەکان و کەسانی تریش.

بەشی حەوتەم: قەومێکن دەیـانزانی هـاوەڵێتی لووسـکەو بێتووکـان و تەماشـاکردنیان جایز نییە، بەڵام نەیانتوانی لەسەر ئەوە ئارام بگرن:

---

٤٩٠ _ گەڕانەوە بۆ بەشەکانی تەصوف لەبواری هاوەڵێتی لاو و منداڵاندا.

له (الرازيِّ)وه دەڵێت: (يوسُفُ)ی كوڕی (الحسينِ) دەڵێت: هەر شتێكتان بینی من دەیكـەم نێوەش بیكەن جگە لە هاوەڵێتی لاوان و منداڵان، چونكە فیتنـەترین و ئاشـوبترینی فیتنــەو ئاشوبەكانە، دڵنیابن زیاتر لە صـەد جـار پـەیمانم بـەخوای خـۆم داوە كـە هـاوەڵێتی لاوان و منداڵان نەكەم، بەڵام جوانی گۆناكان و، قەدو باڵای ڕێك و، مەسـتی چـاوەكان پەیمانەكـەیان هەڵوەشاندمەوە، لە كاتی هاوەڵێتیشیاندا خوای تعالی سـەبارەت بـەهیچ سەرپێـچیەك لێـی نەپرسیم.

(صَرِيعُ الغَواني)(٤٩١) لە مانایەكی هاوەشێوەی ئەوەدا ئەم شیعرە دەڵێت:

إنَّ وَرْد الخُدود، و الحَدَقَ النُّجـ

ـلَ، و ما في الثُّغور من أُقْحُوانِ

واعوجاجَ الأصْداغِ في ظاهر الخَدِّ،

و مـــــا في الصُّدورِ من رُمَّانِ

تَركَتْني بين الغَواني صَريعـــــاً

فلِهذا أُدْعَى صَرِيعَ الغَـــــوَانِي

واتە: سوری گۆناكان و جوانی و گەورەیی چاوەكان و

زارەكان كە وەكو گوڵە بەیبون كراوەتەوە

لاری لاجانگە لە ڕووكاری گۆناكانداو

ئەو هەنارەی لە سنگەكاندایە

بەجێتهێشتم لەنێوان ئافرەتە شۆخ و جوانەكاندا بەتێشكاوی

بۆیە بەتێشكاویی ئافرەتە جوان و شۆخەكان ناسراوم

نووسەر دەفەرمێت:

ئەم پیاوە بەڕاستی ناوی خۆی زڕاندوە لە شتێكدا كە خوای تعالی نهێنیەكەی پاراسـتووە، هەواڵیشی داوە كەوا هەركات فیتنەو ئاشوبێكی ببینیێ پەیمانەكەی هەڵوەشـاندۆتەوە، باشـە

---

٤٩١ _ هو مسلم بن الوليد الأنصاري، ترجمته في ((سير النبلاء)) (٨ / ٣٢٣).

ئیرادەو سووری تەصوف لە کویّ یە بۆ پالّنـانی نـەفس بـۆ ئـەوەی قورسـی و نارِەحەتیـەکان هەلّگریّت ؟!

پاشان بەنەفامیەکەی خۆی واتیّگەشتووە کە سەرپیّچی تەنها بریتیـە لـە داویّـن پیـسی و کاری خراپە، بەلاّم ئەگەر زانـستی هەبوایـە دەیزانـی کـەوا هـاوەلّیّتی و تەماشاکردنیـشیان سەرپیّچیە.

تەماشای نەفامی بکە چ بەخاوەنەکانی دەکات ؟!

## ✸ سوودى زانست و مەترسیێتى تەماشاكردن:

هەموو كەسێك زانستى لە دەست چوبێ، بێ سەروبەرە كردار دەكات، ئەگەر دەستیشى كەوت و كردەوە پێكردنى لە دەست چووبێ، ئەوا بەبێ سەروبەرەیەكى زۆر بەهێزەوە كردار دەكات، وە هەركەس ئەدەبى شەرعى بەكارهێنا كە لە گوفتارى خواى تعالادا هاتووە: ﴿قُلْ لِلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ﴾ النور: ٣٠ واتە: ﴿ قُلْ لِلْمُؤْمِنِينَ ﴾ (ئەى محمد ـ صلى الله عليه وسلم ـ) بلێ بەپیاوانى ئیماندار ﴿ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ ﴾ چاوى خۆیان داخەن و بپارێزن (لەسەیركردنى نامەحرەم)(٤٩٢)، ئەوا هەر لە سەرەتاوە لەو شتانە بێوەى دەبێ، بەڵام ئەگەر ئەدەبى شەرعى پیادە نەكردبێ ئەوا لە كۆتایدا زۆر ئاستەمە وازى لێ بێنێت.

شەرع قەدەغەى ئەوەى كردوە كە لەگەڵ لووسكەى بێتوكدا دانیشتن بكرێت، زانایان سەبارەت بەم شتە ئامۆژگاریان كردوین:

پێشەوا (عمرُ)ى كورِى (الخطّابِ) فەرموویەتى: هیچ جانەوەرێكى درِندەى زیانبەخش بەئەندازەى لاوێكى لووسكەى بێتووك بۆ زانا مەترسیدار نییە.

لە (الحسنِ)ى كورِى (ذكْوانَ)ەوە دەڵێت: لەگەڵ منداڵى دەوڵەمەنداندا دامەنیشن، چونكە روخساریان لە روخسارى ژنان دەچێت، ئەوانە زۆر لە كچى شوونەكردوو دڵرفێنترن.

لە (أبي السَّائبِ)ەوە دەڵێت: دڵنیابن من دەترسم لاوێكى لووسكەى بێتووك زیاتر لە حەفتا كچى شوونەكردوو كار لە خواپەرستێك بكات.

لە (أبي عليّ الرُّوذباريّ)وە دەڵێت: گوێبیستى (جُنید) بووم دەیگوت: پیاوێك بەیاوەرى كورِێكى منداڵى جوانى خۆى چووە دیدەنى پێشەوا (أحمدَ)ى كورِى (حنبلٍ). فەرمووى: ئەمە كێیە؟ پیاوەكە گوتى: كورِى خۆمە. پێشەوا (أحمدَ) فەرمووى: جارێكى تر لە گەڵ خۆتدا مەیهێنە. كاتێ پیاوەكە هەستاو رۆشت، پێى گوترا: خوا پشتگیرى شێخ بكات، ئەم پیاوە پاك دامێن و بەئابرِوەو، كورِەكەشى لە خۆى چاكترە.. پێشەوا (أحمدَ) فەرمووى: پاك

---

٤٩٢ ـ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەى تەفسیرى قورئان.

دامێنیو بەئابڕوویەتی ئەوان مەبەستە سەرەکیەکەی ئێمە قەدەغە ناکات، ئێمە لەسەر ئەم بیروڕایە شێخەکانی خۆمانمان بینی و، ئەوانیش هەمان بیروڕایان لە پێشینانی خۆیانەوە بۆ دەگێڕاینەوە.

لە (بِشْرِ)ی کوڕی (الحارثِ)ەوە دەڵێت: لەم لاو و منداڵانە وریای خۆتان بن.

لە (أَبي منصورِ عبدالقادرِ)ی کوڕی (طاهرِ)ەوە دەڵێت: هەرکەسێك هاوەڵێتی لاو و منداڵان بکات، تووشی کاری ناشیاو و ناپەسەند دەبێ.

لە (أَبي عبدالرحمنِ السُّلَمِيِّ)وە دەڵێت: (مُظَفَّرٌ القَرْمِيسينِيُّ) دەڵێت: هەرکەس هاوەڵێتی لاو و منداڵ بکات بەمەرجی بێوەیی و ئامۆژگاری، ئەوە تووشی بەڵاو فیتنە دەبێ، ئەی ئەو کەسانەی هاوەڵێتیان دەکەن بەبێ مەرجی بێوەیی دەبێ چۆن بێ ؟!

## * ڕوو وەرگێڕان لە لووسکەو بێتوکان:

بەڕاستی پێشینانی چاك زێدەڕۆیان دەکرد سەبارەت بەڕوو وەرگێڕان لە لووسکەو بێتوکان:

لە (عطاءَ)ی کوڕی (مسلمٍ)ەوە دەڵێت: (سفیانُ) نەیدەهێڵا لووسکەیەکی بێتووك لەگەڵیدا دانیشێت.

لە (یَحیی)ی کوڕی (مَعین)ەوە دەڵێت: هەرگیز لووسکەیەکی بێتووك تەماعی هاوەڵێتی منی نەکردووە.

لە (عبدِاللهِ)ی کوڕی (المبارکِ)ەوە دەڵێت: (سفیانُ الثوريُّ) چووە گەرماوەوە، لەو کاتەدا منداڵێکی ڕوو گەش هاتە ژورەوە، ئەوەبوو فەرمووی: دەریکەنە دەرەوە، دەریکەنە دەرەوە، بەڕاستی من لە گەڵ هەر ژنێکدا شەیتانێك دەبینم و، لە گەڵ هەر منداڵێکیشدا دەیەها شەیتان دەبینم !

لە (أبي عليّ الرُّوذباريّ)وە دەڵێت: (أبوالعباسِ أحمدُ المؤدِّبُ) پێی گوتم: ئەی (أباعلي) ! صوفیەکانی ئەم زەمەنەی خۆمان لە کوێ وە ئەم دڵخۆش بوونەیان بەمنداڵان وەرگرتووە ؟ منیش پێم گوت: ئەی گەورەم ! تۆ باشتر دەیاناسی، پێدەچێ نیەتی بێوەیی بیانبات بۆ زۆر شت. گوتی: ئەیهو زۆر دورە، کەسانێکمان بینی ئیمانی زۆر لەوان بەهێزتر بوو، ئەگەر لاو و منداڵی ببینیبا بۆلای دێت، هەڵدەهات، وەکو چۆن لە ڕیزی لەشکری پێشکەوتوو هەڵدێت، لەڕاستیدا ئەوەش بەگویرەی کاتەکانە کە باروحاڵ زاڵ دەبێ بەسەر خاوەنەکانیدا، کە ناهێڵێت تەصروفێك بکات کە سرووشت و خووی ئادەمیزادی پێویستی دەکات، ئای کە مەترسی زۆرە! ئای کە هەڵە زۆرە !

## ✱ هاوەڵێتی منداڵ و لاوان:

هاوەڵێتی منداڵ و لاوان بەهێزترین داوەكانی ئیبلیسە كە زۆرێك لە صوفیەكانی پـێ ڕاو دەكات.

لە (أبي بكرِ الرازي)وە دەڵێت: (یوسُفُ)ی كوڕی (الحُسينِ) دەڵێت: تەماشای بەڵاو نەهامتی صوفیەكانم كرد، بۆم دەركەوت لە كوێ وە بۆیان هاتووە ! بینیم بەڵاو نەهامەتی صوفیەكان لە هاوەڵێتی منداڵ و لاوان و، تێكەڵی دژەكان و، هاوڕێیەتی ژنانەوەیە.

## ✱ سزای تەماشاكردنی لووسكەو بێتووكان:

سەبارەت بەسزای تەماشاكردنی لووسكەو بێتووكان:

لە (أبي عبدِاللهِ)ی كوڕی (الجَلاءِ)ەوە دەڵێت: تەماشای منداڵێكی گاورم دەكرد، لەو كاتەدا (أبوعبدِاللهِ البَلْخيُّ) بەلامدا تێپەڕیوو و، پێی گوتم: بۆچی وەستاوی ؟ منیش گوتم: ئەی مام ! تەماشای ئەم ڕوخسارە ناكەی چۆن بەئاگر سزا دەدرێ، ئەوەبوو بەدەستەكانی دای بەسەر شانمداو گوتی: ئەنجامەكەی دەبینی ئەگەرچی پاش ماوەیەكیش بێت.

گوتی: پاش چل ساڵ ئەنجامی ئەوەم دەستكەوت، ئەوەبوو كە قورئانم بیرچۆوە.

دەڵێم: لەڕاستیدا كەمێ درێژەم بەم بەشەدا(٤٩٣)، چونكە لەو شتانەیە كە خەڵكێكی زۆر تووشی بەڵاو كارەسات دەكات، وە ئەو كەسەی زانیاری زیاتری دەوێت، وە ئەوەی پەیوەندی بەچاو بەرەڵاكردن و، هەموو هۆكارەكانی هەواو ئارەزوواتەوە هەیە، با تەماشای كتێبەكەمان ((ذمّ الهوى)) بكات، چونكە ئەوەی تۆ لەو بارەوە دەتەوێ تیایدایە.

---

٤٩٣ _ شێخ _ علي الحلبي _ دەڵێت: هەستاوم بە لابردنی زۆرێك لەو چیرۆك و باس و خواسانەی كە پێشەوا _ ابن الجوزي _ لێرەدا دەیگێڕێتەوەو، هەرە گرنگەكانیم هێشتۆتەوە.

## ✱ باسی سەرلێشێواندنەکانی ئیبلیس بەرامبەر بەصوفیەکان سەبارەت بەبانگەشەکردنی پشت بەستن و وازهێنان لە هۆکارەکان و خۆنە پاراستن لە ماڵ و سامان:

لە (ذي النُّونِ المصريِّ)وە دەڵێت: ساڵانێك زۆر سەفەرم کرد، بەڵام تەنها یەك جار نەبێ، پشت بەستنم بەڕاستی بۆ نەهاتەدی، ئەوەبوو لەڕێگای دەریاوە سەفەرم کرد، کەشتێیەکەمان شکا، دەستم گرت بەدارێك لەدارەکانی کەشتیەکەوە، نەفسم پێی گوتم: دڵنیابە خوای تعالی حوکمی خنکانی بەسەر تۆدا داوە، ئەم پارچە دارە چ سوودێك بەتۆ دەگەیەنێ ؟ بۆیە وازم لە پارچە دارەکە هێنا، کەچی سەر ئاوەکە کەوتم، تا کەوتمە کەناری دەریاکە.

لە (محمد)ەوە دەڵێت: سەبارەت بەمەسەلەیەك لە بواری پشتبەستندا لە (أبایعقوبَ الزَّیَّاتَ)م پرسی، ئەوەبوو دێرەهەمێکی پێ بوو لایبردو، پاشان وەڵامی دامەوە _ هەقی پشتبەستنەکەی دا _، پاشان گوتی: شەرمم کرد شتێکم پێ بێ، کاتێ کە وەڵامت دەدەمەوە!

نووسەر دەفەرمێت:

کەمی زانست ئەو تێکەڵکردنەی دروست کرد، بەڵام ئەگەر لە ناوەڕۆکی پشتبەستن تێگەشتنایە، دەیانزانی هیچ دژ بەیەکبونێك لە نێوان پشتنبەستن و بەکارهێنانی هۆکارەکاندا نییە، چونکە پشتبەستن متمانەکردن و باوەڕکردنی دڵە تەنها بەو کەسەی کە پشتی پێدەبەسترێت، لە بواری بەڕێوەبردنی کاروباردا، ئەمەش دژ بەوە نیە کە جەستە بجولێتەوەو هۆکارەکان بەکاربێنێ، یاخود ماڵ و سامان پاشەکەوتکردن، خوای تعالی دەفەرمێت: ﴿وَلا تُؤْتُوا السُّفَهَاءَ أَمْوَالَكُمُ الَّتِي جَعَلَ اللَّهُ لَكُمْ قِيَامًا﴾ ﴿النساء: ٥﴾ واتە ﴿وَلا تُؤْتُوا السُّفَهَاءَ﴾ مەیدەنە گێل و کەم عەقڵەکان ﴿أَمْوَالَكُمُ﴾ ماڵەکانتان ﴿الَّتِي جَعَلَ اللَّهُ لَكُمْ﴾ لە حاڵەتێکدا خوا ئەو (ماڵانەی) بۆ کردون ﴿قِيَامًا﴾ بەهۆی ڕاوەستانی ژیانتان(٤٩٤).

---

٤٩٤ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

پێشەوا _ ابن الجوزي _ دەفەرمێت: ﴿ قِيَامًا ﴾ واتە بۆ ڕاوەستانی جەستەكانتان.

پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ فەرموویەتی: ((نِعْمَ المالُ الصالحُ مَعَ الرجلِ الصالحِ))(٤٩٥) واتە: ((ئەو ماڵ و سامانە چاكە، كە هی پیاوی چاكە)).

هەروەها فەرموویەتی: ((إنَّكَ أنْ تدَعَ ورثَتَكَ أغنياءَ خيرٌ مِن أنْ تَدعَهُمْ عالةً يتكففونَ الناسَ))(٤٩٦).

واتە: ((تۆ ئەگەر واریسەكانت بەدەوڵەمەندی بەجێبێڵیت، زۆر چاكترە لەوەی كە بەهەژاری‌و نەداری بەجێیان بێڵیت و، دەست لە خەڵك پانكەنەوە)).

وە بزانە ئەو زاتەی فەرمانی بەپشتبەستن كردوە هەر خۆشی فەرمانی بەوریابون و ئاگاداربون كردووە، بۆیە دەفەرمێت: ﴿ خُذُوا حِذْرَكُمْ ﴾﴿ النساء: ٧١ ﴾ واتە ئاگاداری خۆتان وەرگرن(٤٩٧).

هەروەها خوای تعالی دەفەرمێت: ﴿ وأعِدُّوا لَهُمْ ما اسْتَطَعْتُم مِن قُوَّةٍ ﴾﴿ الأنفال: ٦٠ ﴾ واتە ﴿ وأعِدُّوا لَهُمْ ﴾ (ئەی ئیمانداران) ئامادەی بكەن بۆیان ﴿ ما اسْتَطَعْتُم مِن قُوَّةٍ ﴾ ئەوەی لە تواناتاندا هەیە لە هێز(٤٩٨).

وقالَ: ﴿ أنْ أسْرِ بعبادي لَيْلاً ﴾﴿ طه: ٧٧ ﴾ واتە كە بەندەكانم بەشەو ببە (و لە مصر دەرچن)(٤٩٩).

پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ هەواڵی پێداوین كەوا پشتبەستن دژبە خۆپاراستن نییە.

---

٤٩٥ _ رواه أحمد (٤ / ١٩٧)، والبَغوي (٢٤٩٥) " عن عمر بن العاص، بسند حسن.

٤٩٦ _ رواه البخاري (٥ / ٣٦٣)، ومسلم (١٦٢٨) " عن عبدالله بن عَمرو.

٤٩٧ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

٤٩٨ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

٤٩٩ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

عن أنس بنِ مالكٍ _ رضي الله عنـه _ قـالَ: جـاءَ رجـلٌ إلى النبـيِّ _ صـلى الله عليـه وسلم_، وتركَ ناقةً ببابِ المسجدِ، فسألهُ رسولُ اللهِ _ صلى الله عليه وسـلم _ عنهـا ؟ فقـالَ: أطلَقْتُها، وتوكَّلتُ على اللهِ. قالَ: ((اعْقِلْها وتوكَّل))(٥٠٠).

واته: له (أنس)ی كوڕی (مالـك)هوه _ خوای لیٚ ڕازی بیٚت _ فەرموویەتی: پیاوێك هاتـه خزمەتی پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _، كه وشترێكی له دەرگای مزگەوتەكـەدا بەجێهێڵابوو، پێغەمبەری خواش _ صلى الله عليه وسلم _ دەربارەی وشترەكه لێی پرسـی ؟

٥٠٠ _ رواه الترمذي (٢٥١٩)، وأبونعيم في ((الحلية)) (٨ / ٣٩٠)، وابن أبي الدنيا في ((التوكُّل)) (رقـم ١١) " عن أنس.

وفي سنده راوٍ لم يوثِّقه إلا ابن حبان.

ورواه ابن حبان (٢٥٤٩)، والحاكم (٣ / ٦٦٣)، والقُضاعي (٦٣٣) " عن عمرو ابن أمية.

وقال الهيثمي في ((المجمع)) (١٠ / ٣٠٣):

((رواه الطبراني من طرق، ورجال أحدهما رجال الـصحيح " غـير يعقـوب بـن عبـدالله بـن عمـرو بـن أميـة الضمري، وهو ثقة)).

وناقض نفسه في (١٠ / ٢٩١)، إذ قال:

((وفيه عمرو بن عبدالله بن أمية الضمري ﴿ وهو هو ﴾، ولم أعرفه)) !

إذ تحرَّف عليه !!

وقال العراقي في ((تخريج الإحياء)) (٤ / ٢٧٩):

((رواه ابن خزيمة في ((التوكُّل))، والطبراني من حديث عَمْرو بن أمية بإسناد جيد)) !!

قلت: ويعقوب لم يوثِّقه إلا ابن حبان أيضاً، ولكن الحديث بهذين الطريقين حَسَنٌ إن شاء الله.

(تنبيه):

عزا الحديثَ الشيخُ شعيب الأرنؤوط في تعليقِه على ((الإحسان)) (رقم ٧٣١)، لـ ((البيهقي في ((التوكـل)) (ص١٢) !

وليس لذلك أصل ! إنما هو ابن أبي الدنيا !!

والله أعلم.

گوتی: بەرەڵام کردو، پشتم بەخوا بەست. پێغەمبەری خـواش _ صلی الله علیه وسلم _ فەرمووی: ((بەڵکو بیبەستەوەو پشت بەخوا ببەستە)).

له (سُفیانَ)ی کوڕی (عُیَیْنَةَ)ەوە دەڵێت: تەفسیرکردنی پشتبەستن ئەوەیە کـە مرۆڤ ڕازی بێ بەوەی پێی دەکرێت.

(ابنُ عقیلٍ) دەڵێت: قەومێك وادەزانن کە پـارێزکردن و خۆپاراستن دژ بـە پشتبەستنەو، پشتبەستنی تەواو بریتیە لە پشت گوێخستنی دەرەنجام و ئاکام و، وازهێنانە لـە خۆپاراستن، بەڵام ئەم شتە بەلای زانایانەوە ناتەواوی و کەمتەرخەمیەو، بەلایانەوە دەبێ بـەهۆکارێك بـۆ سەرزەنشتکردن.

خوای تعالی فەرمانی بەبەشتبەستن نـەکرد، تـا فـەرمانی بەخۆپاراستن و بـەکارهێنانی هەموو توانایەك کرد بۆ پارێزکردن، خـوای تعـالی دەفـەرمێت: ﴿ وَشَاوِرْهُمْ فِي الأمْرِ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ﴾ ﴿آل عمران: ١٥٩ ﴾ واتە ﴿ وَشَاوِرْهُمْ ﴾ ڕاوێـژیان پـێ بکـە ﴿فِي الأمْرِ﴾ لەکاروباردا ﴿ فَإِذَا عَزَمْتَ ﴾ جا کاتێ (دوای ڕاوێـژکردن) بڕیـارت دا ﴿ فَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ﴾ ئەوە پشت بەخوا ببەستە(٥٠١).

بۆیە ئەگەر خۆپاراستن و بەکارهێنانی هۆکارەکان دژبە پشتبەستن بوایە، ئەوا خوای تعالی ئەو شتەی تایبەت نەدەکرد بەپێغەمبەرەکەیەوە کاتێ پێی فەرموو ﴿ وَشَاوِرْهُمْ فِي الأمْرِ ﴾.

باشـە ئایـا ڕاوێـژپێکردن مەگـەر سـوود وەرگـرتن نییـە لـەڕای کەسـی بەرامبـەر کـە بەکاردەهێنرێت بۆ خۆپاراستن و پارێزکردن لە دوژمن ؟!

خوای تعالی ڕازی نەبووە بەوەی خۆپاراستن و پارێزکردن بگەڕێنێتـەوە بـۆ ڕاو ئیجتهـادی تایبەتی خۆیان، بەڵکو بڕیـاری لەسـەر داوەو، کردویـەتی بەئەنجامـدانی کارێـك لـە خـودی نوێژەکەدا، کە تایبـەترین پەرسـتنەکانە، بۆیـە فەرموویـەتی: ﴿ فَلْتَقُمْ طَائِفَةٌ مِنْهُمْ مَعَكَ

---

٥٠١ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

وَلْيَأْخُذُوا أَسْلِحَتَهُمْ ﴾﴿ النساء: ١٠٢ ﴾ واتە ﴿ فَلْتَقُمْ طَائِفَةٌ مِنْهُمْ مَعَكَ ﴾ ئەوە با تاقمێك لەوان لەگەڵ تۆ نوێژ بکەن ﴿ وَلْيَأْخُذُوا أَسْلِحَتَهُمْ ﴾ و با چەکەکانیان پێ بێت(٥٠٢).

هۆکاری ئەوەشی بەم ئایەتە ڕوونکردۆتەوە: ﴿ وَدَّ الَّذِينَ كَفَرُوا لَوْ تَغْفُلُونَ عَنْ أَسْلِحَتِكُمْ وَأَمْتِعَتِكُمْ فَيَمِيلُونَ عَلَيْكُمْ مَيْلَةً وَاحِدَةً ﴾﴿ النساء: ١٠٣ ﴾ واتە ﴿ وَدَّ الَّذِينَ كَفَرُوا ﴾ بێ باوەڕان ئاواتەخوازن ﴿ لَوْ تَغْفُلُونَ عَنْ أَسْلِحَتِكُمْ ﴾ کە ئێوە بێ ئاگابن لە چەکەکانتان ﴿وَأَمْتِعَتِكُمْ ﴾ و شت و مەکەکانتان ﴿ فَيَمِيلُونَ عَلَيْكُمْ ﴾ تا پەلامارتان بدەن ﴿ مَيْلَةً وَاحِدَةً﴾ بەپەلامارێکی یەکجارەکی (بدەن بەسەرتاندا)(٥٠٣).

هەرکەسیش بزانێ خۆپاراستن ئاوەهایە، ئیتر نالێت: پشتبەستن وازهێنانە لە هەموو شتە زانراوەکان، بەڵکو پشتبەستن سەرپشکردنی خوای تعالایە لەو مەسەلەدا کە پشتی پێ دەبەسترێت، چونکە لەتواناو وزەی مرۆڤی ئاسایی بەدەرە، ئەوەبوو پێغەمبەری خوا _ صلی الله علیه وسلم _ فەرمووی: ((اعْقِلْها وتوَكَّلْ)) واتە ((بیبەستەوەو پاشان پشت ببەستە)).

ئەگەر پشتبەستن وازهێنان بوایە لە پارێزکردن و خۆپاراستن، ئەوا تایبەت دەکرا بە چاکترین کەسی خەڵکەوە _ صلی الله علیه وسلم _ لە خێرترین باروحاڵەکاندا، کە باروحاڵی نوێژکردنە.

پێشەوا (الشافعيُّ) _ بەڕەحمەتی خوا بێت _ وای بۆ چووە کە پێویستە لەو کاتەدا چەك هەڵبگیرێت، چونکە خوای تعالی دەفەرمێت ﴿ وَلْيَأْخُذُوا أَسْلِحَتَهُمْ ﴾ واتە با چەکانیان پێ بێت.

پشتبەستن خۆپاراستن و پارێزکردن قەدەغە ناکات، چونکە پێغەمبەر موسی _ علیه السلام _ کاتێ پێی گوترا: ﴿ إِنَّ الْمَلأَ يَأْتَمِرُونَ بِكَ لِيَقْتُلُوكَ ﴾﴿ القصص: ٢٠ ﴾ واتە ﴿ إِنَّ الْمَلأَ ﴾ سەرگەورەکان ﴿ يَأْتَمِرُونَ بِكَ لِيَقْتُلُوكَ ﴾ کۆبونەوتەوە لەبارەی تۆوە (قسە دەکەن) بۆ ئەوەی بتکوژن(٥٠٤)، چووە دەرەوە.

---

٥٠٢ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

٥٠٣ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

٥٠٤ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

هەروەها پێغەمبەرمان _ صلى الله عليه وسلم _ لـە مەككـە چـووە دەرەوە، لەترسـی ئەوانەی پلان و دەسیسەیان بۆ دارِشـتبوو، وە پێـشەوا (أبوبكرالـصديق) _ خـوای لـیّ ڕازی بێت_ بەگرتنی کونی ئەشکەوتەکە دەیپاراست.

تەماشاکە ئەوان هەقی خۆپاراستنیان دەداو، پاشان پشتیان دەبەست.

لەبەشی خۆپاراستندا خوای تعالی دەفەرمێت: ﴿لا تَقْصُصْ رُؤْيَاكَ عَلَى إِخْوَتِكَ﴾ ﴿يوسـف: ٥﴾ واتە ﴿لا تَقْصُصْ رُؤْيَاكَ﴾ خەوەکەت مەگێڕەرەوە ﴿عَلَى إِخْوَتِكَ﴾ بۆ براکانت(٥٠٥).

هەروەها دەفەرمێت: ﴿لا تَـدْخُلوا مِـن بـابٍ واحـدٍ﴾ ﴿يوسـف: ٦٧﴾ واتـە هـەمووتان لـە دەرگایەکەوە مەچنە ژوورەوە(٥٠٦).

هەروەها دەفەرمێت: ﴿ فَآمْشوا في مَناكِبِهـا ﴾ ﴿الملـك: ١٥﴾ واتـە دەی بگـەڕێن بەقـەرغ ولاشانیدا(٥٠٧).

ئەمە لەبەر ئەوەیە کە جوڵانەوە بۆ پاراستنی نەفس مانای ئەوەیـە کـە نیعمـەتی خـوای تعالی بـەکاردەهێنرێت، وەکـو چـۆن خـوای تعـالی دەیـەوێت نیعمەتـە ئاشـکراکانی خـۆی بـەدەرخات، ئاوەهـاش دەیـەوێت سـپاردەکانی خـۆی بـەدەرخات، بۆیـە شـیاو نییـە کـەوا سپاردەکانی پەك بخرێت پشتبەستن بەوەی کە بەخشیویەتی، بەڵکو دەبێ ئەوەی پێتە بـەکاری بێنیت و، پاشان داوای ئەوە بکە کە لایەتی.

خوای تعالی بۆ باڵندەو چوارپێکان چەندین چەکی دروست کردووە، بەکاری دەهێنێـت بـۆ دورخستنەوەی مەترسیەکان، وەکو چرنوك و، نینۆك و، دان، وە ئـەقڵ و ژیریـشی بـەئادەمی بەخشیوە، کە ڕێنوێنی دەکات بۆ هەڵگرتنی چەك و، قەڵابەندی بەبیناو قەڵغان.

---

٥٠٥ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

٥٠٦ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

٥٠٧ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

وە هەرکەس نیعمەتی خوای تعالی پەك بخات و، واز لە خۆپاراستن بهێنێت، ئەوا حیکمەتو دانایی خوای تعالای پەکخستووەو، نموونەی وەکو نموونەی ئەو کەسەی لێدێت کە واز لە خۆراك و دەرمان دەهێنێت و، ئنجا بەهۆی برسێتی یاخود نەخۆشیەوە دەمرێت.

هیچ کەس لەو کەسە گێل و کەم فامتر نییە کەوا بانگەشەی ئەقڵ و ژیری و زانست دەکات و، خۆی بەدەست بەڵاو کارەساتەوە دەدات، بەڵکو پێویستە ئەندامەکانی کەسی پشتبەستوو لە کەسابەتدا بێ و، دڵیشی بەئارام و بەخوای بەهەق سپێردراو بێت، نەیدرێتی یاخود پێی بدرێ، چونکە جگە لەخوای سبحانە وتعالی هیچی تر نابینێت، تەصرڕوف ناکات مەگەر بۆ حیکمەت و بەرژەوەندی، ئەوجا پێنەدانیشی دەبێتە بەخشینێك لە مانادا.

ئای کە ئیبلیس دەسەوسان و بێتوانای بۆ کەسانێکی زۆر ڕازاندۆتەوەو، نەفسی فریوداون و خەڵەتاندونی کە کەمتەرخەمی پشتبەستنە. کاتێ لە خۆیان بایی دەبن و بەخۆیانەوە دەنازن وەکو ئەو کەسانەیان لێدێت کە وادەزانن سەرکەشی ئازایەتیەو، لاوازی و بێدەسەڵاتیش خۆڕاگریە.

نووسەر دەفەرمێت:

ئەگەر کەسێك بڵێت: چۆن خۆم لە قەدەرو چارەنووس بپارێزم ؟!

پێی دەگوترێت: ئەی چۆن لە گەڵ بەجێهێنانی فەرمانەکاندا خۆت لەو زاتە ناپارێزیت کە تەقدیر دەکات، چونکە ئەو زاتەی کە قەدەرو چارەنووس دادەنێت هەر خۆشیەتی کە فەرمان دەکات، خوای تعالی دەفەرمێت: ﴿ وَخُذُوا حِذْرَكُمْ ﴾﴿ النساء: ١٠٢ ﴾ واتە وەئاگاداری خۆتان وەرگرن.

## * پشبەستن دژبە کەسابەت نییە:

لە چوارچێوەی هەمان ماناوە کە تیایدا باسی سەرلێشێواندنەکانی ئیبلیسمان کرد، کە وازی پێهێناون لە بەکارهێنانی هۆکارەکان، دیسان سەری لە خەڵکێکی زۆر شێواندو، وای بەخەیاڵدا هێناون کە پشتبەستن دژبە کەسابەت و هەوڵدانی پەیداکردنی بژێویە.

لە (سهل)ی کوڕی (عبدالله التُّسْتَرِيّ)وە دەڵێت: هەرکەس تانە لە پشتبەستن بدات، ئەوا تانەی لە ئیمان داوە، وە هەرکەس تانە لە کەسابەت بدات، ئەوا تانەی لە سوننەت داوە.

لە (محمد)ی کوڕی (عبدِالعزیز)ەوە دەڵێت: پیاوێك لە (أباعبدِاللهِ)ی کوڕی (سالِم)ی دەپرسی و منیش گوێم لێ دەگرتن و دەیگوت: ئێمە بەکەسابەت یاخود بەپشتبەستن بەندەکراوین ؟ ئەویش گوتی: پشتبەستن باروحاڵی پێغەمبەری خوا بوو _ صلی الله علیه وسلم _، وە کەسابەتیش سونەتی پێغەمبەری خوا بوو _ صلی الله علیه وسلم _، لەڕاستیدا کەسابەت دانرا بۆ ئەو کەسانەی توانای پشتبەستنیان لاوازبوو، وە نەگەشتن بە پلەی هەرەبەرزی تەواویی (الکمال) کە سیفەتی پێغەمبەری خوا بوو _ صلی الله علیه وسلم _، بۆیە هەرکەس بەرگەی پشتبەستن بگرێت، ئەوا لە هیچ بارێکدا کەسابەتی بۆ حەڵاڵ نابێ، مەگەر کەسابەتێك بۆ یارمەتیدانی پشتبەستنەکەی نەك کەسابەتێکی ئەوتۆ کە بیکات بەکۆڵەکەی ژیانی، وە هەرکەس توانای پشبەستنی لاوازبوو، ڕێگەی پێ دەدرێ بەدوای بژێوی‌و کەسابەتدا بگەڕێت، بۆ ئەوەی لە پلەی سوننەتەکەی دانەبەزێ، کاتێ لە پلەی باروحاڵی پشتبەستنی پێغەمبەری خوا _ صلی الله علیه وسلم _ دابەزی !!

لە (یوسُفَ)ی کوڕی (الحسینِ)ەوە دەڵێت: ئەگەر موریدت بینی کاریە ڕێپێدراوەکان (الرُّخَص)و کەسابەت دەکات، ئەوا هیچ شتێکیان ناکات.

نووسەر دەفەرمێت:

ئەمە قسەی کەسانێکە لە مانای پشتبەستن تێنەگەشتوون، وادەزانن پشتبەستن وازهێنانە لە کەسابەت و لەکارخستنی ئەندامەکانی لەشە لە ئیش وکار، بەڵام پێشتر ڕونمان کردەوە کە پشتبەستن کاری دڵە، بۆیە دژ بە جوڵاندنەوەی ئەندامەکانی لەش نییە.

ئەگەر هەموو کاسبێك بەدەر بوایە لە پشتبەستن، ئەوا پێغەمبەرانیش بەدەر دەبوون لە پشتبەستن(٥٠٨).

ئەوەبوو (أَبوبكرٍ) و (عُثمانُ) و (عبدُالرحمنِ)ی کوڕی (عوفٍ) و (طلحةَ) _ رضوان الله تعالی علیهم _ کوتاڵفرۆش بوون، هەروەها (محمدُ)ی کوڕی (سیرینَ) و (میمونُ)ی کوڕی (مِهْران)یش کوتاڵفرۆش بوون.

وە (الزُّبيرُ)ی کوڕی (العوَّامِ) و (عَمْرُو)ی کوڕی (العاصِ) و (عامرُ)ی کوڕی (كُرَيْزٍ) (خَزَّاز)بوون (٥٠٩)، هەروەها (أَبو حنيفةَ)ش.

ئەوەبوو (سَعْدُ)ی کوڕی (أَبي وقاصٍ) نووکی تیری تیژ دەکردو دادەدا.

هەروەها (عُثمانُ)ی کوڕی (طلحَةَ) بەرگ دروو بوو.

(تابِعونَ)و کەسانی دوای ئەوانیش بەردەوام کەسابەتیان دەکردو، فەرمانیان بەکەسابەتکردن دەکرد.

(عمرو)ی کوڕی (مَيْمونَ) لە بابیەوە دەگێڕێتەوەو دەڵێت: کاتێ پێشەوا (أَبوبكرٍ) وەکو جێنشین هەڵبژێردرا، دوو هەزاریان بۆ دانا. فەرمووی: بۆم زیاد بکەن، چونکە لە بازرگانیکردن دورتان خستمەوە، بۆیە پێنج سەدی تریان بۆ زیاد کرد.

نووسەر دەفەرمێت:

ئەگەر پیاوێك بەصوفیەکان بڵێت: لە کوێ خۆراکی منداڵەکانم بدەم ؟ بەدڵنیاییی دەیانگوت: هاوەڵت بۆ خوا بڕیار داوە !

وە ئەگەر پرسیاریشیان لێکرێت سەبارەت بە کەسێك کە دەچێ بۆ بازرگانی، بەدڵنیاییی دەیانگوت: کەسێکە نەپشتبەستووەو نە دڵنیاو بێگومانیشە !

---

٥٠٨ _ وحاشاهم.

٥٠٩ _ الخَزَّاز: واتە لە ئاورێشمی چنراو لە گەڵ خوریدا پۆشاکیان دروست دەکرد.

هەموو ئەمانەی کە دەیڵێن بەهۆی ئەوەوەیە کە بەمانای پشتبەستن و بێگومانی و یەقین نەفامن، ئەگەر کەسێك دەرگاکەی داخستایەو پشتی ببەستایە، ئینجا بێ مانایی بانگەشەکەیان لا ڕوون دەبویەوە، بەڵام ئەوان لە نێوان دوو شتدان:

زۆربەیان بەدەستپانکردنەوە هەوەڵ بۆ دونیا دەدەن، هەشیانە کوڕە خزمەتکارەکەی دەنێرێ و، بەزەمبیلێکەوە بەنێو خەڵکیدا دەگەڕێ و، بۆی کۆدەکاتەوە.

یاخود لە خەڵوەتگەیەکدا (رباط) بەشێوەی مسکین و نەدارێك دادەنیشێت، چونکە زانیویەتی خەڵوەتگەکان خاڵی نابن لە کەسانێك کە سەر لە خەڵوەتگەکە دەدەن بۆ بەخشین، وەکو چۆن دوکان خاڵی نابێ لە کەسانێك کە سەر دەدەن بۆ کڕین و فرۆشتن.

(سعیدُ)ی کوڕی (المسَیِّبِ) دەیگوت: هەرکەس بەردەوام لە مزگەوت دانیشێت و، واز لە کارکردن و پەیداکردنی بژێوی بێنێت و، قایل بێت بەوەی کە بۆی دێت، ئەوا سوورە لەسەر داواکردن لە خەڵك.

## ✱ فەرمانی پێشینانی چاك بەكەسابەتكردن:

پێشینانی چاك قەدەغەی ئەوەیان دەكرد مرۆڤ خۆی تووشی ئەو شتانە بكات و، فەرمانی كەسابەت و بژێوی پەیداكردنیان پێ دەكرد:

پێشەوا (عُمرُ)ی كوڕی (الخطَّابِ) _ خوای لێ ڕازی بێت _ دەیفەرموو: ئەی كۆمەڵی هەژاران ! سەرتان بەرزكەنەوە، بەڕاستی ڕێگەكە ڕوون بۆتەوە، دەی لە كردارە چاكەكاندا دەستپێكەر بن و، بەسەر موسڵمانانەوە مەبەن بەبار.

_ خوای لێ ڕازی بێت _ ئەگەر لاوێكی بدیایەو بەدڵی بوایە، لەبارەیەوە پرسیاری دەكرد: ئایا پیشەو كارێكی هەیە ؟ ئەگەر بگوترایە: نەخێر، ئەوا لەبەر چاوی دەكەوت.

لە (أبي القاسمِ)ی كوڕی (الخُتَّلي)وە دەڵێت: لە پێشەوا (أحمدَ)ی كوڕی (حنبلٍ)م پرسی و، گوتم: چ دەڵێی سەبارەت بەپیاوێك لە ماڵی خۆیدا یاخود مزگەوتەكەیدا دانیشتبێت و، بڵێت: هیچ كارێك ناكەم تا ڕۆزیەكەم خۆی بۆم دێت ؟ پێشەوا (أحمدَ)یش فەرمووی:

ئەمە پیاوێكی نەفامە بەزانست، ئەی فەرمایشتی پێغەمبەری خوات _ صلى الله عليه وسلم _ نەبیستووە:

((جَعَلَ اللهُ رِزقي تحتَ ظلِّ رُمْحي))(٥١٠).

واتە: ((خوای تعالى ڕۆزیەكەی بۆ خستومەتە سێبەری ڕمەكەمەوە)).

والحديث الآخر في ذِكْرِ الطيرِ تغدو خِماصا(٥١١).

واتە: فەرموودەكەی تریش كە پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ باسی باڵندەكان دەكات كە بەیانیان بەسكی خاڵی دەچنە دەرەوە، باسی ئەوە دەكات كە بەیانیان دەچنە دەرەوە بۆ پەیداكردنی ڕۆزی.

---

٥١٠ _ تقدم تخريجه.

٥١١ _ هو ما رواه أحمد (١ / ٥٢)، وابن ماجة (٤١٧٤) " عن عمر بن الخطاب، بسند صحيح. وله طرق أخرى عنه.

خواى تعالى دەفەرمێت: ﴿ وَآخَرُونَ يَضْرِبُونَ فِي الأَرْضِ يَبْتَغُونَ مِنْ فَضْلِ اللَّهِ ﴾ ﴿المزمل: ٢٠﴾ واتە ﴿ وَآخَرُونَ يَضْرِبُونَ فِي الأَرْضِ ﴾ وە كەسانێكى ترتان كە دەڕۆن بەزەويدا ﴿يَبْتَغُونَ مِنْ فَضْلِ اللَّهِ ﴾ بەشوێن ڕۆزى خوادا دەگەڕێن(٥١٢).

هەروەها دەفەرمێت: ﴿ لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَنْ تَبْتَغُوا فَضْلا مِنْ رَبِّكُمْ﴾ ﴿البقرة: ١٩٨﴾ واتە ﴿لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ ﴾ گوناهتان لەسەر نييە ﴿ أَنْ تَبْتَغُوا فَضْلا مِنْ رَبِّكُمْ ﴾ كە دواى ڕۆزى پەروەردگارتان بكەون(٥١٣).

ئەوەبوو هاوەڵانى پێغەمبەرى خوا _ صلى الله عليه وسلم _ لە وشكانى و دەريادا بازرگانيان دەكردو، لە باخە دارەخورماكانياندا كاريان دەكردو، ئێمەش دەبێ شوێنى ئەوان بكەوين و بەپێشەنگى خۆمانيان دابنێين.

پياوێك بە پێشەوا (أحمد)ى گوت: دەمەوێ بەپشتبەستن حەج بكەم. ئەويش فەرمووى: كەوابوو بەبێ كاروانى حاجيان بچۆ. ئەويش گوتى: نەخێر. فەرمووى: كەوابوو پشتت بەتوركەى خەڵك بەستووە !

لە (أبي بكرِ المَرْوَزِيِّ)وە دەڵێت: بە (أبي عبدِاللهِ)م گوت: ئەم كەسە پشتبەستووانە دەڵێن: دادەنيشين و ڕۆزيمان لەسەر خواى تعالايە ! ئەويش فەرمووى: ئەوە قسەيەكى خراپە، ئايا خواى تعالى نافەرمێت: ﴿ إِذَا نُودِيَ لِلصَّلاةِ مِنْ يَوْمِ الْجُمُعَةِ فَاسْعَوْا إِلَى ذِكْرِ اللَّهِ وَذَرُوا الْبَيْعَ﴾ ﴿ الجمعة: ٩ ﴾ واتە ﴿ إِذَا نُودِيَ لِلصَّلاةِ ﴾ كاتێك بانگدرا بۆ نوێژ ﴿ مِنْ يَوْمِ الْجُمُعَةِ﴾ لە ڕۆژى هەينيدا ﴿ فَاسْعَوْا إِلَى ذِكْرِ اللَّهِ ﴾ بەپەلە بڕۆن بۆ يادى خوا (و نوێژە هەينى) و ﴿وَذَرُوا الْبَيْعَ ﴾ واز لە كڕين و فرۆشتن بهێنن(٥١٤).

پاشان فەرمووى: ئەگەر بڵێت: كار ناكەم و، لە هەمان كاتيشدا شتێكى بۆ بهێنرێت كە لە كارو كەسابتەوە بەدەست هێنرابێت ! بۆچى لە كەسانى ترى وەردەگرێت ؟!

---

٥١٢ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەى تەفسيرى قورئان.

٥١٣ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەى تەفسيرى قورئان.

٥١٤ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەى تەفسيرى قورئان.

(صالِحُ)ی کوڕی (أَحمَدَ) دەڵێت: من لەویّ بووم کە لە بابمیان پرسی سەبارەت بەقەومێك کارناکەن و دەڵێن: ئێمە پشتمان بەستووە. ئەویش فەرمووی: ئەمانە بیدەعەچین !

(أبنُ عقيلٍ) دەڵێت: بەکارهێنانی هۆکارەکان دژ بە پشتبەستن نین، چونکە مومارسەکردنی پلەیەك کە لە پلەی پێغەمبەران بەرزتر بێ، کەموکوڕی و ناتەواویە لە ئایندا.

وە کاتێ بەپێغەمبەر (موسی) _ علیه السلام _ گوترا: ﴿ إِنَّ الْمَلأَ يَأْتَمِرُونَ بِكَ لِيَقْتُلُوكَ﴾ ﴿القصص: ٢٠ ﴾ واتە ﴿ إِنَّ الْمَـلأَ ﴾ سەرگەورەکان ﴿ يَـأْتَمِرُونَ بِـكَ لِيَقْتُلُـوكَ ﴾ کۆبونەوتـەوە لەبارەی تۆوە (قسە دەکەن) بۆ ئەوەی بتکوژن(٥١٥) ؛ چووە دەرەوە، کاتێکیش برسی بـوو و، پێویستی بەپاك دامێنی نەفسی خۆی هەبوو، هەشت ساڵ خۆی کرد بەکرێکار.

هەروەها خوای تعـالی دەفـەرمێت: ﴿ فَآمْـشوا في مَنـاكِبِهـا ﴾ ﴿ الملـك: ١٥ ﴾ واتـە دەی بگەڕێن بەقەراغ ولاشانیدا(٥١٦).

ئەمە لەبەر ئەوەیە کە جوڵانەوە بەکارهێنانی نیعمەتەکانی خوایە، کە بریتیە لە هێزەکان، ئەوەی لای خۆتە بەکاری بێنەو، پاشان داوای یارمەتی بکە.

پێدەچێ مرۆڤـ داوا لە پەروەردگاری بکات و ئەو زەخیرانـەی بیرچـێ کـە بـەلای خۆیـەوە هەیە، وە ئەگەر ئەوەی داوای دەکات کەمێ لێی دواکەوێت، تووڕە دەبێ، کەسـانێك دەبینـی خانوبەرەو ماڵ و موڵك و سامانی هەیە، بەڵام ئەگەر خواردمەنی کـەم بویـەوەو تـەنگی پـێ هەڵچنی و، قەرزی لەسەر کۆبویەوەو، پێی گوترا خانوبەرەکەت بفرۆشە ! دەڵێ: چـۆن واز لـە خانوویەرەکەم بێنم و، شان و شەوکەوتم لە نێوان خەڵکیدا بڕۆخێنم !

لەراستیدا تاقمێك وازیان لە کاسابەت هێنا تەنها لـە بـەر ئـەوەی بـە قـورس و گرانیـان دادەنا، بۆیە لە نێوان دوو شتی ناشیریندا بوون:

یا سەرلێشێواندنی ماڵ و منداڵ، بەوەش وازیان لە فەرزەکان هێنا.

---

٥١٥ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

٥١٦ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

یاخود خۆڕازاندنەوە بەوەی کە کەسێکی پشتبەستە، بەوەش کەسابتکاران بەزەیان بۆ ئـەو کەسانە هاتە جۆش و، تەنگیان بەماڵ و منداڵی خۆیان هەڵچنی و، پێیان دەبەخشین.

ئەم کردەوە ناشیرین و بێ جێیە، ڕەفتاری هیچ کەسێك نییـە مەگـەر کەسـێکی سـووك و ڕیسواو خراپ، چونکە پیاو ئەو پیاوەیە کە ئەو گەوهەرو ناوەڕۆکەی ون نەکردووە کـە خـوای تعالی پێی بەخـشیووە، ونـی نـەکردووە لەبـەر تەمبـەڵی، یـاخود بـۆ نـاو دەرکـردن و خـۆ پێڕازاندنەوە لە نێوان نەفامان‌دا، چونکە پێدەچێ خوای تعالی مرۆڤ لە ماڵ و سامان بێبـەش بکات و، ناوەڕۆکێکی چاکی پێدات و، ئەویش بیکات بەهۆکار بۆ بەدەستهێنانی دونیا کـاتێ کە خەڵکی ئەو سیفەتە چاکەی لێ قبوڵ دەکەن.

## * بەهانەکانیان ؛ بۆ وازهێنان لە کەسابەتکردن:

ئەو کەسانەی دانیشتوون و وازیان لە کەسابەتکردن هێناوە، دەستیان بەداوێنی هەندێ هۆکاری ناشیرینەوە گرتووە، لەوانە:

دەڵێن: دەبێ ڕۆزی خۆمانمان هەر پێ بگات !

ئەمەش ئەوپەڕی ناشیرینیە، چونکە مرۆڤ ئەگەر واز لە گوێڕایەڵی و خواپەرستی بێنێت‌و، بڵێت: ناتوانم بەگوێڕایەڵی و خواپەرستیەکەم ئەوەی کە خوای تعالی بۆی نووسیوم بگۆڕم، ئەگەر لە ئەهلی بەهەشت بم، ئەوا بۆ بەهەشت دەچم، یاخود ئەگەر لە ئەهلی دۆزەخ بم، ئەوا بۆ دۆزەخ دەچم ! پێی دەڵێین: ئەمە هەموو فەرمانەکان ڕەت دەکاتەوە، چونکە ئەگەر ئەوە بۆ کەسێك بەدیهاتایە، ئەوا بابە ئادەم لە بەهەشت نەدەهاتە دەرەوەو، دەیگوت: هیچ شتێکی ترم نەکردووە جگە لەوەی بۆم نوسراوە.

زانراوة ئَيمة داوای بةجيَهيَنانی فةرمانةکانمان ليَکراوة نةك قةدةرو ضارةنووس.

کەسانێکیشیان هەن دەڵێن: حەڵاڵ لە کوێ یە تا بەدوایدا بگەڕێین ؟!

ئەمە گوفتاری کەسێکی نەفامەو، حەڵاڵ هەرگیز نابڕێتەوە، چونکە پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ فەرموویەتی:

((الحَلالُ بيِّنٌ، والحرامُ بيِّنٌ))(٥١٧).

واتە ((حەڵاڵ ئاشکراو ڕوونەو، حەرامیش ئاشکراو ڕوونە)).

ئاشکرایە حەڵاڵ ئەوەیە کە شەرع مۆڵەتی بەخواردنی داوە، لەڕاستیدا ئەم گوفتارەی ئەوان تەنها بەهانەیەکە بۆ تەمەبڵی. کەسانێکیشیان دەڵێن: ئەگەر کەسابەت بکەین، ئەوا یارمەتی ستەمکاران و باخی بووانمان داوە، وەکو ئەوەی لە (إبراهيمَ الخَوَّاصِ) دەگێڕنەوە گوتویەتی:

لە هەموو شتێکدا بەدوای حەڵاڵدا گەڕام، تا ئەو ئاستەی لە ڕاوکردنی ماسیشدا بەدوایدا دەگەڕام، بۆیە چڵێ قامیشم بردو، هەندێ مووم پێوە بەست و، لە نزیك ئاوەکە دانیشتم،

---

٥١٧ _ رواه البخاري (١ / ١١٧)، ومسلم (١٥٩٩) " عن النعمان بن بشير.

قوڵاپی ماسی گرتنەکەم فڕیدا، ماسیەك دەرهات، لەسەر زەویەکە فڕێمدا، دووەمیشم فڕیدا، ماسیەکم بۆ هاتە دەرەوە، سێ یەمیشم فڕێدا، لەپڕ یەکێك لەدواوە زلەیەکی لێدام و نازانم بەدەستی چ کەسێك لێم درا ! کەسیشم نەبینی، گوێبیستی کەسێکیش بووم دەیگوت: تۆ هیچ ڕۆزیەکت دەست نەکەوت، تەنها دەچیٚ شتێك دەکوژی کە یادمان دەکاتەوە.

دەڵێت: مووکانم بڕی و، قامیشەکەم شکاندو، چوومەوە !!

نووسەر دەفەرمێت:

ئەم چیرۆکە ئەگەر ڕاستیش بێت _ چونکە کەسانێك لە (سَندِ)ەکەیدا هەن تاوانبار دەکرێن_ ئەوا زلەلێدەرەکە ئیبلیسە، هەر ئەویش بوو کە بانگی کرد، چونکە خوای تعالی ڕاوی حەڵاڵ کردووە، بۆیە سزای کەس نادات لەسەر ئەوەی کە ڕێی پێداوە، چۆن پێی دەگوترێت: دەچی ئەو شتانە دەکوژی کە یادمان دەکەنەوە ! لە کاتێکدا هەمان ئەو زاتەیە کە ڕێی پێداوە بیکوژێت ؟!

کەسابەتی حەڵاڵ ستایشکراوە، چونکە ئەگەر واز لە ڕاو و، سەربڕینی ئاژەڵ بهێنین، لەبەر ئەوەی یادی خوای تعالی دەکەنەوە، ئەوا هیچ شتێکمان نابیٚ جەستەمان پیٚ ڕاست بێتەوە، چونکە تەنها گۆشتە کە ڕاستی دەکاتەوە !

وازهینان لە ماسی ڕاوکردن و، ئاژەڵ سەربڕین ڕێباوەڕی (البراهمة)یە، تەماشای نەفامی بکە چ دەکات و، تەماشای ئیبلیسیش بکە چۆن کار دەکات ؟!

## * باسی سەرلێشێواندنەکانی ئیبلیس بەرامبەر بە صوفیەکان سەبارەت بە وازهێنانیان لە خۆ چارەسەرکردن:

نووسەر دەفەرمێت:

زانایان جیاوازیان لە نێواندا نییە سەبارەت بەوەی کە خۆ چارەسەرکردن ڕێپێدراوە، لەڕاستیدا تەنها تاقمێکیان وای بۆ دەچوون عەزیمەت ئەوەیە کە وازی لێ بهێنرێت.

لێرەدا مەبەستمان ئەوەیە بڵێین: ئەگەر جێگیربوو کە خۆ چارەسەرکردن ڕێپێدراوە (مُباح) بە کۆدەنگی زانایان و، بەلای هەندێکی دیکەیانەوە سوننەتە، ئەوا ئاوەڕ لە گوفتاری ئەو کەسانە نادرێتەوە، کە وای بۆ دەچن خۆ چارەسەرکردن دژبە پشتبەستنە، چونکە زانایان یەکدەنگن سەبارەت بەوەی کە خۆچارەسەرکردن دژبە پشتبەستن نییە.

بە (صحیح)ی لە پێغەمبەری خواوە _ صلی اللە علیە وسلم _ باسکراوە کەوا خۆی چارەسەر کردووەو، فەرمانی بەخۆچارەسەرکردنیش کردووەو، بەوەش لە پشتبەستن نەچۆتە دەرەوە، هەروەها کە فەرمانی بەخۆچارەسەرکردن داوە کەسی لە پشتبەستن نەکردۆتە دەرەوە.

وفي ((الصحيح))(٥١٨) من حديث عُثمانَ بنِ عفّانٍ _ رضي الله عنه _ أنَّ النبيَّ _ صلى الله عليه وسلم _ رخَّصَ إذا شكى المُحرِمُ عينَه أنْ يُضَمِّدَها بالصبرِ.

واتە لە (عُثمانَ)ی کوڕی (عفّانَ)ەوە _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا _ صلی اللە علیە وسلم _ مۆڵەتی داوە بەو کەسەی لە ئیحرامدایەو چاوی دەیەشێت بە گوشراوی تاڵی شاری چەوری بکات.

(ابنُ جريرِ الطَّبَريُّ) دەڵێت: ئەم فەرموودە بەڵگەیە لەسەر خراپی ئەو قسانەی کە بێ ناقڵانی ئەهلی تەصوف و خواپەرستان دەیلێن، کە گوایە پەشتبەستن بۆ ئەو کەسە دروست نابێ کە نەخۆشیەکی لە جەستەیدا بەدەرمانێك چارەسەرکردبێ، چونکە بە بۆچونی ئەوان ئەوە داواکردنی چاکبونەوەیە لە شتی تری جگە لە خوای تعالی کە هەر هەموو چاکبونەوەو زیان و سوودەکانی بەدەستە.

---

٥١٨ _ ((صحيح مسلم)) (٢ / ٨٦٣).

كه پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ بەڕەهایی فەرمان بەو كەسانە دەدات كە ئیحرامیان بەستووە چاویان بەگۆشراوی تاڵی شاری چارەسەر بكەن، روونترین بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە مانای پشتبەستن شتێكی دیكەیەو وەكو گوفتاری ئەو كەسانە نییە كە پێشتر باسكران، وە ئەو شتە كەسی پشتبەستوو لە چوارچێوەی ڕازی بوون بە قەزاو چارەنووسی خوا ناكاتە دەرەوە، وەكو ئەوەی كەسێك تووشی برسێتیەكی زۆر بێ، بۆیە كە پەنادەباتە بەر خۆاردەمەنی، لە پشتبەستن و ڕازیبوون بەقەزاو چارەنووسی خوا ناچێتە دەرەوە، چونكە خوای تعالی ((لَمْ يُنْـزِلْ داءً إلا أَنْـزَلَ لـهُ دواءً " إلا المـوتُ))(٥١٩). واتـه ((خـوای تعـالی هـەر نەخۆشیەكی دابەزاندبێ مەگەر دەرمانێكیشی بۆ دابەزاندووە، جگە لە مردن)).

چەندین هۆكاریشی داناوە بۆ دورخستنەوەی نەخۆشیەكان، وەكـو چـۆن خـواردنی كـردووە بەهۆكاری لادانی برسێتی، خوای تعالی دەیتوانی مەخلوقاتی خۆی بژێنێت بەشتێكی دیكەی جگە لەمە، بەڵام بەشێوەیەك خولقاندنی كە پێویستیدارین، بۆیـە زیـانی برسـێتی لاناچـێت مەگەر بەوەی كە كراوە بەهۆكاری دورخستنەوەی، هەروەها نەخۆشیش(٥٢٠).

واللە الهادي.

---

٥١٩ _ كما رواه البخاري (١٠ / ١٣٤) عن أبي هريرة مرفوعاً.

٥٢٠ _ پێشەوا (ابن القيِّم) لە كتێبی ((زاد المعاد))دا(٤ / ١٥) دەفەرمێت:

((فەرمووده (صحيح)ەكان فەرمان بەخۆ تیماركردن دەكەن، وە ئەوە دژبە پشتبەستن نیە، وەكو چۆن دورخستنەوەی برسێتی و تینویەتی و گەرماو سەرما بەدژەكانیان دژبە پشتبەستن نی یە، بەڵكو هەقیقەتی یەكتاپەرستی تـەواو نـابێ مەگـەر بـە بەكارهێنانی هۆكارەكان، كە خوای تعالی دایناون بۆ بەدیهاتنی شتەكان بە پێی قەدەرو چارەنووس و، بـە پێـی شـەرعیش، بەڵكو لەكارخستنی هۆكارەكان دژبە خودی پشتبەستنە، وەكو چۆن دژ بەو شـتەو دانـایی و حیكمەتیـشە، پـشتبەستن لاواز دەكات، چونكە ئەو كەسەی هۆكارەكان پەكدەخات و بەكاری ناهێنێ، وادەزانێ وازلێهێنانی ئەسباب و هۆكار لە پـشتبەستن بەهێزترە، كەچی لە ڕاستیدا بەكارنەهێنانی هۆكارەكان بێتوانایەكی ئاشكرایەو دژبە پشتبەستنە.

هەقیقەتی پـشتبەستنیش پاڵپـشتێتی دڵـە بـەخوای تعـالی بـۆ بەدەسـتهێنانی سـوودو بەرژەوەندیـەكانی دیـن و دونیـاو، دورخستنەوەی ئەوەی زیانی پێ دەگەیەنێت لە دین و دونیادا، لە گەڵ ئەمەشدا پێویستە هۆكارەكان بەكاربهێنرێت، چـونكە ئەگەر بەكارینەهێنا، ئەوا دانایی و شـەرعی پەكخـستووە، كـەوابوو نـابێ بەنـدە بێتوانـایی خـۆی بەپـشتبەستن دابـنێ و، پشتبەستنیشی بەبێتوانایی دابنێت)).

دەڵێم _ شیخ علی حسن _ ئەمە گوفتارێكی بەهێزە لەم مەسەلە گرنگەدا، بۆیە ڕەحمەتی خوا لە پێـشەوا _ ابـن القـیم _ بێت و، خوای تعالی پاداشتی خەیری باتەوە.

# ✸ باسی سەرلێشێواندنەکانی ئیبلیس بەرامبەر بەصوفیەکان دەربارەی وازهێنانیان لە نوێژی هەینی و نوێژی بەکۆمەڵ، بەتەنهابونەوەو گۆشەگیری:

نووسەر دەفەرمێت:

ئەوەبوو پێشینە هەرەچاکەکان تەنهابونەوەو گۆشەگیریان بەچاك دادەنا، چونکە بەزانست و خواپەرستیەوە سەرقاڵ بوون، بەڵام گۆشەگیریەکەیان نە لە نوێـژی هـەینی و، نـە لـە نوێـژی بەکۆمەڵ و، نە لە سەردانی نەخۆش و، نە لە ئامادەبونی ناشتنی تەرمی مـردوان و، نـە لـە بەجێهێنانی هەقەکان داینـەدەبڕین، بـەڵکو دورەپەرێزیـەك بـوو لـە ئـەهلی شـەڕو خراپـەو، تێکەڵبونی بێکاران.

بەڵام ئیبلیس تاقمێکی صوفیەکانی سەر لێشێواندوە، کەسانێکیان لە چیایەکدا گۆشـەگیر بووەو شەو بەتەنیا دەمێنێتەوەو بەتەنیاش بەیانی دەکاتەوە، بۆیـە نوێـژی هـەینیێ و، نوێـژی بەکۆمەڵ و، تێکەڵبوونی ئەهلی زانستی لە دەست چوو.

بەگشتیش لە خەڵوەتگەگاندا (الأربطة) گۆشەگیر بۆنەتـەوە، بـەوەش پاداشـتی چـوون بـۆ مزگەوتیان لە دەست چوو، لەسەر نوێنی حەوانەوە دانیشتن و، وازیان لە کەسابەت هێنا.

(أبوحامدِ الغزاليُّ) لە کتێبی (الإحیاء)دا دەڵێت:

مەبەستی ڕاهێنان دڵ خاڵی کردنەوەیە، ئەوەش بەدینایەت مەگەر لە جێگەیەکی تاریکدا گۆشەگیر بێت!

دەڵێت: ئەگەر جێگەیەکی تاریـك دەسـت نەکـەوت، ئـەوا بـا سـەری خـۆی بەجوبەکـەی بپێچێتەوە، یا بە پۆشاکێك یابە (الإزار)ێك خۆی داپۆشـێت، لـەم کاتـەدا بانگـەوازی هـەق دەبیستێ و، مەزنی ئامادەبونی پەروەردگار دەبینێت !!

نووسەر دەفەرمێت:

تەماشای ئەم ڕێکخستنانە بکە، بەڵام سەرسوڕمان لەوەدایە چۆن لە زانایەکی فیقهزانەوە دێتەدەر !

باشە چۆن دەزانێ ئەو کەسە بانگەوازی هەق دەبیستێ و، ئەو شتەی کە دەیبینێت مەزنێتی پەروەردگارە؟!

پێدەچێ ئەوەی کە دەیبنێ ئەندێشەو خەیاڵاتی پووچ و بۆگەن بن، ئەمە شتێکی ئاشکرایەو لەو کەسانەدا کە خۆراك کەم دەکەنەوە دێتەدی، ئەوانە نەخۆشی (الماليخوليا)یان(٥٢١) تووش دەبێ.

پێدەچێ لەم بارانەدا مرۆڤ هیچ ئەندێشەیەکی خراپی تووش نەبێ، بەڵام ئەگەر خۆی بەپۆشاکەکەی داپۆشی و، چاوەکانی داخست و کەوتە بیرکردنەوە، ئەوە بیرو خەیاڵات دێن و دەچن، خەیاڵات و ئەندیشەی پووچ دەبینێت، وادەزانێ ئامادەبوونی مەزنی پەروەردگارو، شتی ترە!!

پەنا بەخوا دەگرین لەم ئەندێشەو خەیاڵاتی پڕوپووچە.

لە (أبي عُبيدِ التُّسْتَرِيُّ)وە دەگێڕنەوە: کە لە یەکەم ڕۆژی مانگی ڕەمەزاندا، دەچووە ژورەوەو، بەخێزانەکەی دەگوت: دەرگای ژورەکەم بەقوڕ سواغ بدەو، هەموو شەوێك لە تاقەکەوە نانێکم بۆ فڕێ بدە, لە ڕۆژی جەژندا، خێزانەکەی چووە ژورەوە، لە گۆشەیەکدا سی نانی بینی، نەخواردبووی و، نەخواردبویەوە، خۆشی بۆ نوێژەکان ئامادە نەدەکرد، تا کۆتای مانگەکە بەیەك دەستنوێژەوە (طُهْرٍ) دەمایەوە !

نووسەر دەفەرمێت:

بەلای منەوە ئەم چیرۆکە لە دوو ڕۆوە لەڕاستیەوە بەدورە:

یەکەمیان: مانەوەی ئادەمی مانگێك بەبێ نوستن و، بەبێ میزکردن و، بەبێ پیسی و، بەبێ با لێبونەوە.

---

٥٢١ _ الماليخوليا: لە نەخۆشیە نەفسیەکانە کە وا لە نەخۆش دەکات خەیاڵی شتانێك بکات کە هیچ بنەڕەتێکی نەبێ.

دووەم: موسـڵمان واز لـە نوێـژی هـەینی و نوێـژی بەکۆمـەڵ بهێنێـت، کـە (واجـب)ەو وازلێهێنانی حەڵاڵ نیە.

ئەگەر ئەم چیرۆکە ڕاست بێ، ئەوا ئیبلیس هیچی نەهێشتۆتەوەو بەتـەواوی ئـەم پیـاوەی سەرلێشێواندووە.

چەندین جار (أبي الحسنِ البُوشَنْجيٌ) صوفی سەرزەنشت دەکرا سـەبارەت بـەوەی کـە وازی لەنوێژەکانی هەینی و بەکۆمەڵ دەهێناو لێیان دوادەکەوت، بەڵام دەیگوت:

ئەگەر فڕوبەرەکەت لە نوێژی بەکۆمەڵدا بێ، ئەوا بێوەیی لە تەنهایی و گۆشەگیریدایە !

## ✱ باسی سەرلێشێواندنەکانی ئیبلیس بەرامبەر بەصوفیەکان لە بواری دڵکزی و (التخشّع) سەردانواندن و، دانانی ڕازگردا:

نووسەر دەفەرمێت:

ئەگەر ترس لە دڵدا جێگیر بوو، وادەکات کە ڕواڵەتی مرۆڤ دڵکزی بنوێنێ، لە توانای خاوەنەکەشیدا نابێ دوری بخاتەوە، بۆیە تەماشا دەکەی سەری داخستووەو بەئەدەبەو ملکەچە، ئەوەبوو پێشینە چاکەکان تێدەکۆشان بۆ ئەوەی ئەو شتانەیان لێوە دەرنەکەوێت.

(محمدُ)ی کوڕی (سیرینَ) بەڕۆژ پێ دەکەنی و، بەشەویش دەگریا.

ئێمە فەرمان بەزانا ناکەین لەنێوان خەڵکی ئاسیدا بوێری بنوێنێ و شەرم وەلاوە بنێت، چونکە ئەوە ئازاریان پێ دەگەیەنێ، لە پێشەوا ئیمامی (عليٌ) _ خوای لێ ڕازی بێت _ دەگێڕنەوە فەرموویەتی:

هەرکات باسی زانستان کرد، بیدەنگی بن و، بەپێکەنین تێکەڵی مەکەن، چونکە لە لایەن دڵەوە ڕاگرتنی مەحاڵ دەبێ.

شتی وەکو ئەمە ڕوپامایی نییە، چونکە دڵانی خەڵکی ئاسایی توانای لێکدانەوەی (التأويل) نییە بۆ زانا ئەگەر زانا بەفراوانی ڕێپێدراوەکانی بەکارهێنا، بۆیە پێویستە بەبێدەنگی و بەئەدەبەوە ڕوو بە ڕوویان بێتەوە. لەڕاستیدا تەنها ئەوە زەمکراوە کە مرۆڤ زۆر لە نەفسی خۆی بکات و دڵکزی و، خۆگریاندن و، سەر دانواندنێکی لە ڕادەبەدەر بۆ خۆی دروست بکات، بۆ ئەوەی بەچاوی زوهدەوە تەماشا بکرێت و، خۆی بۆ تەوقەکردن و دەست ماچ کردن ئامادە بکات، لەوانەیە پێشی بگوترێت: دوعامان بۆ بکە. بۆیە ئامادە دەبێ بۆ دوعاکردن، وەکو ئەوەی بزانێ وەڵامی دەدرێتەوە!

لە (إبراهيمَ النَّخَعِيِّ) دەگێڕنەوە کە پێی گوترا: دوعامان بۆ بکە. بەڵام ئەوەی پێ ناخۆش بوو، وە بەتوندی کاری تێکرد(٥٢٢).

---

٥٢٢ _ جارێك بە ئیمامی (عُمَر)یان گوت: دوعامان بۆ بکە ! ئەویش فەرمووی: ئایا ئێمە پێغەمبەرین؟! پێشەوا (ابن رجب) لە نوسراوەکانیدا باسی کردووە.

کەسانێك لە ترسنۆکەکان ترس وای لێکردن کە سەردانواندن و شەرمێکی توندیان تووش بێت، بۆیە سەریان بەرەو ئاسمان بەرز نەدەکردەوە، بەڵام ئەمە هیچ چاکێتی و فەزیلەتێکی تێدا نییە، چونکە هیچ دڵکزیەك نییە لە دڵکزیەکەی پێغەمبەری خوا _ صلی الله علیه وسلم _ بەرزتر بێت.

وفي ((صحيح مسلم)) من حديث أبي مُوسى قالَ:

((كانَ رسولُ كثيراً ما يرفَعُ رأسَهُ إلى السماءِ)). واتە (أبي مُوسى) _ خوای لێ ڕازی بێت_ فەرموویەتی:

((پێغەمبەری خوا بەزۆری سەری بەرەو ئاسمان بەرز دەکردەوە)).

ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە خێرو (مُستحب)ە تەماشای ئاسمان بکرێت، بۆ پەندو دەرس وەرگرتن لە بەڵگەو نیشانەکانی.

خوای تعالی دەفەرمێت: ﴿ أَفَلَمْ يَنْظُرُوا إِلَى السَّمَاءِ فَوْقَهُمْ كَيْفَ بَنَيْنَاهَا ﴾ ق: ٦ ﴾ واتە ﴿أَفَلَمْ يَنْظُرُوا إِلَى السَّمَاءِ فَوْقَهُمْ ﴾ دەی ئایا سەرنجی ئەو ئاسمانەیان نەداوە کە لە سەریانەوەیە ﴿ كَيْفَ بَنَيْنَاهَا ﴾ چۆن دروستمان کردووە(٥٢٣).

هەروەها فەرموویەتی: ﴿ قُلِ انْظُرُوا مَاذَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ ﴾ یونس: ١٠١ ﴾ واتە ﴿قُلِ انْظُرُوا ﴾ (ئەی محمد _ صلی الله علیه وسلم) بڵێ: سەرنج بدەن ﴿ مَاذَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ﴾ چی لە ئاسمانەکان و زەویدایە(٥٢٤).

ئەو صوفیانە ئەگەر بیانزانیبا سەرداخستنیان و سەربەرزکردنەوەیان وەکو یەکە سەبارەت بەشەرم کردنیان لە خوای تعالی، ئیتر ئەوەیان نەدەکرد، بەڵام ئیبلیس هیچ شتێك سەرقاڵی نەکردووە جگە لەوەی کە بەنەفامان یاری بکات.

بەڵام لە زانایانەوە زۆر بەدورەو، زۆریش لێیان دەترسێت، چونکە زانایان بەهەموو کاروبارەکانی ئیبلیس شارەزان و، خۆیان لە هەموو پیلان و تەڵەکەکانی بەدور دەگرن.

---

٥٢٣ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

٥٢٤ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

لە (أبي سلمةَ)ی کوڕی (عبدِالرحمنِ)ەوە دەڵێت: هاوەڵانی پێغەمبەری خوا _ صلی الله علیه وسلم _ نە لادەرو، نە ناوازە بوون و، نە خودی خۆشیان وەکو مردوو لێدەکرد، لە مەجلیسەکانیاندا شیعریان بەدەنگی بەرزی خۆش دەخوێندەوەو، باسی سەردەمی نەفامێتی خۆیان دەکرد، وە ئەگەر کەسێکیان لەبارەی شتێکی پەیوەندیدار بەدینەکەیەوە داواکرایە، چاوی زەق دەکردەوە وەکو ئەوەی شێت بویێ.

لە پێشەوا (عُمَر)ی کوڕی (الخطّابِ)ەوە _ خوای لێ ڕازی بێت _ هاتووە کەوا تەماشای لاوێکی کرد سەری دانواندبوو، پێی فەرموو: ئەی تۆ ! سەرت بەرزکەرەوە، دڵنیابە دڵکزی لە هی نێو دڵ زیاتر نابێ، بۆیە هەرکەس دڵکزیەك بنوێنێت لە هی نێو دڵی زیاتر بێت، بەڕاستی زیاتر لە دوو ڕوویەکی نواندووە.

لە (عاصم)ی کوڕی (کُلَیبِ الجَرْمـيِّ)وە دلێت: کە چاوی بە (أبـي عبدَالرحمنِ)ی کوڕی (الأسودِ) کەوتبوو ڕێی دەکرد، وە ئەگەر ڕێی بکردایە بەتەنیشتی دیوارەکەدا بەدڵکزیەوە بەم شێوە ڕێی دەکرد _ (أبوبکرٍ) کەمێ ملی لار کردەوە _، (أبومالكٍ) گوتی:

ئەگەر ڕێ بکەی بەتەنیشتی دیوارەکەدا ڕێ دەکەی، سوێند بەخوا (عُمَرَ) ئەگەر ڕێی بکردایە بەتوندی پێی بەزەویدا دەناو، دەنگێکی زوڵاڵ هەبوو.

نووسەر دەفەرمێت:

پێشینانی چاك باروحاڵی خۆیان دەشاردەوە، وازیان لە هەموو ئەو شتانە دەهێنا کە دەبویە مایەی خۆ دەرخستن.

پێشتر ئاماژەمان بەوەدا کە لە پۆشاکەکانی (أَیُّوبَ السَّختِیانيِّ)دا کەمێ درێژی هەبوو بۆ ئەوەی باروحاڵی خۆی بشارێتەوە.

(سفیانُ الثَّوريُّ) دەیگوت: بایەخ بەو کردەوانەم نادەم کە لێمەوە بەدەردەکەوێت.

وە بەهاوەڵێکی خۆی کە لە دوایەوە نوێژی دەکرد گوتی: چەند بوێری کە نوێژ دەکەیت و خەڵکی دەتبینن.

لە (محمد)ی کوڕی (زیاد)ەوە دەڵێت: (أبوأُمامةَ) بەلای پیاوێکدا تێپەڕبوو کە لە سوجدەدا بوو، ئەوەبوو گوتی: چ سوجدەیەکە، ئەگەر لە ماڵی خۆتدا بوایە !

پێشەوا (الشافعيُّ) _ خوای لێ ڕازی بێت _ دەیفەرموو:

ودَعِ الذينَ إذا أَتَوْكَ تَنَسَّكوا

وإذا خَلَوْا فهُمُ ذئابُ حِقَافِ

واتە: وازبێنە لەو کەسانەی ئەگەر هاتنە دیدەنیت دەبن بەخواپەرست و

ئەگەر تەنهاش بونەوە دەبن بەگورێکی دڕندە

## ✸ باسی سەرلێشێواندنەکانی ئیبلیس بەرامبەر بە صوفیەکان سەبارەت بەوازهێنانیان لە هاوسەرگیری:

ئەگەر ترسی داوێن پیسی لە ئارادا بوو ئەوا هاوسەرگیری (واجبٌ)ە، وە ئەگەر ترسی داوێن پیسی لە ئارادا نەبوو ئەوا سوننەتێکی (مُؤكَّدَةٌ)ە([٥٢٥]). بەلای جەماوەری فیقهزانانەوە.

ڕێباوەڕی هەریەك لە پێشەوایان (أبي حنيفةَ) و (أحمَدَ)ی کوڕی (حنبلٍ) ئەوەیە کە لەو کاتەدا لە هەموو سوننەتەکانی تر چاکترە، چونکە هۆکاری بوونی منداڵە.

پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ فەرموویەتی:

((تزَوَّجوا الودودَ الولودَ " فإنِّي مكاثِرٌ بكُمُ الأمَمَ))([٥٢٦]).

واتە ((ژنی ڕووخۆش و خۆش ڕەفتار بخوازن کە منداڵی زۆر دەبێ، چونکە من شانازی بەزۆری ژمارەی ئومەتەکەوە دەکەم لە ڕۆژی قیامەتدا)).

وعن سعْدِ بنِ أبي وقاصٍ قالَ: رَدَّ رَسُولُ اللَّهِ _ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ _ عَلَى عُثْمَانَ بْنِ مَظْعُونٍ التَّبَتُّلَ، وَلَوْ أَذِنَ لَهُ فِيهِ لَاخْتَصَيْنَا([٥٢٧]).

لە (سعْدِ)ی کوڕی (أبي وقاصٍ)ەوە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم_ قایل نەبوو (عُثْمَانَ)ی کوڕی (مَظْعُونٍ) تەنها خۆی بۆ خواپەرستی یەکلاکاتەوەو، بەهەتاهەتایی ژن نەهێنێت، ئەگەر لەو بارەوە مۆڵەتی پێدایە، ئەوا ئێمە خۆمانمان دەخەساند.

---

٥٢٥ _ ڕاست ئەوەیە کە هاوسەرگیری (واجبٌ)ە لە کاتی توانیندا بەبێ ئەم جیاکردنەوە، لە گەڵ دڵنیابوون لە (واجبٌ)بوونیدا لە کاتێکدا ئەگەر مرۆڤ ترسا تووشی داوێن پیسی ببێ.

٥٢٦ _ رواه النسائي (٦ / ٦٥)، وأبوداود (٦ / ٤٧)، وابن حبان (١٢٢٩)، والحكيم (٢ / ١٦٢) " عن معقل بن يسار. وسنده صحيح.

٥٢٧ _ تقدم تخريجه.

وعن أنس بن مالك أنَّ نَفراً مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ _ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ _ سَأَلُوا أَزْوَاجَ النبيّ _ عليه السلام _ عَنْ عَمَلِهِ فِي السِّرِّ، فأَخْبَرْنَهم، فَقَالَ بَعْضُهُمْ: لَا آكُلُ اللَّحْمَ، وَقَالَ بَعْضُهُمْ: لَا أَتَزَوَّجُ النِّسَاءَ ، وَقَالَ بَعْضُهُمْ: لَا أَنَامُ الليلَ عَلَى فِرَاشٍ ، وقالَ بعضُهم: أَصومُ ولا أُفْطِرُ.

فحمدَ اللهَ النبيّ _ عليه الصلاةُ والسلام _ ، وأثنى عليهِ، ثم قَالَ: ((مَا بَالُ أَقْوَامٍ قَالوا كَذَا وَكَذَا، لَكِنِّي أُصَلِّي وَأَنَامُ ، أَصُومُ وَأُفْطِرُ ، وَأَتَزَوَّجُ النِّسَاءَ ، فَمَنْ رَغِبَ عَنْ سُنَّتِي " فَلَيْسَ مِنِّي))(٥٢٨).

واته له (أنس)ی کوڕی (مالك)ەوە _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی: هەندێ لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا _ صلی الله علیه وسلم _ لە خێزانەکانی پێغەمبەری خوایان _ صلی الله علیه وسلم _ پرسی سەبارەت بە کارە پەنامەکیەکانی پێغەمبەر _ صلی الله علیه وسلم _، ئەوەبوو ئەوانیش پێیان ڕاگەیاندن، بۆیە هەندێ لەو هاوەڵانە فەرموویان: چیتر گۆشت ناخۆم، هەندێکیشیان فەرموویان: چیتر هاوسەرگیری ناکەم، هەندێکیشیان فەرموویان: بەشەو لەسەر نوێن نانووم، هەندێکیشیان فەرموویان: بەڕۆژوو دەبم و نایشکێنم.

ئەوەبوو پێغەمبەری خوا _ صلی الله علیه وسلم _ سوپاس و ستایشی خوای تعالای کردو، پاشان فەرمووی: ((ئەوە چی یە هەندێ کەس وادەڵێن و وادەڵێن، دڵنیابن من نوێژ دەکەم و دەشنووم، بەڕۆژوو دەبم و دەشیشکێنم، هاوسەرگیریش دەکەم، هەرکەس پشت لە سوننەتی من بکات لە من نییە)).

پێشەوا (أحمد)ی کوڕی (حنبل) فەرموویەتی: ژن نەهێنان هیچ پەیوەندیەکی بە ئیسلامەوە نییە. پێغەمبەری خوا _ صلی الله علیه وسلم _ چوارده ژنی هێناو، کە کۆچی دوایشی کرد نۆ ژنی هەبوو.

هەروەها فەرمووی: ئەگەر خەڵکی واز لە هاوسەرگیری بهێنن، ئەوا نە غەزا دەکەن و، نەحەجیش دەکەن، شتەکە ئاوەها نەبوو، شتەکە ئاوەها نەبوو، ئەوەبوو پێغەمبەری خوا

٥٢٨ _ رواه البخاري (١١ / ٤)، ومسلم (١٤٠١).

_صلى الله عليه وسلم _ ڕۆژی لێ دەبویەوەو هیچ شتێکیان نەبوو، بەڵام هاوسەرگیری هەڵدەبژاردو، خەڵکیشی بۆ هاندەداو، قەدەغەی ژن نەهێنانی دەکرد، بۆیە هەرکەس واز لە کرداری پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ بێنێت، ئەوا لە سەر هەق نییە.

پێغەمبەر (يعقوبُ) _ عليه السلام _ لە خەم و خەفەتەکەیدا ژنی هێناو منداڵیشی بوو.

پێغەمبەری خواش _ صلى الله عليه وسلم _ فەرموویەتی:

((حُبِّبَ إِليَّ النِّساءُ))(٥٢٩).

واتە ((ژنانم بەلاوە خۆشەویستکراوە)).

---

٥٢٩ _ رواه النسائي في ((الصغرى)) (رقم ٣٩٣٩)، و ((الكبرى)) (رقم ١ _ عشرة النساء)، وأحمد (١٢٨/٣)، والبيهقي (٧ / ٢٨) " بسند حسَّنه الحافظ ابن حجر في ((التلخيص الحبير)) (٣ / ١١٦) بلفظ: ((حُبِّب اليَّ الطيبُ والنساء، وجُعل قرّة عيني في الصلاة)).

(فائدة):

قال الحافظ ابن حجر في ((الكافي الشاف)) (ص ٢٧):

((ليس في شيء من طُرُقه لفظ: ((ثلاث))، بل أوَّله عند الجميع: ((حُبِّب إليّ من دنياكم النِّساء...)) الحديث، وزيادةُ ((ثلاث)) تُفسد المعنى، على أن الإمام أبابكْر بن فُورك، شرَحَه في ((جُزءٍ)) مفرد بإثباتِها، وكذلك أورده الغزالي في ((الإحياء)) واشتهر على الألسنة)).

قلت: وابنُ فُورَك ليس من أئمة الصناعة، فليس القول قوله !!

# ✸ ڕەخنەگرتن لە ڕێبازی صوفیەکان سەبارەت بەوەی کە لە هاوسەرگیری وازدەهێنن:

ئیبلیس سەری لە کەسانێکی زۆری صوفیەکان شێواندووەو، هاوسەرگیری لێ قەدەغەکردوون، پێشینانی تەصوف لە هاوسەرگیری وازیان دەهێنا، چونکە بەخواپەرستیەوە سەرقاڵ بوون، وای بۆ دەچوون کە هاوسەرگیری خەریکیان دەکات و، ناهێلێت خوای تعالی بەباشی بپەرستن و گوێڕایەڵی بن(٥٣٠).

ئەمانە: ئەگەر پێویستیان بەهاوسەرگیری هەبێ، یاخود بەجۆرێك تامەزرۆی بکەن، با دڵنیابن کاتێ کە وازیان لێهێنا جەستەو ئاینی خۆیان خستە مەترسیەوە، وە ئەگەر پیویستیشیان پێ نەبێ، ئەوا چاکێتی و فەزیلەتی ئەوەیان لە دەست چووە(٥٣١).

وفي ((الصحيحين))(٥٣٢) من حديث أبـي هُريـرة _ رضـي الله عنـه _ عـن رسـولِ اللهِ _ صلى الله عليه وسلم _ أنَّه قالَ:

((وَفِي بُضْعِ أَحَدِكُمْ صَدَقَةٌ)).

قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ ، أَيَأْتِي أَحَدُنَا شَهْوَتَهُ ، وَيَكُونُ لَهُ فِيهِ أَجْرٌ ؟

قَالَ: ((أَرأَيْتُمْ لَوْ وَضَعَهَا فِي الْحَرَامِ أَكَانَ عَلَيْهِ فِيهَا وِزْرٌ ؟)).

قالوا: نعم.

قالَ: ((وكَذَلَكَ إذا وَضَعَهَا فِي الْحَلالِ " كَانَ لَهُ فِيهَا أَجْرٌ)).

ثم قالَ:

((أَفَتَحْتَسِبونَ الشرَّ ولا تَحْتَسِبونَ الخيرَ)).

---

٥٣٠_ ئەمەش دیسان سەرلێشێواندنە، چونکە خێردارترینی خەڵك کە _ پێغەمبەران و هاوەڵانن _ ژنیان خواستووەو هاوسەرگیریان کردووەو، لە خۆ تەرخان کردن بۆ خواپەرستی دووری نەخستنەوە.

٥٣١ _ پێشتر ئاماژەم پێدا کە هاوسەرگیری لە هەردوو بارەکەدا (واجب)ە !

٥٣٢ _ رواه مسلم (١٠٠٦) عن أبي ذرّ.

والزيادة عند أحمد في ((المسند)) (٥ / ١٥٤و١٦٧)، وسندها منقطع.

واته: (أَبي هُرِيرة) _ خوای لیّ ڕازی بیّت _ فەرموویەتی: پیّغەمبەری خـوا _ صـلی الله علیه وسلم _ فەرمووی:

((کە کەسیّکتان دەچیّتە لای خیّزانەکەی بە خیّرو چاکەداری بۆی دادەنریّ)).

فەرموویان: ئەی پیّغەمبەری خوا، ئایا کەسیّکمان ئاوی شەهوەتی دابـەزیّنیّت، پاداشـتی تیّدایە بۆی ؟

ئەویش فەرمووی: ((ئـەی ئەگـەر ئـاوی شـەهوەتی لـە حەرامـدا دابەزانـد ئایـا تـاوانی دەگات؟)).

فەرموویان: بەڵیّ.

بۆیە فەرمووی: ((ئاوەهاش ئەگەر لە حەڵاڵدا دایبەزاند، پاداشتی تیّدایە بۆی)).

پاشان فەرمووی:

((ئایا حیساب بۆ شەڕ دەکەن، بەڵام حیساب بۆ خەیر ناکەن)).

کەسانیّك لە صوفیەکان دەڵیّن: هاوسەرگیری نەفەقەو بژیّوی دەویّ و، کەسابەتیش قورسە.

دڵنیابن ئەمە بەهانەیەکە بۆ خۆدورخستنەوە لە ماندویەتی کەسابەت.

وفي ((الصحيحين))(٥٣٣) مِن حديث أبي هُريرةَ _ رضي الله عنه _ عن النبـيِّ _ صـلى الله عليه وسلم _ أنَّه قالَ:

((دينارٌ أَنْفَقْتَهُ في سبيلِ اللهِ، ودينارٌ أَنْفَقْتَهُ في رقبةٍ، ودينارٌ أَنْفَقْتَهُ في الصَّدَقَةِ، ودينـارٌ أَنْفَقْتَهُ على عيالِكَ، أفضلُها الذي أَنْفَقْتَهُ على عيالِكَ)).

واته (أَبي هُريرةَ) _ خوای لیّ ڕازی بیّت _ فەرموویەتی: پیّغەمبـەری خـوا _ صـلی الله علیه وسلم _ فەرمووی:

((دیناریّکت لە پیّناوی خوادا خەرج کردووە، دیناریّکیشت بۆ ئازادکردنی کویلەیەك خەرج کردووە، دیناریّکیشت بۆ خیّرو صەدەقە خـەرج کـردووە، دیناریّکیـشت بـۆ خاوخیّزانەکـەت خەرج کردووە، چاکترین ئەو خەرجکردنانە ئەوەیە کە بۆ خاوخیّزانەکەت خەرج کردووە)).

---

٥٣٣ _ لم يروهِ البخاري، إنما هو من أفراد مسلم (رقم ٩٩٥)، وانظر ((تحفة الأشراف)) (١٠ / ٣١٦).

کەسانێکیشیان دەیانگوت: هاوسەرگیری مەیلی مرۆڤ بەرەو دونیا ڕادەکێشێت.

لە (أَبي سُليمانَ الدارانيّ)وە باسیان بۆ کردوین کە گوتویەتی: ئەگەر پیاو بەدوای فێربوونی فەرموودەدا گەڕا، یاخود لە پێناو پەیداکردنی ڕۆزیدا سەفەری کرد، یاخود ژنی هێنا، ئەوا بەڕاستی متمانەی بەدونیا هەیە!!

نووسەر دەفەرمێت:

هەموو ئەم قسانە پێچەوانەی شەرعن، چۆن مرۆڤ بەدوای فێربوونی فەرموودەدا نەگەڕێت لە کاتێکدا فریشتەکان لای خوێندکاری زانستی شەرعی دنیشنەوەو دوعای بۆ دەکەن و لە خوای تعالی داوای لێخۆشبوونی بۆ دەکەن(٥٣٤).

چۆن بژێوی پەیدا نەکرێ و کەسابەت نەکرێت لە کاتێکدا پێشەوا (عمرُ)ی کوڕی (الخطّابِ) _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی: ئەگەر بمرم بەهۆی ڕەنجدانمەوەو، زۆری ڕاوەستانم لەسەر پێیەکانم بۆ ئەوەی بژێوی خۆم دەستەبەرکەم خۆشترە بەلامەوە لەوەی لە غەزادا لە پێناوی خوادا بمرم !

واتێدەگەم ئەم باروحاڵانە هەمووی پێچەوانەی شەرعن.

دڵنیابن کۆمەڵێك لە پاشینانی تەصوف، وازیان لە هاوسەرگیری هێنا، بۆ ئەوەی پێیان بگوترێت: زاهید. ڕەمەکی خەڵکیش صوفی بەگەورە دادەنێن ئەگەر خێزانی نەبێ و، دەڵێن: هەرگیز ژنی نەناسیوە.

ئەمە ڕەبەنگەرێتیەکەو پێچەوانەی شەرعەکەمانە.

---

٥٣٤ _ كما صحَّ عن النبـي _ صلى الله عليه وسلم _:

رواه ابن ماجة (٢٢٦)، والنسائي (١ / ٩٨)، وابن حبان (٧٩)، وأحمد (٤ / ٢٣٩)، وابن خزيمة (١٩٣)، والبيهقي (١ / ٢٧٦)، وعبدالرزاق (٧٩٣)، والطبراني في ((الكبير)) (٧٣٥١) " من طريق عاصم عن زرّ عن صفوان بن عسّال.

وسنده حسنٌ " لما قيل في عاصم _ وهو ابن بهدلة _ !

(أبوحامدِ) دەڵێت: پێویستە مورید نەفسی خۆی بەهاوسەرگیریەوە خەریك نەكات، چونكە خەریك دەبێ و لە ڕەوشت ناوڕ ناداتەوەو، خوو بە خێزانەكەیەو دەگرێت و دڵی پێی سوكنایی دێت، بۆیە هەركەس دڵی سوكنایی بێت بە شتێكی دیكەی جگە لە خوای تعالی ، ئەوا لە خواپەرستی ئاوڕ ناداتەوە.

نووسەر دەفەرمێت:

من سەرم لە گوفتارەكانی سووڕ دەمێنێ ! بلێی نەیزانیبێ كە ئەو كەسەی مەبەستی ڕاگرتنی پاك داوێنی خۆی بێ و، مەندالێكی ببێ، یاخود ڕاگرتنی پاك داوێنی خێزانەكەی بێ، لە ڕێچكەی ڕەوشت ناچێتە دەرەوە.

یاخود وابزانێ كە خۆشەویستی و حەوانەی سروشتیی لە گەڵ خێزاندا دژبە خۆشەویستی و حەوانەوەی دڵانە بەگوێڕایەڵی خوای تعالی، خوای تعالی منەت بەسەر مەخلوقاتی خوێدا دەكات و دەفەرمێت:

﴿ خَلَقَ لَكُمْ مِنْ أَنْفُسِكُمْ أَزْوَاجًا لِتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُمْ مَوَدَّةً وَرَحْمَةً﴾ ﴿الروم: ٢١﴾.

واتە ﴿ خَلَقَ لَكُمْ ﴾ بۆی دروست كردون ﴿ مِنْ أَنْفُسِكُمْ أَزْوَاجًا لِتَسْكُنُوا إِلَيْهَا ﴾ (لە ڕەگەزی) خۆتان هاوسەرانێك بۆ ئەوەی ئارام بگرن لە لایاندا ﴿ وَجَعَلَ بَيْنَكُمْ مَوَدَّةً وَرَحْمَةً ﴾ وە خۆشەویستی و بەزەیی خستۆتە نێوانتان([٥٣٥]).

وفي الحديث الصحيح([٥٣٦]) عن جابرٍ _ رضي الله عنه _ عن النبيِّ _ صلى الله عليه وسلم _ قالَ له:

((هلاَّ تَزَوَّجْتَ بِكراً " تُلاعِبُها وتُلاعِبُكَ)).

واتە: لە (جابرِ)ەوە _ خوای لێ ڕازی بێت _ لە پێغەمبەری خواوە _ صلى الله عليه وسلم _ كە پێی فەرمووبوو:

((ئەوەبۆ كچێكت نەخواست، گەمەی لە گەڵدا بكەی و، گەمەت لە گەڵدا بكات)).

---

٥٣٥ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

٥٣٦ _ رواه البخاري (٩ / ١٢١)، ومسلم (١٠ / ٥٦ – بشرحه).

پێغەمبەری خوا _ صلی الله علیه وسلم _ کە ئەوەی پێ فەرموو، مەبەستی ئەوە نـەبوو (جابر) _ خوای لێ ڕازی بێت _ خۆشەویستی بۆ خوای تعالی ببڕێت.

واتێدەگەیت کە کاتێ پێغەمبەری خوا _ صلی الله علیه وسلم _ شادومان دەبوو لە گـەڵ خێزانەکانیدا، وە (ویُسابِق عائشةَ)(٥٣٧) واتە لە گەڵ خـاتوو (عائـشةَ)دا پێـشبڕکێی دەکـرد، لەوە بەدەر بوو کە خوو بەخوای تعالاوە بگرێ و دڵیی سوکنایی پێ بێت.

هەموو ئەمانە نەفامیەکی زۆرە بەزانست.

---

٥٣٧ _ رواه أبوداود (رقم ٢٥٧٨)، وأحمد (٦ / ٢٦٤)، وابن ماجـة (١٩٧٩)، والنـسائي في ((الكـبرى)) (رقم ٥٦و٥٧و٥٨و٥٩ _ عِشْرة النساء) " عن عائشة.

وسنده صحيح.

## ✸ وە ئاگابوون و خۆ قایم کردن بەرامبەر بەهەر پێشهاتێکی ناخۆش کە ئەگەر واز لە هاوسەرگیری هێنرا:

بزانە کە ئەگەر لاوە صوفیەکان لەسەر هاوسەرگیری نەکردن بەردەوام بن، ئـەوا سـێ جـۆر شتیان تووش دەبێ:

جۆری یەکەم: بەهۆی دەرنەهێنانی تۆماوی نێرینەیانەوە نەخۆش دەکەون، چـونکە مرۆڤــ ئەگەر ئەو تۆماوەی بۆ ماوەیەکی درێژ ڕاگرت، زیانێکی توندی پێ دەگەیەنێ.

(أبوبكرِ محمدُ)ی کوڕی (زكريا الـرازيّ) دەڵێت: قەومێك دەناسم تۆماویان زۆر بـوو، کـاتێ جووتبونیان لە خۆیان قەدەغەکرد، لەبەر جۆرێك لە فەلـسەفەکردن، جەسـتەیان سـارد بـۆوە، جوڵانەوەیان ئاستەم بوو، تووشی خەمۆکی بوون بەبێ هـیچ هۆیـەك، نیـشانەکانی نەخۆشـی (الماليخوليا)یان لێ پەیدا بوو، ئارەزووی خواردن و هەرسکردنیشیان کەم بویەوە.

دەڵێت: پیاوێکم بینی وازی لە جووتبوون هێنابوو، بۆیە ئارەزووی خواردنی لەدەسـتدا، وە ئەگەر کەمێك خواردنیشی بخواردایە، هەستی بەخۆشـی خواردنەکـە نـەدەکردو، دەڕشـایەوە، بەڵام کاتێ گەڕایەوە بۆ جووتبوون، ئەو نیشانانەی نەما.

جۆری دووەم: گەڕانەوە بۆ وازلێهێنراو، چونکە خەڵکانێکی زۆریان بەئارام بوون بەرامبـەر بە وازهێنان لە جووتبوون، بەڵام تۆماویان کۆبویەوە، تووشی بێ ئارامی و بێ ئۆقرەیی بوون، بۆیە پەشیمان بونەوەو گەڕانـەوە، تێکـەڵ بـەژنان بـوون و، لـە گـەڵ دونیـادا تێکـەڵ بـوون بەچەندەها ئەوەندەی کە سەرتا لێ هەڵدەهاتن، وەکو ئەو کەسەیان لێهات کە ماوەیەکی درێژ خۆی برسی کرد، پاشان بەو ئەندازەیەی کە لە زەمــەنی ئارامگرتنەکـەدا وازی لـێ هێنـابوو خواردی.

جۆری سێ یـەم: لادان بـۆ هـاوەڵێتیی منـداڵان، چـونکە تاقمێکیـان نەفـسی خۆیانیـان ئومێدبڕاو کردبوو لە هاوسەرگیری، ئەو تۆماوەی لە جەستەیاندا کۆبویـەوە بـێ ئـارام و بـێ ئۆقرەی کردن، بۆیە بەهاوەڵێتی لووسکەو بێ تووکان دەحەوانەوە.

ئیبلیس سەری لە تاقمێکیان شێواند کە هاوسەرگیریان کردو، دەیانگوت: ئێمە بەشەهوەت و ئارەزۆوە جووت نابین.

کەوابوو ئەگەر لێرەدا مەبەستیان ئەوەبێ کە هاوسەرگیری بەزۆری بۆ جێبەجێکردنی سوننەتە، دەشێ، وە ئەگەر واڕابگەیەنن کە شەهوەت و ئارەزوویان بۆ خودی جووتبوونەکە نییە، ئەوە مەحاڵێکی ئاشکرایە.

نەفامی پاڵی بەتاقمێکەوە نا بۆ بڕینی ئەندامی زاوزێی نێرینەی خۆیان، پاشان وایان ڕادەگەیاند ئەویان ئەنجامداوە چونکە شەرم لە خوای تعالی دەکەن.

ئەمە ئەوپەڕی گێلی و نەفامیە، چونکە خوای تعالی نێرینەی بەسەر ژناندا بەرزکردۆتەوەو ڕێزی پێ بەخشیوە بەم ئەندامی زاوزێی نێرینەیە(٥٣٨)، وە خولقاندویەتی بۆ ئەوەی ببێ بەهۆکارێك بۆ زاوزێکردن، بۆیە ئەو کەسەی ئەندامی زاوزێ ببڕێت ئەوا بەزمانحاڵی خۆی دەڵێت: ڕاستی دژی ئەمەیە.

پاشان ئەندامی زاوزێ بڕین شەهەوت و ئارەزووی جوتبوون لە نەفسدا لانابات، کەوابوو مەبەستەکەیان بەدینەهات(٥٣٩).

---

٥٣٨ _ سنورداركردنی بەرزکردنەوەو ڕێز پێ بەخشین پیاو بەسەر ژندا تەنها بەم هۆکارە هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نی یە، خوای تعالی زاناترە بەڕاستێتی باروحاڵ.

٥٣٩ _ تاقمێك لە ((ئامادەکارانی دق)) کتێبێکیان داناوە بەناوی ((العُلماء العُزَّاب الذين آثروا العلم على الزواج)) !! ژمارەیك ئەهلی زانستیان تێدا کۆکردۆتەوە " وایان ڕاگەیاندووە کە هۆکاری هاوسەرگیری نەکردنی ئەمانە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی پەسەندێتی زانستیان داوە بەسەر هاوسەرگیریدا !! بەڵام ئەمە بانگەشەیەکی پووچە کە بەم گشتێتیە باسیان دەکات.

شێخ (بکر أبوزید)یش هەستاوە بەبەرپەرچدانەوەی لە کتێبێکدا بەناوی ((الذين لم يتزوَّجوا من العلماء، والنقض على مَن وحّد السبب))، چەندەها ئەوەندەی ئەو کەسەی تێدا کۆکردۆتەوە، پاشان بەچەندین وەڵامی زانستی بەرپەرچی داوەتەوە، خوێندکارانی زانستی شەرعی پێویستە بیخوێننەوە.

## ✸ باسی سەرلێشێواندنەكانی ئیبلیس بەرامبەر بەصوفیەكان سەبارەت بەوازهێنانیان لە داواكردنی منداڵ:

لە (أَبِي سُلیمانَ الدَّارانيّ)وە دەڵێت: ئەو كەسەی داوای منداڵ بكات گیلە، نە بۆ دونیاو نە بۆ ڕۆژی دوایش، چونكە ئەگەر بیەوێ بخوات یا بخواتەوە یا جووتبێت لە گەڵ خیزانەكەیدا، لێی تێك دەداو ناهێڵێت بەخواستی بگات، وە ئەگەر بیەوێ خواپەرستی بكات سەرقاڵی دەكات و، ناهێڵێت بەباشی ئەنجامی بدات.

نووسەر دەفەرمێت:

ئەمە هەڵەیەكی گەورەیە، چونكە لەبەر ئەوەی مەبەستی خوای تعالی ئەوەیە كە دونیا بخولقێنێت و بەردەوام پەیوەندی هەبێ و نەپچڕێ تا كۆتایی هاتنی ماوەكەی، وە لەبەر ئەوەی نەوەی ئادەم تەمەنیان درێژە ناكێشێ و ماوەیەكی دیاریكراوە، بۆیە خوای تعالی لەدوای نەمانی ئادەمیزاد بەمردن لەڕەگەزی خۆیان بەجێدێڵێت، وە هانی هۆكارەكەی داوە لەڕووی خووی سروشتیەوە، بە هەڵگیرساندنی ئاگری شەهەوەت و ئارەزوو، جارێكیش لە دەروازەی شەرعەوە، كاتێ دەفەرمێت:

﴿ وَأَنْكِحُوا الأَيَامَى مِنْكُمْ وَالصَّالِحِينَ مِنْ عِبَادِكُمْ ﴾﴿ النور: ٣٢ ﴾، واتە ﴿ وَأَنْكِحُوا الأَيَامَى مِنْكُمْ ﴾ ژن مارە ببڕن بۆ پیاوانی بێ ژن و ژنانی بێ مێردیش بدەن بەشوو (مێرد) ﴿وَالصَّالِحِينَ مِنْ عِبَادِكُمْ ﴾ هەروەها ئەوانەی ئیمان دارو چاكن لە كویلەكان (ژنیان بۆ بێنن)و كەنیزەكان (یش بدەن بەشوو)(٥٤٠).

پێغەمبەران _ عليهم الصلاةُ والسلامُ _ داوای منداڵیان دەكردو، خوای پەروەردگاریش لە باسی ئەواندا دەفەرمێت:

﴿ رَبِّ هَبْ لِي مِنْ لَدُنْكَ ذُرِّيَّةً طَيِّبَةً إِنَّكَ سَمِيعُ الدُّعَاءِ ﴾﴿ آل عمران: ٣٨ ﴾ واتە ﴿ رَبِّ﴾ ئەی پەروەردگارم ﴿ هَبْ لِي ﴾ پێم ببخشە ﴿ مِنْ لَدُنْكَ ﴾ لە لایەن خۆتەوە ﴿ ذُرِّيَّةً طَيِّبَةً ﴾ كوڕێكی سروشت پاك ﴿ إِنَّكَ سَمِيعُ الدُّعَاءِ ﴾ بەراستی تۆ بیسەری پاڕانەوەیت(٥٤١).

---

٥٤٠ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

٥٤١ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

هەروەها خوای تعالی دەفەرمێت:

﴿ رَبِّ اجْعَلْنِي مُقِيمَ الصَّلاةِ وَمِنْ ذُرِّيَّتِي ﴾ ﴿ إبراهيم: ٤٠ ﴾ واتە ئەی پەروەردگارم مـن و رۆڵەکانم والێبکەی بەچاکی نوێژەکان بەجێبێنن(٥٤٢).

وە چەندین ئایەتی دیکەش.

وە هەر پیاوچاکان بوون کە هۆکارێـك بـوون بـۆ ئـەوەی ئـەوان بێنـە ژیانـەوە، پێدەچـێ جووتبونێك ببێ بەهۆکاری لە دایك بـوونی کـوڕانێکی وەکـو (الـشافعيِّ) و (أَحمَـدَ)ی کـوڕی (حنبلٍ)و، لە خواپەرستی هەزار ساڵ خێردارتر بێت.

فەرموودەیەکی زۆر هاتوون کە باسـی پاداشـت دانـەوەی جووتبـوون و، خـەرجکردن بـۆ خاوخێزانی تێدایەو، ئەو کەسەی کە منداڵێکی دەمرێ و (٥٤٣)، ئەو کەسەی لە پـاش خـۆی منداڵێك بەجێدێڵێ، کەوابوو هەرکەس ڕوو لە داواکردنی منـداڵ و هاوسـەرگیری وەرگێڕێـت، بەراستی پێـچەوانەی سـوننەت و، چـاکتریش بۆتـەوەو، پاداشـتێکی زۆر گـەورەی لەدەسـت چووە(٥٤٤)، وە هەرکەس ئەوە بکـات، بەڕاسـتی بـەدوای حەوانەوەیـەکی بـێ قـڕەو مـشەدا دەگەڕێ.

(الجُنَیْـدُ) دەڵێت: منداڵ سزای شەهوەت و ئارەزوویەکی حەڵاڵە، ئەی ئـەبێ سـزای حـەرام چۆن بێت ؟!

---

٥٤٢ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

٥٤٣ _ پێشەوا (السیوطي) _ بەڕەحمەتی خوا بێت _ نوسراوێکی هەیە بەناوی ((فضل الجَلَد عند فقْد الولد)) واتە ((فەزڵ و چاکەی ئارامگری لە کاتی لە دەستدانی منداڵدا))، وهي تحت التحقيق عندي، يسّر الله إتمامها و نشرها.

٥٤٤ _ سەرەڕای ئەو تاوانەی کە پێی هەستاوەو بریتیە لە سەرپێچیکردنی فـەرمانی پێغەمبەرایـەتی _ ئەگەر توانادار بوو _.

نووسەر دەفەرمێت:

ئەمە هەڵەیە، چونکە ناونای شتە ڕێپێدراوەکان بە سزا، شتێکی چاك نییــە، چــونکە کــە ڕێپێدراوێتی بە شتێك دەدرێ و، پاشان ئەوەی لەو شتەوە دێتە کایــەوە بەســزا دانانرێــت، وە هەرشتێك فەرمانی پێکرا، ئەنجامەکەی پاداشتە.

## ✹ باسى سەرلێشێواندنەكانى ئیبلیس بەرامبەر بەصوفیەكان لە بوارى گەشتكردندا :

ئیبلیس سەرى لە خەڵكێكى زۆریان شێواندوەو، كردنیە دەرەوە بۆ گەشتكردن، نەك بۆ جێگەیەكى زانراو، یاخود بۆ فێربوونى زانست، زۆربەشیان بەتەنها دەچنە دەرەوەو، هیچ خواردمەنیەك لە گەڵ خۆیاندا نابەن و، بەو ڕەفتارەیان بانگەشەى پشتبەستن دەكەن ! ئاى كە چاكەو فەزیڵەت و فەرزیان لە دەست دەچێ لە كاتێكدا واتێگەشتوون كە لە گوێڕایەڵى و خواپەرستیدان و، بەو كردارەیان لە پلەى وەلى نزیك دەبنەوە، لە كاتێكدا ئەوان لە یاخیبووانەن كە سەرپێچى سوننەتى پێغەمبەرى خوا _ صلى الله علیه وسلم _ دەكەن.

سەبارەت بە گەشتكردن و دەرچوون بۆ شوێنێكى دیارینەكراو، پێغەمبەرى خوا _ صلى الله علیه وسلم _ قەدەغەى گەشت و گەڕانى كردووە بەسەر زەویدا بەبێ پێویستیەكى دیاریكراو.

فقد روای أبوداود في ((سننه))(٥٤٥) مِن حديثِ أَبِي أُمَامَةَ أَنَّ رَجُلًا قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ! ائْذَنْ لِي فِي السِّيَاحَةِ. قَالَ النَّبِيُّ _ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ _ ﴿ إِنَّ سِيَاحَةَ أُمَّتِي الْجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ تَعَالَى ﴾.

واتە (أَبِي أُمَامَةَ) _ خواى لێ ڕازى بێت _ فەرموویەتى: پیاوێك فەرمووى: ئەى پێغەمبەرى خوا ! مۆڵەتم بدە گەشت بكەم. پێغەمبەرى خواش _ صلى الله علیه وسلم _ فەرمووى: ﴿ گەشتى ئومەتەكەى من تێكۆشانە لە پێناوى خوادا ﴾.

---

٥٤٥ _ (رقم ٢٤٨٦)، ورواه الحاكم (٢ / ٧٣).

وسنده حسن.

نووسەر دەفەرمێت:

(إسحاقُ)ی کوڕی (إبراهیمَ)ی کوڕی (هانيءٍ) دەگێڕێتەوە کەوا لە پێشەوا (أحمدَ)ی کـوڕی (حنبـلٍ)یان پرسی: ئایا پیاوێکت بەلاوە خۆشەویستە کە گەشت دەکات وەکـو خواپەرسـتیەك یاخود کەسێکی دانیشتوو لە شارەکاندا.

ئــەویش فــەرمووی: شــتێك لــە ئیــسلامدا نییــە بــەناوی گەشــت، نەپێغەمبــەران و نەپیاوچاکانیش ئەنجامیان نەداوە([546]).

٥٤٦ _ هاوشێوەی ئەم گەشتە _ بەڵام بە شێوازێکی هاوچەرخ _ ئەو ڕەفتارەیە کە هەندێك لـە کۆمەڵـە بانگەوازخوازەکان ئەنجامی دەدەن بەوەی ماڵ و خاوخێزان بەجێدێڵن بەمەبەستی دەرچوون لە پێناوی خوادا _ بەبانگەشەی خۆیان _، ئەم کردارە لە پێشینی چـاکی ئومەتـەوەو بـەو شـێوازەی کـە ئـەوان دەیکـەن نەهاتووە، وەکو پێشتر ئاماژەی پێدرا !

خوای تعالی پاداشتی شێخمان (الألباني) بداتەوە، کە بە ((صوفیەکانی چەرخی نـوێ)) وەسـفی کـردوون، لەمەشدا لە گەڵ ئەو گوفتارەدا یەك دەگرن کە دانەر لە پێشەوا (أحمدَ)ی کوڕی (حنبلٍ)ەوە دەیگێڕێتەوە _ ڕەحمەتی خوای لێبێت _.

کەوابوو وردبەرەوە !

## ✸ ڕەخنەگرتن لە ڕێبازی صوفیەکان لە بواری گەشتدا:

بەڵام بۆ دەرچوون بەتەنهایی، پێغەمبەری خوا _ صلی الله علیه وسلم _ قەدەغەی کردووە پیاو بەتەنها سەفەر بکات:

عن عَمْرو بنِ شُعَيْب عن أبيهِ عن جدِّه أنَّ النبيَّ _ صلى الله عليه وسلم _ قالَ: ((الرَّاكِبَ شَيْطَانٌ، وَالرَّاكِبَانِ شَيْطَانَانِ، وَالثَّلَاثَةُ رَكْبٌ))(٥٤٧).

واتە لە (عَمْرو)ی کوڕی (شُعَیْب)ەوە لە بابیەوە لە باپیریەوە دەگێڕێتەوە کەوا پێغەمبەری خوا _ صلی الله علیه وسلم _ فەرموویەتی:

((حوکم وکردەوەی تەنها سوارێك تەنها شەیتانێکە، دوو سواریش دوو شەیتانە، بەڵام سێ سوار ڕێبوارن)).

---

٥٤٧ _ رواه أبوداود (٢٦٠٧)، والترمذي (١ / ٣١٤)، والحاكم (٢ / ١٠٢)، والبيهقي (٥ / ٢٦٧)، وأحمد (٢ / ١٨٦و٢١٤).

وسنده حسن.

شێخمان لە ((السلسلة الصحيحة))دا (رقم ٦٢) پاش (تخريج)كردنی فەرموودەكە فەرموویەتی:

((... پاشان فەرموودەكە بەرپەرچدانەوەیەكی ئاشكرای تێدایە بۆ ئەو صوفیانەی كە دەچنە دەرەوە بۆ دەشتی بێ ئاو گیاو بەتەنهایی، بۆ پەروەردەبوون وفێربوون و چاكردنی نەفس _ بەبانگەشەی خۆیان _، زۆر جار لەو كاتەدا تووشی مردن بوون بەهۆی تینویەتی و برسێتیەوە، یاخود ناچاربوون دەست لە خەڵك پان بكەنەوە، وەكو ئەو باسانەی سەبارەت بەوان كراوە.

بەڵام چاكترین ڕێباز ڕێبازی پێغەمبەر (محمد)ە _ صلی الله علیه وسلم _)).

## ✸ بەشەو ڕێكردن:

پێدەچێ بەشەوانیش بەتەنها ڕێبکەن، لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ ئەوەی قەدەغە کردووە:

عن ابنِ عُمَر _ رضي الله عنهما _ قالَ: قالَ النبيُّ _ صلى الله عليه وسلم _:

((لو يَعْلَمُ الناسُ ما في الوحدةِ " ما سارَ أحدٌ وحدَهُ بليلٍ أبداً))(٥٤٨).

واتە لە (ابنِ عُمَر)ەوە _ خوا لە خۆی و بابیشی ڕازی بێت _ فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ فەرمووی:

((ئەگەر خەڵکی بیانزانیبا تەنهایی چ تێدایە، هەرگیز هیچ کەسێك بەشەوان بەتەنهایی ڕێی نەدەکرد)).

وعن جابرِ بنِ عبدِالله _ رضي الله عنه _ قالَ: قالَ رسولُ اللهِ _ صلى الله عليه وسلم _:

((أَقِلُّوا الْخُرُوجَ إذا هَدَأَتِ الرِّجْلُ، فَإِنَّ اللهَ تَعَالَى يَبُثُّ فِي خَلْقِهِ ما شاءَ))(٥٤٩).

واتە لە (جابرِ)ی کوڕی (عبدِالله)وە _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرمووی: پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ فەرموویەتی:

((ئەگەر پێیەکان سرەوتن و ئارام بوونەوە، ئەوا چوونە دەرەوە کەم بکەنەوە، چونکە خوای تعالی چ ویست بکات لە نێوان مەخلوقاتی خۆیدا بڵاوی دەکاتەوە)).

---

٥٤٨ _ رواه البخاري (٢٩٩٨).

٥٤٩ _ رواه البخاري في ((الأدب المفرد)) (١٢٣٤)، وأحمد (٣ / ٣٠٦)، وابن حبان (١٩٩٦)، والحاكم (١/ ٤٤٥و٤ / ٢٨٣).

وفيه ضعفٌ " لعنعنة ابن إسحاق.

وله طريقان آخران في ((الأدب المفرد)) (١٢٣٣و١٢٣٥) يتقوى بهما.

فالحديث حسنٌ.

والله أعلم.

نووسەر دەفەرمێت:

کەسانێکیان تێدایە هەموو ڕەنج و ماندوبونێکی خۆی کردۆتە سەفەرکردن، کەچی سـەفەر وەکو خودی خۆی ناویسترێت، قالَ النبيُّ _ صلى الله عليه وسلم _:

((السَّفَرُ قطعةٌ مِن العذابِ، فإذا قضى أحَدُكُم نَهْمَتَهُ مِن سفرِهِ " فلْيُعَجِّلْ إلى أهلِه))(٥٥٠).

واتە پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ فەرموویەتی:

((سەفەر بەشێکە لە سزا، بۆیە هەرکەسێکتان پێویستی و مەرامی لە سەفەرەکە جێبەجێ بوو، با بە پەلە بۆ لای خاوخێزانی بگەڕێتەوە)).

هەرکەس ڕەنج و ماندوبونی خۆی بکا بە سەفەرکردن، بەڕاستی نێوان بەفیڕودانی تەمەن و، سزادانی نەفسی خۆی کۆکردۆتەوە، هەردوکیشیان مەبەست و مەرامێکی خراپن.

٥٥٠ _ رواه البخاري (٣ / ٤٩٦)، ومسلم (١٩٢٧) " عن أبي هريرة.

## ✸ بەیادهێنانەوەی سەرلێشێواندنەکانی ئیبلیس بەرامبەر بە صوفیەکان سەبارەت بەوەی کە بەبێ خواردەمەنی دەچنە بیابان:

نووسەر دەفەرمێت:

بەڕاستی ئیبلیس سەری لە خەڵکێکی زۆریان شێواند، وای بەخەیاڵدا هێنان کە پشتبەستن بریتیە لە وازهێنان لە خواردەمەنی، پێشتریش بۆگەنێتی ئەمەمان ڕوونکردەوە.

کەچی ئەمە لە نێو نەفامانی قەومەکەدا بڵاوبویەوەو، چیرۆك خوانە گێلەکانیش دەهاتن‌و، ئەوەیان لێوە دەگێڕانەوە، وەکو ستایشکردن و پیاهەڵدانێك، بۆیە ئەوە دەبویە هاندانی خەڵك بۆ زیاتر پیادەکردنی ئەو ڕەفتارە.

بەو ڕەفتارەیان کە بەرەو بیابان دەردەچوون و، چیرۆك خوانانیش ستایشیان دەکردن، بارودۆخ خراپ بوو، وە بەلای خەڵکی ئاسایەوە ڕێگە ڕاستەکان پەنهان بوون.

ئەو هەواڵانەی لەوانەوە هاتووە زۆرن، منیش کورتەیەکی باس دەکەم:

لە (فتحٍ الموصليِّ)وە دەڵێت: بە مەبەستی حەجکردن چوومە دەرەوە، کە گەشتمە ناوەڕاستی بیابان لاوێکم بینی، گوتم: چەند شتێکی سەرسوڕمێنە ! بیابانێکی چۆڵ و زەویەکی بێ ئاو و گیاو، لاوێکی بچوك.

پەلەم کرد، تا پێی گەشتم، سڵاوم لێکردو، پاشان گوتم: ئەی کوڕم ! تۆ لاوێکی بچوکی، حوکمەکان تۆ ناگرێتەوە. گوتی: ئەی مامە ! بەڕاستی کەسانێك مردن لە من منداڵتر بوون. گوتم: هەنگاوەکانت فراوان بکەرەوە، چونکە ڕێگاکە دورە، تا بگەیتەوە ماڵ. گوتی: ئەی مامە ! ڕێکردن لە سەر منەو، گەیاندنیش لە سەر خوایە، ئەی گوفتاری خوای پەروەردگارت نەخوێندۆتەوە کە دەفەرمێت: ﴿ وَالَّذِينَ جَاهَدُوا فِينَا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا ﴾﴿العنكبوت: ٦٩﴾، واتە ﴿وَالَّذِينَ جَاهَدُوا فِينَا﴾ وە کەسانێ کە لە پێناو ڕەزامەندی ئێمەدا تێکۆشانیان کردووە ﴿ لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا ﴾ بەڕاستی ڕێنموونیان دەکەین بۆ ڕێبازەکانی خۆمان(٥٥١). پێم گوت:

---

٥٥١ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

ئەوەبۆ نەخواردەمەنی و نە وەڵاخێکت پـێ دەبیـنم. گـوتی: ئـەی مامـە ! دڵنیـابوون و بـێ گومانیم خواردەمەنیمەو، هیواو ئومێدیشم ئامرازی سواربوونمە ! گوتم: دەربـارەی نـان و ئـاو لێم پرسیت. گوتی: ئەی مامە ! پێم بڵێ ئەگـەر برایـەك لـە براكانـت یـاخود ڕەفیقێـك لـە ڕەفیقەكانت بانگهێشتیماڵەكەی خۆی كردی، ئایا بەچاكت دەزانی خواردەمەنیەك لـە گـەڵ خۆتدا هەڵگری، بۆ ئەوەی لە ماڵەكـەی ئـەودا بیخـۆی ؟ گـوتم: پێـت دەدەم ؟ گـوتی: لـێم دوركەوەرەوە ئەی بێ ئیش ! هەر خۆی خواردن و خوارنەوەمان دەداتێ.

(فتحٍ) دەڵێت: هەرگیز لاوێكی بچوكی ترم نەبینیوە لە ئەو زیاتر پشتبەستوتر بێت، هـیچ كەسێكی بەتەمەنیشم نەبینیوە لە ئەو زیاتر زاهیدتر بێت.

نووسەر دەفەرمێت:

بەهاوشێوەی ئەم چیرۆك و باسـانە([552]) كاروبارەكـە خـراپ دەبـێ و، وادەزانرێـت ئەمـە ڕاستەكەیە، كەسی بەتەمەنیش دەڵێت: ئەگەر لاوێكی بچوك ئەمەی كردبێ، ئـەوا مـن لـەو شایستەترم بیكەم !

لەو لاوە بچوكە سەرسوڕنامێنێت، بەڵكو لەو كەسەی پێی گەشت و چاوی پێكەوت، چـۆن ئاشنای نەكرد كە ئەوەی ئەنجامی دەدات كارێكی نادروستەو، ئەو زاتەی بانگی كردویت هەر خۆشیەتی فەرمانی پێ كردویت خواردەمەنی هەڵگریت ؟!

بەڵكو بەتەمەن و گەورەكانی قەومەكەش لەسەر ئەم ڕێبازە دەڕۆشتن، ئیتر منداڵان دەبـێ چ بكەن ؟!

لە (أحمدَ)ی كوڕی (عليّ)وە دەڵێت: پیاوێك بە (أبي عبدِاللهِ)ی كوڕی (الجلاء)ی گـوت: چ دەڵێیت سەبارەت بە پیاوێك دەچێتە بیابان بەبێ خواردەمەنی ؟ گـوتی: ئەمـە لـە كـردەوەی پیاوانی خوایە. گوتی: ئەگـەر مـرد ؟ گـوتی: (الديـة)ەكـەی _ واتـە خوێنەكـەی لـە سـەر بكوژەكەیە.

---

٥٥٢ _ بە بۆچونی من ڕاستیش نی یە !

نووسەر دەفەرمێت:

ئەمە فەتوای کەسێکی نەفامە بە حوکمی شەرع، چونکە هیچ جیاوازیەك لە نێوان فیقهزانانی ئیسلامدا نییە سەبارەت بەوەی کە جایز نییە مرۆڤ بەبێ خواردەمەنی بچێتە بیابان، وە هەرکەسێك ئەو کارە ئەنجام بات و بەهۆی برسێتیەوە بمرێ، سەرپێچیکاری خوای تعالایەو، شایستەیە بچێتە ئاگرەوە.

هەروەها ئەگەر خۆشی تووشی هەندێ شت کرد کە بەزۆری ببێتە هۆی تیاچوون، چونکە خوای تعالی ئەم نەفسانەی بە ئێمە سپاردووە، دەفەرمێت: ﴿ ولا تَقْتُلوا أَنْفُسَكُمْ﴾ ﴿النساء: ٢٩﴾، واتە وە خۆتان مەکوژن (٥٥٣).

ئەگەر ئەو کەسەی بەبێ خواردەمەنی سەفەر دەکات تەنها سەرپێچی ئەو فەرمانەی خوای تعالای کردبێ کە دەفەرمێت: ﴿ وتَزَوَّدوا ﴾ ﴿ البقرة: ١٩٧ ﴾، واتە وە توێشوو (پارێزگاری) هەڵبگرن(٥٥٤) بەسیەتی !

لە (أبي عبدِاللهِ)ی کوڕی (خَفیفِ)وە دەڵێت: لە سەفەری سێیەممدا لە (شیرازَ)ەوە دەرچووم، بەڵام لە بیاباندا ڕێم ونکردو، تووشی برسێتی و تینویەتیەك بووم بە ڕادەیەك هەشت ددانی خستم و، تێکرای تووکی لەشم بڵاوبویەوە !

نووسەر دەفەرمێت:

ئەم پیاوە باسی خۆی کردووەو، وادەردەکەوێ بەهیوای ستایشکردن و پیاهەڵدانە بۆ ئەو ڕفتارەی کە کردویەتی، بەڵام زەمکردنی تووش دەبێ !

لە (أبي حمزةَ الصوفيِّ)وە دەڵێت: من بەڕاستی لە خوای تعالی شەرم دەکەم، کە تێرم خواردبێ و بچمە بیابان، لە کاتێکدا بەپشتبەستن بڕوام هێناوە، بۆ ئەوەی تێرخواردنەکەم نەبێ بەتوێشوویەك و هەڵم گرتبێ!

---

٥٥٣ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

٥٥٤ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

دەڵێم _ ابن الجوزي _ پێشتر لەم بارەوە دواین و، ئەوەمان خستەڕوو کەوا ئەم قەومە وایان زانیوە پشتبەستن وازهێنانە لە بەکارهێنانی ئەسباب و هۆکارەکان، ئەگەر شتەکە ناوەها بوایە ئەوا بەدڵنیایی پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ کە خواردەمەنی هەڵگرت و چووە ئەشکەوتەکە لە بواری پشتبەستن دەچووە دەرەوە، هەروەها (موسى) پێغەمبەر کە بەدوای (الخَضِرَ)دا دەگەڕا ماسیەکی وەکو توێشوو هەڵگرتبوو(٥٥٥)، هەروەها (أهل الكهفِ) کاتێ دەرچوون شتێکی سووکیان لە گەڵ خویاندا برد کە چەند دیرهەمێك بوو!

لەڕاستیدا مانای پشتبەستن بەلای ئەم تاقمەوە پەنهان بوو، تەنها بەهۆی نەفامیانەوە !

(أبوحامدِ)یش بەهانەی بۆ هێنانەوەو، گوتی: چوونە بیابان بەبێ خواردەمەنی شیاو نییە، مەگەر بەدوو مەرج:

یەکەمیان: دەبێ مرۆڤ نەفسی خۆی ڕاهینابێ، بەجۆرێك توانای بەرگەگرتنی بێ خۆاردەمەنی هەبێ بۆ ماوەی هەفتەیەك و زیاتر.

دووەم: توانای خواردنی گیای هەبێ، ئیتر لە دوای هەفتەیەك لەوە بەدەر نابێ کە پێدەچێ لەو بیابانەدا مرۆڤێکی پێ بگات، یا بە شوێنێك بگات، یا گیایەك بدۆزێتەوە کە ئومێدی خواردنی بکرێت.

نووسەر دەفەرمێت:

ناشیرینترین شتی ئەم گوفتارە ئەوەیە کە لە لایەن کەسێکی فیقهزانەوە گوتراوە، چونکە ئەو کەسەی لە بیاباندایە ڕەنگە هیچ کەس بەدینەکات، ڕێگەکەی ون بکات، نەخۆش بکەوێت و، خواردنی گیای بۆ چاك نەبێ، لەوانەیە چاوی بەکەسێك بکەوێ و نەتوانێت خواردەمەنی بداتێ و، تووشی کەسێك بێت میواندارى نەکات، بەدڵنیایی نوێژە بە کۆمەڵەکانیشی لە دەست دەچێ، پێدەچێ بمرێ و کەس بەتەنگیەوە نەچێ.

---

٥٥٥ _ كما حكاه الله _ سبحانه _ عنهم في سورة الكهف: ٥٩ _ ٦٤.
وانظر رسالة ((الفارق بين المصنِّف والسارق)) (ص٧١ _ ٧٧) للسيوطي، وتعليقي عليها، ففيها زيادة تفصيل في قصة موسى والخضر.

پێشتریش باسی ئەوەمان بۆ کردن کە سەبارەت بە تەنهایی هاتووەو، وەڵامیشمان دایەوە.

پاشان خۆ تووش کردن بە ئەم ناڕەحەتی و مەینەتیانە دەبێ سوودی چ بێ ؟ ئەگەر پشت بە نەریتێك، یا چاوپێکەوتنی کەسێك ببەسترێت و، گیا بخورێت ؟!

وە چ فەزیڵەت و چاکەیەك لەم باروحاڵەتەدایە تا نەفسی بۆ بخرێتە مەترسیەوە ؟!

وە ئەو فەرمانەی دەربارەی خواردنی گیا هاتووە لە کوێ یە ؟!

وە چ کەسانێك لە پێشینی چاك ئەمەیان ئەنجام داوە ؟!

وەکو ئەوەی ئەم قەومە بڕیاریان دابێ کە خوای تعالی لە بیاباندا ڕۆزیان بدات ؟

هەرکەس لە بیاباندا داوای خواردەمەنی بکات، ئەوا شتێکی داوا کردووە کە نەریت وانەبووە لە بیاباندا داوا بکرێت، ئایا نابینی قەومەکەی (موسى) پێغەمبەر _ علیه السلام_ کە داوای سەوزەوات و ترۆزی و خەیارو سیرو نیسك و پیازیان کرد، خوای تعالی سروشی بۆ (موسى) پێغەمبەر _ علیه السلام _ نارده خوارەوە کە: ﴿ اهْبِطوا مِصْراً ﴾﴿ البقرة: ٦١﴾، واتە دابەزن بۆ شارێك، چونکە ئەوەی داوایان دەکرد لە شارەکاندا هەبوو.

بۆیە ئەم قەومە لەو پەڕی هەڵەدان کاتێ سەرپێچی شەرع و ئەقڵ دەکەن و، کار بەوە دەکەن کە لە گەڵ نەفسیاندا دەگونجێت.

لە (محمد)ی کوڕی (موسى الجُرْجانيِّ)وە دەڵێت: لە (محمدَ)ی کوڕی (كثيرِ الصَّنْعانيَّ)م پرسی سەبارەت بەو زاهیدانەی کە نە خواردەمەنی و نە نەعل و نە سۆڵیش لە پێ دەکەن ؟ ئەوەبوو گوتی: سەبارەت بە نەوەکانی شەیتان لێت پرسیم نەك زاهیدان ! منیش پێم گوت: کەوابوو زوهد چی یە ؟ گوتی: زوهد دەستگرتنە بە سوننەتەوەو، خۆچواندنە بە هاوەڵانی پێغەمبەر _ صلى الله علية وسلم _.

لە (أحمدَ)ی کوڕی (الحُسينِ)ی کوڕی (حسَّانَ)ەوە دەڵێت: لە (أباعبدِاللهِ أحمدَ)ی کوڕی (حنبلٍ)یان پرسی سەبارەت بە پیاوێك کە بەبێ توێشوو دەچێتە بیابان، ئەوەبوو زۆر بە توندی نکۆڵیان لێکردو، فەرمووی: ئۆف، ئۆف، نەخێر، نەخێرو _ دەنگی لە گەڵیدا درێژ کردەوە _ مەگەر بە توێشوو و لە گەڵ هاوەڵانی کارواندا.

له (أبوبكرِ المروزيُّ)وه دەڵێت: پیاوێك هاته خزمەتی (أبي عبدِاللهِ)و، گوتی: پیاوێك دەیەوێت بچێت بۆ سەفەرێك، کامیانت به لاوه خۆشه: توێشوو له گەڵ خۆیدا بەرێت، یاخود پشت ببەستێ ؟ ئەوەبوو (أبو عبدِاللهِ) فەرمووی: توێشوو له گەڵ خۆیدا دەبات، بۆ ئەوەی چاوی به دەستی خەڵکەوه نەبێ.

له (أحمدَ)ی کوڕی (نَصْرٍ)ەوه دەڵێت: پیاوێك له (أبا عبدِاللهِ)ی پرسی: ئایا پیاو که بچێ بۆ مەککه، باش وایه پشت ببەستێ و هیچ خواردەمەنیەك له گەڵ خۆیدا نەبات ! فەرمووی: پێم باش نییه، ئەی له کوێ بخوات ؟ پیاوەکەش گوتی: پشت دەبەستێ و، خەڵکیش پێی دەبەخشێت ! فەرمووی: ئەگەر پێیان نەبەخشی، ئایا چاوەڕوانیان نابێ بەهیوای ئەوەی پێ ببەخشن ؟! ئەمەم بەدڵ نییه، هەرگیز پێم نەگەشتووه کەسێك له هاوەڵانی پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ یاخود کەسێك له (تابعين) ئەوەیان ئەنجام دابێ.

له (الحُسينِ الرازي)وه دەڵێت: پێشەوا (أحمدَ)ی کوڕی (حنبلٍ)م بینی و پیاوێکی خەڵکی (خُراسانَ) هاته خزمەتی و، پێی گوت: ئەی (أبا عبدِاللهِ) ! چەند دیرهەمێکم پێیه، ئایا بەم دیرهەمانه حەج بکەم ؟ پێشەوا (أحمدَ)یش پێی فەرموو: بچۆ بۆ (بابِ الكَرْخِ)و، بەم دیرهەمانه حەبلێك بکڕەو، بەسەرت شت هەڵبگره تا بەخاوەن سێ سەد دیرهەم دەبی، ئەوجا بۆ حەج بچۆ. ئەویش گوتی: ئەی نابینی خەڵك کەسابەت دەکەن ؟! پێشەوا (أحمدَ)یش فەرمووی: تەماشای ئەم شته مەکه، چونکه هەرکەسێك بەهیوای ئەمه بێت ئەوا دەیەوێ گوزەرانی خەڵك تێك بدات. گوتی: ئەی (أبا عبدِاللهِ) ! من پشتم بەستووه. ئەویش فەرمووی: باشه به تەنهایی دەچیته بیابان یاخود له گەڵ خەڵکدا دەچی ؟ گوتی: نەخێر، له گەڵ خەڵکدا ! فەرمووی: درۆدەکەیت، کەواته تۆ پشتت نەبەستووه، ئەبێ بەتەنهایی بچیته بیابان، بەپێچەوانەوه تۆ پشتت بەتورەکەی خەڵك بەستووه !

## ✸ گێڕانەوەی بەشێك لەو کردەوانەی کە دژبە شەرعەو بەسەر صوفیەکاندا هاتووە لە گەشت و گەڕان و سەفەرەکانیاندا:

(أبوحمزَةَ الخُراسانيُّ) دەڵێت: ساڵێك لە ساڵان چووم بۆ حەج، ئەوەبوو لە کاتێکدا بەڕێگەدا ڕێم دەکرد، کەوتمە نێو بیرێکەوە، نەفسم ئارەزووی ئەوەی دەکرد کە داوای یارمەتی بکەم، بەڵام گوتم: نەخێر سوێند بەخوا داوای هیچ یارمەتیەك ناکەم. ئەوەبوو ئەم یادو بیرەم تەواو نەکرد، تا دوو پیاو بەسەر بیرەکەدا تێپەڕبوون، یەکێکیان بەویتریان گوت: وەرە با سەر ئەم بیرە بگرین، کە لەم سەرە ڕێگەدایە، قامیش و حەسیریان هێنا، منیش ختورە بە دڵمدا هات‌و، گوتم: بۆ لای ئەو زاتەی کە لەو دوانە لێتەوە نزیکترە ! بێدەنگ بووم تا سەری بیرەکەیان داپۆشی، لە پڕدا شتێك هات و، سەری بیرەکەی لاداو، هەردوو قاچەکانی شۆڕکردە خوارەوەو، لە پرتەوبۆڵەکەیدا دەیگوت: دەستت بە منەوە بگرە، منیش دەستم پێوە گرت و، دەریهێنام، تەماشام کرد، بینیم ئاژەڵێکی دڕندەیە، بانگکارێکیش بانگی کردم و گوتی: ئەی (أبا حمزَةَ) ! ئایا ئەمە چاك نییە، کە بە ئاژەڵێکی زیانکار لە زیان ڕزگارمان کردی !

نووسەر دەفەرمێت:

سەبارەت بەم (أبی حمزَةَ)یەی کە کەوتۆتە نێو بیرەوە جیاوازیان تێکەوتووە، (أبوعبدِالرحمنِ السُّلَميّ) دەڵێت: (أبوحمزَةَ الخُراسانيُّ)ەو، لە هاوڕێیانی (الجُنَید) بووە !

لە (ریواية)تێکی دیکەدا هاتووە کە (دمشقيٌّ) بووە.

(أبونُعَيم الحافظ) دەڵێت: ئەو پیاوە (أبوحمزَةَ البغداديُّ)ەو، (محمد)ی کوڕی (إبراهيم)ی ناوە.

(الخطيبُ) لە (تاريخ)ەکەیدا(٥٥٦) باسی ئەو پیاو دەکات و، ئەو چیرۆکەشی لێوە دەگێڕێتەوە!

---

٥٥٦ _ (١ / ٣٩٠).

بەڵام هەر کامیان بێت، لە ڕەفتارەکەیدا هەڵە بوەو، بەو بێدەنگ بوونــەی پێــچەوانەکاری شەرع بۆتەوەو، یارەمەتیدەر بووە بۆ تاوانبارکردنی نەفسی خۆی، چونکە پێویست بوو هــاوار بکات و، نەهێڵێت سەری بیرەکە داپۆشن، وەکو چۆن پێویستە بەرگری لە نەفسی خۆی بکــات بەرامبەر بە هەر کەسێك بیەوێت بیکوژێت. کە دەڵێت: ((لا أستغيثُ)) واتە داوای یارمــەتی ناکەم، وەکو کەسێکە بڵێت: خۆراك ناخۆم و، ئاو ناخۆمــەوە، ئەمــەش نەفامیەکــە بــۆ ئــەو کەسەی کە دەیکات و، سەرپێچیکردنی ئەو دانایی و حیکمەتیــە کــە دونیــای لــە پێنــاودا داهێنراوە، چونکە خوای تعالى شتەکانی بەپێی حیکمــەت و دانــایی دانــاوە، بۆیــە دەبینــی دەستی بە ئادەمی بەخشیوە بۆ ئەوەی بەرگری لە نەفسی خۆی بکات، زمانی داوەتێ قــسەی پێ بکــات، ئــەقڵێکی داوەتــێ ڕێنــوێنی دەکــات بــۆ دورخــستنەوەی زیانــەکان و، هینــانی بەرژەوەندیەکان، خواردن و دەرمانی داناوە بۆ بەرژەوەندی ئادەمیــەکان، بۆیــە هەرکــەس ڕوو وەرگێڕێــت و، ئــەو شــتانە بــەکار نــەهێنێت کــە بــۆی بــەدیهێنراوەو، ڕێنمــایی کــراوە بــۆ بەکارهێنانی، ئەوا بەشەرع قایل نەبوەو، حیکمەتی دروستکاری پەك خستووە.

ئەگەر کەسێکی نەفام بڵێت، چۆن خۆم بپارێزم ئەگەر فەرمانی قەدەرو چارەنووس بێت ؟

دەڵێین _ ابن الجوزي _: چۆن مــرۆڤ خــۆی نــەپارێزێت لــە کاتێکــدا ئــەو زاتــەی قــەدەرو چارەنووسی داناوە، هەر خۆشیەتی کە فەرموویەتی: ﴿ خُذُوا حِذْرَكُم ﴾﴿ النساء: ٧١ ﴾ واتــە ئاگادریی خۆتان وەرگرن(٥٥٧).

پێغەمبــەری خــوا _ صــلى الله عليــه وســلم _ لــە ئەشــکەوتەکەدا خــۆی شــاردەوەو، نەیفــەرموو: بەپــشتبەستن دەچــمە دەرەوە، بــەردەوام بەجەســتەی ئەســباب و هۆکارەکــانی بەکاردەهێنا، بەدڵیشی لە گەڵ خوای دانەری ئەسباب و هۆکارەکاندا بوو.

پێشتریش ئەم بەشەمان بەتیروتەسەلی باس کرد.

گوفتاری (أبي حمزةَ): (فنُوديتُ من باطِني)(٥٥٨) ئەمــە قــسەی نەفــسێکی نەفامــە، کــە بەنەفامی لە نەفسیدا جێگیر بووە کە پشتبەستن بریتیە لەوەی مرۆڤ وازبهێنێت و، دەست بە

---

٥٥٧ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

٥٥٨ _ لە (رایوایە)ێکی دیکەی هەمان چیرۆکدا هاتووە.

ئەسباب و هۆکارەکانەوە نەگرێت ، چونکە شەرع داوای ئـەو شـتانە لـە مرۆڤـ ناکـات کـە قەدەغەی لێکردووە.

دەبا (أَبا حمزَةَ) خودی ناوەڕۆکی دوری خستایەتەوە لەوەی دەست درێژ بکات و، خۆی بـەو شتەوە هەڵواسێت، کە بۆ ئەو خۆی شۆڕکردۆتەوە، کە دەسـتی درێـژکردو خـۆی بـەو شـتەوە هەڵواسی ئەوە خـۆی بـۆ خـۆی پێـشێل کردنـی بانگەشـەکانی خۆیـەتی بـەوەی ئەسـباب و هۆکارەکان بەکارنەهێنرێت، کە بە پشتبەستن ناوی دەبات، چـونکە چ جیاوازیـەك لـە نێـوان ئەوەدا هەیە کە دەڵێت: من لە بیرەکەدام و، لە نێوان ئەوەدا هەیە کە دەستی درێژکردو خـۆی بەوەوە هەڵواسی کە بۆی شۆڕ بویەوە ؟! نەخێر بەڵکو ئەمە دڵنیاترە، چونکە کردار لە گوفتار دڵنیاترە، دەبا بێدەنگ بوایە تاوەکو بەبێ هیچ هۆکارێك هەڵگیرایەو ببرایەتە دەرەوە !

ئەگەر بڵێت: ئەو شتەی خۆی بۆ شۆڕکردمەوە خوای تعالی بۆی ناردم !

دەڵێین _ ابن الجوزي _: ئەو کەسانەی بەسەر بیرەکـەدا تێپـەڕبوون دیـسان خـوای تعـالی ناردونی، ئەو زمانەش کە داوای فریاگوزاری دەکات هەر خوای تعالی خولقاندویەتی، چـونکە ئەگەر داوای فریاگوزاری بکردایـە، ئـەوا دەبـووە کەسـێکی بەکارهێنـەری ئـەو ئەسـباب و هۆکارانەی کە خوای تعالی بۆی خولقاندونی، بۆ ئەوەی سوودی لێوەرگرێت و، بەکاری بێنێـت بۆ بەرگریکردن لە نەفسی خۆی، کەچی بەکارینەهێنا ! لـە ڕاسـتیدا کـە بێـدەنگ بـوو ئـەو ئەسـباب و هۆکارانـەی پەکخـست کـە خـوای تعـالی بـۆی خولقانـدبونی و، حیکمـەت و دانایەکەشی دورخستەوە، بۆیە ڕاستە سەرزەنـشت بکرێـت لـە سـەر ئـەوەی کـە ئەسـباب و هۆکارەکانی بەکارنەهێنا.

لە (مؤمَّلِ المُغابيِّ)وە دەڵێت: هاوەڵێتی (محمدَ)ی کـوڕی (الـسَّمينِ)م دەکـرد، ئـەوەبوو لـە گەڵیدا سەفەرێکم کردو، لـە نێـوان تکریـت و موصـل دا ڕێمـان دەکـرد، لـە کاتێکـدا لـە دەشتایەکدا ڕێمان دەکرد، لە پڕ ئاژەڵێکی دڕنـدە لـە نزیکمانـەوە نەڕەیـەکی کـرد، منـیش ترسامو، تێکچووم و، ئەوە بە ڕوومەوە دەرکەوت و، بە نیـاز بـووم دەستپێـشخەری بکـەم و ڕابکەم، بەڵام گرتمی و، گوتی: ئەی (مؤمَّلِ) ! پشتبەستن ئالێرەدایە، نەك لە مزگەوت !

نووسەر دەفەرمێت:

هیچ گومانێکم لەوەدا نییە کە لە کاتی نارەحەتیەکاندا ئاسەواری پشتبەستن لە کەسی پشتبەستودا بەدەردەکەوێت، بەڵام لە مەرجەکانی پشتبەستن نییە کە خۆت بە دەست ئاژەڵێکی دڕندەوە بدەیت، چونکە ئەوە جایز نیە.

لە هەندێ شێخەوە هاتووە کەوا بە (عليّ الرازيّ)یان گوت: ئەوە بۆ لە گەڵ (أبي طالبٍ الجُرجانيّ)دا ناتبینین ؟ ئەویش گوتی: بە گەشتێک چووینە دەرەوە، لە شوێنێکدا نووستین ئاژەڵی دڕندەی لێبوو، کاتێ تەماشای کردم، بینیمی نەنوستوم، لایبردم و دوریخستمەوەو، گوتی: پاش ئەمڕۆ ڕەفیقایەتیم مەکە.

دەڵێم _ ابن الجوزي _: ئەم پیاوە لە سنوور لایداوە، کاتێ ویستویەتی ڕەفیقەکەی ئەو خووە سروشتە بگۆڕێت، کە لە سەری بەدیهاتووە، بەڵام ئەوە لە توانای ئەودا نییەو، شەرعیش داوای هاوشێوەی ئەو شتەی لێ ناکات، تا ئەو ئاستەی خوای تعالی ئەو توانایەی بە (موسی) پێغەمبەریش _ علیه السلام _ نەبەخشی کاتێ لە مارەکە هەڵهات.

هەموو ئەمانە لە سەر نەفامی بونیاد نراوە.

لە (أحمدَ)ی کوڕی (عليّ الوَجْديّ)وە دەڵێت: (الدِّينَوَرِيُّ) بە پێ پەتێتی و بەسەر ڕووتی دوازدە حەجی کرد، ئەگەر دڕکێك بە پێیدا بچوایە، بە زەویەکە پێی دەسڕی و، ڕێی دەکرد، بەبێ ئەوەی سەری بەرەو زەوی دانوێنێت، چونکە لە پشتبەستنەکەیدا ڕاستگۆ بوو.

نووسەر دەفەرمێت:

تەماشاکەن نەفامی چ بە شوێنکەوتوانی خۆی دەکات، دڵنیابن لە گوێڕایەڵی خوای تعالی نییە مرۆڤ ئەو بیابانە بە پێ پەتێتی ببڕێت، چونکە ئەو پەڕی زیان بە نەفسی خۆی دەگەیەنێت، وە جایزیش نییە سەری ڕووت بێت.

باشە لەم شتەوە چ نزیکبونەوەیەك لە خوای تعالاوە بەدەست دێت، دڵنیابن ئەگەر سەر ڕووتکردن لە ماوەی ئیحرام بەستندا (واجب) نەبوایە، ئەوا هیچ بەهانەیەك نەدبوو بۆ ڕووتکردنی.

باشه چ كەسێك فەرمانی پێكردووه دڕك له پێی دەرنەهێنێ ؟!

وه چ گوێڕایەڵی و خواپەرستیەك لەمەدایه ؟!

ئەگەر پێیەكانی بناوسایه به هۆی ئەو دڕكەوه كه تیایدا ماوەتەوەو، تیاچوایه، ئەوا یارمەتیدەر دەبوو بۆ فەوتاندنی نەفسی خۆی.

وه ئایا سڕینی پێ به زەویدا، لادانی هەندێ شەڕو ئازاری دڕكەكه نییه، دەبا پاشماوەكەشی به دەرهێنان لادایه ؟!

باشه پشتبەستن له چ ئاستێكی ئەم كردەوانەدایه كه پێچەوانەی ئەقڵ و شەرعن، چونكه ئەقڵ و شەرع بڕیاریان داوه بەوەی كه بەرژەوەندیەكان بۆ نەفس بهێنرێ و، زیانەكانی لێ دوربخرێتەوه ؟!

لەم ڕوانگەیەوه شەرع ڕێی بەو كەسانه داوه، كه به هۆی ئیحرام بەستنەوه تووشی زیان دەبن، پیرۆزی ئیحرامەكه بشكێنن و، پۆشاك لەبەر بكەن و، سەریشیان داپۆشن و، فیدیه بەن.

گوێبیستی (أَباعُبيدٍ) بووم دەیگوت: من ئاقڵی و ژیرێتی مرۆڤ بەوه دەزانم كه واز له هەتاو بێنێ و، به سێبەرەكەدا ڕێ بكات.

له (سُفيانَ الثوريِّ)وه دەڵێت: هەركەس برسی بێت و، داوا نەكات تاوەكو دەمرێ، دەچێته ئاگرەوه.

نووسەر دەفەرمێت:

تەماشای گوفتاری فیقهزانان بكه چەند جوانه، چونكه خوای تعالی توانای به كەسی برسی داوه كه به ئەسباب و هۆكاری جوراوجۆر خۆی تێر بكات، وه ئەگەر هۆكاره ئاشكراكان نەبوون بۆ ئەوەی بەكاری بێنێت، توانای داواكردنی هەیه كه بریتیه له دەستكەوتێكی هاوشێوەی بەكارهێنانی هۆكارەكان لەو باروحاڵەدا، بۆیه ئەگەر وازی له داواكردنەكەش

هێنا، بەراستی کەمتەرخەمی نواندوە بەرامبەر بەهەقی نەفس و ڕوحی خۆی کە خوای تعالی پێی سپاردووە(٥٥٩)، بەوەش بەسزا شایستە دەبێ.

لە (أبي بكرِ الدَّقاقِ)ەوە دەڵێت: بووم بە میوانی خێڵیکی عەرەب، کچێکی جوانم بینی و، تەماشام کرد، ئەوەبوو ئەو چاوەی خۆمم دەرهێنا کە پێی تەماشای کچەکەم کردبوو و، گوتم: هاوشێوەی تۆ لە پێناوی خوادا تەماشای کردووە !

دەڵێم _ ابن الجوزي _: تەماشای نەفامی ئەم هەژارە بکە بە شەریعەت، کە چەند لێـوەی بەدورە، چونکە ئەگەر بەبێ قەست تەماشای کردبێ، هیچ تاوانێکی لە سەر نییە، ئەگـەر بـە قەستیشەوە بێت، ئەوا تاوانێکی بچوکی ئەنجام داوە، کە تەنها پەشیمان بوونەوەی بەس بـوو، کەچی تاوانێکی گەورەی خستەسەر تاوانە بچوکەکەی، کاتێ چاوی خۆی دەرهێنـاو، تەوبـەی لێ نەکرد، چونکە بڕوای وابوو کە دەرهێنـانی چـاو نزیکبونەوەیـە لـە خـوای تعـالی، بـەڵام هەرکەس بڕوای بەوەبێ کە شتی قەدەغەکراو هۆکاری نزیکبونەوەیە لە خـوای تعـالاوە، ئـەوا هەڵەکانی گەشتۆتە لوتکە.

پێدەچێ ئەم چـیرۆکەی لـە کەسـانێکی (بـني إسـرائيل)ەوە بیـستبێ، کـاتێ پیاوێکیـان تەماشای ژنێکی کرد، چاوی خۆی دەرهێنا، ئەم چیرۆکە لە گەڵ ئەوەی لە ڕاستیەوە بەدوورە، لەوانەیە لە شەریعەتی ئەواندا جایز بێ، بەڵام لـە شـەریعەتی ئێمـەدا، ئـەم ڕەفتـارە حـەرام کراوە.

تەماشاکەن وەکو ئەوەی ئەم تاقمـە شـەریعەتێکی دیکـەیان داهێنـابێ و، ناویـان نـابێ: تەصوف و، شەریعەتی پێغەمبەرەکەی خۆیان (محمدٍ) _ صلى الله عليه وسلم _ وازلێهێنابێ.

پەنا بەخوا دەگرین لە سەرلێشێواندنەکانی ئیبلیس.

---

٥٥٩ _ بەراوردی بکە بەوەی کە پێـشتر لـە پـەراوێزەکانی تـردا ئامـاژەی پێـدرا، دەربـارەی بەخـشینی ئەندامەکانی جەستەی مرۆڤ، وە ئەوەی لێرەدایە پشتگیری قەدەغەکردنەکە دەکات.

لە (أَبي الحسينِ علـي) كـوڕی (أَحمـدَ البَـصْريِّ)ی خزمــەتكاری (شَـعْوانةَ)وە(٥٦٠) دەڵێـت: (شَعْوانةَ) پێی ڕاگەیاندم كەوا لە دراوسێكانیدا ژنێكی چاكی خێرەومەند هـەبوو، ڕۆژێـك بـۆ بازاڕ چووە دەرەوە، كەسێك بینیتی و، شەیدای بوو، تـا دەرگـای ماڵەكـەی كەوتـە شـوێنی، ژنەكەش پێی گوت: چ شـتێكت لـە مـن دەوێ ؟ پیاوەكـەش گـوتی: شـەیدای تـۆ بوومـە ! ژنەكەش گوتی: چ شتێك لەمندا بە جوان دادەنێـی ؟ پیاوەكـە گـوتی: چـاوەكانت. ئـەوەبوو ژنەكە چووە ماڵەوەو، چاوەكانی خۆی دەرهێناو، چووە پشت دەرگاكەو، چاوەكانی بۆ فڕیـداو، پێی گوت: بیانبە، خوا فرو بەرەكەتت پێ نەبەخشێت.

نووسەر دەفەرمێت:

تەماشاكەن _ براكانم _ ئیبلیس چۆن بە نەفامان یاری دەكـات، چـونكە پیاوەكـە كـاتێ تەماشای كرد تاوانێكی بچوكی ئەنجامدا، بەڵام ژنەكە تاوانێكی گەورەی ئەنجامـداو، پاشـان واتێگەشت گوێڕایەڵی و خواپەرستیەكی ئەنجامداوە، كەچی واپێویست بوو لە گـەڵ پیـاوێكی بێگانەدا قسە نەكات(٥٦١).

كەسانێكی دیكەی ئەم قەومە شتانێكی دیكەی پێچەوانەی ئەمەیان ئەنجامداوە، لـە (ذي النون المِصْريِّ)و كەسانی دیكەش دەگێڕنەوە كە گوتیانە: لە بیاباندا چاوم بە ژنێك كەوت، لـە گەڵمدا دواو، لە گەڵیدا دووام!

بەڵام ئەم ڕەفتارەی بۆ حەڵاڵ نییە.

ژنێكی بە ئاگاش ئەوەی بەلاوە ناخۆش بوەو نكۆڵی لێكردوە، وەكو ئەوەی (محمـدُ)ی كوڕی (یعقــوبَ العُرْجــيُّ) دەڵێــت: گوێبیــستی (ذي النُّــونِ) بــووم دەیگــوت: لــە زەویــەكانی

٥٦٠ _ بەلای صوفیەكانەوە لە ژنە هەرە خواپەرستەكانە.

٥٦١ _ ڕەوشتی ژنانی پێشینی چاك ئەوە نەبوو لە گەڵ بێگانەدا بـدوێن، مەگـەر بـۆ پێویـستیەك، والله أعلم.

(البَجَّةِ)دا(٥٦٢) ژنێكم بەدیكردو، بانگم كرد، ئەویش گوتی: ئەوەبۆ پیاوان لە گەڵ ژناندا قسە دەكەن، ئەگەر كەم ئەقڵ نەبوایەی، شتێكم تێدەگرتی !

لە (أبي سعيدِ الخزَّاز)ەوە دەڵێت: جارێكیان بەبێ خواردەومەنی چووەمە بیابـان، تووشـی نەبوونی بووم، كۆتایی قۆناغەكەم(٥٦٣) لە دوورەوە بەدیكرد، زۆر شادومانم بووم بە گەشتنم، پاشان لە نەفسی خۆمەوە بیرم كردەوە كە سكاڵام كردووەو، پشتم بە جگـە لـە خـوای تعـالی بەستووە، بۆیە بڕیارمدا نەچمە كۆتایی قۆناغەكە تا بۆی هەڵمدەگرن، بۆیە لە خۆڵ و لمەكـەدا چاڵێكم بۆ خۆم هەڵكەندو، تاوەكو سینگ جەستەی خۆمم تێـدا شـاردەوە، لـە نیـوە شـەودا گوێبیستی دەنگێكی بەرز بووم دەیگوت: ئەی ئەهلی قۆناغەكە ! خوا وەلـی و پیاوچـاكێكی هەیە نەفسی خۆی لەم خۆڵ و لمەدا بەنـدكردووە، پێـی بگـەن، ئـەوەبوو كۆمـەڵێك هـاتن و، دەریانهێنام و، تا كۆتای قۆناغەكە هەڵیانگرتم.

نووسەر دەفەرمێت:

بەڕاستی ئەم پیاوە ڕۆچووەو زۆری لە خووی سروشـتی خـۆی كـردووەو، شـتگەلێكی لـێ داواكردووە كە بەسەریدا نەسەپێنراوە، چوونكە ئەوەی ئادەم هەركات ئەو شتانەی بینـی كـە بەلایەوە خۆشەویستە یەكسەر دەگەشێتەوە، بۆیە هیچ سەرزەنشتێك لـە سـەر كەسـی تینـوو نییە ئەگەر دڵی بە ئاو بگەشێتەوە، هەروەها كەسێكی برسیش ئەگەر دڵی بـە خواردەمـەنی بگەشێتەوە، هەروەها هەموو كەسێكیش ئەگەر دڵی بە خۆشەویستەكەی بگەشێتەوە.

پەنا دەگرین بەخوا كە ڕوو لە كارێك بكەین، بەبێ ئەوەی زانست و شەرع پێویستی بكەن.

پاشان كە نەفسی خۆی بەرامبەر بە نوێژە بە كۆمەڵەكان بەند كـردوە، بەڕاسـتی شـتێكی ناشیرینە.

---

٥٦٢ _ شارێكە لە نێوان (فارس) و (أصبهان)دا، وەكو ئەوەی (یاقوت) فی ((معجمـە))كەیدا (١ / ٣٤٠) باسی دەكات.

٥٦٣ _ قۆناغ: ماودایەكە ڕێبوار دەتوانێ لە ماوەی ڕۆژێكدا بیبڕێت، وەرگێڕ.

باشە ئەم ڕەفتارە چ شتێكی نزیكبوونەوەی تێدایە لە خوای تعالاوە، بـەڵكو لـە ڕاسـتیدا تەنها نەفامیەكی پەتیە.

ڕەحمەتی خواتان لێ بێ تەماشاكەن نەفامی چ بەم پیاوە كـرد، كەچـی لـە ئـەهلی خێـرو چاكەش بوو، ئەگەر زانستی هەبوایە، بـەدڵنیایی دەیزانـی ئـەوەی كـە كردویـەتی حەرامـە، دڵنیـابن ئیبلـیس بـەدەر لـە نـەفامی هیـچی تـری بەدەسـتەوە نییـە بـۆ سەرلێـشێواندنی خواپەرستان و زاهیدان.

(أَحْمَدَ)ی كوڕی (عليٍّ) كوڕی (المحسّنِ) لە (أَبي إسـحاقَ الطَّبريِّ)وە دەگێڕێتـەوەو دەڵێـت: (جَعفرٌ الخُلْديُّ) پێی گوتم: پەنجاو شەش جار لە (عَرفةَ) وەستاوم، لەوانە بیـست و یـەكیان لـە سەر (المذهَبِ) بوو، منیش بە (أَبي إسحاقَ)م گوت: مەبەستی چ بوو كـە دەیگـوت لـە سـەر (المذهَبِ). گوتی: دەچووە سەر پردی ڕووباری (الناشـريَّةِ)و سەر قۆڵەكانی دەتەكاند، تـا لـەوە دڵنیابێ كە هیچ خواردەمەنی و ئاوێكی پێ نییە، ئینجـا (لبیـكَ اللـهمَّ لبیـك)ی دەگـوت و، ڕێی دەكرد.

نووسەر دەفەرمێت:

ئەمە پێچەوانەی شەرعە، چونكە خوای تعالی دەفەرمێت: ﴿ وَتَزَوَّدوا ﴾ البقـرة: ١٩٧ ﴾ واتە وە توێشووی (پارێزگاری) هەڵبگرن(٥٦٤)، پێغەمبەری خوا _ صلی الله علیـه وسـلم _ توێشوو و خواردەمەنی پارێزگاری هەڵدەگرت، لە تواناادا نییە بگوترێت: مرۆڤ پێویستی بـە هیچ شتێك نییە بۆ ماوەی چەند مانگێك، چونكە ئەگەر پێویستی پێی بـێ و، خواردەمـەنی هەڵنەگرێ و، بەو هۆیەوە نەخۆش كەوت، ئەوا تاوانبار دەبێ، وە ئەگەر لە خەڵك داوا بكات، یاخود بەزۆر لێیان وەربگرێت، هەرگیز ئەوە بەس نـابێ بـۆ بانگەشـەی پـشتبەستنەكەی، وە ئەگەر واڕاگەیەنێت كە ڕێزی لێ دەگیرێت و، ڕۆزی دەدرێ بەبێ بەكارهێنانی هیچ ئەسـباب و هۆكارێك و، وابزانێت شایستەیە بەوە، بەڕاستی بەڵاو مەینەتیە.

---

٥٦٤ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

ئەگەر پەیڕەوی فەرمانی شەرعی بکردایەو، خواردەمەنی هەڵگرتایە، لە هەموو باروحاڵێکدا ئەوەی بۆ باشتر دەبوو.

لە (محمدِ)ی کوڕی (طاهرِ)ەوە کە لە مەککە کۆمەڵێك لە صوفیەکان چوویونە دیدەنی، ئەویش پێی گوتبوون: بەهاوەڵێتی چ کەسانێك هاتن ؟ ئەوانیش گوتیان: حاجیەکان یەمەن. ئەویش گوتی: ئاخ، تەصوف ئاوەهای لێهات یاخود پشتبەستن نەما ! ئێوە لە سەر تەریقەتو تەصوف نەهاتوون، بەڵکو لە ڕاستیدا تەنها لە خوانی یەمەنەوە هاتوون بۆ خوانی مەککە.

پاشان گوتی: بەهەقی خۆشەویستان و لاوان(٥٦٥)، دڵنیابن چوار کەس بووین لەم ڕێگەیەدا بەهاوەڵێتی یەکتر دەچووینە دەرەوە بۆ سەردانی گۆڕی پێغەمبەر _ صلى الله عليه وسلم_(٥٦٦) بەبێ ئەوەی خۆمان پێوەند کردبێ بە دونیاوە، ئەگەر کەمیش بێ، پەیمانمان بە یەکتر دەدا کە ئاوەڕ لە هیچ مەخلوقێك نەدەینەوەو، پشت بەهیچ زانراوێك نەبەستین، هاتینە لای گۆڕەکەی پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ و، سێ ڕۆژ ماینەوە، هیچ (فتح)ێکمان بۆ نەکرا، لە کاتێکی تردا چووینە دەرەوە تا بە (الجُحْفَةَ) گەشتین و لەوێ دابەزینو، کەسانێکی دەشتەکیش بە بەرامبەرمانەوە بوون، ئەوەبوو ئاردێکی جوانی زۆر وردیان بۆ ناردین، بۆیە کەسانێکمان تەماشای ئەویتری دەکردو، دەیگوت: ئەگەر لە ئەهلی

---

٥٦٥ _ ئەمە سوێندخواردنە بەشتێکی دیکەی جگە لە خوای تعالى، کەچی پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ فەرموویەتی: ((مَن حلف بغير الله " فقد كفر أو أشرك)). واتە ((هەرکەس بەشتێکی دیکەی جگە لە خوای تعالى سوێند بخوات، بەڕاستی کوفری کردووە، یاخود هاوەڵی بۆ خوا بڕیار داوە)).

رواه أحمد (٢ / ٥٨و٦٠)، وابن حبان (١١٧٧) " عن عُمر بسند صحيح.

وله طرق أخرى في ((السنن))، تكلمت عليها في غير هذا الموضع.

٥٦٦ _ بەبێ ئەوەی خۆی ئامادە کردبێ بە تایبەت بچێ بۆ ئەوێ، ئەگینا جایز نابێ، ئەمە ڕێباوەڕی لێکۆڵەرانی ئەهلی زانستە، وەکو پێشەوا (ابن تيمية) _ بە ڕەحمەتی خوا بێت _، وە کەسانێکی دیکەی پێش ئەم.

وانظر ((العقود الدُرِّية في مناقب شيخ الإسلام ابن تيمية)) (ص ٣٣٠ _ ٣٦١) لابن عبدالهادي.

ئەم شتە بێ ئەوا هیچ (فتح)ێکمان بۆ ناکرێ تا دەچینە حەرەم، ئاردەکەمان لە گەڵ ئاودا خواردەوەو، ئیتر ئەوە خۆراکمان بوو تا چوینە مەککە.

دەڵێم _ ابن الجوزي _: برایانم تەماشای پشتبەستنی ئەمانە بکەن چۆن وای لێکردن ئەو خواردمەنیەی فەرمانی پێکراوە لە گەڵ خۆیاندا هەڵنەگرن، تا ئەو ئاستەی ناچاری وەرگرتنی خێرو صەدەقەی خەڵکی کردن.

لەو شتە سەرسوڕمێنانەی کە پێم گەشتووە لە چوارچێوەی سەفەرەکانیاندا ئەوەیە کە لە (أبي عبدالرحمنِ السُّلميِّ)وە دەیگێڕنەوە کە گوتویەتی: پێم گەشتووە کە (أبا شُعيبٍ المُقَفَّعَ) بە پێ حەفتا حەجی کردبوو لە هەر حەجێکدا بەنیەتی عەمرەو حەجێك لە لای بەردەکەی (بيتِ المقدسِ)ەوەئیحرامی بەستبوو، بە بیابانی (تبوك)یشدا تێپەڕیوو لەسەر پشتبەستن، لە حەجی کۆتایدا، سەگێکی بەیکرد لە بەر تینویەتی زمانی دەرهێنابوو. بۆیە گوتی: کێ حەجێك بە ئاو پێدانێك دەکڕێ. گوتی: مرۆڤێك کەمێ ئاوی دایەو، سەگەکە تێر ئابوو، پاشان گوتی: ئەمە لە حەجەکەم بۆم چاکترە، چونکە پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ فەرموویەتی:

((في كُلِّ ذاتِ كَبِدٍ حَرَّى أَجْرٌ))(٥٦٧) ! واتە ((کە هەموو خاوەن جەرگێکی تێنوو ئاو دەدەی پاداشتی تێدایە)).

دەڵێم _ ابن الجوزي _: لە ڕاستیدا شتانێکی وەکو ئەمانەم بەیاد هێنانەوە، تەنها بۆ ئەوەی کەسانی ئاقڵ و ژیر ئەندازەی زانستی ئەمانە بزانن، کە چۆن لە پشتبەستن و شتی تر تێگەشتوون و، تەماشایان بکات چۆن سەرپێچی شەرع و ئەقڵ دەکەن.

خۆزگە بزانیبا ئەو کەسەی دەچێتە دەرەوەو، هیچی لە گەڵ خۆیدا هەڵنەگرتووە، چ دەکات بۆ دەستنوێژو نوێژکردن، وە ئەگەر پۆشاکەکەی بدڕێت و، دەرزی پێ نەبێ، چۆن ڕەفتار دەکات؟!

---

٥٦٧ _ رواه البخاري (٥ / ٣١)، ومسلم (٢٢٤٤) " عن أبي هريرة، بنحوه.

كەچی هەندێ لە شێخەكانیان فەرمانیان بە مرۆڤــ دەكـرد پـێش ئـەوەی سـەفەر بكـات توێشوو لە گەڵ خۆیدا هەڵبگرێت.

لە (الفَرغانيِّ)وە دەڵێت: (إبراهیمُ الخوَّاصُ) لە پشتبەستندا دڵگەرم بوو، بەووردی ئەنجامی دەدا، لە گەڵ ئەوەشدا دەرزی و دەزوو و جامێكی گەورەو مەقەستێكی پێ بوو ! پێی گـوترا: ئەی (أباإسحاقَ) ! بۆ ئەم شتانەت كۆكردۆتەوە لە كاتێكدا خـۆت قەدەغـەی هـەموو شـتێك دەكەی ؟! ئەوەبوو گوتی:

هەڵگرتنی شتانێكی وەكو ئەمە پشتبەستن بەتاڵ ناكەنەوە، چونكە خوای تعـالی چـەندین فەرزی بەسەرمانەوە هەیەو، هەژاریش لە یەك پۆشاك زیاتری لە بەردا نییە، لەوانەیە بدڕێ و كونی تێبێت ئەگەر دەرزی و دەزووی پێ نـەبێ، عـەورەتی دەردەكـەوێ و، نوێژەكـەی بـەتاڵ دەكاتەوە، ئەگەر جامێكی گەورەی پێ نەبێ ناتوانێ دەستنوێژو پاكێتیەكەی بشواتەوە، بۆیـە هەر هەژارێكت بینی جامێكی گەورەو دەرزی و دەزووی پێ نەبوو، لە نوێژەكەیـدا تاوانبـاری بكە(٥٦٨)!

---

٥٦٨ _ ئەم گوفتارە هەموو هۆكارەكانی تریش دەگرێتەوە كە فەرمانی هەڵگرتنیمان پـێ كـراوە، كـە _ بەدڵنیایی _ هەڵگرتن و بەكارهێنانیان دژبە پشتبەستن نی یە، بۆیە _ ئـەی ڕەحمـەتی خـوات لێبێـت _ تەماشای جیاوازی و لەیەك نەچونیان بكە.

## ✹ بەیادهێنانەوەی سەرلێشێواندنەکانی ئیبلیس بەرامبەر بە صوفیەکان ئەگەر لە سەفەر گەڕانەوە:

نووسەر دەفەرمێت:

لە ڕێباوەڕی قەومەکەیە کە ئەگەر ڕێبوار لە سەفەر گەڕایەوەو، چووە خەلۆتگەوەو، کۆمەڵێکی تیابوو، سڵاویان لیّ ناکات تا دەچێتە دەستنوێژگە، دەستنوێژ دەشوات و، دێت و، دوو ڕکات نوێژ دەکات و، پاشان سڵاو لە شێخ دەکات و، ئینجا سڵاو لە کۆمەڵەکە دەکات.

ئەمە لە کۆی ئەو شتانەیە کە پاشینانیان بە پێچەوانەی شەریعەتەوە دایانهێناوە، چونکە فیقهزانانی ئیسلام کۆدەنگن لە سەر ئەوەی کە ئەگەر کەسێك بە کۆمەڵێك گەشت، سوننەتە(٥٦٩) سڵاویان لیّ بکات، ئەگەر دەستنوێژی هەبیّ یاخود نەبیّ، مەگەر ئەم شتەیان لە ڕێباوەڕی منداڵانەوە وەرگرتبیّ، چونکە ئەگەر بەمنداڵ بڵێیت: بۆ سڵاومان لیّ ناکەیت ؟ دەڵێت: هێشتا دەم و چاوم نەشتووە !

یاخود پێدەچیّ منداڵان لەم بیدەعەچیانەوە فێری ئەو قسەیە بوبێتن.

وعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ _ رضي الله عنهُ _ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ _ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ _ ((لِيُسَلِّمَ الصَّغِيرُ عَلَى الْكَبِيرِ، وَالْمَارُّ عَلَى الْقَاعِدِ، وَالْقَلِيلُ عَلَى الْكَثِيرِ)).

أخرجاهُ في ((الصحيحين))(٥٧٠).

---

٥٦٩ _ کەسانێکی تری ئەهلی زانست وای بۆ دەچن کە سڵاوکردن (واجب)ەو، ئەوەیان کردۆتە بەڵگە کە پێغەمبەری خوا _ صلی الله علیه وسلم _ فەرموویەتی: ((السلام قبل الكلام، فمن بدأكم بالسؤال قبل السلام " فلا تجيبوه)). واتە: ((سڵاوکردن پێش قسەکردنە، بۆیە هەرکەسێك پرسیارێکی لیّ کردن پێش سڵاوکردن، وەڵامی مەدەنەوە)).

وهو حديث حسن بمجموع طرقه " كما حققه شيخنا في ((سلسلة الأحاديث الصحيحة)) (رقم ٨١٦).

وهو قولٌ وجيهٌ يعضُدُه الدليل.

٥٧٠ _ رواه البخاري (٦٢٣١)، ومسلم (٢١٦٠).

وهو في ((الصحيفة الصحيحة)) (رقم ٤٩ _ بتحقيقي).

واته له (أَبِي هُرَيْرَةَ)وه _ خوای لیّ ڕازی بێت _ فەرموویەتی: پێغەمبەری خـوا _ صـلی الله علیه وسلم _ فەرمووی: ((با تەمەن بچوك سڵاو له گـەوره بکـات و، کەسـی تێپـەڕیوو سڵاو له دانیشتوو بکات و، کەمیش سڵاو له زۆر بکات)).

وه له بواری سەفەرو پێوەندەکانیدا چەندەها بیدعەو داهێنراوی دیکەشیان هەیە.

## ✱ بەیادهێنانەوەی سەرلێشێواندنەکانی ئیبلیس بەرامبەر بە صوفیەکان ئەگەر کەسێکیان بمرێت:

لەم بوارەدا ئیبلیس دوو سەرلێشێواندنی هەیە:

یەکەم: ئەوان دەڵێن: نابێ بۆ کەسی مردوو بگریت و، هەرکەس بۆ کەسێکی مردوو بگریی، لە ڕێبازی ئەهلی زانست و مەعاریف چۆتە دەرەوە.

(ابنُ عَقیلٍ) دەڵێت: ئەمە بانگەشەیەکەو بەسەر شەرعەوە شتێکی زیادە، لە فەرموودەکەی (خُرافةٍ)(٥٧١) دەچێت، لە نەریت و خووی مرۆڤ بەدەرەو، لادانە لە میزاجی

---

٥٧١ _ ئەمە پەندێکە ((بۆ هەموو ئەو فەرموودانە بەکاریدەهێنن کە بەدرۆی دادەنێن، هەروەها بۆ هەموو شتێك کە بەزێباو جوان و سەرسوڕمێن بێتە پێش چاو بەکاری دێنن))، وەکو ئەوەی (ابنُ الأثیر) لە کتێبی ((النهایة في غریب الحدیث و الأثر))دا (٢ / ٢٥) باسی کردووە. وأصلُهُ ما رواه الترمذيُّ في ((الشمائل)) (رقم ٢١٤)، وأحمد (١٥٧/٦)، والمصنِّفُ في ((العلل المتناهیة)) (رقم ٤٩) " مِن طریق مُجالد بن سعید عن عامر عن مسروق عن عائشة قالت:

حدَّث رسولُ الله _ صلى الله علیه وسلم _ ذات لیلةٍ نساءَه، فقالتِ امرأةٌ منهنَّ: یا رسولَ الله ! هذا حدیثُ خُرافة، فقال:

((أتدرینَ ما خُرافةُ ؟ كان رجلاً من عُذْرَة أسَرَتْهُ الجِنُّ، فمكث فیهم دهراً، ثم ردُّوه إلى الإنس، فكان یُحَدِّث الناسَ بما رأى فیهم من الأعاجیب، فقال الناسُ: حدیث خُرافة)).

واتە لە خاتوو (عائشةَ)ەوە فەرموویەتی:

شەوێك پێغەمبەری خوا _ صلى الله علیه و سلم _ باسێكی بۆ خێزانەكانی گێڕایەوە، ئەوەبو ژنێكیان فەرمووی: ئەمە باسەكەی (خُرافە)یە، پێغەمبەری خواش _ صلى الله علیه و سلم _ فەرمووی:

((ئایا دەزانی (خُرافةُ) چی یە ؟ (خُرافةُ) پیاوێك بوو لە هۆزی (عُذْرَة) لە لایەن جنەوە بە دیل دەستبەسەركراو، ماوەیەك لایان مایەوە، پاشان گەڕاندیانەوە بۆ ئینس و، ئیتر ئەوەی بینیبوی لە شتە سەرسوڕمێنەكانی نێویان بۆ خەڵكی باس دەكردن، ئیتر خەڵكیش دەیانگوت: باسەكەی (خُرافە))).

قال ابنُ كثیر في ((البدایة والنهایة)) (٦ / ٤٧):

((وهو من غرائب الأحادیث، وفیه نكارةٌ، ومُجالدُ بن سعید " یتكلَّمون فیه)).

قلتُ: وهو الصوابُ " خلافاً لما قاله الهیثميُّ في ((المجمع)) (٤ / ٣١٥) بعد أنْ زاد نسبتَه للبزَّار وأبي یعلى:

((رجال أحمد ثقات، وفي بعضهم كلامٌ لا یضرُّ)) !

وله طریقٌ أُخرى عند المصنِّف في ((العِلَل)) (رقم ٤٨)، وابن حبان في ((المجروحین)) (٢ / ٩٧).

وفي سنده راوٍ متروكٌ. فلا یزیدُ الحدیثَ إلا وَهَناً !

نێوەند، بۆیە بەڕاستی پێویستە بەو دەرمانانە چارەسەر بکرێت کە میزاجی مرۆڤ چاك دەکەنەوە، چونکە خوای تعالی هەواڵی پێغەمبەرێکمان بۆ باس دەکات و، دەفەرمێت: ﴿وَابْيَضَّتْ عَيْنَاهُ مِنَ الْحُزْنِ فَهُوَ كَظِيمٌ﴾ ﴿یوسف: ٨٤ ﴾ واتە ﴿ وَابْيَضَّتْ عَيْنَاهُ مِنَ الْحُزْنِ﴾ وە هەردوو چاوی سپی (و کوێر) بوون لە داخ و خەفەتدا ﴿ فَهُوَ كَظِيمٌ ﴾ چونکە هەر داخ و خەفەتی خۆی دەخواردەوە (٥٧٢).

هەروەها خوای تعالی دەفەرمێت: ﴿ يا أَسَفَى على يُوسُفَ ﴾﴿ یوسف: ٨٤ ﴾ واتە وتی ئاخ و داخ بۆ یوسف(٥٧٣).

وە پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ لە کاتی مردنی کوڕەکەیدا گریاو، فەرمووی:

((إِنَّ العينَ لَتَدْمَعُ))(٥٧٤). واتە ((بەڕاستی چاوەکان فرمێسك دەڕێژن)).

وقالتْ فاطمةُ _ رضيَ الله عنها _ واكَرْبَ أبتاهُ. فلم يُنْكِرْ(٥٧٥(واتە (فاطمةُ) _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرمووی: داخەکەم بۆ ئەو خەم و خەفەت و قورسی و ناڕەحەتیەی بابم. بەڵام نکۆڵیشی لێنەکردا.

پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ بەعەیبی داناوە مرۆڤ لە دۆخی خووی سروشتی بچێتە دەرەوە، فقالَ للذي قالَ: لم أُقَبِّلْ أحداً مِن وَلَدي _ وكانَ لهُ عشرةٌ من الولدِ_، فقالَ:

((أوَ أَمْلِكُ لكَ إنْ نزعَ الله الرحمةَ مِن قلبِكَ))(٥٧٦).

واتە کاتێ هاوەڵێکی خۆی فەرمووی: هیچ منداڵێکی خۆمم ماچ نەکردووە _ کە دە منداڵیشی بوو _ پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم پێی فەرموو:

((ناتوانم ڕەحمەت و بەزەی بخەمە دڵتەوە ئەگەر خوای تعالی لایبردبێ)).

---

٥٧٢ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

٥٧٣ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

٥٧٤ _ رواه البخاري (٣ / ١٣٩)، ومسلم (٢٣١٥) " عن أنس.

٥٧٥ _ رواه البخاري (٤٤٦٢) عن أنس _ رضي الله عنه _.

٥٧٦ _ رواه البخاري (١٠ / ٣٦٠)، ومسلم (٢٣١٧) " عن عائشة _ رضي الله عنها.

بۆیه ئەو کەسەی کاروکردەوەیەك ئـەنجام دەدات کـە لـە چوارچـێوەی شـەرع بـەدەربێ و، تەبیعەت حەزی پێی نەبێ: نەفامەو، بەنافامی کردەوەکـان ئـەنجام دەدات، شـەرع فـەرمانی پێکردوین لـە دەم وچـاو نـەدەین و، یەخـە نـەدڕین، بـەڵام فرمێـسکێکی ڕژاو و، دەڵێکـی خەمبارو تەنگ، هیچ عەیب و عارێکی تێدا نییە.

سەرلێشێواندنی دووەم: لە کاتی مردنی کەسەکەدا زیافەتێك دروست دەکەن و، بـە شـایی ناوی دەبەن، گۆرانی تێدا دەڵێن و، سەما دەکەن و، یاری دەکەن و، دەڵێن: بۆ مردوەکە خۆشی دەکەین چونکە بە پەروەردگاری گەشتووە.

لەم بوارەدا ئیبلیس لە سێ ڕۆوە سەریان لێ دەشێوێنێت:

یەکەمیان: سـوننەت وایـە بـۆ مـاڵی مردۆکـە خـواردن دروسـت بکرێـت، چـونکە بـەو کارەساتەوە سەرقاڵ بوونەو، توانای ئەوەیان نییە خۆراك بـۆ خۆیـان دروسـت بکـەن، کەچـی سوننەت ئەوە نییە ماڵی مردوو خۆراك بۆ ئامادەبوان دروست بکەن.

بنەڕەتی دروستکردنی خۆراك بۆ ئەو ماڵەی کەسێکیان مردووە ئەم فەرموودەیە:

عن عبدالله بنِ جعفَر أنَّه قال: لما جاءَ نعيُّ جعفرٍ، فقالَ النبـيُّ _ صلى الله عليه وسلم: ((اصْنَعوا لآلِ جعفرٍ طعاماً " فإِنَّهُ قد جاءَهُم ما يَشْغَلُهُم))(٥٧٧).

---

٥٧٧ _ أخرجه أبوداود (٣١٣٢)، والترمذي (٩٩٨)، وابن ماجة (١٦١٠)، وأحمد (١ / ٢٠٥).
وفي سنده راوٍ لم يوثِّقه إلا ابن حبان.
ولكن له شاهداً أشار إليه شيخنا الألباني في ((أحكام الجنائز)) (ص ١٦٨) " قوَّاه به.
ثم رأيت في حاشية ((تهذيب الكمال)) (٨ / ٧٨) أن ابنَ خَلْفون وثقه أيضاً.
وفي ((الميزان)) (١ / رقم ٢٤٢٣) كأن الذهبيَّ مال إلى تحسين سنده لذاته.
فائدة:
اسم كتاب ابن خَلْفون في الثقات: ((المنتقى في أسامى الأئمة المرضيين، والثقات المحدِّثين، والرواة المشتهرين، من التابعين فَمن بعدهم)) " كما في ((برنامج التُّجيبي)) (ص٢٦٠)، ثم قال:
((وهذا الديوان أحد الدواوين المفيدة في بابه، وقد أوقفتُ عليه ((قاضي القضاة)) (!) الإمام المفتِّ ابن دقيق العيد _ رحمه الله _، فاستحسنه، وكتبه من عندي)).
وهذه فائدة مهمة، ما أحببت تفويتها هنا.
والله الموفق.

واته له (عبدِاللهِ)ی كـوڕی (جعفَـر)ەوه _ خـوای لـیٚ ڕازی بیٚـت _ فەرموویـەتی: كـاتیٚ هەواڵی مردنی (جعفرٍ) گەشت، پیٚغەمبەری خوا _ صلی الله علیه وسلم _ فەرمووی:

((بۆ خاوخیٚزانی (جعفَر) خواردن دروست بكەن، چونكە كارەسـاتیٚك ڕووی تیٚكـردوون كـه سەرقاڵی كردوون)).

دووەم: خۆشی بۆ مردوو دەكەن و، دەڵیٚن: بە پـەروەردگاری خـۆی گەشـت، كەچـی هـیچ ڕوویكی گونجاو نیه بۆ شادومانبوون، چونكە ئیٚمە دڵنیانین لەوەی كە ئایا خوای تعـالی لیٚـی خۆش بووه؟، شادومانبوون چ سوودیٚكی دەبیٚ ئەگەر لە سزادراوان بیٚت، (عمرُ)ی كـوڕی (ذَرّ) كاتیٚ كوڕەكەی مرد گوتی:

دڵنیابە ئەوەندە خەم و خەفتم بۆ خواردیٚت بۆ ئەوەی كە نازانم لە لیٚخۆشبوانی یـاخود لـە سزادراوانی كە سەرقاڵی كردم و نەیهیٚڵا خەفەت بۆ مردنت بخۆم كە بەجیٚت هیٚـشتین و لیٚمـان جیابویتەوه.

لە (أُمِّ العلاءِ)ەوە دەڵیٚت: كە (عُثمانُ)ی كوڕی (مَظْعـونٍ) مرد، پیٚغەمبەری خوا _ صـلی الله علیه وسلم _ سەردانی كردین، منیش گوتم: ڕەحمەتی خوات لیٚ بیٚ ئەی (أبـا الـسائبِ) ! شایەتی دەدەم كە بەڕاستی خوای تعالی ڕیٚزی لـیٚ گرتیـت. ئـەوەبوو پیٚغەمبـەری خـواش _ صلی الله علیه وسلم _ فەرمووی:

((وما يُدْرِيكِ أنَّ الله أكْرَمَهُ ؟))(٥٧٨).

واته ((چۆن دەزانیت خوای تعالی ڕیٚزی لیٚ گرت؟)).

سیٚ یەم: ئەوان لەو زیافەتەدا سەماو یاری دەكـەن، بـەو ڕفتـارەش لـە خـووی سروشـتی تەندروست دەچنە دەرەوە كە ئەو جیابوونەوەیە كاری تیٚدەكات.

پاشان ئەگەر مردووەكەیان لەوانە بیٚت كە خوای تعالی لیٚ بواربیٚت، ئەوا نابیٚ بە سـەماو یاریكردن سوپاسگوزاری دەربڕن ! وە ئەگەر سزادراویش بیٚت ئەوا خـەم و خەفـەت چ سـوودو كاریگەریەكی دەبیٚت؟!

---

٥٧٨ _ رواه البخاري (١٢٤٣).

## ✸ به یادهێنانەوەی سەرلێشێواندنەکانی ئیبلیس بەرامبەر بە صوفیەکان سەبارەت بەوەی کە واز لە فێربوونی زانست دەهێنن:

نووسەر دەفەرمێت:

بزانە یەکەم سەرلێشێواندنەکانی ئیبلیس بەرامبەر بە صوفیەکان ئەوەیە کە لە فێربوونی زانست قەدەغەیان دەکات، چونکە زانست ڕووناکیە، بۆیە ئەگەر چراکانیان کوژایەوە، ئیتر بە ئارەزووی خۆی لە گەڵ تاریکی و نەفانیدا تێکیان دەدات.

لەم بوارەدا ئیبلیس لە چەندین دەروازەوە سەر لە صوفیەکان دەشێوێنێت:

یەکەمیان: ئیبلیس لە بنەڕەتەوە جەماوەری صوفیەکانی لە فێربوونی زانست قەدەغە کردووە، وای بە خەیاڵدا هێناون کە ئەم کارە پێویستی بە هیلاکی و ماندویەتی هەیە، بۆیە حەوانەوەی بێ قرەو مشەی بۆ ڕازاندنەوەو، (مُرَقَّعة)یان پۆشی و، لە سەر ڕاخەری بێکاری دانیشتن.

لە پێشەوا (الشافعيِّ)وە _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی: تەصوف لە سەر تەمبەڵی بونیاد نراوە.

ڕوونکردنەوەی گوفتارەکەی پێشەوا (الشافعيِّ) ئەوەیە کە خواستی دڵ: سەرکردایەتیە، یاخود بەدەستهێنانی دونیایە.

ئیبلیس وای بە خەیاڵدا دەهێنان کە بەدەستهێنانی دونیا لە ڕێگەی فێربوونی زانستەوە درێژە دەکێشێ و، جەستە ماندوو دەکات، دوای ئەوەش لەوانەیە خواستەکەت بە دەست بێت یاخود بە دەست نەیەت ؟!

صوفیەکان پەلەی سەرکردایەتی و _ چونکە بەچاوی زوهدەوە تەماشا دەکەن _ بەدەستهێنانی دونیایان کرد، چونکە خێرا دەستیان دەکەوێت.

لە (أبي حفص)ی کوڕی (شاهينَ)ەوە دەڵێت: تاقمێك لە صوفیەکان زەمی زاناکانیان کردو، وای بۆ دەچوون کار بە زانست کردن بێکاریەو، گوتیان: زانستەکانی ئێمە بەبێ واسیتە دەستمان دەکەوێت، لە ڕاستیدا وایان بەدیکرد کە ڕێگای فێربوونی زانست دوورە، بۆیە

پۆشـاكەكانیان كـورت كـردەوەو، جوبـەكانیان پینـەكردو، گۆزەڵـە ئاوەكانیـان هـەڵگرت و، زوهدیان بەدەرخست.

دووەم: تاقمێكیان بە فێربوون زانستێكی كەم ڕازی بوون، بۆیە فـەزڵ و چـاكەی فێربوونـە زۆرەكەیان لە دەست چوو، وە بە فێربوونی (أطراف الأحاديـث) ڕازی بـوون، ئێبلـیس وای بـە خەیاڵدا هێنان كە (إسـناد العـالي)و دانیـشتن بـۆ فێربـوونی فـەرمووده هـەر هـەمووی بـۆ سەركردایەتی و دونیایە، وە نەفس لەوەدا چێژو لەزەت وەردەگرێ.

ئەم سەرلێشێواندنە بەوە ڕوون دەبێتەوە كە هەر پلەیەكی بەرز، مەگەر فەزیلەت و چـاكەو مەترسی تێدایە، چونكە ئەمیرایەتی و دادوەری و فەتوادان هەرهەمووی مەترسیەو، نەفسیش لەزەتی لێ وەردەگرێ، بەڵام لە هەمان كاتدا فەزیلـەت و چـاكەیەكی زۆر گەورەیـە، نموونـەی وەكو دڕكە بەتەنیشتی گوڵەوە، بۆیە پێویـستە داوای فەزیلـەت و چـاكەكەی بكرێـت و، لـە هەمان كاتیشدا خۆت لە بەڵاكانی بپارێزیت.

بەڵام ئەو حەزپێكردنی سەركردایەتیەی كە لە نەفسدایە، لـە ڕاسـتیدا خـوای تعـالی بـۆ ئەوەی داناوە كە فەزیلەت و چاكەی پێ بەدەست بهێنرێت، وەكو چۆن حەزپێكردنی جووتبوون بۆ بەدەستهێنانی منداڵ دانراوە، بە هەمان شێوە بە زانست وەرگرتن مەبەسـتی زانـا ڕاسـت دەبێتەوە، وەكو ئەوەی (یزیدُ)ی كوڕی (هارونَ) دەڵێت:

بۆ شتانێكی دیكەی جگە لە خوای تعالی زانست فێربوین، بەڵام بەوە قایل بوو كە تـەنها بۆ خوا بێت.

مەبەستی ئەوەبوو كە زانست فێربوونەكە ڕێگەی دڵسۆزی پێ پێـشان دایـن، بـەڵام هـیچ كەس ناتوانێ نەفسی خۆی ناچار بكات كە هەسـتێ بـە بـڕین و لادانـی ئـەوەی لـە خـووی سروشتی مرۆڤدا خولقێنراوە.

سێ یەم: وای بە خەیاڵی تاقمێكیاندا هێنا كە مەبەسـت تـەنها كردەوەیـەو، تێنەگەشـتن لەوەی كە ئەگەر كار بۆ زانست كـرا واتـە بـەرزترین ئاسـتی كردەوەكـان بـەجێهێنراوە، پاشـان

ئەگەر زانا رەوشی کردەوەکانیشی کورت بیّ، بەلاّم لە سەر ڕێگەی ڕاستە، کەچی کەسێك کە بەبیّ زانست خواپەرستی دەکات، لە سەر ڕێگەی ڕاست نییە.

چوارەم: وای بەخەیاڵی تاقمێکی زۆریاندا هێنا کەوا زانا ئەو کەسەیە (علم الباطن) دەزانیّ، تا ئەو ئاستەی کەسێکیان خەیاڵ و ئەندێشەیەکی بە دڵدا دیّ و، دەڵێت: دڵم لە پەروەردگارمەوە بۆی باسکردم !

(الشِّبْليُّ) دەڵێت:

إذا طَلَبونِي بعِلْمِ الوَرَقْ

بَرَزْتُ عليهِمْ بِعلْمِ الخِرَقْ

واتە:

ئەگەر بەزانستی سەر کاغەز داوایان لێکردم

منیش بە زانستی پارچە پۆشاکە پینەکراوەکان بەسەریاندا سەردەکەوم

ئەوان زانستی شەریعەتیان بە (علم الظاهر) ناو ناوەو، خەیاڵات و ئەندێشەی نەفسیش بە (علم الباطن) دادەنێن، ئەوە دەکەنە بەڵگە کە پێشەوا (عليُّ) کوری (أبي طالبٍ) _ كرَّم الله وجهَهُ[٥٧٩] _ لە پێغەمبەری خواوە _ صلى الله عليه وسلم _ دەیگێڕێتەوە کەوا فەرموویەتی:

((علمُ الباطنِ سِرٌّ من سرِّ الله عز وجلَّ، وحُكْمٌ مِن أحكامِ الله تعالى، يقذفُهُ الله عزَّ وجلَّ في قلوبِ مَن يشاءُ مِن أوليائِه)).

واتە فەرموویەتی: ((زانستی ناوەکی نهێنییەکە لە نهێنییەکانی خوای _ عزوجلَّ _، وە حوکمێکە لە حوکمەکانی خوای تعالی، بە ویستی خۆی دەیخاتە دڵی کاسانێکەوە لە وەلیەکانی خۆی)).

---

٥٧٩ _ بنەرەتی تایبەتکردنی هاوەڵ و پێشەوای بەرێز (عليُّ) کوری (أبي طالبٍ) بە دەستەواژەی (كرَّم الله وجهَهُ) بۆ شیعەکان دەگەرێتەوە، بۆیە پێویستە ئەهلی سوننەت ئەوە بەکارنەهێنن و، مامەڵەیەکی لە گەڵدا بکەن بە هاوشێوەی مامەڵەکردن لە گەڵ هاوەڵانی دیکەدا _ خوا لە هەموویان ڕازی بێت _.

هەروەها لەم بارەوە بڕوانە کتێبی ((معجم المناهي اللفظية)) (ص٢٧١) دانانی شێخ (بكر أبوزيد).

نووسەر دەفەرمێت:

ئەم فەرموودەیە هیچ بنەڕەتێکی دروستی لە پیغەمبەری خواوە _ صلى الله عليه وسلم_ نییەو، (إسناد)ەکەشی چەندین کەسی نەناسراوی تێدایە(٥٨٠).

لە (أبي موسى)وە دەڵێت: لە ناوچەکەی (أبايزيدَ)دا پیاوێکی فیقهزان هەبوو کە زانای ئەو ناوچەیە بوو، ئەوەبوو چووە دیدەنی (أبايزيدَ)و، پێی گوت: چەندەها شتی سەرسوڕمێنی تۆیان بۆ گێڕاومەتەوە ! (أبويزيدَ)یش پێی گوت: شتە سەرسوڕمێنەکانی دیکەم زۆرترە کە نەتبیستووە. پێی گوت: ئەی (أبايزيدَ) ئەم زانستەت لە کێ و، لە کوێ و، لە چیەوە فێربویت؟ (أبويزيدَ)یش گوتی: زانستەکەم لە بەخشینەکانی خوای تعالایەو، لەوەوەیە کە پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ فەرموویەتی:

((مَن عَمِلَ بما يعلَمُ وَرَّثَهُ الله علمَ ما لم يَعْلَم))(٥٨١). هەروەها لەوەوەیە کە فەرموویەتی: ((العلمُ علمانِ: علمٌ ظاهرٌ، وهو حُجَّةُ الله تعالى على خلقه، وعلمٌ باطنٌ، وهو العلمُ

---

٥٨٠ _ رواه المصنِّف في ((العلل المتناهية)) (١ / ٧٤)، وقال:

((لا يصح، وعامة رواته لا يُعرفون)).

ونقل ابن عراق في ((تنزيه الشريعة)) (١ / ٢٨٠) عن الذهبي في ((تلخيص الواهيات)) قوله:

((هذا باطل)).

ومع ذلك، أورده السيوطي في ((الجامع الصغير)) (٥٤٧٣) مقتصراً على ضعفه !

وتابعه المناويُّ في ((فيض القدير)) (٤ / ٣٢٦).

وأودعه شيخنا ((السلسلة الضعيفة)) (رقم ١٢٢٧) جازماً بوضعه.

٥٨١ _ هو في ((حلية الأولياء)) (١٠ / ١٤ _ ١٥) لأبي نُعيم بإسناده، ثم قال:

((ذكر أحمد بن حنبلٍ هذا الكلام عن بعض التابعين، عن عيسى ابن مريم _ عليه السلام _، فوهم بعضُ الرواة أنه ذكره عن النبي _ صلى الله عليه وسلم _، فوضع هذا الإسناد عليه " لسهولته وقربه، هذا الحديث لا يُحتمل بهذا الإسناد عن أحمد بن حنبل)).

قال شيخنا في ((الضعيفة)) (رقم ٤٢٢):

((وفي الطريق إليه جماعة لم أعرفهم، فلا أدري مَن وضعَهُ منهم)).

النافعُ))([٥٨٢]). ئەی شێخ زانستەکەی تۆ وەرگیراوە لە زمانێکەوەو لە زمانی فێرکردنەوە، بەڵام زانستەکەی من لە لایەن خواوەیە کە بە نیگاو ئیلهام پێی بەخشیوم. ئەوەبوو شێخ پێی گوت: زانستەکەی من لە کەسانێکی باوەڕپێکراوەوەیە(الثقات) ئەوانیش لە پێغەمبەری خواوە _ صلى الله عليه وسلم _ وەریان گرتووەو، ئەویش لە (جبريل)ەوەو، ئەویش لە خوای تعالاوە وەریگرتووە. (أبويزيد)یش پێی گوت: ئەی شێخ ! پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ زانستێکی لە لایەن خوای تعالاوە پێدرابوو، کە نەیهێڵابوو نە (جبريل) و نە (ميكائيلُ)یش لێی بە ئاگابن. ئەویش گوتی: بەڵێ. بەڵام دەمەوێ ئەو زانستەی تۆ کە دەڵێی لە لایەن خواوەیە لام ڕوون بێتەوە بەشێوەیەکی ڕاست. گوتی: بەڵێ باشە، بۆتی ڕوون دەکەمەوە، بەو ئەندازەیەی کە زانینی لە دڵتدا جێگیر بێت.

پاشان گوتی: ئەی شێخ ! تۆ دەزانی خوای تعالى بە دواندن لە گەڵ (موسى)دا دواو، بەڕوو بە ڕووبونەوە([٥٨٣]) لە گەڵ (محمد)یشدا دوا، وە دەزانی کە خەونی پێغەمبەران سرووشە! ئەویش گوتی: بەڵێ. ئینجا گوتی: ئایا نەتزانیوە کە قسەی ڕاستگۆیان و وەلیەکان بە نیگایەکە لە خواوە، سوودەکانیشی لە دڵانی خۆیانەوەیە، تا دانایی و حیکمەتی خستە سەر

---

٥٨٢ _ وهو حديث موضوع.

أخرجه المصنِّف في ((العلل المتناهية)) (١ / ٧٣) من طريق الديلمي (٤١٩٤).

وانظر لتمام الكلام عليه ((تخريج الأربعين السلمية في التصوف)) (رقم ٧ _ بتحقيقي) للسخاوي.

٥٨٣ _ ئەمە ڕاست نی یە.

قالت السيدة عائشة _ رضي الله عنها _:

((مَن حدَّثكم أن محمداً قد رأى ربَّه " فقد أعظم على الله الفِريَةَ)) واتە خاتوو (عائشە) _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی: ((هەرکەس بۆی باسکردن کە (محمد) پەروەردگاری خۆی بینیوە، دڵنیابن درۆیەکی مەزنی بۆ خوا هەڵبەستووە)).

رواه البخاري (٤٨٥٥)، ومسلم (١٥٧).

وانظر ((الوصية الكبرى)) (ص ٣٨ _ ٤٠ _ بتحقيقي) لشيخ الإسلام ابن تيمية _ رحمه الله.

زمانیان و، وای لێکردن سوود به ئومەت بگەینن، ئەوەی پشتگیری قسەکانم دەکات ئەوەیە: کە خوای تعالی نیگای (إلهام) بۆ دایکی (موسی) کرد بیخاتە نێو تابوتەکەوە، ئەوەبوو خستیە نێوی، هەروەها لە کەشتیەکەو مندالّەکەو دیوارەکەدا نیگای بۆ (الخَضِرَ) کرد، وە دەربارەی (موسی) پێغەمبەر فەرمووی: ﴿ وما فَعَلْتُهُ عن أمْري ﴾﴿ الکهف: ٨٢ ﴾ واتە ئەو (شتانەی) کردم لە خۆمەوە نەبوو(٥٨٤).

دەگێڕنەوە کەوا کەسانێکیان لە مەجلیسەکەی (أبویزیدَ)دا ئامادە دەبوون، لە نێو خەڵکیشدا ئەو قسانە باو بو کە دەیانگوت: فلاّن کەس چاوی بە فلاّن کەس کەوت و، لە زانستکەی وەرگرت و، زۆری لێوە نووسی و، فلاّن کەسیش فلاّن کەسی بینی. ئەوەبوو (أبویزیدَ)یش بە موریدو ئامادەبوانی مەجلیسەکەی خۆی دەگوت: کە بەدبەختن، زانستەکەیان لە مردۆوەو لە مردۆوە وەرگرتووە، بەڵام ئێمە زانستەکەمان لە زیندویەکەوە وەرگرتووە کە نامرێ.

دەڵێم _ ابن الجوزي _: ئەم فیقهەی لە باسەکەی یەکەمدا دەری بڕیوە، کەمی زانست دەنوێنێ، چونکە ئەگەر زانا بوایە، بەدڵنیایی دەیزانی کە نێگاکردن بۆ شتێك دژبە زانست نییە، نکۆڵیی لەوە ناکرێت کە خوای _ عزَّوجلَّ _ بۆ کەسانێك لە بەندەکانی خۆی نیگا دەکات، وەکو ئەوەی پێغەمبەری خوا _ صلی الله علیه وسلم _ فەرموویەتی:

((إِنَّ في الأممِ مُحَدَّثِينَ، وإنْ يكُنْ في أُمَّتي " فَعُمَرُ))(٥٨٥).

واتە ((لە ئومەتاندا کەسانێك هەن نیگای خەیریان بۆ دەکرێت، وە ئەگەر لە ئومەتەکەی منیشدا کەسێك هەبێ، (عُمَرُ)ە)).

---

٥٨٤ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

٥٨٥ _ حدیث صحیح.

انظر تخريجه والوجه الصحيح في شرحه وبيانه في كتابي ((الكشف الصريح عن أغلاط الصابوني في صلاة التراويح)) (رقم ٣٨).

مەبەست بە وشەی (مُحَدَّثِينَ) لە فەرمودەکەدا واتە نیگای خەیر، بەڵام ئەگەر کەسێك نێگایەکی بۆ کراو(٥٨٦) پێچەوانەی زانست بوو، ئەوا کارپێکردنی جایز نابێ و، لەم بارەدا نیگاکەی شەیتانی دەبێ نەك رەحمانی!

بەڵام (الخَضِرُ)، بەپێی گوتەو رای بەهێزترو پەسەندتر پێغەمبەر بووە(٥٨٧)، نکۆڵیی لەوەش ناکرێت کە پێغەمبەران لە تواناياندايە بەرێگەی سرووش دەرەنجامەکان بزانن.

نیگاش هیچ پەیوەندیەکی بە زانستەوە نییە، بەڵکو تەنها بەرووبومی زانست و لە خوا ترسانە، بۆیە ئەو کەسەی ئەو دوانەی تێدا کۆبویەوە ئەوا خوای تعالی سازیاری هەموو خەیرێکی دەکات و، نیگای رێی راست و کاملی ئاوەزو هۆشی بۆ دەکات.

بەڵام سەبارەت بەوەی واز لە زانست بهێنرێت و، بڵێت: پشت بە نیگاو ئەندیشە دەبەستم، ئەمە هیچ نییە، چونکە ئەگەر زانستی گواستراوەو نوسینەوە نەبوایە، نەماندەزانی ئەوەی کە کەوتۆتە دڵمانەوە، ئایا نیگایەکی خەیرە، یاخود گومان و دودڵیەکەو لە لایەن شەیتانەوەیە ؟

ئەوەش بزانە کە ئەو زانستەی بەنیگا دەخرێتە دڵەوە ئەوەندە نییە کە چیتر پێویستت بە زانستی گواستراوەو نوسراوە نەبێ، هەروەها زانستی ئەقڵیش ئەوەندە نییە چیتر پێویستت بە زانستی شەرعی نەبێ، چونکە زانستی ئەقڵی وەکو خۆراکەو شەرعیش وەکو دەرمان و چارەسەرە، هیچ کامیان جێگەی ئەویتریان ناگرێتەوە.

---

٥٨٦ _ کەوابوو ئەمە نیگایەکی شەیتانیە، وەکو ئەوەی پێشەوا (ابن تيمية) لە کتێبی (الفرقان بين أولياء الرحمن وأولياء الشيطان)دا بەدرێژی باسی کردووە.

٥٨٧ _ ئەمە راستە کە هیچ گومانی تێدا نی یە، وەکو ئەوەی پێشەوا (ابن حجر) لە کتێبی (الزَّهْر النَّضْر))دا بەدرێژی باسی کردووە.

دانەریش لەم بارەوە کتێبێکی هەیە " بە گوتەی ئەو کەسانەی ژیانامەکەیان نووسیووە.

هەروەها برامان شێخ (بكر أبوزيد) سەبارەت بە گوتەو رای بەهێزترو پەسەندتری پێغەمبەرێتی (الخَضِر) گوفتارێکی چاکی نوسیوە لە کتێبەکەیدا (التحذير من مختصرات محمد الصابوني في التفسير)) با تەماشا بکرێت.

وه ئەو قسەیەشی کە دەڵێت: ((زانستەکەیان لە مردۆوەو لــە مــردۆوە وەرگرتــووە)): ئــەو گوفتارەی شیاوبێ بۆ وەڵامدانەوەی ئــەم قــسە چــەوتەی ئەوەیــە کــە نــەیزانیوە قــسەکەی چ مانایەکی تێدایە، چونکە ئەمە تانەدانە لە شەریعەت.

(أبوحفصٍ)ی کوڕی (شاهینَ) دەڵێت: کەسانێك لــە صــوفیەکان وای بــۆ دەچــوون کــە خــۆ سەرقاڵ کردن و فێربوونی زانــست بێکاریــەو، دەیــانگوت: ئێمــە زانــستەکەمان بــەبێ هــێچ نێوەندکارو واسیەتەیەك وەردەگرین.

دەڵێت: پێشینانی تەصوف پێشەنگ بوون لە قورئان و فیقهو فەرموودەو تەفسیردا، بــەڵام پاشینانیان بێکاریان بەدڵ بوو.

(أبوحامدِ الطوسيُّ) دەڵێت: ئەوە بزانە کە ئەهلی تەصوف هەواداری ئیلاهیەت بوون بەبێ فێربوون، بۆیە فێرنەبوون و، سوور نەبوون لە سەر فێربوون و، وەرگرتنی ئــەو زانــستانەی کــە زانایان لە کتێبەکاندا نووسیویانەتەوە، بەڵکو گوتیان: ڕێگەکە ئەوەیە کە مرۆڤ بەرامبەر بە نەفسی خۆی تێکۆشێت بۆ ئەوەی سیفاتە خراپ و زەمکراوەکان لــە ســەر خــۆی بــسڕێتەوەو، هەموو پەیوەندیە دونیایەکان ببچڕێنێت و، بەو پەڕی هیمەتەوە ڕوو لە خوای تعــالی بکــات، بەوەی مرۆڤ خەمی خاوخێزان و ماڵ و منداڵ و زانست ببچڕێنێت و، نەفسی خۆی گۆشــەگیر بکات و، تەنها فەرزو سوننەتەکان بەجێبێنێت و، هیمەتەکەی جــووت نــەکات بــە خوێنــدنی قورئان و، تێڕوانینی نەفسی خۆی و، نوسینی فەرموودەو شتی ترو، بەردەوام بڵێت: الله، الله، الله(٥٨٨)... تاوەکو دەگاتە باروحاڵێك واز لە جوڵاندنی زمــان دەهێنرێــت و، پاشــان وێنــای گوتن لە سەر دڵ لادەچێت!!

---

٥٨٨ _ ئەم زیکرە بەم شێوە بیدعەیەو، زانایان و پیاوچاکانی ئومەت نەیانزانیووە، وەکو ئــەوەی پێــشەوا (ابن تيمية) لە کتێبی: (العبودية)دا (ص ١٥٨ _ ١٥٩) باسی کردووە.

نووسەر دەفەرمێت:

بەلامەوە سەختە ئەم قسانە لە كەسێكی فیقهزانەوە دەرچێت، چونكە ناشیرینیەكەی شارەوە نییە، لە ڕاستیدا ئەمە پێچینەوەی ڕاخەری شەریعەتە كە مرۆڤی هانداوە بۆ جوان خوێندنی قورئان و، فێربوونی زانست.

زانا بەڕێزەكانی وەڵاتانم بینی لە سەر ڕێباوەڕی ڕاستی شەریعەت بوون و، بەو ڕێگەیدا نەدەچوون، بەڵكو یەكەم جار خۆیان بەكارپێكردن و وەرگرتنی زانستەوە سەرقاڵ دەكرد.

بەپێی ئەوەی (أبوحامدِ) ڕێكی خستووە ئیتر نەفسی مرۆڤ لە گەڵ ئەندیشە خراپەكان و خەیاڵاتیدا تاك دەبێتەوەو، ئەوەندە زانستی پێ نابێ ئەو شتانەی پێ دوربخاتەوە، بۆیە ئیبلیس بە ئارەزووی خۆی یاری پێ دەكات و، بە ئاخاوتن و بەنهێنیش ئەندیشەی خراپ و خەیاڵاتی پیشان دەدات.

نكۆڵیی لەوە ناكەین كە ئەگەر دڵ پاك بویەوە، نورو ڕوناكی هیدایەت و ڕێنمونی تێ دەڕژێت و، بە نووری خوا(٥٨٩) تەماشا دەكات، بەڵام مەرج ئەوەیە كە پاكردنەوەكەی بە پێی داواكاری و پێویستیەكانی شەرع بێ، نەك بەوەی كە دژبە شەرع بێ، چونكە برسێتی زۆرو، كات بە خەیاڵاتەوە كوشتن، شتانێكە شەرع قەدەغەی كردووە، بۆیە هیچ سوودێك لە دانەری شەرعەوە دەستگیر نابێ، ئەگەر كار بەو شتانە كرا كە قەدەغەی كردبوو.

پاشان هیچ دژایەتیەك لە نێوان زانست و تێكۆشان بەرامبەر بە نەفسدا نییە، بەڵكو زانست مرۆڤ فێر دەكات چۆن تێكۆشێت بەرامبەر بەنەفسی خۆی و، یارمەتی دەدات نەفسی ڕاست بكاتەوە.

---

٥٨٩ _ واتە نیگای خەیری بۆ دەكرێت.

بەڵام ئەوەی كە دەیگێڕنەوە ((اتقوا فراسةَ المؤمن " فإنه ينظُر بنور الله))، لە هیچ ڕوویەكەوە ڕاست نی یە. انظر لتحقيق الكلام حوله ((تخريج الأربعين السلمية في التصوُّف)) (رقم ٣٧ _ بتحقيقي)، و ((كشف المتواري من تلبيسات الغماري)) (ص ١٩ _ ٢٢) بقلمي.

لە ڕاستیدا شەیتان بە تاقمێك یاری کرد بەوەی کە زانستیان دورخستەوەو، ڕوویان لە تێکۆشانێك کرد بەرامبەر بە نەفسی خۆیان کە زانست قەدەغەی دەکات و، زانستیشیان لێوە بەدورە، بۆیە جارێك کردەوانێکی قەدەغەکراو ئەنجام دەدەن و، جارێکیش کردەوانێك دیکە پەسەند دەکەن، کەچی کردەوانێکی تر هەن لە پێشترو شایستەترن ئەنجام بدرێن.

لە ڕاستیدا تەنها زانستە لەم شتانەدا فەتوا دەدات، کەچی بەرکەناریان کردووە.

پەنا دەگرین بەخوا لە سەرشۆڕی و ڕیسوابوون.

لە (أبي عليّ البنَّاءِ)ەوە دەڵێت: لای ئێمە لە (سوقِ السِّلاح) پیاوێك هەبوو دەیگوت: قورئان پەنهانە (حجاب)، پێغەمبەر پەنهانە (حجاب)، جگە لە بەندەو خوا هیچی تر نییە، تا تاقمێکی فریوداو، پەرستنەکانیان پشت گوێ خست، پاشانیش لە ترسی کوشتندا خۆی شاردەوە.

لە (ضِرارِ)ی کوڕی (عمْرِو)ەوە دەڵێت: تاقمێك وازیان لە زانست و، دانیشتن لە گەڵ ئەهلی زانستدا هێناو، لە میحرابدا دادەنیشتن، نوێژیان دەکردو، ڕۆژویان دەگرت، تا پێستی هەریەکەیان بەسەر ئێسقانەکەوە وشك بویەوەو، بەوەش پێچەوانەکاری سوننەت بونەوەو، تیاچوون، سوێند بەو خوایەی کە جگە لەو هیچ خوایەکی تر نییە بەهەق، هەر کەسێك بە نەفامی کردەوە بکات، دڵنیابن خراپەکاریەکانی زۆر زیاتر دەبێ لە چاکەکاریەکانی.

## ✸ حەقیقەت و شەریعەت:

زۆرێك لە صوفیەكان لـە نێـوان (حەقیقـەت) و (شـەریعەت) دا جیـاوازی دەكـەن(٥٩٠)، ئەمەش نەفامیەكە بۆ ئەو كەسەی ئەم قـسەیە دەردەبـڕێ، چـونكە شـەریعەت هەرهـەمووی حەقیقەتە، وە ئەگەر مەبەستیشیان (الرُّخصَةَ) و (العَزِيمَةَ)(٥٩١) بێت، ئەوا هـەردوكیان هـەر شەریعەتن.

تـاقمێكیش لـە پێـشینانی تەصـوف نكۆڵیـان لێكـردن سـەبارەت بـەوەی كـە لـە ڕووە ئاشكراكانی شەرع (ظواهر الشرع) ڕوویان وەرگێڕاوە:

لە (أبي الحسنِ)ی كوڕی (سالم)ەوە دەڵێت: پیاوێك هاتە دیدەنی (سَهْلِ)ی كوڕی (عبدِاللهِ)و شوشەیەكی مەرەكەب و كتێبێكی بەدەستەوە بوو، بـە (سَـهْلِ)ی گـوت: هـاتووم بـۆ ئـەوەی شتێك بنووسم بۆ ئەوەی خوای تعالى بیكا بەسوودمەندی بۆم. ئەویش پێـی گـوت: بنووسـە، ئەگەر دەتەوێ بگەڕێیتەوە بۆ لای خواو شوشە مەرەكەبەكەو كتێبەكەت بەدەستەوە بێ، ئـەوا وابكە ! پیاوەكەش گوتی: ئەی (أبامحمدٍ) ! سوودێكم فێر بكە. ئەوەبوو پێی گوت: دونیا هـەر هەمووی نەفامیە، بەدەر لە زانست، زانستیش هەر هەمووی بەڵگەیـە، بـەدەر لـە كـردەوە، كردەوەش هەر هەمووی وەستێنراوە (موقـوف) جگە لەوەی كە بەگوێرەی قورئان و سـوننەتە، سوننەتیش لە سەر تەقواو لە خواترسان وەستاوە.

---

٥٩٠ _ هەندێ كۆمەڵانی ئیسلامیش هەن خۆیان وەسف دەكەن بەوەی كە حەقیقەتێكی صوفین ! بەڵام زاراوەی (حقیقة) بەلای صوفیەكانەوە چەندەها هیماو نهێنی (رموز وأسرار) هەیە، بۆیە ئاگاداربـەو، كەسێكی بێ ئاگا مەبە.

٥٩١ _ الرخصە: ئەو حوكمانەیە كە دانەری شەرع داینـاوە، بـەگوێرەی عـوزرو بەهانـەی پێـسپێردراوان (المكلفين)، وەكو خواردنی گۆشتی مردارەوەبوو لە كاتی برسێتی و بێ خۆراكی و ناچاریدا.

العزیمە: ئەو حوكمە شەرعیانەیە كە دانەری شەرع بۆ هەموو پێسپێردراوانی دانـاوە، بـەبێ تەماشـاكردنی عوزرو بەهانەكانیان، بۆ ئەوەی لە كاتی ئاسایدا ئەنجامی بدەن، وەكو نوێـژو ڕۆژوو هـەموو پەرستنەكانی دیكە، بڕوانە: الدكتور عبدالكريم زيدان، الوجيز في أصول الفقه، ص ٥١، وەرگێڕ.

له (سَهْلِ)ی كوڕی (عبدِاللهِ)ەوە دەڵێت: ڕەشایی و سپیایی بپارێزن، چونكە هەركەسێك لە ڕووی ئاشكرا (الظاهر) وازبێنێ، دەبێ بە زەندیق و خوانەناس.

هەروەها لە (سَهْلِ)ی كوڕی (عبدِاللهِ)ەوە دەڵێت: هیچ ڕێگەیەكی چاكتر نییە بۆ لای خوا جگە لە زانست، بۆیە ئەگەر هەنگاوێك لە زانست دوركەویتەوە، چل ڕۆژ لە تاریكیدا ڕێ ون دەكەی.

لە (أبي بكرِ الدَّقاقِ)ەوە دەڵێت: گوێبیستی (أباسعيدِ الخَزَّازَ) بووم دەیگوت: هەموو ناوەكیەك (الباطن) پێچەوانەی ڕووی ئاشكرا (الظاهر) بێت پووچە.

نووسەر دەفەرمێت:

ئیمام (أبوحامِدِ الغَزَالِيُّ) لە كتێبی ((الإحْياءِ)دا لەم بارەوە ئاگاداریداوەو دەڵێت: هەركەس بڵێت: (حەقیقەت) پێچەوانەو ناكۆكە لە گەڵ (شەریعەت)دا، یاخود ناوەكی (الباطن) پێچەوانەو ناكۆكە لە گەڵ ڕووی ئاشكرادا (الظاهر)، ئەوا لە كوفرەوە نزیكترە تاوەكو ئیمان.

(ابنَ عقيلٍ) دەڵێت: صوفیەكان (شەریعەت)یان بەناو داناوەو، گوتیان: مەبەست بەوە (حەقیقەت)ە.

دەڵێت: ئەمە ناشیرینە، چونكە خوای تعالى لە بەر بەرژەوەندی خەڵك و پەرستنەكانیان (شەریعەت)ی داناوە، بۆیە (حەقیقەت) تەنها شتێكەو شەیتانەكان خستویانەتە نێو نەفسەوە.

دڵنیابن هەركەس داوای (حەقیقەت) بكات بەبێ (شەریعەت)، ئەوا كەسێكی فێڵ لێكراوو فریودراوە(٥٩٢).

---

٥٩٢ _ وانظر كلاماً مطوَّلا في هذا في تعليقي على ((الفارق بين المصنِّف والسارق)) (ق ٦٦) للسيوطي، وهو تحت الطبع.

## ✹ بەیادهێنانەوەی سەرلێشێواندنەکانی ئیبلیس بەرامبەر بە تاقمێك لە صوفیەکان سەبارەت بەوەی کە کتێبی زانایان دەشارنەوەو فڕێی دەدەنە نێو ئاوەوە:

نووسەر دەفەرمێت:

کۆمەڵێك لە صوفیەکان خۆیان بە فێربوونی زانستەوە سەرقاڵ کرد، کەچی ئیبلیس سەری لێشێواندن و پێی گوتن: مەبەست کردەوەیە بەتەنها. بۆیە کتێبەکانیان شاردەوە.

دەگێرنەوە کە (أَحمَدَ)ی کوڕی (أَبي الحَواريِّ) کتێبەکانی فڕیدایە نێو دەریاوەو، گوتی: چاکترین بەڵگە بووی، بەڵام پاش گەشتن کارکردن بە بەڵگە مەحاڵە.

(أَحمَدَ)ی کوڕی (أَبي الحَواريِّ) سی ساڵ بەشوێن فێربوونی فەرموودەدا دەگەڕا، بەڵام پاش ئەوەی بەتەواوی فێربوو، کتێبەکانی بەرەو دەریا هەڵگرت و، فڕێی دانە نێوی و، گوتی:

ئەی زانست ! ئەم کارەم پێ نەکردی لە بەر ئەوەی گاڵتەت پێ دەکەم، یاخود بەسوك و نزم تەماشات دەکەم، لە ڕاستیدا داوای فێربوونم دەکردی بۆ ئەوەی بە هۆی تـۆوە ڕێگـەی ڕاسـت پەروەردگارم بناسم، کاتێکیش تۆ بوی بە هۆی ئەوەی بیناسم، پێویستم پێت نەما.

لە (أَبي نصرِ الطُّوسيِّ)وە دەڵێت: گوێبیستی کۆمەڵێك لە خەڵکی (الريِّ) بووم دەیانگوت: (أبوعبدِاللهِ المُقْـري) پەنجا هەزار دیناری لە بابیەوە بە میراتی بـۆ مایـەوە، جگـە لـە مـاڵ و موڵك و سامان، بەڵام لە هەموو ئەمانە چووە دەرەوەو، بە سەر هەژاراندا دابەشی کرد.

دەڵێت: منیش لەو بارەوە لـە (أَباعبـدِاللهِ)م پرسـی، ئـەویش گـوتی: لاو بـووم ئیحـرامم بەستو، بەرەو مەککە چوومە دەرەوە، کاتێ کە هیچ شتێکم نەما بۆی بگەڕێمەوە، بڕیاریشم دا کە تەنها لە نێو کتێبدا کۆششەکانم سنووردار بکەم، وە ئەو زانست و فەرموودانـەی فێـری بووم بەلامەوە قورس بوو، بە ڕادەیەك لە دەرچونم بۆ مەککەو، خۆتەرخانکردن بـۆ سـەفەرو، دەرچوونم لە موڵك و سامانەکەم قورستر بوو !

دەڵێم _ ابن الجوزي _: پێشتر ئاماژەی پێدرا کە زانست نـورو ڕوناکیـەو، ئیلیـسیش بـۆ مرۆڤـی دەڕازێنێتەوە کە ئەو نورو ڕوناکیە بکوژێنێتەوە، بۆ ئەوەی لە تاریکیدا بەسەریدا زاڵ بێ، دڵنیاشبن هیض تاریکیتك وەکو تاریکی نەفامی نییە.

وە کاتێك ئیبلیس ترسا ئەمانە بۆ خوێندنەوەی کتێبەکان بگەڕێنەوە، چونکە ئەو کتێبانە دەبن بە ڕێنوێن بۆ ئاشکراکردنی فێڵەکانی، شاردنەوەو، فـەوتان و، تیاچـوون و، خراپکردنـی کتێبەکانی بۆ ڕازاندنەوە، ئەمەش کردەوەیەکی ناشیرین و قەدەغەکراوە، هەروەها نەفامیـشە بە مەبەستی ڕاستەقینە لەو کتێبانە !

ئەوانەی سەرەوەت بە تـەواوی بـۆ ڕوون دەبێتـەوە کـاتێ تەماشـا دەکـەی کـە قورئـان و سوننەت بنەڕەتی زانستەکانە، کەچی لـە ڕووی شـەرعەوە زانـرا پاراسـتنیان قورسـە، بۆیـە فەرماندرا بە نوسینەوەی قورئان و، نوسینەوەی فەرموودەکان.

سەبارەت بە قورئان، ئەوەبوو پێغەمبەری خوا _ صلی الله علیه وسلم _ ئەگەر ئایەتێکی بۆ دابەزاییایە، بانگی نوسەرەکەی دەکردو، ئەویش دەینوسیەوەو جـێگیری دەکـرد، لـە لقـی دارەخورماکاندا کە توێکڵ و پرژوپاڵەکانی لێ داماڵرابێت دەیانوسیەوە، هەروەها لەسەر بەردو ئێسکی شان دەیانوسیەوە، دوای ئەمە پێشەوا (أبـوبکرٍ) _ خـوای لـێ ڕازی بێـت _ هـەموو قورئانی کۆکردەوە، بۆ پاراستنی، پاشانیش پێـشەوا (عُثمـانُ)ی کـوڕی (عفـانَ)و، هاوەڵـانی تریش قورئانیان نوسیەوە، بۆ ئەوەی هیچ شتێکی لێ نەشاز نەبێ (٥٩٣).

بۆ سوننەتیش، سەرەتای ئیسلام پێغەمبەری خـوا _ صـلی الله علیـە وسـلم _ هـەموو خەڵکی سنوردار کردبوو بە قورئانەوەو، دەیفەرموو:

((لا تَکْتُبوا عنِّي سوی القرآنِ))(٥٩٤).

واتە ((جگە لە قورئان هیچ شتێکی تر لە منەوە مەنوسنەوە)).

---

٥٩٣ _ ويُراجع كتاب ((تاريخ المصحف الشريف)) للشيخ عبدالفتاح القاضي _ رحمه الله _.

٥٩٤ _ رواه مسلم (٣٠٠٤) عن أبي سعيد الخُدري.

بەڵام کە فەرموودەکان زۆربوون و، ئەوانیش کارامەیی و شارەزاییان لە لەبەرکردنیدا کـەم بویەوە، ئینجا ڕێی نوسینەوەی پێدان، فرُوِيَ(٥٩٥) عن أبـي هُريـرةَ _ رضـي الله عنـه _ أنـه شكى إلى رسولِ اللهِ _ صلى الله عليه وسلم _ قلَّةَ الحفظِ، فقالَ:

((ابسُطْ رِداءَكَ)).

فبسَطَ رداءَهُ، وحدَّثَهُ النبيُّ _ عليه الصلاةُ والسلامُ _ وقالَ:

((ضُمَّهُ إليكَ)).

فقالَ أبوهُريرةَ: فلم أنْسَ بعدَ ذلكَ شيئاً مما حدَّثنيه رسولُ اللهِ _ صلى الله عليه وسلم _.

واتە لە (أبي هُريرةَ)ەوە _ خوای لێ ڕازی بێت _ دەگێڕنەوە کەوا لای پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ سکاڵای کەمی لەبەرکردنی کرد، ئەویش فەرمووی:

((عەباکەت ڕابخە)).

عەباکەی ڕاخست و، پێغەمبەری خواش _ عليه الصلاةُ والسلامُ _ فەرموودەی بـۆ بـاس کردو ئینجا پێی فەرموو:

((کۆیکەرەوەو لە ئامێزی بگرە)).

(أبي هُريـرةَ) فەرمووی: پاش ئەوە چیتر ئەوانـەی پێغەمبـەری خـوا _ صلى الله عليه وسلم_ بۆی باس دەکردم بیرم نەدچۆوە.

وروى عنه _ صلى الله عليه وسلم _ عبدُاللهِ بنُ عَمْرو أنَّه قالَ:

((قَيِّدوا العلمَ))(٥٩٦).

---

٥٩٥ _ رواه البخاري (٤ / ٢٤٧)، ومسلم (٢٠٩٨).

فتصديره بصيغة التمريض فيه ما فيه " إلا إذا أراد اختصار السند " كما يُلاحظ أحياناً عن بعض قدماء أهل الحديث.

٥٩٦ _ حديث حسن بشواهده وطرقه.

وقد فصل الكلام عليه شيخُنا العلامة الألباني في ((السلسلة الصحيحة)) (رقم ٢٠٢٦)، فراجِعْهُ.

وما في حاشية ((الناسخ والمنسوخ)) (ص٤٦٨) لابن شاهين ممّا ينبغي أن يُتَأنى فيه !

فقلتُ: يا رسولَ اللهِ ! وما تقييدُهُ ؟

قالَ: ((الكتابَةُ))(٥٩٧).

**واتـه (عبـدُاللهِ)ى كـوڕى (عَمْرو) لـه پێغەمبـەرى خـواوه _ صـلى الله عليـه وسـلم _ دەگێڕێتەوە كە فەرمووى:**

**((زانست بچەسپێنن)).**

**منيش گوتم: ئەى پێغەمبەرى خوا ! چ دەيچەسپێنێت ؟**

**فەرمووى: ((نووسينەوە)).**

**نووسەر دەفەرمێت:**

**بزانە هاوەڵان فەرمايشت و، جوڵانەوەو، كردەوەكـانى پێغەمبـەرى خوايـان _ صـلى الله عليه وسلم _ بەتەواوى پاراستوە، بۆيە شەريعەت لە (ريواية)ى ئەم و لـە (ريوايـة)ى ئـەوەوە كۆبۆوە.**

وقد قال رسولُ اللهِ _ صلى الله عليه وسلم _:

((بَلِّغوا عَنِّي))(٥٩٨).

**واتە هەروەها پێغەمبەرى خوا _ صلى الله عليه وسلم _ فەرموويەتى:**

**((چەند لە تواناتاندا بوو لە منەوە ڕاگەيەنن)).**

وقالَ: ((نضَّرَ الله امْرَأً سَمِعَ مقالَتي، فوعاها، فأدَّها كما سَمِعَها))(٥٩٩).

**واتە هەروەها پێغەمبەرى خوا _ صلى الله عليه وسلم _ فەرموويـەتى: ((خـواى تعـالى جـوانيى و گەشـاوەيى لـە دونيـاو ڕۆژى دوايـدا بـەو كەسـە ببەخـشێت، كـە گوێبيـستى فەرمايشتەكانم دەبێ و، لێى تێ دەگات و، هەروەكو چۆن بيستويەتى دەيگەيەنێت)).**

---

**٥٩٧ _ وانظر ما كتبته بعنوان: ((مدخل عام في تدوين حديث نبيّ الإسلام)) في مقدمتي على ((الصحيفة الصحيحة)) (٥ _ ٨).**

**٥٩٨ _ رواه البخاري (٦ / ٣٦١) عن ابن عَمْرو.**

**٥٩٩ _ حديث صحيح متواتر مرويّ عن بضعةٍ وعشرين صحابياً.**

**انظر: ((الحطّة)) (ص٦٨)، وتعليقي عليه، و((الرد العلمي)) (١ / ٧٣) بقلمي " مشاركة مع أخي سليم الهلالي.**

گەیاندنی فەرموودە شتێکە بەدەست نایەت مەگەر بە نووسینەوە، چونکە لەبەرکردن بیردەچێتەوە.

پێشەوا (أحمدُ)ی کوڕی (حنبلٍ) فەرموودەی دەگێڕایەوە، پێی دەگوترا: بیلێرەوە با بینوسینەوە. ئەویش دەیفەرموو: نەخێر، بەڵکو لە کتێبەکەوە بۆتان دەخوێنمەوەو، ئێوەش بینوسنەوە.

(عليٌّ) کوڕی (المَدينيّ) دەڵێت: پێشەوام (أحمدُ)ی کوڕی (حنبلٍ) فەرمانی پێکردووم فەرموودە نەگێڕمەوە مەگەر لە کتێبەوە.

هاوەڵانی بەڕێز سوننەتیان گێڕاوەتەوەو، (تابعین)یش لە ئەوانەوە وەریان گرت و، فەرموودەناسانیش بە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا سەفەریان دەکرد، بۆ بەدەستهێنانی وشەیەك لێرەو وشەیەك لەوێ، هەستاون بە (تصحيح)کردنی ئەوەی (صحيح)ەو، بەدرۆخستنەوەی ئەوەی (صحيح) نییە، تانەیان لەو کەسانە داوە کە فەرموودە دەگێڕنەوە(جرحوا الرواة)، هەستاون بە ڕاستکردنەوەو، پوختەکردن و، بژاردنی سوننەت و، دانانی کتێب.

ئینجاش کەسانێك ئەو کتێبانە بە ئاو دەشۆنەوەو، ئەو ماندوبوونە دەفەوتێنن، کەچی حوکمی خوا سەبارەت بە ڕووداوێك نازانێت، هەرگیز شەریعەت بەشتێکی تری بەم هاوشێوانە عینادی لە گەڵ نەکراوە، ئایا هیچ شەریعەتێکی تری پێش ئێمە (إسناد)ێکیان هەیە بۆ پێغەمبەرەکەیان، لە ڕاستیدا ئەمە تەنها خاسیەتێکی تایبەتی ئەم ئومەتەیە(٦٠٠).

لە پێشەوا (أحمدُ)ی کوڕی (حنبلٍ)ەوە بۆیان باسکردوین کەوا لە گەڵ ئەوەی کە بە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا سەفەری کردووە بۆ دەستکەوتن و فێربوونی فەرموودە کەچی

---

٦٠٠ _ ئا ئەمەیە بەروبومی ڕاستەقینەی زانستی (مصطلح الحديث)و، یاساکانی، وەکو ئەوەی لە شوێنی خۆیدا ئاماژەی پێدراوە، بۆیە هەرکەس ئەمە بخاتە پشت گوێ و هەموو تواناکانی بۆ دانەپاڵ و ناوهێنانی کتێب ئاڕاستە بکات، وەکو ئەو کەسەی لێدێت کە خۆی بە لقەکانەوە خەریك کردبێ و، بنەڕەتەکەی لە بیر کردبێ، بۆیە ئاگاداربەو، زۆری پەراوێز فریوت نەدات (!)

جارێکیان بەکوڕەکەی خۆی دەفەرمێت: چیت لە فلان کەسەوە نوسیەوە؟ فذكر لهُ أنَّ النبيَّ _ عليه الصلاة والسلام _:

((كانَ يَخْرُجُ يومَ العيدِ من طريقٍ ويرْجِعُ مِن أُخرى))(٦٠١).

واتە ئەویش بۆی گێڕایەوە کەوا پێغەمبەری خوا _ علیه الصلاة والسلام _:

((لە ڕۆژی جەژندا لە ڕێگەیەکەوە دەچووە دەرەوەو، لە ڕێگەیەکی دیکەوە دەگەڕایەوە)).

ئەوەبوو پێشەوا (أحمدُ)ی کوڕی (حنبلٍ)یش فەرمووی: (إنا لله)، سونتێك لە سونەتەکانی پێغەمبەری خوام _ صلى الله عليه وسلم _ پی نەگەشتووە !

ئا ئەمە گوفتاری پێشەوا (أحمدُ)ی کوڕی (حنبلٍ)ە، هەرچەند فەردوودەی بە زۆری کۆدەکردەوە، ئەی ئەو کەسەی کە فەرموودە نانوسێت دەبێ چۆن ؟! وە هەرکات بشنوسێت بە ئاو دەیکوژێنێتەوە !

باشە ئەگەر کتێبەکان بە ئاو بسڕێنرێنەوەو، لە ژێر زەویدا بشاردرێنەوە، بۆ فەتواو ڕووداوەکان بە چ پشت ببەسترێت ؟! پشت بە فلان کەسی زاهید ! یاخود بە فلان کەسی صوفی ببەسترێت ! یاخود پشت بەو خەیالات و ئەندێشانەی کە بە خیالیاندا دێت !

پەنا بەخوا دەگرین لە گومرایی پاش ئەوەی کە ڕێگەی ڕاستی پیشاندایین.

---

٦٠١ _ رواه _ بنحوه _ البخاري (٩٨٦) عن جابر.

وانظر رسالتي ((أحكام العيدين في السنّة المطهرة)) (ص١١).

## ✸ ڕەخنەگرتن لە ڕێبازی صوفیەکان سەبارەت بەوەی کە کتێبەکانی زانست دەشارنەوە:

نووسەر _ بەڕەحمەتی خوا بێت _ دەفەرمێت:

ئەو کتێبانەی کە شاردویانەتەوە لەوە بەدەر نییە کە یا هەق یا نارەوایی تێدایە، یاخود تیایدا هەق و نارەوایی تێکەڵ بە یەکتر بووە.

بۆیە ئەگەر نارەوایی تێدا بێت، ئەوا شاردنەوەی سەرزەنشت ناکرێت.

وە ئەگەر هەق و نارەوایی تێکەڵ بە یەکتر بوبێتن و، نەتوانرا جیا بکرێنەوە، ئەوا بەهانەیەك دەبێ بۆ فەوتاندیان، چونکە قەومانێك لە کەسانی باوەڕپێکراو و لە کەسانی درۆزنیشەوە گێڕابویانەوەو نوسیبویانەوە، شتەکەیان لێ تێکەڵ و پێکەڵ بوو، بۆیە کتێبەکانی خۆیانیان فەوتاند.

لێرەدا ئەوەی کە لە (سُفیانَ الثوريٍّ)وە گێڕدراوەتەوە سەبارەت بە فەوتاندنی کتێب دەبێ بەو شێوەیەی سەرەوە لێك بدرێتەوە.

بەڵام ئەگەر کتێبەکان هەق و شەرعیان تێدا بێت، ئەوا بەهیچ شێوەیەك حەڵاڵ نییە بفەوتێنرێن، چونکە زانست و ماڵ و سامان لە خۆدەگرێ و دەچەسپێنێ.

با پرسیاری مەبەست بکرێت لەو کەسەی کە دەیانفەوتێنێ :

ئەگەر گوتی: خەریکم دەکاو، ناهێڵێ پەرستنەکانم جێبەجێ بکەم !

پێی دەگوترێت: بە سێ شێوە وەڵامت دەدرێتەوە:

یەکەمیان: ئەگەر تێگەشتایەی، دەتزانی کە خۆ خەریك کردن بە زانستەوە تەواوترین و چاکترینی پەرستنەکانە.

دووەم: ئەو بە ئاگبوون و فێربوونەی بۆت بەدیهاتووە بەردەوام نابێ، وەکو ئەوەی تەماشای ئەو کاتەت دەکەم، کە پەشیمان بویتەتەوە، پاش ئەوەی کتێبەکانت فەوتاند.

ئەوەش بزانە كە دڵەكان لە سەر پاكێتی خۆیان نامێننەوە، بەڵكو ژەنگ توێژی بە سەرەوە دەبەستێ، بۆیە پێویستی بە پاك كردنەوە دەبێ، پاك كردنەوەشی بەوەیە كە تەماشای كتێبە زانستیەكان بكرێت(٦٠٢)

(یوسُفُ)ی كوڕی (أَسباطَ) كتێبەكانی فەوتاندبوو، بەڵام لە سەر نەگێڕانەوەی فەرموودە نارامی نەگرت و، ئیتر بۆ گێڕانەوە پشتی بە لەبەركردنی خۆی دەبەست، بۆیە تێكەڵ و پێكەڵی دەكرد(٦٠٣).

سێ یەم: ئێمە لە بە ئاگابوونە تەواوەكەت و، بەردەوامبوونی و، پێویست نەبوونت بەو كتێبانە تێدەگەین، بەڵام باشتر وابوو ئەو كتێبانەی خۆتت بە خوێندكارێكی تازە دەستپێكار ببەخشیبا، بە تایبەت ئەو خوێندكارانەی بە ئاستی تۆ نەگەشتوون، یاخود بیتكردبا بە (وقف) بۆ ئەو كەسانەی دەتوانن سوودی لێ وەربگرن، یاخود بتفرۆشتباو پارەكەیت بە خێرو صەدەقە بكردبا، بەڵام فەوتاندنی ئەو كتێبانە، بە هیچ جۆرێك حەڵاڵ نییە.

(المروزيُّ) دەگێڕێتەوە كە لە پێشەوا (أَحمَدَ)ی كوڕی (حنبلٍ)یان پرسی سەبارەت بە پیاوێك ڕاسپێری كردبوو كەوا كتێبەكانی بشاردرێتەوە، ئەویش بۆ وەڵامی پرسیارەكە فەرمووی: پێم باش نییە زانست بشاردرێتەوە.

هەروەها (المروزيُّ) دەڵێت: گوێبیستی پێشەوا (أَحمَدَ)ی كوڕی (حنبلٍ) دەیفەرموو: شاردنەوەی كتێب هیچ مانایەكی نییە.

---

٦٠٢ _ سەرچاوەی هەموو ئەوەی لە بارەی كتێبەوە گوتراوە، سەبارەت بە سوودەكانی و، گرنگیەكانی و، ڕێگەكانی سوود لێ وەرگرتن و، هەموو ئەوەی لە دوورو نزیكەوە پەیوەندی بەوەوەیە، لە كتێبەكەمدا دەیبینیت بەناوی ((حِلْيَةُ الكتاب وبُلْغَة المُطالِع))، خوای گەورە تەواوكردنیم بۆ ئاسان بكات.

٦٠٣ _ ((تهذيب التهذيب)) (١١ / ٤٠٨).

## ✸ باسی سەرلێشێواندنەکانی ئیبلیس بەرامبەر بە صوفیەکان چونکە نکۆڵیی لەو کەسانە دەکەن کە خەریکی فێربوونی زانستن:

نووسەر دەفەرمێت:

صوفیەکان لەم بارەوە بەسەر دوو کۆمەڵدا دابەشبوون: کۆمەڵێکیان تەمبەڵیی دەنوێنن سەبارەت بە فێربوونی زانست، کۆمەڵێکیشیان وایان بە خەیاڵدا هاتووە زانست بریتیە لەوەی کە دەکەوێتە دڵی کەسانێکەوە، وەکو بەرووبومی ئەو خواپەرستیە زۆرەی کە ئەنجامی دەدەن، ئەم زانستەشیان ناوناوە بە: (العلمَ الباطنَ) واتە زانستی ناوەکی، وە قەدەغەی فێربوونی (العلمِ الظاهرِ) واتە زانستی ئاشکرا دەکەن.

لە (جعفرِ الخُلْديِّ)وە دەڵێت: ئەگەر صوفیەکان وازیان لێ هێنابام، (إسناد)ی هەموو دونیام بۆ دەهێنانە بەردەست، کە لاو بووم چووم بۆ لای (عبَّاسِ الدُّوريِّ)و، زانست و فەرموودەی یەك مەجلیسم لێوە نووسیووە، پاشان کە چوومە دەرەوە، کەسێکم پێگەشت لەو صوفیانەی کە هاوەڵێتیم دەکردو، پێی گوتم: ئەمە چی یە بە دەستەوە ؟ منیش پیشانمدا، ئەوەبوو گوتی: تیابچیت ! واز لە (علمَ الخِرَقِ) واتە زانستی پینەوپاتاڵی پۆشاك دەهێنی و، بە فێربوونی (علمَ الوَرَقِ)ەوە واتە زانستی سەر کاغەزەوە سەرقاڵیت ! پاشان کاغەزەکانی دڕاندو، قسەکانیشی چوو بە دڵمەوەو، ئیتر بۆ مەجلیسەکەی (عبَّاسٍ) نەگەڕامەوە !!

دەڵێم ــ ابن الجوزي) ــ: هەواڵی (أبي سعيدِ الكِنْدِيِّ)م پێ گەشتووە دەڵێت: دەچوومە خەڵوەتگەی (رباط) صوفیەکانەوەو، بەنهێنی بە جۆرێك ئەوان هەستی پێ نەکەن فەرموودەم دەنوسیێوەو فێر دەبووم، ڕۆژێکیان شوشە مەرەکەبەکە لە سەرقۆڵی پۆشاکەکەم کەوتە خوارەوە، ئەوەبوو کەسانێك لە صوفیەکان پێیان گوتم: عەورەتت (ئەو شتەی کە جێگەی شەرمەزاریە) بشارەوە !

لە (الحُسينِ)ی کوری (أحْمَدَ الصَّفَّارِ)ەوە دەڵێت: شوشەیەکی مەرەکەبم بەدەستەوە بوو، (الشِّبْلِيُّ) پێی گوتم: مەرەکەبە ڕەشەکەت لێم دورخەرەوە، ڕەشایی دڵیی خۆمم بەسە.

نووسەر دەفەرمێت:

گەورەترین یاخی بوون و، بەرهەڵستیکردنی خـوای تعـالی تعـالی، بریتیـە لـە کۆسـپ و تەگەرە دانان لە سەر ڕێگەی ڕاستی خوای تعـالی، ڕوونتریـن و ئاشـکراترین ڕێگـەی خـوای تعالاش زانستە، چونکە بەڵگەن لە سەر خوای تعالی، بە ڕوونکردنەوەی حوکم و شەرعی خوا هەڵدەستێت، ئەو شتانە ڕوون دەکاتەوە کە خوای تعالی حەزی پێیەتی و، ئەوانەش کـە ڕقـی لێ دەبێتەوە، بۆیە قەدەغەکردنی زانست بەرامبەر بە خواو شەریعەتەکەی دژایەتی دەربڕینە، بەڵام ئەو کەسانەی قەدەغەی زانست دەکەن، لەو شتە تێنەگەشتن.

لە (عبدِالله)ی کوڕی (خفیفٍ)ەوە دەڵێت: خۆتان بە فێربوونی زانستەوە سـەرقاڵ بکـەن و، قـسەی صـوفیەکان فریوتـان نـەدات، مـن شوشـەی مەرەکەبەکـەم لـە گیرفـانی پۆشـاکە (المُرَقَّعَة)کەمداو، کاغەزەکانیشم لـە پـشتوێنی شـەرواڵەکەمدا هەڵـدەگرت و، بـە نهێنیـەوە دەچـوومە خزمـەتی ئـەهلی زانـست، ئەگـەر پێیـان بزانیبـام دژایـەتیان دەکـردم و (٦٠٤)، دەیانگوت: تۆ سەرکەوتوو نابی. کەچی پاشان پێویستیان پێم بوو.

پێشەوا (أَحمَد)ی کوڕی (حنبلٍ) کە شوشەی مەرەکەبی بە دەستی خوێندکارانی زانستەوە بەدیدەکرد، دەیفەرموو: ئەمانە چراکانی ئیسلامن.

هەرچەند خۆشـی بەتەمـەن بـوو بـەڵام شوشـەی مەرەکەبەکـەی هـەر بەدەسـتەوە بـوو، پیاوێکیش پێی گوت: ئەی (أَبا عبدِاللهِ) تاوەکو کەی ؟! ئەویش فەرمووی: (المحبَرَةُ إلى المقبرةِ) واتە شوشەی مەرکەبەکە تاوەکو گۆڕستان.

---

٦٠٤ _ ئای کە ئەمڕۆ لە دوێنێ دەچێت، چونکە زۆرێـك لـە کۆمەڵـە ئیـسلامیەکانی هاوچـەرخ، لەمـە زیاتریش ئەنجام دەدەن _ پەنا بەخوا دەگرین _ کەچی وادەزانن کردەوەیەکی باش ئەنجام دەدەن.
ئێمە شتگەلێکی زۆر دەربارەی کەسانێك _ کە بانگەشـەی سـوننەت دەکـەن _ دەزانـین، کـە زاناکانیـان نکۆڵیی لێ دەکەن و، سەرکردەکانیشیان خۆیان لێ بەدور دەگرن، دەربارەی ئەو شتانەی کە دژ بە فیترەت و سروشتی ئیسلام و، سوننەتی پاکە.

سەبارەت بە فەرمایشتەکەی پێغەمبەری خواش _ صلى الله عليه وسلم _ کە دەفەرمێت: ((لَا تَزَالُ طَائِفَةٌ مِنْ أُمَّتِي منصورينَ لَا يَضُرُّهُمْ مَنْ خَذَلَهُمْ حَتَّى تقومَ الساعةُ))(٦٠٥). واتە ((بەردەوام تایەفەیك لە ئومەتەکەم سەرکەوتوو دەبن و، ئەوانەش کە شوێنیان ناکەون و، یارمەتیان نادەن، هیچ زیانێکیان پێ ناگەینن، تاوەکو نزیك بە ڕۆژی قیامەت)). فەرمووی: ئەو تایەفە ئەگەر ئەهلی فەرموودە نەبن، ئیتر نازانم چ تایەفەیەکی تر دەبن.

پێی گوترا: پیاوێك سەبارەت بە ئەهلی فەرموودە دەڵێت: کۆمەڵێکی خراپن. پێشەوا (أحمدَ)یش فەرمووی: ئەو پیاوە زیندیقە.

پێشەوا (الشافعيُّ) _ بەڕەحمەتی خوا بێت _ فەرموویەتی: ئەگەر پیاوێك لە ئەهلی فەرموودە ببینم، وا هەست دەکەم پیاوێکم لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ بینیوە(٦٠٦).

---

٦٠٥ _ مرويٌّ عن عدة من الصحابة، منهم معاوية _ رضي الله عنه _ وحديثه في ((صحيح البخاري)) (١٣ / ٢٥٠)، و ((صحيح مسلم)) (١٠٣٧).

ولأخينا الفاضل سليم الهلالي رسالة لطيفة بعنوان: ((اللآلِيء المنثورة بأوصاف الطائفة المنصورة))، تحت الطبع.

٦٠٦ _ پیاهەڵدان و ستایشکردنی زانایان بەرامبەر بە خوێندکاران و ئەهلی فەرموودە، لە کتێبەکاندا بە زۆری بەرچاو دەکەوێت و، لە کتێبە دانراوەکانی ئەهلی زانستدا بەزۆری بڵاوە.

لەم بارەوە شتێکی زۆر چاکم لە کتێبێکی سەربەخۆدا کۆکردۆتەوە بە ناوی: ((إتحاف النابه بشرف الحديث و أصحابه))، خستومەتە پاڵ کتێبە دەستنوسەکەی پێشەوا (الضياء المقدسي) کە پێمان گەشتووە بەناوی: ((فضل الحديث وأهله))، کە هەستاوم بە (تخريج)و لێکۆڵینەوەی.

خوای تعالى تەواوکردن و بڵاوکردنەوەیەم بۆ ئاسان بکات.

## ✸ باسکردنی سەرلێشێواندنەکانی ئیبلیس بەرامبەر بە صوفیەکان لەو بوارەوە کە قسە لە زانستدا دەکەن:

نووسەر دەفەرمێت:

بزانە کاتێ ئەم قەومە لە فێربوونی زانست وازیان هێناو، تاکبوونەوەو، بە پێی بیروڕای خۆیان کاریان کرد، ئارامیان نەگرت و، لە زانستەکاندا قسەیان دەکرد، بەڵام بە گوێرەی واقیعاتی خۆیان قسەیان کرد، نەك بە گوێرەی زانست، بۆیە چەندین هەڵەیەی ناشیرینیان لێ وەشایەوە، ئەوەبوو جار بە جار لە تەفسیری قورئاندا قسەیان دەکردو، جار بە جار لە فەرموودەداو، جار بە جار لە فیقهداو، هتد، زانستەکانیشیان بەپێی پێویستیەکانی ئەو بیروبۆچونە لێك دەدایەوە کە تاك بوبونەوە تیایدا.

بەڵام دڵنیابن خوای تعالی بۆ هەر چاخ و زەمەنێك قەومانێکی داناوە کە دەبن بە کۆڵەکەو پاڵپشتی شەرعەکەی، وەڵامی ئەو کەسانە دەدەنەوە کە بە ویستی خۆیان لە شەرعدا قسە دەکەن و، هیچ یاساو ڕێسایەك ڕەچاو ناکەن، هەڵەی هەڵەکاران ڕوون دەکەنەوە.

## * بەیادهێنانەوەی کورتەیەك لە قسەکانیان سەبارەت بە قورئان:

لە (جعفر)ی کوڕی (محمدٍ الخُلْدِيِّ)وە دەڵێت: لە خزمەتی شێخمان (الجُنَيْدَ)دا بووم کاتێ (كَيْسانُ) پرسیارێکی ئاڕاستە کرد سەبارەت بەو ئایەتەی کە خوای تعالی تیایدا دەفەرمێت: ﴿سَنُقْرِئُكَ فلا تَنْسى﴾ ﴿ الأعلى: ٦ ﴾ واتە (ئەی محمد _ صلى الله عليه وسلم _ قورئانت) بەسەردا دەخوێنینەوەو هەرگیز بیرت ناچێتەوە(٦٠٧). کەچی (الجُنَيْدُ) لە وەڵامدا گوتی: واتە کردەوە پێکردنی قورئانت بیر نەچێت.

هەروەها سەبارەت بەو ئایەتە لێی پرسی کە خوای تعالی تیایدا دەفەرمێت: ﴿ودَرَسُوا ما فيهِ﴾ ﴿ الأعراف: ١٦٩ ﴾ واتە ئەوەی لە تەوراتدا هەبوو خوێندویانەتەوە(٦٠٨)، کەچی (الجُنَيْدُ) لە وەڵامدا گوتی: واتە وازیان لە کارپێکردنی هێنا. (كَيْسانُ)یش بە قسەکانی (الجُنَيْدُ) سەرسام بوو و پێی گوت: (لاَيَفْضُضُ اللّٰهُ فَاكَ) واتە پەروەردگار ددانەکانت نەکەوێنێت و هەمیشە زارت بە جوانی بهێڵێتەوە.

دەڵێم _ ابن الجوزي _: گوفتارەکەی (الجُنَيْدُ): ((واتە کردەوە پێکردنی قورئانت بیر نەچێت))، تەفسیرێکە هیچ ڕوویەکی ڕاست و دروستی نییەو، هەڵەکەشی ئاشکرایە، چونکە شێوازی زمانیی ئایەتەکەی والێکداوتەوە کە (نهيٌّ)ە، بەڵام بەم جۆرە نییەو، لە ڕاستیدا شێوازی زمانیی ئایەتەکە (خَبَرٌ)ە نەك (نهيٌّ) واتە مەبەستی خوای تعالی ئەوەیە کە قورئانت بەسەردا دەخوێنینەوەو هەرگیز بیرت ناچێتەوە، نەك گوفتارەکەی (الجُنَيْدُ): ((واتە کردەوە پێکردنی قورئانت بیر نەچێت)). چونکە شێوازی زمانیی ئایەتەکە ئەگەر (نهيٌّ) بوایە، ئەوا پیتەکانی (جزم)ی دەچووە سەرو (مجزوم) دەبوو، بۆیە تەفسیرەکەی (الجُنَيْدُ) پێچەوانەی کۆدەنگی زانایانە(٦٠٩).

---

٦٠٧ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

٦٠٨ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

٦٠٩ _ انظر ((زاد المسير)) للمصنف.

هەروەها فەرمایشتی خوای تعالى ﴿ ودَرَسُوا ما فيهِ ﴾، لە ڕاستیدا وشـەی (دَرَسُـوا) لـەم ئایەتەدا واتای خوێندنەوە دەبەخشێت، وەکو لە ئایەتێکی دیکەشدا خوای تعالى دەفـەرمێت: ﴿ وبِما كُنْتُم تَدْرُسونَ ﴾﴿ آل عمران: ٧٩ ﴾ واتـە وە ئێـوە خۆشـتان دەیخـوێنن(٦١٠)، وشـەی (دَرَسُوا) لەم ئایەتەدا لە (دُروسِ الشيءِ)ەوە نەهاتووە واتـە کوژانـەوەو نـەمان و فەوتانـدنی شتێك، وەکو ئەوەی (الجُنَيْدُ) واتێگەشتبوو مانای ئایەتەکـە واتـە فەوتانـدن و کارپێنـەکردن دەبەخشێت.

لە (أحمدَ)ی کوڕی (محمدِ)ی کوڕی (مِقْسَم)ەوە دەڵێت: لە مەجلیسەکەی (أبابكرِ الشِّبْليِّ)دا ئامادە بووم، کاتێ سەبارەت بەو ئایەتەی خوای تعالى لێیان پرسی کـە دەفـەرمێت: ﴿ إنَّ في ذلكَ لَـذِكْرى لِمَـنْ كـانَ لـهُ قَلْبٌ ﴾﴿ ق: ٣٧ ﴾ واتـە ﴿ إنَّ في ذلـكَ لَـذِكْرى ﴾ بێگومـان لـەم (باسەدا) پەندو ئامۆژگاری هەیە ﴿ لِمَنْ كانَ لهُ قَلْبٌ ﴾ بۆ کەسـێك خـاوەن دڵێکـی (زینـدوو بێت یان ژیریێ)(٦١١)، کەچی (أبابكرِ الـشِّبْليِّ) بۆ وەڵامی پرسیارەکە گـوتی: واتـە بـۆ ئـەو کەسەی خوا بوە بە دڵیی(٦١٢).

---

٦١٠ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

٦١١ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

٦١٢ _ پەنا بەخوا دەگرین، چونکە ئەمە قسەیەکی حلولی کوفریەو، پێخۆشـحاڵ بوونـە بـە قـسەی ئـەو کەسانەی کە درۆیان بەزاری موبارەکی پێغەمبەری خواوە _ صلى الله عليـه وسـلم _ هەڵبەسـتوەو، ئـەم گوفتارە پوچەیان بۆ ئەو گەڕاندۆتەوە:

((مـا وسـعني أرضـي ولا سمـائي، ولكـن وسـعني قلـب عبـدي المـؤمن)) واتـە ((نەئاسمانەکـەی خـۆم و نەزەمینەکەشم جێی منی تێدا نەبۆوە، بەڵکو دڵی بەندە باوەڕدارەکەم جێی کردمەوە)).

هەروەها: ((القلبُ بيتُ الربِّ)) واتە ((دڵ ماڵ و جێگەی پەروەردگارە)).

بەڵام ئەم دووانە هەردوکیان هەڵبەستراو درۆن.

(أَبوعبدِالرحمنِ السُّلَميّ)(٦١٣) له تەفسیری قورئاندا كۆمەڵێكی زۆری قسەكانی ئەوانی كۆكردۆتەوە، كە زۆربەی قسەی هەڵەت و پەڵەت و، بێ هودەیەو، حەڵاڵ نییە، نزیكەی دوو بەرگەو، ناوی ناوە بە ((حقائق التفسير))، سەبارەت بە سورەتی (الفاتحة) لە ئەوانەوە دەگێڕێتەوەو دەڵێت:

ئەوان دەڵێن: لە ڕاستیدا بە (فاتحة) ناونراوە، چونكە مەبەستی خوای تعالی ئەوەیە كە ئەمە سەرەتای دستپێكردنی پەیامەكەمانە بۆ تۆ، بۆیە ئەگەر پەیڕەوت كردو، پێی پەروەردە بویت، ئەوا شتێكی چاكە، ئەگینا لە لوتفی ئایەتەكانی دواتر بێ بەش دەبی !!

نووسەر دەفەرمێت:

ئەمە شتێكی ناشیرینە، چونكە ڕاڤەكارانی قورئان جیاوازیان لە نێوانـدا نییە سەبارەت بەوەی كە (فاتحة) یەكەم سورەتی قورئان نییە كە دابەزیبێت.

سەبارەت بەو گوفتارەی مرۆڤ كە دەڵێت (آمِينَ). گوتویەتی واتە: ڕوومان تێكردووی !

دەڵێم _ ابن الجوزي _: ئەمە شتێكی ناشیرینە، چونكە وشەی (آمِينَ) لە وشەی (أَمَّ)ەوە نەهاتووە، بۆ ئەوەی مانەكەی سەرەوە ببەخشێت، چونكە ئەگەر لەو وشەیەوە وەرگیرابایە، ئەوا پیتی میمی نێو وشەی (آمِينَ) شەددەی بەسەرەوە دەبوو(٦١٤).

سەبارەت بەم ئایەتە ﴿ وَإِن يَأْتُوكُمْ أسارى ﴾ البقرة: ٨٥ ﴾ دەڵێت: (أَبوعُثمانَ) دەڵێت: واتە لە تاواندا نقووم بوونە. (الواسطِيُّ) دەڵێت: واتە لە تەماشاكردنی كردەوەكانیانـدا نقووم بوونە. (الجُنَيْدُ) دەڵێت: واتە دیلن بەدەست هۆكارو خۆشیەكانی دونیاوە.

دەڵێم _ ابن الجوزي _: لە ڕاستیدا ئایەتەكە بۆ نكۆڵیكردنەو، مەبەستی خوای تعالی ئەوەیە كە ئەی (بني إسرائيل) ئەگەر كەسێكی جەنگاوەرتان بەدیل گیرا، لە بریتیاندا ماڵ و

---

٦١٣ _ انظر ((تاريخ الخطيب))(٢ / ٢٤٨)، و((سير أعلام النبلاء))(١٧ / ٢٥٢)، و((ميزان الأعتدال))(٣ / ٥٢٣)، ومقدِّمتي على ((تخريج الأربعين السلمية))(ص١٣_ ١٤).

٦١٤ _ واتە بەم شێوە دەنوسراو دەخوێنرایەوە (آمِّين)، نەك (آمِين).

(أَمَّ): واتە ڕووی تێكرد.

سامان دەدەن و، ئازادیان دەکەن، بەڵام قبوڵتانە لە گەڵ تیرەیەکی (بـني إسـرائیل)ی تـر کـە دژبە خۆتانن بجەنگن، کەچی ماڵ و سامان دان بۆ ئازادکردنی دیل، وە نەجەنگان دژبە یەکتر، هەردوکیان وەکو دوو حوکمی خوای تعالی بـۆ ئێـوە دابـەزیوون، کـەوابوو بـۆ یەکـەم حـوکم جێبەجێ دەکەن و، دووەم حوکم جێبەجێ ناکەن.

بەڵام ئەمانە ئایەتەکەیان بە شێوازی مەدح و ستایشکردن تەفسیر کردووە !

سەبارەت بەم ئایەتە ﴿ ومَن دَخَلَهُ كانَ آمِناً ﴾﴿ آل عمران: ٩٧ ﴾ دەڵێت: واتـە هەرکـەس بچێتە نێو حەرەمی مەککەوە لە ئەندێشەی خراپی نەفسی خۆی و، گومان و دودڵیی شەیتان بێوەی دەبێ.

ئەم تەفسیرە لە ئەو پەڕی ناشیرینیدایە، چونکە بێژەی ئایەتەکە (الخَبَر)یەو، مانای فەرمان پێکردن دەبەخشێت بەم جۆرە: هەرکەس چووە نێو حەرەمی مەککـەوە، لـە زیـان و ئـازاردان بیپارێزن، بەڵام تەفسیرەکەی ئەوان ڕاست نییە، چونکە چەندەها کەس دەچنە نێو حەرەمەوەو، لە ئەندێشەی خراپ و گومان و دودڵیی بێوەیی نابن.

سەبارەت بەم ئایەتە ﴿ فللهِ المَكْرُ جَميعاً ﴾﴿ الرعد: ٤٢ ﴾ دەڵێت: (الحُسينُ) دەڵێت: هـیچ مەکرو پیلانێکی دیکە لەم ئایەتەدا بەدیناکرێت بە ئەندازەی ئەو مەکرو پیلانـە ئاشـکرایەی کە خوای هەق بەرامبەر بە بەندەکانی خـۆی لـەم ئایەتـەدا باسـی دەکـات، چـونکە وای بـە خەیاڵدا هێناون کە ڕێگەیەکیان بۆی هەیە بەباروحاڵێك.

نووسەر دەفەرمێت:

هەرکەس بەوردی لە مانای ئەمە تێڕوانێت، دەزانێ ئەمـە کـوفرێکی ئاشـکرایە، چـونکە پەنجە بۆ ئەوە ڕادەکێشێت کە مانـای ئایەتـە وەکـو گاڵتـەپێکردن و یاریکردنـە، بـەڵام ئـەم (الحُسينُ)ە خودی (الحَلّاجُ)ەو، ئەمەش شایستە بە ئەوە.

دەڵێم ـ ابن الجوزي ـ: هەموو کتێبەکە لەم ڕەگەزەیەو بەم جۆرەیە، بڕیارم دابوو شتێکی زۆری ئەو کتێبە لێرەدا بنووسمەوە، بەڵام تەماشام کرد کات و زەمـەنێکی زۆرم بـە نوسـینی شتێکەوە بە فیڕۆ دەچێت، کە لە نێوان کوفرو، هەڵەو، قسەی هەڵەت و پەڵەتدایە.

ئەمە لە هەمان ڕەگەزی ئەو شتانەیە کە لە کومەڵیی (الباطنية)وە گێڕامانەوە. هەرکەس دەیەوێ ڕەگەزو ئەو شتەی لە کتێبەکەدا هاتووە بزانێ، ئەمە نموونەیەکە لە پێش دەستیدا.

(أبونصرِ السرَّاجُ) لە کتێبی ((اللُّمَع))دا دەڵێت: تەصوف هەڵهێنجانی (استِنْباطٌ) هەیە، لەوانە فەرمایشتی خوای تعالایە: ﴿ أدْعـوا إلى اللهِ على بـصيرةٍ ﴾﴿ يوسف: ١٠٨ ﴾ واتە ﴿أدْعـوا إلى اللهِ ﴾ بانگی (خەڵکی) دەکەم بۆ لای خوا ﴿ على بـصيرةٍ ﴾ لـە سـەر بەڵگـەی ڕوون(٦١٥)، کەچی (السرَّاج) دەڵێت: (الواسطيُّ) دەڵێت: واتە بانگی خـەڵکی دەکـەم بـۆ لای خوا بە شێوەیەك خۆم نەبینم !

سەبارەت بەم ئایەتە ﴿ لَوِ اطَّلَعْتَ عَلَيْهِمْ لَوَلَّيْتَ مِنْهُمْ فِرَارًا﴾ ﴿الكهـف: ١٨ ﴾ واتـە ﴿لَـوِ اطَّلَعْتَ عَلَيْهِمْ ﴾ ئەگەر سەیرێکت بکردنایە ﴿ لَوَلَّيْتَ مِنْهُمْ فِرَارًا ﴾ بێگومان بەڕاکردن بـەرەو دوا دەگەڕایتەوە(٦١٦)، کەچی (الـشِّبْليُّ) دەڵێـت: واتـە خـوای تعـالی فەرموویـەتی ئەگـەر تەماشای هەمووان بکەی جگە لە ئێمە، ئەوا بێگومـان لـە هـەمووان هەڵـدێی و بـەڕاکردن بەرەو لای ئێمە دەگەڕێیتەوە.

دەڵێم _ ابن الجوزي _: ئەم بۆچونە حەڵاڵ نییە، لە ڕاستیدا مەبەستی پـەروەردگار تـەنها (أهل الكهف) بوو.

ئەمەش (السرَّاج)ەو لە کتێبەکەیدا ئەم گوفتارانە بە هەڵهێنجان ناو دەبات !

سەبارەت بە فەرمایشتی خوای تعالی: ﴿ وَاجْنُبْنِي وَبَنِي أَنْ نَعْبُدَ الْأَصْنَامَ﴾ ﴿إبراهيم:٣٥﴾ واتە ﴿ وَاجْنُبْنِي وَبَنِي ﴾ وە خۆم و کوڕەکانم بپارێزەو دورخەرەوە ﴿ أَنْ نَعْبُدَ الْأَصْـنَامَ ﴾ لەوەی بتەکان بپەرستین(٦١٧)، کەچی (أبوحامدِ الطوسيُّ) لە کتێبی ((ذمِّ المالِ))دا دەڵێت: مەبەستی خوای تعالی زێڕ و زیو بوو، چونکە پلەی پێغەمبەرایەتی زۆر گەورەترە لەوەی ترسـی ئـەوەی

---

٦١٥ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

٦١٦ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

٦١٧ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

هەبێ بتەکان بپەرستێت، لە ڕاستیدا مەبەستی خوای تعالی بە پەرستنی بتەکان لەم ئایەتەدا، خوشەویستی و فریوخواردنی زێڕ و زیوە.

دەڵێم _ ابن الجوزي _: ئەمە شتێکە هیچ کەسانێکی ڕاڤەکارانی قورئان نەیانگوتوە، ئەوەتا (شُعیبٌ) پێغەمبەر فەرموویەتی: ﴿ وَمَا يَكُونُ لَنَا أَنْ نَعُودَ فِيهَا إِلَّا أَنْ يَشَاءَ اللَّهُ رَبُّنَا﴾ ﴿الأعراف: ٨٩ ﴾ واتە ﴿ وَمَا يَكُونُ لَنَا أَنْ نَعُودَ فِيهَا ﴾ ڕەوانیە بۆمان بگەڕێینەوە بۆ ناو ئەو (بت پەرستی یە) ﴿ إِلَّا أَنْ يَشَاءَ اللَّهُ رَبُّنَا ﴾ مەگەر خوای پەروەردگارمان بیەوێ(٦١٨). زانراوە کە مەیلی پێغەمبەران بۆ شیرك و هاوبەش دانان شتێکی قەدەغە کراوە، لە بەر پارێزراوی لە هەڵەو تاوان (العصمَةِ)، نەك لە بەر ئەوەی مەحاڵ بێ. پاشان خوای تعالی لەو ئایەتەدا ڕوونی دەکاتەوە کە پێغەمبەر (إبراهیم) لە گەڵ نەفسی خۆیدا کەسانی دیکەشی بەشدار کرد، ئەو کەسانەی بۆچوونی شیرك و کوفریان لێ دەکرێت، بۆیە شیاو بوو خودی خۆشی لە نزاکەدا بەشدار بکات و فەرموی ﴿ وَاجْنُبْنِي وَبَنِيَّ ﴾ واتە وە خۆمو کوڕەکانم بپارێزەو دورخەرەوە، بەلای هەموو کەسێکیشەوە زانراوە کە هەموو عەرەب کوڕی پێغەمبەر (إبراهیم)ە، کەچی زۆربەشیان بتیان پەرستووە.

لە (أبي حفصٍ)ی کوڕی (شاهینَ)ەوە دەڵێت: تاقمێك لە صوفیەکان لە خودی قورئاندا بە شێوازێکی نەشیاو دووان و، سەبارەت بەم ئایەتە ﴿إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلَافِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ لَآيَاتٍ لِأُولِي الْأَلْبَابِ﴾ ﴿آل عمران: ١٩٠﴾ واتە ﴿إِنَّ فِي خَلْقِ﴾ بەڕاستی لە دروست کردنی ﴿السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾ ئاسمانەکان و زەویدا ﴿وَاخْتِلَافِ﴾ و لە جیاوازی و گۆڕانی ﴿اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ﴾ شەو و ڕۆژدا ﴿لَآيَاتٍ﴾ چەندەها بەڵگە هەیە ﴿لِأُولِي الْأَلْبَابِ﴾ بۆ خاوەن ژیری یەکان(٦١٩)، کەچی گوتیان: مەبەستی خوای تعالی بە ﴿لَآيَاتٍ لِأُولِي الْأَلْبَابِ﴾ واتە ئەوانە بەڵگەن بۆ خۆم.

---

٦١٨ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

٦١٩ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

ئالێرەدا شتێکیان داوەتە پاڵ خوای تعالی، کە لە بنچینەدا خوای تعالی بە هی کەسانی ژێرمەندی داناوە، بەڕاستی ئەم کارە قورئان گۆڕینە.

سەبارەت بەم ئایەتە: ﴿ وَلِسُلَيْمَانَ الرِّيحَ ﴾ سبأ: ١٢ ﴾ واتە وە بۆ سولیمان بامان ڕام هێنا(٦٢٠) دەڵێن: مەبەستی خوای تعالی بەم جۆریە: (ولي سُليمان) !!

دەڵێم _ ابن الجوزي _: من سەرم سوڕدەمێنێ لەمانەی کە خۆیان لە پارو و، وشەی حەرام دەپارێزن و، ئا بەم جۆرە لە تەفسیری قورئاندا سنوور دەبەزێنن، تا ئەم ئاستە ؟!

لە (رُوَيْمِ)ەوە دەڵێت: خوای تعالی چەند شتێکی لە چەند شتێکدا پەنهان کردووە، مەکرو پیلانی خۆی لە زانستی خۆیدا پەنهان کردووە، هەڵخەڵەتاندنی (الخداع) خۆی لە لوتف و سەرکەوتن بەخشینی خۆیدا پەنهان کردووە، سزاکانی خۆی لە دەروازەی کەراماتیدا پەنهان کردووە.

ئەم شتەش تێکەڵ و پێکەڵ کردنەو، بەرامبەر بە خوای تعالی زاتکردن و چاونەترسیە.

پەنا بەخوا دەگرین لەم تێکەڵ و پێکەڵ کردنەو، لە قسەکردن لە زانستدا بەئێی ویست و ئارەزووی خۆیی،

دڵنیابن باسکردن و هەواڵدان بەم شتە غەیبیاتانە هیچ کەس نایانزانێ _ ئەگەر هەقیش بێت _ مەگەر پێغەمبەرێك، ئیتر ئەو چۆن دەیانزانێ ؟!

بەڵام دووربوونی ئەمانە لە زانستەوە، ڕازی بونیان بە واقیعاتە بۆگەنەکانی خۆیان، ئەم تێکەڵ و پێکەڵ کردنەی بۆ دروست کردن.

با بزانرێت کە ئەندێشەو، خەیاڵات و، واقیعات لە ڕاستیدا بەروبومی زانستی خوودی مرۆڤەکەیە، بۆیە هەرکەس زانا بوو، ئەوا ئەندێشەو خەیاڵاتیشی ڕاست و دروستن، چونکە بەروبومی زانستە باشەکەی خۆیەتی، هەرکەسێکیش نەفام بوو، ئەوا بەروبومی هەموو نەفامی بەشی خۆی دەبێ.

---

٦٢٠ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

پێشەوا _ ابن الجوزي _ دەفەرمێت: بەچاوەکانی خۆم بینیم (ابنِ عقيلٍ) بەدەست و خەتی خۆی نوسیبووی: (أَبويزيدَ) بەلای گۆڕستانی جولەکەکاندا تێپەڕیوو و، گوتی: پەروەردگارا ئەمانە چین تا سزایان بدەی، تەنها چنگێگ ئێسك و پروسكن كە قەدەریان بە سەردا تێپەڕیووە، لێیان خۆش بە.

نووسەر دەفەرمێت:

ئەمە كەم زانستبوونە، چونكە كاتێ گوتویەتی ((چنگێگ ئێسك و پروسكن))، گاڵتەپێكردن و بەسووك تەماشاكردنی ئادەمی تێدا بەدیدەكرێت، لەبەر ئەوەی مرۆڤی ئیماندار ئەگەر مرد هەر تەنها چنگێك ئێسك و پروسك دەبێ و، لەوە بەدەر نابێ.

كە گوتوویەتی ((قەدەریان بە سەردا تێپەڕیووە))، خۆ هەمان قەدەریش بەسەر فیرعەوندا تێپەڕیوو !

كە گوتویەتی ((لێیان خۆش بە))، نەفامبوونە بە شەریعەت، چونكە خوای _ عزَّوجلَّ _ پێمان دەفەرمێت: ﴿ إِنَّ اللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَنْ يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَنْ يَشَاءُ ﴾ ﴿النساء: ٤٨﴾ واتە ﴿ إِنَّ اللَّهَ ﴾ بەڕاستی خوا ﴿ لَا يَغْفِرُ أَنْ يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ ﴾ خۆش نابێت گەر هاوبەشی بۆ دابنرێ، بێجگە لەوە خۆش ئەبێت لە هەر گوناهێكی تر ﴿ لِمَنْ يَشَاءُ ﴾ بۆ هەر كەسێك كە بیەوێت(٦٢١)، لێرەدا خوای تعالى پێی ڕاگەیاندوین كە لەو كەسانە خۆش نابێ كە هاوبەشیان بۆ داناوەو، بە كافری مردوون، چونكە ئەگەر خوای تعالى تكاكاری كافرانی قبوڵ بوایە، ئەوا نزاكەی پێغەمبەر (ابراهیم)ی _ صلوات الله وسلامُه عليه _ قبوڵ دەكرد، كاتێ داوای لێخۆشبوونی بۆ بابی كرد، خوای تعالى دەفەرمێت: ﴿ وَمَا كَانَ اسْتِغْفَارُ إِبْرَاهِيمَ لِأَبِيهِ إِلَّا عَنْ مَوْعِدَةٍ وَعَدَهَا إِيَّاهُ فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُ أَنَّهُ عَدُوٌّ لِلَّهِ تَبَرَّأَ مِنْهُ إِنَّ إِبْرَاهِيمَ لَأَوَّاهٌ حَلِيمٌ﴾﴿ التوبه: ١١٤ ﴾ واتە ﴿ وَمَا كَانَ اسْتِغْفَارُ إِبْرَاهِيمَ لِأَبِيهِ ﴾ وە داوای لێخۆشبوونی ئیبراهیم بۆ باوكی ﴿ إِلَّا عَنْ مَوْعِدَةٍ ﴾ تەنها لە بەر وادەو بەڵێنێك بوو ﴿وَعَدَهَا إِيَّاهُ﴾ كە بە باوكی دابوو (كە داوای لێ بوردنی بۆ بكات) ﴿ فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُ ﴾ جا كاتێ بۆی

---

٦٢١ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

ڕوون بویەوە﴿ أَنَّهُ عَدُوٌّ لِلَّهِ ﴾ کە بێگومان باوکی دوژمنی خوایە ﴿ تَبَرَّأَ مِنْهُ ﴾ خۆی لێ بەری کرد ﴿ إِنَّ إِبْرَاهِيمَ لَأَوَّاهٌ حَلِيمٌ ﴾ بەڕاستی ئیبراهیم زۆر لە خوا ترس و لە سەر خۆ بوو (٦٢٢)، وە محمد _ صلی الله علیه وسلم _ بۆ دایکی(٦٢٣).

بۆیە پەنا بەخوا دەگرین لە کەم زانستی.

---

٦٢٢ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

٦٢٣ _ کما روی مسلم في ((صحیحه))(٩٧٦) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ _ صلی الله علیه وسلم _: ((اسْتَأْذَنْتُ رَبِّي أَنْ أَسْتَغْفِرَ لِأُمِّي، فَلَمْ يَأْذَنْ لِي، وَاسْتَأْذَنْتُهُ أَنْ أَزُورَ قَبْرَهَا، فَأَذِنَ لِي)) واتە لە (أَبِي هُرَيْرَةَ)ەوە _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا _ صلی الله علیه وسلم _ فەرمووی: ((لە پەروەردگارم داوم کرد مۆڵەتم بدات داوای لێخۆشبوون بۆ دایکم بکەم، بەڵام مۆڵەتی نەدام، وە داوام لێکرد مۆڵەتم بدات سەردانی گۆڕەکەی بکەم، ئەوەبوو مۆڵەتی دام)).

## ✵ لەو قسانەی کە سەبارەت بە فەرموودەو هیتریش کردویانە :

لە (عبدِالله)ی کوڕی (أحمدَ)ی کوڕی (حنبلِ)ەوە فەرموویەتی: (أبوتُرابِ النَّخْشَبِيُّ) هاتـە دیدەنی بابم و، لەو کاتەدا بابم دەیفەرموو: (فلانٌ ضعیفٌ)، (فلانٌ ثقةٌ). (أبوتُرابِ)یش گـوتی: ئەی شێخ ! غـەیبەتی زانایان مەکە(٦٢٤). بابیشم بـەرەو لای ئـەو ئـاوڕێکی دایـەوەو، پێـی فەرموو: وەی بۆ تۆ، ئەمە ئامۆژگاریە، غـەیبەت نییە.

لە (محمدِ)ی کوڕی (الفَضْل العبَّاسـيِّ)وە دەڵێـت: لای (عبـدِالرحمنِ)ی کـوڕی (أبـي حـاتمٍ) بووین، کە کتێبی ((الجرح والتعـدیل))ی بۆ دەخوێندینەوەو، گوتی: باروحاڵی ئەهلی زانـستان بۆ ئاشکرا دەکەم ئەوانەی (ثقةٌ)ن یاخود (ثقةٍ) نین. (یوسُفُ)ی کوڕی (الحُسَینِ)یش گوتی: شەرم لە قسەکانت دەکەم ئەی (أبا محمدٍ)، چونکە چەندها ئەو کەسانە سەد ساڵ و دوو سـەد سـاڵە باروکۆچیان لە بەهەشتدا خستووە، تۆش لە سەر ئـەم زەویـە باسـیان دەکـەی و، غـەیبـەتیان دەکەی ! (عبدِالرحمنِ)یش گریاو گوتی: ئەی (أبا یعقوبَ) ! ئەگەر ئەم وشـەیەم پـێش دانـانی ئەم کتێبەم گوێبیست بوایە، هەرگیز نەم دەنووسی و دام نەدەنا !

---

٦٢٤ _ ئەمرۆ کەسانی واریسی بیدعەکانی ئەوان، هەمان دەستەواژەکانی ئەوان دووبارە دەکەنـەوەو، بـە وشەکانی ئەوانەوە گۆرانی دەڵێن، ئەگەر کەسێکی ئەهلی سوننەت وەڵامی کەسێك لە ئاژاوەچیان بداتەوە، یاخود بەرگری لە خۆی بکات بەرامبەر بەو بوختان و درۆ دەلەسانەی نەیارانی بۆی هەڵدەبـستن و، پێـوەی دەلکێنن و، بەو هاوشێوانە " ئەوانەی خۆیـان بـە بانگـەوازکارانی ((یـەکێتی ڕیزەکـان))و ((یەککـەوتنی وشـە)) دادەنـێن بانگیـان لـێ بـەرز دەبێتـەوە، ئەمـە دوویـەرەکی چـاندنە لـە نێـوان ئومەتـدا، ئەمـە غەیبەتە،و..و... !!

ئەم کەسانە بە مەنهەجی زانایان بۆ بەدەرخستنی بیدعەچیان و، وەڵامدانەوەی ئەهلی هەواو ئارەزوو، زانـا نین، ئەگەر شتێکیان لەو بارەوە بزانیبا، چیتر زاتی ئەوەیان نەدەبوو نکۆڵیی بکەن و، بەبێ هیچ بەڵگەیـەك قسەبکەن ! لەڕاستیدا تەنها ئەوانن تۆوی دووبەرەکی لە نێـوان ((ڕیزەکـان))دا دەچـێنن و ((ووشـە))کـان جیادەکەنەوە، کاتێ کە بێدەنگ دەبن و (چەورەبیی)) بۆ کەسی بەرامبەر دەکەن.

دەڵێم _ ابن الجوزي _: خوا لە (ابن أبي حاتم) خۆش بێ، چونکە ئەگەر کەسێکی زۆر فیقهزان بوایە، وەڵامی دەدایەوە وەکو چۆن پێشەوا (أَحمَدَ)ی کوڕی (حنبلٍ) وەڵامی (أبي تُرابٍ) دایەوە، باشە ئەگەر زانستی ((الجرح والتعديل)) نەبوایە، لە کوێ وە (صحیح) و (باطل)ی فەرموودە دەزانراو جیا دەکرایەوە ؟

پاشان بوونی ئەو کەسانە لە بەهەشتدا قەدەغەمان ناکات باسیان بکەین بەو سیفاتانەوە کە تیایاندایە.

وە ناونای ئەوە بە غەیبەت قسەیەکی خراپە.

پاشان ئەو کەسەی کە ((الجرح والتعديل)) نەزانێ چۆن بتوانێ باش و خراپی قسەی کەسانی دیکە بزانێ.

(أبوالعباسِ)ی کوڕی (عطاءٍ) دەڵێت: هەرکەس خوا بناسێت، چیتر داوای لێ ناکات پێویستیەکانی بۆ جێبەجێ بکات، چونکە دەزانێ خوای تعالی بە هەموو باروحاڵەکانی ئەو زانایە!

دەڵێم _ ابن الجوزي _: ئەم قسانە داخستنی دەروازەی داواکردن و نزایە، کە لە خودی خۆیدا نەفامبوونە بە زانست.

لە (أبي بكرٍ الصوفيِّ)ەوە دەڵێت: لاوێك لە (الشِّبْلِيِّ) پرسی و گوتی: ئەی (أبابكرٍ) ! بۆ دەڵێی: ((الله) و، ناڵێی: ((لا إلهَ إلا اللهِ)) ؟ (الشِّبْلِيِّ)یش گوتی: شەرم دەمگرێ (إثبات) پاش (نفيٍ) بەکار بێنم ! (واتە شەرم دەیگرێ (إلا اللهِ) واتە جگە لە خوا، پاش گوتنی (لا إلهَ) واتە هیچ خواوەندێك نییە بەهەق بڵێت)، لاوەکەش گوتی: لەم بەهانەیە بەهێزترم دەوێ! ئەویش گوتی: چونکە دەترسێم کاتێ وشەی نکۆڵیکردن واتە (لا إلهَ) دەڵێم، خوای تعالی سزام بات، پێش ئەوەی بە وشەی دان پیانان و جێگیرکردن واتە (إلا اللهِ) بگەم !

نووسەر دەفەرمێت:

تەماشای ئەم زانستە وردە بکەن ! دڵنیابن پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ فەرمانی بە گوتنی: ((لا إلهَ إلا الله) دەکردو، هانی خەڵکیشی دەدا بۆ گوتنی.

وفي ((الصحيحين))(٦٢٥) عنه كانَ يقولُ دُبُرَ كُلِّ صلاةٍ:

((لا إلهَ إلا الله وحدَهُ لا شريكَ لهُ)).

واته پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ پاش تەواوکردنی هەموو نوێژێك دەیفەرموو: ((هیچ خوایەك نییە بەهەق جگە لە خوا کە تاك و تەنهایەوهیچ هاوەڵێکی نییە)).

وكانَ يقولُ إذا قامَ لصلاةِ الليلِ:

((لا إلهَ إلا أَنْتَ))(٦٢٦).

واتە پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ هەرکات بۆ شەونوێژ هەستایە دەیفەرموو:

((هیچ خوایەك نییە بەهەق جگە لە تۆ)).

هەروەها پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ باسی پاداشتی گەورەی کردووە بۆ هەرکەسێك بڵێت: ((لا إِلهَ إلا اللهِ))(٦٢٧).

بۆیە تەماشای ئەو دەستدرێژیە بکەن کە ئەوان دەیکەنە سەر شەریعەت، شتانێکیش هەڵدەبژێرن کە پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ هەڵینەبژاردووە.

لە (أبي القاسمِ عبدِالرحيمِ)ی کوڕی (جَعْفَرِالسِّرافيِّ) فیقهزانەوە دەڵێت: لە شیراز لای (أبي سعيدِ بِشْرِ)ی کوڕی (الحسنِ الداوديّ) قازی ئەو شارە ئامادە بووم _ کاتی پیاو و ژنێکی صوفی _ هاتنە لای، دەڵێت: ئەو کاتە بارودۆخی صوفیەکان لەوێ زۆر پەرەی سەندبوو، تا ئەو ئاستەی دەڵێن: ژمارەیان گەشتبووە هەزارەها، ژنە صوفیەکە داوای یارمەتی قازیەکەی دەکرد، بۆ چارەسەرکردنی کێشەی نێوان خۆی و مێردەکەی، بۆیە کاتێ هەردوکیان لە پێش

---

٦٢٥ _ رواه البخاري (٢ / ٢٧٥)، ومسلم (٥٩٣) " عن المغيرة بن شُعبة.

٦٢٦ _ رواه البخاري (٣ / ٣٣) عن عُبادة بن الصامت.

٦٢٧ _ پێشەوا (ابنِ البَنَّاءِ) کتێبێکی هەیە بە ناوی ((فضل التهليل وثوابه الجزيل))، تیایدا نزیکەی پەنجا دەقێك لەو بارەوە دەهێنێتەوە، کتێبەکەش چاپ کراوە.

قازیدا ئامادەبوون، ژنە صوفیەکە گوتی: ئەی قازی ! ئەم پیاوە مێردی منەو، دەیەوێ تەڵاقم بات، بەڵام بۆی نییە تەڵاقم بات، دەمەوێ قەدەغەی بکەی ! دەڵێ: ئـەوەبوو (أبـي سـعیدٍ)ی قازی سەری سوڕما _ وە توڕەبوو لە ڕێباوەڕی صوفیەکان _، پاشان بە ژنەکەی گـوت: ئـەی چۆن ؟ بۆ تۆ نییە ئەوە بکەی ! ژنەکە گوتی: چونکە هاوسەرگیری لە گەڵدا کردم و مانای ئەو بە منەوە بەندە، ئێستا ئەو دەڵێ ماناکەی بەمنەوە تەواو بووە، بەڵام مانـای مـن بەئـەوەوە بەندەو تەواو نەبووە، بۆیە پێویستە ئارام بگرێت تاوەکو مانای منیش لـە ئـەودا تـەواو بـێ، وەکو چۆن مانای بەمنەوە تەواو بووە.

(أبي سعیدٍ) پێی گوتم: ئەم فیقهە چۆن دەبینی ؟! پاشان نێوانی چـاکردن و، بـەبێ تـەڵاق هەردوکیان چوونە دەرەوە.

(أبوحامدِ الطوسيُّ) لە کتێبی (الإحیاء)دا دەڵێت: کەسـانێکیان دەڵـێن: پـەروەردگارێتی نهێنیەکی هەیە، ئەگەر ئاشکرای کات، پێغەمبەرایەتی پـووچ دەبێتـەوە، پێغەمبەرایـەتیش نهێنیەکی هەیە، ئەگەر ئاشکرا بکرێت، زانست پووچ دەبێتەوە، ئەو کەسانەش کـە بـە خـوا زانان، نهێنیەکان هەیەو ئەگەر ئاشکرای کەن، حوکمەکان پووچ دەبێتەوە !

دەڵێم _ ابن الجوزي _: تەماشای ئەم تێکەڵ و پێکەڵ کردنە ناشیرینە بکـەن، بانگەشـەی ئەوە دەکات کـە ڕووی ئاشـکرای شـەریعەت (ظـاهر الـشریعة) دژبـە ڕووە ناوەکیەکەیـەتی (باطنها).

(أبوحامدِ) دەڵێت: کەسێکی صوفی منداڵێکی ون بوو، پێی گوترا: لـە خـوای تعـالی داوا بکە کە منداڵەکەت بۆ بگەڕێنێتەوە. ئەویش گوتی: ڕەخنەگرتنم لە خـوای تعـالی سـەبارەت بەوەی تەقدیری کردووە زۆر لە ونبوونی منداڵەکەم بەلامەوە ناخۆشترە.

دەڵێم: بەڕاستی سەرسوڕمانم بەرامبەر بە (أبوحامـدِ) درێژە دەکێشێ ؛ کە چۆن ئەم شتانە لە ڕووی پەسەندکردن و، پێ قایلبوون و، پێ ڕازی بوون بە قسەی ئەو صوفیە باس دەکـات، لە کاتێکدا چاك دەزانێ نزاو لە خوا داواکردن هیچ مانایەکی ڕەخنەگرتن نابەخشێت.

ئەمە کورتیەك بوو لە قسەو فیقهی ئەم قەوەمـە، تیایـدا خـەڵکم لـە زانـست و، خـراپ تێگەشتن و، زۆریی هەڵەیان ئاگادار کردۆتەوە !

## ✸ بەیادهێنانەوەی سەرلێشێواندنەکانی ئیبلیس بەرامبەر بە صوفیەکان لە بواری (الشَطحْ)[٦٢٨] و بانگەشەکرندا:

نووسەر دەفەرمێت:

بزانە زانست لە خوا ترسان و، نەفس بێزاندن و، درێـژیی بێـدەنگبوون بـۆ مـرۆڤ دروسـت دەکات، ئەگەر تەماشای زانایانی پێشین بکەی، دەبینی تەرسیان بەسەردا زاڵەو، بانگەشـەو، زۆر گوتنیان لێوە بەدوورە، وەکو ئەوەی پێشەوا (عُمَرُ) فەرموویەتی: (الويلُ لعُمَـرَ إنْ لَمْ يُغفَـرْ لهُ) واتە وەیل بۆ عومەر ئەگەر لێی نەبوردرێت.

هاوەڵیی بەڕێز (ابنُ مسعودٍ) فەرموویەتی: (لیـتَني إذا مِـتُّ لا أُبْعَـثُ) واتـە بریـا کـاتێ دەمردم زیندوو نەکرایەمەوە.

(سُفيانُ الثوريُّ) لە کاتی سەرەمەرگدا بە (حَمَّادِ)ی کوڕی (سلمَةَ)ی گوت: (ترجو أَنْ يُغْفَـرَ لِمْثْلي ؟) واتە پێی گوت: ئومێدارێت لە کەسێکی وەکو من ببوردرێت.

نووسەر دەفەرمێت:

لە ڕاستیدا قسانێکی بەم شێوە لەم پێشەوایانەوە هاتـە دەرێ، چـونکە زانـستیان بـەخوا بەهێز بوو، بەهێزبوونی زانستیش ترس و بیم بۆ مـرۆڤ بەرامبـەر بـە خـوای تعـالی دروسـت دەکات، خوای _ عزَّوجلَّ _ دەفەرمێت:

﴿إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ﴾ (فاطر: ٢٨) واتە بەڕاستی لە ناو بەندەکانی خـوادا تەنیا زانایان (وەك پێویست) لە خوا دەترسن(٦٢٩).

---

٦٢٨ _ الشطح: وشەو قسەو زۆر گوتنێکە صوفیەکان دەریدەبڕن و، ڕووی ئاشکرای پێچەوانەی شـەرعە، بڕوانە: محمد قلعجي، معجم لغة الفقهاء، ص٢٦٢، وەرگێر.

٦٢٩ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

وقالَ _ صلى الله عليه وسلم _:

((أَنا أَعْرَفُكُم باللهِ، وأَشَدُكُمْ لهُ خشيةً))(٦٣٠).

واتە پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ فەرموویەتی:

((من لە هەمووتان بەخوا زاناترم و، لە هەمووشتان زیاتر ترسم لێیەتی)).

بەڵام كاتێ تاقمێك لە صوفیەكان لە زانست دوركەوتنەوەو، تەماشای كردەوەكانی خۆیان كرد، كە هەندێ (اللُّطْفِ)یان بۆ بەدیهات كە لە (كَرامات)(٦٣١) دەچوو، بۆیە ئیتر پێیان درێژ كردو، بەزۆری بانگەشەو قسەی هەڵەت و پەڵەتیان دەكرد.

---

٦٣٠ _ رواه البخاري (١٣ / ١٢٥)، ومسلم (٢٣٥٦) " عن عائشة.

٦٣١ _ جیاوازی نێوان (اللُّطْف) و (كَرامات):

(كَرامات): ئەو ئاسانكاریانەیە كە خوای تعالى بۆ بەندە ئیمانداره چاكەكانی خۆی بەدیدەهێنێت، بەجۆرێك یارمەتیدەری بێ بۆ زیاتر لە خوا ترسان و مەلكەچی و پەرستنی خوای تعالى، بەو هۆیەوه هەر لە ژیانی دونیادا رێز لە بەندەكەی خۆی دەنێت، بۆ نموونە خوای تعالى دڵی بەندەیەكی دەكاتەوه بۆ زیاتر خوێندن و تێگەشتنی قورئان، یاخود یارمەتی بەندەكەی خۆی دەدات بۆ ئەوەی بە بەردەوام پاك و تەمیزبێ، یاخود یارمەتی دەدات بۆ شەونوێژی بەردەوام، یاخود نوێژی سوننەتی بەردەوام، یاخود بەرێژووبونی سوننەت، نوێژكردنی بەردەوامی بە كۆمەڵ و بەو هاوشێوانە، وە پێدەچێ هەندێ لەو كراماتانە پەیوەندی بە كاروبارە دونیایەكانەوە هەبێ، وەكو ئەوەی خوای تعالى یارمەتی بەندەكەی خۆی دەدات بۆ بەدەستهێنانی پێداویستیە دونیایەكانی، وەكو ئەوەی پێشەوا (عمر)ی كوڕی (الخطاب) _ خوای لێ ڕازی بێت _ لە شاری مەدینەی پیرۆز بەسەر مینەرەوە بوو وتاری دەخوێندەوە لە ناكاو بەدەنگی بەرز فەرمووی ((ئەی ساریە چیاكە چیاكە))، مەبەستی (ساریە)ی كوڕی (زنیم) بوو كە فەرماندەی سریەیەك بوو لە سەر زەوی فارس ! ئەوەبوو ساریەو هاوەڵانی قسەكانی پێشەوا (عمر)ین گوێبیست بوو هەرچەند لەو كاتەدا لە ڕێزەكانی جەنگدا بەرامبەر بە دوژمن وستابوون، بۆیە پاڵیان دایە چیاكەوەو بەرگریان لە خۆیان كرد تاوەكو سەركەوتن. وە چەندها نموونەی تریش، بڕوانە: ar.islamway.com.

بەڵام (اللُّطْفِ): ئاستی لە (كرامات) كەمترەو، لە شتە بچوكەكان و، ئەو شتانەی كە ڕۆژانە ڕوودەدات دوبارە دەبێتەوە، وەكو دۆزینەوەی شتێكی ونبوو، یاخود چاكبوونەوە لە نەخۆشیەكی بچوك، یاخود بەدەستهێنانی ڕۆزیەكی پێشبینی نەكراو. بڕوانە: http://meerzahussain.forumarabia.com، وەرگێر.

له (أَبي يزيدَ البسطاميِّ)وه دەڵێت: خۆزگە دەخوازم كە قيامەت هەستايە، تـا چـادرەكەم بە سەر دۆزەخەوە هەڵدايە ! پياوێكيش لێی پرسی: بۆ وادەكەی (أَبا يزيدَ) ؟ ئـەويش گـوتی: من دەزانم ئەگەر دۆزەخ بمبينێت، دادەمركێتەوەو، بۆ هەموو خەڵكی دەبم بەڕەحمەت !

نووسەر دەفەرمێت:

ئەم قسە ناشرينترينی هەموو قسەيەكە، چونكە ئەو ئاگرە بەسووك تەماشـا دەكـات كـە خوای _ عزَّوجلَّ _ زۆر بە گەورە وەسفی دەكات، خـوای تعـالی دەفـەرمێت: ﴿فَـاتَّقُواْ النَّـارَ الَّتِي وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ﴾ ﴿البقرة: ٢٤﴾ واتە ﴿فَاتَّقُواْ النَّارَ الَّتِي﴾ دەی خۆتـان بپـارێزن لــەو ئـاگرەی كـە ﴿ وَقُودُهَـا النَّـاسُ وَالْحِجَـارَةُ ﴾ سـووتەمەنيەكەی خـەڵك (ی بــەدكار)و بەردە(٦٣٢).

هەروەها دەفەرمێت: ﴿ إِذَا رَأَتْهُمْ مِنْ مَكَانٍ بَعِيدٍ سَمِعُوا لَهَـا تَغَيُّظـاً وَزَفِـيراً ﴾ ﴿الفرقـان: ١٢﴾ واتە ﴿ إِذَا رَأَتْهُمْ مِنْ مَكَانٍ بَعِيدٍ ﴾ كـاتێ (ئـەم ئـاگرە) لـە دوورەوە ئـەوان دەبينێـت ﴿سَمِعُوا لَهَا تَغَيُّظاً وَزَفِيراً ﴾ نركەو ناڵەی گڕو بڵێـسەی دەبيـستن (كـە نيـشانەی ڕق و قينـی زۆرێتی لێيان)(٦٣٣).

وە چەندەها ئايەتی ديكەش.

عن أَبي هُرَيْرَةَ قالَ: قالَ رسولُ اللهِ _ صلى الله عليه وسلم _: ((إِنَّ نَارُكُمْ هَذِهِ " مـا يُوقِـدُ بَنُو آدَمَ: جُزْءٌ مِنْ سَبْعِينَ جُزْءاً مِنْ حَرِّ جَهَنَمَ)).

فقَالَ لهُ الصحابةُ : وَاللهِ إِنْ كَانَتْ لَكَافِيَةً يَا رسولَ الله.

قَالَ: ((فُضِّلَتْ عليها بِتِسْعَةٍ وَسِتِّينَ جُزْءَا، كُلُّهُنَّ مِثْلُ حَرِّهَا)).

أَخرجاهُ في ((الصحيحينِ))(٦٣٤).

واتە لە (أَبي هُرَيْرَةَ)وە _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموويەتی: پێغەمبەری خوا _ صـلى الله عليه وسلم _ فەرمووی: ((گەرمی ئەم ئاگرەی ئێـوە، كـە ئـادەميزاد دايدەگيرسـێنێت، بەشێكە لە حەفتا بەشی گەرمی دۆزەخ)).

---

٦٣٢ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسيری قورئان.

٦٣٣ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسيری قورئان.

٦٣٤ _ رواه البخاري (٦ / ٢٣٨)، ومسلم (١٨٤٣).

هاوەڵانیش پێیان فەرموو: سوێند بەخوا ئەگەر هەر ئەم ئاگرەش بوایە بۆ سزادانی سەرپێچیکاران بەسبوو لە ڕۆژی دوایدا ئەی پێغەمبەری خوا.

پێغەمبەری خواش _ صلی الله علیه وسلم _ فەرمووی: ((ئاگری دۆزەخ بە شەصت و نۆ پلە بەسەر ئاگری دونیادا زیاد کراوە، گەرمی هەر بەشێکی بە هاوشێوەی گەرمی دونیایە)).

وفي أفرادِ مسلمٍ (٦٣٥) مِن حديثِ ابنِ مسعودٍ عن النبيِّ _ صلى الله عليه وسلم _ أنَّهُ قالَ:

((يُؤتَى بِجَهَنَّمَ يومَئذٍ لَهَا سَبْعُونَ ألفَ زِمَامٍ ، مَعَ كُلِّ زِمَامٍ سَبعُونَ ألْفَ مَلَكٍ يَجُرُّونَهَا)).

واتە لە (ابنِ مسعودٍ)ەوە _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا _ صلی الله علیه وسلم _ فەرمووی: ((ڕۆژی قیامەت دۆزەخ دەهێنرێت حەفتا هەزار جڵەوی هەیە، لە گەڵ هەر جڵەوێکدا حەفتا هەزار فریشتە هەن ڕایدەکێشن)).

پێشەوا (عُمَر)ی کوڕی (الخطابِ) _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرمووی: ئەی (کعْبُ) ! بمانترسێنە.

ئەویش فەرمووی: ئەی ئەمیری موسڵمانان ! وەکو پیاوێك کار بکە، کە ئەگەر بە ئەندازەی کردەوەی حەفتا پێغەمبەرەوە بە ڕۆژی قیامەت گەشتیت، بە کردەوەکانی خۆت گاڵتەت بێت، لە ئاستی ئەو باروحاڵەدا کە چاوت پێ دەکەوێت.

(عُمَر) _ خوای لێ ڕازی بێت _ ماوەیەکی درێژ بێدەنگ بوو، پاشان بە ئاگا هاتەوەو، فەرمووی: ئەی (کعْبُ) زیاتر بمانترسێنە !

ئەویش فەرمووی: ئەی ئەمیری موسڵمانان ! ئەگەر لە بەری ڕۆژهەڵاتەوە بە ئەندازەی لووتە گایەك لە دۆزەخ بکرێتەوەو، پیاوێکیش لە ڕۆژئاوا بێت، دڵنیابە مێشکی دەکوڵێ تاوەکو دەڕژێ لە بەر گەرمیەکەی.

---

٦٣٥ _ برقم (٢٨٤٢).

(عُمَرَ) _ خوای لێ ڕازی بێت _ ماوەیەکی درێژ بێدەنگ بوو، پاشان بە ئاگا هاتەوەو، فەرمووی: ئەی (کعْبُ) زیاتر !

ئەویش فەرمووی: ئەی ئەمیری موسڵمانان ! دڵنیابە لە ڕۆژی قیامەتدا دەنگی هەڵگڕانێکی دۆزەخ دەبیسترێت، هەر هەموو فریشتە نزیکەکان و پێغەمبەرە هەڵبژێردراوەکان چۆك دادەدەن و، دەڵێن: پەروەردگارم نەفسی خۆم نەفسی خۆم، ئەمرۆ داوای هیچت لێ ناکەم جگە لە نەفسی خۆم !

ڕۆژێك هاوەڵی بەڕێز (عبدُاللهِ)ی کوڕی (رواحةَ) گریا، خێزانەکەشی پێی گوت: بۆ دەگری؟ ئەویش فەرمووی: پێیان ڕاگەیاندم من بەسەر دۆزەخدا تێدەپەڕەم و (٦٣٦)، پێیان نەوتم لێی دەگەڕێمەوە.

نووسەر دەفەرمێت:

ئەگەر ئەمە باروحاڵی چاکترین کەسانی ئەم ئومەتە بێ و، ئەوەش سەغڵەتیان بێت، ئەی دەبێ لای ئەو (أبا یزید)ە بانگەشەکارە چۆن بێ ؟

پاشان ئەو (أبا یزید)ە بەشێکی تایبەتی لە ماف گەرێتی و، دەستەڵات و، ڕزگاربوونی بۆ نەفسی خۆی جیاکردۆتەوە، بەبێ ئەوەی بزانێ ئەو شتەی پێدراوە یاخود پێی نەدراوە ! ئایا ڕزگاربوون بۆ تاقمێکی تایبەت لە هاوەڵان نەبێ بۆ کەسی دیکە هاتووە ؟!

(ابنُ عقیلٍ) دەیگوت: لە (أبي یزید)ەوە دەگێڕنەوە گوتویەتی: باشە ئاگری دۆزەخ چی یە، سوێند بەخوا ئەگەر بیبینم بە لایەکی ئەم پۆشاکە (المُرَقَّعة)مە یا بەشتێکی تری وەکو ئەمە دەیکوژێنمەوە. (ابنُ عقیلٍ) دەڵێت: هەر کەس ئەمە بڵێت، ئەوا زیندیقەو پێویستە بکوژرێت، چونکە بە سووك تەماشاکردنی شت بەروبومی نکۆڵیکردنە، تۆ تەماشا بکە ئەو

---

٦٣٦ _ ئەوە لەو ئایەتەدا کە خوای تعالی دەفەرمێت: ﴿ وَإِن مِّنكُمْ إِلاَّ وَارِدُهَا كَانَ عَلَى رَبِّكَ حَتْمًا مَّقْضِيًّا ﴾﴿ مریم: ٧١ ﴾ واتە ﴿ وَإِن مِّنكُمْ ﴾ کەس نییە لە ئێوە ﴿ إِلاَّ وَارِدُهَا ﴾ نەڕوات و تێنەپەڕێت بەسەر دۆزەخدا ﴿ كَانَ عَلَى رَبِّكَ حَتْمًا مَّقْضِيًّا ﴾ (ئەو تێپەڕینە) بڕیارێکی بڕاوەیە لە پەروەردگارتەوە. مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

کەسەی کە باوەڕی بە جنۆکە هەیە، لە تاریکیدا دەلەرزێ، هەرکەسیش باوەڕی پێ نەبێ، سەغڵەت نابێ، لەوانەشە بڵێت: ئەی جنۆکەکان ! بمبەن ! کەسێکی بێژەری وەکو ئەم (أبي یزید)ە پێویستە مۆمێك لە دەم و چاوی نزیك بکەیتەوە، ئەگەر سەغڵەت بوو، ئەوجا پێی دەگوترێت: ئەمە تەنها پشکۆیەکە لە ئاگر کەچی تۆ لێی دەترسی.

لە (طَیفورِ الصغیر)ەوە دەڵێت: گوێبیستی مامم بووم کە خزمەتکاری (أبي یزید) بوو دەیگوت: گوێبیستی (أبي یزید) بووم دەیگوت: (سُبْحاني، سُبْحاني ما أعظَمَ شأني !!).

واتە گوتی: (پاك و بێگەردی بۆ من ، پاك و بێگەردی بۆ من، پلەو پایەم چەند گەورەیە).

دەڵێم ـ ابن الجوزي ـ: ئەگەر ئەمە بە (صحیح)یش لەوەوە باسکرابێ، پێدەچێ ئەو کەسەی ئەم شتەی لێوە دەگێڕێتەوە لە قسەکەی تێنەگەشتبێ، چونکە لەوانەیە مەبەستی ڕێزلێنان و بەگەورەدانی خودی خوای هەق بێت، بەڵام تیایدا گوتویەتی (سُبْحاني) وەکو باسکردن و گێڕانەوەیەك لە خواوەو، مەبەستی نەفسی خۆی نەبووە.

(الجنَیْدُ)یش قسەکانی (أبي یزید)ی تەئویل کردووە بەڵام ئەگەر نەگەڕێتەوە سەر ئەوەی کە من گوتومە، ئەوا بەهیچ دانانرێت.

لە (جعفرِ الخُلْدِيِّ)ەوە دەڵێت: بە (الجنَیْدُ)یان گوت: (أبا یزید) دەڵێت: (سُبحاني، سُبحاني، أنا ربي الأعلی) واتە: (پاك وبێگەردی بۆ من، پاك و بێگەردی بۆ من، من خوای بەرزو بڵندی خۆمم)، (الجنَیْدُ)یش گوتی: بەڕاستی پیاوەکە لە تەماشاکردنی خوای جەلالدا بەکاربراوە، کاتێ خوای هەقی بینی سەری سوڕماو گێژبوو، بۆیە بەدەر لە خوای هەق هیچی دیکەی نەبینی و، ئیتر بەو جۆرە وەسفی کرد.

دەڵێم ـ ابن الجوزی ـ: ئەم قسانە پڕو پووچن.

لە (عبدِاللهِ)ی کوڕی (عليّ السَّرَّاجِ)ەوە دەڵێت: گوێبیستی (أحمَدَ)ی کوڕی (سالمِ البصريً) بووم ڕۆژێك لە مەجلیسەکەی خۆیدا لە بەصرە دەیگوت: فیرعون ئەو شتەی نەگوت کە (أبو یزید) گوتویەتی، چونکە فیرعون دەیگوت: ﴿ أنا رَبُّكمُ الأعْلی﴾ ﴿النازعات: ٢٤ ﴾ واتە

وتی: من پەروەرگاری هەرە گەورەتانم(٦٣٧)، چونکە لە زمانی عەرەبیدا وشەی (الـرَّب) مانای خاوەنیش دەبەخشێت، بۆیە دەتوانرێت وەکو ناوێك بۆ خـەڵكیش بـەكاربهێنرێت، دەگوترێـت (رَبُّ الدَّارِ) واتە خاوەنی ماڵەکە.

بەڵام (أَبو يزيد) گـوتی: (سُبحاني، سُبحاني) واتـە (پـاك وبێگـەردی بـۆ مـن، پـاك و بێگەردی بۆ من)، کەچی وشەی (سُبحانَ) جگە لە خوای تعالی نابێ و جـایز نییـە بـۆ هـیچ کەسی تر بەکاربهێنرێت.

گوتم: ئایا بە (صحيح)ی ئەم شتەت لە (أَبي يزيدَ)ەوە پێگەشـتووە، گـوتی: دڵنیابـە ئـەو شتەی گوتوە.

بەڵام من دەڵێم _ ابن الجوزي _: پێدەچێ ئەم قسانەی (أَبـي يزيـدَ) بـێ پێـشەکی نـەبێ، چونکە ئەو تەنها باسمان بۆ دەکات کەوا خوای تعالی دەفەرمێت: (سُـبحاني)، چـونکە ئێمـە هەر خۆشمان ئەگەر گوێبیستی پیاوێك بین بڵێت: ﴿ لا إلهَ إلا أنا ﴾، یەکـسەر بیروهۆشمـان بـۆ ئەوە دەچێت کـە ئایـەتی (١٤)ی سـوورەتی (طـه) دەخوێنێتـەوە کـە خـوای تعـالی تیایـدا دەفەرمێت: ﴿ لا إلهَ إلا أنا ﴾ واتە هیچ پەرسـتراوێکی ڕاسـت نیـە جگـە لـە مـن(٦٣٨)، وە مەبەستی خودی خۆی نییە کە خوایەکی پەرستراو بێ و خەڵك ئـەو بپەرسـتن، بـەڵکو تـەنها ئایەتەکە دەخوێنێتەوە.

من خۆشم _ ابن الجوزي _: لە کۆمەڵە خەڵکێکی (بِسطامَ) _ شوێنێك بووە لە خۆراسـان بەڵام نزیك بە عێراق _ لە کەسانی بنەماڵەی (أَبـي يزيـدَ)م پرسـی سـەبارەت بـەو قـسەیە، گوتیان: ئەم شتە نازانین.

لە (أَبي يزيدَ)ەوە دەڵێت: دەمویست بەدەوری ماڵی خوادا تەوافم بکەم، بەڵام کـە بـە لای گەشتم، تەماشای ماڵی خوام کرد ئەو بە دەوری مندا تەواف دەکات !

---

٦٣٧ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

٦٣٨ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

له (طَيفورِ الصغير)ەوه دەڵێت: گوێبیستی (أَبي يزيدَ) بووم دەیگوت: یەکەم جار که حەجم کرد، ماڵی خوام بینی، دووەم جار که حەجم کرد، خاوەن ماڵەم بینی و، ماڵم نەبینی، سێ جار که حەجم کرد، نه ماڵم بینی و نه خاوەن ماڵیشم بینی !

سەبارەت به (اللوحُ المحفوظ) له (أَبي يزيدَ)یان پرسی ؟ گوتی: من (اللوحُ المحفوظ)م !!

له (أَبي موسى الدُّبَيلي)وه دەڵێت: به (أَبي يزيدَ)م گوت: پێیان ڕاگەیاندووم که دڵی سیان وەکو دڵی (جبريل)ە ؟! ئەویش گوتی: من ئەو سیانەم. گوتم: چۆن ؟ گوتی: دڵم یەکە، غەمم یەکە، ڕوحم یەکە.

(أَبي موسى) دەڵێت: گوتم: هەروەها پێیان ڕاگەیاندووم که دڵی کەسێك وەکو دڵی (إسرافيل)ە ! ئەویش گوتی: من ئەو کەسەم، نموونەی من وەکو دەریایەکە، نه سەرەتای هەیەو نەکۆتا !

(السَّهْلَكيّ) دەڵێت: پیاوێك لای (أَبي يزيدَ) ئەم ئایەتەی خوێندەوە ﴿ إِنَّ بَطْشَ رَبِّكَ لَشَدِيدٌ ﴾ ﴿ البروج: ١٢ ﴾ واته بەڕاستی دەست وەشاندنی پەروەردگاری تۆ زۆر سەختە(٦٣٩)، (أَبي يزيدَ)یش گوتی: سوێند به ژیانی خوا دەست وەشاندنی من زۆر له دەست وەشاندنی ئەو سەخت ترە !

به (أَبي يزيدَ)یان گوت: هەموو بونەوەر له ژێر ئاڵای سەیدمان محمدایە _ صلى الله عليه وسلم _. گوتی: سوێند بەخوا ئاڵای من زۆر له ئاڵای محمد گەورەترە، ئاڵاکەی من هەموو جن و ئینس و پێغەمبەرانی له ژێردایە !

(أَبي يزيدَ) دەڵێت: (سُبحاني، سُبحاني، ما أَعْظَمَ سلطاني ! ليسَ مِثْلي في السَّماءِ يوجَدُ، ولا مِثْلي صِفَةٌ في الأرض تُعْرَفُ، أنا هُو، وهُو أنا، وهُو هو !) واته (پاك و بێگەردی بۆ من، پاك و بێگەردی بۆ من ! هاوشێوەی من له ئاسماندا نییە، هاوشێوەی سیفەتی من له سەر زەمیندا نییە، من ئەوم، ئەویش منە، خۆشی خۆیەتی !).

٦٣٩ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

بە (أبي يزيدَ)یان گوت: تۆ یەكێكی لە حەوت (الأبْدالِ)ەكە (٦٤٠)، ئەوانەی (أوتاد)ی زەمینن. ئەویش گوتی: من هەر حەوتەكەم(٦٤١) !

لە (الحسنِ)ی كوڕی (عليٍّ) كوڕی (سلامٍ)ەوە دەڵێت: (أبي يزيدَ) چووە شارێكەوە، خەڵكێكی زۆری شارەكەش بەدوای كەوتن(٦٤٢)، ئەویش بەرێكی بەلاوە كردن و، گوتی: (إنِّي أنا اللهُ لا إلهَ إلا أنا فاعْبُدني) واتە (من بەڕاستی خوام و هیچ خوایەكی دیكە نییە جگە لە من، دەی بمپەرستن). خەڵكەكەش گوتیان: (أبي يزيدَ) شێت بووە، ئیتر وازیان لێ هێناو لێی دوركەوتنەوە(٦٤٣).

(أبي يزيد) دەڵێت: جارێك بۆ لای خوا بەرز كرامەوە تا لە پێشیدا وەستام، پێی فەرمووم: ئەی (أبي يزيد) ! بەڕاستی مەخلوقاتی من دەیانەوێ بتبینن. منیش گوتم: ئەی ئازیزم !

---

٦٤٠ _ سەبارەت بە (الأبدال) هیچ فەرموودەیەك بەجێگیری (صحیح)ی نەهاتووە، كما علَّقتُه في ((اتِّباع السُّنن)) (٦٠ _ ٦١) للضياء المقدسي، ولعبدالله الغماري تدليس فاحشٌ في المسألة بيَّنته في ((كشف المتواري من تلبيسات الغُماري)) (ص١٦ _ ١٩).

٦٤١ _ بە پێی بیروباوەڕی صوفیەكان وەلیەكانی ئەوان تەصرٖوف بە كەونەوە دەكەن و، وە ئەگەر بە هەر شتێك بڵێن ببە یەكسەر دەبێ (كن فيكون)، خوای تعالی پەنامان بات، بەلای ئەوانەوە خوای تعالی هەر وەلیەكی ئەوانی كردووە بە بریكاری خۆی بۆ بەڕێوەبردنی لایەك لە لاكانی كەون، بۆیە لە بیروباوەڕی ئەواندا چوار وەلی ئەم جیهانەیان گرتووە هەر یەكێك لە لایەكەوەو بە (أوتاد) ناو دەبرێن، حەوت وەلی دیكەش هەر یەكێكیان لە كێشوەرێكی حەوت كێشوەرەكەی زەمیندان و، ئەمانە بە (الأبدال) ناو دەبرین (چونكە ئەگەر دانەیەكیان مرد ئەوی تر دەبێ بە جێگرەوەی). بڕوانە ئەم: www. islamqa.info, وەرگێڕ.

٦٤٢ _ لە هەموو زەمن و جێگەیەكدا نەزانانی خەڵك شوێنی ئەهلی بیدعەو خاوەن گومڕایی دەكەون، ئەوانەی زۆر لە هەقەوە بەدوورن، لە ڕاستیدا تەنها دەنگەكانیان خەڵكی ئاسایی فریو دەدەن و، شێوازەكانیان شەیدایان دەكەن و، فەلسەفەكانیان بەندیان دەكەن !

٦٤٣ _ سوپاس و ستایش بۆ خوا كە ناسیان و پێیان زانی وازیان لێ هێنا، بەڵام كەسانی دیكە پێدەچێ ئەو شتە نەكەن و دورنەكەونەوە، لە بەر لووتبەرزی و وێڵ بوون و نەزانین !!

منیش دەمەوێ ببینن. فەرمووی: ئەی (أبا یزید) ! من دەمەوێ تۆیان پێ پیشان بدەم. گوتم: ئەی ئازیزم ! ئەگەر دەیانەوێ ببینن و، تۆش ئەوەت دەوێ و، منیش توانای سەرپێچی کردنی تۆم نییە، بەتەنهایەتیت نزیکم کەرەوە، لە پەروەردگاریتیت بپۆشەو، بۆ یەکێتیت بەرزم کەرەوە، تا ئەو ئاستەی هەرکات بەدیهێنراوانی تۆ ببینن، بڵێن: خوایە تۆمان بینیەوە، ئەو کاتە تۆ بەوە دەبی و، منیش لەوێ نابم ! ئەوەبوو وای پێکردم، هەڵیبڕیم و، چاکی کردمو، بەرزی کردمەوە، پاشان فەرمووی: بۆ لای مەخلوقاتم بچۆ دەرەوە، ئەوەبوو ویستم بچمە دەرەوەو، بەرەو لای مەخلوقاتی خوا هەنگاوێك چووم، بەڵام لە هەنگاوی دووەمدا بورامەوە، ئیتر بانگی کرد: خۆشەویستەکەم بگەڕێننەوە، چونکە توانای ئارامگرتنی سەعاتێکی نییە کە لێم دورکەوێتەوە !

لە (أبي يزيدَ) دەگێڕنەوە گوتویەتی: (موسى) پێغەمبەر _ عليه الصلاةُ والسلامُ _ ویستی خوای تعالی ببینێ، بەڵام من نەمویست خوای تعالی ببینم، ئەو ویستی من ببینێت!

لە (الجُنَيْدِ)ی کوڕی (محمدٍ)ەوە دەڵێت: دوێنێ پیاوێکی خەڵکی (بِسطامَ) دیدەنی کردم، بۆی گێڕامەوە کە گوێبیستی (أبي يزيدَ) بووە گوتویەتی: پەروەردگارا ئەگەر لە زانینی پێشوتری تۆدا هەیە کەسێك لە بەدیهێنراوانی خۆت بە ئاگر سزا بدەی، ئەوا خولقەتم گەورە بکەرەوە، بۆ ئەوەی جگە لە من کەسێکی تر جێی لە ئاگردا جێی نەبێتەوە .

نووسەر دەفەرمێت:

ناشیرینی ئەو شتانەی کە دەیڵێت و پێشتر ئاماژەمان پێدا شاراوە نییە، چونکە لە ڕادەبەدەر قیزەونە.

بەڵام ئەم گوفتارەی لە سێ ڕۆوە هەڵەیە:

یەکەمیان: دەڵێت: ((ئەگەر لە زانینی پێشوتری تۆدا هەیە)). کەچی ئێمە بەدڵنیایەوەو بەبێ هیچ گومانێك دەزانین خەڵکانێك بە ئاگر سزا دەدرێن، خوای _ عزَّوجلَّ _ کەسانێکی لێ ناوبردون، وەکو (فرعَوْنَ) و (أبي لهبٍ)، باشە چۆن دەشێ پاش ئەوەی کە دڵنیابوین و، هیچ گومانێکمان لەو بارەوە نەما، بڵێین: ((ئەگەر)).

دووەم: دەڵێت: ((خولقـەتم گـەورە بکـەرەوە)). ئەگـەر بیگوتایـە: بـۆ ئـەوەی ئـاگر لـە ئیمانداران دورخەمەوە، باشتر دەبوو ! بەڵام گوتی: بۆ ئەوەی جگە لە من کەسی تر جێی تێدا نەبێتەوە، ئەوەتا بەزەی بە کافرانیشدا هاتۆتەوە، ئەمەش فەزڵدانی بەزەیی خودی خۆیەتی بە سەر بەزەیی خوای تعالادا.

سێ یەم: یا دەبێ بە ئەندازەی گەورەیی ئەو ئاگرە نەفام بێ، یا لە نەفسی خـۆی دڵنیـابێ ئارام دەگرێ بەرامبەر بە هەڵگرتنی سەختی ئەو ئاگرە، بەڵام هەردوو شتەکە لای ئەو نییە.

دەڵێم _ ابن الجوزي _: پاش ئەوە (أبي يزيدَ) دەڵێ: سوێند بەخوا دوێـنێ سـەبارەت بـەم مەسەلە لە گەڵ (الخضرِ)دا قسەم کردو، فریشتەکانیش قسەکانی منیان بـە چـاك دەزانـی و، خوای _ عزَّوجلَّ _یش گوێبیستی قسەکانم بوو، عەیبداری نەکرم، چونکە ئەگـەر عەیبـداری بکردمایە، لاڵی دەکردم.

دەڵێم _ ابن الجوزي _: ئەگەر ئەم پیاوە نەدرایەتە پاڵ گۆڕانکاری، ئەوا پێویست بوو پێی بگوترێت: باشە (الخضرِ) لە کوێ یە(٦٤٤) ؟! چۆن زانیویەتی فریـشتەکان قـسەکانی بـە چـاك دەزانن ؟! پاشان دەبێ بزانرێت کەوا چەندین کاری نابـەجێ هەیـە، خـوای تعـالی عەیبـداری دەکات و، یەکسەر سزای ئەنجامدەرانیشی نەدات(٦٤٥).

لە (میمونَ عبدِهِ)وە پێیان ڕاگەیاندوم گوتویەتی: (سَمْنونَ المحبِّ) خۆی بە درۆزن نـاودەبرد بەهۆی دێڕە شیعرێکەوە کە تیایدا دەیگوت:

وَلَيْسَ لي في ســــــواكَ حَظٌّ فَكَيفَما ما شِئْتَ فامْتَحِنِّي

واتە:

جگە لە تۆ بەختم لە کەسی تردا نییە بۆیە هەرچۆنێك خۆت دەتەوێ تاقیم بکەرەوە.

---

٦٤٤ _ فالتحقيق أنه ميِّت _ كما سبق _ وللمصنف _ رحمه الله _ رسالة في ذلك سماها ((الروض النضر في خبر الخضر))، مخطوطة.

٦٤٥ _ بۆ فریودانی خاوەنەکەی و، سزادانی پێش ئەوەی تەوبە بکات و پەشیمان بێتەوە.

ئەوەبوو خوای تعالی بە میزگیران تاقی کـردەوە، بۆیـە ئـارامیی لـێ بـڕاو، بەمنـداڵانی دەگوت: نزا بۆ مامی درۆزنتان بکەن.

نووسەر دەفەرمێت:

بەڕاستی کە ئەم قسە دەبیستم پێستم دەلەرزێ، باشە تۆ بڵێی بەرگەی ئەوە بگرێ ؟

لە ڕاستیدا ئەوە بـەروبومی نەفامیـە بـە خـوای _ سبحانە وتعـالی _، چـونکە ئەگـەر بەڕاستی بیناسیبا، بەدەر لە بێوەیی و، دورخستنەوەی دەردو بەڵا، هیـچی دیکـەی لـێ داوا نەدەکرد.

لە (أبي العباسِ)ی کوڕی (عطاءِ)ەوە دەڵێت: من نکۆڵیم لەم جـۆرە کەراماتانـە دەکـرد، تاوەکو کەسێکی باوەڕپێکراو لە (أبي الحُسَيْنِ النُّوريِّ)وە بۆی باسکردم و، خۆشم لـێم پرسـی، گوتی: بەو شێوە بوو !

دەڵێ: لە نێو کەشـتیەکی بـەناوی (سُمَيْرِيَّة)دا بـووین، لـە ڕوبـاری دجلـەدا، بـە (أبي الحُسَيْنِ)یان گوت: لە دجلە ماسیەکمان بۆ دەربێنـە سـێ (رطـل)و سـێ (أوقيـة)(٦٤٦) بێـت. ئەویش لێوەکانی جوڵاندەوەو، کوتوپڕ ماسیەك کە کێشەکەی سێ (رطل)و سێ (أوقيـة) بـوو لە ئاوەکە هاتەدەرێ و، کەوتە نێو کەشتیە (سُمَيْرِيَّة)کـەوە ! بـە (أبـي الحُسَيْنِ)یـان گـوت: توخوا پێمان بڵێ ئەوە چ نزایەکت کرد ؟ گوتی: گـوتم: سـوێند بـە شـکۆمەندیت ئەگـەر لـە ئاوەکە ماسیەکمان بۆ دەرنەهێنی سێ (رطل)و سێ (أوقية) بێت، خۆم لە دجلەدا دەخنکێنم!!

لە (الجُنَيْـد)ەوە دەڵێـت: گوێبیـستی (النُّـوريِّ) بـووم دەیگـوت: لـە (الرَّقَّـة) بـووم، ئـەو موریدانەی لەوێ بوون هاتنە دیدەنیم و، گوتیان: دەچینە دەرەوە بۆ ڕاوە ماسی. پێیان گـوتم: ئەی (أبا الحُسَيْنِ) ! بە خواپەرستی و تێکۆشـانی خـۆت و، ئـەو (إجتهـاد)ەی تـۆی تێـدای، ماسیەکمان بۆ دەربێنە، کێشەکەی سێ (رطل) بێت، نـەزیاد و نەکـەم، منـیش بـە گـەورەی خۆمم گوت: ئەگەر هەر ئێستا ماسیەکم بۆ دەرنەهێنی، کێشەکەی سێ (رطـل) بێـت، ئـەوا

---

٦٤٦ _ الرطل: ٤٥٠ غرام.

أوقية: ٣٧ غرام. بڕوانە: http://ar.wikipedia.org/wiki/. وەرگێڕ.

خۆم دەخەمە نێو فوراتەوە، بۆیە ماسیەکی بۆ دەرهێنام، کێشام، بینیم سێ (رطل)ە، نەزیادو نەکەم !

(الجُنَیْد) دەڵێت: پێم گوت:: ئەی (أَبا الحُسَیْنِ) ! ئەگەر ماسیەکە دەرنەچوبایە، خۆتت دەخستە نێو فوراتەوە ؟! گوتی: بەڵێ

لە (أَبي یعقوبَ الخَرَّاطِ)ەوە دەڵێت: (أَبو الحُسَیْنِ النُّوريِّ) پێی گوتم: نەفسم شتێك لەم کەراماتەی تێدا بوو، بۆیە چووم قامیشێکم لە منداڵەکان بردو، لە نێوان دوو بەلەمدا لە سەری وەستام و گوتم: سوێند بە شکۆمەندیت ئەگەر ماسیەکم بۆ دەرنەهێنی کێشی سێ (رطل) بێ، نەزیاد و نەکەم، ئەوا هیچ شتێك ناخۆم!

(أَبي یعقوبَ الخَرَّاطِ) دەڵێت: ئەو قسانە بە (الجُنَیْد) گەشت و، گوتی: حوکمی ئەوەبوو ماریکی بۆ دەرچوایەو، پێوەی دایە !

لە (أَبي سعیدِ الخَزَّاز)ەوە دەڵێت: گەورەترین تاوانی من ئەوەیە کە ئەوم ناسیوە !

نووسەر دەفەرمێت:

ئەگەر ئەم قسەی (أَبي سعیدِ الخَزَّاز)ە بەم جۆرە لێکدرێتەوە ئەوا باشە: من (أَبو الحُسَیْنِ النُّوريِّ)م ناسی و، بە گوێرەی ناسینەکە مامەڵەم لە گەڵدا نەکردو، لەو کردەوانە قەدەغەم نەکرد، بۆیە تاوانەکانم گەورەتر بوو، وەکو چۆن تاوانی کەسێك گەورەتر دەبێ کاتێ کە دەزانێ بەڵام سەرپێچی دەکات، وە ئەگەر بەم جۆرە لێك نەدرایەوە ئەوا ناشیرینە.

لە (الشِّبْليِّ)وە دەڵێت: پەروەردگارا خەڵك خۆشیان ویستی لەبەر ئەو نیعمەتانەی پێیان دەبەخشی، بەڵام من خۆشم دەوێی لە بەر تاقیکردنەوەکانت.

لە (أَبي عبدالله أَحمدَ)ی کوڕی (محمدِ الهَمْدانيِّ)وە دەڵێت: چووەمە دیدەنی (الشِّبْليِّ)، کاتێ هەستام بۆ ئەوەی بچمە دەرێ، بەخۆم و ئەو کەسانەی لە گەڵمدا بوون تا لە ماڵەکەش چوینە دەرێ دەیگوت: بە ئاسوودەیی تێپەڕین، لە هەر کوێ بن من لە گەڵتاندام، ئێوە لە ژێر چاودێری و ئێشگریی مندان.

لە (منصورِ)ی کوڕی (عبداللە)وە دەڵێت: کەسانێك چوونە سەردانی (الشِّبْلِيِّ) لـە کـاتی ئەو نەخۆشیەدا کە تیایدا مرد، پێیان گوت: ئەی (أبـابکرِ) باروحاڵـت چـۆنە ؟ ئـەویش ئـەم شیعرەی خوێندەوە:

إِنَّ سُلْطـانَ حُبِّهِ     قالَ لا أَقْبَلُ الرِّشَا
فَسَلُوهُ فَدَيْتُـهُ     مـا لِقَتْلِي تَحَرُّشا

واتە: بەڕاسی سوڵتانی خۆشویستنی خوای تعالی لـە دڵـمدا دەیگـوت بـەهیچ شـێوەیەك بەرتیلم قبوڵ نییەو کەسی ترم بە ئەندازەی ئەو زاتە خۆش ناوێت، دەی ئێـوەش بـە هـەقێتی ئەو زاتە لێی پرسن، بۆ گێچەڵم پێدەگێڕێ و دەمکوژێت.

(ابنُ عقیلٍ) دەڵێت: لە (الـشِّبْلِيِّ) دەگێڕنەوە کە گوتویەتی: خوای _ سـبحانە و تعـالی _ دەفەرمێت: ﴿ وَلَسَوْفَ يُعْطِيكَ رَبُّكَ فَتَرْضَى ﴾ [الـضحی: ٥] واتە سـوێند بـەخوا لەمـەولا پەروەردگارت ئەوەندەت پێ دەبەخشێ کە ڕازی ببیت(٦٤٧)، بەڵام سوێند بەخوا محمد _ صلی اللە علیە وسلم _ ڕازی نەبووە، ئەگەر کەسێك لە ئومەتەکەی لە ئاگردا بێ.

پاش ئەوە (الشِّبْلِيِّ) گوتی: محمد _ صلی اللە علیـە وسـلم _ تکاکـاری بـۆ ئومەتەکـەی دەکات و، پاش ئەو منیش تکاکاری بۆ ئەهلی دۆزەخ دەکەم، بۆ ئەوەی هیچ کەسـێکی تێـدا نەمێنێتەوە.

(ابنُ عقیلٍ) دەڵێت: یەکەم بانگەشەی سەبارەت بە پێغەمبـەری خـوا _ صـلی اللە علیـە وسلم _ درۆیە، چونکە ئەو بە سزادانی خرپەکاران ڕازی دەبێ، چۆن ڕازی نابێ لە کاتێکدا کە باسی مەی و خواردنەوە دەکات، نەفرەت لە لە دەکەس دەکات(٦٤٨) ؟! بانگەشەکردن بـەوەی کە گوایە پێغەمبەری خوا _ صلی اللە علیەوسلم _ ڕازی نابێ خوای تعالی سزای خراپەکاران بات، قسەیەکی پووچەو، نەفامبوونە بە حوکمی شەرع.

---

٦٤٧ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

٦٤٨ _ رواه الترمذي (١٢٩٥)، وابن ماجة (٣٣٨١) عن أنس.

وسنده حسن.

ئەو قسەیەی کە تیایدا بانگەشە دەکات کە گوایە بۆ هەمووان تکا دەکات و، لەم شتەشدا لە محمد _ صلی الله علیه وسلم _ زیاتر ئەنجام دەدات، کوفرە، چونکە ئەگەر کەسێك خۆی یەکلا کردەوە کە لە ئەهلی بەهەشتە، ئەوا لە ئەهلی دۆزەخ دەبێ، بە تایبەت ئەو شایەتی بۆ نەفسی دەدات کە پلەکەی لە پلەی پێغەمبەرایەتی بەرزترە، بەڵکو شایەتی داوە کە پلەکەی لە پلەی (المقامِ المحمودِ) کە بریتیە لە (الشفاعة العُظْمى) واتە تکاکاری مەزن گەورەترە ؟!

(ابنُ عقيلٍ) دەڵێت: ئەوەی لە توانادایە دژبە ئەهلی بیدعەی بکەم، تەنها زمانم و دڵمە، وە ئەگەر توانام ئەوەندە فراوان بوایە بۆ شمشێر هەڵگرتن، دڵنیابن خاکم بە خوێنی ئەو خەڵکە ئاو دەدا.

لە (أبي العباسِ)ی کوڕی (عطاءٍ) دەڵێت: قورئانم خوێندەوە، تەماشا دەکەم خوای تعالی باسی هیچ بەندەیەك ناکات و، پیایدا هەڵداو ستایشی بکات، تا ئەو کاتەی تاقی دەکاتەوە، بۆیە لە خوام داواکرد تاقیم بکاتەوە، ئەوەبوو چەند شەو و ڕۆژێك بەسەر داواکەمدا تێپەڕ نەبوبو، تا لە ماڵەکەی منەوە زیاتر لە بیست مردوو دەرکران و، هیچیان نەگەڕانەوە.

(أبا عبدالله العلقي) کە هاوەڵی (أبي العباسِ)ی کوڕی (عطاءٍ) بووەو ئەم بەسەرهاتەی لێوە گێڕاوەتەوە دەڵێت: ماڵ و سامانی نەما، عەقڵ و هۆشی نەما، منداڵ و خاوخێزانیشی نەما، بۆیە حەوت ساڵ بە پەکەوتووی و لاوازی و بێدەستەڵاتی مایەوە، پاشان کە هۆشی بە خۆی هاتەوە گوتی:

حَقّاً أَقُولُ لَقَدْ كَلَّفْتَني شَططاً     حَملي هَواكَ وصَبْري إنَّ ذا عَجَبُ

واتە: بەڕاستی دەڵێم بە ستەم لە ڕادەبەدەت بە سەرمدا سەپان

کە توانیم خۆشم بوێیت و ئارامگرم بەرامبەرت بەڕاستی شتێکی سەرسوڕمێنە

دەڵێم _ ابن الجوزي _: بەروبومی کەم زانستی ئەم پیاوە ئەوەبوو کە لە خوای داواکرد، تاقی بکاتەوە، بۆیە کە کەسێك داوای تاقیکرنەوە دەکات، مانای ئەوە دەبەخشێت کە توانای هەڵگرتنی تاقیکردنەوەکەی خوای هەیە، ئەوەش زۆر ناشیرینە.

وشەی (الشَّطَطُ) مانای جەورو ستەم دەبەخشێ و، جایز نییە بدرێتە پاڵ خوای تعالی.

چاکترین شتێك قسەکانی ئەم پیاوەی پێ لێکدرێتەوە ئەوەیە کە بگوترێت: کاتێ ئەو قسانەی گوتووە کە بە ئەو پەڕی تەمەنی پیری و خەڵەفان گەشتووە.

لە (محمدِ)ی کوڕی (الحُسينِ السُّلَميِّ)وە دەڵێت: گوێبیستی (أبا الحسنِ عليٍّ) کوڕی (إبراهيمَ الحُصْريَّ) بووم دەیگوت: بمهێڵنەوە لە گەڵ تاقیکردنەوەکانی خۆمدا، ئایا ئێوە نەوەی ئادەم نین کە خوای تعالی بە دەستەکانی خۆی دروستی کردن و، لە ڕوحی خۆی فوی پێدا کردن و، فریشتەکانی بۆ بردنە سوجدەو، فەرمانی پێکرد، بەڵام ئەو سەرپێچی کرد ؟! ئەگەر یەکەم شتی بنی دەفرە گەورەکە خەڵتە بێت، کۆتاکەی دەبێ چۆن بێ ؟!

دەڵێت: (الحُصْريَّ) دەڵێت: زەمەنێکم بە سەردا تێپەڕیوو ئەگەر قورئانم بخوێندبا نەمدەگوت (أعوذ بالله من الشيطان الرجيم)و دەمگوت: شەیتان کێ یە تا ئامادەی گوفتاری خوای هەق بێت ؟

نووسەر دەفەرمێت:

ئەم کارە سەرپێچی کردنی فەرمانی خوای _ عزَّوجلَّ _ە کە دەفەرمێت:

﴿ فَإِذَا قَرَأْتَ الْقُرْآنَ فَاسْتَعِذْ بِاَللَّهِ مِنْ الشَّيْطانِ الرَّجِيمِ ﴾﴿ النحل: ٩٩ ﴾ واتە ﴿فَإِذَا قَرَأْتَ الْقُرْآنَ ﴾ (ئەی محمد _ صلى الله عليه وسلم _ کاتێ ویستت قورئان بخوێنی ﴿ فَاسْتَعِذْ بِاَللَّهِ مِنْ الشَّيْطانِ الرَّجِيمِ ﴾ پەنا بەخوا بگرە لە شەیتانی دەرکراو لە بەزەیی خوا(٦٤٩)!

لە (أبي العباسِ أحمدَ)ی کوڕی (محمدِ الدِّينَوَرِيِّ)وە دەڵێت: پایەکانی تەصوفیان هەڵوەشاندەوە، ڕێگەکانیان ڕۆخاندو، ماناکانیان گۆڕی بە ماناگەلێك خۆیان هەڵیانبەستبوو(٦٥٠): خوو (الطبعَ) بە زیاد ناودەبەن، بێ ئەدەبی بە دڵسۆزی ناودەبەن، لە

---

٦٤٩ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

٦٥٠ _ ئابەو شێوەن لادەران و سەرلێشێواوان، بەدرێژایی ڕۆژگارو زەمەن ناوی شتەکان بەناوانێکی دیکە دەگۆڕن، بۆیە دەبینی کۆمەڵانی ئیسلامی کاری خۆیان بەکارێکی بەکۆمەڵ دادەنێن، ڕق و قین و ئێرەیی: بە خۆشنەویستن لە پێناوی خوادا ناودەبەن، خۆبەزلزانین و لە خۆباییبوون: بە پشت بەخۆ بەستن و، هەجرو جودایی و وازهێنان ناو دەبەن، گرنگی دان بە دونیاو ئەهلی دونیا: بە کۆمەڵایەتیەکان ناودەبەن!!!

هەق چوونە دەرەوە بە (الشطح) ناودەبەن، چێژ وەرگرتن لە زەمكراو بە (طيبةً) واتە بە شتی چاك وخۆش ناودەبەن، بێ ڕەوشتی بە (صَوْلَةً) واتە دەستەڵات و تواناداریی ناودەبەن، دەست قوچاویی بە (جَلادةً) واتە بەئارامگرتن و تەحەمول ناودەبەن، شوێنكەوتنی هەواو ئارەزوو بە تاقیكردنەوە ناودەبەن، گەڕانەوە بۆ دونیا بە (وصـول) واتە بەگەشتن ناو دەبەن، داواكـردن بە كردەوە ناو دەبەن، زمانپیسی بە گلیەیی ناو دەبەن.

هەموو ئەو شتانە ڕێگەی ڕاستی قەومەكە نین.

(ابنُ عقيلٍ) دەڵێت: صـوفیەكان حەرامـەكانیان بـە دەسـتەواژەگلێك دەربڕیـوە، كـە لـە ڕاستیدا خۆیان ناوەكانیان بۆ گۆڕیوە، بۆ ئەوەی مانایەكی شیاو ببەخشێت، بۆیە بە كۆبونەوە لە سەر ڕابواردن و گۆرانی دەڵێن: (أوقاتٌ). بـە لاوی لووسـكەی تـووك دەرنـەهاتوو دەڵـێن: (شبٌّ) واتە لاو. بە ئافرەتی زۆر زۆر خۆشویستراو (معشوقة) دەڵێن: (أُخْتٌ) واتە خوشك، بـە ئافرەتی خۆشویستراو (المُحِبَّةِ) دەڵێن: موریدە. بە سەماو جۆش و خرۆشی دەڵێن: (وَجْـدٌ) واتە سۆز. بە شوێنی ڕابواردن و بێكاری دەڵێن: (رِباطٌ) . بەڵام ئـەم نـاو گۆڕینـە شـیاو نییـەو، ڕێی پێنەدراوە(٦٥١)

٦٥١ _ ئەمە بنەمایەكی گرنگەو، پێویستە بانگەوازكاران و خوێندكارانی زانستی شەرعی پـشت گـوێی نەخەن، چونكە بـەهۆی ئـەم بنەمایـەوە درۆ و دەلەسـەی زمـان لووسـان و، ڕازاندنـەوەی كەسـانی لادەر دەزانرێت.

## ✸ بەیادهێنانەوەی کۆمەڵە کردەوەیەکی ناپەسەندی باسکراو لە صوفیەکانەوە:

دەڵێم _ ابن الجوزي _: پێشتر گەڵێك لە کردەوە ناپەسەندکانی ئەوانمان بۆ باسکردن، کە تێکڕای ناپەسەندو ناشیرین بوو، لێرەشدا باس لە سەرسوڕمێنترین کردەوەکانیان دەکەین.

لە (أبي جعفرِ الكُرَيْتي)وە دەڵێت: شەوێك لەش گران بووم و، پێویستم بەخۆ شتن بوو، شەوێکی ساردیش بوو، تەماشای نەفسی خۆمم دەکرد کە حەز بە دواکەوتن و کەمتەرخەمی دەکات، نەفسم پێی دەگوتم: ئەگەر واز لە خۆشتن بێنیت، تا ڕۆژ دەبێتەوەو، ئاوەکەت بۆ گەرم دەکرێت، یا دەچیتە گەرماوێك، پاشان بە نەفسی خۆمم گوت: بەڕاستی شتێکی سەرسوڕمێنە ! من بە درێژایی تەمەنم مامەڵە لە گەڵ خوادا دەکەم و، ئێستا هەقێکی لە سەرمەو لە ئەنجامدانیدا پەلە ناکەم، هەست بە وەستان و خاوە خاوکردن خۆدواخستن دەکەم، بۆیە بڕیارمدا لە ڕوبارێکدا نەبێ خۆم نەشۆم، بڕیاریشمدا تەنها لەبەر هەتاودا وشکی کەمەوە، یا بەو شێوازە قسەی کرد.

دەڵێم _ ابن الجوزي _: لە ڕاستیدا ئەو پیاوە کردەوەکەی خۆی بۆ خەڵك باس دەکات، بۆ ئەوەی بۆیان ڕوون بکاتەوە کە کردەوەیەکی چاکی جوانی ئەنجام داوە، ئەوانیش ئەم شتەی لێوە دەگێڕنەوە بۆ ئەوەی فەزڵ و چاکێتی کردەوەکەی ڕوون بکەنەوە، بەڵام ئەوە نەفامیەکی پەتیە، چونکە ئەو پیاوە بەو کردەوەیە سەرپێچی خوای _ سبحانَه و تعالى _ کردووە.

دڵنیابن خەڵکانی ئاسایی گێل بە کارەکەی سەسام دەبن و پێیان باشە نەك زانایان.

شیاو نییە هیچ کەسێك بەو شێوە سزای نەفسی خۆی بدات، بەڕاستی ئەم هەژارە جۆرەها سزای بۆ نەفسی خۆی کۆکردۆتەوە: خۆی خستە نێو ئاوەکەو، پۆشاکێکی (المُرقَّعة)ی ئەستوری پۆشیبوو، بەجۆرێك توانای نەبوو بەویستی خۆی تیایدا بجولێتەوە، پێدەچێ هەندێ چرچ و لۆچی جەستەشی هەبێ بە باشی ئاوەکەی پێ نەگەشتبێ، مانگێکیش بە تەڕیی لە بەریدا مایەوەو وشك نەبویەوە، ئەوەش چێژی نووستنی لێ دوورخستەوە.

هەموو ئەو کردەوانەی کە ئەنجامی داوە هەڵەو تاوانە، پێدەچێ ببێ بە هۆکـاری نـەخۆش کەوتنی یاخود کوشتنی.

لە (حَمْدِ)ی کوڕی (أحمَدَ)ی کوڕی (عبدِاللهِ الأصـبهانيِّ)وە دەڵێـت: خێزانەکـەی (أحمـدَ)ی کوڕی (حَضْرَوَيْهِ) لە گەڵ (أحمَدَ)ی مێردیدا مارەیەکەی یـەکلاکردەوە بەمـەرجێك بیبـات بـۆ دیدەنی (أبا یزید البِسْطاميِّ)، ئەویش بردی بۆ ئەوێ، ژنەکە کە بۆ دیدەنی (أبا یزیـد) چـووە ژورەوە، پەچەکەی لە سەر ڕووی لاداو، لە پێش دەستیدا دانیشت، کە هاتنە دەرێ (أحمـدَ)ی مێردی پێی گوت: شتێکی سەرسوڕمێنم لێتەوە دی، کە لـە پـێش دەسـتی (أبـي یزیـد) دا دانیشتی پەچەکەت لە سەر ڕووی خۆت لادا(٦٥٢)، ئەویش گوتی: چونکە کاتێ تەماشام کـرد هەموو بەختەکانی نەفسی خۆمم ون کرد، هەرکاتیش تەماشای تۆ دەکەم بەختەکانی نەفـسم دەگەڕێتەوە !! کاتێ (أحمدَ) ویستی (أبي یزید) بەجێبێڵێت، پێـی گـوت: ئامۆژگـاریم بکـە. ئەویش پێی گوت: جوانمەردی و ئازایەتی لە خێزانەکەوتەوە فێربە !!

---

٦٥٢ _ ئێمە بەدڵنیایەوە دەزانین کە شێخانی ئـەهلی تەصـوفی ئـەمڕۆی وەڵاتەکـەمان قبوڵیانـە ژنـانی موریدەکانیان لەوەش زیاتریان بۆ ئەنجام بەن، تا ئەو ئاستەی کەسانێکی مورید خێزانەکەی تەڵاق داوە بـۆ ئەوەی لە شێخەکەی خۆی مارەی بکات (!). خودی ئەم شێخە جارێکیان ئەم کارەی بە ژنێکی موریدەکەی خۆی کردو پێش ئەوەی (عِدَّة)ی ژنەکە تەواو بێ مارەی کرد !!
جا ئارامگرتنێکی چاك و پەسەند، خواش یارمەتی دەرمانە بۆ ئەوەی کە باسی دەکەن.

## ✱ جياوازى و سەرپێچیەكانیان لە جەستەو ماڵ و ساماندا :

لە (يوسفَ)ى كوڕى (الحسينِ)ەوە دەڵێت: لە نێوان (أحمدَ)ى كوڕى (أبي الحَواريّ) و (أبي سُليمانَ)دا پەیمانێك هەبوو كە لە هیچ شتێكدا سەرپێچی نەكات، چ كات فەرمانی پێكرد(٦٥٣)، ئەوەبوو ڕۆژێك لە مەجلیسەكەی خۆیدا دیدەنی كردو، ئەو لەو كاتەدا قسەی دەكرد، پێی گوت: تەنورەكەمان گەرم كردووە، فەرمانی چ شتێكمان پێدەكەی ئەی شێخ ؟ وەڵامی نەدایەوە، جارێك یاخود دوو جار دوبارەی كردەوە، بۆ سێ یەم جار پێی گوت: بچۆ لە نێویدا دانیشە. ئەویش چوو لە نێو تەنورەكەدا دانیشت.

(أبي سُليمانَ) گوتی: پێی بگەن، چونكە لە نێوان من و ئەودا پەیمانێك هەیە بۆ ئەوەی هەرگیز لە هیچ شتێكدا سەرپێچی فەرمانم نەكات، ئەوەبوو هەستاو، كەسانی دەوروبەریشی هەستان و، هاتنە لای تەنورەكە، تەماشادەكەن لە نێوەڕاستیدا دانیشتووە، بۆیە دەستەكانی گرت و، هەڵیساندو، تەنها ڕووشاویەكی كەمیشی پێوە نەبوو.

نووسەر دەفەرمێت:

ئەم باسە لە ڕاستیەوە بەدوورە، ئەگەر ڕاستیش بێت، ئەوا خۆ خستنە نێو ئاگری تەنورەكەوە سەرپێچی و تاوانە.

وفي ((الصحيحينِ))(٦٥٤) من حديث عليّ _ رضي الله عنه _ قال: بَعَثَ رَسُولُ اللهِ _ صلى الله عليه وسلم _سَرِيَّةً ، وَاسْتَعْمَلَ فيها رَجُلاً مِنَ الأَنْصَارِ ، فَلَمَّا خَرَجُوا وَجَدَ عَلَيْهِمْ فِي شَيْءٍ، فَقَالَ لَهُمْ: أَلَيْسَ قَدْ أَمَرَكُمْ رَسُولُ اللهِ أَنْ تُطِيعُونِي ؟ قَالُوا: بَلَى ، قَالَ: اجْمَعُوا حطَبًا ، فجَمَعوا، ثُمَّ دَعَا بِنَارٍ فَأَضْرَمَهَا ، ثُمَّ قَالَ: عَزَمْتُ عَلَيْكُمْ لَتَدْخُلُنَّهَا.

---

٦٥٣ _ كۆمەڵانی ئیسلامی ئەمڕۆ بەم شێوەن با شێوەكانیان زۆر بێ و، دروشم و نیشانەكانیان جیاواز بێ و، ناوەكانیشیان هەمە جۆر بێ.

هاوشێوەی ئەم پەیمانە بیدعەیەو داهێنراوەو، فەرمانی خوای لە سەر نی یە.

٦٥٤ _ رواه البخاري (٨ / ٤٧)، ومسلم (١٨٤٠).

قَالَ: فَهَمَّ الْقَوْمُ أَنْ يَدْخُلُوهَا، فَقَالَ لَهُمْ شَابٌّ: إِنَّمَا فَرَرْتُمْ إِلَى رَسُولِ اللهِ مِنَ النَّارِ ، فَلاَ تَعْجَلُوا حَتَّى تَلْقَوُا النَّبِيَّ _ صلى الله عليه وسلم _ فَإِنْ أَمَرَكُمْ أَنْ تَدْخُلُوهَا، فَادْخُلُوا ، فَرَجَعُوا إِلَى النَّبِيِّ _ صلى الله عليه وسلم _ ، فَأَخْبَرُوهُ ، فَقَالَ لَهُمْ رسولُ اللهِ _ صلى الله عليه وسلم: ((لَوْ دَخَلْتُمُوهَا مَا خَرَجْتُمْ مِنْهَا أَبَدًا ، إِنَّمَا الطَّاعَةُ فِي الْمَعْرُوفِ.)).

واتە پێشەوامان (علي) _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ سریەیەکی بەڕێ خست و، پیاوێکی پشتیوانی کرد بە سەرکردەیان، کاتێ چوونە دەرێ لە شتێکدا لێیان تووڕە بوو، فەرمووی: ئایا پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ فەرمانی پێنەکردن کە گوێڕایەڵم بن ؟ گوتیان: بەڵێ، فەرمووی: دارو چیلکەم بۆ کۆکەنەوە، ئەوانیش کۆیان کردەوە، پاشان دارو چیلکەکەی ئاگرداو، فەرمووی: بڕیارم داوە هەمووتان بچنە نێوی.

پێشەوامان (علي) _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرمووی: کۆمەڵێك لە خەڵکەکە ویستیان بچنە نێو ئاگرەکەوە، بەڵام لاوێکیان تێدا بوو پێی فەرموون: لە ڕاستیدا ئێوە لە ترسی ئاگردا بۆ لای پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ هەڵهاتوون، بۆیە پەلە مەکەن تا چاوتان بە پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ دەکەوێ، ئەگەر پێی فەرموون بچنە نێوی، بچنە نێوی، ئەوەبوو ئەوانیش بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ گەڕانەوەو، بەسەرهاتەکەیان پێڕاگەیاند، پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ پێی فەرموون: ((ئەگەر بچواینە نێوی، هەرگیز دەرچوونتان نەبوو، لە ڕاستیدا گوێڕایەڵی سەرکردە تەنها لە شتی چاك و خێردایە)).

لە (عبدِاللهِ)ی کوڕی (إبراهيمَ الجَزَرِيِّ)وە دەڵێت: (أبوالخيرِ الدُّئيلي) گوتی: لای (خيرِ النَّسَّاجِ) دانیشتبووم، ژنێك هاتە دیدەنی و، پێی گوت: دەستەسڕەکەم بەرێ کە پێم دای. گوتی: بەڵێ. دەستەسڕەکەی بە ژنەکەدا. ژنەکەش پێی گوت: هەقدەستەکەت چەندە ؟ گوتی: دوو دیرهەمە. ژنەکە گوتی: ئێستا هیچ شتێکم پێ نییە، چونکە چەند جارێك هاتمە ئێرەو، نەمبینیت، بۆیە _ إن شاء الله _ سبەینێ پارەکەت بۆ دێنم. (خيرِ)یش پێی گوت: هەرکات

پارەکەت بۆ هێنام و لێرە نەبووم، بیخەرە نێو ڕووباری دیجلـەوە، هـەرکات هاتمـەوە دەیبـەم. ژنەکەش پێی گوت: چۆن لە دیجلە هەڵیدەگریتەوەو دەیبەی، (خیر)یش پێی گـوت: لـەم شـتە مەکۆڵەرەوەو، دەست مەخەرە نێو کاروباری یەکێکی دیکەوە، ئەوە بکە کە فەرمانم پێکردی. ژنەکەش گوتی: _ إن شاء الله _، پاشان ڕۆشت.

(أبو الحسنِ) دەڵێت: بۆ سبەینێ هاتمەوە، (خیرِ) نەهاتبوو، پاش کـەمێك ژنەکـە هـات و پارچە قوماشێکی بەدەستەوە بوو کە دوو دیرهەمی تێدا بوو، کە تەماشـای کـرد نـەهاتووە، فڕێی دانە نێو دیجلەوە، تەماشام کرد یەکسەر قرژاڵێك هـات و، پارچـە قوماشـەکەی بـردو، خۆی لە نێو ئاوەکەدا نقووم کـرد، پـاش سـەعاتێك (خیرِ) هاتـەوەو، دەرەگـای حانوتەکـەی کردەوەو، لە قەراخ ڕووبارەکە دانیشت بۆ ئـەوەی دەسـتوێژ بگرێـت، یەکـسەر قرژاڵەکـە لـە ئاوەکە هاتە دەرێ و، پارچە قوماشەکەی بەسەر پشتەوە بـوو، کـە لـە شـێخ نزیـك بویـەوە، بردی، منیش پێم گوت: ئاوەها و ئاوەهام بینی. ئەویش گوتی: حەز دەکەم لـە ژیـانی منـدا بڵاوی نەکەیتەوە. بۆیە منیش پەیمانی ئەوەم پێدا.

نووسەر دەفەرمێت:

شتێکی وەکو ئەمە لە ڕاستیەوە بـەدوور دادەنرێـت، ئەگـەر ڕاسـتیش بێـت، ئـەم کـارە سەرپێـچیەو، دژبـە بـە فـەرمانی شـەرعە، چـونکە شـەرع فـەرمانی داوە مـاڵ و سـامان بپارێزرێت‌و، ئەو کارەی کە ئەنجامی داوە بەفیڕۆدانە.

وفي ((الصحيح)) أنَّ النبيّ _ صلى الله عليه وسلم _ نهى عن إِضاعةِ المالِ([٦٥٥]).

واتە پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ قەدەغەی کردووە ماڵ و سامان بە فـیڕۆ بدرێت.

ئاوڕ مەدەرەوە لـە قـسەی ئـەو کەسـانەی کـە دەڵـێن ئەمـە کەراماتـە، چـونکە خـوای _عزَّوجلَّ_ کەرامات بەو کەسانە نابەخشێ، کە سەرپێچی شەرعەکەی دەکەن.

---

٦٥٥ _ تقدم تخريجه.

له (عليٍّ) كوڕی (عبدِالرحيمِ)ەوه دەڵێت: ڕۆژێك چوومه دیدەنی (النُّوريِّ)، تەماشام كرد پێیەكانی ئاوساوە، منیش له باروحاڵیم پرسی ؟ پێی گوتم: نەفسم داوای خواردنی خورمای لێ دەكردم، بەڵام دەمویست نەیخۆم و، نەفسی خۆمم لێ دوردەخستەوە، بەڵام ڕازی نەدەبوو، بۆیه چوومه دەرێ و، كڕیم، كاتێ خواردم، پێم گوت: دە هەستەو، نوێژ بكه. تەماشا دەكەم ڕازی نابێ، ئەوەبوو گوتم: سوێند بەخوا چل ڕۆژ نابێ له سەر زەوی دانیشم مەگەر لە كاتی تەحیات خوێندندا، بۆیه دانەنیشتم!

دەڵێم ــ ابن الجوزي ــ: ئەگەر كەسانێكی نەفام گوێبیستی ئەم بەسەرهاتەبن دەڵێن: چەند چاكە ئەم تێكۆشانە بەرامبەر بە نەفس ! كەچی نازانن ئەم ڕەفتارە جایز نییە. چونكه شیاو نیه بارێك بخرێتە سەر نەفس كە توانای هەڵگرتنی نەبێ و، هەقی حەسانەوەو ئاسوودەی لێ قەدەغە بكرێت.

(أبوحامدِ الغَزَليُّ) له كتێبی (الإحياء)دا دەڵێت: هەندێ لە شێخان لە سەرەتادا بۆ هەستانی شەو نوێژ تەمبەڵی دەیگرتن، بۆیە بڕیاریاندا بەدرێژایی شەو لە سەر سەریان ڕاوەستن، بۆ ئەوەی نەفسیان بە ئارەزووی خۆیان هەستێت !

هەروەها دەڵێت: كەسانێكیان چارەسەری خۆشویستنی سەرەوەت و سامانی بەوە دەكرد كە هەمووی دەفرۆشت و، دەیخستە نێو دەریاوە، چونكه لەوە دەترسا ئەگەر لە نێوان خەڵكدا دابەشی بكات، هەڵەشەیی بەخشندەیی و، ڕووپامایی دەستبڵاوی تووش بێت !

هەروەها دەڵێت: كەسانێكیان بە كرێ كەسانێكی تریان بۆ خۆیان دەگرت بۆ ئەوەی لە پێش خەڵكدا جوێنی پێ بات، بۆ ئەوەی نەفسی خۆی ڕابێنێ لە سەر میهرەبانی و لە سەر خۆیی!

هەروەها دەڵێت: كەسانێكی دیكەش لە زستانداو لە كاتی شلۆقانی شەپۆلەكانی دەریادا سواری كەشتی دەبوو، بۆ ئەوەی ئازاو زیرەك بێت.

نووسەر دەفەرمێت:

لە هەموویان بەلامەوە سەرسوڕمێنتر بێ، (أبوحامدِ)ە، چۆن ئەم شتانەی بـاس کـردوەو، نکۆڵیی لێ نەکردون ؟!

بەڵام چۆن نکۆڵیی لێ بکات، لە کاتێکدا ئەم شتانەی بۆ فێرکردنی خەڵك باس کردووە ؟!

(أبوحامـدِ) پێش ئەوەی ئەو بەسەرهاتانە بگێڕێتـەوە دەڵێـت: پێویـستە شـێخ تەماشـای باروحاڵی کەسی تازە دەستپێکاری موریدی خۆی بکات:

ئەگەر ماڵ و سەروەتێکی زیاد لە ئەندازەی پێویستێتی خۆی بەلاوە بینی، دەیبات و، لـە ڕووە جیاوازەکانی خەیردا خەرجی دەکات و، دڵی مورید لەو سەروەتە زیادە خـاڵی دەکاتـەوە بۆ ئەوەی ئاوەڕی لێ نەداتەوە.

وە ئەگەر تەماشای کرد گەورەیی و خۆبـەزلزانینی بەسـەردا زاڵ بـووە، فـەرمانی پێـدەدا بچێتە بازار بۆ ڕەنجدان و ئارەق ڕشتن، ڕایدەسپێرێ داوا لـە خـەڵك بکـات و، لـە سـەر ئـەوە بەردەوام بێ.

وە ئەگەر تەماشای کرد بەزۆری بیکارە، کـاری ئاودەسـت و، پاکردنـەوەی و، کـسکدانی شوێنە پیسەکانی دەداتێ، فەرمانی پێدەدا بەردەوام لە چێـشتخانەو، شـوێنە دوکەڵەیەکانـدا کاربکات .

وە ئەگەر تەماشای کرد زۆرخۆری بەسەردا زاڵە، فەرمانی ڕۆژووگرتنی پێدەدا.

وە ئەگەر تەماشای کرد بێ ژنەو، شەهەوت و ئارەزووی بە ڕۆژووگرتن نەشکاوە، فەرمانی پێدەدا شەوێك ڕۆژووەکەی بە ئاو بشکێنێ و هیچی تر نەخوات، شەوێکیش تەنها نان بخوات و ئاو نەخواتەوە، یەکسەر خواردنی گۆشتیشی لێ قەدەغە دەکات.

دەڵێم _ ابن الجوزي _: بەڕاستی لە (أبي حامدِ) سەرم سوڕ دەمێنێ، چـۆن فـەرمان بـەم شتانە دەکات، لە کاتێدا کە پێچەوانەی شەریعەتن.

چۆن دەشێ مرۆڤ بەدرێژای شەو لە سەر سەری بوەستێت، لـەو کاتـەدا خوێنەکـەی بـەرەو ڕووی پێچەوانە دەبێتەوەو، تووشی نەخۆشیەکی توندی دەکات ؟!

وه چۆن دەشىٚ ماڵ و سەروەت فڕىٚ بدرێته نێو دەریاوە، له كاتێكـدا پێغەمبــەرى خـوا _ صلى الله عليه وسلم _ بەفیڕۆدانى ماڵ و سامانى قەدەغه كردووه.

وه ئايا دەشىٚ بەبىٚ هيچ هۆيەك جوێن به موسڵمان بدرێت ؟!

وه ئايا بۆ موسڵمان دەشىٚ كەسێك بەكرىٚ بگرێت، بۆ ئەوەى جوێنى پىٚ بات ؟!

چۆن دەشىٚ له كاتى شڵۆقى شەپۆلەكانى دەریادا مرۆڤ سوارى كەشتى بێت، لـه كاتێكـدا ئەگەر شەپۆلەكان شڵۆق بوون، پێویسته مرۆڤ سوارى كەشتى نەبىٚ و بـۆ بـەجێهێنانى حـەج نەچێت.

وه ئايا شیاوه مرۆڤ داوا له خەڵك بكات له كاتێكدا تواناى كارو كەسابەتى هەبىٚ ؟!

تەماشاكه (أبو حامدِ الغزاليُّ) چەند به هەرزان فیقهى به تەصوف فرۆشتووه !

## ✵ سەرپێچیەکانیان لە پەروەردەو ڕێنوێنیدا :

لــە (الحَسَنِ)ی کــوڕی (علـيّ الـدَّامَغانيّ)وە دەڵێــت: پیــاوێکی خــەڵکی (بِسْطام) لــە مەجلیسەکەی (أَبي يزيدَ) دانەدەبڕاو بەجێی نەدەهێڵا، ڕۆژێك پێی گوت: مامۆستا ! من سی ساڵە بەردەوام بەڕۆژووم و، بە شەویش شەونوێژ دەکەم، لە ئارەزووات وازم هێناوە، بەڵام هیچ شتێکی ئەوانەی تۆ باسی دەکەی لە دڵمدا هەست پێ ناکەم !! (أَبـو يزيـدَ)یـش پێـی گـوت: ئەگەر سێ سەد ساڵ بەڕۆژوو بیت و، سێ سەد ســاڵیش شــەونوێژ بکــەیت و، لــە ســەر ئــەو باروحاڵە بیت کە من دەتبینم تیایدای، هەرگیز هەست بە گەردیلەیەك لەم زانــستە ناکــەیت. گوتی: بۆچی مامۆستا ؟ گوتی: چونکە نەفسی خۆت داپۆشیویت ! پێی گــوت: ئایــا ئەمــە دەرمانێکی هەیە بۆ ئەوەی ئەم داپۆشەرە لاچێت ؟ گوتی: بەڵێ، بەڵام تۆ ئەوەت قبوڵ نییە ! گوتی: بەڵێ، قبوڵی دەکەم و، ئەوەی تۆ پێم دەڵێیت جێبەجێی دەکەم. (أَبو يزيدَ)یش گــوتی: ئا ئێستا سەرو ڕیشت بتاشەو، ئەم پۆشاکەی بەرت فڕێدەو، بە عەبایەکەوە بــچۆرە دەرێ و، تورەکەیەك لە مل بکەو، پــڕی گــوێز بکــەو، هاواربکــەو بڵــێ: ئــەی منداڵێنــە ! هەرکــەس شەپازللەیەکم لێدات، گوێزێکی دەدەمێ، هەروەها بچۆرە ئەو بازاڕەش کە تیایدا ڕێزداریت.

ئەویش گوتی: ئەی (أَبا يزيدَ) ! _ سبحان الله _، شتانێکی وەکو ئەمەم پێ دەڵێی، ئەی بۆ من چاکە ئەمە بکەم ؟!

گوتی: کە دەڵێی: _ سبحان الله _ ئەوە شیرك و هاوبەش بڕیاردانە ! گوتی: چۆن ؟ گوتی: چۆنکە نەفسی خۆتت بەگەورە داناو، پاك و بێگەردیشت بۆ بڕیاردا ! گوتی: ئەی (أَبا يزيدَ) ! ئەمە شتێکە لە توانای من بەدەرەو، جارێکی تر نایڵێمەوە، بەڵکو بۆ شتێکی تــر ڕێنمــوویم بکە تا جێبەجێی بکەم. (أَبو يزيدَ)یش گوتی: پێش هەموو شتێك دەستپێــشخەری بکــە بــۆ بەجێهێنانی ئەو شتانەی سەرەتا پێم گوتی بۆ ئەوەی شەرافەت و بــەڕێزی خــۆت نــەهێڵی و، نەفسی خۆت ڕیسوا بکەی، پاشان شتانێکی ترت پێ دەڵێم کە بــۆ تــۆ چــاك بێــت ! گــوتی: بەرگەی ئەم شتانە ناگرم. ئەویش گوتی: من دڵنیا بووم ئەمەت قبوڵ نابێ!!

نووسەر دەفەرمێت:

سوپاس و ستایش بۆ خوای تعالی هیچ شتێکی ئەوانەی (أبو یزیدَ) لە شەرعەکەی ئێمەدا نییە، بەڵکو شەرع ئەو شتانەی بە حەرام داناوەو، قەدەغەی ئەوەی لێ کردووین مرۆڤ نەفسی خۆی ڕیسوا بکات، پێغەمبەری خوا _ صلی الله علیه وسلم _ فەرموویەتی:

((لیس للمؤمِنِ أَن یُذِلَّ نفسَهُ))(٦٥٦) واتە فەرموویەتی: ((ڕێگە بە موسڵمانی بڕوادار نەدراوە نەفسی خۆی ڕیسوا بکات)).

جارێك (حذیفةَ) نوێژی هەینی لە دەست چوو، تەماشای کرد وا خەڵك دەگەڕێنەوە، خۆی لە پەنای شتێکدا شاردەوە، بۆ ئەوەی لە بواری نوێژدا بە چاوێکی کەمەوە تەماشا نەکرێت !

ئایا شەرع لە هیچ کەسێکی داوا کردووە کاریگەری نەفس بسڕێتەوە ؟!

---

٦٥٦ _ رواه الترمذي (٢٣٥٥)، وابن ماجة (٤٠١٦)، وأحمد (٥ / ٤٠٥)، وأبوالشيخ في ((الأمثال))(١٥١)، والقضاعي في ((مسند الشهاب))(٨٦٦) " عن حذيفة " بسند ضعيف.

وله طرق أخرى:

فأخرجه الطبراني في ((المعجم الكبير)) (١٣٥٠٧)، والبزّار (٣٣٥٣)، وأبو الشيخ في ((الأمثال)) (١٥٣) " من حديث ابن عمر.

وقال الهيثمي في ((المجمع)) (٧ / ٢٧٤ _ ٢٧٥) بعد أن زاد نسبته لـ ((أوسط)) الطبراني:

((ورجاله رجال الصحيح، غير زكريا بن يحيى بن أيوب الضرير، ذكره الخطيب، روى عن جماعة، وروى عنه جماعة، ولم يتكلم فيه أحد)).

قلت: فهو حسن في الشواهد على أقلِّ تقدير.

وقد صحَّح إسنادَه لذاته شيخنا الألباني لأحتمال أن زكريا عنده هو أبو يحيى اللؤلؤي !

وليس هو.

ولم يقف شيخنا على رواية أبي الشيخ وغيره.

والله أعلم بالصواب.

بەڵكو شەرع هەوڵی داوە شەرافەت و بەڕێزی نەفس بپێنێت(٦٥٧)، تا ئەو ئاستەی ئەگەر کەسێکی قۆشمەچیش فەرمان بە منداڵان بات شەپازللەی لێدەن، دڵنیابن شتێکی ناشیرین دەبێ!

پەنا بەخوا دەگرین لەم کەم ئەقڵ و ژیریە، کە لە کەسێکی تازە دەسپێکار داوای شتانێك دەكات، شەرع پێی ڕازی نییە، لە ئەنجامیشدا ئەو کەسە سارد دەبێتەوەو، هەوڵی خۆ دورخستنەوە دەدات.

(أبوحامدِ الغَزَاليُّ) لە کتێبی (الإحياءِ)دا لە (يحيى)ی کوڕی (مُعاذِ)ەوە دەگێڕێتەوە کە گوتویەتی: بە (أبي يزيدَ)م گوت: ئایا لە خوای تعالات داوا کردووە کە بە چاکی بیناسیت؟! ئەویش گوتی: پێی ناخۆش بوو جگە لە خۆی هیچ کەسێکی دیکە لەو شتە ئاگادارکاتەوە.

دەڵێم _ ابن الجوزي _: لە ڕاستیدا دان بە نەفامی خۆیدا دەنێت، چونکە ئەگەر مەبەستی بە چاك ناسینی خوای تعالی بێت بە گشتی، وەکو ئەوەی کە مەجودەو سیفاتی هەیە، ئەمە شتێکە نابێ هیچ موسڵمانێك نەیزانێت، ئەگەر خەیاڵیشی بۆ ئەوە چووبێ کە بە چاك ناسینی خوای تعالی بریتیە لە زانینی هەقیقەتی زاتی خوای تعالی و، جەوهەرەکەی، ئەوا بەڕاستی نەفامیە بە خوای تعالی.

(أبوحامدِ) دەگێڕێتەوە کەوا ڕۆژێك (أباتُرابِ النَّخْشَبِيَّ) بە موریدێکی خۆی گوت: ئەگەر یەك جار (أبا يزيدَ) ببینیت، بۆ تۆ لەوە بەسوودترە کە خوای تعالی حەفتا جار ببینیت !

دەڵێم _ ابن الجوزي _: ئەم قسانەی ئەو بە چەندین پلە لە سەرووی شێت بوونەوەیە.

(أبوحامدِ الغَزَاليُّ) لە (ابنِ الكُرَيني)ەوە دەگێڕێتەوە کە گوتویەتی: چوومە شوێنێك، بە کەسێکی چاك ناسرام، گڕ لە دڵم بەر بوو، بۆیە چومە گەرماوێکەوە، چاوم خستە سەر پۆشاکێکی نایاب، دزیم و، پۆشیم و، پاشان پۆشاکە (المُرَقعة)ی خۆمم بەسەریدا پۆشی و، چوومە دەرەوەو، بەهێواشی کەمە کەمە ڕێم دەکرد، پێم گەشتن و، پۆشاکە (المُرَقعة)یان لە

---

٦٥٧ _ بەڵام بەبێ خۆهەڵکێشان و لووت بەرزی و خۆبەزلزانین.

بەرم داکەندو، پۆشاکەکانی خۆیانیان بردو، شەپازللەیەکیان لێدام و، ئیتر لەوە بەدوا بەدزی گەرماو ناسرام، بۆیە نەفسم هێور بویەوە.

(أبوحامدِ) دەڵێت: ئا بەم شێوە نەفسی خۆیان ڕازی دەکرد، بۆ ئەوەی خوای تعالی ڕزگاریان بکات و، چیتر نە تەماشای خەڵك و، پاشان نە تەماشای نەفسی خۆشیان بکەن، پێدەچێ صوفیە سەرگەورەکانی (الحال) نەفسی خۆیان بە شتانێك چارەسەر بکەن، کە کەسی فیقهزان ڕای لە سەر نەبێ و، فەتواشی بۆ نادات بەو جۆرە خۆی چارەسەر بکات، هەرچەند کەسی فیقهزان زانیبێتی ئەو کەسە گەشتۆتە ئاستێکی بەرزی دڵ چاکیش، پاشان صوفیە خاوەن (الحال)ەکان فریای خۆیان دەکەون و، ئەو کەمتەرخەمیانە چارەسەر دەکەن کە تووشی دەبن، بە هاوشێوەی ڕەفتاری ئەو کەسە کە لە گەرماوەکەدا ئەنجامی دا !

دەڵێم _ ابن الجوزي _: پاك و بێگەردی بۆ ئەو زاتەی کە (أبا حامدِ)ی لە بازنەی فیقە کردەوە دەرەوە کاتی هەستا بە دانانی کتێبی ((الإحیاءِ))، بریا شتانێکی وەکو ئەمەی تێدا باس نەکردایە کە حەڵاڵ نین.

لەوەش سەرسوڕمێنتر ئەوەیە کە باسی دەکاو بەچاکی دادەنێ و، خاوەنەکانیشیان بە سەرگەورانی (الحال) ناودەبا.

باشە دەبێ چ (الحال)ێك ناشیرینترو خراپتر بێ لە (الحال)ی ئەو کەسەی کە سەرپێچی شەرع دەکات، ئەم شەرعەی کە وای تەماشا کردووە بەرژەوەندی گشتی لەوەدایە کە قەدەغەی ئەو شتانە بکات ؟!

باشە چۆن دەبێ بە کردەوەی خراپ و سەرپێچی کردن داوای دڵ چاکی بکرێت ؟!

ئایا هیچ شتێك لە شەرعدا نەماوە دڵی خۆی پێ چاك بکات، تەنها ئەو شتانە نەبێ کە تیایدا حەڵاڵ نەکراوە؟!

ئەمە لە ڕەگەزی ئەو کردەوانەیە کە ئەمیرە نەفامەکان ئەنجامی دەدەن، کاتێ ئەندامی کەسێك دەبڕن کە بڕینی (واجب) نییە ببڕدرێ و، کەسانێك دەکوژن کە نابێ بکوژرێن و، ئەم ڕەفتارە بە سیاسەت ناودەبن. کەچی شەریعەت بۆ سیاسەتێکی وەکو ئەمە بەکار نایەت.

باشە چۆن حەڵاڵە مرۆڤ خۆی تووشی شتێکی وا بکات کە ناوی بە دز بەرن؟!

ئایا بۆ موسڵمان شیاوە مەبەستی لاوازکردنی ئاینەکەی خۆی بێتو، بەلای شایتحاڵەکانی خواوە لە سەر زەویدا هەوڵی لادان و سڕینەوەی بدات.

تەنانەت ئەگەر پیاوێك لە گەڵ خێزانەکەی خۆیدا لـە ڕێگەیەکـدا بوەسـتێت، قـسەی لـە گەڵدا بکات و دەست بە شوێنێکیدا بهێنێت، بۆ ئەوەی ئەو کەسانەی کە نازانن ژن و مێـردن پێیان بڵێن: ئەمە کەسێکی فاسق و خراپەکارە، بە دڵنیایی بەو کارەی کەسێکی سەرپێچیکار دەبوو.

پاشان چۆن دەشێ تەصرۆف بە ماڵ و سامانێکەوە بکرێت بەبێ مۆڵەتی خاوەنەکەی ؟!

پاشان لـە دەقـی ڕێباوەڕەکـانی پێـشەوایان (أَحمـدَ) و (الـشافعيُّ)دا هـاتووە کـە ئەگـەر هەرکەسێك لە گەرماودا پۆشاك بدزێ، بەمەرجێك ئەو پۆشاکانە کەسێك هەبێ بیانپارێزێـت، پێویستە دەستی دزەکە ببڕدرێت.

پاشان سەرگەورانی (الحال) کێن تا کار بە واقیعاتی خۆیان بکەن ؟!

نەخێر سوێند بەخوا، ئێمە شەریعەتێکمان هەیـە ئەگـەر (أَبـوبکرِ الـصِّدِّیقُ) بیـەوێ لـەو شەریعەتە بچێتە دەرەوە، بۆ ئەوەی بە بیروڕای تایبەتی خۆی کار بکات، دڵنیابن لێـی قبـوڵ ناکرێت.

بۆیە من سەرم سوڕ دەمێنی لەم فیقهزانە کە بە تەصوف لە فیقـە دزاروە، زۆر زیـاتر لـە سەرسوڕمانم لەم دزی پۆشاکە.

## ✱ بە نەفسی خۆیان سووکایەتی دەکەن :

لە (محمد)ی کوڕی (أحمدَ النَّجَّارِ)ەوە دەڵێت: (عليٌّ) کوری (بابَوَیْـةِ) لـە صـوفیەکان بـوو، ڕۆژێك لە ڕۆژان پارچە گۆشتێکی کڕی، حەزی کرد هەڵیگرێت و، بۆ ماڵەکەی خۆی بیباتەوە، بەڵام لە خەڵکی بازاڕ شەرمی دەکرد، بۆیە لـە ڕقـی ئـەو شـەرمەدا پارچـە گۆشـتەکەی بـە ملیەوە هەڵواسی و، بۆ ماڵی بردەوە.

دەڵێم _ ابن الجوزي _: بەڕاستی سەرسوڕمانە کە کەسانێك لە نەفسی خۆیان داوا دەکـەن کاریگەری خوو و ئەو فیترەتە سروشتیەی کە پەروەردگار مرۆڤـی لـە سـەر دروسـت کـردووە بسڕێتەوە، دڵنیابن ئەوە شتێکە لە توانا بەدەرەو، ویستی شەرعیش نییە، خـوای تعـالی لـە خوو و فیترەتی سروشتی ئادەمیزادا چەسـپاندویەتی کـە حـەز نـەکات ببینرێـت مەگـەر بـە پۆشاکێکی جوان ڕازابێتەوە، وە لە ڕووتی و سەر ڕووتی شەرم دەکات، شەرعیش ڕێگریی لەو شتانە ناکات.

ئەم پیاوە کە لە نێوان خەڵکدا بە نەفسی خۆی سووکایەتی کـردووە، لـە شـەرع و ئەقڵـدا شتێکی ناشیرینە، چونکە ئەو ڕەفتارەی کـە نواندویـەتی لـە دەسـتدانی پیاوەتیـە نـەك خـۆ ڕاهێنان، ڕەفتاری ئەم پیاوە هەروەکو ئەوەیە کە هەردوو نەعلەکەی بەسەری هەڵگرتبێ.

دڵنیابن خوای تعالی ڕێزی لە نەوەی ئادەم گرتووە، بۆ زۆرێك لە خەڵك کەسانێکی تەرخان کردووە خزمەتی بکەن، ئەوە ئاینداری نییە کە پیاو لە نێوان خەڵکیدا نەفسی خۆی سەرشـۆڕ بکات.

تاقمێك لەصوفیەکان ناوی خۆیان نابوو (الملامَتیَّةِ) واتە سەرزەنشتکراوان، خۆیان فڕیدایـە نێو تاوانەوەو، دەیانگوت: مەبەستمان ئەوەیە لە بەر چاوی خـەڵك بکـەوین، بـۆ ئـەوەی لـە بەڵای گەورەی و بەڕێزی و ڕووپامایی بێوەی بین !

نموونەی ئەم تاقمە بەهاوشێوەی نموونەی کەسێکە لە گەڵ ژنێکدا داوێن پیسی بکات و، سکی پڕ بکات، ئینجا پێی بگوترێت: ئەوە بۆ (عَـزْلْ)ت(٦٥٨) نـەکرد ؟ ئـەویش بڵێـت: پـێم گەشتووە کە (عَزْلْ)(٦٥٩) حەرامە !! بۆیە پێی گوترا: ئەی پێت نەگەشتووە کە داوێـن پیـسی حەرامە ؟!

ئەم نەفامانە شەرافەت و بەڕێزی خۆیان بەلای خوای تعالاوە نەهێڵاوە، بیریـان چـووە کـە موسڵمانان لە سەر زەمیندا شایتحالّی خوان (٦٦٠).

لە (أَبي عَمْرو)ی کوڕی (عُلْوانَ)ەوە دەڵێت: (أَبوالحسينِ النُّوريُّ) سێ سەد دیناری هەڵگرت کە نرخی موڵکێك بوو، بۆی فرۆشرابوو، لە سەر پردێك دانیشت و، کـە هـەر یـەکێکی فـڕێ دادایە نێو ئاوەکەوە دەیگوت: هاتویتەتە لام دەتەوێ بەم جۆرە فریوم بەی !

(السَّرَّاجُ) دەڵێت: بۆیە چەند کەسێك دەیانگوت: ئەگەر لە پێناو خوادا خـەرجی بکردایـە، بۆ ئەو خێرتر دەبوو.

منیش گوتم _ ابن الجوزي _: ئەگەر ئەو دینارانە یەك چاو تروکانێك سەرقاڵی بکردایـەو، نەیهێڵایە فەرمانەکانی خوا جێبەجێ بکات، (واجـب) بـوو بـە یـەك کـەڕەت فڕێیداتـە نێـو ئاوەکەوە، بۆ ئەوەی خێراتر لە بەڵاکەی ڕزگاری بێت، وەکو پێغەمبەر (سُليمان) کە کاتێ ئەو ئەسپانە سەرقاڵیان کردو نەیانهێڵا نوێژی عەسر بکات تا کاتی شێوان هات، دەستی بە مل و قاچیاندا دەهێناو دەیفەرموو تۆ لە پێناوی خوادای ، لەم بـارەوە خـوای تعـالی دەفـەرمێت: ﴿فَطَفِقَ مَسْحًا بِالسُّوقِ وَالأَعْنَاقِ﴾ ﴿ص: ٣٣ ﴾ واتە ئینجا دەستی هێنا بـە دەسـت و قـاچ و گەردەن و یاڵی (ئەو ئەسپانەدا)(٦٦١) !

---

٦٥٨ _ عَزْلْ: واتە پیاو لە گەڵ ژندا جووت دەبێ، ئەگەر لە ڕژاندن و دابەزینی تۆماوەکەی نزیك بویـەوە، ئەندامی نێرینەی دەردەهێنێ و، لە دەرەوەی ئەندامی مێینە دەیڕژێنێ، بڕوانە: شرح النـووي علی مـسلم، ج١٠، ص٩، وەرگێڕ.

٦٥٩ _ بۆ شارەزابوون لە حوکمەکانی (عَزْلْ) تەماشای ئەم کتێبەمـە بکـە: ((الأبتهـاج بأحكـام الخِطبـة والزواج))(ق ١١٥)، يسر الله أتمامه.

٦٦٠ _ کما في الحديث الذي رواه البخاري (١٣٦٧)، ومسلم (٩٤٩) " عن أنس.

٦٦١ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

دەڵێم _ ابن الجوزي _: ئەم قەومە نەفامی خۆیان بە شەرع و، کەم ئەقڵێتی خۆیان ئاشکرا کرد، پێشتر ڕوونمان کردەوە کە شەرع فەرمانی داوە بە ماڵ پاراستن، نابێ بە دەستی هیچ کەسێکەوە بدرێت، مەگەر کەسێکی هوشیارو ئاقڵ، بۆ ئەوەی ئادەم کردویەتی بە کۆڵەکەو، پشتگیرو، بژێوی، ئەقڵ و ژیریش شایەتیمان بۆ دەدا کە ماڵ و سامان بۆ بەرێوەبردنی بەرژەوەندیەکان خولقێنراون، بۆیە ئەگەر مرۆڤ فرێی بات، ئەوا بەڕاستی شتێکی لە دەست خۆی داوە کە هۆکاری چاکبونیەتی و، دەیسلمێنێ کە بە حیکمەت و دانایی خوای دانەرو خولقێنەری ئەو ماڵ و سامانە نەفامە.

کاری (السَّرَّاجُ)یش کە بەهانەی بۆ دەهێنێتەوە لە کاری خودی پیاوەکە ناشیرینترە، چونکە ئەگەر ئەو پیاوە لە بەڵای پارەکە دەترسا، ئەوا پێویست بوو بە هەژارێکی بات و، خۆی لێ ڕزگارکات.

## ✸ سەرپێچیەکانیان لە تەفسیری قورئانی پیرۆزدا :

لە کۆی نەفامیەکانیانی دیکەیان قورئان بە پێی بیرورا بۆگەنەکانی خۆیان تەفسیر دەکەن، چونکە بیانوو دەهێننەوە کە خوای تعالی دەفەرمێت: ﴿ فَطَفِقَ مَسْحًا بِالسُّوقِ وَالأَعْنَاقِ﴾، چونکە وادەزانن مانای ئایەتەکە ئەوە دەگەیەنێت کە (سُليمان) پێغەمبەر بەلێدانی دەست و قاچ و ملی ئەسپەکان بە شمشێر کوشتنی، ئیتر واتێگەشتووە ئەوە بەلگەیە بۆ خراپ کردن و تێکدان، کەچی تێنەگەشتووە کە خراپکردن و تێکدان لە شەرعەدا قەدەغە کراوە، لە ڕاستیدا (سُليمان) پێغەمبەر تەنها دەستی بە جەستەی ئەسپەکاندا دەهێناو دەیفەرموو: تۆ لە پێناوی خوادای.

(أبو نصرِ السَّرَّاجُ) لە کتێبی ((اللُّمع))دا دەلێت: (أبو جعفرِ الدَّرَّاجُ) دەلێت: ڕۆژێك مامۆستاکەم چووە دەرێ دەستنوێژ بگرێت، منیش تورەکەکەیم بردو، پشکنیم، تەماشام کرد ئەندازەیەك زیوی تێدایە بای چوار دیرهەم بوو، کەچی ئەو کاتە شەویش بوو، مایەوەو هیچ شتێکی نەخوارد، کە گەڕایەوە پێم گوت: لە نێو تورەکەکەی تۆدا ئەوەندەو ئەوەندە دیرهەم هەیە، کەچی ئێمە برسین. گوتی: ئەوە بردوتە ؟ بیگەڕێنەوە. پاشان پێی گوتم: بیبەو شتێکمان بۆ بکڕە. پێم گوت: بە هەق ئەو زاتەی کە دەیپەرستیت، باس و خواسی ئەم پارچە زیوانە چی یە ؟ ئەوەبوو گوتی: خوای تعالی لەم دونیا شتێکی دیکەی پێ نەداوم جگە لەمانە، بۆیە ویستم وەسێت بکەم لە گەلمدا بخرێتە نێو گۆڕەکەوە، تا هەرکات ڕۆژی قیامەت هات، بۆ خوای بگەڕێنمەوەو، بلێم: ئەمە ئەوەیە کە لەم دونیایە پێت داوم !

لە (أبي عبدِاللهِ الحُصْري)وە دەلێت: (أبو جعفرِ الحدَّادُ) بیست سالی کاری دەکرد، ڕۆژی بە یەك دینار، هەموو ڕۆژێ بە هەژارانی دەبەخشی و، خۆشی بە ڕۆژوو بوو، لە کاتی نێوان بانگەکانی شێوان و خەوتناندا دەچووە دەرێ، لە دەرگای مالەکانی دەداو، خێرو صەدەقەی داوا دەکردو، ڕۆژووەکەی پێ دەشکاند.

نووسەر دەفەرمێت:

ئەگەر ئەم پیاوە بیزانیبا داواکردنی خێرو صەدەقە ناشێ و دروست نییە بـۆ کەسـێك کـە توانای کارو کەسابەتی هەبێ، هەرگیز داوای نەدەکرد، گریمان داواکـردن شـیاوە، ئـەی باشـە شکۆمەندی نەفس لە کوێیە بۆ ئەوەی سەرشۆڕ نەکات بۆ لە خەڵك داواکردن ؟!

فعن عَبْدِ اللَّهِ بن عُمَر قالَ: قال رسولُ اللهِ _ صلى الله عليـه وسـلم _: ((لاَ تَـزَالُ الْمَـسْأَلَةُ بِأَحَدِكُمْ حَتَّى يَلْقَى اللَّهَ _ عزَّوجلَّ _ وَلَيْسَ فِي وَجْهِهِ مُزْعَةُ لَحمْ))(٦٦٢). واتە لە (عبـدالله)ی کوڕی (عُمَر)ەوە _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا _ صـلى الله عليـه وسلم _ فەرمووی: ((کەسی واتان تێدایە بەردەوام داوای خێرو صەدەقە دەکات تـا کـاتێ بـۆ لای خوای _ عزَّوجلَّ _ دەگەڕێتەوە تەنها یەك پارچە گۆشتیشی بە دەم و چاوەوە نابێ))

عَنْ الزُّبيرِ بنِ العَوَّام ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ _ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم _: ((لَأَنْ يَحْمِـلَ الرَّجُـلُ حَبْلًا، فَيَحْتَطِبَ ، ثُمَّ يَجِيءَ، فَيَضَعَهُ فِـي الـسُّوقِ، فَيَبِيعَـهُ ، ثُـمَّ يَـسْتَغْنِيَ بِـهِ ، فَيُنْفِقَـهُ عَلَـى نَفْسِه، خَيْرٌ لَهُ مِنْ أَنْ يَـسْأَلَ النَّـاسَ ، أَعْطَـوْهُ أَوْ مَنَعُـوه))(٦٦٣). واتـە لـە (الـزُّبيرِ)ی کـوڕی (العَوَّام)ەوە _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسـلم _ فەرمووی: ((ئەگەر پیاو حەبلێك هەڵگرێ و، دارو چیلکە کۆکاتەوەو، پاشـان بێـت و، لـە بازاڕدا داینێت و، بیفرۆشێت، هەر بەوە ڕازی بێت و، بۆ خـۆی خـەرجی بکـات، زۆر لـەوەی خێرترە کە لە خەڵك داوا بکات، پێی بدەن، یا پێی نەدەن)).

وفي حديث عبدِالله بنِ عَمْرو عن النبـيّ _ صـلى الله عليـه وسـلم _ أَنَّـهُ قـالَ: ((لا تَحِـلُّ الصدقةُ لغنيّ، ولا لذي مِرَّةٍ سويّ))(٦٦٤).

---

٦٦٢ _ رواه البخاري (٣ / ٢٦٨)، ومسلم (١٠٤٠).

٦٦٣ _ رواه البخاري (٣ / ٢٦٥)، واللفظ لأحمد (١ / ١٦٤ و ١٦٧).

٦٦٤ _ رواه الترمـذي (٦٥٢)، وأبـوداود (١٦٣٤)، والـدارمي (١ / ٣٨٦)، والحـاكم (١ / ٤٠٧)، والطيالـسي (١/١٧٧) " من طريق رَيْحان بن يزيد عنه.

ورَيْحان " جهله أبوحاتم، ووثقه ابن معين، وقال ابن حبان:

((صدوق)).

وله طريق أخرى عند البيهقي (١٧ / ١٣) بسند فيه جهالة.

وفي الباب عن عدَّة من الصحابة. فالحديث صحيح.

واتە لە (عبدِاللە)ی کوڕی (عَمرو)ەوە _ خوای لیٚ ڕازی بێت _ فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا _ صلی اللە علیە وسلم _ فەرمووی: ((خێرو صەدەقە بۆ کەسی دەوڵەمەندو، بۆ کەسێکی بەهێزو ئاقڵ و تەندروست حەڵاڵ نییە)).

پێشەوا (الشافعيُّ) _ خوای لیٚ ڕازی بێت _ فەرموویەتی: خێرو صەدەقە بۆ ئەو کەسانە حەڵاڵ نییە کە بەهێزن و توانای کارو کەسابەتیان هەیە.

## ✸ له سەرپێچیه جۆر بە جۆرەکانیان:

له (أبي الحَسَنِ يونُس)ی كوڕی (أبي بكرِ الشبْلِيّ)وه دەڵێت: شەوێك بابم هەستاو، پێیەكی خستە سەربانەكەو، پێیەكەی تریشی خستە سەر شوێنێكی تری ماڵەكەوە، گوێبیستی بووم بە خۆی دەگوت: ئەگەر چاوەت بتروكێنی فڕێت دەدەمە نێو ماڵەوە، بەردەوام بەو شێوە مایەوە تاوەكو ڕۆژ بویەوە، كە ڕۆژ بویەوە " پێی گوتم: كوڕم ! ئەمشەو گوێبیستی هیچ شتێك نەبووم زیكری خوای _ عزَّوجلَّ _ بكات جگە لە كەڵەشێرێك بای دوو (دانَقْ)(٦٦٥) بوو.

نووسەر دەفەرمێت:

ئەم پیاوە نێوان دوو شتی كۆكردۆتەوە كە جایز نین:

یەكەمیان: نەفسی خۆی خستۆتە مەترسیەوە، چونكە ئەگەر نووستنی بەسەردا زاڵ بوایەو، بكەوتایەتە خوارەوە، ئەوا هەر خۆی دەبووە یارمەتیدەری تیاچوونی خودی خۆی، بێگومان ئەگەر خۆشی فڕێدایەتە خوارەوە، ئەوا تاوان و سەرپێچیەكی گەورەی ئەنجامدەدا، چونكە ئەگەر مرۆڤ خۆی تووشی كەوتنە خوارەوە بكات، سەرپێچیە.

دووەم: نووستنی لە خۆی قەدەغە كردووە، كەچی پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم_ فەرموویەتی:

((فإن لجَسَدِكَ عليك حقّاً ، وإن لزوجِكَ عَليكَ حقّاً ، وإنَّ لعَيْنكَ عليكَ حقّاً))(٦٦٦).

واتە فەرموویەتی: ((دڵنیابە جەستەت هەقی بەسەرتەوە هەیە، هاوسەرەكەت هەقی بە سەرتەوە هەیە، چاوەكانت هەقی بە سەرتەوە هەیە)).

وقالَ: ((إِذا نَعِسَ أَحدُكُم " فليَرْقُدْ))(٦٦٧).

واتە پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ فەرموویەتی: ((هەركات كەسێكتان خەوی هات، با بخەوێت)).

---

٦٦٥ _ دانق: یەك لە سەر شەشی دیرهەمێكە.

٦٦٦ _ تقدم تخريجه.

٦٦٧ _ رواه البخاري (١ / ٢٧١)، ومسلم (٧٨٦) " عن عائشة.

وفيه زيادة: ((... وهو يصلّي...)).

ومرَّ _ صلى الله عليه وسلم _ بحبلٍ قد مَدَّتْهُ زينبُ، فإذا فَتَرَتْ " أمسكَتْ بِهِ، فأمَرَ بحلِّهِ، وقالَ:

((لِيُصَلِّ أَحدُكُم نشاطَهُ، فإذا كَسِلَ أو فَتَرَ " فلْيَقْعُدْ))(٦٦٨).

واتە پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ بەلای حەبلێكدا تێپەڕیوو زینەب درێـژی كردبویەوە، بـۆ ئـەوەی هـەركات سـستبوون ڕوی تێكـرد، دەسـتی پێـوە بگرێـت، ئـەوەبوو فەرمانیدا حەبلەكەی لابەرێت و فەرمووی:

((با هەر كەسێكتان لە كاتی چالاكیەكەیدا نوێژ بكـات، ئەگـەر تەمبـەڵی یـا سـستی و خاوبوونە ڕووی تێكرد، با دانیشێت)).

لە (الحُسَين)ی كوڕی (أحمد)ی كوڕی (عبدالرحمن الـصَّفَّار)ەوە دەڵێـت: (الـشِّبليُّ) لـە ڕۆژی جەژنێكدا چووە دەرێ، برژانگ و برۆی چاوەكانی تاشیبوو، بـە پێـچەرێك سـەری بەسـتبوو، دەیگوت:

للنَّاسِ فِطْرٌ وعِيدُ إِنِي فَرِيدٌ وَحِيدُ

واتە دەیگوت:

خەڵك نان دەخۆن و جەژن دەكەن منیش تاك و تەنهام.

لە (أَبِي الحَسَنِ عليٍّ) كوڕی (مُحمـد)ی كوڕی (أَبـي صـابرِ الـدَّلَّال)ەوە دەڵێـت: تەماشـای (الشِّبليُّ)م دەكرد لە گومەزی شاعیراندا لە مزگەوتی (المنصورِ)، خەڵكیشی لێ كۆ بوبویەوە، لاوێكی زۆر جوان كە لەو كاتەدا لە بەغدا كەسێكی دەم و چاو جوانی وەكو ئەو نەبوو، وە بـە (ابنِ مُسلمٍ) دەناسرا لە ئەڵقەكەوە تەماشای دەكرد، بە لاوەكەی گـوت: دوركـەوەرەوە. بـەڵام ئەو لانەچوو، بۆ دووەم جار پێی گوت: شەیتان لێمان دوركەوەرەوە. بەڵام لانەچوو. بۆ سێ یەم جار پێی گوت: دوركەورەوە ئەگینا هەرچی ئەو پۆشاكەت لە بەردایە دەیـدڕێنم، پۆشـاكێكی

---

٦٦٨ _ رواه البخاري (٣ / ٢٧٨) عن أنس بن مالك.

زۆر نایابی پۆشیبوو كه بای پارەیەكی زۆر بوو، ئـەوەبوو لاوەكـە ڕۆشـت، ئینجـا (الـشّبليُّ) گوتی:

طَرَحُوا اللَّحْمَ لِلْبُزاةِ    على ذِرْوَتَي عَــدَنْ
ثُمَّ لامــــوا البُزاةَ إذْ    خَلَعُوا مِنْهُمُ الرَّسَــنْ
لَوْ أَرادوا صَلاحَنــــا    سَتَروا وَجْهَكَ الحَسَن

واته:

گۆشتیان بۆ بازەكان فڕێدا    له سەر هەردوو كەنارەی دولێك
پاشان سەرزەنشتی بازەكانیان كرد    له كاتێكدا كه جڵەویان بۆ درێژ كردن
ئەگەر چاكێتی ئێمەیان دەوێ    ڕووە جوانەكەیان دادەپۆشیت

(ابنُ عقيلٍ) دەڵێت: هەركەس ئەم شتە بڵێت، ئەوا ڕێگەی شەرعی هەڵـەكردووە، چـونكە دەڵێت: خوای _ عزَّوجلَّ _ ئەم مرۆڤەی تەنها بۆ ئەوە دروست كـردووە كـە خـەڵك شـەیدای بێت، بەڵام بەو جۆرە نییە، بەڵكو خولْقاندویەتی تـەنها بـۆ پەنـدو ئامۆژگـاری وەرگـرتن و، تاقیكردنەوە، چونكە خۆر بۆ ئەوە خوڵقێنراوە ڕووناكی ببەخشێت، نەك بۆ ئەوەی بپەرسترێت.

له (أحمدَ)ی كوڕی (محمدِ النُّهَاوَنْدِيِّ)وە دەڵێت: كوڕەزایەكی (الشِّبليُّ) كه ناوی (علـي) بوو مرد، دایكیشی پرچی خۆی بۆ تاشی، (الشِّبليُّ)یش ڕیـشێكی گـەورەی هـەبوو، فەرمانیـدا هەمووی بۆ بتاشن، بۆیە پێی گوترا: مامۆستا ! چ وای لێكردی ئەم شتە بكـەیت ؟ ئـەویش گوتی: ئەم ژنە پرچی خۆی بۆ كەسێكی مردوو تاشیووە، ئەی باشە من بۆ ریشم بـۆ زاتێكـی مەوجود نەتاشم !

له (عبدِاللهِ)ی كـوڕی (علـيّ الـسَّرَّاج)ەوە دەڵێـت: جـاری وابـوو (الـشِّبليُّ) پۆشـاكی زۆر بەنرخی دەپۆشی، پاشان دایدەكەندو، بە سەر ئاگری دەخست !

هەروەها دەڵێت: دەگێڕنەوە جارێك پارچەیەك عەنبەری بردو، بـە سـەر ئـاگری خـست و، كلكی گوێدرێژەكەی پێ بۆندار دەكرد !

(السَّرَّاجُ) دەڵێت: دەگێڕنەوە (الشِّبليُّ) جارێك خانوبەرەیـەكی فرۆشـت و، پارەكـەی بـەش بەش كردەوەو، خاوخێزانی هەبوو، كەچی هیچ شتێكی نەدانێ، گوێبیستی كەسـێكیش بـوو

ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە: ﴿ اخْسَؤوا فيها ﴾﴿ المؤمنون: ١٠٨ ﴾ واتە (خوا) دەفەرموێ: بەڕیسوایی بمێننەوە لە دۆزەخدا(٦٦٩)، گوتی: خۆزگە من یەکێکیان بوایەم !

دەڵێم _ ابن الجوزي _: (الشِّبليُّ) وای زانیوە ئەوەی لە گەڵ خەڵکی دۆزەخدا دەدوێ، خودی خوای تعالایەو بەڕاستەوخۆ لە گەڵیاندا دەدوێ، بۆیە ئەو قسەی کرد، کەچی خوای تعالی بەڕاستەوخۆ لە گەڵیاندا نادوێ، پاشان ئەگەر لە گەڵیشیاندا بدوێ، گوفتارەکانی بۆ ڕیسواکردنە، کەوابوو ئەم شتە چی یە تا داوا بکرێت ؟

(السَّرَّاجُ) دەڵێت: (الشِّبليُّ) ڕۆژێك لە مەجلیسەکەیدا گوتی: خوای تعالی بەندەگەلێکی هەیە، ئەگەر تەف بەسەر دۆزەخدا بکەن دەیکوژێننەوە.

دەڵێم _ ابن الجوزي _: ئەم قسانەی (الشِّبليُّ) لە ڕەگەزی قسەکانی (أبي يزيدَ)ە کە پێشتر ئاماژەمان پێدا ، هەردوکیشیان لە یەك قاپەوە دەرچوونە.

لە (أبي عليّ الدَّقَّاقِ)ەوە دەڵێت: پێم گەشتووە کەوا (الشِّبليُّ) بە ئەوەندەو ئەوەندە خوێ چاوەکانی ڕەشتووە، بۆ ئەوەی لە سەر شەونخونی ڕابێ و نەنوێت.

نووسەر دەفەرمێت:

ئەمە کردارێکی ناشیرینە، بۆ موسڵمان حەڵاڵ نییە نەفسی خۆی ئازار بات، ئەوە هۆکارێکە بۆ کوێربوون، جایز نییە شەونخونی بە بەردەوامی ئەنجام بەیت، چونکە بەو کارە هەقی نەفسی خۆت دەفەوتێنیت، بەڵام وادیارە شەونخونی بەردەوام و کەم خواردن تووشی ئەو باروحاڵ و کردەوانەی کردووە.

دەڵێم _ ابن الجوزي _: (أبوحامدِ الغَزَاليُّ) دەگێڕێتەوە کەوا (الشِّبليُّ) جارێك پەنجا دیناری بردو، فڕێی دانە نێو دیجلەوەو، گوتی: هەرکەس خۆشویستووی، خوای تعالی سەر شۆڕی کردووە!

---

٦٦٩ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

من سەرم سورِ دەمێنی لـە (أبوحامـدٍ) زیـاتر لـە سەرسـوڕمانم لـە (الـشِّبليٌّ)، چـونکە (أبوحامدٍ) ئەو قسانە لـە ڕووی پیاهەڵـدان و ستایـشکردنەوە بـاس دەکـات نـەك لـە ڕووی نکۆڵیکردنەوە، باشە کاریگەری فیقهەکەت لە کوێیە؟

## * نەفامیە فیقهیەكانیان:

لە (حُسینِ)ی كوڕی (عبدِالله القَزْوِيني)وە دەڵێت: كەسانێك كە هاو مەجلیسی (بَنانَ)(٦٧٠) بوون بۆیان باسكردم كە گوتبووی: ڕۆژێك نەمتوانی ڕۆزی پەیدا كەم، زۆریش زەرور بووم، پارچە زێڕێكم بینی لە سەر ڕێگەكە فڕێ درابوو، ویستم بیبەم، بەڵام گوتم: (لُقَطَـةٌ)یە(٦٧١). بۆیە وازم لێهێنا، بەڵام ئەو فەرموودەیەم بیركەوتەوە كە دەیگێڕنەوە: ((لـو أنَّ الدُّنيا كانتْ دَماً عَبيطاً " لكانَ قوتُ المسلمِ منها حَلالاً))(٦٧٢) واتە گوایە پێغەمبەری خوا _ صلی الله علیه وسلم _ فەرموویەتی: ((ئەگەر دونیا خوێنێكی پوختی نەرمی پاراو بوایە، بەدڵنیایی بژێوی موسڵمانی لێ حەڵاڵ دەبوو)).

بۆیە بردم و، خستمە نێو دەمم و، زۆر ڕێم نەكرد، بە ئەڵقەیەكی منداڵان گەشتم، یەكێكیان قسەی بۆ دەكردن، یەكێكی تریش لێی پرسی: چ كاتێ بەندە هەقیقەتی ڕاستگۆیی دەست دەكەوێت ؟ گوتی: ئەگەر پارچەكەی لە دەمی فڕێدا. بۆیە منیش پارچەكەم لە دەمم دەرهێناو، فڕێمدا.

نووسەر دەفەرمێت:

فەقیهان هیچ جیاوازیەكیان لە نێواندا نییە كە فڕێدانی جایز نییە.

---

٦٧٠ _ بَنانَ: ئەم پیاوە ناوی (بَنانَ الحمَّال)ە، یەكێكە لەو كەسانەی كە بەزوهدو تەصوف دەناسرا ! (السُّلَمي) لة (طبقات الصوفيَّة)دا(ص٢٩١ _٢٩٤) ژیانامەكەی باسكردووە.

٦٧١ _ لُقَطَةٌ: ئەو شتانەیە كە لە خاوەنەكەی ون دەبێ، یاخود لێی بەجێ دەمێنێ، لە شوێنێكی وادا كە مولكی هیچ كەسێك نی یە، یاخود لە ڕێگەیەكدا، هەركەسێك بیدۆزێتەوە بۆی دروستە هەڵیگرێتەوەو، هەروەها بۆی دروستە وازی لێ بێنێت، بەڵام هەڵگرتنەوەی لە وازلێهێنانی باشترە ئەگەر باوەڕی بەخۆی هەبوو كە بە پێویستیەكانی هەڵدەستێ، ئەوەش چەندین حوكمی خۆی هەیە، بڕوانە: أبي الشجاع: متن الفتح القريب، وەرگێڕ.

٦٧٢ _ موضوع " كما في ((أحاديث القصاص)) (رقم ٧٩)، و ((تنزيه الشريعة)) (٢ / ١٩٩). تەماشاكە _ ڕەحمەتی خوات لێ بێت _ كردەوەی ناپەسەند دەكەن و، فەرموودەی (موضوع)ی بۆ دەكەنە بەڵگە !

سەرسوڕمانیش لەوەدایە کە بە قسەی منداڵێك فریێ داوە کە نازانێ چ دەڵێت !

(أَبوحامدِ الغَزَالـيُّ) دەگێڕێتەوە کـەوا (شـقيق البَلْخِـيُّ) چـووە دیـدەنی (أَبـي القاسِـمِ)ی زاهید، لە نێو پۆشاکەکەیدا شتێکی بەستبوو، پێی گوت: ئەمـە چـی یـە کـە بەلاتەوەیـە ؟ گوتی: چەند بادەمێکە برایەکم پێی دام و گوتی: حەزم بەوەیە لـە سـەر ئەمـە فتـار بکـەی. گوتی: ئەی (شقیق) تۆ باسی خۆت دەکەی و لـەو بـاوەڕەدای تـاوەکو شـەو بـژێی، کـەوابوو هەرگیز قسەت لە گەڵ ناکەم، ئەوەبوو دەرگاگەی بە ڕوومدا داخست و، چووە ژوورێ.

دەڵێم _ ابن الجوزي _: تەماشای ئەم فیقهە وردە بکەن، چۆن هەجری موسـڵمانێکی کـرد بە هۆی کردارێکی جائیزەوە، بەڵکو مەندوبەوە، چونکە مرۆڤ فەرمانی پێکـراوە کـە شـتێك ئامادە بکات بۆ ئەوەی فتاری لە سەر بکات، ئامادەکردنی شت پێش هاتنی کاتەکەی ڕێك و پێك بوونە لە بڕیارو کرداردا، خوای تعالی دەفەرمێت: ﴿ وأَعِدُّوا لَهُمْ مَا اسْتَطَعْتُمْ مِنْ قُـوَّةٍ ﴾ ﴿الأنفـال: ٦٠ ﴾ واتـە ﴿ وأَعِـدُّوا لَهُـمْ ﴾ (ئـەی ئیمانـداران) ئامـادەی بکـەن بۆیـان ﴿مَـا اسْتَطَعْتُمْ مِنْ قُوَّةٍ ﴾ ئەوەی لە تواناتاندا هەیە(٦٧٣). پێغەمبەری خـواش _ صـلى الله عليـه وسلم _ بژێوی ساڵێکی بۆ خێزانەکانی پاشەکەوت کردبوو(٦٧٤). پێشەوا (عُمَرُ)یش _ خـوای لێ ڕازی بێت _ نیوەی ماڵەکەی هێناو، پاشماوەکەشی پاشەکەوت کردو، کەسیش نکوڵیی لێ نەکرد.

بەڕاستی نەفامبوون بە زانست ئەو زاهیدانەی خراپ کرد.

لە (أَحمَدَ)ی کوڕی (إِسحاقَ العُمـانيِّ)وە دەڵێت: لە هند شێخێکم بینی، کـە بـە (الـصابرِ) واتە بەئارامگر ناو دەبرا، تەمەنی صەد ساڵی تێپەڕانـدبوو، کەچـی یـەك چـاوی نوقانـدبوو. منیش پێم گوت: ئەی ئارامگر ! بۆچی بەم جۆرە ئارام دەگری ؟ گـوتی: ئـارەزووی ڕازاوەیـی دونیام کردو، حەزم بەوە نەبوو لە تەماشاکردنی تێر بم، بۆیە هەشتا سـاڵە چـاوێکم نوقانـدو، نەمکردەوە !

---

٦٧٣ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

٦٧٤ _ رواه البخاري (٥٣٥٧)، ومسلم (١٧٥٧) " عن عُمر.

دەڵێم _ ابن الجوزي _: مەبەستی ئەوەبوو کە بەیەك چاو تەماشای دونیا بکات بۆ ئەوەی ڕازاوەیی دونیا سەرقاڵی نەکات و ڕۆژی دوای بیرچێتەوە، بۆیە داوای دروستی ئەقڵ و هـۆش لە خوای تعالی دەکەین.

(یوسُفُ)ی کوڕی (أَیُّوبَ الهَمْدانيُّ) لە شێخەکەی خۆیەوە (عبدِاللهِ الجَوْنيّ) دەگێڕێتەوە کـە گوتبووی: ئەم زاڵبوون و سەرکەوتنەم(٦٧٥) بەهۆی میحرابـەوە دەسـت نەکـەوت، بـەڵکو لـە شوێنی ئاودەستەکەوە !

بۆیە بەسەرهاتی خۆی دەگێڕێتەوەو، دەڵێت: لە ئاودەستدا کارم دەکرد، ڕۆژێك کە گـسکم دەداو پاکم دەکردەوە، نەفسم پێی گوتم: تەمەنی خۆتت لەمەدا بەسەر برد ! بۆیە بـە نەفـسی خۆمم گوت: تۆ گەشتوتە ئەو ئاستەی کە لووت بەرزی بەرامبەر بە خزمەتکردنی بەنـدەکانی خوای تعالی بنوێنی، بۆیە سەری بیرەکـەم کـردەوەو، خـۆمم تێخـست و، دەمـی خـۆمم لـە پیسایەکی پڕ دەکرد، ئەوانیش هاتن و، دەریان هێنام و، شتمیان !

دەڵێم _ ابن الجوزي _: تەماشای ئـەم هـەژارە بکـەن چـۆن وای زانیـوە کـە کۆبونـەوەی هاوەڵان بە دەوریدا زاڵ بوون و سەرکەوتنە، واشی زانیوە کە ئەو زاڵبوون و سەرکەوتنە تـەنها بە هۆی ئەوەوە بووە کە خۆی خستۆتە نێو پیسایەکەوەو، دەمی لە پیسایەکە پڕکـردووە، وای زانیو بەهۆی ڕەفتارەکەیەوە پلەو پایەیەکی بەرزی لە ڕەوشت و بەرزیدا پێدراوە، بەو هۆیشەوە بەهاوەڵی زۆر پاداشتی دراوەتەوە. کەچی ڕەفتارەکەی تەنها سەرپێچیەو، سزای بـۆ پێویـست دەکات.

بەگشتی، کاتێ ئەمانە زانستیان ون کرد، کردەوەی بێ سەرو بەرەیان زۆر بوو.

لـە (محمدِ)ی کـوڕی (علـيّ الكَتَّـانيِّ)وە دەڵێـت: (الحُـسینُ)ی کـوڕی (منـصورِ) سـەرتای دەستپێکردنی بوو کە هاتە مەککە، ئێمەش ماندوو بوین تـا پۆشـاکە (المُرَقَّعَـة)کـەمان لـێ

٦٧٥ _ مەبەستی ناوبانگیەتی بەلای هاوەڵانی خۆیەوە، کە ئـەو هاوەڵانـەی بـۆ لای خـۆی ڕانەکێـشاوە بەهۆی کۆششەکانی و میحرابی نوێژەکەیەوە، بەڵکو بەهۆی چیرۆکی ((ئاودەستەکەوە)) کە دەیگێڕێتەوە !!

سەند، ئسپێیەکمان تێدا دۆزیەوە، کێشامان نیو (دانقٍ) بوو، لە بەر زۆری خۆ ڕاهێنـانی و ! توندی تێکۆشانی بەرامبەر بە نەفسی خۆی !

دەڵێم _ ابن الجوزي _: تەماشای ئەم کەسە بکەن، کە چەندە نەفامە بـەو پاکێتیـەی کـە شەرع هانی خەڵکی بۆ داوە، تا ئەو ئاستەی شـەرع ڕێـی داوە بـەو کەسـەش کـە ئیحرامـی بەستووە (٦٧٦) سەری بتاشێ _ کە تاشینی لەو شوێنەدا قەدەغـە کـراوە _ ئەگـەر ئەسـپێ یاخود شتی دیکە ئازاری بـات، قەدەغەکردنەکەشـی بـە خێـر یـا قوربـانی یـا ڕۆژووکـردن چاکردۆتەوە، لەویش نەفامتر ئەو کەسەیە کە وادەزانێ بەردەوام بـوون لـە سـەر پیـسی، خـۆ ڕاهێنانە !!

---

٦٧٦ _ لەم بارەوە خوای تعالی دەفەرمێت: ﴿ فَمَنْ كَانَ مِـنْكُمْ مَرِيـضًا أَوْ بِـهِ أَذًى مِـنْ رَأْسِـهِ فَفِدْيَـةٌ مِـنْ صِيَامٍ أَوْ صَدَقَةٍ أَوْ نُسُكٍ ﴾﴿ البقرة: ١٩٦ ﴾ واتە ﴿ فَمَنْ كَانَ مِنْكُمْ مَرِيضًا ﴾ ئینجا هەر کامێك لە ئێـوە نەخۆش بوو ﴿ أَوْ بِهِ أَذًى مِنْ رَأْسِهِ ﴾ یان ئازارێك لە سەریدا هەبوو ﴿ فَفِدْيَةٌ مِنْ صِيَامٍ ﴾ (ئەگـەر سـەری تاشی) بریتی یەك بدات کە ڕۆژوو (ی سێ ڕۆژە) ﴿ أَوْ صَدَقَةٍ أَوْ نُـسُكٍ ﴾ یان خێرێك یان قوربانیەك بکات. مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

## ✸ شان و شەوكەتی خۆیان دەڕۆخێنن:

تاقمێك لە صوفیەكان خۆیان فرێدایە نێو تاوانەوەو، گوتیان: مەبەستمان ئەوەیە كە لە بەر چاوی خەڵك بكەوین، بەوەش لە شان و شەوكەت ڕزگارمان دەبێ، كەچی نەیانزانیوە شان‌و شەوكەتی خۆیان بەلای خوای تعالاوە نەهێشتووە، چونكە بەو ڕەفتارەیان سەرپێچی شەرعیان كردووە.

بۆیە دەیانبینی ناشیرینترین ڕفتارەكانی خۆیان ئەنجام دەدەن و، چاكترین كردەوەكانی خۆیان دەشارنەوە!

ئەوەی ئەنجامی دەدەن لە هەموو شتێك ناشیرینترە، ئەوە پێغەمبەری خوایە _ صلی الله علیه وسلم لە بارەی (ماعزٍ)ەوە كە لە گەڵ كەنیزەكێكی (هَـزّال)دا داوێن پیسی كردبوو، بە (هَزّال) دەفەرمێت:

((هَلَّا سَتَرْتَهُ بثوبِكَ يا هذا))(٦٧٧).

واتە ((دەی بریا بە پۆشاكەكی خۆت نهێنیەكەیت داپۆشیبا)).

كەسانێك لە هاوەڵان بەلای پێغەمبەری خوادا _ صلی الله علیه وسلم _ تێپەڕبوون لە كاتێكدا لە گەڵ (صفیَّةَ)ی خێزانیدا دەدوا، ئەوەبوو پێی گوتن:

((إِنَّها صَفِيَّةُ))(٦٧٨).

واتە فەرمووی: ((بەڕاستی ئەمە (صفیَّةَ)یە)).

---

٦٧٧ _ رواه أبوداود (٤٣٧٧)، وأحمد (٥ / ٢١٧)، والحاكم (٤ / ٣٦٣)، والبيهقي (٨ / ٣٣٠ _ ٣٣١)، والنسائي في (الكبرى)" كما في ((تحفة الأشراف)) (٩ / ٧٠)، والطبراني في ((الكبير)) (٢٢ / ٢٠١) " من طريقين عن هزّال:

ورواه مالك (٢ / ٨٢١) عن سعيد بن المسيّب بلاغاً، ومن طريقه النسائي في ((الكبرى)) أيضاً.

وهو حديث حسن.

٦٧٨ _ رواه البخاري (٤ / ٢٤٠)، ومسلم (٢١٧٥) عن صفية.

دڵنیابن خەڵکێکی زۆر ئامادەن خۆیان بەدور بگرن لەو شتانەی کە دەبێتە هۆی بەدگومان دروست کردن، چونکە بڕواداران شایتحاڵەکانی خوان لە سەر زەویدا.

(حُذَیْفَةُ) چووە دەرێ بۆ نوێژی هەینی، بەڵام فریای نەکەوت، تەماشای خەڵکی کرد وا دەگەڕێنەوە، ئەوەبوو خۆی شاردەوە، بۆ ئەوەی خەڵك گومانی خراپی پێ نەبەن.

پیاوێك بە هاوەڵێکی پێغەمبەری خوای _ صلی الله علیه وسلم _ گوت: مـن ئاوەهـا و ئاوەها تاوانم ئەنجام داوە، ئەویش پێی فەرموو: دڵنیابە خوای تعالی نهێنیەکەی داپۆشیووی، ئەگەر خودی خۆت نهێنیەکەی خۆت داپۆشی.

ئەمانە بەڕاستی سەرپێچی شەریعەتیان کردووەو، ویستویانە ئەو خووە سروشتیە لابەرن کە نەفسی مرۆڤی لە سەر دروستکراوە.

## * ئەو كەسانەی لە ئەهلی ئیباحە چوونەتە نێو صوفیەكانەوە:

كەسانێك لە ئەهلی ئیباحە تێكەڵ بە صوفیەكان بوون و، خۆیان بەوان چواند، بـۆ ئـەوەی خوێنی خۆیان بپارێزن، ئەمانە بۆ سێ بەش دابەش دەبن:

بەشی یەكەم: كافر، تاقمێكیان دان بەخوای _ سبحانه وتعالی _دا نانێن، كەسانێكیشیان دانی پێدا دەنـێن، بـەڵام نكـۆڵیی لـە پێغەمبەرایـەتی دەكـەن، واتێگەشـتوون ئـەوەی كـە پێغەمبەران هێناویانە مەحاڵە.

ئەم كەسانە كاتێ ویستیان نەفسی خۆیان لە ئارەزوواتـدا تێـر بكـەن، هـیچ كۆمـەڵێكی دیكەیان بەدینەكرد بۆ ئەوەی خوێنی خۆیان لە نێواندا بپارێزن، خۆیان لە نێوانـدا بـشارنەوە، مەبەستەكانی نەفسیان دەسـتكەوێت وەكـو ڕێبـاوەڕی تەصـوف، بۆیـە بـە ئاشـكرا چـوونە ڕیزیانەوە، بەڵام لە ناخەوە كافر بوون، ئەم كەسانە جگە لە شمشێر هیچی تریان بۆ باش نییە، نەفرەتی خوایان لێ بێت.

بەشی دووەم: تاقمێكن دان بە ئیسلامدا دەنـێن، بـەڵام تـەنها چـاولێكاری شـێخەكانیان دەكەن، بەبێ شـوێنكەوتنی بەڵگەیـەك و، بـەو هاوشـێوانە، ئـەوان فـەرمانی شـێخەكانیان جێبەجێ دەكەن، یاخود لەكردەوەكاندا لاسایی ئەوان دەكەنەوە.

بەشی سێ یەم: تاقمێكن تووشی چەند گومانێك (شُبُهات) بوون و، بە پێی ئەو گومانانـە ڕفتاریان كرد(٦٧٩).

ئەو بنەڕەتەی كە گومانەكانی بۆ دروستكردن، ئەوەبوو كە دەستیانكرد بە تەماشـاكردنی ڕێباوەڕەكانی خەڵك، ئیبلیسیش سەری لێ شـێواندن و، وای بەخەیاڵـدا هێنـان كـە بەڵگـەو

---

٦٧٩ _ پێویستە ئەو بەندەیەی كە خوای تعالی ڕێنوێنی كردووە بۆ ناسینی هەق بـە بەڵگـەو، ڕاسـتی و دروستی بە سەلماندن، چیتر لە كەسانی گومان دروستكارو، وشە ڕازاوەكانیان و، دەسـتەواژە شـیرینەكانیان ئاوڕ نەداتەوە !! ((چونكە دڵ لاوازەو، گومانیش ڕفێنەرە))!

سەلماندنەکان ناتوانن وەلامی گومان و شـوبهەکان بەنـەوەو، جیاکردنـەوەی هـەق و راسـتیش ئاستەم و قورسە، مەقصودو مەبەستیش زۆر لەوە بەرێزترە کـە بەزانـست دەسـت بکـەوێت، دەستکەوتنیشی تەنها ڕۆزیەکەو بە بەندە دەدرێ، نەك بە فێربوون و داواکردنی زانـست، بـەم قسانە ئیبلیس دەروازەی ڕزگاربوونی لێ داخستن کە فێربوونی زانستە، بۆیە ڕقیـان لـە نـاوی زانست دەبویەوە، وەکو چۆن (الرافضيُّ) ڕقی لە ناوی پێشەوایان (أبوبکرٍ) و (عُمَر) دەبێتەوە، وە دەڵێن: زانست پەردەیە، ئەو پەردەیەیە کە ناهێڵێت زانایان بە مەقصودو مەبەست بگەن.

ئەگەر زانایەك نکۆڵیان لێ بکات، بە شوێنکەوتوانیان دەڵـێن: ئـەم پیـاوە لـە ناوەڕۆکـدا (الباطن) لە گەڵ ئێمەدا سازیارو هاو ڕایە، بەڵام بۆ خەڵکانی ئاسایی ئـەقڵ لاواز دژی ئـەوە بەدەردەخات کە ئێمە باوەڕمان پێیەتی.

وە ئەگەر زاناکە بە گرنگی زیاترەوە لە دژیان کردار بکات، دەڵـێن: ئەمـە گەمژەیـەو بـە کۆتی شەریعەت پێوەند کراوە، ئەو ڕووپۆشراوەو، ناتوانیت بە مەقصودو مەبەست بگات.

پاشان بە پێی گومانگەلێك ڕەفتاریان کرد کە بۆیان دروسـت بـوو، ئەگـەر تێگەشـتنایە، بەدڵنیایی دەیانزانی کە کاتێ بە پێی پێویستی گومانەکانی خۆیان ڕەفتـار دەکـەن، ئـەوەش دیسان زانستە، بۆیە نکۆڵیی کردنیان لە زانست پووچ بویەوە.

من _ ابن الجوزي _: گومانـەکانیان بـاس دەکـەم و، ئاشـکرایان دەکـەم _ إن شـاءَ اللهُ تعالیٰ_:

_ سەبارەت بە قەزاو قەدەر:

گومانی یەکەم: ئەوان گوتویانە: ئەگەر شتەکان لە کۆنەوە موقەدەر کرابێ و، کۆمـەڵانێك بۆ کامەرانی تایبەت کرابن و، کۆمەڵانێکیش بۆ بەدبەختی تایبەتکرابن، وە کەسی کامـەران بەدبـەختی نـەبینێ و، کەسـی بەدبـەختیش کامــەرانی نـەبینێ، وە خـودی کردەوەکـانیش ناویستریت، بـەڵکو ئـەو کردەوانـە تـەنها بـۆ بەدەسـتهێنانی کـامرانی و، دوورخـستنەوەی بەدبەختیەکەیە، بوونی کردەوەکانیش پێشمان کەوتووە، بۆیە پێوست بەوە ناکـات نـەفس لـە

كاروكردەوەدا ماندوو بكرێت، یاخود له ئارەزووات دوربخرێتەوە، چونكه ئەوەی وەكـو قـەدەرو چارەنوس نوسرابێ، ئەوا بەدڵنیاییی هەر وادەبێ.

بۆ وەڵامدانەوەی ئەم گومانە دەڵێین: ئەمـە دەسـت پێوەنـانی هـەموو شـەریعەتەكان و، پووچـكردنەوەی تێكـڕای حـوكمی كتێبـەكان و، سەرزەنـشتكردنێكه بـۆ هـەر هـەموو ئـەو پێغەمبەرانەش كه شەریعەتیان بۆ دابەزیووە، چونكه كه خوای تعالی دەفـەرمێت: ﴿ أَقِيْمـوا الصَّلاَةَ ﴾ ﴿ الأنعام: ٧٢ ﴾ واته بەرپێكی نوێژ بەجیٚ بێنن(٦٨٠)، كەسی وایان تێدایـە دەڵێـت: بۆچی نوێژ بكەم ؟ ئەگەر له ئەهلی كامەرانی بم، له ئەنجامدا هەر كامەران دەبم ! ئەگـەر لـە ئەهلی بەدبەختیش بم، له ئەنجامدا هەر بەدبەخت دەبم، كەوابوو بـەرپێكی نوێـژ ئەنجامـدان چ سوودێكی بۆ من دەبێ ؟

هەروەها كه خوای تعـالی دەفـەرمێت: ﴿ ولا تَقْرَبـوا الزِّنـی ﴾﴿ الإسـراء: ٣٢ ﴾ واتـە وە نزیكی زیناش مەكەونەوە(٦٨١)، دەڵێت: بۆچی ئارەزووات و ڕابواردن له نەفسی خۆم قەدەغـە بكەم، له كاتێكدا كامەرانی و بەدبەختی نوسراوەو، تەواو بووە ؟

بۆ فیرعەونیش هەبوو هەمان ئەو قسانه بە (موسـی) پێغەمبـەر بڵێـت، كـاتێ (موسـی) پێغەمبەر پێی فەرموو: ﴿ هَلْ لَكَ إِلی أَنْ تَزَكَّی ﴾﴿ النازعـات: ١٨ ﴾ واته وە ئایـا دەتـەوێ پاك ببیتەوە له (گوناه)(٦٨٢).

پاشان سەرزەنشتەكانی هەنگاو دەنێت و خوای خولقێنـەریش دەگرێتـەوەو، پێـی دەڵێـت: سوودی ناردنی پێغەمبەران لەلایەن تۆوە چی یە، له كاتێكدا ئەوە ڕوودەدات كه تۆ تەقدیرت كردوەو نوسیوتە ؟

بەڵام دڵنیابە هەر شتێك ببێتە هۆی ڕەتكردنەوەی كتێب و بـە نـەفامزانینی پێغەمبـەران مەحاڵ و پووچە، بۆیە كاتێ هاوەڵان بە پێغەمبەری خوا _ صلی الله علیه وسلم _ فـەرموو:

---

٦٨٠ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

٦٨١ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

٦٨٢ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

((أَلا نَتَّكِلَ ؟)) واتە ئایا دەكرێت پشت ببەستین بەوەی كە بۆمـان نووسـراوەو، واز لـە كـارو كردەوە بێنین ؟ ئەویش پێی فەرموون:

((اعْمَلوا، فكُلٌّ مُيَسَّرٌ لما خُلِقَ لهُ))(٦٨٣) واتە ((كاروكردەوە بكەن، هەموو كەسێك خـوای تعالی هۆكاری بۆ ئاسان كردووە كە بەرەو ئەوە بڕوات كە بۆی خوڵقێنراوە)).

وە بزانە ئادەمی كارو كردەوەو كەسب و دەسـتكەوتی چـاك و خراپـی هەیـە كـە خـۆی هەڵیدەبژێرێت، لە سەر ئەوە پاداشت و سزای دەدرێتەوە، ئەگەر سەرپێچی كرد، بۆمـان ڕوون دەبێتەوە كە خوای _ عزَّوجلَّ _ پێشتر قەزای كردووەو نووسیویەتی كە ئەو كەسە سەرپێچیی بكات، بەڵام لە هەمان كاتدا ئەقڵی پێداوەو دەتوانێ خراپـەو سەرپێـچی نـەكات، بۆیـە لـە ئەنجامدا كە سزای دەدات، ئەو سزادانە لەبەر ئەوەیە كە ئەو كەسە هەسـتاوە بـە سەرپێـچی كردن، نەك لە سەر ئەوەی كە زاتی خۆی شتەكەی قـەزا كـردووەو نوسـیویەتی، بۆیـە بكـوژ دەكوژرێت و، كاتێ لەم بارەوە باسی قەزاو قەدەریش دەكات، بەهانەكەی وەرناگیرێت.

لە ڕاستیدا پێغەمبەری خوا _ صلی الله علیـه وسـلم _ لـە تەماشـاكردنی قـەدەر وازی پێهێنان، بۆ ئەوەی كارو كردەوە بكەن، چونكە فەرمانكردن و قەدەغەكردنەكانی خوای تعالی شتێكی ئاشكرایەو، پێویستە مرۆڤ هەردوكیان بەجێ بێنێ، ئـەوەش كـە خـوای تعـالی لـەو بارەوە تەقدیری كردوەو نوسیویەتی شتێكی نهێنی و نەزانراوە، بۆیە بـۆ ئێمـە نییـە واز لـەو تەكلیف و سەپاندنە شەرعیانە بێنین، كە دەیانزانین، لە بەر قەزاو قەدەر كـە نهێنیـەو بـەلای ئێمەوە نەزانراوە.

فەرمایشتی پێغەمبەری خوا _ صلی الله علیه وسـلم _: ((فكُـلٌّ مُيَـسَّرٌ لمـا خُلِـقَ لـهُ)): ئاماژەیەكە بۆ هۆیەكانی دەستكەوتنی ئەوەی كە خوای تعالی تەقدیری كـردووە، بـۆ نموونـە ئەگەر خوای تعالی زانستی بۆ كەسێك تەقدیر كردبێ، ئەوا ڕێگەی فێربوون و خۆشەویستی و تێگەشتنیشی بۆ ئاسان دەكات، وە ئەگەر نەفامیشی بۆ كەسێكی دیكە تەقدیر كردبێ، ئـەوا خۆشویستنی زانستی لە دڵ دەردەهێنێ، هەروەها ئەگەر خوای تعـالی بـۆ كەسـێك تقـدیری

---

٦٨٣ _ رواه البخاري (٧ / ٥٤٤)، ومسلم (٢٦٤٧) " عن علي بن أبي طالب.

كوڕێكی كردبێ ئەوا هاوسەرگیری بۆ ئاسان دەكات، وە ئەگەر بۆ كەسێك تقدیری كوڕی نەكردبێ ئەوا هاوسەرگیری بۆ ئاسان ناكات.

_ سەبارەت بە نەفامبونیان بە خوای تعالی:

گومانی دووەم: ئەوان دەڵێن: بەڕاستی خوای _ عزَّوجلَّ _ پێویستی بە كاروكردەوەی ئێمە نییەو، موتەئەسیرو كارتێكراو نابێ بە كردەوەكانمان، سەرپێچی بێت یاخود گوێڕایەڵیی، بۆیە پێویست ناكات نەفسی خۆمان بەبێ سوود ماندوو بكەین.

پێویستە سەرەتا وەڵامی ئەم گومانە بهێنەوە بەهاوشێوەی وەڵامدانەوەی گومانی یەكەمو، دەڵێین: ئەمە ڕەتكردنەوەی شەرعە سەبارەت بەو شتانەی كە فەرمانی پێكردوین، وەكو ئەوەیە كە بە پێغەمبەرو خوای تعالی بڵێین: هیچ سوودێك لەوەدا نییە كە فەرمانتان پێكردوین.

پاشان سەبارەت بەم گومانە دەدوێین و، دەڵێین: هەركەسێك وایزانیوە كە خوای _ جلَّ وعلا_ سوود لە گویرایەڵی و پەرستنێك دەبینێ، یاخود بەهۆی سەرپێچیەكەوە زیانی پێ دەگات، یاخود شتێكی دەست دەكەوێت(٦٨٤) ئەوا خوای تعالای نەناسیوە، چونكە خوای

---

٦٨٤ _ ومن ذلك قوله _ صلى الله عليه وسلم _ فيما يرويه عن ربِّه _ سبحانه وتعالى _: ((يَا عِبَادِي: إِنَّكُمْ لَنْ تَبْلُغُوا ضَرِّي، فَتَضُرُّونِي، وَلَنْ تَبْلُغُوا نَفْعِي ، فَتَنْفَعُونِي ، يَا عِبَادِي: لَوْ أَنَّ أَوَّلَكُمْ وَآخِرَكُمْ ، وَإِنْسَكُمْ وَجِنَّكُمْ ، كَانُوا عَلَى أَتْقَى قَلْبِ رَجُلٍ وَاحِدٍ مِنْكُمْ ، مَا زَادَ ذَلِكَ فِي مُلْكِي شَيْئًا ، يَا عِبَادِي: لَوْ أَنَّ أَوَّلَكُمْ وَآخِرَكُمْ ، وَإِنْسَكُمْ وَجِنَّكُمْ ، كَانُوا عَلَى أَفْجَرِ قَلْبِ رَجُلٍ وَاحِدٍ ، مَا نَقَصَ ذَلِكَ مِنْ مُلْكِي شَيْئًا)). رواه مسلم (٢٥٧٧) عن أبي ذرّ. واته ((ئەی بەندەكانم: ئێوە بەڕاستی ناتوانن بگەنە ئاستی زیان پێگەیاندنم، تا زیانم پێگەیەنن، وە ناتوانن بگەنە ئاستی سوود پێ بەخشینم، تا سووم پێ ببەخشن، ئەی بەندەكانم: ئەگەر سەرتاو كۆتاتان، مرۆڤ و جنۆكەتان، دڵیان وەكو دڵی لە خواترسترین كەستان بێت، هیچ لە مولكی من زیاد ناكات، ئەی بەندەكانم: ئەگەر سەرتاو كۆتاتان، مرۆڤ و جنۆكەتان، دڵیان وەكو دڵی خراپترین كەستان بێت، هیچ لە مولكی من كەم ناكات)).

وانظر ما علَّقته على هذا الحديث في تحقيقي لـ ((نصيحة الملك الأشرف)) (ق ١٣) للضياء المقدسي، طبع في دار الهجرة، الدَّمام.

تعالى پاك وبيگەو له هەموو عەرەزو غەرەز، سوود وەرگرتن و زيانێكەوە بەدورە، لە ڕاستيدا سوودی كارو كردەوە تەنها بۆ نەفسی خۆمان دەگەڕێتەوە، وەكو ئەوەی خوای _ عزَّوجلَّ _ دەفەرمێت: ﴿ ومَنْ جاهَدَ فإِنَّما يُجاهِدُ لنَفْسِهِ ﴾ العنكبوت: ٦ ﴾ واتە وە هەركەس جيهاد بكاو تێ بكۆشێ ئەوە تەنها بۆ خۆی تێ دەكۆشێ(٦٨٥)، هەروەها دەفەرمێت: ﴿ وَمَنْ تَزَكَّى فإِنَّما يَتَزَكَّى لنَفْسِهِ ﴾ فاطر: ١٨ ﴾ واتە وە هەركەس خۆی پاك ڕاگرێ (لە تاوان) ئەوە بەڕاستی (سوودی) خۆپاك ڕاگرتنەكەی هەر بۆ خۆيەتی(٦٨٦)، لە ڕاستيدا كاتێ پزيشك فەرمانی خۆپارێزی بە نەخۆش دەدات، لە بەر بەرژەوەندی نەخۆشەكەيە، نەك بۆ بەرژەوەندی تايبەتی خۆی، بزانە كە وەكو چۆن جەستە جۆرەها بەرژەوەندی و زيان لە خۆراك وەردەگرێ، بەهەمان شێوە نەفسيش جۆرەها بەرژەوەندی و نەفامی بەرامبەر بە زانست هەيە، هەروەها بۆ بيروباوەڕو كارو كردەوەش، بۆيە دانەری شەرع وەكو پزيشك وايە خۆی زاناترە بەو بەرژەوەنديانەی فەرمانی پێ دەكات.

_ سەبارەت بە فراوانيی ڕەحمەت و بەزەيی خوای تعالی:

گومانی سێ يەم: بەڕاستی فراوانيی ڕەحمەت و بەزەيی خوای تعالی جێگير بوە، ئێمەش لەو ڕەحمەت و بەزەييە بێ بەش نابين، بۆيە هيچ ڕێگرێك بەديناكرێت بۆ ئەوەی نەفسی خۆمان لە ئارەزووات بێبەش بكەين.

وەڵامی ئەمە وەكو وەڵامی يەكەمە، چونكە بە پێی ئەم قسەيە بێ، دەبێ هەستين بە دورخستنەوەی هەموو ئەو هەڕەشانەی كە پێغەمبەران هێناويانە، وە بەسووك دانانی ئەوەی كە بەتوندی لەو بارەوە وريايان كردوينەتەوەو، باسی توندی سزاكانيان بۆ كردوين.

ئەوەی كە سەرلێشێواندنەكانی ئيبليس لەم بارەوە ئاشكرا دەكات ئەوەيە كە خوای _عزَّوجلَّ _ وەكو چۆن نەفسی خۆی بە ڕەحم و بەزەيی وەسف كردووە، هەر ئاوەهاش نەفسی

٦٨٥ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسيری قورئان.

٦٨٦ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسيری قورئان.

خۆی به سزادەری توند وەسـف کـردووە، ئێمـە زۆر بـە ئاشـکرا تەماشـا دەکـەین، وەلـی و پێغەمبەران بە نەخۆشی و برسێتی تاقی دەکرێنەوەو، لە سەر هەڵەو تـاوان و زەللەکانیـشیان سزا دەدرێن.

چۆن خۆمان دڵنیاکەینەوە لە کاتێکدا ئەو کەسانەی کە ڕزگاربونیان یەکلاکراوەتەوە، لێـی دەترسێن، ئەوە (إبراهيم الخليـل)ە لە ڕۆژی قیامەتدا دەفەرمێت: تەنها نەفـسی خـۆم، تـەنها نەفسی خۆم، (موسى كليم الله)ش دەفەرمێت: تەنها نەفسی خۆم، تەنها نەفسی خۆم(٦٨٧).

ئەوەش پێشەوا (عُمَرُ)ە _ خوای لیّ ڕازی بێت _ دەفەرمێت: وەیل بۆ (عُمَرُ) ئەگەر لێـی نەبوردرێت.

بزانە ئەو کەسەی ئومێـدەواری ڕەحمـەت و بـەزەیی خـوای تعالايـە، دەبـیّ هۆکارەکـانی جێبەجیّ بکات، بۆنموونە ئەو کەسەی دەیەویّ خوای تعالی بـەزەیی پێـدا بێتـەوە، دەبـیّ لـە هەڵەو تاوان زەللەکانی تەوبە بکات، بەهاوشێوەی ئەو کەسەی کە ئومێدەوارە خەلەودانەکەی دروێنە بکات، دەبیّ هۆکارەکانی دروێنەکردنی پێشتر ئامادە کردبیّ، تەماشاکە خوای تعـالی دەفەرمێت: ﴿إِنَّ الَّذِينَ آمَنُواْ وَالَّذِينَ هَاجَرُواْ وَجَاهَدُواْ فِـي سَـبِيلِ اللّـهِ أُوْلَـئِكَ يَرْجُـونَ رَحْمَـتَ اللّهِ﴾ ﴿البقرة: ٢١٨﴾ واتـە ﴿إِنَّ الَّـذِينَ آمَنُـواْ﴾ بەڕاسـتی ئەوانـەی بڕوایـان هێنـا ﴿وَالَّـذِينَ هَاجَرُواْ﴾ و ئەوانەی کۆچیان کـرد ﴿وَجَاهَـدُواْ فِـي سَـبِيلِ اللّـهِ﴾ و تێکۆشـان لـە ڕێـی خـوادا ﴿أُوْلَـئِكَ يَرْجُونَ رَحْمَتَ اللّهِ﴾ ئا ئەوانە چاوەڕوانی میهرەبانی خودان(٦٨٨)، واتە خـوای تعـالی فەرموویەتی ئەو کەسانەی ئەو کارو کردەوەیەیان بەجێهێناوە، بەڕاستی شایستەن چـاوەڕوانی ڕەحمەت و بەزەیی و میهرەبانی پەروەردگاریان بـن، بـەڵام ئـەو کەسـانەی سـوورن لـە سـەر

---

٦٨٧ _ وذلك في حديث الشفاعة الطويـل الـذي رواه البخـاري (٦ / ٢٦٤)، ومـسلم (١٩٤) " عـن أبـي هريرة.

٦٨٨ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

تـاوانكردن(٦٨٩)، وه لـه هـهمان كاتيـشدا ئومێـدهواری ڕهحمـهت و بـهزهیی خـوان، ئـهوا ئومێدبردنیان له وهڵامدانهوهوه دوره. (معروفُ الكَرْخِيُّ) دهڵێت: كه به ئومێـدی ڕهحمـهت و بهزهیی زاتێكیت و، له ههمان كاتدا گوێڕایهڵیی نابی، بهڕاستی سهرشۆڕی و گێلیه.

نهفامبونیان به ویستی شهرع:

گومانی چوارهم: تاقمێكیان وایان بهدیكرد، كه ویستی شهرع تهنها ڕاهێنانی نهفسهكانه، بۆ ئهوهی له خهڵته و خهوشه بێ سوودو كهڵكهكان ڕزگاری بێت، بۆ ئهوهی لـه كـاروكردهوهی خراپ دوركهوێتهوه، بۆیه كه ماوهیهك ڕاهێنانیان بهنهفسی خۆیان كرد، تهماشایان كرد پـاك بونهوه قورسه، ئهوهبوو گوتیان: ئهوهبۆ نهفسی خۆمان له شتێكدا ماندوو دهكهین كه بۆ هیچ ئادهمیزادێك بهدی نایهت ؟! بۆیه له كارو كردهوهی چاك و خۆڕاهێنان وازیان هێنا.

ئـهم سهرلێـشێواندنه بـهوه ئاشـكرا دهبـێ، كـه ئـهوان وایـان زانیـوه ویـستی شـهرع سـهركوتكردنی سـیفاته ئادهمیزادیـهكانی ناوهكیـه، وهكـو سـهركوتكردنی ئـارهزووات و، تووڕهبوون، هتد.

كهچی ئهمه ویستی سهرهكی شهرع نییـه، واش بـه خهیاڵـدا نایـهت ئـهوهی لـه خـووی سروشتی مرڤدا چهسپاوه، به خۆڕاهێنان لابردرێت، لـه ڕاسـتیدا ئـارهزوواتیش بـۆ سـوودێك خولقێنراوه، چونكه ئهگهر ئارهزووكردنی خواردن نهبوایه، مـرۆڤ دهفـهوتا، ئهگـهر ئـارهزووی هاوسهرگیری نهبوایه، وهچهو نهوه خستنهوه دهبڕدرا، ئهگـهر تووڕهبـوون نهبوایـه، مـرۆڤ لـه توانایدا نهبوو ئهو شـتانه لـه خـودی خـۆی دورخاتـهوه كـه زیـانی پێدهگهیـهنن، هـهروهها

---

٦٨٩ _ ومنه قوله _ صلى الله عليه وسلم _:

((ويلٌ للمصرِّين على ما فعلوا وهم يعلمـون))، واته ((ویل بۆ سووربوان له سـهر تـاوانكردن لـه كاتێكـدا دهزانن ئهوهی ئهنجامی دهدهن سهرپێچیه و داوای لێبوردن ناكهن)).

رواه البخاري في ((الأدب المفرد)) (رقم ٣٨٠)، وأحمد (٦٥٤١)، والخطيب في ((تاريخه)) (٨ / ٢٦٥)، وعبد بن حُميد في ((المنتخب)) (١ / ٢٨٧)، والفسوي في ((تاريخه)) (٢ / ٥٢٢) " عن عبدالله بن عَمْرو. وسنده صحيحٌ.

خۆشویستنی ماڵ و سامان لە خووی سروشتی ئادەمیزادا چەسپێنراوە، چونکە هۆکاری دەستکەوتنی ئارەزووەکانێتی.

لە ڕاستیدا مەبەست لە خۆڕاهێنان، تەنها خۆگرتنەوەی نەفسە لەوەی کە زیانی پێدەگەینێ لە هەر هەموو شتێك و، گەڕانەوەیەتی بۆ ئەوەی ئەو شتانە بە شێوازێکی نێوەندو ڕێك و پێك بەکار بێنێت.

خوای تعالی بەو کەسانەدا هەڵ دەدات کە بەرگری لە نەفسی خۆیان دەکەن بەرامبەر بە ئارەزوواتی خراپە، لە راستیدا مرۆڤ بەری نەفسی خۆی دەگرێ لەوەی کە داوای دەکات، چونکە ئەگەر داواکردنی ئارەزوواتی خراپە لە خووی سروشتیدا نەبوایە، چیتر مرۆڤ پێویستی بەوە نەدەبوو کە بەرگری لە نەفسی خۆی بکات.

خوای تعالی دەفەرمێت: ﴿ والكاظِمين الغَيْظَ ﴾﴿ آل عمران: ١٣٤ ﴾ واتە ئەوانەی ڕقی بەتینی خۆیان دەخۆنەوە(٦٩٠)، لێرەدا تەماشا دەکەین خوای تعالی فەرموویەتی: ئەوانەی ڕقی خۆیان دەخۆنەوە، بەڵام نەیفەرمووە: ئەوانەی ڕقیان نییە، چونکە ئاشکرایە ئادەمیزاد لە سروشتیدا ڕق هەیە، ئەگەر لە بنەڕەتەوە نەیبوایە دەیفەرموو: ئەوانەی ڕقیان نییە، وشەی (الكَظْمُ): واتە خواردنەوەی ڕق و قین. لە زمانی عەرەبیدا دەگوترێت: (كَظَمَ البعيرُ على جِرَّتِهِ) واتە وشترەکە خۆراکەکەی لە گەدەی دەرهێنایەوەو کاوێژی کردو سەر لە نوێ گەڕاندیەوە.

لێرەدا خوای تعالی بەو کەسانەدا هەڵدەدا، کە نەفسی خۆیان لە کاروکردەوەی نابەجێ دەگەڕێننەوە، کاتێ ڕق و قینیان هەڵدەچێ.

هەرکەسێك بانگەشەی ئەوە بکات کە خۆ ڕاهێنان خووە سروشتیەکان دەگۆڕێت، دڵنیابن بۆ شتێکی مەحاڵ بانگەشە دەکات. چونکە لە ڕاستیدا مەبەست بە خۆ ڕاهێنان تەنها کەمکردنەوەی توندی و زۆر چالاکبوونی شەهوەت و ئارەزوواتی نەفس و تووڕەبوونە، نەك لادانی لە بنەڕەتەوە.

---

٦٩٠ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

کەسی خۆ ڕاهێنەر وەکو پزیشکی ئاقڵە، لە کاتی ئامادەبوونی خۆراکدا ئەوە دەخوات کە سوودی بۆ هەبێ و، وازدەهێنێ لەوەی کە زیانی پێدەگەیەنێت، بەڵام ئەو کەسەی خۆی ڕانەهێناوە وەکو منداڵێکی نەفامە، هەموو ئەو شتانە دەخوات کە حەزی لێیەتی و، گوێ بەوە نادات چ کۆکردۆتەوە.

_ گومڕابونیان لە (الوُصُولِ) واتە گەشتندا:

طومانی ئێنجتم: تاقمێك لە خۆ ڕاهێناندا زێدەڕۆیان نواند، بۆیە شتانێکیان بەدیکرد لە جۆرە کەراماتێك، یاخود خەونگەلێکی چاك دەچوو، یاخود وشەگەلێکی جوانیان بۆ دەهات کە بەروبومی بیرکردنەوەو خەڵەوت بوون، بۆیە واتێگەشتن کە بە مەقصودو مەبەست گەشتوون، دەڵێن: ((بەدڵنیایی گەشتین، بۆیە چیتر هیچ شتێك زیانمان پێ ناگەیەنێت، چونکە ئەو کەسەی بە کەعبە بگات، لە ڕێکردن دەوەستێت)) ! بۆیە لە کارو کردەوە وازیان هێنا، بەڵام لە هەمان کاتدا ڕوخساری دەرەوەیان بە پۆشاکی (المُرَقَّعَةِ)و، بەرماڵ و، سەماکردن و، سۆز دەڕازانەوەو، بە دەستەواژە تایبەتەکانی تەصوف لە بوارەکانی زانست و زانیاری و، سۆزو، ئارەزوو بۆ کردندا (الشَوق) دەدوان، بۆ ئەوەی گومانی خراپیان پێ نەبردرێت.

(ابنُ عقيلٍ) دەڵێت: بزانە کە خەڵك لە گوێڕایەڵی پەروەردگار چونەتە دەرەوەو، لە بارودۆخی شەرع دوورکەوتونەتەوە بۆ پیادەکردنی بارودۆخە داهێنراوەکانی خۆیان:

کەسی وایان تێدا بوو کەسێکی تری جگە لە خۆی دەپەرست، چونکە زۆر بە گەورەی دادەنا کاتێ تەماشای دەکرد کە خواپەرستیە جۆراوجۆرەکان ئەنجام دەدات، پاشان وای ڕادەگەیاند کە ئەو بەگەورەدانانە وەسیلەیەکە بۆ نزیك بوونەوە لە خوای پەروەردگار.

کەسی واشیان تێدا بوو دانی بە یەکتایی خوادا دەنا، بەڵام پەرستنەکانی ئەنجام نەدەداو، دەیگوت: ئەم پەرستانە شتانێکە بۆ خەڵکانی ئاسایی دانراوە، چونکە هیچ زانست و زانیاریەکیان نییە!

ئا ئەمە جۆرێکە لە شیرك، چونکە خوای _ عزَّوجلَّ _ زانیویەتی ناسینی زاتی خۆی قوڵایەکی دورەو جەوێکی زۆر بەرزە، دووریشە کەسێك کە ترسی ئاگر نەزانێ خۆی لێ بەدور

بگرێت، چونکه خەڵك ئەندازەی سووتاندنەکەی دەزانن، خوای تعالی دەفەرمێت: ﴿ لَنْ يَنالَ اللهَ لحومُها ولا دِماؤها ﴾﴿ الحج: ٣٧ ﴾ واتە ﴿ لَنْ يَنالَ اللهَ ﴾ هەرگیز ناگات بەخوا ﴿لحومُها ولا دِماؤها ﴾ نەگۆشتی ئەو (قوربانی)انەو نەخوێنیان(٦٩١) " بە گوێرەی ئەم ئایەتە ڕوون دەبێتەوە کە خوای تعالی تەنها بە پێی نێت و مەبەست کردەوەکان وەردەگرێت، وە تەنها ناسینی خوای تعالی بەبێ گوێڕایەڵیی و پابەندبوون بەس نییە، وەکو ئەوەی کە کۆمەڵی (باطنية) بێباوەڕەکان و، صوفیەکان پشتی پێ دەبەستن.

لە (أبوعليّ الرُّذْباريُّ)یان پرسی _ وەکو پێشتر ئاماژەی پێدرا _ سەبارەت بەو کەسەی کە دەڵێت: گەشتوومەتە پلەیەك کە جیاوازی باروحاڵ کارم تێناکات !! ئەویش گوتی: دڵنیابن گەشتووە، بەڵام بە سەقەرە گەشتووە(٦٩٢) !!

---

٦٩١ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

٦٩٢ _ نموونەی ئەم کەسە ((واصل))ە واتە گەشتووە، لە زەمەنی خۆماندا زۆرن، بۆیە تەماشا دەکەی بانگەشەی ((الولاية))(!) دەکەن لە کاتێکدا کە نوێژ ناکەن ! بە بانگەشەی ئەوەی کە ((اليقين))یان بۆ هاتووە !!

ئەی تەماشا ناکەن ئەو ((اليقين))ەی کە بانگەشەی بۆ دەکەن، تەنانەت بۆ (محمد)ی گەورەی نەوەکانی ئادەم _ عليه الصلاة والسلام _ نەهاتووە، لە کاتێدا کە ئەمینداری ئەو زاتەیە کە لە ئاسماندایە، ئەوەبوو مردو، ئومەتەکەی بە نوێژکردن ڕادەسپاردو، هانی بۆ دەدان.

خوای تعالی دەفەرمێت: ﴿ واعْبُدْ ربَّكَ حتى يأتِيَكَ اليَقينُ ﴾﴿ الحِجْر: ٩٩ ﴾ واتە ﴿ واعْبُدْ ربَّكَ ﴾ وە پەروەردگارت بپەرستە ﴿ حتى يأتِيَكَ اليَقينُ ﴾ هەتا مردن یەخەت پێ دەگرێت، مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

ئا لەم ئایەتەدا بەڕوونی دەردەکەوێت کە مەبەستی خوای تعالی بە وشەی ((اليقين)) مردنە بە یەك دەنگی زانایانی ئیسلام.

## ✱ ڕەخنەگرتن لەو ڕێبازەی صوفیەکان بەکاری دێنن لە لێکدانەوەکانیاندا( تأویل ):

کە زانستی صوفیەکان بە شەرع کەم بویەوە، چەندین کارو گوفتاریان لێ دەوەشایەوە کە حەڵاڵ نەبوون، ئینجا کەسانێکی دیکەش کە لەوان نەبوون خۆیان بە صوفیەکان دەچواندو، ناوی ئەوانیان لە خۆیان دەناو، وەکو ئەو شتانەیان لێ دەوەشایەوە کە باسمان بۆ کردن، کەسانی چاکیان دەگمەن بوو، کۆمەڵێك لە زانایان زەمیان کردن و، عەیبداریان کردن، تا ئەو ئاستەی تەنانەت شێخەکانیشیان عەیبداریان کردن:

لە (عبدِالملكِ)ی کوڕی (زیادِ النَّصِيِّ)وە دەڵێت: لە خزمەتی (مالكٍ)دا بووین، باسی چەند صوفیەکی وەڵاتی خۆمانم بۆ کردو، پێم گوت: نایابترین پۆشاکی یەمەنی دەپۆشن و، کارو کردەوەیان ئاوەهایە!

ئەویش فەرمووی: تیابچیت ! تۆ بڵێی ئەوانە موسڵمان بن ؟!

دەڵێت: پاشان ئەوەندە پێکەنی تا ڕاکشا.

دەڵێت: کەسێك لەوانەی کە هاومەجلیسی (مالكٍ) بوون پێی گوتم: ئەی تۆ ! بەڕاستی هیچ بەڵایەکی ترمان نەبینیوە ئەمەندەی تۆ لە سەر ئەم پیاوە گەورەتر بێ، هەرگیز شێخمان نەبینووە پێکەنێت.

لە (یونُسَ)ی کوڕی (عبدِالأعلی)وە دەڵێت: گوێبیستی پێشەوا (الشافعيَّ) بووم دەیفەرموو: ئەگەر پیاوێك سەرتای ڕۆژبوونەوە ببێ بە صوفی، دڵنیابن پێش ئەوەی نیوەڕۆ بێت گەمژەو بێ ئەقڵ بووە.

هەروەها دەفەرمێت: هەرکەسێك چل ڕۆژ لە گەڵ صوفیەکاندا بێت، هەرگیز ئەقڵی بۆ ناگەڕێتەوە !

پێشەوا (الشافعيَّ) لە شیعرێکیدا فەرموویەتی:

وَدَعُوا الذينَ إذا أَتَوكَ تَنَسَّكوا    وإذا خَلَوا فهُمُ ذئابُ حِقافُ

واتە: لەو کەسانە وازبێنە کە دێنە دیدەنیت خواپەرستی دەنوێنن و، ئەگەر تەنهاش بوونەوە دەبن بە گورگێکی هەڵنیشتوو.

له (سفيانَ)ەوه دەڵێت: گوێبیستی (عاصم) بووم دەیگوت: بەردەوام صوفیەکانمان بە گەمژەو بێ ئەقڵ دەناسی، بەڵام خۆیان لە پەنای فەرموودەدا دەشاردەوە.

له (يحيى)ی کوڕی (يحيى)ەوه دەڵێت: (الخوارجُ)م لە صوفیەکان بەلاوە خۆشەویسترە.

له (يحيى)ی کوڕی (معاذ)ەوه دەڵێت: لە هاوەڵێتی سێ جۆری خەڵك دورکەوەرەوە: زانا بێ ئاگاکان، هەژارە چەورەیی کارەکان، صوفیە نەفامەکان.

کە لە سەرەتای ئەم کتێبەدا وەڵامی صوفیەکانمان دەدایەوە، ئەوەمان بەیادهێنانەوە کە فیقهزانەکانی مصر نکۆڵیان لە (ذي النُّون) دەرکرد سەبارەت بەو قسانەی کە دەیکرد، لە (بِسْطام)یش نکۆڵیان لە (أبي يزيدَ) دەکردو، دەریانکرد، هەروەها (أباسُلَيمانَ الدَّارانيَّ)یشیان دەرکرد، هەروەها (أحمدُ)ی کوڕی (أبي الحَوَاريّ) و (سَهْلٌ التُّسْتَريُّ) لە دەستیان هەڵهاتن، چونکە پێشینانی چاك خەڵکیان لە بچوکترین بیدعە دوردەخستەوەو، هەجری بیدعەچیان دەکرد، بۆ ئەوەی زیاتر دەست بە سوننەتەوە بگرن(٦٩٣).

(أبو الفتح)ی کوڕی (السَّامريِّ) بۆی باسکردم و گوتی: فەقیهەکان بۆ پرسەی کەسێکی فەقیە لە خەڵوەتگەیەکدا (الرباط) دانیشتبوون، ئەوەبوو شێخ (أبوالخطَّابِ الكَلْوذانيُّ) فیقهزانیش کە خۆی بە سەر دەستی مندا دابوو هات، تا لە دەرگای خەڵوەتگەکەدا وەستاو، نەچووە ژوورێ، گوتی: زۆر پێم ناخۆشە ئەگەر کەسێك لە هاوەڵانمان و شێخە کۆنەکامان ببینن لە کاتێکدا من دەچمە نێو ئەم خەڵوەتگەیەوە.

دەڵێم _ ابن الجوزي _: شێخەکانمان لە سەر ئەم ڕێبازەبوون، بەڵام لەم زەمەنەی ئێمەدا، بەڕاستی مەڕو گورگ ئاشت بوونەتەوە !

---

٦٩٣ _ ئەمە مەنهەجێکە _ زۆر بەداخەوە _ زۆرێك لەو کەسانەی کە خۆیانیان داوەتە پاڵ پێشینی چاك هەجریان کردوە _ مەگەر کەسێك خوای تعالى بەزەیی پێدا هاتبێتەوە _ بۆیە تەماشا دەکەی چەندین پەیوەندی و دۆستایەتی لە گەڵ ئەهلی بیدعەو خاوەن گومڕایدا دەبەستێ بەبێ ئاگابوون لەو داوو سەرلێشێواندنانەی کە بەنهێنیەوە بۆیان دادەنێن !

ئا ئەمانە گومانی باشیان پێ دەبن، لە کاتێدا پێشینی چاك گومانی خراپیان پێ دەبردن !

## ✸ لەو ڕووانەی کە صوفیەکانی تێدا زەم دەکرێت:

(ابنُ عقيلٍ) دەڵێت: من صوفیەکان زەم دەکەم لەبەر چەندین ڕووی جۆراوجۆر، شەرع بە پێویستی داناوە ئەو کردەوانە زەم بکرێت، لەوانە:

ئەوان شوێنێکی مانەوەیان بۆ بەسەربردنی کاتی بێکاری تەرخان کردووە، کە بریتیە لە خەلوەتگەکان (الأربطةُ)، بەو هۆیەوە لە نوێژە بەکۆمەڵەکانی مزگەوتیش دادەبڕێن، ئەو شوێنانەی ئەوان نە مزگەوتە، نە ماڵە، نە خانە، تیایدا دەمێننەوە بۆ بەسەربردنی کاتی بێکاری و دورکەوتنەوە لە بژێوی پەیداکردن.

جەستەی خۆیان قەڵەو کردەوە وەکو جەستەی ئاژەڵان، بۆ خواردن و، خواردنەوەو، سەماکردن و، گۆرانی گوتن.

هەستاون بە پینەکردن کە لە بنچینەدا مەبەستیان تەنها زیاتر چاکردنی پۆشاکەکەیە، بە چەند ڕەنگێکی تایبەت، کە بۆ سەر دڵی خەڵکانی ئاسایی و ژنان کاریگەریەکی زیاتری دەبێ.

سەرنجی ژنان و لاوانی لووسکەی بێتوك ڕادەکێشن، چونکە خۆیان بە جۆرێکی تایبەتی ڕوخسارو جل وبەرگەوە پیشان دەدەن، بۆیە کە چوینە هەر ماڵێکەوە، دەرنەچوونە تا دڵی ژنەکانیان بەرامبەر بە مێردەکانیان خراپ کردووە.

پاشان خۆراك و بژێوی لە ستەمکاران و، خراپەکاران و، ئەو کەسانەی ماڵ و سامان داگیر دەکەن وەکو کۆکەرەوانی باج وەردەگرن.

لاوانی لووسکەی بێ تووك لە گەڵ خۆیاندا بۆ گوێگرتنەکان دەبەن، لە نێو کۆمەڵداو لە بەر ڕووناکیدا هاوەڵێتیان دەکەن.

تێکەڵ بە ژنان دەبن، بە بەهانەی ئەوەی کە پۆشاکی (الخِرْقَة)یان(٦٩٤) لە بەر دەکەن.

---

٦٩٤ _ جۆرە پۆشاکێکی صوفی داهێنراوەو هیچ بنەڕەتێکی لە شەرعدا نی یە، وەکو ئەوەی پێشتر لە (السخاوي)وە گێڕامانەوە.

جۆش و خرۆشی بە (وجْد) واتە سۆزی بەتین ناودەبەن، بانگهێشتکردن بە (وقت) ناودەبەن، دابەشکردنی پۆشاکی خەڵك لە نێوان خۆیاندا بە (حُکم) ناودەبەن.

لە بانگهێشتی ماڵێك ناچنەدەرەوە تا یەکسەر بانگهێشتێکی تر دەکرین و دەڵێن (إنَّها وَجَبَتْ) واتە بەڕاستی لە سەرمان پێویست بوو.

بەڵام دڵنیابن باوەڕبوون بەوانە کوفرەو، کارپێکردنیشی گومڕابوونە.

لەو بڕوایەشدان کە گۆرانی گوتن بە ئامێری موسیقیی (القَضیب) چاکەو نزیك بونەوەیە.

بیستومانە دەڵێن نزاکردن لە کاتی گۆرانی گوتنی وشترەواندا گیرایە، چونکە لەو باوەڕدان کە چاکەو نزیك بونەوەیە.

ئەمەش دیسان کوفرە، چونکە هەر کەسێك وابزانێت کە شتی (المکروە)و حەرام چاکەو نزیك بونەوەیە، بەو باوەڕە کافر دەبێ، خەڵکیش جیاوازن سەبارەت بە حەرامبوون و کەراهەتبوونی(٦٩٥).

لە ڕادەبەدر بۆ شێخ و ڕابەری تەریقەتەکانیان سەرشۆڕ دەکەن، تا ئەو ئاستەی کە ئەگەر لاوێکی لووسکەی بێ تووك ماچ بکات دەڵێن: بەزەی و میهرەبانیە ! ئەگەر لە گەڵ ژنێکی نامەحرەمدا تاك بویەوە، دەڵێن: کچی خۆیەتی و، پۆشاکە (الخِرقَةَ)کەشی پۆشیوە، بۆیە

---

٦٩٥ _ بەڵگەی حەرامێتی ئامێرە موسیقیەکان بە پێی چەندین بەڵگە (صحیح)و جێگیرە، بەهێزترینیان ئەو فەرموودەیە کە پێشەوا (البخاري) لە ((صحیح))ەکەیدا دەیگێڕێتەوە:
((لیکوننَّ من أُمَّتي أقوامٌ یستحلُّون الحِرَ والحریرَ والخمرَ والمعازفَ...)) واتە پێغەمبەری خوا _ صلی الله علیه وسلم _ فەرموویەتی: ((تاقمێك لە ئومەتەکەی من داوێن پیسی و ئاورێشم و مەی و ئامێرە مۆسیقیەکان حەڵاڵ دەکەن...)).

بە لێکۆڵینەوەیەکی ڕەخنەیی ئیسنادیی، لەم بارەوە دواوم، هەستاوم بە بەرپەرچدانەوەی گومانی ئەو کەسانەی کە لەم بارەوە بیروڕای جیاوازیان هەیە، وەکو (ابن حزم)و ئەو کەسانەی شوێنی کەوتوون و چاولێکاری دەکەن، هەموو ئەوانەم لە بەشی (١٦)ی کتێبەکەمدا ((الأجزاء الحدیثیة))دا باسکردووە، بە ناونیشانی ((الکاشف في تصحیح روایة البخاري لحدیث تحریم المعازف)) نشر دار ابن الجوزي _ الدَّمام.

هيچى تێدا نييه. ئەگەر پۆشاكێك دابەش بكات بەبێ قايلبوونى خاوەن پۆشاكەكە، دەڵێن: ئەوە حوكمى (الخِرقَةَ)يە.

دەڵێن: شێخێكمان نييه كه له تواناماندا نەبێ ملكەچى باروحاڵى بين و، له هەموو شتێكدا گوێڕايەڵى بين، چونكه شێخێكمان نييه له چوارچێوەى (التكليف) واته سەپاندندا نەبێ.

چونكه ئەگەر شێخێكمان هەبوايەو له تواناماندا بوايه ملكەچى باروحاڵى نەبين و، له هەموو شتێكدا گوێڕايەڵى نەبين، (أبابكرِ الصديقَ) دەبوو _ خواى لێ ڕازى بێت _.

دەڵێم _ ابن الجوزي _: ئەى باشه پێشەوامان أبابكرِ الصديقَ) _ خواى لێ ڕازى بێت _ نەبوو كه فەرمووى: (إنْ اعْوَجَجْتُ فَقَوِّموني)(٦٩٦) واته ئەگەر لامدا ڕاستم بكەنەوە، بەڵام نەيفەرموو: ئەگەر لامدا ملكەچم بن و گوێڕايەڵم بن ؟!

پاشان تەماشاى پێغەمبەرى خوا بكە _ صلى الله عليه وسلم _ هاوەڵان چۆن ڕەخنەى لێ دەگرن(٦٩٧)، ئيتر ئەوان بۆ نەتوانن له شێخەكانيان ڕەخنە بگرن، ئەمە هاوەڵێكە بە پێغەمبەرى خوا _ صلى الله عليه وسلم _ دەفەرمێت: ((تنهانا عن الوصال وتُواصِلُ))(٦٩٨) واته قەدەغەمان دەكەى لەوەى كه (الوصال) بكەين له كاتێكدا خۆت (الوصال) دەكەى ؟!

پاشان ئەوە فريشتەكانه بەخواى تعالى دەفەرمن: ﴿أَتَجْعَلُ فيها﴾ ﴿البقرة: ٣٠﴾ واته (فريشتەكان) وتيان: ئايا كەسێكى واى تێدا دروست دەكەيت(٦٩٩).

---

٦٩٦ _ انظر تعليقي على ((التذكرة والأعتبار والأنتصار للأبرار)) (ص٤٧) لابن شيخ الحزَّمين، نشر مكتبة ابن الجوزي _ الدَّمام.

٦٩٧ _ ڕەخنەيان له بنەڕەتى حوكمەكەى نەگرت، بەڵكو مەبەستيان بەو ڕەخنەيه پرسياركردن و ڕوونكردنەوە بوو.

٦٩٨ _ رواه البخاري (٤ / ١١٩)، ومسلم (١١٠٢) " عن ابن عُمر.

الوصال: واته بەردەوامبوونى ڕۆژووگرتن و نەشكاندنى بەشەو بەرۆژ، وەرگێڕ.

٦٩٩ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەى تەفسيرى قورئان.

وه (موسى) پێغەمبەریش دەفـەرمێت: ﴿ أتُهْلِكُنـا بمـا فَعَـلَ الـسُّفَهاءُ مِنَّـا ﴾ ﴿الأعـراف: ١٥٥﴾ واته ﴿أتُهْلِكُنا﴾ ئایا تۆ هەمموومان له ناو دەبەیت ﴿بما فَعَـلَ الـسُّفَهاءُ مِنَّـا﴾ بـەهۆی ئەوەی كه گێلەكانمان ئەنجامیان داوه(٧٠٠).

له ڕاستیدا صوفیەكان ئەم وشەیان داناوه بۆ ئاسوودەكردنی دڵـی پێـشكەوتوانی خۆیـان، دەستەڵاتێكیشیان پێ دەبەخشێ بەسەر موریدو شوێنكەواتوانیاندا، خوای تعالی دەفەرمێت: ﴿فاسْتَخَفَّ قومَهُ فأَطاعُوهُ﴾ ﴿الزخـرف: ٥٤﴾ واته جا بەم قسانه گەلەكـەی هەڵخەڵـەتان و ئەوانیش گوێڕایەڵیان كرد(٧٠١).

پێدەچێ وشەكه ئەو كەسانەیان گوتبێتی كه دەڵێت بەنده ئەگەر بزانێت، ئـیتر هـەر كـارو كردەوەیەك بكات زیانی پێ ناگەیەنێت، بەڵام ئـەم گوفتـاره ئەوپـەڕی زەندیقیەتـه، چـونكه فیقهزانان كۆڕان له سەر ئەوەی كه زانا به هـەر باروحـاڵێكی بـەرزتر بگـات، ئەوەنـدەی تـر (التكلیف) واته سپاندنه شـەرعیەكانیان لـه سـەر زیـاترو قورسـتر دەبـێ، وەكـو باروحـاڵی پێغەمبەران كه دەبێ پابەندی كردەوه بچوكەكانیش بن.

بۆیه توخوا ئەگەر گوێ لەم كەسه دەست خاڵیانه بگرن، كه هـیچ بەڵگـەو سـەلماندنێكیان بەدەستەوه نییه، له ڕاستیدا ئەوان تەنها زیندیقن و، دوو شـتیان لـه خۆیانـدا كۆكردۆتـەوه: جویەی (المُرَقَّعـة)و خوری پۆشین، كـردەوەی بێبـاوەڕه بـەرەڵاكانیش ئـەنجام دەدەن: خـواردن و خواردنەوەو سەماكردن و گوێگرتن له گۆرانی و پشت گوێ خستی حوكمه شەرعیەكان.

زیندیقەكان نەوێران بەتەواوی نكۆڵیی له شەریعەت بكـەن، تـاوەكو صـوفیەكان سـەریان هەڵدا، ئەوكاته زۆر به ئاسانی كاروكردەوەی ئەهلی بەرەڵایان هێنا.

ئەوەبوو یەكـەم شـتێك كـه هێنایـان چـەند ناوێـك بـوو، گوتیـان (حەقیقـەت) هەیـەو، (شەریعەتیش) هەیه!

---

٧٠٠ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

٧٠١ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

ئەمە شتێکی ناشیرینە، چونکە شەریعەت ئەوەیە کە خوای هەق بۆ بەرژەوەندی بەندەکانی خۆی داینـاوە، بـەڵام (حەقیقـەت) هـیچ بنـەڕەتێکی نییـەو، تـەنها شـەیتانە کـە دەیخاتـە نەفسەکانەوە، وەهەرکەس خواستی (حەقیقەت) بکات بەبێ شـەریعەت، ئـەوا کەسـێکی لـە خۆبایی و هەڵخەڵەتێنراوە.

وە ئەگـەر گوێبیـستی کەسـێك بـن فـەرموودە دەگێڕێتـەوە، دەڵـێن: هـەژارن، ئـەوان زانستەکانی خۆیان مردوو لە مردۆوە وەرگرتووە، بـەڵام ئێمـە زانـستەکەمان ڕاسـتەوخۆ لـە زاتێکەوە وەرگرتووە کە زیندووەو نامرێت، بۆیە ئەگەر هەر کەسێك لەو هەژارانە بڵێـت: بـابم لە باپیرمەوە بۆی گێڕاومەتەوە، من دەڵێم: دڵم لە پەروەردگارمەوە بۆی باسکردم !

بەم قسە هیچ و پووچانە خۆیان تیاچوون و، دڵی ژمارەیەکی زۆری نەفامیشیان تیاچـواند، جا بۆ ئەو قسانە پارەو سامانیشیان بۆ خەرج دەکرا، چونکە فەقیهان وەکـو پزیـشکان وان و، نرخی دەرمانیش گرانە.

بەڕاستی ڕقبونەوەیان لە فەقیهان زەندیقیەتێکی گەورەیە، ڕقەکەشیان لە بەر ئەوەیـە کـە فەقیهان بەفەتواکانیان لە گومڕابوون و فاسقی قەدەغەیان دەکەن.

دڵنیابن هەردەم هەق قورس دەبێ وەکو چۆن زەکاتدان قورس دەبێ، بەڵام چەند سووکە ئەو بەخشینەی کە بە کچە گۆرانی بێژان دەدرێ‌و، ئەو ماڵ و سامانەی بەو شاعیرانە دەدرێت کـە مەدح و ستایشیان دەکەن!

خوای تعالی شەریعەتی والێکردووە کە پێویستی بە شەڕی ئەم تایەفە نەبێ، کـەوا چـەند شتێکیان لە خۆیاندا کۆکردۆتەوە وەکو: بەخشندەیی دەربڕین بە هـۆی ئـەو پۆشـاکانەوە کـە دەیپۆشن، خۆشگوزەرانی، فریودان بە قسەی شیرین، کە لە ڕاسـتیدا هـیچ سـوودێکی نـی ی بەدەر لە فەرامۆشکردنی سەپاندنە شەرعیەکان و، هەجرکردنی شەرع، هەر بۆیـە ئـەم تاقمـە سووکن بەسەر دڵانەوەو خۆشیان دەوێن، ئەو بەڵگەیەی زۆر بەهێزەو ئاماژە بۆ ئـەوە دەکـات کە ئەمانە خاوەن بیروباوەڕێکی پووچن ئەوەیە کە تەبیعەتی کەسـانی دونیـا ویـست خۆشـی دەوێن، وەکو چۆن ئەهلی ئارەزووات و ڕابواردن و کچە گۆرانی بێژانیان خۆش دەوێ.

هیچ تاقمێك ئەوەندەی قسەناسان و صـوفیەكان بـۆ شـەریعەت زەرەرمەنـد نـین، چـونكە قسەناسان بیروباوەڕی خەڵك دەشێوێنن بە خەیاڵ و ئەندێشە گوماناویـەكانی ئـەقڵی خۆیـان، صوفیەكانیش كارو كردەوەكان خراپ دەكـەن و، ڕێـسای ئاینـەكان دەڕۆخێـنن و، بێكـاری و بیستنی دەنگەكانیان بە لاوە خۆشەویستە.

بەڵام پێششینی چاك ئاوەها نەبوون، بەڵكو لـە بەشـی بیروبـاوەڕدا بەندەیـەكی گوێڕایـەڵ بوون، لە بەشەكەی دیكەشدا ئەهلی جیدیات بوون.

ئامۆژگاریم بۆ برایانم ئەوەیە با قسەی قسەناسان (كـلام المـتكلمين) هـەرگیز نـەتوانێ لـە دەرگای دڵیان بات، وە با گوێیان قسە هیچ و پوچەكانی ئەهلی تەصوف نەبیستێت، دڵنیـابن خۆ سەرقاڵكردن بە بژێوی پەیداكردنەوە زۆر لە بێكاری صوفیەكان شایستەترە، كـاركردن بـە پێی مانا ئاشكراكانی شەرع زۆر لە قوڵبونەوەی ئەو كەسانە باشترە كـە خۆیـان داوەتـە پـاڵ شەرع.

لە ڕێبازی هەردوو تاقمەكەم كوڵیوەتەوە، بۆم ڕوون بویەوە كە ئەوپەڕی ڕێبازی قـسەناسان گومانەو، ئەوپەڕی ڕێبازی صوفیەكانیش قسەی هەرچی و پەرچیە.

(ابنُ عقیـلٍ) دەڵێت: بەلای منەوە قسەناسان لە صوفیەكان خێردارتـرن، چـونكە پێدەچـێ قسەناسان گومانەكانی كەسی بەرامبەری خۆیان لابەرن، بەڵام صوفیەكان خـەڵك بـە هەڵـەدا دەبن و تەشبیەو چواندنیان بۆ دروست دەكـەن، زۆربـەی قسەكانیـشیان پوچـەو، ئامـاژە بـۆ نەهێشتن و لادانی پێغەمبەرایەتی دەكات.

بۆیە ئەگەر صوفیەكان بە پیاوانی فەرموودەناسیان گـوت: ((ئـەوان زانـستەكانی خۆیـان مردوو لە مردۆوە وەرگرتووە)) ئەوا تانەیان لـە پێغەمبەرایـەتی داوەو، دەیانـەوێ پـشت بـە واقیعاتی خۆیان ببەستن، وە هەركات بەڕێگەیەك لە ڕێگەكان سوكایەتی پێكرا، چـیتر كـاری پێ ناكرێ.

بەڵام هەر صوفیەك بڵێت: ((دڵم لە پەروەردگارمـەوە بـۆی باسـكردم))، دڵنیـابن زۆر بـە ئاشكرا دەڵێت من پێویستم بە پێغەمبەر نییـە، وە هەركەسـێكیش ئـەوە بڵێـت، بەڕاسـتی كوفری كردووە.

ئەوە دەستەواژەیەکی خراپەو خراوەتـە نێـو شـەریعەتەوەو، ئـەو زەندیقیەتـەی لـە ژێـردا شاردراوەتەوە، بۆیـە ئەگـەر کەسـێکمان بـەدیکرد سـوکایەتی بـە گێڕانـەوەو نووسـینەوەی فەرمووده دەکرد، دەبێ یەکسەر بزانین ئەو کەسە لە دڵەوە کاری شـەرعی پەکخـستتوە، ئـەو کەسەی کە دەڵێت: ((دڵم لە پەروەردگارمەوە بۆی باسکردم)) با دڵنیابێت کـە پـەروەردگاری نەبووە بەڵکو شەیتان بووە کە خستویەتیە دڵیەوە، چونکە خـوای _ عزَّوجلَّ _ دەفـەرمێت: ﴿وإِنَّ الـشَّياطِينَ لَيوحُـونَ إِلى أَوْلِيـائِهِمْ ﴾﴿ الأنعـام: ١٢١ ﴾ واتـە وە بێگومـان شـەیتانەکان بەنهێنی شت بەدۆستانیان دەڵێن(٧٠٢).

ئەوە شتێکی ئاشکرایە، چونکە لە بەڵکەی پارێزراو لە هەڵـە وازی هێنـاو، پـشتی بـەوە بەستووە کە دەخرێتە ئەو دڵەیەوە کە لە خەیاڵات و ئەندێشەی خراپ نەپارێزراوە.

(ابنُ عقيلٍ) دەڵێت: ئەوانەی لە شەریعەت چوونەتە دەرێ زۆرن، بـەڵام دڵنیـابن خـوای _ عزَّوجلَّ _بە پیاوانێکی فەرموودەناسی زانای چاك پشتگیری لە شەریعەتەکەی خۆی دەکـات، کە بەو پەڕی توانایانەوە بەرگری لێ دەکەن، بۆ ئەوەی بنەڕەت و بنچینە پاکەکـەی بپـارێزن، هەروەها بە کەسانێکی فیقهزان پشتگیری لێ دەکات، بۆ ئـەوەی ماناکـانی بـۆ خـەڵك ڕوون بکەنەوە، ئەمانە زانا سوڵتانەکانن، کە هیچ بوارێك ناهێڵنەوە بۆ ئەوەی درۆزنان سەری تێـدا بەرزکەنەوە.

(ابنُ عقيلٍ) دەڵێـت: خـەڵکی دەڵـێن: ئەگـەر خـوای تعـالی بیـەوێت مـاڵی بازرگانێـك بڕۆخێنێت، ئەوا تێکەڵی صوفیەکان دەبێ. منیش دەڵێم: هـەروەها ڕۆخانـدنی ئاینەکەشـی، چونکە صوفیەکان ڕێیان داوە پیاوێکی نامەحرەم پۆشاکە (الخرقة)کە لە بەر ژنـان بکـات، وە ئەگەر ئامادەی کۆڕێکی گوێگرتنی گۆرانی و شیعرو جۆش و خرۆشی بن، پێدەچێ لـە نێـوان هەردوو لادا دەمەتەقێ و غەزەل و تەنهابوونـەوەی هەنـدێ کـەس لـە گـەڵ هەنـدێکی تـردا ڕووبات و، ئەو کاتە بانگهێشتەکە دەبێ بە شاییەك بۆ هەردوو کەسەکە، پـێش ئـەوەی لـەو شوێنە بچنە دەرێ دڵی کەسێك بە کەسێکەوە پەیوەند دەبێ، تەبیعەتێك مەیلی تەبیعەتێکی

---

٧٠٢ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

تر دەكات، دڵی ژن بەرامبەر بە پیاوەكەی دەگۆڕێ، لێرەدا ئەگەر پیاوەكە ئەوەی بەلاوە ئاسایی بێت، ئەوا بە (الدَّيُّوث)(٧٠٣) واتە بەو كەسە ناودەبرێت كە بەلایەوە ئاسایە خێزانەكەی بەدڕەوشتی بكات، ئەگەر ڕێگریشی لێ بكات، داوای جیابونەوە دەكات و، دەچێت بۆ لای ئەو كەسەی كە پۆشاكە (المُرَقَّعَةَ)ەكەی لە بەردەكات و، بۆ تێكەڵبوون لە گەڵ ئەو كەسانەشدا كە ڕێگریی لێ ناكەن و، بەسەر تەبیعەتەوە وشك نین.

وە دەڵێن: فلان ژن تەوبەی كردوەو، شێخ پۆشاكە (الخِرْقَةَ)ەكەی لەبەر كردو، بویە یەكێك لە كچەكانی، بەڵام ڕازی نەبوون بڵێن: ئەمە یاریكردن و هەڵەیە. بەڵكو گوتیان: ئەمە لە مەقاماتی پیاوانە.

ساڵەهای ساڵ بەسەر ئەمەدا تێدەپەڕێت، بەڵام دڵنیابن دووبارە حوكمی قورئان و سوننەتی ڕاست بۆ دڵان دەگەڕێتەوە .

دەڵێم _ ابن الجوزي _: هەموو ئەوانە گوفتاری (ابنُ عقيلٍ) بوون _ خوای لێ ڕازی بێت_، بەڕاستی كەڵەپیاوێكی ڕەخنەگرو لێهاتوو و، فیقهزان بوو، لە دەرخستنی چاكەو خراپەدا زۆر بەتوانابوو.

---

٧٠٣ _ والنبيّ _ صلى الله عليه وسلم _ يقول:
((ثلاثةٌ لا ينظرُ الله إليهم يوم القيامة... والدَّيوث)). واتە پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ فەرموویەتی: ((سێ كەس هەن خوای تعالى لە ڕۆژی قیامەتدا تەماشایان ناكات... وە ئەو كەسەی بەلایەوە ئاسایە خێزانەكەی بەدڕەوشتی بكات )).
أخرجه النسائي (١ / ٣٥٧)، وأحمد (٢ / ١٣٤)، وابن حبان (٥٦_ موارد) " عن ابن عمر.
وسنده صحيح.
وله طريق أخرى عند أحمد (٢ / ٦٩ و ١٢٨)، وفيها تفسيرالدَّيُّوث:
((الذي يقرُّ في أهله الخبث)).
وفي سنده جهالة.
لكن المعنى صحيح ثابت " كما في ((النهاية في غريب الحديث والأثر)) (٢ / ١٤٥) لأبن الأثير، و ((غريب الحديث)) (٣ / ١٠٨٧) للحَرْبيّ.

# بەشی یازدەیەم

## ئیبلیس بەشتانێك سەر لە خواپەرستان دەشێوێنێت كە لە كەرامات دەچێ

پێشتر ڕوونمان كردەوە كە لە ڕاستیدا ئیبلیس بەسەر مرۆڤدا زاڵ دەبێ بە پێی كەمبوونی زانست، بۆیە هەرچەندە زانستی مرۆڤ كەم بوو " ئیبلیس زیاتر بەسەریدا زاڵ دەبێ، وە هەرچەند زانستی زۆر بوو " كەمتر بەسەریدا زاڵ دەبێ.

كەمێتی زانست چەندها خەیاڵات بۆ مرۆڤ دروست دەكەن، كەسانێك لە خواپەرستان تیشكێك یاخود ڕووناكیەك لە ئاسماندا دەبینێ، ئەگەر كاتی مانگی ڕەمەزان بوو " دەڵێت: شەوی قەدرم بینیوە، وە ئەگەر لە كاتەكانی دیكەدا بێت " دەڵێت: بەڕاستی دەرگای ئاسمانەكانم بۆ كراوەتەوە.

جار بە جاریش پێدەچێ ئەو شتە بەدیبكات كە داوای دەكات، ئیتر وادەزانی كەراماتی بۆ هاتووە، كەچی لەوانەیە بەدیكردنیی ئەو شتە ڕێكەوت بێ، پێدەچێ بۆ تاقیكردنەوە بێ، پێدەچی فێڵ و تەڵەكەی ئیبلیس بێ، لێرەدا كەسی ئاقڵ ئەوەیە كە هیچ شتێك لەوانە نەخاتە دڵی خۆیەوە، با كەراماتیش بێ.

(مالكِ)ی كوڕی (دینارِ) و (حَبیبِ العَجَمیِّ) دەڵێن: بەڕاستی شەیتان یاری بە خوێنەران دەكات وەكو چۆن منداڵان یاری بە گوێز دەكەن.

## ✱ لە سەرسوڕمێنترین چیرۆکەکانی کەراماتیان:

ئیبلیس هەستا بە فریودانی چەند کەسێکی زاهیدی لاوازو شتانێکی پیشاندان کە لە کەرامات دەچوو، تا گەشتە ئەو ئاستەی کەسانێکیان بانگەشەی پێغەمبەرایەتی بکەن:

لە (عبدِالرحمنِ)ی کوڕی (حَسَّانَ)ەوە دەڵێت: (الحارِثُ الكَذَّابُ) خەڵکی دیمەشق بوو، خزمەتکاری (أبي الجُلَّاسِ) بوو، باپیشی نیشتەجێی (الغُوطَةِ) بوو، ئەم پیاوە خواپەرستێکی زۆر زاهید بوو، تا ئەو ئاستەی ئەگەر جوبەیەکی زێڕینی بپۆشیایە، تۆ هەر زوهدت پێوە دەبینی، ئەگەر دەستی بکردایەتە (الحمد لله)کردن، بیسەرانی وایان دەزانی کەسێکی تر نیە لەو دەنگ خۆشتر بێت.

دەڵێت: (الحارِثُ) نامەیەکی بۆ بابی نووسی: بابە گیان ! فریام کەوە، بەڕاستی شتانێکم بینیوە دەترسم لە لایەن شەیتانەکانەوە بێت.

دەڵێت: باپیشی زیاتر گومڕای کردو، بۆی نووسی: کوڕی شیرینم ! ئەوە بکە کە فەرمانت پێکراوە، چونکە خوای تعالی دەفەرمێت: ﴿ هَلْ أُنَبِّئُكُمْ عَلَى مَن تَنَزَّلُ الشَّيَاطِينُ، تَنَزَّلُ عَلَى كُلِّ أَفَّاكٍ أَثِيمٍ﴾ ﴿الشعراء: ٢٢١ _ ٢٢٢ ﴾ واتە ﴿ هَلْ أُنَبِّئُكُمْ عَلَى مَن تَنَزَّلُ الشَّيَاطِينُ﴾ هەواڵتان بدەمێ شەیتانەکان دادەبەزنە سەر کێ ؟ ﴿ تَنَزَّلُ عَلَى كُلِّ أَفَّاكٍ أَثِيمٍ﴾ دادەبەزنە سەر هەموو (کەسێکی) زۆر درۆزنی زۆر تاوانبا (٧٠٤)، بەڵام تۆ نە درۆزنی و نە تاوانباری، بۆیە ئەوە بکە کە فەرمانت پێکراوە.

ئەوەبوو (الحارِثُ) دیدەنی پیاو بە پیاوی ئەهلی مزگەوتی دەکردو، بەسەرهاتەکەی خۆی بۆ باس دەکردو، پەیمانی ئەوەی لێ وەردەگرت کە ئەگەر شتێکی لێوە بەدیکردو پێی ڕازی بوو با قبوڵی بکات و، ئەگەر ڕازیش نەبوو نهێنیەکەی بپارێزێت.

شتانێکی سەرسوڕمێنی بە خەڵك پیشان دەدا: دەچووە لای پارچە مەرمەڕێکی مزگەوتەکەو، بەدەستەکانی لێی دەدا، یەکسەر (سبحانَ الله)ی دەکرد، میوەی هاوینی لە

---

٧٠٤ _مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

زستاندا پیّ دەدان بیخۆن، دەیگوت: دەرچنە دەرەوە با فریشتەتان پیشان بـەم، دەیبردنـە لای (دَیرِ المُرَّانِ)و، پیاوانێکی ئەسپ سواری پیشان دەدان.

خەڵکێکی زۆر شوێنی کەوتن، هەواڵەکە بڵاو بویەوە، هاوەڵانی زۆر بوو، تا هەواڵەکەی بە (القاسمِ)ی کوڕی (مُخَیْمِرَةَ)ی فەرموودەناس گەشت، پێی گوت: من پێغەمبەرم. (القاسمِ)یش پێی گوت: درۆت کرد ئەی دوژمنی خوا. (أبو أدريسَ)یش بە (القاسمِ)ی کووت: تۆ خـراپترین کارت ئەنجامدا، نەرم ونیانیت بۆ نەنواند تا دەستگیری بکەین، ئا ئێستا هەڵدێت.

لە مەجلیسەکەی خۆی هەسـتاو چـووە دیـدەنی (عبـدالملكِ)، هەواڵەکـەی (الحـارِثُ) پـیّ ڕاگەیاند، ئەویش ناردی بەدوایدا، بەڵام بیّ توانابوون لە گرتنیـدا، پاشـان (عبـدالملكِ) چـووە دەرەوە تا لە (العُنَیْبِرة) دابەزی، بە هــەموو سـوپاکەی خـۆی ڕاگەیانـد کـە وەکـو (الحـارِثُ) تۆمەتباریان دەکات، ئەگەر هەمان بیروڕای ئەویان هەبیّ.

بەڵام (الحارِثُ) هەڵهات و چووە (بیـتَ المقـدسِ)، خـۆی شـاردەوە، هاوەڵـەکانی دەچـوونە دەرەوەو بەدوای پیاواندا دەگەڕان و، دەیانبردنە دیدەنی (الحارِثُ).

لەو کاتەدا پیاوێکی خەڵکی بەصـرە چـوبوە (بیـتَ المقـدسِ)، وا ڕێکـەوت ئەویـشیان بـۆ دیدەنی برد، کە چووە ژورەوە یەکسەر (الحارِثُ) دەستی کردە (الحمد لله)کردن و، هەواڵی خۆی پیّ ڕاگەیاند، کە پێغەمبەرێکی نێردراوە ! پیاوەکەش گوتی: بەڕاستی قسەکانت جوانن، بەڵام هێشتا پێویستم بە تێڕوانینە. ئەویش پێی گوت: بە ئارەزووی خۆت تێڕوانە.

پیاوە بەصراویەکە چووە دەریّ و، پاشان دوبارە چۆوە دیدەنی، وەڵامی قسەکانی (الحـارِثُ) دایەوەو گوتی: بەڕاستی قسەکانت جوانن و، چۆتە دڵمەوە، بەڕاستی ئیمانم پـیّ هێنـاوی، ئـا ئەمە ئاینە ڕاستەکەیە.

ئەوەبوو (الحارِثُ) فەرمانیدا ڕێگریی لیّ نەکرێت هەرکات ویستی بـچێتە ژورەوە بـۆ لای، ئیتر پیاوە بەصراویەکە زوو زوو سەری لیّ دەدا، کات و شوێنەکانی چوون و هـاتنی (الحـارِثُ) دەزانی، بۆ کوێ هەڵدێت ! تا بووە شـارەزاترین کـەس بـە باروحـاڵیی، پاشـان پێـی گـوت:

مۆڵەتی ڕۆشتنم بدە ! گوتی: بۆ کوێ ؟ گوتی: بۆ بەصرە، دەبمە یەکەم بانگەوازخوازی ئاینەکەت لەوێ.

دەڵێت: ئەویش مۆڵەتی ڕۆشتنی دا، یەکسەر پیاوەکە بە خێرایی خۆی گەیاندە (عبدالملكِ) کە لە (العُنَیْبِرة) بوو، کە لە چادرو خێوەتەکانی نزیك بویەوە، بە دەنگی بەرز هاواری کرد: ئامۆژگاری ئامۆژگاری. سەربازەکانیش گوتیان: ئامۆژگاریەکەت چی یە ؟ گوتی: ئامۆژگاریەکە بۆ ئەمیری موسڵمانان.

خەلیفەی موسڵمانان (عبدالملكِ) فەرمانیدا مۆڵەتی ئەو پیاوە بەصراویە بەن دیدەنی بکات، ئەویش چووە ژورەوە بۆ لای و هاوەڵانیشی لە خزمەتیدا بوون.

دەڵێت: هاواری کرد: ئامۆژگاری. گوتی: ئامۆژگاریەکەت چی یە ؟ گوتی: با بەتەنها بین، کەست لا نەبێ.

هەموو ئەوانەی لە ژورەوە بوون دەرکران، پاشان گوتی: نزیکم کەرەوە. گوتی: نزیك بەرەوە. (عبدالملكِ) لە سەر جێگەکەی خۆی دانیشتبوو، کە پیاوە بەصراویەکە لێی نزیك بۆوە. پێی گوت: چیت پێیە ؟ گوتی: (الحارِثُ)...

کە ناوی (الحارِثُ)ی هێنا، یەکسەر لە سەر جێگەکەوە خۆی فڕێدایە سەر زەوی و، گوتی: ئەو لە کوێ یە ؟ گوتی: ئەی ئەمیری موسڵمانان ! ئەو لە (بیتَ المقدسِ)ە، کات و شوێنەکانی چوون و هاتنەوەی دەزام، چیرۆکەکەی بۆ گێڕایەوەو، چۆن خۆی وادەرخستبوو کە بڕوای پێ هێناوە. (عبدالملكِ)یش پێی گوت: تۆ هاوەڵی بویت، تۆ ئیستا ئەمیری (بیتَ المقدسِ)یت و، لێرەشدا تۆ ئەمیری ئێمە بە، شتێکم پێ بڵێ با بیکەم. گوتی: ئەی ئەمیری موسڵمانان ! کۆمەڵە سەربازێکم لە گەڵدا بنێرە لە قسەکانمان تێنەگەن، بۆیە فەرمانیدایە چل پیاوی (فَرْغانَةَ)(٧٠٥) لە گەڵیدا بچن و، پێی گوتن: لە گەڵ ئەم پیاوەدا بچن، فەرمانی هەر شتێکی پێ دان، گوێڕایەڵی بن.

---

٧٠٥ _ فرغانة: شارێکی فراوانە لە پشتی ڕوبارەوە، هاوسنوری وەڵاتی تورکستانە " کما في ((معجم البلدان)) (٤ / ٢٥٣).

دەڵێت: (عبدالملكِ) نامەیەکیشی بۆ والی (بیتَ المقدسِ) بۆ نووسی " کە فڵان کەس دەبێ بە ئەمیرت تا لە شارەکەت دەچێتە دەرەوە، بۆیە گوێڕایەڵی فەرمانەکانی بە.

کە گەشتە (بیتَ المقدسِ)، نامەکەی پێدا، گوتی: فەرمانی هەر شتێکم پێ دەدەی ئامادەم، ئەویش گوتی: چ لە تواناتدایە لە (بیتَ المقدسِ) مۆمم بۆ کۆکەرەوە، هەر مۆمێکیش بە دست پیاوێکەوە بدەو، لە کوچەو کوڵانەکانی (بیتَ المقدسِ)دا ڕیزیان بکە، ئەگەر گوتم: دایگیرسێنن. هەمووتان دایگیرسێنن.

ئەویش بە مۆمەکانەوە لە کوچەو کۆڵانەکانی (بیتَ المقدسِ)دا ڕیزی کردن، ئینجا پیاوە بەصراویەکە چووە پێشەوە بۆ ماڵ (الحارِثُ)، کە لە دەرگاکە نزیك بویەوە، بە دەرگاوانەکەی گوت: مۆڵەتم بۆ وەرگرە با بچمە لای پێغەمبەری خوا ! دەرگاوانەکەش گوتی: لەم سەعاتەدا مۆڵەتی دیدەنی بەهیچ کەس نادات تاوەکو بەیانی. گوتی: پێی ڕاگەیەنە کە من پێش ئەوەی بە بەصرە بگەم گەڕاومەتەوە بۆ لای چونکە زۆر تامەزرۆی بینیی دەکەم ! دەرگاوانەکەش چووە ژورەوەو، قسەکانی پیاوەکەی پێ ڕاگەیاند، بۆیە فەرمانی دایە دەرگاکەی بۆ بکاتەوە.

دەڵێت: پاشان پیاوە بەصراویەکە بە دەنگێکی بەرز هاواری کرد: مۆمەکان داگیرسێنن، کە داگیرسێنران، دونیا وەکو ڕۆژی لێهات. پاشان هاواری کرد: هەرکەس بەلاتانا تێپەڕ بوو دەستبەسەری کەن. خۆشی چووە ئەو شوێنەی کە دەیزانی، بەمەبەستی دەستبەسەرکردنی، بەڵام لەوێ نەبوو، هاوەڵانی (الحارِثُ) گوتیان: زۆر دورە، بتوانن پێغەمبەری خوا بکوژن، دڵنیابن بۆ ئاسمان بەرز کراوەتەوە.

دەڵێت: پاشان لە نێو چاڵێکدا بۆی گەڕا، کە وەکو شوێنێکی خۆشاردنەوە ئامادەی کردبوو، پیاوە بەصراویەکە دەستی کردە نێو چاڵەکەوە، پۆشاکەکەی گرت، ڕایکێشاو، دەرهێنایە دەرەوە، پاشان بە پیاوە (فَرْغانَةَ)یەکانی گوت: بیبەستنەوە، ئەوانیش بەتوندی بەستیانەوە، لە کاتێکدا کە ڕێیان دەکرد، (الحارِثُ) گوتی: ئایا پیاوێك دەکوژن کە دەڵێت خوا پەروەردگارمە ؟! پیاوێکیش لە (فَرْغانَةَ)یەکان پێی گوت: ئا ئەمە کەراماتی ئێمەیە، تۆش کەراماتی خۆت بەدەرخە!

ئیتر ڕێیان پێكرد تا هێنایانه لای (عبدالملكِ)، كه فه‌رمانێدا دارێكی باشی بۆ ئاماده بكه‌ن و، له زه‌ویدا داچه‌قێنرێت، ئیتر به‌و داره‌وه هه‌ڵیواسی و، فه‌رمانیشیدا پیاوێك به حه‌ربه‌یه‌ك لێی دات، پیاوه‌كه‌ش لێیدا، به‌ڵام حه‌ربه‌كه كه گه‌شته په‌راسویه‌ك له په‌راسووه‌كانی تێشكاو گه‌ڕایه‌وه، ئیتر خه‌ڵكه‌كه هاواریان كردو گوتیان: چه‌ك به جه‌سته‌ی پێغه‌مبه‌راندا ناچێت.

پیاوێكیش له موسلمانان كه ئه‌وه‌ی به‌دیكرد، حه‌ربه‌كه‌ی هه‌ڵگرت و، بۆی چوو، ده‌ستی پێدا هێنا، تا گه‌شته نێوان دوو په‌راسوو، به حه‌ربه‌كه لێیداو، كردیه ژووره‌وه‌و، كوشتی.

(الولیدَ) ده‌ڵێت: پێم گه‌شتووه كه‌وا (خالدَ)ی كوڕی (یزیدَ)ی (معاویةَ) چووه دیده‌نی (عبدالملكِ)ی كوڕی (مَرْوانَ)و، پێی گوت: ئه‌گه‌ر ئه‌و كاته من لاتان ئاماده بوایه‌م فه‌رمانی كوشتنیم پێ نه‌ده‌كردی.

(عبدالملكِ)یش گوتی: ئه‌ی بۆ ؟ پێی گوتی: له ڕاستیدا ئه‌و پیاوه ته‌نها شه‌یتان كاری تێكردبوو، ئه‌گه‌ر برسیت كردایه، لێی دور ده‌كه‌وته‌وه !!

## ✸ سەر لێ شێوان و فریوخواردن بەو شتانەی کە لە کەرامات دەچێ:

کەسانێك بە شتانێکی زۆرەوە فریویـان دەخـوارد کـە لـە کـەرامات دەچـوو، لـە (أَبي عِمْرانَ)ەوە دەڵێت: (فَرْقَدْ) پێی گوتم: ئەی (أَباعِمْرانَ) ! بەڕاستی ئـەمڕۆ ڕۆژم کـردەوەو لـە هەوڵی پەیداکردنی ئەو پارەدا بووم کە وەکو باج خراوەتە سەرم، کە بریتیە لە شەش دیرهـەم، کە نەمبوو، نزام کرد، لە کاتێکدا کە بەلای ڕووباری فورتـدا ڕێـم دەکـرد، شـەش دیرهـەمم دۆزیەوە، بردم و، کێشام، تەماشا دەکەم شەشە نە زیادو نە کەم. (أَباعِمْرانَ)یش پێـی گـوت: بە خێرو صەدەقەی بکە، چونکە هی خۆت نییە.

دەڵێم ـ ابن الجوزي ـ: (أَباعِمْرانَ) خودی (إِبراهیمُ النَّخَعِيُّ)ە کە فیقهزانی خەڵکی کوفـە بووە.

ئێوە تەماشای گوفتاری فیقهزانان بکەن، کە چەند لە فریوخواردنەوە دورن، وە چـۆن پێـی ڕاگەیاند کە ئەو پارەیە (لُقَطَةٌ)یەو، بـۆ ئـەوە ئـاوڕی نەدایـەوە کـە دۆزینـەوەی پارەکـە لـە کەرامات بچێت، وە فەرمانی ناساندن و جاڕدانی پارەکەی بە نێو خەڵکدا پێنـەکرد، چـونکە ڕێباوەڕی فیقهزانەکانی کوفە ئەوەیە کـە ئەگـەر پـارە لـە دینارێـك کـەمتر بـوو ناسـاندن و جاڕدانی (واجب) نابێ، لە ڕاستیدا فەرمانی پێکرد بە خێرو صەدەقەی بکات، بۆ ئەوەی هیچ کەس گومان نەبات کە پیاوەکە کەراماتی پێدراوە بۆ ئەوەی پارەکە بەرێت و خەرجی بکات.

(إِبراهیمَ الخُراسانيَّ) دەڵێت: ڕۆژێك پێویستم بە دەستنوێژگرتن هەبوو، لە پڕێکا گۆزەیـەك گەوهەرین و، سیواکێکی زیوینم دۆزیەوە، سەری لە ئاورێشم نەرمتربوو، منیش بە سیواکەکە سیواکم کردو، لە گۆزەکەش دەستنوێژم گرت و، بەجێم هێشتن و، ڕۆشتم.

دەڵێم ـ ابن الجوزي ـ: لە سەندی ئەم باسـەدا کەسـانێك هـەن متمانـە بـە گێڕانـەوەیان ناکرێت، بەڵام ئەگەر (صحیح) بێت، ئەوا ئاماژە بـۆ کـەمێتی فیقهـی ئـەم پیـاوە دەکـات، چونکە ئەگەر لە فیقە تێگەشتبا، دەیزانی کە بەکارهێنانی سیواکی زیوین جایز نییـە، بـەڵام لە بەر ئەوەی زانستی کەم بوو، بەکاری هێنا، ئەگەرچی وایزانی کەراماتە، بەڵام خوای تعالی

کەرامات بە کەس نابەخشێ، لەو بوارانەدا کـە لـە ڕووی شـەرعەوە قەدەغـە کـراوە، بـەڵام پێدەچێ شتێکی ناشەرعی بۆ بەدەرخات، بۆ ئەوەی تاقی بکاتەوە.

# ✷ خۆپاراستن لەوەی کە ڕواڵەتی دەرەوەی وات پیشان دەدات کە کەراماتە :

کە ئاقڵ و ژیران توندی سەرلێشێواندنەکانی ئیبلیسیان بۆ دەرکەوت، خەڵکیان ئاگادار دەکردەوە بەوەی کە دورکەونەوە لەو شتانەی کە ڕواڵەتی دەرەوەیان وایان پیشان دەدەن کە کەراماتن، چونکە ترسان لە سەرلێشێواندنەکانی ئیبلیسەوە بێت.

بڕوانن ئاقڵ و ژیران لەم بوارەدا چۆن ڕەفتاریان نواندووە، ئەوە (أَبي الطَّيِّب)ە دەڵێت: گوێبیستی (زَهْرونَ) بووم دەیگوت: لە بیاباندا ڕێم دەکرد، ڕێم لێ ونبوو، باڵندەیەکی سپیم بەدیکرد، پێی گوتم: ئەی (زَهْرونَ) ! ئایا تۆ ڕێت لێ ون بووە ؟ گوتم: ئەی شەیتان ! کەسێکی دیکە فریودە. دیسان پێی گوتم: ئایا تۆ ڕێت لێ ون بووە ؟ گوتم: ئەی شەیتان ! کەسێکی دیکە فریودە، بۆ جاری سێ یەم بازی دایە سەر شانم و، گوتی: من شەیتان نیم، تۆ ڕێت لێ ون بووە، بۆ لای تۆ نێردراوم، پاشان لێم دورکەوتەوە !

لە (زُلْفی)وە دەڵێت: بە (رابِعَةَ العدويَّةِ)م(٧٠٦) گوت: پورە گیان ئەوە بۆ مۆڵەتی خەڵکی نادەیت دیدەنیت بکەن ؟ ئەویش گوتی: ئومێدەواری چ شتێك بم لە خەڵك: هەرکات دیدەنیم بکەن، شتانێکم لێ دەگێڕنەوە کە ئەنجامم نەدابێ، پێم گەشتووە سەبارەت بە من گوتویانە: کە گوایە من لە ژێر بەرماڵەکەمدا دیرهەم دەدۆزمەوە، وە بەبێ ئاگر مەنجلی چێشتەکەم بۆ دەکوڵێنرێت، بەڵام دڵنیابە ئەگەر شتانێکی وەکو ئەمانەم بدیایە دەتۆقیم.

دەڵێت: پێم گوت: خەڵك زۆر باسی تۆ دەکەن و، دەڵێن: (رابِعَةَ) لە ماڵەکەی خۆیدا خواردن و خواردنەوەی پێ دەدرێت، ئایا هیچ شتێکت لەوانە بەدیکردووە. گوتی: کچی برام !

---

٧٠٦ _ أختلفتْ فيها الأقوالُ، فانظر: ((سير أعلام النبلاء)) (٨ / ٢١٥ _ ٢١٧) و ((البداية والنهاية)) (١٠ / ١٨٦ _ ١٨٧).

فحبَّذا لو جَرَّد بعضُ طلبةِ العلمِ قلَمَهُ " جمعاً و تحريراً ودراسةً لأقوالها، وما قيلَ فيها. وللمصنفِ جزءٌ مفردٌ في حياتها " كما ذكره الذهبيُّ.

ئەگەر لە ماڵەکەمدا شتێك وەکو ئەوانە ببینم، هەرگیز دەستی لێ نادەم و، دەستیشی ناخەمە سەر.

لە (زُلْفی)وە دەڵێت: لە ڕۆژێك زۆر سەرمادا (رابِعَةَ) بەڕۆژوو بوو، (رابِعَةَ) دەیگوت: بۆیە نەفسم تامەزرۆی شتێك لە خواردنی گەرمی دەکرد بۆ ئەوەی فتاری لە سەر بکەم، هەندێك بەزیشم هەبوو، گوتم: ئەگەر پیاز یاخود کەوەرم هەبوایە چاکم دەکرد، تەماشام کرد چولکەیەك هات و پیازێکی بە دەنوکەوە بوو، بۆی خستمە خوارەوە، کە ئەوەم بەدیکرد، وازم لە چێشتەکەم هیناو، ترسام لە شەیتانەوە بێت.

لە (محمدِ)ی کوڕی (یزیدَ)ەوە دەڵێت: خەڵکی وایان بەبیردا دەهات کە (وُهَیبِ) لە ئەهلی بەهەشت بێ، بەڵام ئەگەر ئەو شتەیان پێ بگوتایە، زۆر دەگریاو، دەیگوت: بەڕاستی دەترسم ئەمە لە شەیتانەوە بێت.

## * رەخنەگرتن لە رێبازی صوفیەکان لە (الشَّطحِ)و بانگەشەکردندا:

ئیبلیس سەری لە تاقمێك لە پاشینان شێواندو، هەستان بە دانانی چیرۆك سەبارەت بە کەراماتی ئەولیا، بە بانگەشەی خۆیان بۆ ئەوەی کاروباری قەومەکە بەرز بنوێنن، بەڵام هەق پێویستی بەوە نییە کە بە شتی پووچ بەرز بنوێنرێت، بۆیە خوای تعالی بە زانایانی بڕواپێکراو کاروباری ئاشکراکردن:

لە (سَهْلِ)ی کوڕی (عبدِاللهِ)وە دەڵێت: هاوەڵێتی پیاوێك لە وەلیەکانی خوام کرد، لە رێگەدا بەرەو مەککەی پیرۆز، سێ رۆژ هیچی پێ نەبوو بیخوات، بۆیە لایدایە مزگەوتێك کە لە چیایەکدا دروست کرابوو، بیرێکی تێدا بوو کە خولخولۆکەیەك و حەبلێك و سەتڵێکی بەسەرەوەبوو، دارهەنارێکیش لە نزیکی بیرەکەوە بوو، هیچ بەرێکی پێوە نەبوو، تاوەکو مەغریب لە مزگەوتەکەدا ماینەوە، نزیك بە کاتی نوێژ چل پیاو هاتنە مزگەوتەکەوە کە پۆشاکی خوریان پۆشیبوو، نەعلانێکیشیان لە پێ کردبوو کە لە گەڵاو پەلکی دارەخورما دروست کرابوو، سڵاویان کردو، یەکێکیان بانگی فەرموو، ئیقامەی نوێژەکەی کردو، پێشیان کەوت و، نوێژی پێکردن، کە سڵاوی نوێژەکەی دایەوە، چوونە لای داهەنارەکە، کە چل هەناری تەڕی پاراوی پێوە بوو، هەر کەسێکیان هەنارێکی بردو، رۆشت.

دەڵێت: لە سەر برسێتی و نەبونیەکەی خۆم مامەوە، بۆ جارێکی تر کە هەمان کاتی بردنی هەنارەکان بوو، دیسان گەڕانەوە، کە نوێژیان کردو هەنارەکانیان برد، گوتم: ئەی قەومەکە ! من لە ئیسلامدا براتانم و، برسێتی و نەبونیەکی زۆر ڕووی تێ کردووم، نە قسەتان لە گەڵ کردم و، نە یارمەتیدان دام ! سەرۆکەکەیان پێی گوتم: ئێمە قسە لە گەڵ کەسێکدا ناکەین کە مەحجوب و ڕووپۆشراو بێت بە هۆی ئەو شتانەوە کە پێیەتی، بۆیە بچۆ، هەموو ئەو شتانەی کە پێتە لە پشت ئەم چیاوە فڕێی بدە نێو دۆڵەکەوە، ئینجا بگەڕێرەوە بۆ لامان، تا ئەوەت دەستکەوێت کە دەستی ئێمە کەوتووە.

دەڵێت: بەچیاکەدا سەرکەوتم، بەڵام نەفسم ڕێگەی نەدام کە شتەکانم فڕێدەم، بۆیە خستمە نێو چاڵێکەوەو ، گەڕامەوە، پێی گوتم: شتەکانی خۆتت فڕێدا ؟ گوتم: بەڵێ. گوتی: ئایا هیچ شتێکت بینی ؟ گوتم: نەخێر. گوتی: کەوابوو هیچ شتێکت فڕێ نەداوە ! بۆیە جارێکی تر بگەڕێرەوەو هەموو شتەکانت فڕێ بدە نێو دۆڵەکەوە .

ئەوەبوو دیسان گەڕامەوەو، هەموو شتەکانم فڕێ دا، تەماشام کرد نورو ڕووناکی ویلایەت دایپۆشیم، کە گەڕامەوە، تەماشام کرد درەختەکە هەنارێکی پێوەیە، خواردم و، ئیتر بەو شتە کەمە بەرگەی برسێتی و تینویەتیم گرت، ماوەیەکی زۆر نەبوو کە بە مەککە گەشتبووم، چل پیاوەکەم لە نێوان زەزەم و مەقامدا چاوپێکەوت، هەموویان هاتنە لام و لە باروحاڵیان دەپرسیم و، سڵاویان لێ دەکردم، منیش گوتم: بەڕاستی لە کۆتادا پێویستی منی بە ئێوەو، قسەی ئێوە نەهێڵا، وەکو چۆن خوای تعالی پێویستی ئێوەی بە قسەکردن لە گەڵ مندا نەهێڵا یەکەم جار، دڵنیابن لە دڵی مندا جێگەی هیچ کەسێکی تر نییە جگە لە خوای تعالی.

نووسەر دەفەرمێت:

(عَمرو)ی کوڕی (واصِل) لە سەنەدی ئەم چیرۆکەدایە، کە (ابنُ أَبي حاتِم) بە (ضعیف)ی داناوە، (الآدميُّ)و باپیشی نەناسراون.

ئەو شتەی کە ئاماژە بۆ (موضوع)یی ئەم چیرۆکە دەکات ئەوەیە کە پێیان گوتوە: ((اطْرَحْ ما معكَ)) واتە هەستە بە فڕێدانی هەموو ئەو شتانەی کە پێتە، ئەگەر بەڕاستی ئەولیای خوا بوایەن ئەویان پێ نەدەگوت، چونکە ئەولیای خوا سەرپێچی شەرع ناکەن، شەرعیش بە فیڕۆدانی ماڵ و سامانی قەدەغە کردووە.

کە دەڵێت: ((غَشِيَني نورُ الولايةِ) واتە نورو ڕووناکی ولایەت دایپۆشیم و بوم بە وەلی خوا، قسەیەکی هەڵبەستراوەو، باسێکی هیچ و پوچە، کە هەر کەسێك بۆنی زانستی کردبێ فریوی پێ ناخوات و، لە ڕاستیدا تەنها نەفامەکان فریوی پێ دەخۆن، کە هیچ زرنگی و کارامەییەکیان نییە.

لە (عبدالعزیز البغدادیّ)وە دەڵێت: زۆر تەماشای چیرۆکی صوفیەکانم دەکرد، ڕۆژێك چوومە سەربانیماڵەوە، گوێبیستی کەسێك بووم دەیگوت: ﴿ وهو يَتَوَلَّى الصَّالِحِينَ﴾ ﴿الأعراف: ١٩٦ ﴾ واتە وە هەر ئەویش پشتیوانی چاکەکاران دەکات(٧٠٧)، کە ئاوڕم دایەوە، هیچ شتێکم نەبینی، بۆیە لە سەربانەوە خۆمم فڕێدایە خوارەوە، ئەوەبوو بەهەواوە وەستام !!

دەڵێم _ ابن الجوزي _: ئەمە قسەیەکی مەحاڵ و درۆیە، هیچ کەس گومانی لە درۆبونیدا نییە، لە حاڵەتێکدا ئەگەر واش دابنێین ڕاستە، ئەوا ئەو کارە پێچەوانەی شەرعە چونکە خۆ فڕێدان لە سەربانەوە حەرامە، ئەو بۆچونەشی زۆر پوچە، کە گوایە خوای تعالی یارمەتی ئەو کەسانە دەدات، کە کارێکی حەرام و قەدەغەکراو ئەنجام دەدەن، بەڕاستی خوای تعالی دەفەرمێت: ﴿ولا تُلْقُوا بأيْديكُمْ إلى التَّهْلُكَةِ﴾ ﴿البقرة: ١٩٥﴾ واتە وە بەدەستی خۆتان خۆتان مەخەنە تیاچونەوە(٧٠٨)، باشە چۆن دەبێتە وەلی و چاکەکار لە کاتێکدا سەرپێچی فەرمانی پەروەردگاری دەکات ؟! با وا دابنێین ئەو بوە بە ولی و چاکەکار، باشە چ کەسێك پێی ڕاگەیاندو دڵنیای کردەوە کە یەکێکە لە ئەوان(٧٠٩).

کەسانێکی بێشومار بە نهێنیەوە چوونە نێو صوفیەکانەوەو، خویان بە صوفیەکان چواندوو، قسەی هەڵەت و پەڵەت و پوچیان لە بواری کەرامات و بانگەشەکردنیدا بڵاو

---

٧٠٧ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

٧٠٨ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

٧٠٩ _ با گوفتاری ئەم ئیمامە چارەسەرێك بێت بۆ گوفتاری زۆرێك لەو بەڕێزانەی کە بیستومانە ((کتێبیان داناوە)) سەبارەت بە جێگیرکردنی کەرامات بۆ هەندێ لەو تایەفە ئیسلامیانەی کە بەرامبەر بە دوژمنانی خوای تعالی دەجەنگن، ئەو بەڕێزانە سەرەڕای جێگیرکردنی کەرامات، ئەوەیان بە هێماو نیشانەیەك داناوە کە لە لایەن خوای تعالاوە بە ئەوان درابێت !!

بۆیە پێویستە فراوانی نەدەین بە زیاتر باسکردنی شتانێکی وەکو ئەمە، لە بەر ئەو ڕووانەی کە پێشەوا _ ابن الجوزي _ باسی کردووە، سەرەڕای کەسانی دیکەی جگە لە ئەویش، کە بەلای هیچ کەسێکەوە شاراوە نییە.

دەکـردەوە، بـۆ کەسـانی ئاسـایی درۆ و دەلەسـەیەکی زۆریـان بەدەردەخـست و، دڵـی پـێ ڕاوەدەکردن.

دەگێڕنەوە (الحلّاج) نان و گۆشـتی بـرژاو و حـەلوای لـە شـوێنێکی بیابانـدا دەشـاردەوە، کەسێك لە هاوەڵانی تایبەتی خۆشی لەو کارە ئاگادار دەکردەوە، ئەگـەر ڕۆژ بوایەتـەوە، بـە هاوەڵانی دەگوت: ئەگەر پێتان باشە بـۆ گەشـتێك دەچـینە دەرەوە، بۆیـە هەڵدەسـتاو ڕێـی دەکردو، خەڵکیشیی بـەدواوە بـوو، هـەرکات بـە شـوێنی دیـاریکراو بگەشـتنایە، هاوەڵـە تایبەتەکەی خۆی کە قسەکەی لا باس کردبوو بە (الحلّاج)ی دەگوت: حەزمان بەوەو بەوەیـە ، (الحلّاج)یش بەجێی دەهێشتن و، بەتەنها بۆ ئەو شوێنە دەچوو و، دوو ڕکـات نوێـژی دەکـردو، نان و گۆشت و حەلواکەی بۆ دەهێنان !

(الحلّـاج) دەستی بۆ هەوا درێژ دەکردو، زێڕی بـۆ نێـو دەسـتی خـەڵك فـڕێ دەدا، وە درۆ دەلەسەی دەکرد!

ڕۆژێك کەسێك لە ئامادەبووان پێی گوت: ئەم دیرهەمانە ناسراون، بەڵام بڕوات پێ دەکەم ئەگەر دیرهەمێکم بەیتێ ناوی خۆت و بابتی لە سەر نوسرابێ !

ئیتر لە درۆ دەلەسەکردندا بەردەوام بوو تا کاتی کوشتنەکەی.

(أبي عَمْرو)ی کوڕی (حَيْوَة)ەوە دەڵێت: کاتێ (الحلّاج) بۆ شـوێنی کوشـتنەکەی دەرکرایـە دەرەوە، منیش لە گەڵ کۆمەڵی خەڵکدا بۆ بینینی چووم، بەردەوام بەربەرەکانێی خەڵکم کـرد تاوەکو بینیم، بەهاوەڵانی خۆی گوت: ئەم شتە با نەتانترسێنێت، من پاش سیی ڕۆژی تـر بـۆ لاتان دەگەڕێمەوە !

بیروباوەڕی (الحلّاج) بیروباوەڕێکی پووچ و ناشیرین بوو، لە سەرەتای ئەم کتێبەدا شتێکمان لە بیروباوەڕو قسە هەڵەت و پەڵەتەکانیمان بۆ باس کردن، ڕووغان کردەوە کە بە پێی فـەتوای زانایانی فیقهزانی هاوچەرخی خۆی کوژرا.

کەسانێکیش لە پاشینان جەستەی خۆی بە ڕۆنی (الطَّلْقِ)(٧١٠) چەور دەکردو، لە نێو ئاگردا دادەنیشت و، وایان بۆ خەڵك بەدەردەخست کە کەراماتیان بۆ هاتووە !

لە ڕاستیدا شتانێکی وەکو ئەمانەم بۆ باس کردن تەنها بۆ ئەوەی ئاگاداربن کە ئەم تایەفە بەرز بونەوە بۆ ڕادەی بە ئاین یاری کردن، باشە ئیتر چۆن شەریعەتی ڕاست و پاك بمێنێت لە گەڵ ئەم بارو حاڵەد

٧١٠ _ دُهْنِ الطَّلْقِ: ڕۆنێك بوو لە درەختێك دەردەهێنرا کە لە قامیش دەچوو، ئەو درەختە نەدەسوتا تا ئەو ئاستەی پلێتەی چراکانیان لەوە دروست دەکرد، بڕوانە: القزويني: أثار العباد وأخبار البلاد، وەرگێڕ.

# بەشی دوازدەیەم

## سەبارەت بە سەرلێشێواندنەکانی ئیبلیس بەرامبەر بە ڕەمەکی خەڵك

پێشتر ڕوونمان کردەوە کەوا ئیبلیس سەرلێشێواندنەکانی بەهێز دەبێ بە گوێرەی ئاستی بەهێزبوونی نەفامیی خەڵك، بەراستی ئیبلیس جۆراوجۆرێتی داوە بەشێوازەکانی گومڕاکردنی ڕەمەکی خەڵك.

باسکردنی هەموو ئەو شێوازانەی کە ئیبلیس بەکاری هێناوە بۆ گومراکردن و سەرلێشێواندنی خەڵك ئاستەمە، چونکە زۆر زۆرن، لە ڕاستیدا تەنها شتە سەرەکیەکان باس دەکەین، بۆ ئەوەی بکرێ بە ڕێنوێنك بۆ زانینی سەرلێشێواندنە هاوڕەگەزەکانی خۆی، واللە الموفّقُ.

لەو شێوازانە، دەبینی ئیبلیس دەچێتە لای کەسێکی ئاسایی و، هانی دەدا بۆ ئەوەی بیر لە زاتی خوای _ عزَّوجلَّ _و سیفاتەکانی بکاتەوە، ئیتر کەسەکە تووشی گومان دەبێ.

پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ هەواڵی ئەو شتەی پێداوین:

عن أَبي هريرةَ قالَ: قالَ رسولُ اللهِ _ صلى الله عليه وسلم _: ((إِنَّ الشَّيْطَانَ يَأْتِي أَحَدَكُمْ، فَيَقُولُ: مَنْ خَلَقَكَ ؟ فَيَقُولُ: اللَّهُ. فَيَقُولُ: مَنْ خَلَقَ السَّماواتِ والأرضَ ؟ فيقولُ: اللَّهَ ؟ فيقولُ: مَن خَلَقَ اللهُ ؟! فَإِذَا وَجَدَ أَحَدُكُمْ شيئاً منْ ذَلِكَ فَلْيَقُلْ: آمَنْتُ بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ))(٧١١).

واتە لە (أَبي هُريرةَ)ەوە _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ فەرمووی: ((بەڕاستی شەیتان دێتە لای کەسێکتان و، دەڵێت: کێ خەڵقی کردووی ؟ ئەویش دەڵێت: خوا. دیسان پێی دەڵێت: کێ ئاسمانەکان و زەمینی خولقاندووە ؟ دەڵێت: خوا. ئینجا پێی دەڵێت: ئەی باشە کێ خوای خولقاندووە ؟! بۆیە هەر کەسێکتان هەستی بە شتێك لەوانە کرد، با بڵێت: بڕوام بە خواو پێغەمبەرەکەی هێناوە)).

٧١١ _ رواه مسلم (رقم ١١٣).

دەڵێم _ ابن الجوزي _: لە ڕاستیدا ئەم دەدەسەری و مەینەتیە ڕوودەدات، چونکە هەستە کە بەتەنها بەسەر مرۆڤدا زاڵ دەبێ و، تەماشای هەموو شتێك دەکات دروستکراوە، بۆیە پێدەچێ بە قسەکانی شەیتان فریو بخوات، بەڵام بەم کەسە ئاساییە دەگوترێت: ئەی باشە نەتزانیوە ئەو زاتە زەمەن و کاتی لە زمەن وکاتدا دروست نەکردوە، وە شوێن و مەکانیشی لە شوێن و مەکاندا دروست نەکردووە، ئەگەر ئەم زەمینەو ئەوەی بەسەر زەمینەوەیە لە شوێن و مەکاندا نەبێ و، بەسەر هیچ شتێکیشەوە دانەنرابێت _ بەدڵنیایی هەستت لەمە هەڵدێت و باوەڕی پێ ناکات، چونکە هەر شتێك کە تۆ تەماشای دەکەی لە شوێن و مەکانێکدایە _ ئەوا بەهەستە ئاسایەکانی مرۆڤ داوای ناسینی زاتێك ناکرێت کە بەهەست ناناسرێت، وە لەم بارەوە زیاتر بە ئەقڵ و ژیریت ڕاوێژ بکە، چونکە ڕاوێژکاریکی چاکە.

جار بە جاریش ئیبلیس لە بەشی سیفاتەکانی خوای _ عزَّوجلَّ _دا سەر لە کەسانی ئاسایی دەشێوێنێت، بۆیە تەماشای ڕەمەکی خەڵك دەکەی کاتێك باسی سیفاتی خوایان بۆ دەکرێت، یەکسەر وای بۆ دەچن کە وەکو سیفاتەکانی ئادەمیزاد بێت، ئەمەش حەرامەو، پێی دەگوترێت (التشبيهَ)(٧١٢) واتە چواندن.

---

٧١٢ _ (الصواب في باب أسماء الله وصفاته _ سبحانه وتعالى _ الإيمان المُطلَق بها وبمعانيها وَفْقَ ما يليق بالله _ سبحانه وتعالى _ دونما تأويل يخرجها عن ظاهرها، ويعطِّل المعنى الحقيقي لها، ودونما تشبيهٍ يجعل الخالق كالمخلوق !) واتە (ڕاست لە بەشی ناو و سیفاتەکانی خوای _ سبحانه وتعالى _دا بڕوابوونی یەکلاکەرەوەیە بە ناو و سیفاتو ماناکانیان بە گوێرەی ئەوەی کە شایستەیە بە خوای _ سبحانه وتعالى_ بەبێ هیچ لێکدانەوەیەك کە لە مانا دیارو ئاشکراکانیان بیباتە دەرەوە، وە مانا هەقیقەت و ڕاستەکەی پەك بخات، وە بەبێ هیچ چواندنێك کە تیایدا خوای خولقێنەر بە مەخلوقاتی خۆی بچوێنرێت!)).

(والحقّ: إثبات بلا تشبيه، وتنزيه بلا تعطيل).

واتە هەق بۆ ناو و سیفاتەکان: جێگیرکردنیانە بەبێ چواندن و، دوورکردنە لە کەم و کوڕی بەبێ پەکخستن.

پێشەوا (ابن الجوزي) _ بەڕەحمەتی خوا بێت _ لە بەشی سیفاتدا وتەیەکی خۆشی هەیە، لە کۆتایی کتێبی ((مجالس المتشابه من الآيات القرآنية)) (ص١٦) فەرموویەتی:

((ئەو کەسەی دەڵێت: من باوەڕم بە چواندن و تأویل نی یە، بەڕاستی ڕێگەی سەرفەرازی گرتۆتە بەر)).

پێدەچێ ئەمە کۆتا گوتەکانی بیت لەم بوارەدا.

جار به جاریش لەو بوارەوە سەریان لێدەشێوێنێت کەوا بۆ ڕێباوەڕو بیرو بۆچوونێکی تایبەت دەمارگیریان هەبێ، تەماشا دەکەی کەسی ئاسایی نەفرەت دەکاو شەڕ دەکا بۆ بەرگریکردن لە شتێك کە هەقیقەتەکەی نازانێ، بۆیە کەسانێك دەمارگیریەکانیان بە پێشەوا (أبابكرِ)ەوە _ خوای لێ ڕازی بێت _ تایبەت دەکەن، کەچی کەسانێکی دیکەش دەمارگیریەکانیان بە پێشەوا (علي)کوڕی (أبي طالب)ەوە _ خوای لێ ڕازی بێت _ تایبەت دەکەن ! دڵنیابن چەندین جەنگ بەهۆی ئەم شتەوە ڕوویداوە !

ئەو شەڕانەی کە لە نێوان دانیشتوانی گەڕکی (الكَرْخ) و گەڕەکی (باب البصرة) لە بەغدادا ڕوویان داوە، نموونەی ئەو دەمارگیریەن، کە چەندەها ساڵ ئەو شتە دوبارە دەبویەوەو، ئەمەندە کوشتن و سوتاندنی دوکان و ماڵانی لێ دەکەوتەوە، کە باسکردنیان درێژە دەکێشێت.

لە لایەکی دیکەشەوە تەماشا دەکەی زۆرێك لەو کەسانەی لەم بارەوە بە شەڕ دێن و جنێو دەدەن، ئاورێشم دەپۆشن و، مەی دەخۆنەوەو ، نەفس دەکوژن و، (أبابكرِ) و (علي)یش لێیان بەرین.

بەڕاستی لەوانەیە کەسی ئاسایی هەست بە جۆرە تێگەشتنێك لە نەفسی خۆیدا بکات، بۆیە ئیبلیس فریوی دەدا بۆ دژایەتیکردنی خوای تعالی، کەسی وا دەبینی دەڵێت: بۆچی قەزا دەکاو سزا دەدا ؟ کەسی واش دەبینی دەڵێت: بۆ ڕۆزی کەسی خواپەست و لە خواترسی کەم کردۆتەوەو، هی کەسی یاخی بووی فراوان کردووە؟

تایەفەی واش هەن بۆ نیعمەتەکان سوپاسگوزاری دەکەن، بەڵام ئەگەر بەڵاو کارەسات ڕووی تێکردن ڕەخنە دەگرن و، کوفر دەکەن.

لە ئەوانە کەسانێك هەن مەقصودو مەبەستیان شێواوە، یاخود بە شتێك تاقی دەکرێنەوە، ئیتر کوفر دەکەن و، دەڵێن: من نامەوێ نوێژ بکەم.

یاخود پێدەچێ کەسێکی گاوری خراپـەکار بەســەر موســڵمانێکدا زاڵ بــێ و، بیکوژێـت، یاخود تەنها لێی بدات، ئیتر کەسی ئاسایی دەڵێت: بەڕاستی خـاچ ســەرکەوت، کـەوابوو بـۆ نوێژ بکەین ئەگەر شتەکە ئاوەها بێت ؟

هەموو ئەم بەڵاو کارەساتە ئیبلیس بەسەریدا زاڵ کردوون، چونکە لە زانست و زانایانەوە بەدوورن، بەڵام ئەگەر لە زانایانیان بپرسـیبا، بـەدڵنیایی پێیـان ڕادەگەیانـدن کـە خـوای _ عزَّوجلَّ _ حەکیم و مالکەو، ئیتر هیچ ڕەخنەیەکیش نەدەما.

## ✸ سەرلێشێواندنەکانی ئیبلیس بەرامبەر بە خەڵکی ئاسایی لە بواری فەتوادا :

کەسی وا لە خەڵکی ئاسایی دەبینی لە ئەقڵی خۆی ڕازی دەبێ و، ئیتر گوێ نادات و سەرپێچی زانایان دەکات، بۆیە هەرکات فەتوای زانایان پێچەوانەی مەبەستی ئەو بوو، دەست بە وەڵامدانەوەیان دەکات و، بەدگۆیان دەکات.

بەڕاستی (ابنُ عقيلٍ) دەیگوت: هەموو ئەو ساڵانەی ژیانم کە بەسەر بردووە، ئەگەر دەستکاری پیشەی پیشەسازێکم کردبێ، بەدڵنیایی دەیگوت: لێت تێکدام. ئەگەر بمگوتبا: من پیاوێکی زانام، بەدڵنیایی پێ دەگوتم: خوای تعالی زانستەکەت فرەبەرەکەتدار بکات، بەڵام ئەمەی من ئیش و کاری تۆ نییە ! ئەگەرچی کارەکەی ئەو شتێکی هەستی بوو، ئەگەر ئەنجامم بدابا، لێی تێدەگەشتم، بەڵام ئەمەی من شتێکی ئەقڵییە، ئەگەر باسی بکەم و فەتوای پێ بدەم، وەرناگیرێت !!

## ✱ سەریان لێدەشێوێنێت بەوەی کە کەسانی خۆ بە زاهیدکار پێشی زانایان دەخەن:

ئیبلیس سەری لێ شێواندوون و وای لێکردوون کە کەسانی خۆ بە زاهیدکار لە زانایان بـە پێشتر دابنێن، بۆیە ئەگەر نەفامترین مـرۆڤ ببیـنن جوبەیـەکی خـوری پۆشـیبێت، ئـیتر بـە گەورەی دادنێن، بەتایبەت ئەگەر سەری دانواندبوو و، دڵکزیان (الخشوع) بۆ بنوێنێت، دەڵێن: ئەم کەسە لە چ ئاستێکی فلان زانادایە ؟ ئەو زانایە داواکاری دونیایـە ! بـەڵام ئـەم زاهیـدە دەنکە ترێیەك یا خورمایەکیش ناخوات، هەرگیز هاوسـەرگیری ناکـات، ئـەم قـسانە دەڵـێن چونکە نەفامن بە فەزڵ و چاکێتی زانایان بەسەر زاهیداندا، وە لە بەر ئەوەی کەسـە خـۆ بـە زاهیدکارانیان لە شەریعەتەکەی (محمد)ی کوڕی (عبدِاللهِ) _ صلی الله علیه وسـلم _ بـەلاوە لە پێشترو پەسەندترە.

لە نیعمەتە چاکەکانی خوای تعالی بەسەر ئەم جۆرە کەسانەوە ئەوەیە کە بـە پێغەمبـەری خوا _ صلی الله علیه وسلم _ نەگەشتن، چونکە ئەگەر چاویان لـێ بوایـە زۆر هاوسـەرگیری دەکات و، گۆشتی مریشك دەخوات و، حەزی بە حەلوایە، لە دڵیاندا بە گەورە دانەدەنرا !

## ✸ له بواری بەدگۆیی زانایاندا سەریان لیٚ دەشێوێنێت:

کەسانی ئاسایی کە تەماشا دەکەن زانایان شتە ڕێپێدراوەکانی شەرع ئەنجام دەدەن، ئیتر بەدگۆیان دەکەن، ئەوەش نەفامیەکی زۆر ناشیرینە.

بەزۆری مەیلی غەریبان دەکەن، ئەوان زانا غەریبەکان لە زانایانی خەڵکی شارەکەی خۆیان پەسەندتر دەکەن کە لە بیرو باوەڕیان شارەزا بوون و، ڕاستیێتی کارەکەیان دەزانن(٧١٣)، مەیلی غەریبانێك دەکەن، کە ڕەنگە سەر بە کۆمەڵی (الباطنيَّة)ش بن.

کەچی لە ڕاستیدا پێویستە نەفسی خۆمان تەنها بەینە دەستی ئەو زانایانەی کە ڕاست و دروستی بیروباوەڕو ڕێگەکانیان تاقیکراوەتەوە.

خوای تعالى دەفەرمێت: ﴿ فإنْ آنَسْتُم مِنْهُمْ رُشْداً فادْفَعوا إِليهِمْ أَموالَهُم ﴾﴿ النساو: ٦﴾ واته ﴿ فإنْ آنَسْتُم ﴾ ئینجا ئەگەر هەستان کرد ﴿ مِنْهُمْ رُشْداً ﴾ لەواندا ژیری (پێگەشتن) هەیە ﴿ فادْفَعوا إِليهِمْ أَموالَهُم ﴾ ئەوە سامان و ماڵەکانیان پیٚ بدەنەوە(٧١٤).

خوای تعالى چاکەو منەتی ناوە بەسەر مرۆڤایەتیدا بەوەی پێغەمبەرێکی بۆ ناردوون، کە بە چاکی بارو حاڵی دەزانن.

لەم بارەوە خوای تعالى دەفەرمێت: ﴿لَقَدْ مَنَّ اللهُ عَلَى الْمُؤمِنِينَ إِذْ بَعَثَ فِيهِمْ رَسُولاً مِنْ أَنْفسِهِم ﴾﴿ آل عمران: ١٦٤ ﴾ واته ﴿ لَقَدْ مَنِّ اللهُ ﴾ سوێندبیٚ بیٚ گومان خوا چاکەو منەتی نا ﴿ عَلَى الْمُؤمِنِينَ ﴾ بەسەر بڕواداراندا ﴿ إِذْ بَعَثَ فِيهِمْ ﴾ کاتیٚ کە ڕەوانەی کرد لە ناویاندا ﴿ رَسُولاً ﴾ پێغەمبەرو نێرراوێك ﴿ مِنْ أَنْفسِهِم ﴾ لە خۆیان(٧١٥).

---

٧١٣ _ ئەمە شتێکە تیایدا ژیاوین و، دەیبینین، فلا حول ولا قوة إلا بالله.

٧١٤ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

٧١٥ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

دیسان خوای تعالی دەفەرمێت: ﴿ يَعْرِفونَهُ كَمَا يَعْرِفونَ أَبْنـاءَهُمْ ﴾﴿ الأنعـام: ٢٠ ﴾ واتـە ﴿يَعْرِفونَـهُ ﴾ ئەم پێغەمبەرە دناسن (کە پێغەمبەری خوایە بەهۆی باسکردنی نیشانەکانی لـە تەورات و ئینجیل دا) ﴿ كَمَا يَعْرِفونَ أَبْناءَهُمْ ﴾ وەك چۆن کوڕەکانیان دەناسن(٧١٦).

٧١٦ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان.

## ✱ بەگەورەدانانی کەسانی خۆ بەزاهیدکار:

کەسانی خۆ بە زاهیدکار چەندین شێوازی جۆراوجۆر بەکاردێنن، بۆ ئەوەی کەسانی ئاسایی بانگەشەکانیان قبوڵ بکەن، ئەگەرچی دەستورە ڕاست و دروستەکانی شەریعەتیش بشکێنن و، لە سنورەکەشی بچنە دەرەوە، بۆیە کەسانی (المُتَنَمِّسَ)(٧١٧) واتە کەسانی بەختگرەوەو بانگەشەکاری غەیب زانیی دەبینی بە کەسی ئاسایی دەڵێت: دوێنێ ئاوەهات کردو، ئاوەهات بەسەردا دێت، ئەم داماوەش بێ چەندوچون باوەڕی پێ دەکات و، دەڵێت: ئەمە بە پێی ئەو بیرو بۆچونە قسە دەکات کە دەکەویتە دڵ و مێشکیەوە، بەڵام نازانێت بانگەشەکردنی غەیب زانی کوفرە.

دوای ئەوەش خەڵکی ئاسایی بەچاوی خۆیان کەسانی بەختگرەوەو بانگەشەکارانی غەیب زانی دەبێن، چەندین کاری نابەجێ ئەنجام دەدەن، وەکو هاوەڵێتی ژنان و، تاکبونەوە لە گەڵیاندا، بەڵام لەوە نکۆڵی ناکەن، چونکە واتێگەشتوون ئەو کەسانە خواپەرستن و باروحاڵیان دراوەتە دەستیان.

---

٧١٧ _ المُتَنَمِّسَ: مەبەستی پێشەوا _ ابن الجوزي _ بەم وشەیە ئەو کەسانەیە کە بانگەشەی زانینی غەیب و بەخت گرتنەوە دەکەن !!

ئەمڕۆ ڕۆژنامەو گۆڤارەکان پڕن لەو بەشە تایبەتانەی کە باسی ((زانینی بەخت)) و ((بورجەکان)) دەکەن، بانگەشەی ئەوەی تێدا دەکەن کە ((غەیب دەردەخەن)) و ((ئاینەدە دەزانن)) ! هەموو خەڵکیش لە تێکڕای تەمەنەکانداو، بە جیاوازی ڕۆشنبیریەکانیانەوە دەیخوێننەوەو، بەبێ چەندو چوون تەسلیمی دەبن و قبوڵی دەکەن، بەتایبەت بە شێوازێکی پێچ پێچۆکەیی دەنوسرێت، کە بۆ هەموو خەڵك و خەم و خەفت و کێشەکانیان سازیارە، بۆیە هەر کەسێك دەیخوێنێتەوە، وادەزانێ جووتی باروحاڵەکەی خۆیەتی !! ئەگەر خوێنەر بورجی هەموو گۆڤارو ڕۆژنامەکان بخوێنێتەوە، دەبینێ دیسان جووتی باروحاڵەکەی خۆیەتی !!
شتانێکی وەکو ئەمە فێڵ و درۆ و جادووە بەڵام بە شێوازێکی نوێ و سەردەمیانە.

## * بەرەڵاکردنی نەفس بۆ سەرپێچیکردن:

لەو هۆیانەی کە ئیبلیس بەکاری دێنێ بۆ سەرلێشێواندنی خەڵکی ئاسایی، بەرەڵاکردنی نەفسیانە بۆ سەرپێچیکردنی پەروەردگار، ئەگەر سەرزەنشتیش بکرێن، وەکو زەندیقەکان قسە دەکەن:

کەسانێکیان دەڵێن: واز لە ئارەزوواتێکی دونیایی ناهێنم کە چێژو لەزەتەکەی بە مۆڵی وەردەگرم لە بەر نیعمەتگەلێکی ڕۆژی قیامەت کە خۆشیەکی دواخراوی هەیە.

بەڵام ئەگەر تێگەشتنایە، بەدڵنیایی دەیانزانی چێژو لەزەتی ئارەزوواتی دونیایی مۆڵ نییەو پەشیمانی بەدواوەیە، چونکە حەرامە.

پاشان ئەگەر هەقیقەتی ئیمانیان بزانیبا، دەیانزانی خۆشی و لەزەتەکانی ڕۆژی قیامەت پەیمانێکی ڕاستە لە لایەن خوای پەروەردگارەوەو ناشکێنرێت.

کەسانێکیشیان دەڵێن: پەروەردگار بەخشندەیەو، لێبوردنیشی فراوانەو، ئومێدەواریش (الرجاء) بەشێکە لە ئاین.

ئاوات بۆ خواستن و لە خۆباییبونی خۆیان بە ئومێدبوون ناودەبەن، دڵنیابن هەر ئەمەشە کە تێکڕای تاوانبارانی فەوتاندووە.

(أبوعَمْرو)ی کوڕی (العلاء) دەڵێت: هەواڵم پێگەشتووە کەوا (الفَرَزْدَق) لە گەڵ کۆمەڵە کەسێکدا دانیشت کە ڕەحمەت و بەزەیی پەروەردگاریان یاد دەکردەوە، (الفَرَزْدَق) لە هەموویان زیاتر ئومێدی بە ڕەحمەت و بەزەیی خوا بوو. پێیان گوت: کەوابوو بۆ بوهتانی داوێن پیسی بۆ ئافرەتانی داوێن پاکی بێ ئاگای ئیماندار دەکەی ؟ ئەویش گوتی: باشە ئێوە پێم ڕاگەیەنن ئەگەر من بەرامبەر بە بابم و دایکم هەمان ئەو تاوان و سەرپێچیانە ئەنجام بدەم کە بەرامبەر بە خوای تعالای ئەنجام دەدەم، بە بۆچونی ئێوە پێیان خۆش بوو من فرێدەنە نێو تەنورێکەوە کە لە ئاگری گەش پڕ بوایە ؟ گوتیان: نەخێر، لە ڕاستیدا ئەوان تەنها بەزەیان بەتۆدا دەهاتەوە. گوتی: دڵنیابن من لەوەش زیاتر متمانەم بە ڕەحمەت و بەزەیی پەروەردگارمە.

دەڵێم _ ابن الجوزي _: ئا ئەمە نەفامایەکی پوختە، چونکە ڕەحمەت و بەزەیی خوای _ عزَّوجلَّ _ بە تەبیعەت ناسکیی نییە، ئەگەر بەو شێوە بوایە، تەنانەت چۆلەکەش سەرنەدەبڕدراو، مەنداڵێکیش نەدەمرێنراو، کەسیش نەدەخرایە دۆزەخەوە.

لە (عَبَّادٍ)ەوە دەڵێت: (الأصمَعيُّ) دەڵێت: لە گەڵ (أبي نوَاسٍ)دا بووم لە مەککەی پیرۆز، لە پڕێکا لاوێکی لووسکەی بێ تووکم بەدیکرد کە دەیەویست (الحَجَرَ الأسْوَدَ)ی ماچ بکات، (أبي نوَاسٍ) پێی گوتم: سوێند بەخوا دورناکەومەوە تا لای (الحَجَرَ الأسْوَدَ) ماچی دەکەم. منیش گوتم: (وَيْل) بۆ تۆ ! لە خوای _ عزَّوجلَّ _ بترسە، تۆ لە (البَلَدِ الحرامِ)و لە (البيتِ الحرام)دای. بەڵام گوتی: دەبێ هەر بیکەم. پاشان لە (الحَجَرَ الأسْوَدَ) نزیك بۆوەو، لاوەکەش هات (الحَجَرَ الأسْوَدَ) ماچ بکات، بەڵام (أبي نوَاسٍ) دەستپێشخەری کردو، ڕوومەتی خستەسەر ڕوومەتی لاوەکەو، ماچی کردو، منیش تەماشام دەکرد، گوتم: (وَيْل) بۆ تۆ ! ئەی بۆ لە حەرەمی خوای _ عزَّوجلَّ _دا ئەوە دەکەی. گوتی: واز لەوە بێنە، چونکە پەروەردگارم بە بەزەیە، پاشان ئەم شیعرەی خوێندەوە:

وعَاشِقَــانِ التَفَّ خَدَّاهُما  عند استِلامِ الحَجَرِ الأسْوَدِ
فاشْتَفَيا مِن غَيْرِ أنْ يَأثَما  كأنَّمـا كانَـا على مَوْعِدِ

واتە:

ئەو دوو عاشیقەی ڕوومەتیـــان لێك ئاڵا  لە کاتی ماچکردنی بەردە ڕەشەکەدا
بە ئاواتیان گەشتن بەبێ ئەوەی تاوانبار بن  وەکو ئەوەی پەیمانی بەیەك گەشتنیان بەیەك دابێ.

دەڵێم _ ابن الجوزي _: تەماشای ئەم چاونەترسیە بکەن کە چۆن تەماشای ڕەحمەت و بەزەیی خوای تعالی دەکات، بەڵام بیری چۆتەوە کە بەتوندی سزا دەدرێ، بەهۆی شکاندنی سنوری قەدەغەکراوەکانی خواوە.

کەسانێك لە خەڵکی ئاسایی دەڵێت: ئەو زانایانە سنوور دەپارێزن، فڵان زانا ئەو کارە دەکاو، فڵانیش ئەو کارە دەکا، کارەکەی منیش لەو شتانەوە نزیکە!

ئەم سەرلێشێواندنە بەوە دەڕوێنرێتەوە کە هەریەك لە نەفام و زانا لە بەشـی (التکلیـف) واتە سپاندنە شەرعیەکاندا یەکسانن، بۆیە زاڵبوونی هەواو ئـارەزووات بـە سـەر زانـادا، بـۆ کەسانی نەفام نابێتە بەهانەو عوزر (٧١٨)، کەسانێکیشیان دەڵـێن: ئەنـدازەی تـاوانم چـەندە تاوەکو سزا بدرێم ! من کێم تا سزا بدرێم ! لە کاتێکدا نە تاوانم زیانی پـێ دەگەیـەنێ و، نـە گوێڕایەڵیشم سوودی بۆ دەبێ، وە لێبوردنیشی لـە تاوانەکـەی مـن گـەورەترە، شـاعیرێکیان دەڵێت:

مَنْ أنـا عِنْدَ اللهِ حَتَّى إذا أَذْنَبْتُ لا يَغْفِرُ لي ذَنْبِي

واتە:

بۆ من کێم بەلای خواوە تا ئەگەر تاوانم کرد لێم نەبورێت.

ئەمە گێلیەکی گەورەیە، ئەگەر واتێگەشتبن کە خوای تعالی سزای هـیچ کەسـێك نـادات مەگەر دوژمنێك یاخود کەسێك کە شتێکی بە هاوتای خوای تعالی کردبێ.

پاشان نەیانزانیوە بـە هـۆی ئـەو سەرپێـچیانەوە کـە ئـەنجامی دەدەن گەشـتونەتە پلـەی یاخیبوون.

(ابنُ عقیـلٍ) _ بەڕەحمەتی خوا بێت _ گوێبیستی پیاوێك بوو دەیگوت: بۆ مـن کـێم تـا خوای تعالی سزام بات ! ئـەویش پێـی گـوت: تـۆ ئـەو کەسـەی کـە ئەگـەر خـوای تعـالی

---

٧١٨ _ بەڕاستی ئەمە بنەڕەتێکی چاکە بۆ زانینی هەڵەی زۆرێك لە کەسانی ئاسایی ئەم سـەردەمە، بـۆ نموونە ئەگەر حەرامێتی ڕیش تاشینیان بۆ ڕوون بکەیتەوە، پێت دەڵێن: چۆن حەرامە ؟ لە کاتێکـدا شـێخ (...) ڕیشی تاشیوە، یاخود تەنکە ڕیشێکی هەیە (!)، ئایا تۆ لە ئەو زاناتریت ؟!

سوپاس و ستایش بو خوای تعالی بەتەنها، کە تەواوێتی بەڵگـەکانی خـستۆتە نێـو قورئـان و، سـوننەتی پێغەمبەری خواوە _ صلى الله عليه وسلم _، شێخەکان یاخود کەسانی تریش تەنها هۆکارێکن کـە هـەق فێری خەڵك دەکەن و، خەیریان پێ ڕادەگەیەنن.

دڵنیابن تێگەشتنی ئەم مەنهەجیەتە هیچ کەس نایزانێ مەگەر کەسانێك کە دڵی کردبێتەوە بۆ مەنهەجی پێشین چاك و شوێنکەوتووانی.

سەرتاسەری مەخلوقاتی خۆی بمرێنێت و، تەنها تۆ بهێڵێتەوە، ئەوا گوفتاری خوای تعالی: ﴿يا أَيُّها النَّاسُ﴾ پەیامێك دەبێ و ڕاسپاردەیەك دەبێ بۆ تۆ.

کەسانێکیشیان دەڵێن: تەوبە دەکەم و خۆم چاك دەکەم.

چەندین گێل بەهیوای تەوبەکردن بوون، بەڵام پێش تەوبەکردن مردن ڕفاندنی، بەڕاستی ئەوە بەجەرگبوون نییە کە بۆ هەڵەکردن پەلە بکرێت و، بۆ ڕاستی و دروستیش چاوەڕوانی بکرێت، ئینجا پێدەچێ هەرگیز بارودۆخی تەوبەکردنەکە ئامادەنەبێ، پێدەچێ تەوبەکردنەکە ڕاست و دروست نەبێ، پێدەچێ قبوڵ نەکرێت، پاشان ئەگەر قبوڵیش بکرێت، ئەوا هەتا هەتایە تۆ شەرمەزاریت سەبارەت بەو تاوانەی کە ئەنجامت دابوو، بۆیە بەرگەگرتنی ئەنجام نەدانی تاوان و سەرپێچی کردن تا ڕادەبورێت و نامێنێت زۆر لە دەردەسەری تەوبە باشترە تا قبوڵ بکرێت.

کەسانێکیش تەوبە دەکەن، پاشان هەڵیدەوەشێننەوە، بۆیە ئیبلیس بە فێڵ و تەڵەکەکانیەوە بۆیان دەچێتە ژورەوە، چونکە بەلاوازی بڕیاردانەکانیان دەزانێ.

لە (الحَسَنِ)ەوە دەڵێت: هەرکات شەیتان تەماشای کردیت و، تۆ لە خواپەرستی و گوێڕایەڵی خوای تعالادا نەبووی، بەمردوت دادەنێ، وە هەرکات تەماشای کردیت لە سەر خواپەرستی وگوێڕایەڵی بەردەوامیت، لێت بێزار دەبێ و بەجێت دێڵێت، وە هەرکات تەماشای کردیت جارێك ئاوەها و جارێك ئاوەهای، تەماعت تێ دەکات.

## ✸ سه‌ریان لیٚ ده‌شیٚوێنیٚت و وایان لیٚده‌کات به نه‌ژادو بنه‌ماڵه‌کانی خۆیانه‌وه بنازن:

ئیبلیس که ده‌زانیٚ که‌سیٚك نه‌ژاردو بنه‌ماڵه‌یه‌کی ناوداری هه‌یه، سه‌ری لیٚ ده‌شیٚوێنیٚت و، وای لیٚده‌کات به نه‌ژادو بنه‌ماڵه‌که‌ی خۆیه‌وه بنازیٚت(٧١٩)، ده‌ڵیٚت: من له نه‌وه‌ی (أبي بكرٍ)م. که‌سیٚکی تر ده‌ڵیٚت: من له نه‌وه‌ی (عليّ)م. که‌سیٚکی تر ده‌ڵیٚت: من شه‌ریفم له نه‌وه‌ی (الحسنِ) یاخود (الحسينِ)م. یاخود ده‌ڵیٚت: ڕه‌گه‌زو بنه‌ماڵه‌ی من نزیك به فڵان زانا یاخود فڵان زاهیده.

ئه‌م که‌سانه پشتیان به‌دوو شت به‌ستووه:

یه‌که‌میان: ئه‌وان ده‌ڵیٚن: هه‌رکه‌س مرۆڤیٚکی خۆشویست، ئه‌وا منداڵ و که‌سوکاره‌که‌شی خۆش ده‌ویٚت.

دووه‌م: ده‌ڵیٚن: ئه‌وانه توانای شه‌فاعه‌ت و تکاکاریان هه‌یه، شایسته‌ترین که‌سیش که تکاکاری بۆ بکه‌ن نه‌وه‌و که‌سوکاری خۆیانه !

هه‌ردوو بۆچونه‌که‌شیان هه‌ڵه‌یه:

سه‌باره‌ت به خۆشویستن، خۆشه‌ویستی خوای تعالی وه‌کو خۆشه‌ویستی ئاده‌میزاد نییه، چونکه خوای تعالی ئه‌و که‌سانه‌ی خۆش ده‌ویٚت که گوێڕایه‌ڵی ده‌بن، ته‌ماشاکه‌ن ئه‌وانه ئه‌هلی کیتابن که نه‌وه‌ی (یعقوبَ) پیٚغه‌مبه‌رن، که‌چی هیچ سوودیٚکیان له باو باپیرانی خۆیان نه‌دیوه.

---

٧١٩ _ ئیٚمه که‌سیٚکی بیدعه‌کاری گومڕا ده‌ناسین، به ئاشکرا ئه‌هلی سوننه‌ت و بانگه‌وازکارانی ته‌کفیر ده‌کات، به‌ڵام ئه‌گه‌ر له گه‌ڵیدا بدوێی، پاشگه‌ز ده‌بیٚته‌وه، به‌ڵام دیسان بۆ گوفتاری یه‌که‌می ده‌گه‌ڕیٚته‌وه‌و... به‌و شیٚوه‌یه به‌بیٚ هیچ پاساخیٚك یاخود وڕێنه‌یه‌ك... له گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا شانازی ده‌کات و خۆی به گه‌وره داده‌نیٚت و سه‌باره‌ت به نه‌فسی خۆی ده‌ڵیٚت (... القرشي الهاشميّ....) !! به‌ڵام نه‌فامه‌و له ڕیٚی ڕاست لایداوه.

سەبارەت بــە تكاكــاريش، خــواى تعــالى دەفــەرميّت: ﴿ ولا يَـشْفَعونَ إلا لِمَـنِ ارتَـضى﴾ ﴿الأنبياء: ٢٨ ﴾ ﴿ ولا يَشْفَعونَ ﴾ وە (فريشتەكان) تكا ناكەن ﴿ إلا لِمَنِ ارتَـضى ﴾ تەنها بۆ ئەو كەسە نەبىّ (خوا) ڕازى بىّ (تكاى بۆ بكرى)(٧٢٠).

كاتىّ (نـوحٌ) پيّغەمبەر ويستى كوڕەكەى لە كەشتيەكەدا هــەلّبگرىّ، خــواى تعــالى پيّــى فەرموو: ﴿ إنَّهُ ليسَ مِن أهْلِكَ ﴾﴿ هود: ٤٦ ﴾ واتە بەڕاستى ئەو (كەنعانە) لە كەس و كارى تۆ نييە(٧٢١).

وە (إبراهيمُ) پيّغەمبەر بۆ بابى تكاى نەكرد.

هەروەها پيّغەمبەرمان _ صلى الله عليه وسلم _ بۆ دايكى تكاى نەكرد(٧٢٢).

وقد قالَ _ صلى الله عليه وسلم _ لفاطمةَ _ رضي الله عنها _:

((لا أُغني عنكِ مِن اللهِ شيئاً))(٧٢٣) واتە: پيّغەمبەرى خوا _ صلى الله عليه وسلم_ بە (فاطمةٌ)ى كچى _ خواى لىّ ڕازى بيّت _ فەرمووى: ((دلّنيابە ئەگەر ئيمان نەهيّنى هــيچ سووديّكم بۆت نابىّ و، ناتوانم سزاى خوات لە سەر دورخەمەوە)).

---

٧٢٠ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەى تەفسيرى قورئان.

٧٢١ _ مەلا محمد مەلا صالح، پوختەى تەفسيرى قورئان.

٧٢٢ _ انظر ما سبق (ص٤٥٢)، وتعليقي على رسالة (الفارق بين المصنف والسارق)) (ص٥٤) للإمام السيوطي، نشر دار الهجرة _ الدَّمام.

٧٢٣ _ رواه البخاري (٨ / ٣٨٦)، ومسلم (٢٠٦) " عن أبي هُريرة.

## * پشتبەستن بە خەسلەتێکی خەیرو گوێنەدان شتی تر:

ئیبلیس سەریان لێ دەشێوێنێت و کەسانێکیان والێدەکات پشت بە خەسلەتێکی خەیر ببەستێ و، ئیتر گوێ بە ئەنجامدانی هەر کارێکی ناڕەوا نەدات:

بۆیە کەسی وایان تێدایە دەڵێت: من لە ئەهلی سوننەتم و، ئەهلی سوننەتیش لە سەر خەیرن، ئیتر گوێ نادات و خۆی لە هیچ سەرپێچی و تاوانێك لانادات.

بۆ دەرخستن و لادانی ئەم سەرلێشێواندنە دەگوترێت: بیروباوەڕی ڕاست فەرزەو، خۆدورخستنەوە لە سەرپێچی و تاوان فەرزێکی ترە، بۆیە بەجێهێنانی دانەیەکیان جێگەی ئەویتر ناگرێتەوە(٧٢٤)، بەڵکو پێویستە هەردوکیان جێبەجێ بکرێت.

هەروەها (الرافضة)کانیش دەڵێن: ئێمە لە گەڵ بوون و لاینگریمان بۆ (أهل البیت)ی پێغەمبەری خوا _ صلی الله علیه وسلم _ هەموو شتێکمان لێ دوردەخاتەوە.

بەڵام درۆیان کرد، چونکە لە ڕاستیدا تەنها خواپەرستی ڕاست و دروست و لە خوا ترسانە کە بەکاری دورخستنەوە هەڵدەستێت.

---

٧٢٤ _ پێشەوا (ابن تیمیة) لە کتێبی (الاستقامة)دا (١ / ٤٦٦) فەرموویەتی:

((زۆربوونی تاوان لە گەڵ ڕاست و دروستی یەکتاپەرستیدا زۆر خێرەترە لەوەی کە مرۆڤ تاوانی کەم بێت بەڵام یەکتاپەرست نەبێ)).

گومانی تێدا نی یە کە پلەی بیروباوەڕی ڕاست و دروست و یەکتاپەرستی زۆر لە سەرپێچی و تاوان گەورەترە.

## ✱ سەر لە (العَيَّارِينَ)[٧٢٥] دەشێوێنێت و وایان لێ دەکاتماڵی خەڵك بەرن:

ئیبلیس سەری لە (العَيَّـارِينَ) واتە بێکاران شێواندوەو، وای لێکردوون ماڵی خەڵك بـەرن، ئەم تاقمـە بـە (الفِتْيـانِ) واتـە ئامادەباشـان بـۆ بەهاناوەچـوونی لێقـەوماوان نـاودەبرێن و، تاکیشیان بە (الفَتـی) ناودەبرێت، دەڵـێن: (الفَتـی) داوێـن پیـسی ناکـات و، درۆ ناکـات و، ئابڕووی هیچ ئافرەتێك نابات، کەچی لە بردنی ماڵ و سامانی خەڵکدا خۆیان بـەدورناگرن و، جەرگ سوتاندنی خەڵك بۆ ئەو ماڵ و سامانەیان بیردەچێتەوە.

ڕێبازەکەی خۆیان بە (الفُتَوَّةَ)(٧٢٦) واتە ڕێبازی جوامێران بۆ بەهاناوەچـوونی لێقـەوماوان ناودەبەن، پێدەچێ کەسی وایان تێدا بێت سـوێند بـە هـەقی (الفُتَـوَّةَ) بخـوات و (٧٢٧)، ئـیتر نەدەخوات و نەدەخواتەوە.

---

٧٢٥ _ العَيَّارِينَ: واتە بێکاران: لە سەردەمی خەلافەتی عەباسیەکاندا پەیدا بوون، کۆمـەڵێك بـوون لـە نێوەنـدە هەمە جۆرەکانی ڕەمەکی خەڵك، ڕێتێچوتریش ئەوەیە کە زۆربەیان لە هەژاران و نەداران بوون، بەتایبەت ئەوانـەی هەلی کاریان بۆ نەڕەخسابوو، وە ناچاربوون کارگەلێکی ئاناسایی بکەن، وەکو دزینی ماڵ و سامانی دەوڵەمەندان و دابەشکردنی بە سەر هەژاراندا، وە لەکاتی شـڵەژان و خراپبـوونی هـەر بـارێکی سیاسـی یـاخود لاوازی ئیـدارەی دەوڵەتدا زیاتر سەریان هەڵدەدا، بزوتنەوەکەیان تێکڕای چەشنەکانی خەڵك و لاینگرانی ڕێباوەڕەکانی تێدا بوو ، بۆ نمونە دزو شەریف و هەژاران و منـداڵی دەوڵەمەنـدانی لـە خـۆ دەگـرت، سـەرەڕای کـارە نائاسـایەکانیان بـەڵام هەڵوێستی جوامێرانەشیان دەنواند، هەرکات بەغدای پایتـەخت تووشـی مەترسـی هێرشـی دوژمنـان بوایەتـەوە، ئەوەبوو کاتێ (المعتز) و سەرکردە تورکەکانی ئابڵۆقەی بەغدایان دا، ئەمانە هەڵوێستێکی گرنگیان نواندو، پـشتی خەلیفە (المستعین بـالله) گـرت و، بەکۆڵنـەدەری لـە شـاری بەغـدا بـەرگریان کـرد (٢٤٨ _ ٢٥٢ ك)، بڕوانـە: ejabat.google.com، وەرگێڕ.

٧٢٦ _ الفُتَوَّةَ: (ابن بَيْدكين الحنفي) لە بەشی (الفتوَّة)ی کتێبی ((اللمع))دا (ل٥٠٤) دەڵێت:

((ئەو (الفُتَوَّةَ)ی لەم زەمەنەدا دەکرێت بیدعەیەکی زۆر ناشیرینە، کاریکە شـەیتان ڕازی دەکـات و، ڕەحمـان تـووڕە دەکات)).

لە هەمان کتێبدا (ل٥١٢) فەرمایشتێکی پێشەوا (ابن تیمیة)ش هاتووە، تیایدا فەرموویەتی:

((ئەم (الفُتَوَّةَ) بە کۆدەنگی هەموو زانایان پووچەو، هیچ بنەڕەتێکی نی یە...)).

٧٢٧ _ ئەمە سوێندخواردنە شیرکەو، نابێ سوێند بە جگە لە خوای تعالى بخورێت.

تێکڕای ئـەم تاقمـە شـەرواڵ دەپۆشـن و، هەرکەسـێکی تـازە هـاتووش بێتـە ڕیزیانـەوە شەرواڵەکەی بۆ دەپۆشن، وەکـو چـۆن صـوفیەکان پۆشـاکی (المُرَقَّعـةَ) بـۆ موریـدانی خۆیـان دەپۆشن.

کەسانی سەر بەم تاقمە ئەگەر گوێبیستی هەر وشەیەکی تاوان بێت کـە بـە خوشـکەکەی کراوە، یەکسەر خوشکەکەی دەکوژێت، کەچی ئەو وشەیە پێدەچێ ڕاست نـەبێ و، کەسـێکی هاندەری خراپ گوتبێتی، دوای ئەوەش ئەم کارە بە جوامێری ناودەبەن.

## ✸ پشتبەستن بە سوننەت و فەوتاندنی فەرزەكان:

كەسانێك لە خەڵكی ئاسایی پشت بە سوننەتەكان دەبەستن و، فەرزەكان دەفەوتێنن، وەكو ئەوەی كەسانێكیان پیشی بانگدان بۆ مزگەوت دێت و، سوننەت دەكات، ئینجا ئەگەر لە پشتی پێشەواوە نوێژی كرد، پێشی پێشەوا دەكەوێت.

كەسانێكیشیان بۆ نوێژە فەرزەكان ئامادە نابێ، بەڵام لە شەوی (الرغائِب)دا(٧٢٨) پێشبڕكێ دەكات و فشار دەخاتە سەر خەڵك.

كەسانێكیش خواپەرستی دەكات و دەگری، بەڵام لە سەر ئەنجامدانی كاری خراپە بەردەوامەو سوورەو، وازی لێ ناهێنێت، ئەگەر پێشی بگوترێت: ئەو شتە مەكە ! دەڵێت: هیچی تێدا نییە كارێكی چاك و كارێكی خراپە، چاكەكە خراپەكە دەسڕێتەوە، پەروەردگاریش لێبوردەو بەبەزەییە !

جەماوەریشیان بەپێی بیروبۆچونی خۆی خواپەرستی دەكات، بۆیە خراپ دەكات زۆر زیاتر لەوەی كە چاك بكاتەوە.

بۆ نموونە پیاوێكم لەوان بینی قورئانی لەبەر كردبوو، بویوە زاهید، پاشان خۆی خەساندبوو، ئەمە كردەوەیەكی زۆر خراپە.

---

٧٢٨ _ مەبەستی نوێژی (الرغائِب)ە، كە نوێژێكی داهێنراوی بیدعەیەو هیچ بنەڕەتێكی ڕاستی نی یە، پێشەوا (العزّ)ی كوڕی (عبدالسلام) لەكتێبێكی تایبەتدا نكوڵی لێ دەكات و، بیدعەبونەكەی ئاشكرا دەكات.

## ✱ ئامادەبوون لە مەجلیسەکانی یادو زیکردا:

ئیبلیس سەری لە کەسانێکی زۆری خەڵکی ئاسایی شێواندووە، لە مەجلیسەکانی یادو زیکردا ئامادە دەبن و، دەگرین و، تەنها بەوە ڕازی دەبن، چونکە وادەزانن مەبەستی سەرەکی تەنها ئامادەبوون و گریانە، لەبەر ئەوەی پێشتر فەزڵ و چاکەی ئامادەبونیان لە مەجلیسەکانی یادو زیکردا بیستووە، بەڵام لەوە تێنەگشتوون کە مەبەستی سەرەکی بە هەموو ئەوانە کارپێکردنێتی، چونکە شتە بیستراوەکان ئەگەر کاریان پێ نەکرێت، ئەوە تەنها دەبێتە بەڵگەیەك بۆ ئەوەی کە تۆ شتەکەت بیستووەو کارت پێ نەکردووە.

بۆ نموونە من خەڵکێکی زۆر دەناسم، چەندین ساڵە لە مەجلیسەکاندا ئامادە دەبن و، دەگرین و، دڵکزی دەنوێنن و، هیچ کەسێکیشیان گۆڕانکاریان بەسەردا نایەت و، هەمان ئەو مامەڵانە ئەنجام دەدەن کە پێشتر لە سەری ڕاهاتبوون وەکو سوو خواردن و، فێڵکردن لە فرۆشتنداو، نەفامبوون بە پایەکانی نوێژو، غەیبەتکردنی موسڵمانان و، بەگوێنەکردنی دایكو باب!

ئەم کەسانە ئیبلیس سەری لێ شێواندوون و، وای بە خەیاڵدا هێناون کە ئامادەبوون لە مەجلیسەکانداو گریان، تاوانی هەموو ئەو گوناهانەیان لە سەر لادەبات کە ئەنجامی دەدەن.

هەروەها ئیبلیس وای بە خەیاڵی تاقمێکی دیکەدا هێناوە کە دانیشتن لە گەڵ زانایان و پیاوچاکاندا تاوانی گوناهەکانیان لە سەر لادەبات.

لە تەوبەو پەشیمان بونەوەدا ئیبلیس بەکەسانێکی بێشومار ئەمڕۆ و سبەی دەکات، بۆیە دواخستنی تەوبەکەیان زۆر زۆر درێژە دەکێشێت.

کەسانێکی دیکەشی داناوە تەنها بۆ کات ڕابواردن بەوەوە کە دەیبیستن، کەچی کارپێکردنیان فەرامۆش کردووە.

## ✸ ئیبلیس سەر لە خاوەن ماڵ و سامانەکان دەشێوێنێت:

ئیبلیس بە چوار ڕوو سەر لە خاوەن ماڵ و سامانەکان دەشێوێنێت:

یەکەمیان: لە ڕووی پەیداکردنەوە، گرنگی بەوە نادەن کە چۆن چۆنی دەستیان دەکەوێت، سوو خواردن لە زۆربەی مامەڵەکانیاندا بڵاوبۆتەوە، پێی ڕاهاتوون و دڵیان پێ خۆشە، تا ئەو ئاستەی کۆی مەمەڵەکانیان لە سنووری کۆدەنگی زانایان بەدەرە.

دووەم: لە ڕووی دەستقوچاویەوە، کەسی وا دەبینی هەر لە بنەڕەتەوە زکاتی شەرعی ماڵ و سامانەکەی نادات، پشت بە لێبوردنی خوای تعالی دەبەستێ.

کەسی واش دەبینی زکاتی بەشێك لە ماڵ و سامانەکەی دەدات، پاشان پیسکەیی و دەستقوچاوی بەسەردا زاڵ دەبێ، وای بەخەیاڵدا دێت زەکاتی ئەو بەشەی کە داویەتی تاوانی بەشە نەدراوەکانی تری لە سەر لادەدات.

کەسی وا دەبینی فیڵ دەکات بۆ ئەوەی زەکاتەکەی لە سەر بکەوێت، بۆ نموونە پێش ئەوەی ماڵ سامانەکەی ساڵێکی تەواوی بەسەردا تێپەڕێت دەیبەخشێتە کەسێك و، پاشان دوبارە لێی وەردەگرێتەوە !

کەسانێك فیڵ دەکەن بەوەی پۆشاکێك دەبەخشنە هەژارێك و بە دە دیناری دادەنێن، لە کاتێکدا پۆشاکەکە بای دوو دینارە، ئەم نەفامانە وا تێدەگەن زەکاتەکەیان لە سەر کەوتووە.

کەسانێکیش بۆ زەکات دان شتی خراپ لە جێگەی چاك دەردەهێنن.

کەسی وا دەبینی زەکاتەکەی بە کەسێکی کریکار دەدات کە بەدرێژای ساڵ کاری پێکردووە، بۆیە بە هەقیقەت ئەوە دەبێتە کرێکەی نەك زەکات.

کەسانێکیش زەکاتەکانیان بەپێی پێویست و بەڕاست و دروستی دەدەن، بەڵام ئیبلیس پێیان دەڵێت: هیچتان لە سەر نەماوە ! ماڵ و سامانەکانیان بەلاوە خۆشەویست دەکات و، ڕێگریان لێ دەکات وەکو سوننەت خێرو صەدەقەی لێ بکەن، پاداشتی خێرو صەدەقەکەیان لە کیس دەبات، لە ئەنجامیشدا ماڵ و سامانەکەیان بە ڕۆزی کەسێکی تر دەبێ.

سێ یەم: لە ڕوویماڵ و سامان زۆر کردنەوە، دەوڵەمەند خۆی لە هەژاران بە خێرتر دادەنا، ئەمەش نەفامیە ، چونکە چاکێتی بە چاکێتی نەفسە نەك بە کۆکردنەوەی ماڵ و سامان، شاعیرێك دەڵێت:

غِنَى النَّفْسِ لِمَنْ يَعْقِـــلُ خَيْرٌ مِن غِنَــــى المالِ
وفَضْـــلُ النَّفْسِ في الأنْفُـــسِ لَيـــْسَ الفَضْلُ في الحالِ

واتە:

دەوڵەمەندی نەفس بۆ کەسێك ئەقڵی بەکاربێنێت لە دەوڵەمەندی ماڵ و سامان خێرترە
وە چاکێتی نەفس لە نەفسەکاندایە چاکێتی لە باروحاڵدا نییە.

چوارەم: لە خەرجکردنیدا، کەسی وا دەبینی ماڵ و سامانەکەی بە فیڕۆ دەداو، دەست بڵاوی تێدا دەکات:

جار بە جار لە ئەندازەی پێویستی خۆی زیاتر خەرج دەکات، دیوارەکانی پێ دەڕازێنێتەوەو، دەینەخشێنێت، ماڵی پێ جوان دەکاتەوە، وێنەی پێ دروست دەکات.

جار بە جاریش جل و بەرگی نایابی پێ دروست دەکەن، کە لووتبەرزی و لە خۆبایبوون بۆ خاوەنەکەی دروست دەکات.

جار بە جاریش لە خۆراکدا کە دەستبڵاویەکی زۆری تێدا دەکەن.

لە هەموو ئەم کردەوانەدا خاوەنەکەی بێوەی نابێ و، تووشی کردەوەیەکی حەرام یاخود (مکروە) دەبێ، وە بەهۆی ئەنجامدانی ئەو شتانەوە مرۆڤ بەپرسیار دەبێ:

عن أَنَسِ بنِ مالكٍ قالَ: قَالَ رسولُ اللهِ _ صلى الله عليه وسلم: ((يا ابنَ آدَمَ ! لا تَزُولُ قَدَمَاكَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ بينَ يديِ اللهِ _ عزَّوجلَّ _ حَتَّى تُسْأَلَ عَنْ أَربعٍ: عُمُرِكَ " فِيمَا أَفْنَيْتَه ؟ ، وجَسَدِكَ " فِيمَا أَبْلَيْتَهُ ؟ ، وَمَالِكَ " مِنْ أَيْنَ اكْتَسَبْتَهُ ؟ وَأَيْنَ أَنْفَقْتَهُ ؟ ، وعِلْمِكَ " ماذا عَمِلْتَ فِيهِ ؟))(٧٢٩) واتە لە (أَنَسِ)ی کوڕی (مالِكٍ)ەوە _ خوای لێ ڕازی بێت _

---

٧٢٩ _ حديث صحيح، له طرق عديدة، خرَّجتُه في تعليقي على ((جزء ذمّ مَن لا يعمل بعلمه))(رقم ١) للإمام ابن عساكر.

فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا _ صلی الله علیه وسلم _ فەرمووی: ((ئەی ئادەمیزاد ! لە ڕۆژی قیامەتداو لە پێش دەستی خوای _ عزَّوجلَّ _دا پێکانت جوڵە ناکات، تا پرسیاری چوار شتت لێ دەکرێت: تەمەنت، لە چیدا بەسەرت برد ؟ جەستەت، لە چیدا تەواوت کرد، ماڵ و سامانەکەت، لە کوێ دەستت کەوت و ؟، لە چیدا خەرجت کرد ؟ وە زانستەکەت، چ کارێکت پێ کرد)).

کەسی وایان دەبینی پارەیەکی زۆر بۆ دروستکردنی مزگەوت و پرد خەرج دەکات، بەڵام مەبەستی ڕووپامیی و، ناوبانگی و، مانەوەی باسکردنێتی، بۆیە ناوی خۆی لە سەر ئەو شتانە دەنوسێ کە دروستی دەکات، بەڵام ئەگەر بەڕاستی کارەکەی بۆ خوا بوایە، تەنها بەوە ڕازی دەبوو کە خوای _ سبحانَه وتعالی _ لە کارەکەی ئاگادارەو، ئیتر ناوی خۆی لە سەر نەدەنوسی، دڵنیابن ئەگەر داوای لێ بکرێت دیوارێك دروست بکات بەبێ ئەوەی ناوی خۆی لە سەر بنوسێت، دروستی نەدەکرد !

هاوڕەگەزی ئەمەیە کاتێ لە شەوانی مانگی ڕەمەزاندا مۆمێکی زۆر لە بەر ڕۆشنایدا دەهێننە دەرەوە بەمەبەستی ناوبانگ دەرکردن، کەچی مزگەوتەکانیان بەدرێژای ساڵ تاریکە، چونکە ئەگەر هەموو شەوێك کەمێك نەوت بەرنە دەرەوە بۆ چرای مزگەوت هیچ کاریگەریەکی نابێ و مەدح و ستایشێکی زۆر ناکرێن، بەبەراوردی ئەو مۆمانەی کە لە ڕەمەزاندا دەیهێننە دەرەوەو، گاریگەریەکی زۆری دەبێ و مەدح و ستایشێکی زۆر دەکرێن، دڵنیابن دەوڵەمەندکردنی هەژاران بە پارەی ئەو مۆمانە لەبەرترو شایستەترە.

کەسی وایان تێدایە ئەگەر خێرو صەدەقە بکات، لە کاتێکدا پارە بە هەژارەکە دەدات کە خەڵکی تەماشای بکەن، بۆیە لە لایەکەوە مەبەستی بەدەستهێنانی مەدح و ستایشکردنی خەڵکەو، لە لایەکی تریشەوە هەژارەکە سەرشۆڕ دەکات.

کەسانێکیش کێشی دینارەکان سووك دەکەنەوەو، دەیکەن بە دوو (قیراط)و(٧٣٠) نزیك بەوە، وە ڕەنگە پاکیش نەبێ و شتی تری تێکەڵ بێ و خراپ بێت، ئینجا بە ئاشکراو لە پێش

٧٣٠ _ دیناری ئیسلامی یەکسان بووە بە (٢٢) قیراط زێڕ. بڕوانە: www.ahlalhadeeth.com، هەر (٥) قیراط = (١) غرام، بڕوانە: ar.wikipedia.org ، وەرگێڕ.

چاوی خەڵكیدا بە خێرو صەدەقەی دەكەن، بۆ ئەوەی بڵێن: فڵان كەس یەك دیناری بەخشی بە فڵان هەژار.

بە پێچەوانەی ئەو كەسانەوە، كۆمەڵێك لە پیاوچاكانی پێشین دێنارێكی كێش قورسیان دەخستە نێو كازێكی بچوكی لوول دراوەوە، كە كێشەكەی لە دینارو نیوێك زیاتر دەبوو، بەنهێنی بە هەژارەكەیان دەدا، كاتێ هەژارەكە كازە لول دراوەكەی دەبینی، وای دەزانی تەنها پارچەیەكەو هیچی تر، كە دەستی لێ دەدا، هەستی بە خڕی دینارێك دەكرد، دڵخۆش دەبوو، كە كاغەزە لول دراوەكەی دەكردەوەو، تەماشای دینارەكەی دەكرد، وای دەزانی كێشی دینارەكە سووكە، كە بەتەواوی تەماشای دەكرد، هەستی دەكرد قورسە، ئیتر واتێدەگەشت كێشی دینارەكە تەواوە، دواتر كە دەیكێشا، تەماشای دەكرد كێشەكەی لە دینارێك زیاترە، ئیتر زۆر زۆر دڵخۆش دەبوو، بەو شێوە پاداشتی كەسی بەخشەر بە گوێرەی دڵخۆشبوونی هەژارەكە لە هەر جارێكدا دوو ئەوەندەو زیاتر دەبوو.

كەسی وا دەبینی خێرو صەدەقەكەی بە غەریبان دەداو، خزمەكانی خۆی پشتگوێ دەخات، لە كاتێكدا خزمەكانی خۆی لەبەرترو شایستەترن.

عن سُلَيمانَ بنِ عامرٍ قالَ: سمعتُ رسولَ اللهِ _ صلى الله عليه وسلم _ يقولُ:

((الصدقةَ على المِسكينِ صدَقةٌ، والصدقةُ على ذوى الرحم اثنتانِ: صدقةٌ و صِلَةٌ))(٧٣١).

واتە لە (سُلَیمانَ)ی كوڕی (عامرٍ)ەوە _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی: گوێبیستی پێغەمبەری خوا بووم _ صلى الله عليه وسلم _ دەیفەرموو:

((خێركردن بە هەژار تەنها صەدەقەیەكە، بەڵام خێركردن بە خزمان دوو شتە: صەدەقەیەو بەجێهێنانی پەیوەندی خزمایەتیشە)).

كەسی واشیان تێدایە دەزانێ خێركردن بە خزمان زۆر چاكە، بەڵام لە نێوان خۆی و خزمەكەیدا دوشمنایەتێكی دونیایی هەیە، بۆیە خێری پێ ناكات، لە كاتێدا دەزانێ هەژارە،

---

٧٣١ _ رواه أبوداود (٢٣٥٥)، وأحمد (٤ / ١٧ _ ١٨)، والترمذي (٦٥٨)، والنسائي في ((الكبرى)) " كما في ((تحفة الأشراف)) (٤ / ٢٥) " بسند جيد.

بەڵام ئەگەر خێرەكەی بە خزمەكەی خۆی بدابا، ئەوا پاداشتی خێرەكەو، خزمایەتێكەو، تێكۆشانەكەشی وەردەگرت بەرامبەر بە هەواو ئارەزوواتی نەفسی خۆی.

كەسی وا دەبینیت پارەیەكی زۆر بۆ حەج خەرج دەكات، چونكە ئیبلیس سەری لێ دەشێوێنیت و وای بەخەیاڵدا دێنێت كە حەج هۆكارێكی سەرەكی نزیك بونەوەیە لە خوای تعالی، كەچی مەبەستە سەرەكیەكەی ڕووپامایی و تەماشاكردن و بەدەستهێنانی مەدح و ستایشی خەڵكە.

بۆنموونە پیاوێك بە (بِشْرِ الحافي) گوت: دوو هەزار دیرهەمم كۆكردۆتەوە بۆ حەج. ئەویش بە پیاوەكەی گوت: ئایا پێشتر حەجت كردووە ؟ گوتی: بەڵێ. بۆیە بە پیاوەكەی گوت: كەوابوو حەج مەكەو بەو پارەیەت قەرزی قەرزارێك بەرەوە. بەڵام پیاوەكە گوتی: نەفسم تەنها مەیلی حەج دەكات ! ئەوەبوو بە پیاوەكەی گوت: دڵنیام مەبەستت ئەوەیە سوار بیتو بچێت و بگەڕێتەوەو، خەڵكی پێت بڵێن: فڵان كەس حاجی یە.

كەسانێك پارەیەكی زۆر بۆ سەماو گۆرانی خەرج دەكەن و، ئیبلیس سەریان لێدەشێوێنێتو پێیان دەڵێت: ئێوە بەم كارەتان هەژاران كۆدەكەنەوەو خۆراكیان دەدەن، پێشتر ڕوونمان كردەوە كە ئەم ڕەفتارە دڵان خراپ دەكات.

كەسی وا دەبینیت ئەگەر كچەكەی بە شوو بات، كەل و پەلی زیوینی بۆ دروست دەكاتو، بە كردەوەیەكی چاكی دادەنێت، پێدەچێ جار بە جار خەتمەی قورئانیشی هەبێ، دیسان بوخوردانی زیوین دادەنێت، لەوێدا تاقمێك لە زانایانیش ئامادە دەبن، ئیتر نەخودی خۆی ئەو كارە بە لووتبەرزی دادەناو، نە زاناكانیش لەو كارە نكۆڵی دەكەن، وەكو پەیڕەوكردنێك بۆ نەرێتی باو.

کەسی واش هەیە لە وەسێتنامەکەیدا مافەکان پێشێل دەکـات و، واریـسەکان بـێ بـەش دەکات، چونکە وادەزانێ ماڵی خۆیەتی و، بەویستی خۆی تەصرڕوفی پێوە دەکات، کەچی بیری چووە ئەو نەخۆشەو مافی واریسەکانی کەوتۆتە ئەستۆ.

## * سەر لە هەژاران دەشێوێنێت:

بەڕاستی ئیبلیس سەری لە هەژاران شێواندووە: کەسی وایان تێدایە خۆی وەکو هەژار پیشان دەدا، لە کاتێکدا کە دەوڵەمەندە، بۆیە سەرەڕای ئەم کارە، ئەگەر دەست لە خەڵك پان بکاتەوەو، بەو هۆیەوە ماڵ و سامانی خەڵك بەرێت، ئەوە لە ڕاستیدا تەنها ئاگری دۆزەخ بۆ خۆی زیاد دەکات.

عَنْ أَبِي هُرِيرَةَ _ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ _ ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ _ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ_: ((مَنْ سَأَلَ النَّاسَ أَمْوَالَهُمْ تَكَثُّرًا ، فَإِنَّمَا يَسْأَلُ جَمْرًا ، فَلْيَسْتَقِلَّ مِنْهُ ، أَوْ لِيَسْتَكْثِرْ))(٧٣٢).

واته له (أَبي هُرَيرَةَ)ەوە _ خوای لیّ ڕازی بێت _، فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا _ صلی الله علیه وسلم _ فەرموویەتی: ((هەر کەس دەست لە خەڵك پان بکاتەوە بۆ ئەوەی ماڵ و سامانەکەی خۆی پیّ زیاد بکات، ئەوە لە ڕاستیدا تەنها داوای پشکۆو سکڵی ئاگری کردووە، ئیتر بە ئارەزووی خۆی با پشکۆو سکڵی ئاگرەکەی کەم بکاتەوە، یاخود زیادی بکات)).

ئەگەر ئەم پیاوە هیچیش لە خەڵك وەرنەگرێت و، مەبەستی بەو هەژاریی نواندە تەنها ئەوەبیّ کە خەڵك پێی بڵێن: پیاوێکی زاهیدە، ئەوە ڕیاو ڕووپامایی نواندووە.

وە ئەگەر مەبەستی بەو هەژاریی نواندنە، شاردنەوەی نیعمەتەکانی خوا بێت، ئەوا کردەوەکەی پیسکەیی و دەستقوچاویەو، لە هەمان کاتیشدا سکاڵاکردنە لە پەروەردگار.

وە ئەگەر هەژارێکی ڕاست و مافداریش بێت، ئەوا (مُستحَبّ)ە هەژاریەکەی بشارێتەوەو، ئابڕوی خۆی بپارێزێت و، خۆی بە کەم و ناتەواو پیشان نەدات، دڵنیابن کەسانێك لە پێشینی چاك کلیلێکی هەڵدەگرت، بۆ ئەوەی خەڵك وابزانن ماڵی هەیە، کەچی خۆی لە مزگەوتەکاندا دەنووست و دەمایەوە.

---

٧٣٢ _ رواه مسلم (١٠٤١).

دیسان ئیبلیس سەر لە هەژاران دەشێوێنێت و، خۆیان لە دەوڵەمەندان بە چاكتر دادەنـێن، چونكە بە خەیاڵی ئەوان لەو شتانە خۆیان بەدور گرتووە، كە دەوڵەمەندان بەدوایدا دەگەڕێن !

ئەمەش هەڵەیە، چونكە چاكبوونێتی بە هەبوون و نەبوون نییە، لە ڕاستیدا بەشـتگەلێكی ترە كە لە پشت ئەوەوەیە.

## ✸ سەرلێشێواندنەکانی ئیبلیس بەرامبەر بە خەڵکی ئاسایی:

ئیبلیس سەر لە جەماوەری خەڵکی ئاسایی دەشێوێنێت و، وایان لێدەکات بەردەوام لە گەڵ نەریتدا بچن، بۆیە ئەمە زۆرترین هۆکارەکانی تیاچونیانە.

بۆ نموونە ئەوان لە بواری بیروباوەڕدا، بەزۆری چاولێکاری باب و باپیرانی خۆیان دەکەن، بەپێی ئەو نەریتەی لە سەری پەروەردە بوونە، بۆیە پیاوی وا دەبینی پەنجا ساڵ لە سەر بیروباوڕی بابی دەژی، بە بێ ئەوەی تەماشا بکات: ئایا بابی لە سەر ڕاست و دروستی دەچوو یاخود هەڵە.

نموونەی ئەم چاولێکاریە، گاورو جولەکەکانن کە چاولێکاری پێشینانی خۆیان دەکەن، هەروەها موسڵمانانیش لە نوێژو خواپەرستنەکانیاندا بەزۆری نەریتی باو پەیڕەو دەکەن، بۆیە پیاوی وا دەبینی چەندەها ساڵ بەو شێوازە نوێژ دەکات کە بینیویەتی خەڵك نوێژ دەکەن، پێدەچی نەزانێ بە باشی سورتی (الفاتحة) بخوێنێت، نەزانێت (واجبات)ەکانی سەر شانی چین ؟ بەلاشێوە ئاسان نابێ هەوڵی فێربوونی بات، چونکە بەسووك تەماشای ئاین دەکات، کەچی ئەگەر بیەوێت بۆ بازرگانی بۆ وەڵاتێك بچێت، بەدڵنیایی پێش سەفەرکردنی دەپرسی لەو وەڵاتەدا چ خەرج دەکات.

پاشان تەماشا دەکەی کەسانێك پیش پێشەوا ڕکوع دەبەن و، پێش پێشەوا سجود دەبەن.

پێشەوا _ ابن الجوزی _ دەفەرمێت: کۆمەڵێکم بینی لە کاتی سڵاودانەوەی پێشەوادا ئەوانیش سڵاویان دەدایەوەو، هێشتا (التشهُّد)ەکەیان بەتەواوی نەخوێندبوو.

پێدەچێ کەسانێك واز لە فەرزێك بێنن و، زیادەیەك بەسەر سوننەتێك بخەن.

پێدەچێ شتنی هەندێك لە ئەندامەکان وەکو پاژنەکان پشت گوێ بخەن.

پێدەچێ ئەنگوستیلەیەکی لە پەنجەدا بێت، زۆر بەتوندی دەوری پەنجەکەی دابێ، بەڵام لە کاتی دەستنوێژ شتندا نایسوڕێنێتەوە، ئیتر ئاوەکە بە ژێر ئەنگوستیلەکە ناگات و، دەستنوێژەکەش دروست نابێ.

لە بواری کڕین و فرۆشتندا، زۆربەی گرێبەستەکانیان پووچە، لەو بارەوە حوکمی شەرع پەیڕەو ناکەن، بەلاشیانەوە قورسە چاولێکاری فیقهزانێك بکەن بۆ ئەوەی نەکەونە هەڵەوەو، ڕێپێدراوەکانی وەرگرن، چونکە بەپێی بیروڕای تایبەتی خۆیان تەصرف دەکەن و، واتێدەگەن لە حوکمی شەرع بەدەر نییە.

هەر شتێك دەفرۆشن غەشێکی تێدایەو، عەیبێك دایدەپۆشێ.

بە پەیڕەوکردنی نەریت کەسانێك لە مانگی ڕەمەزاندا لە ئەنجامدانی نوێژە فەرزەکاندا تەمەبڵی دەنوێنن و، لە سەر خۆراکی حەرام فتار دەکەن و، غەیبەتی خەڵك دەکەن.

کەسی وایان تێدایە شتێك بەقەرز دەهێنێ و خانووەکەی دەکاتە بارمتە، تا قەرزەکە دەداتەوە، دەڵێت: ئەمە شتێکی زەرورو ناچاریە، پێدەچێ خانویەکی دیکەشی هەبێ، وە پێدەچێ شتومەکی وای لە ماڵدا هەبێ ئەگەر بیانفرۆشێت، چیتر پێویستی بە بارمەتەدانان و بەکرێ گرتن نەبێ، بەڵام لە گەورەیی و پلەوپایەی خۆی دەترسێ، نەوەکا خەڵکی بڵێن: فلان کەس گەشتۆتە ئەو ئاستەی کە خانۆکەی فرۆشتووە.

لەو نەریتانەی کە خەڵکی ئاسایی پەیڕەوی دەکەن: پشت بە قسەی (الكاهن) و (المنجِّم) و (العرَّاف)(٧٣٣) دەبەستن، بەڕاستی ئەم شتانە لە نێوان خەڵکیدا بڵاوبونەتەوە، تا ئەو ئاستەی بووە بە نەریتی باوی پایەبەرزانی خەڵکیش، بۆیە بەزۆری دەیانبینی پێش ئەوەی سەفەر بکەن، یاخود پۆشاکێك بکڕن، یاخود کەڵەشاخ بگرن، لەو کەسانە دەپرسن کە بەخت

---

٧٣٣ _ الكاهن: واتە غەیبزان، بانگەشەی زانینی ڕووداوەکانی ئایندە دەکات و، وارادەگەیەنێت کە نهێنیەکان دەزانی.

العرّاف: واتە فاڵچی: مومارسەی دۆزینەوەی شتە دزراوەکان و جێگەی شتە ونبووەکان و بەو هاوشێوانە دەکات.

المُنَجِّم: واتە: بەختگرەوە: ئەو کەسەیە کە بانگەشەی زانینی بەخت و شانسی خەڵك دەکات بەپێی تەماشاکردنی شوێنی ئەستێرەکان، بڕوانە: www,almaany.com، هەروەها بڕوانە: شرح النووي على مسلم، وەرگێڕ.

دەخوێننەوەو، بەپێی قسەکانی ئەو ڕەفتار دەکەن، هەموو ماڵێکیان تەقویمی غەیبزانان و خوێنەرانی بەختی تێدایە، کەچی چەندەها ماڵ قورئانی تێدا نیە.

وفي ((الصحيح)) (٧٣٤) عن النبيِّ _ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ _ عَنْ الْكُهَّانِ، فَقَالَ: ((لَيْسُوا بِشَيْءٍ)). فقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ ! إِنَّهُم يُحَدِّثُونَ أَحْيَانًا بِالشَّيْءِ يَكُونُ حَقًّا. فقَالَ رَسُولُ اللَّهِ _ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ _: ((تِلْكَ الْكَلِمَةُ مِنْ الْحَقِّ يَخْطَفُهَا الْجِنِّيُّ، فَيَنقرُهَا فِي أُذُنِ وَلِيِّهِ نَقَرَ الدَّجَاجَةِ، فَيَخْلِطُونَ فِيهَا أَكْثَرَ مِنْ مِئَةِ كَذْبَةٍ)).

واتە سەبارەت بە بانگەشەکارانی غەیبزانی لە پێغەمبەری خوایان _ صلى الله عليه وسلم_ پرسی، فەرمووی: ((قسەکانیان هیچ نییە تا پشتی پێ ببەسترێت)). گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ! هەندێ جار شتێك دەڵێن و ڕاست و دروست دەردەچێ. ئەوەبوو پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ فەرمووی: ((ئەوە وشەیەکی ڕاستە جنۆکە دەیقۆزێتەوەو بە گوێی دۆستەکەی خۆیدا دەیچەپێنێ و دوبارەی دەکاتەوە وەکو چۆن مریشك دەنگی دوبارە دەکاتەوەو زیاتر لە سەد درۆی تێکەڵ دەکات)).

وفي ((صحيح مسلم))(٧٣٥) عن النبي _ صلى الله عليه وسلم _ أنَّه قالَ:
((مَن أتى عَرَّافاً، فسألَهُ عن شيءٍ " لم تُقْبَلْ لهُ صلاةٌ أربعينَ ليلةً)).

واتە پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ فەرموویەتی:
((هەرکەسێك بچێتە لای فالچیەك و، پرسیاری شتێکی لێ بکات، چل شەو نوێژەکەی قبوڵ ناکرێت)).

وروى أبوداودَ مِن حديثِ أبي هُريرةَ _ رضي الله عنه _ عن النبيِّ _ صلى الله عليه وسلم _ أنَّهُ قالَ:
((مَن أتى كاهناً، فصدَّقَهُ بما يقولُ " فقد بَرِيءَ مِمَّا أُنْزِلَ على محمدٍ _ صلى الله عليه وسلم_))(٧٣٦).

---

٧٣٤ _ رواه البخاري (٣٢١٠)، ومسلم (٢٢٢٨) " عن عائشة.

٧٣٥ _ برقم (٢٢٣٠).

٧٣٦ _ أخرجه أبوداود (٣٩٠٤)، والترمذي (١٣٥)، وابن ماجة (٦٣٩)، وأحمد (٢ / ٤٠٨) " بسند جيد.

واته له (أَبي هُريرةَ)ەوە _ خوای لیٚ ڕازی بێت _ فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا _ صلی الله علیه وسلم _ فەرمووی: ((هەرکەس بچێتە لای کەسێکی غەیبزان و، بڕوا بە قسەکانی بکات، ئەوا بەری بووە لەوەی کە بۆ (محمد) _ صلی الله علیه وسلم _ دابەزێنرا)).

بە پەیڕەوکردنی نەرێتی باو خەڵکی سوێندی درۆینەیان زۆر بووە، کە زۆربەی لە بواری (ظِهار)دایە(٧٣٧)، بەبێ ئەوەی لێی تێبگەن، یاخود زۆربەی قسەکانیان لە سوێندخواردندا بەم جۆرەیە: لێم حەرام بێ ئەگەر بیفرۆشم !

لە نەرێتە باوەکانیان ئاوریشم پۆشین و، ئەنگوستیلەی زێڕ لە دەست کردنە، پێدەچێ کەسی وایان تێدا بێت خۆی لە ئاوریشم پۆشین بەدور بگرێت، بەڵام لە کاتێکی دیاری کراودا دەیپۆشێ، وەکو پێشەوایانی وتارخوێن لە ڕۆژی هەینیدا.

شتێکی دیکە لە نەرێتە باوەکانیان ئەوەیە کەوا قەدەغەکردنی کاری خراپە فەرامۆش دەکەن، تا ئەو ئاستەی پیاوی وایان تێدایە براکەی یاخود خزمەکەی دەبینێت مەی و شەراب دەخواتەوەو، ئاوریشم دەپۆشێ، کەچی نکۆڵی لێ ناکات و، پێی بێتاقەت نابێ و، بەڵکو تێکەڵیشی دەکات وەکو تێکەڵیی کردنی کەسێکی خۆشەویست.

لە نەرێتە باوەکانی دیکەیان ئەوەیە کەسی وایان تێدایە سەکۆیەك لە بەردەم ماڵەکەیدا دروست دەکات و، ڕێگای هاتوچۆکاران تەنگ دەکاتەوە، پێدەچێ ئاوی بارانیش لە بەردەم ماڵەکەیدا کۆبێتەوەو، زیاد بکات و، پێویست بە لابردن بکات، بەوەش خۆی تووشی تاوان دەکات، چونکە بووە بە هۆکارێك بۆ ئەوەی ئازار بە خەڵکی بگەیەنێت .

لە نەرێتە باوەکانی دیکەیان ئەوەیە کە بەبێ (ازار) _ پۆشاکێکە نیوەی خوارەوەی جەستە دادەپۆشێت _ دەچنە گەرماوەوە، کەسی وایان دەبینی ئەگەر (إزار)یشی پۆشیبێ، تەنها دەیدا بەسەر ڕانەکانیدا، بۆیە هەردوو لای سمت و کلۆکی بەدەرەوە دەبێ، خۆی

---

٧٣٧ _ ظِهار: ئەگەر مێرد بە خێزانەکەی خۆی بڵێت: تۆ بەلای منەوە وەکو پشتی دایکم وای، یاخود وەکو پشتی خوشکم وای، ئەوە (ظِهار)ی کردووەو خێزانەکەی لیٚ حەرام دەبێ، تا ماوەکە تەواو دەبێ، بڕوانە: پوختەی فیقهی شەریعەت، مامۆستا طارق هموندی، وەرگێڕ.

تەسلیمی دەستی کەسی شێلەر دەکات و، بەشێ لە عەورەتی دەبینێ و، دەستیشی لێدەدا _ چونکە عەورەت لە نێوان ناوك و ئەژنۆدایە، پاشان خۆشیان تەماشای عەورەتی یەکتر دەکەن، نەچاویان دەدەخەن و نەنکۆڵیش دەکەن.

لە نەریتە باوەکانی دیکەیان ئەوەیە کە مافی ژنە هاوسەرەکانیان پێشێل دەکەن، لەوانەیە ناچاری بکەن واز لە مارەیەکەی بێنێت، مێردیش واتێدەگات لە مارەیەکە ڕزگاری بووە، کاتێ خێزانەکەی واز لە مارەیەکە دێنێنت.

ڕەنگە مێرد مەیلی یەکێك لە خێزانەکانی بکات لە سەر حیسابی خێزانەکەی دیکەی، بۆیە لە بەشەکاندا ستەم دەکات، وەکو کەمتەرخەمی و گوێ پێ نەدانێك، واتێدەگات شتەکە نزیکە.

وقد روى أبوهُريرةَ _ رضي الله عنه _ عن النبيّ _ صلى الله عليه وسلم _ أنّهُ قالَ:

((مَن كانتْ لهُ امرأتانِ يَميلُ إلى إحداهُما على الأخرى " جاءَ يومَ القيامَةِ يجُرُّ إحدى شِقَّيْهِ ساقطاً أو مائلاً))(٧٣٨).

واتە لە (أبوهُريرة)ەوە _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ فەرمووی: ((هەرکەسێك دوو خێزانی هەبێ و لە بواری خواردن و خەوتن و بژێویدا مەیلی لای یەکێکیان بکات لە سەر حیسابی ئەوی دیکەیان، ڕۆژی قیامەت دێت و، لایەکی بە کەوتووی یاخود لاری ڕادەکێشێت)).

نەریتێکی باوی دیکەیان ئەوەیە دەچنە لای دادوەر بۆ ئەوەی هەژاری و نەبووی خۆیان (الفَلْسِ) بسەلمێنن، ئیتر ئەو کەسەی حوکمی هەژاریی‌و نەبووی بۆ دەردەچێت، وادەزانێت تێکڕای هەق و مافەکانی لە سەر لاچووە.

---

٧٣٨ _ رواه أبوداود (٢١٣٣)، والنسائي في ((الصغرى)) (٧ / ٦٣)، وفي ((الكبرى)) (رقم ٤ _ عِشرة النساء)، والترمذي (١١٤١)، وابن ماجة (١٩٦٩)، والدارمي (٢ / ١٤٣)، وأحمد (٢ / ٢٩٥ و ٣٤٧). وصححه عدة من أهل العلم.

نەرێتێکی باوی دیکەیان ئەوەیە پیاو دەبێ بە کرێ گرتـە بـۆ ئـەوەی بەدرێـژای ڕۆژ کـار بکات، بەڵام کاتێکی زۆر بە فیڕۆ دەبات، کاتێ لە سەرخۆ کاردەکـات، یـاخود خـۆی بێکـار دەکات و دادەنیشێت، یاخود ئامێرەکانی کارەکە چاك دەکاتەوە، بۆ نموونە دارتاش خـۆی بـە تیژکردنی تەورەکەوە خەریك دەکات، ئەو کەسەش دار دوو کەت دەکات خۆی بە مـشارەکەوە خەریك دەکات، شتی وەکو ئەمە ناپاکیە، مەگەر ئـەو کاتـە کـەم بێـت و، نـەرێتی بـاویش ڕێگەی بەو کاتە کەمانە دابێ.

کەسانێکیش کەمتەرخەمی لە نوێژەکاندا دەکەن و، دەڵێن: ئێمە کرێکاری ئـەم پیـاوەین، کەچی نەیانزانیوە کاتەکانی نوێژ ناچێتە چوارچێوەی گرێبەستی کارکردنەکەوە.

بەکەمی لە کارەکانیاندا ئامۆژگاری دەکەن.

نەرێتێکی باوی دیکەیان ئەوەیە مردوو لە نێو تابوتەکـەدا دەنێـژن، ئەمـەش ڕەفتـارێکی نەویستراو و (مکروه)ە.

وە نابێ شانازی بەکڕینی کفنی گران بەهاوە بکرێت، بەڵکو دەبێ نێوەند بێت.

کۆمەڵە خەڵکێکیش جل و بەرگ لە گەڵ تەرمەکـەدا دەخەنـە نێـو گۆڕەکـەوە، ئەمـەش حەرامە، چونکە بەفیڕۆدانی ماڵ و سامانە.

هەروەها کۆدەبنەوە بۆ شیوەن و زاری، وفي ((صحيح مسلم))(٧٣٩) أَنَّ النبـيَّ _ صلى الله عليه وسلم _ قالَ: ((إِنَّ النائحةَ إِذا لم تَتُبْ قبلَ موتِها تُقامُ يـومَ القيامـةِ وعليهـا سِرْبالٌ مـن قَطِرانٍ، ودِرْعٌ مِن جَرَبٍ)).

واتە پێغەمبەری خوا _ صلی الله علیـە وسـلم _ فەرموویـەتی: ((ئـەو ژنـەی بـەگریان دەلاوێنەوە، ئەگـەر پـێش مردنـی تەوبـە نـەکات، لـە ڕۆژی قیامـەت زینـدوو دەکرێتـەوە، پۆشاکێك لە قەتران و، نەخۆشـی گـەڕیی بـە شـێوازێك لەشـی دادەپۆشـێت، وەکـو ئـەوەی کراسێکی لە بەر کردبێ)).

---

٧٣٩ _ برقم (٩٣٤).

نەریتێکی باوی دیکەیان ئەوەیە کە لە کاتی مردنی کەسێکدا یەخەی پۆشاك دەدڕێـنن و، بەدەم و چاوی خۆیاندا دەکێشن، بەتایبەت ژنان، وفي ((الصحيحين))(٧٤٠) أَنَّ الـنبيَّ _ صـلى الله عليه وسلم _ قالَ:

((ليسَ مِنَّا مَن شقَّ الجيوبَ، ولطمَ الخُدودَ، ودَعَا بدعوى الجاهِلِيَّةِ)).

واتە پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ فەرموویەتی:

((لە ئێمە نیە ئەو کەسەی کە یەخەی خۆی دادەڕێ و، لـە ڕوومــەتی خـۆی دەداو، داب و نەریتەکانی سەردەمی نەفامی پەیڕەو دەکات)).

پێدەچێ کەسی کارەساتبار بەدیکەن پۆشاکەکەی خۆی دڕیوە، بەڵام ڕێگریـی لـێ ناکـەن، لەوانەشە نکۆڵیی لەوە بکەن کە کەسی کارەساتبار پۆشاکەکەی نەدڕیوەو، بڵێن: کارەسـاتەکە کاری تێنەکردووە.

نەریتێکی باوی دیکەیان ئەوەیە لە شەوی بەراتدا سـەردانی سـەر قـەبران دەکـەن و، لای گۆڕەکان ئاگر دادەگیرسێنن و، هەندێ لە خاکی گۆڕی کەسە لە دڵا شیرینەکە لە گەڵ خۆیاندا دەبەن.

(ابنُ عقيلٍ) دەڵێت: بەلای کەسانی نەفام و هەرچـی و پەرچـیەوە سـەپاندنە شـەرعیەکان (التكاليف) قورس بوو، بۆیە وازیان لە باروحاڵەکانی شەرع هێناو، باروحاڵێکی نوێ یـان بـۆ خۆیان داناو، پەیڕەوی دەکەن، چـونکە بەلایانــەوە ئاسـانەو، نایانباتــە ژێـر فـەرمانی هـیچ کەسێکەوە.

دەڵێت: بەلای منەوە بە پەیڕەوکردنی ئەو کردەوانەی کە بۆ خۆیانیان دانـاوە کـافر دەبـن، وەکو بەگەورە تەماشاکردنی گۆڕو، ڕێزگرتنی بە شتانێك کە شەرع ڕێگریی لێ کردووە، وەکو ئەوەی ئاگری لە سەر دەگیرسێنرێت و، ماچی بکرێت و، لە سەری بنوسـرێت: گـەورەم ! ئـەم

---

٧٤٠ _ تقدَّم إيرادهُ وتخريجُه تعليقاً.

کارەو ئەو کارەم بۆ بکە(٧٤١)، وە بردنی خۆڵ و خاکەکەی بۆ تەبەڕك و، گوڵاو ڕشاندن بە سەر گۆڕەکانداو، سەردانی کردنیان و، فڕێدانی پارچە پەڕۆ بە سەر دارەکاندا وەکو لاسایی کردنەوەی ئەو کەسانەی کە بتەکانی (اللّات) و (العُزَّی)یان دەپەرست.

بەڵام هیچ کەسێك لەم کەسانە بەدیناکەیت لە مەسەلەیەکی زەکاتدا لێکۆڵێتەوە، بۆ ئەوەی شارەزا بێت لە حوکمێکی زەکاتدا کە پێویستە بەجێی بێنێت.

بەڵام بەلای ئەوانەوە وەیل بۆ ئەوە کەسەیە کە وێنەکەی (الكهفِ) ماچ ناکات و، ڕۆژانی چوارشەمەش دەست بە بردەکانی مزگەوتی (المأمونيَّةِ)دا ناهێنێ و، نایهێنێت بە جەستەی خۆیدا.

---

٧٤١ _ ئەمە داواکردنێکە لە کەسانێکی دیکەی جگە لە خوای _ تعالی _، کە کوفرە بە خوای _ جلَّ جلاله _.

انظر كتاب ((مفتاح الجنة: لا إله إلا الله)) للمعصومي، وتعليقي عليه.

## ✱ سەرلێشێواندنەکانی ئیبلیس بەرامبەر بە ژنان:

سەرلێشێواندنەکانی ئیبلیس بەرامبەر بە ژنان، زۆر زۆرە، بۆ ژنان کتێبی تایبەتم نوسیوە(٧٤٢) هەموو ئەو پەرستن و کاروبارانەم تێدا ڕوون کردۆتەوە کە بە ژنانەوە پەیوەندن، لێرەشدا چەند وشەیەك باس دەکەم سەبارەت بەو سەرلێشێواندنانەی کە ئیبلیس بەرامبەر بە ژنان بەکاری دێنێت:

لەوانە ژنی وایان تێدایە پاش لاربونەوەی خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان لە بێنوێژیەکەی پاك دەبێتەوە، بەڵام دوای عەسر خۆی دەشوات و، تەنها نوێژی عەسر دەکات، لە کاتێکدا کە نوێژی نیوەڕۆشی لە سەر (واجب) بووەو، پێی نازانێت.

ژنی وایان تێدایە دوو ڕۆژ خۆشتنەکەی دوادەخات و، بەهانەی ئەوە دەهێنێتەوە کە گوایە پۆشاکەکەی دەشوات !

ژنی وایان تێدایە غوسڵی لەشگرانی بۆ دوای خۆرهەڵاتن دوادەخات و، ئەگەر بچێتە گەرماویشەوە، (إزار) ناپۆشێت و، دەڵێت: من لە گەڵ خوشکەم و دایکم و خزمەتکارەکەمدام، ئەوانیش ژنن وەکو من، ئیتر بەرامبەر بە چ کەسێك خۆم داپۆشم ؟! بەڵام هەموو ئەمانە حەرامن.

بۆ ژن حەڵاڵ نییە تەماشای عەورەتی ژنێکی تر بکات، کە کەوتۆتە نێوان ناوك و هەردوو ئەژنۆکانیەوە(٧٤٣)، با کچی خۆی، یا دایکی خۆشی بێت، مەگەر کچەکە بچوك بێت، بەڵام ئەگەر تەمەنی بە حەوت ساڵ گەشت، هەردوکیان بەرامبەر بە یەکتر خۆیان دادەپۆشن.

جار بە جار ژن بە دانیشتەوە نوێژ دەکات، لە کاتێکدا دەتوانێت نوێژەکەی بە هەستانەوە بکات، بۆیە نوێژەکەی پوو چ و بەتاڵ دەبێتەوە.

---

٧٤٢ _ وهو كتاب ((أحكام النساء))، طُبع حديثاً في قطر، بتحقيق الدكتور محمد علي الحمَّدي.

٧٤٣ _ کەسانێك لە ئەهلی زانست سنورەکەی فراوانتر دەکەنەوە، بەناستێك هەردوو مەمك و سنگ و دەوروبەریان دەگرێتەوە.

بەڵام مەسەلەکە پێویستی بە لێکۆڵینەوەی زیاترە.

لەوانەیە بەهانە بێنێتەوە بەوەی کە پۆشاکەکەی پیس بووە، بەهۆی میزی منداڵەکەیەوە، لە کاتێکدا توانای شتنی هەیە، کەچی ئەگەر ویستی دەرچوونی دەرەوەی هەبوایە، بەدڵنیایی پۆشاکێکی لە هاوەڵێکی خۆی دەخواست و خۆی ئامادە دەکرد، بەڵام لە ڕاستیدا بە سووکی تەماشای نوێژ دەکات.

پێدەچێ هیچ شتێك لە (واجبات)ی نوێژ نەزانێت و، ناشپرسێت.

پێدەچێ ژنی ئازاد هەندێ لە ئەندامەکانی بکەوێتە دەر کە نوێژەکەی پووچ دەکاتەوە، بەڵام بە سووك و ئاسان تەماشای ئەو شتە دەکات.

پێدەچێ ژن بە سووك و ئاسان تەماشای لە باربردنی کۆرپەڵەی ناو سکی بکات، کەچی نازانێت کاتێ هەستاوە بە لە باربردنی کۆرپەڵەیەك کە فووی ڕۆحی پێدا کراوە، موسڵمانێکی کوشتووە.

پێدەچێ ژن لە گەڵ مێردەکەیدا بە خراپی مامەڵە بکات، پێدەچێ بە قسەی خراپ لە گەڵیدا بدوێ و، پاشانیش دەڵێت: ئەمە بابی منداڵەکانمەو، هیچمان لە نێواندا نییە، وە بەبێ مۆڵەتی مێردەکەی دەچێتە دەرەوەو، دەڵێت: من بۆ سەرپێچی و خراپە نەچومەتە دەرەوە، کەچی نازانێت خودی چوونە دەرەوەی بەبێ مۆڵەتی مێردەکەی بەتەنها بۆ خۆی سەرپێچیەکە.

پاشان خودی چوونە دەرەوەکەی لە فیتنەو بەڵا بەدەر نابێ.

ژنانێك بە بەردەوامی لای گۆڕەکان دانیشتوون و، ڕەشپۆشی بۆ کەسانی دیکەی جگە لە مێردەکانیان دەکەن، وقد صحَّ عن رسولِ اللهِ _ صلى الله عليه وسلم _ أَنَّهُ قالَ:

((لا يَحِلُّ لامْرَأَةٍ تُؤْمِنُ باللهِ ورسولِه أَنْ تَحِدَّ عَلَى مَيِّتٍ إلا عَلَى زَوْجٍ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْراً))(٧٤٤).

واتە پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ فەرموویەتی:

((بۆ ئەو ژنەی بڕوای بە خواو پێغەمبەرەکەی هێناوە حەڵاڵ نییە بەرگی پرسەی ڕەش بۆ هیچ مردوویەك بپۆشێت مەگەر بۆ مێردەکەی کە چوار مانگ و دە ڕۆژە)).

---

٧٤٤ _ رواه البخاري (٩ / ٤٢٧)، ومسلم (١٤٨٦) " عن أُمِّ حَبيبة.

ژنانی واش هەن مێرەکانیان داوای سەرجێگەیان لێ دەکەن، بەڵام قایل نابن، وادەزانن ئەمە سەرپێچی نیە، لە کاتێکدا قەدەغەیی ئەوەیان لێکراوە، لما روى أَبو هُريرةَ _ رضي الله عنه _ قالَ: قالَ رسولُ اللهِ _ صلى الله عليه وسلم:

((إِذَا دَعَا الرَّجُلُ امْرَأَتَهُ إِلَى فِرَاشِهِ فَأَبَتْ، فَبَاتَ وهو عليها ساخِطٌ " لَعَنَتْهَا الْمَلَائِكَةُ حَتَّى تُصْبِحَ))

أَخرجاهُ في ((الصحيحينِ))(٧٤٥).

واتە لە (أَبوهُريرةَ)ەوە _ خوای لێ ڕازی بێت _ فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا _ صلى الله عليه وسلم _ فەرمووی:

((هەرکات مێرد داوای سەرجێگەیی لە خێزانەکەی کردو، ئەویش ڕازی نەبوو، پاشان نووست و مێردەکەی لێ تووڕە بوو، ئەوا فریشتەکان تاوەکو بەرەبەیان نەفرین لەو ژنە دەکەن)).

پێدەچێ ژن لە ماڵ و سامانی مێردەکەیدا کەمتەرخەمی بنوێنێ، بەڵام حەڵاڵ نییە هیچ شتێك لە ماڵەکەی دەرهێنێ مەگەر مۆڵەتی بات، یاخود بزانێت بەوە ڕازیە.

پێدەچێ پارە بات بەو کەسانەی کە بە بەرد بەختی بۆ دەگرنەوەو، جادوو دەکەن و، نوسخەی خۆشەویستی بۆ دروست دەکەن و، زمانگرتنی بۆ دروست دەکەن، لە کاتێکدا کە هەموو ئەم شتانە حەرامن.

پێدەچێ ژنان ڕێگە بە سمینی گوێی منداڵەکانیان بەن، لە کاتێکدا کە حەرامە(٧٤٦).

لە کاتێکدا ئەگەر ژنان سەرکەوتوین و، لە مەجلیسی واعیزەکاندا ئامادەبن، یەکسەر شێخی صوفیەکان پۆشاکە (خِرْقَةَ)کەی لە بەر دەکات و، تەوقەی لە گەڵدا دەکات و، دەبێ بە یەکێك لە کچانی مینبەرو، چەندین شتی سەرسوڕمێنی لێوە دەبینی.

---

٧٤٥ _ رواه البخاري (٩ / ٢٥٨)، ومسلم (١٤٣٦) " عن أبي هُريرة.

٧٤٦ _ ئەم مەسەلە وردەکاری تێدایە، پێشەوا (ابن القيم) لە کتێبی (تحفة المودود) (ق٢٤٥)، فەرموویەتی: ڕێتێچوترین شت ئەوەیە کە بۆ کچان شیاوە.

پێویسته ئیتر جڵەوی پێنوسەکەمان کورت کەینەوه، تەنها ئەم کورتەیـەمان بـەس بێـت، چونکه ئەم شته درێژه دەکێشێت، ئەگەر کورته باسکراوەکانی نێو ئەم کتێبـه بـاس بکـەین، یاخود به فەرمودەو (أثر) وەڵامی ئـەو کەسـانه بەینـەوه کـه وەڵامـان داوەتـەوه، دڵنیـابن چەندین کتێب دەنوسینەوه.

قایل بوین به باسکردنی کاره ناشیرینەکانی هەڵەکاران بەبێ ئـەوەی وەڵامیـان بەینـەوه " چونکه شتەکه ئاشکرایه.

پەروەردگارا له هەڵەو زەلله بمانپارێزەو، وه سەرکەوتوشمان بکه بـۆ پیـادەکردنی گوفتـارو کردەوەی چاك به منەت و بەخشندەی خۆت.

# بەشی سیازدەیەم

# باسی سەرلێشێواندنەکانی ئیبلیس بەرامبەر بە تێکڕای خەڵك بەوەی کە بەردەوام هانیان دەدات کاروکردەوەکانیان لە ئایندەدا ئەنجام بدەن:

نووسەر دەفەرمێت:

چەندین جار خۆشەویستی ئیسلام بە دڵ کەسانێکی جولەکەو گاوردا هاتووە، بەڵام ئیبلیس ساردی کردۆنەتەوەو، پێی گوتون: پەلە مەکەن و، لە سەرخۆ بیربکەنەوە، ئیتر ئەمڕۆو سبەیان پێ دەکات، تا لە سەر کوفرەکەیان دەمرن.

بەهەمان شێوە ئەمڕۆ و سبەی بە یاخیبوان دەکات بۆ ئەوەی تەوبە نەکەن و، وایان پێ دەکات مەبەستیان تەنها تێرکردنی شەهوت و ئارەزواتیان بێت، وایان بەخەیاڵدا دێنێت کە پاشان هەر دەگەڕێنەوە، وەکو ئەوەی شاعیرێك دەڵێت:

لا تَعْجَلِ الذَّنبَ لِما تَشْتَهي

وتَأمَلِ التوبةَ من قَابلِ

واتە:

پەلەی ئەوەت نەبێ کە تاوانت کردووە بۆ ئەوەی بەتەواوی ئارەزووەکانت تێرکەی، وە بەهیوای تەوبە بە لە داهاتوودا.

چەندین لەو کەسانەی کە بڕیاریان دابوو جیدی بن ئەمڕۆ و سبەیان پێ دەکات، وە چەندین لەو کەسانەش کە تێکۆشان بۆ ئەنجامدانی کاری خێر ساردی کردنەوە.

پێدەچێ فیقهزانێك بڕیاری دابێ دەرسەکەی دوبارە کاتەوە، بەڵام پێی گوت: سەعاتێك پشوو بدە. یاخود بەشەو خەبەری دەبێتەوە بۆ ئەوەی نوێژ بکات، بەڵام پێی دەڵێت: جاری کاتت ماوە.

بەردەوام تەمبەڵی خۆشەویست دەکات و، ئەمڕۆ و سبەی بە کارکردن دەکات و، هەموو شتەکان دەداتە پاڵ بە هیوابونێکی درێژ.

بۆیە پێویستە کەسی هۆشیار و بە ئاگا لە سەر یەك باوەڕیی خۆی کار بکات، فریای کاتەکانی بکەوێت، واز لە ئەمڕۆ و سبەینێ بێنێت، ڕوو لە بەهێوابوون وەرگێڕێت.

هەر کەمتەرخەمبونێك لە خەیردا، یاخود مەیل کردن بۆ شەڕ هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ بەهیوابوونی درێژ، چونکە مرۆڤ بەردەوام لە نەفسی خۆیەوە هەوڵی لە شەڕ وازهێنان و، ڕوو کردنە خەیر دەدات، بەڵام تەنها پەیمان بە نەفسی خۆی دەدات کە لە داهاتوودا ئەوە بکات.

دڵنیابن هەر کەس بەهیوابێ بەڕۆژ ڕێ بکات، ئەوا بە هێواشی ڕێ دەکات، وەهەرکەس بەهیوا بوو تا بەیانی بژێت، ئەوا بە شەو کارێکی لاواز دەکات، بەڵام هەرکەسێك مردنی هێنایە پێش چاوی خۆی، ئەوا بە جیدی کار دەکات.

وقد قالَ ــ صلى الله عليه وسلم ــ:

((صَلِّ صلاةَ مُوَدِّعٍ))(٧٤٧).

واتە پێغەمبەری خوا ــ صلى الله عليه وسلم ــ فەرموویەتی:

((نوێژ بکە بەهاوشێوەی نوێژی کەسێك کە دەیەوێت ماڵئاوای بکات)).

کەسانێك لە پێشینی چاك فەرموویانە: ئاگاردارتان دەکەمەوە لە گوتنی (سوفَ) واتە لە ئایندەدا بەجێی دێنم، چونکە گەورەترین سەربازەکانی ئیبلیسە.

---

٧٤٧ ــ رواه البخاري في ((التاريخ الكبير)) (٣ / ٢ / ٢١٦)، وأبوالشيخ في ((الأمثال)) (٢٢٦)، وابن ماجة (٤١٧١)، وأحمد (٥ / ٤١٢)، وأبو نُعَيم (١ / ٣٦٢) " عن أبي أيوب الأنصاريِّ.

وفي إسناده جهالةٌ " كما قال البوصيري في ((مِصْباح الزجاجة)) (٢ / ٣٣٣)، وبقيَّة رجاله ثقات.

ولكنْ له شاهدان أوردناهما شيخُنا الألباني في ((السلسلة الصحيحة)) (رقم ١٤٢١ و ١٩١٤)، يصحُّ الحديث بهما.

نموونەی کارکردنی کەسی هۆشیارو بەئاگاو، کەسێکی پشتبەستوو بە هیوای کـارکردن لـە ئایندەدا، وەکو نموونەی قەمێکە لە سەفەرێکدا، چوونە دێیەکەوە، کەسی هۆشـیارو بـە ئاگـا یەکسەر چوو بۆ کڕینی پێداویستیەکانی سەفەرو، دانیشت و بۆ کۆچکردن ئامادەبوو. کەسـی کەمتەرخەمیش گوتی: پاشان ئامادە دەبم، لەوانەیە مانگێك بمێنینەوە، بەڵام یەکسەر زۆڕنای کۆچکردن لێدرا، کەسـی هۆشـیار دڵخـۆش بـوو، کەسـی کەمتەرخـەمیش بێتاقـەت بـوو و حەسەرەتی کێشا !

ئەوە نموونەی خەڵکە لە دونیادا، کەسی وایان تێدایە بە ئاگاو ئامادەیە، هـەرکات (مَلَكُ الموتِ) هـات، پەشـیمانی و حەسـرەت ناکێـشێ، کەسـی فریوخـواردووی ئـەمڕۆ و بـەیانی پێکراویش لە کاتی کۆچکردندا تاڵی پەشیمانی دەکێشێت، خـوا پـەنامان بـات ئەگـەر ئـەو خراپی و فریوخواردنە لە تەبیعەتی مرۆڤدا بـوو، ئـەوا هـەوڵی لادانـی قـورس دەبـێ، بـەڵام هەرکەسێك بیر لە نەفسی خۆی بکاتەوە، دەزانێ ئەو لە ڕیزەکانی جەنگدایەو، دوژمـنەکەشـی هەرگیز سستی ڕووی تێ ناکات، وە ئەگەر جار بە جار هەست بە سـستبوونی بکرێـت، ئـەوا بەدڵنیاییی چەندان فێڵ و پیلانی بۆ دادەڕێژێت و، چەندان بۆسەی بۆ دادەنێت.

ئێمە لە خوای _ عزَّوجلَّ _ داواکارین لە فێڵ و پیلان و دەسیـسەکانی دوژمـن بێوەیمـان بکات و، لە فیتنەو خراپەکانی شەیتان و، شەڕی نەفسەکان و دونیـا بمانپارێزێـت، إِنَّـه قريـبٌ مجيبٌ.

جعلنا الله من أولئك المؤمنين.

تەواو بوو

الحمد لله أولاً وآخراً.

# ناوەڕۆك

پێشەوا (ابنُ الجوزي) دەفەرموێت:

خوای تعالی دەزانێ ئێمە کە هەڵەی کەسانی هەڵەکار بەدەردەخەین مەبەستمان تەنها پاك ڕاگرتنی شەریعەتە، خەمخۆریە بەرامبەر بەشەریعەت لە هەر ناتەواوی و کەم وکوڕیەك، پەیوەندیمان بە کەسی بێژەرو بکەرەوە نییە، لەڕاستیدا مەبەستمان بەوە تەنها بەجێهێنانی ئەمانەتی زانستییە، دڵنیابن بەردەوام هەر یەکێك لەزانایان هەڵەی هاوەڵەکەی بەدەردەخات، بەمەبەستی ڕوونکردنەوەی هەق، نەك لەبەر ئاشکراکردنی عەیب و ناتەواوی کەسی هەڵەکار.